# ئورهان پامووك

ئورهان پامووك لە ساڵی 1952 لە ئەستەنبووڵدا لە دایك بووە و لە بنە ماڵەیەكی هاو شێوەی ئەو بنە ماڵانەی وا لە ڕۆمانەكانی ( كاك جەودەت و كوڕەكانی و كتێبی ڕەشدا ) باسیكردوون لە ( نیشانتاش )دا گەورە بووە . تەنیا ئەو سی ساڵە نەبێ كە لە نیۆیۆركدا دەربازی كردووە ، هەموو تەمەنی خۆی لە ئەستەنبووڵدا ژیاوە . خوێندنی كۆتایی بەرلە زانكۆی لە كۆلێژی ڕۆبەرت تەواو كرد و لە زانكۆی تەكنیكی ئەستەنبووڵدا سی‌ساڵیش مێعماری خوێند لە ساڵی 1976 دا خوێندنی لە زانكۆی ئەستەنبووڵ لەبەشی ئەنیسیتۆی ڕۆژنامە وانی تەواو كرد . هەر لە ساڵی 1974 ەوە بەردەوام دەستی بە نووسین كرد و ئەمەی وەكوو كارێك هەڵبژارد . ڕۆمانی یەكەمی بەناوی ( كاك جەودەت و كوڕەكانی ) لە كێبەركێی ڕۆمانی چاپ و پەخشی میلییەتدا وەكوو باشترین هەڵبژێردرا . ئەم كتێبە لە ساڵی 1983 دا بڵاو بووەوە خەڵاتی تایبەتی ڕۆمانی ئورهان كە ماڵی وەرگرت . كتێبی " ماڵی بێدەنگ " ەكەی كە هەر لەو ساڵەدا بڵاو بووە خەڵاتی ڕۆمانی خەماویترین ڕۆمانی وەرگرت . شایانی باسە كە لە ساڵی 1991 وەرگێڕدراوەكەشی لە فەرەنسادا بڵاو بووە خەڵاتی ( كەشتی ئاورووپا )ی وەرگرت (picxde ladecouverte eucopeene) . ڕۆمانە مێژووییەكەی بە ناوی قەڵای سپی كە لە ساڵی 1985 دا بڵاو بووەوە لە ماوەیەكی كورتدا ناو بانگی لە دەرەوە و ناوەوەی وڵات دەكرد ، تەنانەت لە گۆڤاری نیۆیۆرك تایمزدا بە قسەی ( لە ڕۆژ هەڵاتدا ئەسستێرەیەك بەرز بووەوە ) نرخێندراو بە زیندووترین زمانەكانی ڕۆژ ئاوا وەرگێڕدرایەوە .

رۆمـانی ( کتێبـی ڕەش ) ەکـەی بـە دەوڵەمەنـدی و پڕبـار بوونەکەیـەوە بووبەیەکێك لە باس هەڵگرترین ڕۆمانەکانی ئەدەبیاتی هاو چەرخ و بوو بە یـەکێك لـە ڕۆمانانـەی کـە زۆرتـرین ژمـارەی خوێنـەرانی بـە دەست هێنـا . پاموك لە ساڵی 1992 دا سناریۆی فیلمی ڕوخساری شاراوەی کەلە ژێر بەڕێوەبەرایەتی عومەردا نوسرابووکرد کرد بە ڕۆمان . کتێبـی ( ژیانی تازە ) کە باسی بەسەرهاتی هەندێك خوێندەواری زانکۆ دەکات کە کەوتوونەتە ژێـر کاریگـەری ڕۆمـانێکی ڕازداردار لـە سـاڵی 1994 دا بـڵاو بـووەوە بـە پـڕ خوێنـەرترین کتێبـی ئـەدەبیاتی تـورکی . ڕۆمـانی (نـاوی مـن سـوورەیە ) لـە ساڵی 1998 دا بڵاو کردەوە کە لەگەڵ بایەخپێدانێکی دەرئاساییدا ڕوو بە ڕوو مایەوە . زۆربەی ڕۆمانـەکانی ئورهـان پامووك بە زیـاتر لـە (20) زمـانی زینـــدووی دونیـــا وەرگێڕدراونەتـــەوە . پـــامووك لـــە یـــەك خســـتنەوەی دەفتەرەکانی کە بیست و پێنج ساڵە ڕایگرتوون و نووسراوەکانی لە گۆڤار و ڕۆژنامەکانــدا و نووســراوە ڕەخنەییــەکانی و وت و وێــژو یادداشــتەکانی سەفەرە کانی، لەگەڵ ئەزموونـەکانی خۆیـدا بـە هەڵبـژاردنێکی خێـرا بەسەر هاتــە درێژەکــەی بــە نــاوی ( ڕوانــین لەبــەر پەنجــەرەوە ) بەســەر دێــڕی( ڕەنگەکانیتر) کرد بە کتێب . کە کارێکی لەو شێوەیە تاوەکوو ئەو کاتـە هـیچ ئەنجامنەدرا بوو .

**پیشکەشە بە ڕۆیا**

**" مروڤیێکیان کوشت و لە نێو خویاندا دەستیان کرد بە قسەو باس . "**

( قورئان ـــ بەقەرە ـــ 72 )

**" کوێر و بینەر نابن بە یەک "**

( قورئان ـــ فایتر ـــ 19 )

**" ڕۆژ هەڵات و ڕۆژ ئاواش هی خودایە "**

( قورئان ـــ بەقەرە ـــ 115 )

ناوەڕۆک

# ((من مردووم)) (1)

ئێستا مردوویەکم،

لاشەکەم لە بنی چاڵە ئاوێکدایە ، لە زووەوە دوا هەناسەم هەڵکێشاوە و دڵم ڕاوەستاوە ، بەڵام لە بکوژە هیچ و پوچەکەم زیاتر نەبێ، کەس نازانێ کە چیم بەسەردا هاتووە. ئەو ناپیاوە چەپەڵەش بۆ ئەوەی کەلە مەرگم دڵنیا بێت، گوێی خستە سەر سینگم و چاوەڕیێ دوا هەناسم مایەوە و لەدوایشدا شەقێکی هەڵدایە ناوزکمەوە و ڕایکێشام بۆ سەر چاڵە ئاوەکە. بە تاشە بەردەکەی دەستی کاسەی سەرمی شکاندولە بەر ئەوەش سەرم پلاش پلاش بوو.

دەمم پڕبوو لەخوێن ، دەم وچاو و تەوێڵ و گوپەکانم هەمووی تلیقانەوەو لەناو چوون، یەك بە یەکی ددانەکانم ورد و هاڕ بوون.

ئەوە بۆ چوار ڕۆژ دەچێ کە نە گەڕامەتەوە بۆ ماڵ، ژن ومنداڵەکانم بە دەوامدا دەگەڕێن کچەکەم بەردەوام سەیری دەرگای حەوشەکە دەکات، ئەوەندە گریاوە کە هیچی بە هیچ نەماوە و خەریکە لە ناو بچێ، هەموویان چاویان لە دەرگای ماڵەکەیە وچاویان لە ڕێگایە، ئایا بە ڕاستی هێشتا لە بەر دەرگا کەیە؟ نازانم لەوانەیە پێی ڕاهاتبێ !

ئای کە خراپە! مرۆڤ خۆی لێرەیەو هەست بە بەردەوام بوونی ژیانەکەی ڕابردووی خۆی لەولا دەکات ! بەر لەوەی لە دایك بم، کاتێکی بێسنوور لە پێشمەوەبوو، کاتێکیش کە مردم زەمانێکی بێکۆتایی!

کاتێکیش کە دەژیام، بیرم لەم شتانە نەدەکردەوە، لە بەینی دوو کاتی تاریکدالە نێوان تیشك و ڕووناکیدا دەژیام.

ئێستا تێدەگەم کەوا خۆشحاڵ و بەختەوەر بووم.

لە وێنەکێشخانەکەی پادشا کەماندا، جوانکاری هیچ کەسێك بە قەدەر ئەوانەی من باش نەبوو، کاری دەرەوەی ڕاسپاردەکانی کۆشکیشم ئەنجام دەدا و مانگانە زیاتر لە نۆسەد ئاکچەم* دەست دەکەوت، ئەمانەش هەمووی دەبن بە هۆی ئەوەی کەوا مەرگم لەلا سەخت بێت و زۆرم پێ قورس بێت. نەخش وجوانکاریم دەکرد کەناری لاپەڕەکانم دەڕازاندەوە. لق و پەل، گوڵ و گیا، پەلەوەری ڕەنگاوڕەنگم دەکێشا، بەنەریتی چینیەکان پەڵە پەڵە هەورم بە سەریانەوە دەکێشا، پەلی دارەکان سەریان دەکردە ناو یەك، لە ناو دارستانی چڕوپڕدا ئاسکی جوانم دەکێشا. جاری وا هەبوو، پاشاوخانەکان و کۆشکەکانیان و دار و ڕاوچی و ئەسپەکانیانم لە قاپێکدا دەکێشا، جاری واش هەبوو کە هەر ئەوانەم لە پشتی ئاوێنەیەکدا، یان لە ناو کەوچکێك دا، یان وەکوو لە ماڵێکی گەورەدا لە (ملەکە)*، یان لە ڕووی ناوەوەی بانی ماڵێکدا دەکێشا. بەڵام لەم ساڵانەی دواییدا تەنیا لە سەر لاپەڕەی کتێب کارم دەکرد. پادشا پارەیەکی زۆری دەدا بە کتێبی پڕ نەخش و نیگار، لە بەر ئەوەیکە وا ئێستا مردووم وکۆتایی بەژیانم هاتووە، هەگیز جاڕی ئەوە لێنادەم کە پارە لە ژیاندا بایەخێکی ئەو تۆی نییە، چوونکە بەراستی تە نانەت کاتێکیش کە مرۆڤ دەمرێت، دیسان هەست بە بایەخی پارە دەکات.

دەزانم کە ئێستا سەرتان لەوە سوور دەمێنێ کە گوێبیستی قسەکانی من دەبن و لەم وەزعە دەرئاساییە تێناگەن و لەگەڵ خۆتاندا دەڵێن کە: واز لەوە بێنە کە لە کاتی ژیانتدا چەندەت پارە قازانج کردووە، ئەوەمان پێبڵێ کە

لەو دونیادا چیت بینیوە؟ ڕۆحت لە كوێیە؟ بەهەشت و دۆزەخ چۆنن، لەوێدا چی دەبینی؟ مردن چۆن شتێكە، گیانت دەئێشێ؟ منیش بە نیسبەت خۆمەوە مافی بیر كردنەوەیەكی لەو چەشنەتان پێدەدەم، مرۆڤ كاتێ ژیان دەكات، هەمیشە بیر لەوە دەكاتەوە كە داخۆ دەبی مردن چۆن شتێك بێت، هەر لە بەر ئەوەش هۆڵی لێدێت.هەر لە سەر ئەو بابەتە چیرۆكی پیاوێك دەگێڕنەوە، كەلەناو لاشەی مردووەكاندا گەڕاوەو بەتەما ی ئەوە بووە كەلە مەیـــدانی شـــەڕە خوێناوینـــەكان ولـــەنێوان تەرمیجەنگاوەرانـــدا تووشیكەسێكی مردوو بێت كەزیندوو بووبێتەوە، بۆئەوەی كەباسی نهێنیەكانی دونیا ی تری دەرەوەی بۆبكات. لەوكاتانەدا یەكێك لەسەربازە نیـوە گیـان و برینـدا ڕەكـانی تـەیموور وادەزانێـت كەئـەو دووژمنـەو بەشمشـێرەكەی خـۆی دەیكـات بـە دوولەتـەوە ، ئـەویش وادەزانێـت كەلەودوونیامرۆڤ دەكەن بەدوو لەتەوە. بەلاَم من دەتوانم كە بڵێم شتێكی ئاوا هەبوونی نیە و بەپێچەوانەوە ، ئەوڕۆحانەی والەودنیادا بوون بەدوو بەشەوە لێرەدا یەكدە گرنەوە . دونیای پاش مەرگ وەكوو ئەوە نییە كەوا گوێگرانی شەیتان وكا فروو زەندیقەكان باسی لێوە دەكەن ، هەرئەوەیكەمن ئێستا دەتوانم لەگەڵ ئێوەدا قسەبكەم ، خۆی بەڵگەی حاشا هەڵنەگری پێچەوانە بوونی ئەو شتانەیە .لەلایەكیتریشەوەدەبێ ئەوەش بڵێم كە من هیچ یەك لەوشتانەشم نە بینی كەوا قورئانی كەریم باسیان لێوە دەكات و چاوم بەحۆری جوان و داری پڕپەل و گۆشەزێڕاوییەكانی بەهەشت و چۆمی پڕ هاژەو ڕەوان نەكەوتووە .تەنیائەوەنەبێ كەلەكاتی ڕووداوەكەدا وێنەی حۆرییە چاوگەورەكان دەهاتەوە یادم ، كەئەویش خۆم كێشامبوون.!

هەڵبەت من هەقم بە سەر فەرموودەكانی قورئانی پیرۆزەوە نییە ، بەلاَم لە

**ڕاستیدا من چاوم بە شیرو شەراب وچوار چۆمی ئاووهەنگوین نەکەوت کەوا کوری عەرەبی (ابن العربی) بەخەیاڵیکی شیرینەوە باسیان لێوەدەکات . بائەوەش بڵێم کە ئەوشتانەی وامن باسی لێوە دەکەم ، پەیوەندییان بەبارودۆخی تایبەتی منەوە هەیەو بەهیچ جۆرێك مەبەستی ئەوەم نییە کە خەڵکی لە هیواداربوون بەژیانی دوونیای دیتر دڵساردبکەمەوە و بێبڕوایان بکەم . کەسێکی خاوەن دین و ئیمان ئەگەر تۆزێك زانیاری لەسەر چۆنیەتی ژیانی دیتر هەبێت لەوە باش تێدەگات کەکەسێکی ئاڵۆزو پەرێشانی وەکوو من توانای بینینی چۆمەکانی بە هەشتی نیە.**

***ئەگەر بە کورتی باستان بۆبکەم ، ئەوەتان پێ دەڵێم کە: "زەریف ئەفەندی" نێو دەستەی ئوستادە وێنەکێشەکان منم و ئێستاش مردووم، بەڵام هێشتا نەنێژراوم. هەر لە بەر ئەوەش ڕۆحم بە تەواوەتی دەرنەچووە.***

**بۆ ئەوەی کە بچمە بەهەشت، یان دۆزەخ یاخود ئەو جێگایەی کە خوداوەند بڕیاری لە سەر بدات، پێویستە**

**ڕۆحم لە پیساوییەکانی سینەم دەرکەوێت و ڕزگاری ببێت. لەگەڵ ئەوەی کە سەرم شکاوەو نیوەی سینگم لەناو ئاوێکی ساردی وەکوو سەهۆڵدایە و خەریکە بە برینەکانیەوە بگەنێ، کەچی بە قەدەر ئازاری ڕۆحم کە دەیەوێ لە سینەم دەرچێ، ئێشم پێناگەیەنێت. وا هەستدەکەم کە تەواوی دونیایان تەپاندوەتە ناو جێگایەکی منەوە. لەوە دەچێ کە ئەو کارە ساتە دەرئاساییەی وا بەسەر مندا هاتووە بەسەر کەسیتر یشدا بێت، بەڵام بە ڕاستی ئازاری ئەم ڕۆحەی من زۆر ترسناکە. هەست بە تەنگاوییەکی زۆر دەکەم، کە ئەمە لەگەڵ ئەو دڵئارامی و دڵفراوانییە سەرسۆڕ هێنەرەدا بەراورد دەکەم وا لە کاتە بێ هاوتاکەی مردندا تووشم بوو، ...**

کاتێك کە ئەو یەکەم زەربەی بەردی چاوەڕوان نەکراوی لە سەرمدا و کاسەی سەری‌شکاندم، ئیدی‌زانیم کە مەبەستی کوشتنی منی هەیە، بەڵام هەرگیز بڕوام نەدەکرد کە بتوانیٚ من بکۆژیٚ. بە هیوا بووم بەڵام لەکاتی ژیانە ساردەکەی نێوان وێنەکێشخانە و ماڵەکەمدا، نەمزانیوە کەچەندە ئومێد و هیوام بەو ژیانە هەبووە. بە نینۆك و پەنجە و گرێدراوبوونێك لە شێوەی ئەوەی وا ددان پەنجە دەگەزێت و بەدابەشەییەکی باشەوە باوەشم کردبوو. بەسە ئیدی، با بەئازارەکانی سەرمەوە سەرتان نەیەشێنم.

کاتێك بەحەسرەتەوە زانیم کە مردووم، هەستم بەدڵئارامی و وە دڵفراوانییەکی دەروونی‌کرد وە لەخەیاڵی‌خۆمدا وامدەزانی کە خەوەنووچکەیەکی نەرم دەمباتەوە. لە دوایشدا تەنیا چاوم بە پێڵاوەکانی‌بکوژە ناپیاوە_

_کەی خۆم کەوت کەهێشتا بەفری پێوەمابوو. چاوەکانم خەواوی بوون، خەوە نووچکە دەیبردمەوە، چاوەکانم گرت و لە نێوخەیاڵە شیرینەکانی خۆمدا دەربازی دوونیای دیتر بووم. ئێستا گلەییم لەوە نیە کە ددانەکانم وەکوو لە ب لەبی ڕژاونەتە ناودەمە خوێناوییە کەم، هەروەهاخەمی ئەوەشم نیە کە دەمووچاوم تلیقاوە وام لێهاتووە کە کەس نامناسێتەوە ، تەنانەت نیگەرانی ئەوەش نیم کەلە بن چاڵە ئاوێك دا ماومەتەوە ، بەڵکو تەنیا گلەییم لەوە هەیە کەهێشتا وادەزانن دەژیم و نەمردووم ، هەروەها لەوەش ناڕەحەت دەبم کە خۆشەویستەکانم بە دوامدا بگەڕێن و بیرم لێبکەنەوە و وابزانن کە لە گۆشەیەکی ئەستەنبووڵدا خۆم بەشتێکی بێهوودەوە خەریك کردووە . هەروەها لەوەش دڵگیر دەبم و ڕۆحم پڕئازار دەبیٚ کە واخەیاڵ بکەن من بەدوای ژنێکی ترەوەم. باتۆزێك زووتر بمدۆزنەوە و نوێژەکەم

بکەن وبمنێژن ! لەوەش گرنگتر با بکوژەکەم بدۆزنەوە . ئەبێ باش لەوە ئاگاداربن کەتا وەکوو ئەو هیچ و پووچە نەدۆزنەوە . هەر چاوەڕێ دەمینمەوە ، تەنانەت ئەگەر لە باشترین مەزاریشدا بمنێژن دیسان بەو چاوەڕوانییەوە دەتلێمەوە و لەنێوانتاندا بێبڕوایی بڵاو دەکەمەوە . ئەگەر ئەو تۆخمە زۆڵەی وامنی کوشتووە بدۆزرێتەوە ، ئەوا منیش باسی ئەوتان بۆ دەکەم کە چیم بینیوە ! بەڵام بە مەرجێك کە لە دوای دۆزینەوە بە مەنگەنە ئەشکەنجەی بدەن و ئێسقانەکانی ورد و هان بکەن ، ئەگەر ئێسقانەکانی سینگی بێت زۆر باشترە ، لەدوایشدا بە شیشی تایبەت سەری کون کون بکەن و تاڵ بە تاڵی قژە پیس و چەورەکەی بهێننە دەرەوە.

بەر لە هەمو شتێك ئەبێ بزانم کە ئەو بکوژەی والە ناکاو منی کوشت کێیە و بوچی وایکرد زۆر نەفرەتی لێدەکەم. بە دوای ئەمانەدا بگەڕێن ، ئێوە دەلێن کە : دونیا پڕ بووە لە بکوژی بێقیمەت ، ها ئەم ، ها ئەویتر؟ ئەگەر وابێ هەر لە ئێستاوە ئاگادارتان دەکەمەوە " کە لە بەرامبەر دین ، هەڵسوکەوتی گشتی و بۆ چوونی دونیاییماندا پەلامارێکی پیس لە ئارادایە .

چاوتان بکەنەوە و بزانن دوژمنانی ئیسلام بۆچی منیان کوشت ، لەوانەیە ڕۆژێك لە ڕۆژان ئێوەش بکوژن . بۆ نموونە ئەمڕۆ یەکە یەکەی قسەکانی مامۆستای گەورەی ئایینی ، مامۆستا "نەسرەتی ئەرزڕومی" دێنەدی. لەوانەیە بتوانین بەسەر هاتەکانمان بنوسینەوە و بیکەین بە کتێب بەڵام هیچ وێنە کیشێك ، تەنانەت مامۆستا گەورەکانیش ، توانای ئەوەیان نییە کە بیانکێشنەوە و بیانکەن بە وێنە . باکەس بەهەڵە لێم تێنەگات ، (هەرچەندە کە بڕوا ناکەم بە هەڵە لێم تێبگەن ) ، ئەمە حاشا ، وەکوو

قورئانی پیرۆزە کە لەبەر چۆنیەتی دروستبوونەکی، هیچ کات هێزە هەمە گیرەکەی لە هیچ تابلۆیەکدا جێی نابێتەوە .

سەیر کەن ، کاتێك کە دەریانهێنام ، سەرەنجم نەدەدایە سەر ڕاستی نێو قووڵاییەکان و ئەو دەنگەی والەو لاوە دەهات و گاڵتەم بەشتیوەها دەهات ، کەچی لە دواییدا ئەنجامەکەم بوو بە بنی چاڵە ئاوێك !چاوتان مەگرن ، لەوانەیە ئەمە بە سەر ئێوەشدا بێت چاوتان باش بکەنەوە لەوانەیە کە ئەگەر بگەنێم ، لە بەر بۆنی لاشەکەم بمدوزنەوە ، بەڵام لە دواییدا هەر فەرامۆشم دەکەن . ئەوەی کە بۆ من دەمێنێتەوە لە بیر کران و خەیاڵی ئەشکەنجەدرانی بکوژەکەم لەلایەن خێر خوازێکەوەیە .

## ((ناوی من ڕەشەیە)) (2)

وەکووئەوەی کە بە دەمی خەوەوە ڕێبکەم ، لە دوای دوانزە ساڵ دووری گەڕابوومەوە جێگای لە دایك بوون و گەورەبوونم ،گەڕابوومەوە بۆ ئەستەمبووڵ . دەڵێن ئەوانەی مەرگ لێیان نزیك دەبێتەوە ، خاكرایا ندەكێشێ ، خاك منیشی كێشابوو . سەرەتا كەڕۆیشتمە ناو شار وامدەزانی كە بە تەنیا مەرگی لێدەبارێ ، بەڵام لە دواییدا تێگەیشتم كە عەشقیشی تێدایە . بەڵام لەو كاتەدا ، عەشق بەقەدەر یادگارییەكانی شارەكەم لەمنەوە دوور بوو ، دوانزە ساڵ بەر لەئێستا، لێرە ، لە ئەستەنبووڵ عاشقی كچە منداڵەكەی پوورم بووبووم لە ماوەی چوار ساڵ دوور كەوتنەوە لە ئەستەمبووڵ لەبەر ئەوەی كە یەك بەیەكی تەپۆڵكە سەوزاوییەكانی ئێران و چیا بەفراوییەكانی دەگەڕام و دەچوومە شارەكانی چارەنووسم و نامەم هەڵئەگرت و بارمتەم كۆدەكردەوە و زۆر خەریك

دەبـووم ، وردە وردە سـيماى خۆشەويسـتە منداڵـە بـە جێماوەكـەم لـە ئەستەنبووڵ لە بيردەچووەوە .دڵە ڕاوكێيـەكى زۆر دايگرتبووم ، زۆر هـەوڵى ئەوەم دەدا كە سيماى لە يادم نەچێتەوە ، بەڵام بڕواتان هـەبێ ، چەندە حەز لە ڕوخسارێكيش بكەن ، كە نەتانبيى ، ئەوا هەرلە بيرتان دەچێتەوە . لەو ساڵانەى لەگەڵ نووسەر و ڕێبوارەكان دا لە خزمەتى پاشاكاندا كارم دەكرد ، ڕوومـەتى خۆشەويسـتێكم لـە خـەياڵى خۆمـدا بەرجەسـتە دەكـردەوە كـە لەگـەڵ ڕوخسـارى خۆشـەويسـتە بەجێماوەكـەم لـە ئەسـتەنبووڵدا يـەكى نـە دەگـرتەوە . ئـەو ڕوومەتەى وا لەشەشەم ساڵى دووريـدا بـە هەڵـە هـاتبووەوە يـادم لەسـاڵى هەشـتەمدا بەشـێوەيەكى تـر هاتـەوە پـێش چاوم . لـە دواى دوانزە سـاڵ دوورى وپـاش گەڕانـەوەم بۆئەستەمبووڵ تەمـەنم بوو بەسـى و پێنچ ساڵ . لەبەر ئەوەى ڕوخسارى خۆشەويستەكەم فەرامۆش كرد بوو ، بەزەييم بە خۆمدا دەهاتەوە .لە ماوەى ئەم دوانزە ساڵەدا زۆرينـەى دۆسـتان و ئاشـنايانى نـاو كۆڵانەكـەمان عـەمرى خودايـان كردبـوو . سـەردانێكى قەبرستانەكەى بەرامبەر (خەليجم) كرد، لە سەر گۆڕى دايكم و مامۆكانم كە والـە نـەبوونى منـدا مردبـوون ، ڕاوەسـتام و دۆعـام بـۆ كـردن . بـۆنى خاكـە قوڕاوييەكـەى قەبرسـتان لەگـەڵ بيرەوەرييەكانمـدا تێكـەڵاو بـوون . نـازانم بۆچـى بـوو ، لــە كــەنارى قەبرەكــەى دايكمــدا گۆزەيــەكيان شـكاندبوو ، تەماشايەكم كرد و دەستم كرد بە گريان . ئەو گريانـە بۆچـى بـوو ؟ لەوانەيـە لـەدواى ئـەو هـەموو سـاڵە هێشـتا وا هەسـتدەكەم كـە لـە سـەرەتاى ژيـانى خۆمدام . يان وەكو لەوانەيە هەست بە كۆتايى هاتنى ژيانم دەكەم . ترووكـە ترووكەيەكى بەفر دەستى پێكردبـوو . خـەياڵم لەگـەڵ دانـە دانـەى بەفرەكـەدا بـەملا وئـەولا دەڕۆيشـت . لـەناو ناديارييـەكانى ژيانـدا ڕێگـاى خـۆمم ون

کردبوو . کەسەرنجم دایەوە ، سەگێکی ڕەش لە گۆشەیەکی قەبرستانەکەوە تەماشای دەکردم . فرمێسکەکانی چاوم ڕاوەستابوون ،لووتم پاکردەوە ، سەگە ڕەشەکە بە نیشانەی دۆستایەتی کلکی لێڕاوەشاندم .قەبرستانەکە م بەجێهێشت و ڕۆیشتم . لە دوایدا ماڵی یەکێك لە خزمەکانی باوکم بە کرێگرت و لەوێ نیشتەجێ بووم . خاوەنی ماڵەکە ژنێك بوو کە کوڕەکەی لەشەڕی عوسمانیەکاندا کوژرابوو ، ژنەکە دەیگوت شێوەی ڕوخساری کوڕەکەی لەهی من چووە . ماڵەکەی بۆ ڕێك و پێك دەکردم وچێشتی بۆ لێدەنام . وامدەزانی کە لە ئەستەنبوولْ دا نیم ، بەڵکو وامدەزانی کە لە یەکێك لە شارە عەرەب نشینەکاندا نیشتەجێبووم . هەر بۆیە مەراقی ئەوەم نەدەکرد کەشارەکە چۆنە . لای خۆم واهەستمدەکرد کە بۆ ماوەیەکی کورت لێرە دەمێنمەوە ، کەوتمەناو کۆڵانەکان ودەستم بە پیاسە کرد . نازانم کۆڵانەکان تە نکتر ببوون ، یان وەکو من وەهام هەستدەکرد ؟ لەناو هەندێك لەو کۆڵانانەدا کەوا خانووەکان بەرامبەر بەیەك وە نزیك لە یەك دروستکرابوون بۆ ئەوەی کە لەگەڵ بار کێشەکاندا لەیەك نەدەین ، پاڵم دەدایە دیوار ەکەوەو ڕێم دەکرد . لەوانەیە هەڵەش بم ، بەلاّم وا هەستمدەکرد کە ڕێژەیدەوڵەمەندەکان زیاتربووون . چەند ئەسپێکی لە خۆبایی چەرخێکیان ڕادەکێشا ، ئەوەندە جوان بوون کە نموونەی ئەوانەم لە عەرەبستان و ئێرانیش نەدیبوو . لای "بەردە گردەکەی " بازاڕی مریشکەکەوە بۆنێکی پیس دەهات . لەنێو ئەو بۆنە پیسەدا چەند لەتە چنێکی جل شڕۆڵەم بینی کەوا قۆڵیان کردبوو بە قۆڵی یەکتریدا وە لە ژێر ئەو بەفرەدا ڕاوەستابوون ، کوێرێکیان تێدابوو کە سەیری بەفرەکەی دەکردو پێدەکەنی ! ئەگەر بیانگووتبایە ئەستەنبووڵی جاران فەقیرتر و

بچوكتر و خۆشتر له ئێستا بوو ، بڕوام نەدەكرد ، دڵم وای هەستدەكرد كە ماڵی خۆشەویستەكەم هەر لەوییێە ، بەلاّم لە جێگای خانووەكەیاندا دار ڕووابوو و كەسانیتری لێبوون . دایكی كچەكە ، یانی پوورم مردبوو. زاواكەشمان دەستی كچەكەی گرتبوو و ڕۆیشتبووكابرای بەردەرگا بە بێئەوەی هەست بەوە بكات كە خەیاڵەكانمی تێكشكاندووە هەموو ئەمانەی پی ٚووتم . لێمگەڕێن باباسی ئەوەتان بۆ بكەم وە ئەوەتان پی ٚبڵێم كە كاتێك چاوم بە پەلی دارەكانی ناو حەوشە كۆنەكە و سەهۆڵەكان دەكەوت كەوا خۆیان بەسەر لێواری بانی ماڵەكەدا شۆڕ كردبووەوە و ڕۆژانی گەرم و شینایی و جوانی هاوینانی ئەم باخچەیەم دەهاتەوە یاد ، مردن لە عەقڵم دا زیندوو دەبووەوە . كاتێك لە تەورێز بووم ، زاواكەمان بە ڕێگای نامەوە باسی بەسەرهاتەكان و مەرگی خزمەكانمی بۆ كردبووم ، هەروەها لەو نامەیەشدا داوای لێكردبووم كە بگەڕێمەوە بۆ ئەستەنبووڵ چونكە خەریكی ئامادە كردنی كتێبێكی نهێنی‌یە وە پێویستی بە هاوكاری‌من هەیە . زاواكەمان لەوە ئاگاداربوو كەمن لە تەورێزدا چەند كتێبێكم بۆ پاشا و فەرمانداران ئامادەكردووە و ڕاسپاردەكانیانم بە جێهێناوە . لە تەورێز بۆ ئەو ڕاسپاردانەی وا دەهاتنە لام پارەی پێشەكیم وەردەگرت و لە دوایشدا بە دەستی خۆشنووس و وێنە كێشە نارِازییەكانی عوسمانی كەوا لە دەستی سەربازو ئەفسەرەكان ڕایاندەكرد و بەرەو قەزوێن و شارەكانیتری ئێران هەڵدەهاتن ، ڕووپەلەكانیم دەنووسی و وێنەكانیم دەكێشا وە ڕەوانەی ئەستەنبووڵم دەكرد . زۆری ئەو ئوستادانە بە دەستی هەژاری و فەقیریەوە دەیاننالاّند و گلەییان لەكەم بەها بوونی خۆیان دەكرد . لەوانەیە ئەگەر لەكاتی جوانیدا كتێبە نەخشینەكەی زاواكەمانم نە

خوێندبایەتەوەکەوا باسی عەشق دەکات ، ئەو کارانەم نەکردبایە . لەسەر کۆڵانەکەی لای خانووە پێشووەکەی زاواکەمان دوکانێکی سەرتاشخانەی لێبوو ، وەستای دەلاك هێشتا هەر لەوێیە ،ئاوێنەکانی جاران و شتەکانی پێشووی بەکاردەهێنا . چاومان بەیەك کەوت ، نازانم منی ناسیوەتەوە یان نا ؟ قاپێکی هەبوو کە ئاوی گەرمی بۆ سەر شۆردن تێدەکرد . زنجیری سەقفی دوکانەکە وەکوو جاران شۆڕ بوو . کە چاوم بەمانە کەوت ، یەکسەر خۆشحاڵ بوومەوە . لەماوەی ئەو دوانزەساڵەی ڕابردوودا زۆرینەی کۆڵانەکانی کاتی لاویم سووتابوون و بووبوون بە خۆڵەکەوە و دووکەڵ و جێگاکانیشیان بووبوون بە شوێنی پاڵکەوتنی سەگ و ئاگری نەخۆشە (جزامییەکان) و مناڵەکانیان پێدەترساندن . لە هەندێك جێگاشدا ماڵی گەورە گەورە دروستکرابوون . کەسانێکی وەکوو من کەلەدوورەوە دەهاتن و چاویان پێدەکەوت سەریان سوڕدەما ، پەنجەرەی هەندێك لەو ماڵانە بە گرانترین جۆری شوشەی ڕەنگاوڕەنگەوە دروستکرابوون . لە ماوەی دوورکەوتنەوەم لەئەستەنبووڵ ،ماڵی گەورەو باڵکونداری زۆریان دروستکردبوو. بەڵام وەکوو زۆربەی شارەکانیتر لە ئەستەمبووڵیشدا پارە بێ بەهابووبوو. لەو ساڵانەی کەوا من بەرەو ڕۆژهەلات دەڕۆیشتم ، ئاکچەیەکت دەدا ، نانێکی گەورەی چوار درهەمیان پێدە دای کەچی ئەمڕۆ سەرەڕای ئەوەی کە تامەکەی لەتامی نانی کاتی منداڵیم ناچێ، هەر ئەو پارەیە نیوەی نانێکیشت بۆ ناکات . ئێستا نرخی دوانزە هێلکە سێ ئاکچەیە ، ئەگەر دایکی خوالێخۆشبووم زیندووبایە دەیگوت : بەر لەوەی کە مریشکەکان لە خۆبایی ببن و ڕیقنەمان بەسەردا بکەن ، هەڵسن بالەم شارە بڕۆین . بەلآم لە ڕاستیداپارەکە لە هەموو جێگایەکدا ئاوەها بێقیمەت بوو

بوو . بەگـوێرەی ئـەوەی کـە خـەڵکی دەیـانگـوت : ئـەو کەشـتیانەی وا لـە فیلامینگ و وەنیزەوە دێن ، پڕن لە پارە . جاران لـە بەرامبـەر سـەد "درهـەم" دا ، پێـنج سـەد ئاچـکە یـان دەبـڕی ، بـەڵام ئێسـتە لـە بـەر ئـەو شـەرە بەردەوامـەی وا لەگـەڵ سـەفەوییەکاندا دەکـرێ ، بـە هەشتسـەد ئاکچـە دەبردرێتـەوە. کـاتێ پـارەی یەنیچـەرییەکان(سـەربازەکانی عوسمـانی) دەکەوتە ناو خەلیجەوە (بەشێکە لـە ئاوەکانی ئەستەنبوڵ) ئەوەندە زووبوو کـە وەکـوو فاسـۆلیای وشـك لـە نـاو ئـاودا مەلـەی دەکـرد ، ئەوسـا "یـەنی چەرییەکان "وەکوو چۆن پـەلاماری سـەری دوژمـن بدەن ئاوەها دەوروبـەری کۆشکی پاشاکانیان دەگـرت . لـەکاتی ئـەمجۆرە بێڕەوشـتیانە و لەمیانـەی ئەم جینایەت و دزییانەدا مەلا سەید نەسرەتی مەلای مزگـەوتی بایـەزیت کـە خـۆی لەنـەوەکانی حـەزرەتی موحەمـەد دەزانـی ، ناوبـانگێکی باشـی دەرکردبـوو . ئـەو مـەلا ئەرزڕوومیـە دەیگـوت :هـۆی سـەرەکی ڕوودانـی ئـەم کارەسـاتە ماڵوێرانکەرانـە و سـووتانی گەڕەکـەکانی "باخچـە قـاپی" و "قـازانجیلا" و هـاتنی وەبـا ،کـە گیـانی هـەزاران کەسـی وەرگرتـووە ،هـەروەهاهۆی ئـەو هـەموو گیانـەی کـەوا لـە شـەڕە بێئەنجامـەکانی دژ بەسەفەویدا بـەختکراون و هۆکـاری سـەرهەڵدانی خاچپەرستانی ڕۆژئاوایی بەرامبـەر قـەڵا بچـکۆلانەکەی عوسمـانی ، دەگەڕێتـەوە بـۆ لاڕێیـی و لادان لـە ڕێگای حەزرەتی موحەمەد و دوورکەوتنەوە لە فەرمانەکانی قورئانی پیرۆز ، هەروەها هۆکارەکەی تریشی بە

ڕوخـۆش بـوون بەرامبـەر خاچپەرسـتان و ڕێگـا پێـدانیان بـۆ شـەراب فرۆشتن و لێدانی مۆسیقا لە قەڵەم دەدا .

کابرایەکی ترشی فرۆش باسی ئەو مەلایەی بۆ کردم وە ئەیگووت : بازاڕ

پڕبووە لەو پارەیەی وا لە دڵ دەچێت و ئاکچەش وەکو جاران باوی نەماوە و زێڕەکەشی کەم کراوەتەوە ، کۆڵانەکان پڕبوون لە چەر کەس و ئابازاری و مینگەری و بۆشناك و گورچی و ئەرمەنی ، لە هەمان کاتدا بێڕەوشتییەکی بێگەڕانەوە بڵاو بۆتەوە ، بێڕەوشتەکان لەگەڵ سەرهەڵداوەکاندا لە قاوەخانەکاندا لە دەوری یەك کۆدەبنەوە وەتا بەیانیان باسی ئەم و ئەو دەکەن و ورتەو بۆڵە دەکەن ، ئەو زۆر قسەکەرانەیوا دیار نیە کە چیدەکەن ، لەگەڵ ئەفیون کێشەکاندا (هیرۆیین) وپاشماوەی قەلەندەرەکان کە خۆیان وەکوو ڕێبوارانی ڕێگای خودا دەبینن ، لە تەکیەکاندا تا بەیانی دەمێننەوە و بە مۆسیقاوە هەڵدەپەڕێن و شیش بەملاو لای یەکتریدا دەکەن وە لە دوای بێئەدەبی جۆراوجۆر ، لەگەڵ خۆیان و کوڕە جوانەکاندا کاری بێڕەوشتانە ئەنجام دەدەن .

نازانم لەوانەیە بە دوای دەنگی شیرین و ڕاکێشەری عوودێکەوە هاتبووبێتم کەوا تووشم لەم پیاوەوەهات . عەقڵم بە یادەوەری و داخوازیەکانی خۆیەوە تێکەڵاو بوو ، بەڵام لە بەرامبەر ژەهری ترشی فروشەکەدا توانای نەما و ڕێگا چارەیەکی پێ نیشاندام . ئەگەر شارەزای شارێك بن زۆر دەگەرێن وخۆشیشتان دەوێ ، تەنانەت لە دوای ساڵاتێکی درێژیش نەك هەر بە تەنها ڕۆحت بەڵکوو سینەشتان ئەیناسێتەوە و لەگەڵ بارینی بەفرەکەدا دەتانباتە سەر تەپۆڵکەیەکی ئەو شارە . بازاڕی ناڵی ئەسپەکانم بە جێهێشت و بەرو سولەیمانییە ڕۆیشتم ، لە وێشەوە لە پاڵ مزگەوتەکەی "خەلیج" دا تەماشای بارینی بەفرم کرد . بەشی ژووری بانەکە ڕووی لە بایە هەر بۆیە بەفری زۆری لێنیشتبوو ، لەم کاتەدا بادبانی کەشتییەکی تازە گەیشتوو پەیتا پەیتا سلاوی لێدەکردم ، ڕەنگی بادبانەکە

له تەمومژێكی ئاڵ دەچوو .دارەكانی چنارو سەرو و دیمە نی سەربانەكان وخۆرئاوابوو نەخەماوییەكەو دەنگە دەنگی گەڕەكی خواروو قیڕە قیڕی دەستفرۆشەكان وئەو منالأنەی وا لە حەوشی مزگەوتەكاندا یاریان دەكرد ، هەموو لە خەیاڵی مندا كۆدەبنەوەو ئەوەم پێدەڵێن كە “ ناتوانی لە شارێكی تردا بژیت و دەبێت هەر لێرەدا بمێنیتەوە . وامزانی ڕوومەتە لەبیر كراوەكەی خۆشەویستەكەم هاتەوە پێش چاوم . لە یاڵەكە هاتمە خوارەوە وە چوومە ناو جەنجاڵەكەوە ، بانگی ئێوارانیان دابوو ، چوومە دوكانێكی جگەر فرۆشی وتێر نانم خوارد ، دوكانێكی چۆڵ بوو، خاوەنەكەی وەكوو ئەوەی كە پشیلەیەك تێربكات ئاوەها بەبەزەییەوە تەماشای پارووەكانی دەكردم . منیش گوێم لێ ڕادەگرت . جێگای قاوە فرۆشییەكەشی پێنیشاندام ، بەو ئیلهامەی كەلەوەوە وەرم گرتبوو كەوتمە ناو كۆلأنێكی پشتی بازاڕی ئەسیرەكانەوە و قاوەخانەكەم دۆزییەوە .

ناوەوەی جەنجاڵ بوو، گەرماییەكەی لەئەوانەی ولأتی ئێرانیەكان دەچوو ، ئەوان لەوێ (بالۆرەوێژ) یان نەبوو ، بەلأم كەسێكیان هەبوو كە پێیان دەگووت : (پەردەدار ). كەسێك لەپشتی ئاگردانەكەدا لە پاڵ دیوارەكەدادادەنیشت بەسەر دیوارەكەشەوە وێنەی سەگێكیان كێشابوو ، كابرا جاروبار ئاوڕی لێدەدایەوە بە زمانی ئەوەوە چیرۆكەكانی دەگێڕایەوە .

## ((من ، سەگ )) (3)

ددانـەكانم زۆر تیـژ و درێـژن ، بـە زۆری لەدەممـدا جێگایـان دەبێتــەوە ، ئەمە ئەبێت بەهۆی ئـەوەی كـەوا ڕوخسـارێكی ترسێنـەرم هـەبێت . بـەڵام مـن حـەزی لێدەكـەم . جارێـك كابرایـەكی قەسـاب تەماشـای ددانـەكانمی كـرد و وتـی : "بـرا ، ئەمـە سـەگ نییـە ، ئـەڵێی بـەرازە " ! هـەر لەبـەر ئـەو قسـەیە

گـازێكی باشـم لێگـرت ، ددانـەكانم گۆشـتە چـەورەكەی قاچـی كـون كـرد و گەیشـتە ئێسـقانەكانی كلـۆكی . خۆشـترین شـت بـۆ سـەگێك ئەوەیـە كـەوا ددانـەكانی بخاتـە نـاو گۆشـتی لاشـەی ئـەو دوژمنـەیوا نـەفرەتی لێـدەكات . هەلێكی باشم بۆ ڕخسا بوو ، قۆربانییە گێژەكەم!بێخەم بێخەم بە بەر دەممدا دەرۆیشـت ، لـە خۆشـیدا بـەر چـاوم ڕەش بـوو ، ددانـەكانم بەدزییـەوە بریقەیـەكیان دایـەوە بەبێئـەوی كـە ئاگـام لێیبـێ ئـەو دەنگـەی وا ئێـوە دەترسێنێ لە قوڕگمەوە دەركەوت .

مـن سـەگێكم ، ئێـوەش لـە بـەر ئـەوی كـە بەئەنـدازەی مـن ئافرێنـدراوێكی ماقووڵ نین ، دەڵێن كە : داخۆ سەگ دەتوانێ قسە بكات؟ وادیارە كە ئێوە بڕواتـان بـە قسـەكردنی مردووەكـان هەیـە و پێێتـان وایـە كـە قارەمانـەكان دەتوانن بە بێئاگاداری وشەی جۆروجۆر بەكار بهێنن .

سـەگەكانیش قسـە دەكـەن ، بـەڵام تـەنیا لەگـەڵ ئەوانـەدا قسـە دەكـەن كـە دەزانن گوێبگرن .

(ساڵێ بوو،ساڵێ نەبوو)* ، زەمانێك بووە كەلە یەكێك لە گەڕەكەكانی كەناری شارەوە مەلایەك هەڵدەستێ و بەرەو مزگەوتێكی گەورەی پایتەخت وەكـوو مزگـەوتی بایـەزیت دەچـێ . لەوانەیـە كـەناوی ڕاسـتەقینەی خـۆی نەگوتبێ ، بەڵام ئیمە دەتوانین بە مەلا ((هوسەرت)) ناوی بەرین .

ئەگـەر درۆم نـەكردبێ ، ئـەم مەلایـە پیـاوێكی سـەرزل و هـیچ نـەزان بـوو بەڵام بەمەیلی خودا ، چەندە مێشكی پڕ بووە لە كا بەهەمان ئەندازەش لە ڕوو نەچوو وزمان درێژ بوو ! هەموو ڕۆژانی هەینی لە مزگەوتدا جەماعەتی دەهێنایـە خرۆشـەوە وە هەموویانیدەگریانـد . ئەوەنـدە دەگریـان تـاوەكو فرمێسك لـە چاویان دەبـرا ، هەنـدێك تێكدەچوون هەندێكیتریش لـە هـۆش

دەچوون . نامەویٚ کەس بە هەڵە لێم تێبگات ، بەلاّم ئەم مەلایە وەکوو مەلاکانیتر خۆشی نەدەگریا ، تا لە دەستی دەهات زیاتر خەڵکی دەگریاند و بۆ خۆشی برژانگەکانی چاوی نەدەجولاّندەوە . وابزانم خەڵك لە کەسێك حەز دەکەن کەوا ئازاریان بدات ، بۆستانجی و حەلاو چییەکان و هەموو ئەو کەسانەی کە کاری سەر پێیی دەکەن لە دەوری ئەو مەلایە کۆبووبوونەوە و بووبوون بە کۆیلەو عەبدی .ئیٚ ! خۆ ئەویش سەگ نیە برا ! بەلاّم ئەمە مرۆڤەو شیری خاوی خواردۆتەوە ، لە بەرامبەر لایەنگرەکانیدا لە خۆبایی بووەو لە خۆدەرچووە . سەیری ئەوەی کردوە کە گریانی خەڵکەکە چەندە خۆش بێت ، ترساندنەکەشیان بە هەمان ئەندازە خۆش دەبێت . لەوەش زیاتر، کەزانیویەتی لەم ڕێگایەوە نانێکی باشی دەستدەکەویٚ پێوانەکانی تێپەڕاندووە . مەلا هوسرەت دەیگوت! هۆکاری سەرەکی گرانی ، وەباو ئەو شکستانەی وا ڕووبەڕوومان دەبێتەوە ، ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کەوا ئێمە ئیسلامەکەی حەزرەتی موحەمەدمان لە بیر چووە و بەناوی ئیسلامەوە ڕوومان لە هەندێك کتێبی تر کردووە . ئایا لە زەمانی حەزرەتی موحەمەدا خوێندنەوەی مەولوودی باو بووە یان نا ؟ ئایا دروستکردن و بەرپاکردنی زیاتر لە چل بۆنەو مەراسیم و بلاّوکردنەوەی حەڵواو شیرینی لەو کاتەدا هەبووەیان نا ؟ ئایا لە کاتی پێغەمبەردا قورئانیان وەکو گۆرانی خوێندۆتەوە ؟ ئایا لەو کاتەدا کەسی وا هەبووە کە بچێتە سەر منارەکە و دەنگی خۆی تاقیبکاتەوە ، یان وەکوو لەبەرخۆوەو بەپێی مەقام بانگدا ئەوەش تەنیا بۆ ئەوەی کە بزانیٚ عەرەبییەکەی چۆنە ؟ چوونە سەر مەزاری مردووەکان و پاڕانەوە داواکردنی هاوکاری کەسێکی مردووە ، ڕەوابووە یان نا ؟ پەت بەستنەوە بەسەر قەبری مردووەکان و بوتپەرستی لەو چەشنە باو

بووه یان نا ؟ لەو کاتەدا زاناو ڕێنیشاندەری تەریقەت هەبوون یان نا ؟ کوڕی عەرەبی مامۆستای هەموو تەریقەتەکان بووە ، ئەم کابرایە وتوویەتی کە فیرعەون بە ئیمانەوە مردووە ، هەر لەبەر ئەمەش تاوانبارە.هەموو ئەو تەریقەتچیوداروو دەستەی مەولەوی وخە لوەتیانەی کە لە لەگەڵ قەلەندەرەرەکاندا بە مۆسیقاوە قورئان دەخوێننەوەو لەگەڵ کوڕی منداڵدا هەڵپەڕکێ دەکەن کافرن . پێویستە تەکیە کان بروخێنین و بنچینە کانیان لە حەوت ئاسماندا لە ناوبەرین و خۆڵە کەی بڕژێنینە ناو ئاوی دەریاوە ، ئەو کاتە دەتوانین لەوێدا نوێژ بکەین . ئەم مەلایە ، ڕینگ و کەفی لە دەم دەهاتە خوارو هار تر دەبوو . دەیگوت"ئەی موسڵمانان :خواردنەوەی قاوە حەرامە ! حەزرەتی موحەممەد گوتوویەتی : لەبەر ئەوەی کە قاوە مێشکی مرۆڤ سڕدەکات و دەبێتە هۆی کون بوونی معیدە و دروست بوونی فیتقی پشت و نازێیی دروست دەکات ، خواردنەوەی قاوە حەرامە، هەروەها گوتوویە کە : قاوە گەمەیەکی شەیتانە . لەوەش زیاتر ئەمڕۆ قاوە خانەکان بوون بە جێگای ئەوانەی وا بە دوای خۆشی خۆیاندا دەچن ، دەوڵەمەندەکان و کەسانی تر لێرەدا بەرەڵایی دەکەن ، هەر بۆیە پێویستە بەر لەوەی کە تەکیەکان بڕوخێندرێن دەرگای ئەم قاوە خانانە دابخرێن . ئایا خەڵکی هەژار و نەدار پارەی خواردنەوەی قاوەی هەیە ؟ کەسی وا هەیە کە دەچێت بۆ قاوە خواردنەوەو سەری گەرم دەبێت و گوێ ڕادەگرێ بۆ قسەی هەموو تووتکە سەگێك و وادەزانێ هەمووشی ڕاست و دروستن . خۆ هەر ئەو سەگانەن کەوا قسە بە دین دەڵێن .

ئەگەر یارمەتیم بدەن ، دەمەوێ وەڵامی دوایین قسەکانی ئەومەلا بەڕێز بدەمەوە. هۆکاری ئەوەی وا داروودەستەی حاجی و مەلا و مامۆستا و ئیمام

حەزلە ئێمەی سەگ ناکەن  بۆ هەموتان دیار و ئاشکرایە . بە گوێرەی من کێشەکە ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی وادەڵێن ، جارێك پشیلەیەك لە سەر چمکی عەباکەی پێغەمبەر نووستبوو ، پێغەمبەریش بۆئەوەی کە پشیلەکە لە خەو هەڵنەستێت چمکی عەباکەی خۆی بڕیوە . پێویستە ئەوە بلێم کەلەگەڵ ئەوەی کە سپڵەیی ونان کوێری ئەم حەیۆانە بۆ هەموان ڕوون و ئاشکرایە، کە چی ئەو هەڵسوکەتەی بەرامبەر ئەوان دەکرێت  بەرامبەر ئێمە  ئە نجامنادرێت ، لەبەر لێکدانەوەی هەڵەو ناڕاستی ئەو مامۆستا ئاینیانەی کە واگووتایەنە : لە بەر شەڕە بێکۆتاییەکانی سەگەکان بەرامبەر پشیلەکان، پێغە مبەر حەزی لە جەماعەتی سەگ نەکردووە،  هەر لە بەر ئەوەش تاوەکوو ئێستا نەیانهێشتووە بچینە ناو حەوشەی مزگەوتەکان و دەڵێن کە دەسنوێژ دەشکێنین و بەدەسکی گسکە درێژەکان لێمان دەدەن .

ئەمەویٚ یەکێك لە جوانترین سورەکانی قورئان ، یعنی سوورەی (کەهف) تان بەبیر بهێنمەوە ، ئەوەش لە بەر ئەوە نییە کەوا لەم قاوەخانە جوانەدا کەسێك لە خوێندوەی کتێب قورئان دوور بیٚ و بیٚکتێب بیٚ ، بەڵکو تەنیا لە بەر ئەوەیە کەوا بە بیرتانی بهێنمەوە .

لەناو ئەم سورەیەدا باس لەحەوت گەنج دەکرێت کەوا لە ژیانی بوتپەرەستی بێزار دەبن و پەنادەبەنە ناو ئەشکەوتێك و لەویٚ بۆ خۆیان دەخەون ، خودای گەورەش هەریەکەو مۆرێك لەگوێیان دەدات و بۆ ماوەی سێسەدونۆ ساڵ دەیانخەوێنیٚ .

کاتێك لە خەو هەڵدەستن ، یەکێك لەوانە دەچێتە ناو شار و تێکەڵاوی مرۆڤەکانی ئەویٚدەبیٚ . بە پارەکەی دەستیەوە کەباوی نەمابوو ئاشکرا دەبێت و پێی دەزانن و سەریان سوور دەمێنی . هەر چەندە کە حەدیشم

نییه، بەڵام دەمەویٚ لەم سوورەیەدا ئەوەتان بەبیر بهێنمەوە کە چۆن مرۆڤ گرێداوی خودای خۆدەمێنێتەوە ،خوداش بە ویستی خۆی تێپەرش بوونی زەمانی بە خەوێکی شیرینەوە پیٚ نیشان دەدات . لەئایەتی هەژدە یەمی ئەو سوورەیەدا باسی سەگێك دەکرێت کەوا لەبەر ئەشکەوتە کەدا خەوتبوو ، ئەوەش شتێکی ئاشکرایە کە کاتێکناوی کەسێك لە قورئاندا باسی لێوە کرابێت ئەو کەسە شانازی پێوەدەکات ، منیش وەکوو سەگێك شانازی بەئەم سوورەیەوە دەکەم وئومێدم لای خودا وایە کە ئەم سوورەییەعەقڵی ئەو ئەرزڕومییانەی وا بە دوژمنانیان دەڵێن تووتکە سەگ دەهێنێتەوە سەر خۆی . ئەگەر وابیٚ ئەو دوژمنایەتیە بۆچی دەبیٚ دستنوێژتان لە ئێمە مانان بشکیٚ ؟ بۆچی کاتێك کە چمکی کەواکەتان بەر ئێمە دەکەویٚ یەکسەر دەیشۆرن ؟ کاتێك کە سەگێك قابلەمەیەك بلێسێتەوە ، یان قابلەمەکە فڕی دەدەن یان وەکوو بەدەستێکی پاك خاوێنی دەکەنەوە ، لەوانەیە بیدەن بە پشیلەیەك کە بیلێسێتەوە . کاتێك کە مرۆڤەکان ژیانی کۆچەرییان بەجێهێشت وە دەستیان لەگۆند و لادیٚ بەردا و بەرەو شارەکان ڕۆیشتن ، سەگەکان دەستەپاچە بوون و بێچارە مانەوە . بەر لە ئێسلام ناوی یەکێك لە مانگەکانی ساڵبەناوی سەگەوە بوو، کەچی دوای هاتنی ئێسلام سەگ بوو بە نەگبەتی و نەهامەتی . هەر چەندە کە من ئەمشەو تووشی خەفەت بووم ، بەڵام لە ڕاستیدا نامەویٚ دوستە ئازیزەکانم دڵگیربن ، من خۆم تەنیا لەوە نارەحەت دەبم کەوا "مەلا ئەفەنی" بە خراپی باسی قاوەخانەکەمان بکات . زۆر حەز دەکەم بزانم کە ئەگەر پێی بڵێم باوکت نادیارە و توخمە زۆڵی چی دەفەرمویٚ ؟ پێیان وتم : تۆ چ جۆرە سەگێکی ؟ چغە! بۆچی زماندرێژی دەکەیت و قسە بە مەلا ئەفەندی دەڵێی ؟ لەوە دەچیٚ کە لەبەر ئەوەی وا

بالۆرە بێژە کە وێنەکەتی بەسەر دیوارەوە هەڵواسیوە و وادەزانی کە دەتپا ڕێزی ، لەخۆبایی بووبی.

حاشا ! وەڵاهی زماندرێژی ناکەم ، خۆتان باش دەزانن کەمن لە سەگ بوونی خۆم و لەوەی وا وێنەکەم لەسەر کاغەزێکی گەورە و هەرزان کێشراوە دڵگیرنیم . من لەوە نارەحەتم کەوا ناتوانم لە قاوەخانەکەدا قاوە بخۆمەوە . ئێمە مانان خەمی قاوەو قاوەخانەکەمان دەخۆین ، کەچی ئەو هیچ ... .

سەیری من بکەن ، وەستاکەم لەناو قاوەدانەکەدا قاوەم پێدەدات . ئاخر بڵێ وێنە چۆن قاوە دەخواتەوە ؟ هیچ مەلێن ، سەیرکەن بزانن ئەو سەگە چۆن ملّق بە ملّق ئاو دەخواتەوە . ئۆی چەندە خۆش بوو! چەندم پێخۆش بوو، گەرمی کردمەوە . چاوەکانمی بریقەدارتر کرد و مێشکمی کردەوە ، سەیرکەن بزانن چی هات بەمێشکمدا .

لۆردی وەنیز (ئیتاڵی) ، دەیان تۆپ پارچەی ئاوڕێشمی چینی و سەدان قاپی جۆراو جۆری بەگوڵیشین نەخشێنراوی بەهەدییە ناردووە بۆ ((نورحەیات سوڵتان)) ی کچی پادشاکەمان . ئەزانن چی تری بۆ ناردووە ؟

سەگێکی فەڕەنسی بۆ ناردووە کەپرچەکانی لە ئاوڕیشم دەچێ و لەپرچەکانی گیانداری سیمڕیش نەرمترە ئەم سەگە زۆر بەناز بوو ، جلێکی سوری ئاوڕیشمی هەبوو کە لەکاتی چەقان وجووتبووندا لەگەڵ سەگی تردا دەرینە دەهێنا . با لە بەینی خۆماندا بێت سەگێکی برادەریخۆم لەگەڵیدا جۆربوو بوو هەربۆیە من باشدەزانم کەچۆن بووە . لەفەڕەنسا هەموو سەگەکان جل لەبەردەکەن . جارێك ژنە ناسکۆڵەیەکی فەڕەنسی چاوی بەسەگێك دەکەوێ کە جلی لەبەردا نەبووە ، ئیدی نازانم لەوانەیە چاوی بەشتی سەگەکە کەوتبێ کە وتوویەتی : هەی ڕۆ لەم سەگە ! خۆ ڕووتە ! و

یەکسـەر دەکـەویٚ و لـەهۆش دەچـیٚ . لـە ولاٌتـی گـاورە فەڕنسـییەکاندا هەرسـەگێك خـاوەنێکی خـۆی هەیـە ، زنجیرێـك دەکەنـە ملـی ئـەم سـەگە بێچارانەو کـۆلاٌن بـە کـۆلاٌن بـەدوای خۆیانـدا ئـەیانگێڕن . لەدوایشـدا بـەزۆر دەیانبەنەوە ناو مالٌ و جێگای خەوی خۆشیانەوە ، لـەوەش خـراپتر ئەوەیـە کەوا ناهێلٌن بۆنی پێستی سەگی تریش بکات و دوو بە دوو پێکـەوە بگـەڕێن . ئەگــەر لەشــەقامەکاندا یــەکتر ببیــنن ، تەنیابــە زنجیرەکــەی ملیانــەوە بەچاوێکی خەماوییەوە لەیەکتر ورد ئەبنەوەو بەس . ئێمەش لـە کۆلاٌنـەکانی ئەسـتانبوولٌدا بەدەسـتەو بەگـەل پێکـەوە دەگـەڕێین . لەهـەر جێگایەکـدا کـە ئارەزوومان لێی بیٚ پرخـەی لێدەدەین وپالٌدەکەوین ، بۆ کویٚکە ویستمان لێی بـوو دەڕۆیـن ، حـەزمان لـە کیٚبیٚ گـازی لێدەگرین . گەرچـی خـۆ ئەمانـە شـتانێك نـین کـەوا عـەقلٌی ئـەو گاورانـە بـڕی پێبکـات . لـە لایەکیتریشـەوە لایـەنگرانی مـەلا ئەرزڕوومییەکـە لەبـەر ئـەوەی کـە دژایـەتی گاورەکـان بکـەن گۆشت فڕیٚ نادەنە ناو کۆلانەکان بۆ ئەوی کە ئێمە بیخۆین ، با بە ڕاشـکاوی ئەوە بهێنمە سەر زمان کە دوژمنی سـەرەکی ئێمـە خـودی گاورەکـانن. هیـوام وایە کاتێك کە ئـەو ڕیسـوایانە ئیعـدام کـران ، بـرای جـەلاد بانگمـان بکـات بـۆ ئەوەی کە ئێمەش چەن پل گۆشت بخۆین. تـاوەکوو ببێـت عێـورەت وپەنـدی لێوەربگردرێـت . لەدوایشــدا ئــەوەتان پێــدەلٌێن کــە خاوەنەکــەی جــارانم ، پیـاوێکی زۆر چـاك وبـە عەدالـٌەت بـوو ، شـەوان دەڕۆیشـتن بـۆ دزی مـن ئەمواڕاند و ئەویش قوڕگیقوربانیەکەی دەبڕی ، بـەم شێوەیە ئیدی دەنگـی لێدەبڕا و نـووزەی لێـوە نـەدەهات ، لەبەرامبـەر کردەوەکـەی منـدا ، گۆشـتی تاوانبەرەکەی دەهەنجنی و دەیکولانـد و دەیـدا بـە مـن . مـن حـەز لـە گۆشـتی خاو ناکەم ، ئەگەر خوا مەیلی بێت ، جەلادەکەی ئەو مەلایەش ئەوەی لە بیر

ناچیٚ ، چوونکە نامەویٚ بە خاوی گۆشتی ئەو پیسە بخۆم و لە دوایدا تووشی زگ ئیٚشە و خراپ بوونی معیدە ببم .

## ((لەدوايد پێم ئەلێن پياو كوژ)) (4)

ئەگەر تۆزێك بەر لەوەی ئەو بوودەلەیە بكوژم بیانگوتبایە كە تۆ كەسێك دەكوژی ، هیچ بڕوام نەدەكرد هەر

بۆیە جارجار كردەوەكەم وەكوو عاربانەیەك دوور دەبێتەوە و دەچێ ، جاری واش هەیە هیچ هەست ناكەم كە كەسێكم كوشتبێ . ئەوە بۆ چوار ڕۆژ دەچێ كە "زەریفی" برای خۆمم كوشتووە تۆزێك پێی ڕاهاتووم .بەر لەوەی ئەو پیاوە بكوژم، زۆر خوازیاری ئەوە بووم كە كێشەكە چارەسەر بكەم ، بەڵام بەزووی تێگەیشتم كە ڕێگا چارەیەكی ترم نییە ، هەر بۆیە ئەو كارەم ئەنجامدا و هەموو بەرپرسیارییەكم گرتە ئەستۆ و لەبەر بوختان و تۆمەتی كابرایەكی بێڕەوشت هەموو كۆمەڵەی وێنەكێشانم خستە مەترسییەكی گەورەوە .

سەرەڕای هەموو شتێك ، ڕاهاتن بە پیاو كوژی شتێكی ئاسان نییە ، لەماڵەوە ئارام ناگرم ، لەدەرەوەشدا ئارام ناگرم ، لەكۆڵانەكانیشدا هەر بەو شێوەیەم ، لەم كۆڵانەوە دەچمە ئەو كۆڵانەكەی تر بەم شێوەیە دەگەمە ئاخرین كۆڵان . كاتێك كە لەگەڵ مرۆڤەكاندا ڕووبەڕوو دەبمەوە ، یەكسەر تێدەگەم كەوا مرۆڤەكان تەنیا لەبەر ئەوەی كەوا هەلێكی باشیان بۆ نەڕەخساوە بۆ ئەوەی كە تاوان ئەنجام بدەن و پیاو كوژی بكەن ، خۆیان بەبێتاوان و دوور لە هەڵە دەزانن .

لەبەر ئەو كێشە بچووكەی كەوا لە ڕووی چارەو شانسەوە تووشم بووە ، هیچ كات ناتوانم بڕوا بەوە بكەم كە مرۆڤەكانی تر لەمن باشترو بەڕەوشتترن

. هەندێك لەوان لەبەرئەوەی وا هێشتا توشی تاوان و ئەنجامدانی پیاو کوژی نەبوون ، خۆیان بە کەسانێکی خاوەن نیازی باش دەبینن و ڕوومەتێکی گەمژەیان هەیە . چوار ڕۆژ دوای ئەوەی ئەو بێچارەیەم کوشت تێگەیشتم کەئەو تیشکەی وا لەڕۆحی مرۆڤەکانەوە دەگەڕێتەوە ڕوخساریان ئەوەم پێنیشاندەدات کە هەموو کەسێك لە ڕۆحی خۆیدا پیاو کوژێکی شاراوەیە و ئەوەشم بۆ ڕوون دەکاتەوە کە تەنیا گێل و گەمژەکان بێتاوانن .

بۆ نموونە : ڕۆیشتمە ناو قاوەخانەکەی پشتی بازاڕی ئەسیرەکەوە و قاوەیەکم خواردەوە ، دەروونمی گەرم کردەوە ، وەکو هەموو کەسێکی تر منیش تەماشایەکی دواوەوەی خۆمم کرد ، وێنەی سەگێکم بە سەر دیوارەکەوە بینی ، دەتگووت کە ئەو چیرۆکمان بۆ دەگێڕێتەوە ، گوێم لە قسەکانی بالۆرە وێژەکە دەگرت و پێدەکەنیم ، لەپڕ چاوم بە پیاوێك کەوت کە لە تەنیشتمەوە دانیشتبوو کە بەباشی سەرنجم دایە نیگای چاوانی ، یەکسەر تێگەیشتم کە ئەویش وەکوو من پیاو کوژە .

هەستەکانیم خوێندەوە ، ئەویش وەکوو من بەقسەی کابرا پێدەکەنی . وەکوو برایەك دەستی خستبووە پاڵ دەستمەوە ، پەنجەکانی لەکاتی هەڵگرتنی پەرداخەکەدا ، زۆر جووڵەیان دەکرد . نازانم خەتای پەنجەکانی بوویان وەکوو لەبەر بێئارامی کابرا وایان دەکرد بەڵام ئاشکرا بوو کەئاسوودە نییە ، ئەویش لەمن دەچوو . لەناکاو گەڕامەوە و سەیرێکی ناوچاوانیم کرد ، یەکسەر ترسا و ڕەنگی تێکچوو ، قاوەکەی دەستی ڕژا .

هەر لەو کاتەداکابرایەکی ناسیاوی هاتە لای وچپاندی بە گوێیەوە و وتی : لایانگرانی "مەلا هوسرەت" هێرش دەکەنە سەر ئەم قاوەخانەیە !

چـاوێكی لێـداگرت و بێـدەنگی كـرد . ئـەو ترسـەی والـە دڵـی ئەوانـدا هەبوومنیشی داگرت .

كـەس بـڕوای بەكەسـیتر نـەبوو ، هەمیشـە چـاوەڕوانی سـووكایەتی وناپیاوی لە كەسی بەرامبەر خۆیەوە دەكرد .

هـەوا سـاردی كـردووە ، بـەفر لـە گۆشـەی كـۆڵان و لـە بـن دیوارەكانـدا جێگـای خـۆی گرتبـوو ، چاوچاو نابینیٚ ، لەم تاریكییە كوێرەدا چاوەكانم ڕێگـا نادۆزنـەوە ، بەهەست ڕێگـای بـەر پـێم دەدۆزمـەوە . لـەو ماڵانـەی كـەوا دەڕابـەكانیان بـاش كێشـاوەتە وە ودەلاقـەكانیان بـە تختـەی ڕەش داگرتـووە دیسـان لـە كـونێكی بچـكۆلانەوە تیشـكی چـرایەكی كـز وّە نیوەگیـان خـۆی ئەدزێتە دەرەوە و لە ناو بەفرەكەدا ڕەنگ ئەداتەوە . زۆر جار هیچ

ڕووناكیوتیشـكێك بـەدی ناكـەم ، جـاری واش هەیـە كـە گـویٚ لـە دەنگـی تێلای پاسەوانەكان دەگرم كاتیٚ كە لە بەردی دەدەن ، ئـەوسـا ڕێگـای خـۆم دەگـرم و دەڕوم ، كاتیٚواش هەیـە لە نیوە شـەوانی كۆڵانـە تـەنـگ و تاریـك وترسـێنەرەكانی شـاردا ، زۆر دەترسـم و واهەسـت دەكـەم كـە تیشـكێكی دەرئاسایی و سەرسوڕ هێنەر لەسینەمەوە دەردەچیٚ و لـەنێوان دارو شـوێنە خراپ بووەكانی شاری ئەستەنبووڵدا تارمایی و خێوی بێخێرم دێنێتە پێش چاوو زۆر جاریش لە ماڵانەوە یان دەنگی منگـەمنگی نائومێدانـەی كەسێك بەر گوێم دەكەویٚ ، یـان وەكـوو دوابـەدوای یـەك دەنگـی كـۆخینی نەخۆشێك دەبیسم ، هەندێك كەس كە لوتیان دەسڕن دەنگیان دەگاتـە نـاو كۆڵانـە كـە ، هەنـدێكیش خـەو دەبیـنن و لـە خـەونەكانیانـدا قسـە دەكـەن ، جارجـاریش هەنـدێك ژن ومێـرد لـە پـێش چـاوی منداڵەكانیانـدا شـەڕ دەكـەن و منداڵەكانیشـیان لـەبـەر ئـەو ئاژاوەیـە تێـر تێـر دەگـرێن و فرمێسـك دەڕێـژن .

ژیانی پڕ لە ئاسوودەیی ودڵخۆشییەکەی خۆمم بەر لە پیاو کوژییە کەم دێتەوە یاد . بۆ کەیف و خۆشی دەرۆیشتم بۆ قاوەخانە و گوێم لەقسەکانی بالۆرە وێژەکە ڕادەگرت . دۆستانی وێنەکێشم کەوا تەمەنێکم لەگەڵیاندا تێپەڕ کرد بوو ، دەهاتن وهەموو شەوێك پێکەوە لە قاوەخانەکەدا دادەنیشتین لە دوای کوشتنی ئەو گەمژەیەی کەوا لە منداڵییەوە پێکەوە بووین و کاری ڕازاندنەوەمان دەکرد ،نەمدەویست هیچ یەك لە هاوڕێکانم ببینم .

برادەرەکانم لەکاتی بەیەك گەیشتنندا دەستیان بە ورتە و بۆڵەدەکرد ، هەر لە بەر ئەوە نەمدەویست کەبیانبینم . بەزمی ئەم سەر گەرمییەڕیسوایە شتانێکی تێدا هەبوو کە بەگوێرەی من نەبوون و دەیانخستمە ناو شەرمەوە ،بۆ ئەوەی کە تانە و تەشەرم لێنەدەن نەڵێن کە لووتی بەرزە  چەن وێنەیەکم بۆ کابرای بالۆرە وێژ کێشا بوو ، بەڵام بۆ بەخیلی بردنەوە هەقیان پێدەدەم ، چوونکە لە تێکەڵاو کردنی ڕەنگ و کێشانی جەدوەلدا و لە هەڵبژاردنی بابەت و کێشانی ڕۆخسارەکاندا هەر وەها لە گونجاندنی جەنجاڵی شەڕ ونێچیر و دانانی حەیوانەکان وپاشاکان  لەگەڵ کەشتی و ئەسپ ومەیدانی شەڕدا لە هەمویان باشتر بووم . لەدروستکردنی وێنەی عاشقان و لە گونجاندنی ڕۆحی شیعر لەناو وێنەکاندا و لە ڕازاندنەوە و جوانکاریدا مامۆستای هەموویان بووم . ئەمانە بۆ لەخۆبایی بوون و لە خۆتاریف کردن باس ناکەم ، بەڵکو بۆ ئەوەیە کە لەمن تێبگەن ، چونکە لەگەڵ تێپەڕ بوونی زەماندا بەخیلی بردنەوە و ڕەنگی وێنەکێشان شتانێکن کە لەژیانی کابرایەکی وێنە کێش جیا ناکرێتەوە . ئێستا کە بەڕێگادا دەچم ، وەکوو جاران دڵتەنگ و نائاسوودە نیم جارناجار چاوم بە نێوچاوانی پاکی

برایەکی دینی دەکەوێت و لەبەر خۆمەوە دەڵێم " ئاخۆ ئەگەر ئێستا بیر لە پیاو کوژی بکەمەوە تێدەگات کە من پیاو کوژم ؟ هەر لە بەر ئەوەش یەکسەر بیر لە شتانی تر دەکەمەوە ، وەکو چۆن لە نوێژکردنی کاتی جوانیدا بیرم لە ژنی جوان دەکردەوە وە بە شەرمێکی زۆرەوە بەخۆمدا دەچومەوە . ئێستا خراپەیی و پیاو کوژی خۆمم لەبیر دەبەمەوە ، بەلاّم ئەوسا هەرگیز ژنە جوانەکانم لەبیر نەدەچووەوە . ئەو شتانە کەوا باسی دەکەم پەیوەندی بەمنەوە هەیە . ئەگەر شتێکم بە خەیاڵدا بێت ئێوە یەکسەر تێدەگەن ، ئەمەش دەبێت بە هۆی ئەوەی کە من وەکوو بکوژێکی نادیار و ناسراو نەمێنمەوە و بناسرێم و بە دەستەوە بدرێم و لە دواشیدا سەرم بتاشن دادکاییم بکەن . یارمەتیم بدەن با هەمو شتێکتان بۆ نەدرکێنم وهەندێکیش بۆ خۆم بهێڵمەوە ، چونکە کەسانێکی وەکوو ئێوە کە خاوەنی ڕۆحێکی ناسك و هەستتەوەرن ، دەیانەوێت وەکوو گەڕان بەدوایشوێنە پێیەکدا بە ڕێگای وشەو ڕەنگەکانمەوە بێن و بمدۆزنەوە . ئەوەش دەمانهێنێتەوە سەر ئەو شێوازەی وا ئەمڕۆ باوە، ئایا هەر وێنە کیشێك بە پێی پرەنسیپە کانی خۆی خاوەنی دەنگ و ڕەنگێکی تایبەتە ؟ بۆ نمونە با باسی وێنەکەی پیروگەورەی ئوستادەکان و مامۆستای ڕازاندنەوە وەستا بەهزاد بکەین ، ئەو وێنەیە وێنەی تاوان وپیاوکوژی وخراپە کارییە هەر بۆیە لەگەڵ وەزعی مندا باش دەگونجێت . باسی شازادەیەکی ئێرانی دەکات کەوا لە شەڕی دەسەلاّتدا گیانی خۆی لە دەست دەدات .چوومە ناو کتێبخانەکە وبەسەرهاتی خەسرە وشیرینم دوزییەوە کە نەوەد ساڵبەر لە ئێستا بە دەستیهەراتییەکاندزوستکرابوو. شایانی باسە کە ئەمە کتێبەکەی "فیردەوسی" نییە بەڵکو نوسراوەکەی "نیزامییە" . هەر دوو دڵدارەکە

لە دوای بە سەر هاتێکیسەخت و دژوار دەگەنە یەك ، خەسرەو لە یەکەم ژنـی خـۆی کـوڕێکی بـە نـاوی ((شـیرویە)) هـەبوو کـە لـە شـێتان دەچـوو ، شیرویە چاوی بڕیبووە تـەختی دەسـەڵات وژنەکـەی بـاوکی . نیزامـی دەڵـی : بۆنی دەمی ئەم کوڕە وەکوو هی شێر پیس بوو .

ڕێگەیەکی دۆزییەوە و باوکی ئەسیر کرد و دەسەڵاتی گرتە دەستی خۆی . شەوێك ڕۆیشتە ناو ژووری خەوی باوکییەوە و ڕۆیشتە سەر سەری باوکی و خنجەرەکەی دەرهێنا جەرگی باوکی بڕی . خوێنی باوکی تا بەیانی دەڕژا و وردە وردە گیـانی لـە دەسـتدا ، شـیرینیش بەئاسـودەییەوە لـە پاڵیـدا خـەوتبوو . وێنەکـەی ماموٚستا بـەهزادیش وەکـوو ئـەم چیروکە ، ترسـێکی گـەورەی لـە خـۆدا حەشـاردا بـوو، وابـیر بکەنـەوە کـە لـە تاریکـایی شـەودا هەڵدەسـتیٚ ، چـاو چـاو نـابینیٚ ، ترسـی ئـەوەی کـە کەسـێکی تـر لـە نـاو ژوورەکـەدا بـیٚ لـە دڵـت دەنیشـیٚ ، ئـەو کەسـە بـە دەسـتێکی خـۆی قـورگی ئێـوەی گرتبیٚوبـە دەسـتەکەی تریشـی خەنجـەرێك ، ئـای کـە ترسـناکە ! وەستایەکی باش دیوارەکی دروستکردووە ، چوارچێوەی پەنجەرەکان زۆر جوان دروستکراون ، ڕەنگیقیرە بێدەنگەکەی قوڕگە گوشراوەکان لە ڕەنگی قاڵییە سورەکە دەچێت ، پیاوکوژەکە بە پێی پەتییەوە دێتە سەر لێفەکانتان و دێـت بـۆ ئـەوەی بتـانکوژیٚ ، لیّفەکـە گـوڵی زەرد و جـوانی پێوەیـە ، لـە لایەکەوە جوانی ڕەسمەکە دەبینی و لەلایەکیتریشەوە ئەو ژوورەی کە تێیدا دەمری ، یەکسەر جوانی ئەو دونیایەت بەخەیاڵدا دێت کەوا بەجێی دێڵی! بەڵام جوانی دونیا و جوانی وێنەکە ، هەقیان بە سەر مردنی تۆوە نییە . تەنانەت ئەگەر لە کاتیٚمردنیشدا ژنەکەشت لەژوور سەر تەوە بێت ، دیسان هەست بـە تـەنیایی دەکـەیت . بـەڵام کاتێـك کـە تەماشـای وێنەکەدەکـەی ،

یەکەم شت واتاکەیە کەوا بەخەیاڵتا دێت ! بیست ساڵ بەر لە ئێستا ئوستادێکی پیر بەدەستە لەرزۆکەکەی خۆیەوە ئەم کتێبەی وەرگرت و گوتی ئەمە هی بەهزادە، بەڵام ئیمزای پێوە نەبوو !

بەهزاد خۆشی دەیزانی کە ئیمزای لێنەدراوە . وستا پیرەکە دەیگوت : بەهزاد لە بەر شەرم و تووڕەیی ئەم ئیمزایەی نەکردووە . هۆنەری ڕاستەقینە ئەوەیە کە بتوانیٚ شتێکی دەگمەن بکێشی و ناسنامەو شوێنە دەستی خۆتی پێوە نەنییٚ.

قوربانیەکە هوڵی گیانی خۆی لێهاتبوو ، گرتم و بە شێوەیەکی زۆر خراپ کوشتم، بۆ ئەوەی کە دڵنیا بم هیچ شوێنە دەستێکم بە جێنەهێشتووە هەمو شەوێك سەردانی جێی ئاگرەکەم دەکرد . بەڵام وردە وردە بیرم لە کەموکوڕییەکانی خۆم لەبارەی شێوازەوە کردەوە ، ئەو شتەی کە بەشێواز ناوی دەبەن هەر ئەوەیە کە شوێنە دەستمان دەدۆزێتەوە . ئەگەر ڕۆشنایی بەفرەکەش نەبایە دیسان هەر ئەم جێگایەم دەدۆزییەوە، لێرەدا کەسێکم کوشتبوو کەوا بیست وپێنج ساڵ هاوڕێم بوو . بەفر هەمو ئەو شتانەی کەوا ببێت بە شێواز و ئیمزای من سڕیبووەوە ئەمەش ئەوە دەسەلمێنیٚ کەوا خوداش لە بارەی شێواز و ئیمزاوە وەکوو من و وەستا بەهزاد بیر دەکاتەوە . چوار ڕۆژ بەر لە ئێستا ئەو بیٚعەقڵە دەیگوت ! ئەمە تاوانێکی گەورەیە ، ئەگەر ئاگامان لێنەبایە خودا ڕەحمی بە کۆمەڵگای وێنەکێشان نەدەکرد . ئەو شەوەی کە لەگەڵ زەریف ئەفەندیدا هاتبووینە جێگا سووتاوەکە ، هێشتا بەفر دەستی پێنەکردبوو ، دەنگی لورە لوری سەگێکمان لە دوورەوە دەبیست ، وتی بۆچی هاتووین بۆ ئێرە ؟ ئەتەویٚ چیم پیٚ نیشان بدەی ؟ وتم ! ئەوە چاڵە ئاوەکەیە ، دوو هەنگاو لەولاتریش پارەکەم تێدا

شاردۆتەوە ، ئەگەر قسە بۆ کەس نەکەی زۆرخۆشحاڵ دەبم . بەدەستە پاچەییەوە وتی : کەواتە لەپێشدا دەتزانی کەچیدەکەی ؟ بە درۆیەکەوە وتم:بەڵێ دەمزانی . وتی : ئەزانی ئەو وێنەیەی کە کێشاوتە ، تاوانێکی گەورەی تێدایە ؟ کوفرێکە و کەس جەسارەتی ئەنجامدانی ئەوەی نییە ، لە ئاگری دۆزەخدا دەسووتی ، منیشت کرد بە شەریکی خۆت . کاتێ کە ئەمانەم بیست ترسێکی زۆرم لێنیشت.

لە بەر چی هەموو کەس بڕوای پێدەکرد ؟ چونکە ئەم قسانە هێزێکی ڕاکێشەری تایبەت بە خۆی هەیە و بتەوێ و نەتەوێ ، هەر ڕاتدەکێشێ . لەملا و لەولا لەسەر کتێبە شاراوەکەی زاوا و ئەو پارەیەی کەوا دەیدا قسەی زۆر دەکرا ، وەستا عوسمانی سەرۆکی وێنەکێشانیش نەفرەتی لێدەکرد ، ئەو تۆمەتانەی کەوا هاوڕێکەم لەزاوای دەدا ، شتانێکی ڕاست بوون ، بەڵام ئاخۆ چەندە پاکی و یەکڕەنگی دۆستانەی تێدا بوو ؟ ئەوەم بۆ دوپاتکردەوە کەوا هەندێك لە قسەکانی دەبنە بە هۆی ناکۆکی و دووبەرەکی وجیاوازیمان، قسەیەکی برد و هێنا، بەڵام ...

نەیتوانی بیکات!

دەتگوت دەورانی شاگردیمانە و دەیەوێ خراپەکارییەکی من لە وەستا عوسمان بشارێتەوە ، چاوەکانی زەق کرد بوو ، ئەو کاتە بڕوام دەکرد کە قسەکانی لە ڕووی دڵسۆزییەوە بێت ، بەڵام لە ڕاستیدا هیچ کات نەمدەویست کە حەزی لێبکەم ، چونکە هەمو شتێکی بۆ هەر کەسێك دەگێرایەوە . وتم : بەو بێ شەرمییانەتەوە ناچاری هەندێك شتی خراپم مەکە ، جوانکاری دەکین ، کەنارەکان دەڕازێنینەوە جەدوەل دەر دەخەین ، ڕوپەلەکان زێراوی دەکین، وێنەی جوان دەکێشین ، ئەوە ساڵانێکی درێژە

کەوا ڕاسیاردە وەردەگرین و جێبەجێی دەکەین، پێمان دەڵێن : وێنەی شا ، ئاسك یان کەشتییەکە ئاوەها یان بە شێوەیەکی‌تر دانێ، ئەم جارەش زاوای بەڕێز گوتی : لە ناو ئەمانەدا وێنەی ئەسپێك بکێشە . سێ ڕۆژ خەریکی وێنە کێشان بووم ،وەکوو ئوستادێکی کۆنە کار ، سەدان جار لە سەر لاپەڕەی سەمەرقەندی وێنەی ئەسپێکم کێشا و لێیورد بوومەوە کەچی تێنەگەیشتم واتاکەی چییە . لە ژێر کزە بای مانگە شەوێکدا لێیوەرگرتم و لە بەر ڕۆشنایی مانگە شەوەکەدا تەماشای کرد.

وتم : ئوستادەکانی "شیراز و هەرات" دەلێن : بۆ ئەوەی کە بتوانی وێنەی ئەسپێك بکێشی ، پێویستە پەنجا ساڵ وێنەی بکێشی و لە دوایشدا لە ژێر تاریکایی شەودا ئەو وێنەیە بکێشی . چونکە لە دوای پەنجا ساڵ پیاو کوێرایی دادێ و دەستی بە کێشانی ئەسپەکە ڕادێ . چاوەکانی وەکوو کاتی منداڵی پاك و بێگەرد بوون ، سەرنجی دابووە سەر وێنەکان . وتم : وێنەیەکمان پێڕادەسپێرن و دەڵێن : ئەسپێکمان بۆ بکێشن ، ئێمەش وەکوو ئوستادێکی کۆنە کار وێنەکە بە هەموو جوانی و نهێنییەکانیەوە دەکێشین ، لە دواییدا کەس مافی ئەوەی نییە کە ئێمە تاوانبار بکات . وتی : نازانم ، ئەمە ڕاستە یان نا ؟ " بەڵام ئێمەش بەر پرسیارین و ئیرادەی تایبەت بە خۆمان هەیە ، من لە خوا زیاتر لە کەس ناترسم و ئەویش بۆ دۆزینەوە ڕاستی و ناڕا ستی مێشکی پێداوین " . وەڵامەکەی لەجێی خۆیدا بوو ، بە عەرەبی وتم : خوا هەمو شتێك دەبینێ و ئاگاداری هەر شتێکە، ئەزانێ کە من و تۆش ئەم کارەمان بە نەزانی کردوە . حەزرەتی پادشا لە پشتی ئەم کارەوەیە ، تۆ ڕاپورتی زاوا بەکێی دەدەی ؟ بێدەنگ بووم ، لە بەر خۆمەوە بیرم کردەوە و وتم : ئایا بەراستی مێشکی ئەم کابرا کای تێدایە،

یان وەکوو لە بەر ترسی خودا خوێنساردی خۆی لە دەستداوە و شتی هەڵەچە و پەڵەچە دەڵێ ؟

لە پاڵ چاڵە ئاوەکەدا ڕاوەستا بووین ، چاوم بە چاوەکانی‌دا هەڵتۆقی یەکسەر زانیم کە ترساوە . بەزەییم پێدا هاتەوە ، بە لام کار لە کار ترازا بوو ، بۆ ئەوەی بتوانم بسەلمێنم کە ئەم پیاوە ترسەنۆکە کەسێکی ڕیسوایە دوعایەکی زۆرم کرد . وتم : دوانزە هەنگاو بژمێرە و زەوییەکە هەڵکۆڵە . وتی : ئەی دوایی چیدەکەین ؟

وتم : چارەمان نیە ، بە زاواکەمان دەڵێم کە وێنەکەمان بسوتێنێ ، ئەگەر جەماعەتێ "مەلا هوسرەت" پێمان بزانن ، لە ناومان دەبەن و وێنەکێشخانەکەش دادەخەن ، کەسیان لێدەناسی ؟ ئێستا ئەو پارەیەم لێوەربگرە تا وەکوو دڵنیا بم باسی ئێمە لای ئەوان ناکەی . وتی : پارەکە لەناو چیدایە ؟ . وتم : گۆزەیەکی کۆنی ترشی لەوێیە ، حەفتا ئاڵتونی" وەنیزی" تێدایە .نازانم چۆن ئەم گۆزەیەم بەعەقڵدا هات . بە ڵام شتێکی وامگوت کەیەکسەر بڕوای کرد ، یەك بە دوای یەك دەستی بە ژماردنی هەنگاوەکان کرد. بەمجورەش زانیم کە خودا لەگەڵ مندایە.

ئەم دوستەی کاتی شاگردیم زۆر تەما کار بوو ، دوانزە هەنگاوەکە هاتەوە یادم ، ژێر خۆڵکە ، ئاڵتون و ماڵتونی تیدا نەبوو ، ئەگەر پارەم پێنەدابایە بەدبەختی دەکردین ، لە پڕ ویستم وەکوو دەورانی شاگردی باوەشی پێدابکەم و ماچی بکەم . بەلام سالان لەیەکتری دوری کردبووینەوە ، ئەی باشە خۆڵەکە بە چی هەڵەکە نین ، بە نینۆك ! ئەمانە هەموی لە چاو تروکانێکدا هات بە مێشکمدا . هێشتا نەگەیشتبوە

هەنگاوی‌هەشتەم کەبەردێکی گەورەم لە پاڵچاڵە ئاوەکەدا هەڵگرت و بەڕا کردن پێی گەیشتم و بەهەر دوو دەستم بەردەکەم بەسەری‌دا دا.

ئەوەندە بە قورسایی لێمدا کەوامزانی لە سەری خۆمم داوە ، بەزەییم پێدا هاتەوە بەڵام دەمویست کەکاری

تەواو بکەم . چونکە لەزەویدا دەستی بە لەرزە لەرز کرد بوو ، کیێ بێت هەروا دەکەوێتە ناو خرۆش وهەڵچوونە وە ! ماوەیەکی بەسەردا چوو ، لەدوای ئەوەی کە خستمە ناو چاڵە ئاوەکە ، تازە تێگەیشتم کارێکم کردووە کە شایستە و شیاوی کابرایەکی وێنەکێش نەبووە

## ((من زاواکەتانم))(5)

من زاوا بەرێزەکەی ڕەشەم ، خەڵکیتریش هەر بەکاکی زاوا بانگم دەکەن ، کاتی خۆی دایکی ڕەشەش دەیویست کوڕەکەی وەها بانگم بکات . سیێ ساڵ بەر لە ئێستا ، کاتیك کە ڕەشە هاتوچۆی ماڵی ئێمەی دەکرد خانوەکەمان لە پشتی کۆشکی سپییەوە لە ژێر سێبەری دارەکاندا بوو ، هاوینان ، کە من و مەحمود پاشا دەڕۆیشتین بۆ سەفەر ڕەشە و دایکی دەهاتنە ماڵی ئێمە و لەویێ دەمانەوە . دایکەخوا لێخۆشبووەکەی ڕەشە خوشکی گەورەی هاوسەرەکەی من بوو . زستانان کە دەگەڕامەوە بۆ ماڵ

دەمبینی کە دایکی ڕەشە و ژنەکەی من باوەشیان کرد بوو بە یەکا و دەگریان ، دیار بوو کە دەردی دڵیان پێکەوە کرد بوو . باوکی ڕەشە پیاوێکی تووڕە و بەد خوو بوو ، نەیدەتوانی لە هیچ قوتابخانەیەکدا وانە بڵێتەوە ، ڕەشە لە منداڵیدا تەماشای دەمی دایکی دەکرد ، بگریایە ، دەگریا ، پێبکەنیبایە پێدەکەنی ، بێدەنگبایە بێدەنگ دەبوو ، هەر چی بکردایە ئەویش دەیکرد و بە ترسێکەوە تەماشای من ، واتا زاوا کەیانی دەکرد .

ئێستا زۆر خۆشنوودم لەوەی کەوا دەبینم بووە بە پیاوێکی خاوەن بڕیار و گەورە بووە ڕێزی هەیە . ڕێزیکی زۆر لە من دەگرێ ، دەستەکانم ماچ دەکا و خەڵاتم بۆ دێنێ جامۆلکەی مەغوولیم بۆ دێنێ و دەڵێ :"ئەمە تەنیا بۆ مورەکەبە سورەکەیە " ، لە بەرامبەرمندا چوار مشقی دەدا و ڕێك وپێك دادەنیشێ . ئەمانە تەنیا شتانێك نین کەوا ئەو دەیەوێت ، بەڵکو شتانێکیشن کەوا منیش دەمویست پێیان بگەم . شێوەی ڕۆخساری لە هی باوکی دەچوو ، باڵابەرزەکەی و دەستە پڕجموجوڵەکەی هەر وەکوو هی باوکی بوو ، دەستی دەخستە بەر ئەژنۆی وکاتێك کە من شتێکم دەگوت ،دەیگوت : تێگەیشتم ، گوێم لێتانە ، بەدڵەوە تەماشای نێو چاوانی منی دەکرد و بە گوێرەی قسەکانی من سەری دەلەقاند . کوڕێکیقورس و لەسەر خۆ بوو . تەمەنێکم تێپەڕ کرد بەڵام تازە تێدەگەم کە ڕێزی ڕاستەقینە لە دڵەوە نییە ، بەڵکو لەم سەردانەواندنانە دایە !

دایکی لەبەر ئەوەی کە دەیزانی داهاتووی کوڕەکەی لە چارەی ماڵی ئێمەدایە،بە بەهانەی جۆرا و جۆرەوە دەهێنایە ماڵی ئیمە . لەو ساڵانەدا تێگەیشتم کە حەز لە خوێندنەوەی کتێب دەکات ، هەر ئەمەش بوو بە هۆی ئەوەی کەوا زیاتر لێی نزیك ببمەوە . خەڵکیش دەیانگوت : ڕەشە

بووه بەشاگردی کاکی زاوا "باسی وێنەی" ئاسۆ لە ژوورەوم بۆ دەکرد کە بە دەستی ئوستادە شیرازییەکان وبەپێی نەریتی تازە کێشرا بوون . هەر وەها باسی ئەوەشم بۆ دەکرد کە زۆر کەس وێنەی مەجنونی شەیدا وسەر شێتان کێشاوە کەوا لە بەر عەشقی لەیلا عەقڵی لە دەستداوە ڕووی کردۆتە دەشت و سەحرا ، هەر وەها تاریفی وێنەکەی بەهزادم بۆ دەکردکەوا چۆن مەجنونی لەکاتی تووڕەیی و چێشت لێناندا کێشاوە و چۆنیەتی هەستەکانی مەجنون لەکاتی سیحرەکاندا و لەنێو ژنە جوانەکاندا ڕنگاوی کردووە. هەروەها پێکەنیناوی بوونی وێنەی ئەو وێنە کێشانەم بۆ دەکرد کەوا بە بیٚخوێندنەوەی هۆنراوەکانی "نیزامی" وێنەی خەسرەو شیرین یان کێشا بوو . دیارە ئەو وێنەکێشانەی کە بە بیٚویست و بیٚخوێندنەوەی بابەتەکان وێنەدەکێشن تەنیا بۆ پارە کار دەکەن . ئێستا باش دەزانم کە ڕەشە پیاوێکی ئاگایە و دەزانیٚ کە بۆ ئەوەی دڵی مروۆ لە هونەر و وێنەکێشی نەئێشی ، پێویستە وەکوو پیشە چاو لە هونەر نەکات و بۆ پەیدا کردنی پارە و دەسەڵات ڕێگای‌تر بدۆزیتەوە ، بۆ ئەوەی کە کاتیٚ بە هاو بایەخی پێویستیٚ بەرامبەر هۆنەرەکەی نەبینی تووڕە و دڵنگەران نەبیٚ.ئەو ویٚنە کیٚشانەی وامن دەیانناسم و وێنەیان بۆ دەوڵەمەندەکانی "ئەستەنبووڵ" و "تاشرا" دەکێشا، ئێستا لەتەورێزدا لە هەژاری و نائومێدیدا ژیان دەبەنە سەر ، ئەوانەی مەشهەدیش هەر ئاوەهان. ئەڵێن : وێنە کێشانی حەڵەب لە بەر هەژاری ونەداری دەستیان لە دروستکردنی کتێب بەر داوە و خەریکی‌دروستکردنی وێنەی یە کرپەلی و کێشانی وێنەی سەیر وسەمەڕە و ڕووت وقووت بۆ گەشتیارانی فەرەنسەیین.

بە گوێرەی ئەو شتانەی کەوا من بیستوومە کتێبەکەی شا عەباس کەوا لە کاتی پەیمانی ئاشتیدا دایبوو بە پادشا کەی خۆمان ، هەرلە ئێستاوە پەڕوپووت کراوە وروپەلەکانی بۆ دروستکردنی کتێبی‌تر بەکار دەبرێ . "ئەکبەر خانی" پاشای هێند ، دەیەوێ کتێبێکی تازە و گەورە دروستبکات و بۆ ئەوەش پارەیەکی زۆر دەدات ، هەر بۆیە زۆربەی وێنەکێش و خۆشنووسەکانی تەورێز و قەزوێن و کارەکانی خۆیانیان بەجێهێشتوە و بەر و کۆشکی ئەو شایە بە ڕێکەوتوون .

ڕەشە لە نێوان قسەکانی خۆیدا جار وبار چیرۆکی خۆشی بۆ دەگێڕامەوە ، بۆ نمونە بەسەر هاتی "مەهدی" درۆینە و ئەو شازادە گەمژەیەی بۆ دەکردم کەوا سەفەوییەکان بۆ بەر قەرار بوونی ئاشتی لە نێوان خۆیان و ئۆزبەکەکاندا تەسلیمی ئۆزبەکەکانیان کرد بوو ، هەر وەها باسی ئەوەشی بۆ دەکردم کە ئەو پیاوە گەمژە چۆن هەوڵی ڕزگار کردنی خۆی دەدات ودواییش لە ئاگردانەکەدا دەسووتێندرێ . لەگەڵ ئەمانەشدا ڕووی لە من دەکرد و پێدەکەنی ، بەڵام هێشتا لە سێبەری نیگاکانیدا ، هەستم بەو مەسەلە قورسەی دەکرد وا هەردوومانی دەترسان و باس کردنیشی ئاسان نییە . وەکوو ئەوانەی وا شتانێك لەبارەی ئێمەوە دەزانن و هات وچۆی ماڵی ئێمە دەکەن ، ئەویش عاشقی تاقە کچە جوانکیلەکەم بوو بوو . شەکورەی کچم زۆر جوان بوو، ئەوەندە جوان بوو کە خەڵك لە تاریف کردنەکەشییەوە عاشقی دەبوون ، ئەمەش لە ڕوانگە ی منەوە شتێکی مەترسیدار نەبوو. بەڵام ڕەشە هاتووچۆی ماڵی ئێمەی دەکرد، بەڕێزو گەرمییەوە پێشوازی لێدەکرا، بۆقسە کردن لە گەڵ شەکورەدا هەلی گونجاوی دەستدەکەوت ،ئەمەش خۆی لە دواییدا دەبوو بە هۆی

دروستبوونی عەشقێکی بە هێز و بیٚئومێد. لە دوایشدا ئەوەی وا لیی دەترسام هەر تووشم بوو و کوڕ عەشقەکەی لە دڵی خۆیدا پێڕانەگیرا و لە بەرامبەر کچەکەمدا ڕاگەیاند . هەر لە بەر ئەو کارە خراپەشی ڕێگای هاتووچۆی ماڵی ئێمەی لێبڕا . سیٚساڵ دوای ئەوەی کە ئەستەنبۆڵی بە جیٚهێشتبوو ، کچەکەم لە گەڵ ئەفسەرێکی سوپادا زەماوەنی کرد و مێردی پیٚ کرد . ئەم شەڕکەرە سوپاییە ، بەر پێی خۆی نەدەبینی و عەقڵی دوومەتەرە لە زەوی بەرزتر بوو . دووکوڕی لە کچەکەم هەبوو ، لە دواییدا ڕۆیی بۆ سەفەر وئێستاش ئەوە بۆ چوار ساڵ دەچێت کە نەگەڕاوەتەوە . لە بەر ئەوەی کە وا قسەو باسەکان زووزوو بڵاو دەبنەوە ، پێموایە کە ڕەشەش ئاگاداری ئەم بابەتەیە . ئەوە دووساڵە کە کچەکەم لەگەڵ منداڵەکانیدا گەڕاوەتەوە بۆ ماڵی خۆمان . ڕەشە سەیری مێزەکەی دەکرد و تەماشای (کتابالروح ) ی دەکرد ، بەلاٚم لە ڕاستیدا عەقڵی لەلای دەنگەدەنگی منداڵەکانەوە بوو . ئەم خانووەم لە کاتی نەبوونی ڕەشەدادروستکردبوو ، بەلاٚم ئەو وەکوو گەنجێکی هەستیار و بە توانا کە دەیەویٚ ببیٚ بە خاوەنی پارە و ڕێزداری و متمانەیی هیچ پرسیارێکی لەم بارەیەوە نەکرد . هێشتا نەهاتبووینە ناو ماڵەوە کە لە سەر پلیکانەکاندا پێم گوتبوو : قاتی دوو وشکە و بۆ ئازاری پشتم زۆر باشە . بەلاٚم لە بەر ئەم قسەیەی خۆم تەریق بووبوومەوە ، خۆی لە ڕاستیشدا ئێستاکانە هەموو کەسێك ماڵی دوو قات دروستدەکات . ئێمە زستانان ژووری وێنەکێشیمان بەکار دەهێنا ، ڕەشە هەستی بەوە کرد بوو کە شەکورە لە ژووری دواییدا دادەنیشیٚ . لەو نامەیەی کەوا بۆم نارد بوو ، هۆی بانگهێشت کردنەکەم بۆ شیکردبووەوە ، بۆیە یەکسەر کەوتمە ناو بابەتەکەوە و گوتم : منیش دەمەویٚ وەکوو

وێنەکێش و خۆشنووسانی تەورێز کتێبێك ئامادە بکەم . ئەو کتێبەی وا بە تۆی ڕادەسپێرم هی پاشای جیهانە(و:مەبەست پادشای عوسمانییەکانە ) ، لەبەر ئەوەی کە کتێبە کە نهێنی یە پادشا خۆی لە خەزێنەکەی گشتی هەندێ پارەی پێداوم . منیش لەگەڵ هەموو ئوستادەکانی وێنەکێشخانەی شاهیدا قسەم کردووە و پێمگوتوون کە هەندێکیان وێنەی سەگ وهەندێکیش نەخشی دار بکێشن و کەسانێکیشم بۆ ڕازاندنەوەی کەنارەکان و کێشانی وێنەی هەوری سەر ئاسۆ و ئەسپ ڕاسپاردووە .

ئەوەی وا دەمویست بیکێشم ، شتێك بوو لە وێنەی ئەوانەی وا "وەنیز " یەکان دەیانکێشا ، دەبوایە هەمووجیهانی پادشاکامانی لە خۆ بگرتایە . ئەو جیهانە وەکو هی ئەوان دونیای ماڵ و موڵکی پادشا نەبوو ، بەڵکو دونیای ترس و خۆشیەکانی پادشاکەمان بوو .

بۆ ئەوەی نرخی پارەکەم بکەینەوە ، وێنەیەکمان بە بچووکی کێشابوو ، جندۆکە و شەیتانیشمان تێدا دروستکردبوو ، چوونکە لێیان دەترساین ! بەڵام ئەوەی ڕاستی بێ نازانم کەخەڵکی بەدزییەوە چۆن باسی ئەمە دەکات . ئەبێ وێنەیەك بێت کە بێمەرگی دارەکان وماندووبوونی ئەسپەکان و بێعاری سەگ و هەموو دونیا لە خۆیدا بەر جستە بکاتەوە . ناز ناوی وێنە کێشەکەمان لەق لەق ـ زەیتون ــزەریف وپەپوولەیە ،داوام لێ کردبوون کە بە دڵی خۆیان بابەتەکان هەڵبژێرن . شەوانی سارد و بێخەبەری زستانیش دەهاتن بۆلام و وێنەکانیان پێنیشان دەدام . بە تەواوی نازانم و ناتوانم بڵێم کە چۆن وێنەمان دەکێشا و بۆچی وامان دەکرد ؟! ئەوەش لەبەر ئەوە نییە کەوا لە تۆی دەشارمەوە ، بەڵکوو بەراستی منیش نازانم . تەنیا دەزانم کەچی دەکێشم .

ڕەشـە دوای چـوار مـانگ لـەو کاتـەی وا بـانگم کردبـوو ، گـەڕابووەوە بـۆ ئەستەنبووڵ ، هەنـدێك شـتی لـە دەلاکەکـەی کـۆڵانی خـانووە کۆنەکەمانـەوە بیستبوو.

بانگم کرد بۆماڵەوە . دەمزانی کە لەم چیرۆکەدا دەردێك هەیە کەوا لێك نزیکمان دەکاتەوە و دواییەکەشی بەڵێنی خۆشییەکی تێدایە . گوتم : هەر ڕەسمێك باس لە چیرۆکێك دەکات ، بۆ ئەوەی ئەو کتێبەی وا دەیخوێنینەوە جوان دەربچێ ، پێویستە وێنەی دانیشتنی هەرە باشی کتێبەکە بکێشرێ . بۆ کێشانی وێنەی دیمەنێکی جوان پێویستە کاتی بەیەکگەیشتنی عاشقان و ئەوەیوا ڕۆستەم گیانداره شەیتانییەکە سەر دەبڕێ تێیدا دیار بێت ، یان ئەو کاتەی کە تێدەگات ئەو نائاشنایەی وا کوشتوویەتی کوڕەکەی خۆیەتی ، یان ئەبێ مەجنونی تێدا بێت کەوا لەبەر عەشقی لەیلا عەقڵی لە دەست داوە و لە بیابانێکی چۆڵ و هۆڵدا لەگەڵ ئاسك و شێر و پەڵەنگدا دەژی ، یا خود ئەبێ وێنەی ئەو کاتەی تێدا بێت کەوا ئەسکەندەر بەر لەوەی دەست بە شەڕ بکات ، بۆئەوەی لە ڕێگای پەلەوەرەکانەوە لە فاڵی ئایندەی خۆی تێبگات دەچێ بۆ دارستان و هەڵۆیەکی چنگۆڵ تیژ جل و بەرگەکەی دەدڕێنی ،شایانیباسە کەدەبێ هەموو تووڕەییەکانی بەرجەستە بکات . دوای خوێندنەوەی ئەم چیرۆکانە ، بۆ ئەوەی کە ماندوویی چاوەکانمان دەربچێ، چاوێکمان بە وێنەکاندا خشاندەوە . جاری وا هەیە هەندێك شت لە ناو چیرۆکەکاندا ڕوو بە ڕووت دەبنەوە کە لە عەقڵ و خەیاڵدا بەرجەستە ناکرێن ، لەم کاتانەدا وێنە فریاتدەکەوێ و نەجاتت دەدا ، وێنە تێکەڵبوونی ڕەنگ و داستان پێکەوەیە .

گوتم : کەس ناتوانێ بیر لە وێنەیەکی بێداستان بکاتەوە ، لەدوایشدا بە

پەشیمانییەوە ئەوەشم پیٚ زیاد کرد  کە لانی کەم من وەها بیر دەکەمەوە .

دوو ساڵ بەر لە ئیستا پادشا وەکوو نویٚنەری خۆی ناردمی بۆ " وەنیز " ویٚنەی ئەو دەموچاو و ڕوخسارانەیوا ئوستادە ئیتاڵییەکان دەیانکیٚشا زۆر سەرەنجیان ڕادەکیٚشام ، هەمووکات سەیرم دەکردن . نەمدەزانی کە ئەم ویٚنانە چ جۆرە داستانیٚکم بۆ دەگیٚرنەوە ، لە هەوڵدانی دۆزینەوەی ئەو چیرۆکانەدا بووم،کە ڕۆژیٚك چاوم بە ویٚنەی سەر دیواری کۆشکەکە کەوت ، ڕاوەستام و تیٚرتیٚر سەیرم کرد . لە هەموو شتیٚك زیاتر لە شیٚوەی ڕۆخساری یەکی وەکوو من دەچوو . بەڵام ئەو کافر بوو ، لەئیٚمە نەدەچوو ، بەڵام هەرچی  زیاتر سەیرم دەکرد زیاتر هەستم دەکرد کە لە من دەچیٚ ،بەڵام دەمو چاوی خڕۆڵە و بیئیٚسقان بوو ، ئیٚسقانی لای چەناکەی هەر دیار نەبوو ! چەناکەی لە هی من نەدەچوو .

ئەو کەسەی وا لە گەڵمدا بوو ، کۆشکەکەی پیٚنیشاندام  و وتی : ئەمە ویٚنەی کابرایەکی پیاوماقووڵی  " وەنیزییە " . چی لە ژیانی ئەو پیاوە بە بایەخ بوو ، هەمووی کیٚشرا بوو . لە نیٚوان دەلاقەکەیەوە کیٚڵگەیەکیجوان دیار بوو ، گوند و ڕەنگەکانی تیٚکەڵکرا بوون ، دارستانیٚکی خۆش کیٚشرا بوو ، لە بەر دەمیدا میٚزیٚك  هەبوو کە ، کاتژمیٚر و کتیٚب وکات و خراپیەکانی ژیان و قەڵەم و نەخشە لەگەڵ قیبلەنەما و قوتووئاڵتوونەکان و هەندیٚك وردە واڵەی تریشی لەسەر دانرا بوو، سیٚبەری شەیتان و جندۆکەشی تیٚدا بوو ، لەتەنیشت باوکیدا کچیٚکی جوان وەکوو خەیاڵ کیٚشرابوو . ئەم ویٚنەیان بۆ تەواو کردنی کام داستان ڕازاندبووەوە ؟ لە ڕاستیدا ئەمە بەر دەوامی داستانیٚك نە بوو ، بەڵکو خۆی بۆ خۆی شتیٚك بوو . تیٚگەیشتم کە چیرۆکە کەش هەر خودی پیاوەکەیە، لە بەرامبەر ئەو

ڕەسمەدا سەرم سوڕمابوو ! هیچ فەرامۆشم نەدەکرد . لە کۆشکەکە دەرچووم و گەڕامەوە بۆ ئەو ماڵەی وا لێی دەمامەوە . شەو هەر بیرم لێدەکردەوە . دەمگوت : خۆزگە وێنەیەکی منیشیان ئاوەها بکێشابایە بەڵام ، نا ، من حەدم چییە ! ئەبێ وێنەی پادشاکەمان وەها بکێشرێ ! پێویستە وێنەیەك بێت کە هەموو دونیا و ماڵ و موڵکی و خزمەتکارەکانی پادشای تێدا بەرجەستە بکرێتەوە . ئەو ئوستادە ئیتالییانە وێنەیەکیان دروستکردووە کە تۆ لە هەر جێگایەکیتردا چاوت بەو کابرایە بکەوێت یەکسەر دەیناسیتەوە .

ئەم ئوستادانە فێڵی " پۆرترە " (وێنەی کەسی )یان وەکوو چۆنیەتی کیشان و دەرخستنی جیاوازییەکانی نێوان ڕوخسارەکانیان دۆزیوەتەوە . ئەگەر تەنیا جارێك وێنەیەکی لەمجۆرەت لێبکێشن کەس لە بیرت ناکا ، تەنانەت کەسێکی دووریش وادەزانێ کە لە نزیکەوە تۆی بینیوە، هەروەها ئەو کەسانەی وا تۆیان دیبێ ئەوانیش وادەزانن کە هەموو کات لەبەرامبەریان دانیشتووی . بۆماوەیەکی زۆر بێدەنگ بووین . لە پەنجەرە بچووکەکەی هۆڵەکەوە کۆڵانەکە دیار بوو ، لە گەڵ ئەوەی کە بە قوماشێکی ڕەش داپۆشرا بوو تیشکێکی تۆقێنەر کە ڕەنگەکەی لە ڕەنگی سەرما دەچوو دەهاتە ناو ماڵەکەوە .

گوتم وێنەکێشێك هەبوو ، کە وەکوو وێنەکێشانی تر بۆ دروستکردنی ئەم کتێبە نهێنییە سەردانی دەکردم و تا بەیانیان پێکەوە کارمان دەکرد ، لە هەموویان باشتر وێنەی دەڕازاندەوە ،ناوی " زەریف ئەفەندییە " ئەو بێچارەیە ڕۆژێك لیرە ڕۆیشت و ئیدی نەگەڕایەوە . لەوە دەترسم کە ئوستادە جوانکارەکەمیان کوشتبێ.

## ((من ، ئورهان ))(6)

رەشە گوتی : کوشتویانە ؟ ! ، ڕەشەپیاوێکی باڵا بەرز و ترسێنەر بوو ، بەرەولای ئەوان دەڕۆیشتم کە باپیرم وتی :بەڵێ کوشتویانە . منی بینی وگوتی:لێرە چ دەکەی ؟ وەها تەماشای دەکردم کەناچار مامەوە و ڕۆیشتمە باوەشی و دانیشتم ، بەڵام یەکسەر منی داناو گوتی : دەستی ڕەشەماچ بکە . دەستم ماچکرد و وتی :زۆر شیرینە و لەداهاتوودا وەکوو شێرێکی لێدێت .

- ئەمە ئورهانە ، تەمەنی شەشساڵە ، لەمەش گەورەتر ناوی شەوکەتە ، تەمەنی حەوت ساڵە بەڵام زۆر کەلە ڕەق و پێداگرە.

- ڕەشە وتی : ڕۆیشتمە کۆڵانەکەی لای کۆشکی سپی هەموو شتێك لەناو سەهۆڵدایە ،زۆر ساردە ، بەفرێکی زۆریش باریوە ،بەڵام ئەڵێی هیچ شتێك نەگۆڕاوە .

- هەمووشتێك گۆڕاوە و خراپ بووە . ڕووی کردە لای من وتی : ئەی کاکت لە کوێیە ؟

- لای مامۆستاکەیە .

- ئەی تۆ لێرە چ دەکەی ؟

- مامۆستاکە وتی ئەی ئافەرم بۆ تۆ ، تۆ ئیدی بڕۆ .

– بە تەنیا هاتی ؟ ، پێویستە کاکت تۆ بهێنێتەوە ، لە دواییدا بە ڕەشەی گوت : هەر هەفتە یەك دوو جار دەچن بۆ مەکتەبی قورئان و لە دواییدا دەڕۆن بۆ لای کابرایەکی دۆستی خۆم و فێری کاری ناو کێڵگە دەبن.

- ڕەشە وتی : ئەتەوێ وەکوو باپیرت وێنە بکێشی ؟بێدەنگ بووم .
- باپیرم گوتی : باشە ئەی ئێستا تۆ ... .

گەرمایەکی خۆش لە مقەڵەکەوە بڵاو دەبووەوە ،نەمدەویست لێی دوور بکەمەوە، بونی ڕەنگ و سەرێشەکەم کرد و تۆزێك ڕاوەستام ، بۆنی قاوەش دەهات . باپیرم گوتی : " وێنەکێشان ، لە هەموو کەسێك زیاتر واتای بیر دەکەنەوە دەزانن و بۆ چوونییشیان جیاوازترە . جوانکارە بێچارەکەمیان لە سەر ئەمە کوشتووە ، ئەو بە پێی نەریتی کۆن وێنەیدەرازاندەوە . نازانم ، لەوانەیە نەمردبێتیش ، بەڵام ئەوە ماوەیەکە ونبووە ، لە ژێر فەرمانی وەستا عوسمانی سەروکیوێنە کێشاندا نامەیەکی بۆ پاشا دەڕازاندەوە . هەر کەس لە ماڵی خۆیدا کار دەکات ، تەنیا وەستا عوسمان لە وێنە کێشخانەکەدا ئیشی دەکات ، ئەمەوێ بەر لە هەموو شتێك بچیت و چاوت بەهەر شتێك بکەوێ . ئەترسم ئەوانیتریش لە ناو خۆیاندا دست بە قسە و باس بکەن ویەکتری بکوژن .پەپوولە و زەیتون و لەق لەق و ... کەوا بۆچی وەستاعوسمان ئەم ناز ناوانەی پێوەناون ".

دەمویست لە پلیکانەکانەوە بچمە خوارەوە ، جیڕەجیڕەك لە ژوورەوە دۆلابدارەکەی خەرییەوە دەهات ، گەڕامەوە وڕۆیشتمە ئەوێ ، بەڵام خەیرییەی لێنەبوو ، دایکمی لێبوو ، کە منی بینی . تەریق بووەوە و گوتی : تۆ لە کۆی بووی ؟ بەڵام دەیزانی کە لە کویێ بووم . دۆڵابەکە کونێکی تێدا بوو ، لەوێوە ژووری وێنە کێشی و ئەگەر دەرگاکەش کراوەبایە هۆڵەکەشیلێ دیار دەبوو ، خۆ ئەگەر دەرگای هۆڵەکەش کراوە بایە ، ئەوا ژووری نوستنی باپیریشم دیار دەبوو . گوتم : لای باپیرم بووم ، ئەی تۆ لێرە چ دەکەی ؟ وتی : مەگەر نەمگوت میوانی هەیە مەچن بۆ لای ؟

بەدەنگێکی نزمەوە دەیقیڕاند چونکە نەیدەویست میوانەکە گوێی لێبێت ، بەدەنگە شیرینەکەیەوە گوتی :چیان دەکرد ؟ وتم : دانیشتبوون، باپیرم قسەی دەکرد و ئەویش گوێی ڕادەگرت . وتی : چۆن دانیشتبوو ؟ یەکسەر دانیشتم و لاسایی میوانەکەم کردەوە : من پیاوێکی زۆر جدیم ، سەیرم کە دایە ، نێوچاوانم کۆ کردۆتەوە و گویێ لە باپیرم ڕادەگرم و وەکوو مەولوودی خوێندنەوەش سەرم دەلەقێنم . دایکم وتی : ئێستا بچۆرە خوارەوە و خەیرییەم بۆ بانگ بکە . دانیشت و لە سەر تەختەی نووسینەکە کاغەزێکی هەڵگرت و دەستی بە نووسین کرد . وتم : دایە چی دەنووسی ؟ وتی : مەگەر نەمگوت بچۆرە خوارەوە و خەیرییەم بۆ بانگ بکە ؟! . ڕۆیشتم بۆ مەتبەخ، کاکم گەڕابووەوە . خەیرییە قاپێك برنجی لە برنجی میوانەکەی نابووە بەر دەستی . کاکم وتی : سەر شێت ، من جێدێڵێ و لەگەڵ مامۆستادا دەڕۆی ! هەمووئەو شتانەم کۆ کردەوە ، سەیر کە دەستم چی لێهاتوە ، هەمووی ڕەش بۆ تەوە . وتم : خەیرییە دایکم بانگت دەکا .

کاکم گوتی : کە نانەکەم خوارد لێدانێکی باشت دەکەم ، ئەبێ تاوانی سەر شێتی و تەمەڵیەکت بدەیتەوە . کە خەیرییە ڕۆیشت ، کاکم نانەکەشی تەواو نەکرد و یەکسەر کەوتە گیانم ، دەستمی گرت و مەچەکمی بادا .وتم : وامەکە شەوکەت ، وامەکە گیانم دێشێنی . وتی : جارێکی‌تر کارەکان خراپ دەکەی ؟ هەڕادەکەی ؟ وتم : هەڕاناکەم . وتی : سوێند بخۆ ، بڵێ بە قورئان . وتم : باشە بە قورئان ئیدی واناکەم. بەڵام دیسان بەری نەدام ، کێشامیە لای سینی برنجەکە ، بەدەستێکەوە برنجی دەخوارد بەویتریش مەچەکی منی پێچدەدا ، خەیرییە وتی: زاڵم ، واز لە براکەت بێنە ، دیسان لێیدەدەی ؟ خەریك بوو بڕواتە ناوکۆڵانەوەکە که دیسان گوتی:وازی لێبێنە . وتی:

تو قسە مەکە کچی کۆیلە ، بۆ کوێ دەچی؟ وتی دەچم لیمۆ دەکڕم .

وتـــی درۆزن خـــوا ڕووت ڕەش بکـــات ، خـــۆ دۆڵابەکـــە لیمـــوی تێدایـــە . دەستمی شل کردبوو ، یەکسەر خۆم نەجاتدا و شەقێکم تێهەڵدا . دەسکی مۆمدانەکەم گرت ، بەڵام خۆی فڕێدایە سەرم ، خۆیدا لە مۆمدانەکە بەڵام نەیدەقیڕاند . باشە ئەی دایکم چۆن توانیویەتی خۆی لە چاوانی ڕەشە بدزێتەوە و لە هۆڵەکەوە بێتە خوار!؟ لەیەك جیایکردینەوە و وتی : توخمە زۆڵینە ! ئیوە مرۆڤ ڕیسوا دەکەن . کاکم وتی : ئورهان ئێمڕۆ درۆی کردوە ، منی لەلای وەستاکە بەجێهێشت و خۆی ڕای کردەوە . دایکم وتی : بێدەنگ بەو زەلەیەکی لێدا و بە هێواشی لە منیشی دا، براکەم گووتی : من باوکی خۆمم دەوێ و دەستی بە گریان کرد. دوایی وتی : ئەگەر باوکم هاتەوە شمشێرە سوورەکەیمامە حەسەنم دەردێنین و و دەڕۆینەوە بۆ ماڵی مامم . دایکم باڵی شەوکەتی گرت و وتی : بێدەنگ بەو بەرەو لای دیوارەکەی برد . منیش بەدوایاندا ڕۆیشتم ، دایکم وتی : بڕۆنە ماڵەوە . وتم: دایکە ! من هبچم نەکردوە . بەڵام بردینیە ناوەوە و دەرگاکەی لێداخستین . ناوەوە زۆر تاریك بوو ، تیشکێکی جوان لە دەلاقەکەوە دەهاتە ناو ژورەکەوە ، بەڵام دیسانهەر دەترسام .

وتم : دایە دەرگاکە بکەوە ، سەرمامە .

شەوکەت وتی : مەگری ترسنۆك ئێستا دەیکاتەوە . دایکم دەرگاکەی کردەوە و وتی: تاوەکوو میوانەکە دەچێ بێدەنگ دەبن یان نا ؟ باشە ، تائەو کاتەی ڕەشە دەچێ لەلای ئاگردانەکەدا بەبێ دەنگی دانیشن و نەچنە ژوورەوە . شەوکەت وتی : بەڵام لەوێ ناڕەحەت دەبین ، خەیرییە بۆ کوێ چوو؟ دایکم وتی : تۆ خۆت دەکەی بەناو هەموو شتێکدا ،خەریکی

**زیادەدەڕەوی . لە گەوڕەکەوە دەنگی شیحەی ئەسپێك هات ، ئەسپەکەی ڕەشە بوو وەکوو ئەوەی کە بەرەبەیانی ڕۆژێکی جەژن بێت یان ڕۆژی خۆپیشاندان بیٚ ، ئاوەها بە خۆشیەوە تێپەڕبوو . دایکم بزەیەکی لێدا و وەکوو ئەوەی کە بیەوێت ئێمەش پێبکەنین ئاوەها سەیرێکی کردین لەدوایدا دووهەنگاو ڕۆیشتە دواوە و دەرگای گەوڕەکەی کردەوە و وتی : دررررس س . لەدوایدا گەڕایەوە و ئێمەی بردە ناو مەتبەخەکەی خەیرییە ، مەتبەخەکە بۆنی ڕۆنی لێوەدەهات . وتی : تا ئەو کاتەی میوانەکە دەچێت لێرە دەرناکەون ، ئاژاوە مەکەن وبێدەنك دانیشن، باکەس وابیرنەکاتەوە کە ئێوە منداڵێکی بەدخۆ و لەخۆباییں .**

**–دایکە : با بەر لەوەی دەرگاکە داخەی شتێکت پیٚ بڵێم : جوانکارە بێچارەکەی باپیرمیان کوشتووە .**

## ((ناوی من ڕەشەیە ))(7)

ئەوە بۆ یەکەم جاربوو کە لەدوای منداڵیەکەیەوە بیبینم ، ساڵانیکی درێژ شێوەی ڕوخساریم لەبیر چووبوو ،بەڵام لەیەکەم نیگادا هاتەوە یادم .

رووماتی وەکوو دەموچاوە باریکەلەکەی ئورهان وابوو ، بەلام چەناکەی تۆزێک درێژ تر بوو ، بەپێچەوانەی ئەوەیوا من بیر دەکردەوە ، ڕوخسارێکی خڕۆڵە و جوانی هەبوو ، لەو شارانەدا، وا بیرم دەکردەوە کە ڕوومەتێکی پان و لێوێکی بچکۆلانەی هەبوو ، هەروەها قەڵەوتر سپیتر لە جاران دەهاتەوە یادم . ئەگەر بەپێی نەریتیوێنەکێشە فەرەنسییەکان وێنەیەکی شەکورەم بکێشابایە و لەگەڵ خۆمدا بمبردایە ، لە ساڵانی دوور خرانەوەمدا هەستم بە فەرامۆشکاری و دەربەدەری نەدەکرد . چوونکە ئەگەر ئێوەش خۆشەویستتان هەبێت ، ئەوا دەزانن کە لە دۆخیکی بەو شێوەیەدا مرۆڤ وا هەستدەکات کە تەواوی جیهان موڵکی ئەو. هەستێکی غەریبی دایگرتووم ! دەمەوێ کە زیاتر شەکورەم ببینم ، قسەی لەگەڵ بکەم ، ماچێکی بکەم . مێشکم تێکەڵ و پێکەڵ بووە ! هەستی کەسێکی پیاو کوژ وتاوانبار ئۆقرەی لێبڕیوم ، دەنگێک لە قووڵایی دڵمەوە بانگی دەکردم ودیگوت : هەستە بڕۆ بۆ لای شەکوورە ، ڕامەوەستە . یەکسەر شتێك هات

بە مێشكمدا، وتم: هەرئێستا بەبێئەوەی زاواكەمان هەستی پێبكات دەچمە ناو هەیوانەكە و تەماشای دەرگای هەر پێنج ژوورە كە دەكەم . ئەگەر شەكوورە لە سەر پلیكانەكاندا نەبێت ، یەكە یەكە دەرگای ژوورەكان دەكەمەوە تا وەكوو دەیبینم . لەهەمان كاتیشدا دەمزانی كە ئەم شتانەی وامن بیری لێدەكەمەوە ، هەمووی پڕ و پووچ و بێهودەن ، چونكە ئەوە بۆ دوانزە ساڵی تەواو دەچووكە من لە خۆشەویستەكەم دوور كەوتبوومەوە . بێدەنگ بێدەنگ لە جێگای خۆمدا خۆمم مەڵاسدا و تەماشای ئەو دۆشەكانەم كرد كەوا شەكوورە لەسەریان دانیشتبوو .

گوێم لە زاواكەمان دەگرت و سەیری كەلوپەلەكانی ناو ماڵێشم دەكرد ، دەمزانی كە شەكوورە دەستی لێداون. زاوا ئەفەندی گوتی : لە سەر داخوازی سوڵتان ، پێویستە ئەم كتێبە بەرلە سەری ساڵی هێجری تەواو ببێت ، پەناگەی دونیا ، حەزرەتی پادشای خۆشەویستمان ، دەیەوێت بە ڕەچاو كردنی ئەم ڕێكەوتە ئەوە بسە لمێنێت كە ئێمەش بە قەدەر فەرەنسییەكان ڕۆژ ژمێر بەكار دێنین .

هەر وەها پادشا فەرمانی ئەوەشی دابوو كەوا وێنەكێشان بۆ دروستكردنی كتێبی (( جەژننامە )) لە ماڵی خۆیاندا كار بكەن ، ئەوەش لەبەر ئەوە بوو كە وێنەكێشخانە زۆر جەنجاڵ بوو ، پادشا ئاگاداری ئەوەش بوو كەوا وێنە كێشان بەدزییەوە هاتوچۆی ماڵی زاوا ئەفەندی دەكەن .

زاوا ئەفەندی گوتی : "دەچی وچاوت بە وستا عوسمانی سەرۆكی وێنەكیشان دەكەویٚ ، دەڵێن كوێرایی داهاتووە، بەگوێرەی من هەم كوێرایی داهاتووە هەم خڵەفاوە ". سەرە ڕای ئەوەی كە زاواكەمان هیچی لەوێنەكێشی نەدەزانی و ئاگای لە وردە كارییەكانی ئەم ئیشە نە بوو ،

پادشا ئەرکی دروستکردنی کتێبێکی پێسپارد بوو . ئەمەش بوو بە هۆی ئەوەی کەوا وەستا عوسمان دڵگیر بێت و بەخیلی پێبباتەوە.

کاتیٚکە تەماشای کەلوپەلی ناومالّم دەکرد دەورانی مندالّیم دەهاتەوە یاد . گلّێمە شینەکەی جاران هەرما بوو ، پوورم زۆر جار بەشانازییەوە باسی ئەو سینی وکووپی قاوەیەیدەکرد کەوا لە چینەوە بەرێگای پورتوغالّ هاتبوون . ئێستاش هەست بە نەرمایی کلاّوەکەی سەر دیوارەکەدەکەم . ئەم شتانە هەمووی مالّە کۆنەکەی جارانی دەهێنایەوە بیرم و تیشکی خۆشی جارانی دەخستەوە بەر نیگای چاوانم . لەوانەیە خۆێنەرە بەرێزەکانی بەسەر هاتەکەی من سەرەنجی ئەوەیان دابێت کە خۆشی و وێنە دوو خالّی سەرەکی و بنەمایی ژیانی منن .

هەر لە بەر ئەمە دەمەوێت کە ئەوەتان لەبیر نەچێت کەمن لە نێوان ئەم کتێب و قەلّەم و وێنانەدا ڕۆژانیکیخۆشم بەسەر بردووە ،بەلاّم کە لەدواییدا عاشق بووم، لەویٚ دەریانکردم . لە سالاّنی دوورە ولاّتی و دوورە خراوەیی عەشقەکەمدا ، بیرم لە قەرزەکانی خۆم بەرامبەر شەکوورە و وێنەکەی دەکردەوە ، چونکە لە ژیانی لاویمدا بەچاوێکی باش و دیدێکی گەشبینانەوە سەیری دونیام نە دەکرد .

بەلّام لە بەر ئەوەی کە بڕوام بە وەلاّمدانەوەی عەشقەکەم هەبوو ، بەهەموو پاکییەکەوە سەیری دونیام دەکرد ودونیام بەپاك دەزانی ، هەر بۆیەکتێبەکانی زاوای ئەفەندیم دەخوێندنەوە و گوێم بۆ وانەکانی قوتابخانەرادەگرت وخۆم فێری نەخش و نیگار کێشان دەکرد .لەبەر عەشقەکەم بەرامبەر بەشەکوورە و ڕەتکردنەوی زانیاریو ڕەشبینییەکانی خۆم بووە کە ئەم زانیاری و فێربوونە زێڕینانەم دەستکەوتووە .لە شەوانی

ساردی ژوورەکانی کاروانسەراکاندا لەبەر ئاگری ئاگردانەکان دادەنیشتم ، ئاگرەکان دادەمرکانەوەو بەرەو کوژاندنەوە دەڕۆیشتن ،لە بیرکردنەوەکانما دەمەویست کە لە گەڵ بلێسە کزۆڵەکانی ئاگرەکاندا بەلەرزە لەرزە وە باوەشی پێدا بکەم و لەدوای ماچکردن و جووتبوون لەگەڵیدا لە ناو نیکای یەکتردا نوقم ببین و لەدڵی تاریکاییدا خۆمان بشارینەوە. هەروەها هەمیشە بیرم لەوەدەکردەوە کە ڕۆژێك لەگەڵ ئەو ژنە وا خۆشمدەویٚ ، لە کەنداوێکی بێدەنگەوە بکەوینە خوارەوە . بەڵام لەو هەموو خەیاڵە جوانە تەنیا هەستی بێبەهایی خۆمم بۆ دەماوە !

زاواکەمان وتی : ئەزانی کە لە دوای مردن ڕۆحەکانمان لگەڵرۆحی ئەوانەی وا لەم دونیایەدا پرخەیان لێوەدێت یەکتری دەگرێتەوە !

وتم : نەمدەزانی .

-: لەدوای مردن ڕێگایەکی دوورمان لەبەرە ، بۆیە لە مردن ناترسم ، تەنیا ترسم ئەوەیە کە بەر لە تەواو کردنی کتێبەکەی پاشا بمرم . لە لایەکەوە بیرم دەکردەوە کە عەقڵ و هۆشی من لەهی ئەو زیاترە ولەسەر خۆیەتی ، لەلایەکیتریشەوە عەقڵم لەسەر ئەوە بوو کەئەم پیاوەی وا هەموو کات عەبای گران وپڕبەها لەبەر دەکات دوانزە ساڵ بەر لە ئێستا کچەکەی خۆی پێنەدا بووم ، ئەو بەشەکەیتری مێشکیشم خۆی سەرقاڵی ئەوە کرد بوو کە چۆن بچمە لای گوڕەکە و چۆن سواری ئەسپە زین نەخشینەکەم ببم .

ووتم : هەموو ئەو شتانەی کەوا لە وێنەکێشان فێر بووم ، هەمووی بەکار دەهێنم . دەستیم ماچکرد و لە پلیکانەکان دابەزیم .رۆیشتمە ناو حەوشەکە ، کاتیٚ هەستم بە سەرمای بەفرەکە کرد زانیم کە ئیدی منداڵێکی ساوا نیم ، لە هەمان کاتدا ئەوەشم دەزانی کە هێشتا پیر نەبووم . هەستم بە

خۆشـی دونیـا لەسـەر جەسـتەی خـۆمکرد . دەرگـای گەورەکـەم داخسـت ،بایەکی سارد هەڵیکرد بوو ، لەغاوی ئەسپە سپیەکەی خۆمم گرتبوو و لە بەر دالآنەکەوە بەرەو حەوشەکە دەڕۆیشتم ، لەناکاو ئەسپەکەم سڵی کرد ، بێئارامی و سەر کێشییەکەی لە گرژایی دەماری لاقەکانیەوە دیار بوون ، بە زۆری پیێم زەوتکرا ، تەنیا خۆم دەمزانی کەچۆن بووم . خەریك بوو لە کۆڵانەکە دەرچم و سواری ئەسپەکەم ببم لەناکاو ژنێکی گەورە و زەبەلاح هاتە بەرامبەرم ، سەرم سووڕما بوو ، نەمزانی چۆن هات ! ئەو جوولەکەیە کراسێکی پەمبەیی لەبەر کرد بوو . بە بوخچەکەی دەستیەوە هاتەلام.

وەکوو دولآبێك پان و گەورە بوو ، کەچی زۆر بە جمو جۆڵیش بوو .

ووتی : شێرە کوڕ ، جوانمێرەکەم ، بە ڕاستی وەکوو ئەوەیوا تاریفیان دەکردی هەر ئاوا جوانی ، ژنت هێناوە یان نا ؟ لەبەر خاتری خۆشەویستیە نهێنییەکەت ئەم دەستماڵە لیێدەکڕی ؟ لەتەواوی ئەستەنبووڵدا نموونەی نیە .وتم: نا .

-: ئەی پشتوێنێکی ئەتڵەسی سوور ؟ دیسان وتم : نا .

-: نا نا مەکە بزانم ، مەگەر دەبیٚ شێرە کوڕێکی وەکوو تۆ دەزگیرانیٚ ، دەنکیٚ مەنکیٚ شتێکی نەبێت ؟

کێدەزانیٚ کە ئێستا چاوی چەند کچ لەبەر عەشقی تۆ دەسووتیٚ ؟ ! . لە ناکاو سینەی لە سینەم کەوت . لە هەمان کاتدا وەکوو سیحر بازێك کە لە هیچەوە شتێك دروستدەکات ، نامەیەکی دەرهێنا .چاو و ئەبرۆکانم دایەك و سەرەنجم دایە سەر نامەکە ، وەکوو بڵێی کە سالآنێکی دوور و درێژ بۆ ساتێکی ئاوەها پەروەردە کرا بێتم ، بە پەلە نامەکەم خستە تۆیی پشتوێنەکەمەوە ،نامەیەکی گەورە بوو .لە بەینی سك وپشتوێنەکەمدا دامنا

بوو ، هەستێکی سەیر دایگرتم ! هەر لە ئێستاوە لاشە ساردەکەمی وەکوو ئاگر لێکردبوو .

ئەستەری بوخچەچی وتی :" سواری ئەسپەکەت بەو بەغار لێی خوڕە ڕێکی ئەم دیوارە بڕۆ و بەشانی ڕاستدا بکەرێرەوە ، هیچ خۆت تێك مەدە ، کاتێ کە گەیشتیتە لای دار هەنارەکە لابکەرەوەو تەماشای پەنجەرەی ئەو ماڵە بکە وا لێی بووی ". ڕیگای خۆی گرتە بەر و لە نیو دارەکاندا ون بوومنیش سواری ئەسپەکەم بووم .

## ((ناوی من ئەستەرە)) (8)

دەزانم زۆر کەستان دەتانەوێ بزانن لەناو ئەو نامەیەی وادامە دەستی ڕەشەوە چی نووسرا بوو ، منیش دەمەویست بزانم ، هەر بۆیە هەموویم خوێندەوە . ئەگەر بتانەوێ دەتوانن لاپەڕەکانی ئەو ڕۆمانەی وا دەیخوێنن هەڵدەنەوە بەرو دواوە بڕۆن و بزانن بەرلەوەی نامەکە بدەم بە ڕەشە چی قەوما بوو ، ئێستا هەموویتان بۆ باس دەکەم .

ئێوارە وەختەو لەماڵەکەی خۆمان لە گەڕەکی جوولەکەکان لە وپەڕی خەلیجدا دانیشتووین، پیرەژن و پیرەمێردێکین وقرخە قرخمانە و دار دەخەینە ناو ئاگردانەکە بۆ ئەوەی گەرم ببینەوە . کە دەڵێم پیرم ، وانەزانن کە هیچم لێنایە و کاتم بەسەر چووەو بڕوا بکەن کاتێ کە دەستماڵەئاورێشمینەکەم گرێدەدەم و کراسە ڕەنگاوڕەنگەکەم دەکەمە بەر کە بە کەشتیە پورتوغالییەکە بۆیان هێناوم و گوستیلەکانم دەکەمە دەست

و گوێوارەکـانم دەکەمـە گـوێ وملوانکـە کـەم دەبسـتم و مورگـە جـوان و وردیلـەکانم هەڵدەواسـم ودەستکێشـەکانم دەکەمـە دەسـت و چارۆکەکەشـم دەدەم سـەردا و بوخچـەکەم هەڵـدەکرم ،دڵـی هـەموو ژنـان دەخەمـە نـاو تامەزرۆیی حەسرەت و کۆڵان بە کۆڵانی ئەم ئەستەنبووڵە دەگەڕێم .

نامـەی ئـەم دەبـەم بۆ ئـەو لـەو ماڵـەوە دەچمە ئەویـدی . نیـوەی کچانی ئەستەنبووڵم داوە بە شوو ! ئەمانەش بۆ خۆ پەسـەندان باس ناکـەم . با لـە سـەری نـەڕۆین ، ئێـوارە وەختـان بـوو ، تـەق تـەق لـە دەرگایانـدا ، کارەکەرەگێلەکـە ! خەییریـە بـوو ، نامەیـەکی پـێ بـوو ، نـازانم ! لەوەدەچـێ لە بەر سـەرما پەشـۆکا بووبێ،بەترس و لـەرزەوە داواکارییەکـەی پێڕاگەیانـدم . سەرم سووڕ مابوو ، لە سەرەتادا وامزانی نامەی بۆ حەسەن ناردووە ، ئەگەر بـە مـن بـێ ، پێویسـتە ئـەو شـەکوورە جوانـە ، حاشـا بکـات و مێردێکـیتـر بکـات ، چـونکە ئـەوە بـۆ چـوار سـاڵ دەچـێ مێردەکـەی نەگەڕاوەتـەوە ، شـووەکەی کابرایـەکی سـەربازە و برایـەکی چاوهەڵگەڕاوی هەیـە کـە نـاوی حەسەنە .

تێگەیشـتم کـە نامەکـەی شـەکوورە بـۆ حەسـەن نییـە ، بـەڵکوو بـۆ کەسـێکیترە ، چـی تێـدا نووسـراوە ؟ خـەریك بـوو هـار ببم هـەتا نامەکـەم خوێندەوە ، ئەوەی ڕاستی بێت لە بەر ئەوەی کە نەتانناسم ، تۆزێك شـەرم دەکەم،هـەر بۆیـە پێتـان نـاڵێم کـە چـۆن نامەکـەم خوێنـدەوە وادیـارە ئێـوە بەقـەدەر سەرتاشـەکان زانخـواز نییـەن، ئەمەعـەیبێکی زۆر گەورەیـە ! سـووك تەماشـای مـن دەکـەن . کـە نامەکـەیان بـۆ خوێندمـەوە ، هەنـدێك شـتی لێتێگەیشـتم تـەنیا ئـەوەتان بـۆ بـاس دەکـەم : شـەکورەی شـیرین وەهـای نووسیبوو:

"ڕەشەی بە ڕێز : لە بەر پێوەندییەکانت لەگەڵ باوکمدا هاتوو چۆی ماڵی ئێمە دەکەی ، لە دوای ڕۆیشتنی تۆ زۆر شت قەوماوە ، مێردمکردوە و دوو شێرە کوڕم لێی هەیە ، ئەوەی وا بەرلە ئێستا هات و بینیت ، ئورهان بوو ، ئەوە چوار ساڵە کە چاوە ڕوانی مێردەکەم دەکەم ولەوەیش زیاتر بیر لە کەسیتر ناکەمەوە ، لەگەڵ باوکێکی پیر و دوو منداڵدا هەست بە بێچارەیی و بێکەسی دەکەم و پێویستم بە مێردێك هەیە کە دەستی بە سەرمەوە هەبێت ، بەڵام بڕواناکەم کە کەسێك بتوانێ لەو وەزعەی من کەڵك وەربگرێ . لەم ڕووەشەوە تکات لێدەکەم کە جارێکیتر لەدەرگاکەمان نەدەی . جارێك شەرمەزارت کردووم ، کێدەزانێ کە چەندە مەینەتم کێشاوە تاوەکوو پاکانەی خۆمم لەلای باوکم کردووە ! کاتێ کە جوانێکی ژیر و لووت بەرز بوویت ، وێنەیەکت بۆ کێشا بووم . لەگەڵ ئەم نامەیەدا دەینێرمەوە بۆت . خۆت ئومێدوار مەکە . ئاماژەیەکی هەڵە وەر نەگری بۆ خۆت ! ئەوەی کە دەڵێن مرۆڤەکان بە تەماشاکردنی وێنەیەك عاشق دەبن هەمووی درۆ و دەلەسەیە. دەمەوێت کە پێت لە بەر دەرگای ماڵی ئێمە ببڕی ، ئەمە لە هەموو شتێك باشترە ."

ئاخ شەکورە داماوەکەم ! خۆ پیاوێك یان ئاغا و پاشا یەك نیت کە مۆرێکت هەبێ و لە بنی نووسراوەکەتی بدەی . سەرەتای ناوەکەی خۆی وەکوو پەلەورێکی ترسە نۆك لە گۆشەی خواری نامەکەوە نووسیبوو . لەوانەیە بتانەوێ بزانن کە من چۆن نامە مۆردارەکان دەکەمەوە و دەیانخوێنمەوە ، خۆ ئەم نامانە مۆریان پێوە نییە . لەوانەیە ئێستا شەکوورە وا بیر بکاتەوە کە من ژنە جوولەکەیەکی هیچ نەزانم و نامەکەی ناخوێنمەوە . ڕاستە ، من نۆسراوەکانی ئێوە ناخوێنمەوە بەڵام کەسێکیتر

بۆم دەخوێنێتەوە . لەوە دەچێت کاتێ کە باسی خوێندنەوەی نامەکانتانم کرد سەرتان لێشێوا بێت ! با وەها باسی بکەم کە تەنانەت کەسانی هیچ نەزان و گێلیش لێم تێبگەن .

ئەو شتەی کەوا پێی دەڵێن نامە تەنیا وەکوو نووسراوە ناخوێندرێنەوە ، بەڵکوو ئەمەش وەکوو کتێب بە بۆن و هەست و دەست لێدان دەخوێندرێتەوە . ئەوانەی کە زانا وژیر بن دەلێن کە : نامەکە بخوێنەوە بزانم چی دەڵێ ،ئەوانەش کە گەمژە و تێنەگەیشتووبن دەلێن : "نامەکە بخوێنەوە بزانم چی نووسراوە ". خوێندنەوەی نووسراوەکە هونەر نییە ، بەڵکوو شتی گرنگ خوێندنەوەی تەواوی نامەکەیە . گوێڕاگرن بزانن کە شەکورە چ شتانیکی تری گوتبوو :

1- (نامەوێت نهێنی کاری بکەم ) هەر بۆیە نامەکە ئەستەرەوە دەنێرم کە ناو بانکێکی دەر کردووە .

2- ( نامەکە زۆر مەپێچێنەوە ، بۆ ئەوەی کە کەس وا تێنەگات کە نهێنی کاری تێدایە )

نامەکە کراوە بوو ، ڕەسمێکی گەورەشی‌لەگەڵدا بوو ! بە ڕای من ئەمە ڕەتکردنەوە نییە ، بەڵکوو گەڕانەوەی ئەوین و بانگهێشتێکی عەشقە.

3- ئەمەش لە بۆنی نامەکەوە دیار بوو ، ئەمە بەقەدەر دوودڵی ئەو کەسەی وا نامەکە دەکاتەوە نادیارە ( ئەمە بۆنی دەستییەیان وەکوو خۆی عەتری لێداوە ؟ )لە ڕاستیدا کەس لە بەرامبەر ئەمەدا بێ هەڵویست نابێت ، چونکە شتێکی سەرەنجڕاکێشە . ئەم بۆنە مێشکی ئەو کەسەی تێکدا کەوا نامەکەی بۆ خوێندمەوە و دڵنیام کە بەشی تێکدانی عەقڵی ڕەشەش دەکات !

4- من ئەستەرێكی نەخوێندەوارم ، عەشقی ئەم دێڕانە لە قەلەمەكەدا شاراوەیە . ئای لە من ! چەندە پەلەپەل دەكەم ! سەرە ڕای ئەوەی كە دەڵێ بایەخێكی زۆرت پێ نادەم ، ئەڵێی پیتەكانی بەر شنە بایەكی نەرم كەوتوون و زۆر بەناسكی و جوانی لەپاڵ یەكدا ڕیز كراون و بە پێچەوانەی قسەكانی ، شتانێكی شاراوەیان تێدا یە كە دەڵێ : " تۆزێك بەر لە ئێستا ئورهانت بینی " ، ئەمە مانای وایە كە بە دزییەوە سەیری كردووە .

5- ئەگەر من ئەستەرە جوولەكەكە بم وادەزانم كە كاتێ شیرین چاوی بە وێنە جوانەكەی خەسرەو دەكەوێ یەكسەر عاشقی دەبێ . ژنە خۆش خەیاڵەكانی ئەستەنبووڵ گیانیان بۆ شتێكی ئاوەها دەردەچێ، بەڵام نازانم ! ئەوە یەكەم جار ە كە دەبینم كەسێك وێنەیەك بنێرێتەوە . زۆرجار زۆر كەسم تووش دەبێ كە دەڵێن ئەو نامەیەمان بۆ هاتووە ، زەحمەت نەبێ بۆمانی بخوێنەوە . نووسراوەكان زۆر سەیرن ، پەشۆكاوتان دەكات و خاوەنی نامەكەش لە بەر ئەوەی كە دەزانێ ئێوە نامەكەتان خوێندۆتەوە ، بە شەرمێكەوە داواتان لێدەكات كە جارێكیتر كاری وا نەكەن ، بەڵام جارێكیتر دەیخویننەوە ، لە دواییدا ئەوەندە دەخوێندرێتەوە كە هەر دووكتان لەبەری دەكەن و وای لێدێت كە جارجار پرسیار بكەن و بڵێن ئالێرە یان لە وێدا چی نووسراوە . زۆر لەو كچانە ، لەگەڵ ئەوەی كە نەخوێندەوارن و ناتوانن نامەكان بخوێننەوە ، هەموویان لەبەر كردوووە . هەر بۆیە زۆر جار نەخوێندەوارییەكەی خۆمم لەبیر دەچێتەوە ودەمەوێ ماچیان بكەم لەلایەكیترە جارجار كە كچەكان دەیانەوێ تەماشای نامەكە بكەن و دەستی پێوەبدەن هەندێك حەیوانی نەفام دەڵێن : ئەوە چ دەكەن ؟ مەیخوێننەوە ، ئیدی تەماشای چی دەكەن ؟ یان وەكوو ئەوەی كە نامەكە

**هـی خـۆی بێـت لای خـۆی دەیهێڵێتـەوە و نایداتـەوە بـە کچـەکان . ئەوسـا شەڕەکە بۆ من دەمێنێتەوە و تووشی شەڕ دەبم و نامەکەیان لێدەسێنمەوە و دەیدەمەوە بە کچەکان .**

**ئیشەکەی من ئاوەهایە ، ئەگەر حەزتان لێبکەم یارمەتیتان دەدەم .**

## ((من شەکورەم )) (9)

**نازانم لە بەر چی بوو ؟ کاتیۘ ڕەشە بە سواری ئەسپەکەیەوە لـەو بـەرەوە تێپـەڕ دەبـوو منـیش چـوومە بـەر پەنجەرەکـە و تەماشـای ئـەوم دەکـرد . ماوەیەکی درێژ لە بەر دەلاقەکەدا مامەوە . ناتوانم هەموویتان بۆ باسبکەم ! دەمزانی کـە ڕەشـە لـەوێوە دەچێت ، بۆیـە بـە ڕێگـای خەیریـەوە خەبـەرم بۆ ئەستەر ناردبوو . بۆ تەماشاکردنی چارۆکەکانم ڕۆیشتبوومە ناو ژووری**

بەرامبـەر دار هەنارەکـە ، کەچـی لـە خۆمـەوە و بـە هـەموو توانایەکمـەوە دەلاقەکـەم کـردەوە و یەکسـەر چـاوم پـڕ بـوو لـە تیشـکی هـەتاو، لـە دواییـدا چـاوم بـە ڕەشـە کـەوت . ئـای چـەندە جـوان بـوو ! گـەورە و مـاقووڵ بـووە ، زیپکـەکانی کـاتی جـوانی نـەماوە و زۆر قـۆز بـووە . لـە دڵـی خۆمـدا وتم : شەکورە ! سەیری ڕەشە بکە ، برا ڕۆ کە قۆزە ! تۆ سـەیری چاوەکانی بکـە ! ئـۆی لـە مـن ! چـیم کردبـە خـۆم! نامەیـەکم بـە پێچـەوانەی ئەمانـەوە بـۆ نووسیوە !

دوانزە ساڵ لە من گەورەتر بوو ، لە دوانزە ساڵی خۆمدا وا هەستمدەکرد کە لە ئەو پێگەیشتووترم . لە باتی ئەوەی کە وەکوو کوڕێکی هـەرزە کـار لـە بەرامبەرمدا ڕاوەستێ و بڵێ : ئەمە دەکـەم و ئـەوە دەکـەم ، لێـرە بـازدەدەم و لـەوێوە دەچـمە سـەرەوە ، سـەری دادەخسـتە سـەر کتێـب و وێنـەکانی بـەر دەستی و نیگـای چاوەکانی تێـدا ون دەکـرد . لـە دواییـدا عاشـقم بـوو بـوو . تەمـەنم گەیشـتبووە دوانـزە سـاڵ ئیـدی لـەوە دەترسـام کـە ئەگـەر ڕوو بـە ڕووی‌یـەك ببینـەوە چـاومان بەیەکـدا هەڵـدەتۆقێ و عاشـقمدەبێ . بـەڵام بـۆ نموونە جارجار دەیگوت ئەوچەقویەم پێدەدەی کـە دەسکەکەی لـە شفرەی فیـل دروستکراوە ، کەچـی لـە دواییـدا سـەری هەڵنـەدەبڕی و تەماشـای نێـو چـاوانمی نـەدەکرد . یـان بـۆ نموونـە ئەگـەر بمگوتبایـە شـەربەتی گێڵاسـەکە خۆشـە ؟ ئەگەرکەسـێك دەمیشـی پـڕ بێـت بـە بزەیـەکی شـیرینەوە یـان بـە گوزارشتکردنێکی جوانەوە وەڵامێکی ئەرێنی دەدات ،بە لام ئـەو هـیچ کاتێك وەهـای نـەدەکرد و وەکووئـەوەی کـە لەگـەڵ گێلێکـدا قسـە بکـات بـە هـەموو توانایەکییـەوەدەیگوت : بـەڵێ . لـە ترسـاندا نەیـدەوێرا تەماشـام بکـات . ئەوسا زۆر جوان بووم ، هەر کوڕێکی هەرزە کار لە بەر دەرگایەکدا یان لەبەر

پەنجەرەیەکدا چاوی پێبکەوتبایم یەکسەر عاشقم دەبوو . ئەمانەتان بۆ خۆ پەسەندان و لە خۆتاریفکردن بۆ باسناکەم ، بەڵکووبۆ ئەوەیە کە لە داستانەکەم تێبگەن و بەسەرهات وچارەی خۆمتان بۆ بگێڕمەوە .

کاتێکی تایبەت هەیە لە ناو بەسەرهاتی عەشقەکەی خەسرەو وشیریندا کە هەمووتان پێی دەزانن ، من و ڕەشەش زۆر جار باسی ئەوەمان دەکرد . شاپوور دەیەوێت کە خەسرەو شیرین بکات بە دڵداری یەك ، ڕۆژێك لە ڕۆژان شیرین لەگەڵ خزمەتکارەکانیدا دەچێت بۆ گەشت وگوزار بۆ لادێ و گوندەکانی وڵات . لە بن دارێکدا بۆ پشوودان ڕادەوەستێ ، کاتێ سەر هەڵدەبڕێ ، وێنەیەکی هەڵواسراو دەبینێ . تومەزە شاپوور بە دزییەوە وێنەی خەسرەوی لەوێدا هەڵواسیوە ، شیرین کە چاوی بە وێنەکە دەکەوێت ،یەکسەر عاشقی دەبێ . ئەم کاتەی وا بەبی بینینێ خەسرەو عاشقی دەبێت ، شایانی باسەئەمە لە لایەن وێنەکێشانەوە بە سەدان جار کراوە بە وێنەی جوان . ئەو کاتانەی ڕەشە لەگەڵ باوکمدا ئیشی دەکرد ، زۆر جار ئەمەی بینی بوو ، یەك دوو جاریش بە سەیر کردنەوە وەکوو خۆی وێنەیەکی لێکێشا بوو . کاتێ کە عاشقم بوو هەر ئەو وێنەیەی کێشا، بەڵام ئەم جارەیان لە باتی وێنەی خەسرەو شیرین وێنە من و خۆی دانا بوو ، ئەگەر نووسراوەکەی ژێرەوەی وێنەکە نەبایە کەس نەیدەزانی کە ئەمە وێنەی من و ئەوە . وێنەکەی منی بە ڕەنگی شین و ئەوەی خۆشی بەسوور بۆیاخ کرد بوو .لە وەش زیاتر لەژێر وێنەکەی خەسرە و شیریندا ناوی من و خۆی نووسیبوو . وێنەکەی وەکوو تارانێکی دیار وبەر چاو خستبوە جێگایەك کە من بیبینم و خۆیشی هەڕای کرد بوو .

دەمزانی کە وەکوو شیرین عاشق نابم بۆیە هەر بۆیە باسم نەکرد تا ئەو

کاتەی کەگەڕایەوە بۆ ماڵی خۆیان، شەوێك لەو شەوانەی وابە شەربەتی گێلاسی سارد کراو ی چیای " ئولوداغ " دەروونی خۆمان فێنك دەکردەوە بە باوکمم گوت . ڕەشە ئەو کاتانە تازە قوتابخانەی تەواو کرد بوو ، باوکم زۆری بۆ هێنا کە لە لای (( نایم پاشا )) دابمەرزێت . هەر وەها لە گەڕەکەکانی خواری شاردا وانەی دەوتەوە، باوکم دەیگوت : "بە جۆرێك کار ناکات تاوەکوو بچێتە لای (( نایم پاشا)) ، ڕەشەلووتی بەرزە و کوڕێکی ژیرە ."

بەڵام ئەو شەوە مانای قسەکەی لە ئێمە هێنا و وتی : ئەم خوشکەزاگە فەقیرەمان چاوی بڕیوەتە جێگای بەرزتر .گوێم نەدایە . دایکم وتی :ئەوە نەبوو کە ئێمە دەمانزانی ئەم کوڕە زۆر ژیرە ! لە ڕۆژانی دوای ئەوەدا مەگەر خودا خۆی بزانێت کە باوکم چیدەکرد ، بۆ ئەوەی کە لە من وباوکم ڕق هەڵنەگرن ، باسی ئەوەتان بۆ دەکەم کە چۆن لە ماڵی ئێمە و گەڕەك و شار دوورخرایەوە . بڕوابکەن هیچ چارەیەکی ترمان نەبوو . ئەو کاتانەی کە ئەم عاشقە بێ هیوایە بێ ئومێد کرا، ئەگەر کەسانێکی ماقووڵ هەبایەن ، لەو دونیا بێ یاسایەی دڵ تێدەگەیشتن و دەیانگوت : ئێمەیان بەیەك ڕەوا نەبینیوە و کۆتایی بەباسەکە دەهێنا. دایکم چەند جارێك گوتی : دڵی منداڵەکە مەشکێنن . ئەو منداڵەی وا دایکم باسی دەکرد ، تەمەنی بیست و چوار ساڵ بوو ، لەبەر ئەوەی کە باوکم ئەم کارەی ڕەشەی وەکوو بەڕەڵایی وهەرچی وپەرچێتی لەقەڵەم دەدا بەقەستەوە بەپێچەوانەی قسەی دایکمی کرد وداواکارییەکانی بەجێنەهێنا .دواتر هەواڵی ئەوەمان پێگەیشت کە ئەستەنبووڵی بەجێهێشتوە ، ئەگەر فەرامۆشیشمان نەکرد بێ ، ئەوا بیریشمان لێنەدەکردەوە . بەڵام لە بەر ئەوەی کە نەمدەزانی لە چ شارێکدایە

لە بیرەوەریەکانی کاتی منداڵی وێنەکەییم شاردەوە و هەڵمگرت و لای خۆم وتم : ئەمە کارێکی باشە . بەڵام بۆ ئەوەی کە باوکم نەیبینیٚ و مێردەکەم چاوی پێی نەکەویٚ و لیٚم خانووگمان نەبیٚ ، بە شیوەیەکی زۆر هۆستایانە دوو دڵۆپ مورەکەبی " حەسەن پاشایم " داتەکاندە سەر ناوەکەی من و خۆی .

وەکوو گوڵێکی لیٚهاتوو، کەس نەیدەزانی کە چییە . ئەگەر لەنێوان ئیٚوەدا کەسێك هەبێت و بیەوێت کە لەبەرامبەر مندا ئەمە بەکاربهێنیٚ ، بابزانیٚ کەمن ئەمڕۆ وێنەکەم بۆ ناردەوە و لەبەردەقەڵاٚکە شەوە تەماشامکرد ، باهەر بەمەشەوە تەریق بێتەوە و تۆزێك بیربکاتەوە . کاتیٚ کەلە دوای دوانزە ساڵ ڕۆیشتمە بەرامبەری ماوەیەك لەبەر سوورایی هەتاوی ئێوارەدا مامەوە ، باخچەکەمان لەبەر ئەو ڕەنگە سوورە ، ڕەنگێکی(کاڵتر) تورنجی بەخۆوە گرتبوو . تائەو کاتەی کە باش سەرمام بوو لەوێدا ڕاوەستام ، هیچ بایەك نەدەهات، ئەگەر بابم یان کەسێکی تر منی بدیبایە یان وەکوو چاویان بەڕەشە بکەوتایە کە دەگەڕێتەوە و لەبەرامبەرمندا تێپەڕ دەبێت چییان دەگوت ؟. گوێی لیٚمەدەن ، بەخەیاڵیشمدا نەدەهات . هەفتەیەك جارێك لەگەڵ یەکێك لە کچەکانی "زیوەر پاشا "دا دەڕۆیشتین بۆ حەمام . کچێکی دەم بەپێکەنین و زۆرزان بوو ، لەکاتی چاوەڕوان نەکراودا قسەی وا سەیر سەیری دەکرد کە مرۆڤ سەری سوڕدەما . ناوی "مەسوورە" بوو، ڕۆژێك گوتی :کاتی وا هەیە شتێك دەڵێم ، کە دەیڵێم تازە تێدەگەم کە بیرم لێنەکردۆتەوە ، بەڵام کاتێکیش کە تێدەگەم بە بڕوایەکی تەواوەوە بەپێچەوانەی ئەوە بیر دەکەمەوە .

لەنێو هەموو ئەو وێنەکێشانەی کەوا باوکم بانگی دەکردن و هاتووچۆی

مـاڵی ئێمـەیان دەکـرد ، ئـەوەیان کـە لەهـەموویان زیـاتر ڕۆحێکـی پـیس و هەژاری هەبوو ، زەریڤ ئەفەندی بوو ، ئەگەر لێتانی نەشارمەوە پێویستە کەبڵێم  بە دزییەوە تەماشای هەمویانم دەکرد .

دەلاقەکـەم داخسـت و لەژوورەکـە دەرکـەوتم و ڕۆیشـتمە خـوارەوە بـۆ مەتبەخەکە .

ئورهـان وتـی : دایـە ، شـەوکەت بەقسـەی تـۆی نـەکرد ، کـاتیّ ڕەشـە ئەسپەکەی لە گەوڕەکە هێنایە دەر ، شەوکەتیش لـە مەتبەخەکە دەرکـەوت و لە کونی دیوارەکەوە تەماشای ئەوی کرد .

شەوکەت دەستێکی ڕاوەشاند و وتی : دەی جا چییە ! خۆ دایکیشم لە کـونی دۆڵابەکـەوە تەماشـای دەکـرد  وتم : خەیرییـە ، ئێـوارە نـانی بادامیشیرینیان بۆ دروست بکە .

ئورهـان هـەڵقونی و دڵیخـۆش بـوو ، بـەڵام شـەوکەت نووکـەی نـەکرد . لـە پلیکانەکەوە سەردەکەوتم کە هەردووکیان بـە قـەپووقاڵ و بەپەلەپـەل هـاتن و گەیشتنە لام . قاقایەکی پێکەنینم لێدا و یەکی یەك مشتی سوکەڵەم لەپشتە ناسکۆڵەکانیان دا . چەند خۆشە ئێواران لەگەڵ مناڵەکانتدا لـە ماڵێکدا بیـت ! باوکم بێدەنگ بێدەنگ کتێبەکەی دەخوێندەوە .

وتم : میوانەکەمان چوو، هیوادارم کە ئازاری نەدابن . وتی : نا ، وەکو جاران لەبەرامبەر زاواکەیدا بەڕێزە.

- زۆر باشە .

- بەڵام تۆزێکیش بەحیساب و تەدبیرەوە هەڵسوکەوت دەکات .

ئەمەی بۆ ئـەوە نـەگووت کـە بزانـیّ من چـی دەڵـێم ، بـەڵکوو بۆ ئـەوە بـوو کەڕەشەی پیّبچووك بکاتەوە و  بابەتەکە بگۆڕێت ... .

ئەگەر کاتێکی تر بایە بەزمانە درێژەکەی خۆم وەڵامێکی باشم دەدایەوە .
ئەم جارە کە بە سواری ئەسپە سپیەکەیەوە بیبینم و بەرەو لای من نزیك دەبووەوە ، زۆر پەشۆکابوو بووم لەدوایشدا نازانم چۆن بوو کەمن و " ئورهان " لەژوورەکەدا باوەشمان کردبوو بەیەکدا ، "شەوکەتیش " پاڵی پێوەدام ، ماوەیەك دەستیان کرد بە ئاژاوە و شەڕە قسە . وەکو توتکە سەگ خۆشمدەویستن ، ماچمکردن ، سەر و قژ و پشت و دەم و چاویانم ماچکرد و بەرەو سینگی خۆم ڕامکێشان ، هەستم بەقورسایی لاشەیان لەسەر مەمکەکانم کرد .

وتم : ئێ یێێ بۆنی قژتان دێ . بەیانی لەگەڵ خەیرییەدا دەچن بۆ حەمام .

شەوکەت وتی : من نامەوێ ئیدی لە گەڵ خەیریەدا بچم بۆ حەمام .

– : بۆ زۆر گەورە بووی ؟

– : دایە بۆچی ئەمڕۆ ئەو کراسە مۆرە جوانەت لە بەر کردووە ؟

ڕۆیشتمە ژوورەکەی ترەوە و کراسەکم گۆڕی و کراسە سەوزەکەم لە بەر کرد . هەمیشە ئەم کراسەم لە بەر دەکرد ، کاتێ کە جلەکەم داکەند سەرمام بوو ، ترس ولەرزێك هات بە گیانمدا . بەڵام لەبەر گەرمای زۆری لاشەم هەستم بە لەسەرخۆیی سك و لاشەی خۆم کرد . گۆنام تۆزێك سوراویی پێوە مابووەوە ، کاتێ کە لە گەڵ مناڵەکاندا خۆمان بە یەکتریدا دادەدا ، سڕابووەوە . تۆزێك تفم دا لە دەستم و بەسەر گۆنامدا هێنام و بردم تا وەکوو جوان بڵاو بووەوە . هەندێك لەو خزمەو ناسیاوانەی وا لە حەمام دا من دەبینن پێم دەڵێن کە : تۆ لە ژنێکی بیست وچوار ساڵی خاوەن دوو مناڵ ناچی ، بە پێچەوانەوە لە کچێکی تەمەن شەش ساڵ دەچی، حەز

دەكـەم ئێـوەش بڕوايـان پێبكـەن ، ئـەگينا هيچـتان بـۆ باسـناكەم . قسـە كردنەكـەم لـە گـەڵ ئێـوەدا كـەم نـەبينن و سـووكايەتيم پێمەكـەن ، ئـەوە ساڵانێكی دوور و درێژە كە باوكم تەماشای وێنەی ناو كتێبەكان دەكات . منيش هەموو كات لە ناو ئەوانەدا بە دوای ژنان و جوانەكاندا گەڕاوم ، ئەگـەر كـەميش بێت بـەڵام ديسان تييێدا هەيە ، هـەموويان شـەرمەزار و شەرمۆكن، وەكووئەوەی كە دوای لێبوردن بكەن لە بەرامبەر يەكدا ڕاوەستان . نابێ كە ڕاوەستانەكانيان وەكوو ڕاوستانی پياو و پادشاو سەربازەكان بێ ، لە بە ڕداوە شاوەيی و بێ سەرنجی هەندێك لەو وێنەكێشانە ، هەندێك لـە ژنـان لـە بـاتی ئـەوەی تەماشـای خۆشەويستەكايان بكـەن تەماشـای شـتانێكیتری وەكـوو پـەراخێكی ئـاو دەكـەن ودواتـر چـاو دەبڕنـە چـاوی خۆينەر . داخۆ ئەو خۆێنەرە كييێە كە وا هەموو كات سەيری دەكەن ؟ زۆر جار بيرم لەوە كردۆتەوە . كاتێ كە دەبيسم گاورە زانخوازەكان لـە كـاتی تـە يمـوورەوە تـاوەكوو ئێسـتا كتـێبی كـۆنی دووسـەد سـاڵە دەكـڕن و ئـاڵتونی پێـدەدەن ، تـرس و لـەرزێك دامـدەگرێت . لەوانەيـە ڕۆژێكـيش كەسـێك لـە جێگايـەكی دوورەوە ئـەم بـە سـەر هاتـەی مـن بخۆێنێتـەوە ، ئايـا هەسـتی كەوتنە ناوداستان و كتێب هەر ئەمە نييە ؟ ئايا ئەو هەموو پادشا و وەزيـرە كـە نووسـەران ڕادەسـپێرن بـوچ ئـەوەی كـە لـە سـەريان كتێـب بنووسـن و وێنەيان بكێشن لە بەر هەمان ترس و لـەرز وەها ناكـەن ؟ كاتێكە منيش لـە دەروونمدا هەستم بەم لـەرزە كرد ،ويستم وەكوو ئـەو ژنانـەی وا چاوێكيان لەوەيەكـە كێلـە كـوێ و كـەی كتێبەكـە دەخوێنێتـەوە قسـە بكـەم . ژنێكـی جـوان و ژيـرم و پێمخۆشـە كـە ئێـوە سـەيرم دەكـەن ، ئەگـەر جـار جارێكيش يەك دوو درۆ بكەم ، ئەوە بۆ ئەوەيە كەبە هەڵە لە سەر من بير نەكەنەوە .

لە وانەیە هەستان بەوە کردبێ کە باوکم منی خۆشدەوێ ، بەر لە من سێ کوڕی هەبوو ، باوکم لە بەرامبەر مندا تێکدەچێ و دەلەرزێ ، ویستی بمدا بە پیاوێك کە خۆی هەڵیبژاردبوو ، بەڵام من شووم پێنەکرد . بە گوێرەی باوکم ، پێویست بوو کە مێردەکەی من پیاوێکی زانا و وێنەکێش و هونەر دۆستبایە ، خاوەن دەسەلات بایە و کوری "قارون"ی دەوڵەمەند بایە ، من باش دەمزانی کە شتی ئاوەها تەنانەت لە ناو داستانەکانیشدا نابن و ئەگەر بە قسەی باوکمم بکردایە ئەوا دەمامەوە و مێردم نەدەکرد . هەر بۆیە دڵم چووە کابرایەکی سوپاهیوە بوو مێردیشم پێکرد ، هەموو کەس باسی جوانی مێردەکەی منی دەکرد . لە ژێرە هەواڵم بۆ ڕێکردبوو ، وتبوم دەمەوێ بیبینم . ڕۆژێك لە حەمام دەگەڕامەوە ، ئەویش لەسەر ڕێ ڕاوەستا بوو . کە چاوم پێکەوت یەکسەر عاشقی بووم ، کوڕێکی ئەسمەری لاشە سپی بوو ، چاوە سەوزەکانی زۆر جوان بوون ، دەست و مەچەکێکی بە تواناى هەبوو ، وەکوو منداڵێك کە خەوبیبیاتەوە ئاوەها پاك و بێدەنگبوو . لەوانەیە لەبەر ئەوەی کەوا هەموو ژیانی خۆی لە مەیدانەکانی شەڕدا بۆ پیاو کوشتن تەرخان کردبێت ، من وا هەستمدەکرد کە بۆنی خوێنی لێوە دێت. بێدەنگ بێدەنگ بە ئارامی دانیشتبوو ، باوکم دەیگوت : ئەمە سەربازێکی ڕەش و ڕووتە و تۆی پێنادەم . بەلاَم کە وتم ئەگەر منی نەدەی خۆم دەکوژم ، یەکسەر ڕازی بوو . ئەم پیاوە لە هەموو شەڕێکدا زۆر پیاوانە ئەم لا وئەولای دەکرد و وەکوو کوڕی کوڕانە هەموو کارێکی دەکرد ، هەر بۆیە پایەیەکی باشیان پێداو دەهەزار ئاکچەی(پارەیکاتی عوسمانییەکان ) بردەوە . چوار ساڵ بەر لە ئێستا سەربازە کانیتر لە شەڕی سەفەوییەکاندا گەڕانەوە بەڵام ئەو نەهاتەوە ، خەفەتی زۆرم خوارد . چونکە هەرچی

دەچوو لە شەڕدا شارەزاتر دەبوو و بە گوێرەی خۆیشی کاری جۆرا و جۆری دەکرد . پلەی بەرزتری وەردەگرت سەربازی زیاتری فێری شەڕ دەکرد . هەندێك کەس دەیانگوت : بەچاوی خۆمان بینیومانە کە لە هێزی پیادەی " سوپا " جیا بووەتەوە و لەگەڵ پیاوەکانی خۆیدا چوونە ناو شاخەکان . لە پێشدا وامدەزانی کە دەگەڕێتەوە ، بەڵام کە دوو ساڵی بە سەردا چوو ئیدی کەم کەم ڕاهاتم.

کاتێکیش کە زانیم ژنی وەکوو من زۆرە وهێشتا مێردەکانی ئەوانیش نەگەڕاونەتەوە زووتر عادەتم پێکرد . شەوان باوشم دەکرد بە منداڵەکانمدا و دەگریام ، بۆ ئەوەی کە ئەوان نەگرین . درۆ ودەلەسەی زۆرم بۆ دەکردن و دەمگوت : "کابرایەك گوتویەتی : باوکتان بەبێئەوەی خەبەر بنێرێتەوە دەگەڕێتەوە" . هەر ئەمەش لە دواییدا لە ئەم دەم بۆ ئەو دەم دەگەڕا و ئەگەیشتە گوێی خەڵکی و لە دوایشدا دەهاتن و دەیانگوت : " مزگێنی بدە ، پیاوەکەت دەگەرێتەوە " . بەم شێوەیەش یەکەم کەس خۆم بڕوام بە درۆکانی خۆم دەکرد . لەگەڵ باوکە هیچ نەدیووەکەی مێردەکەم کە خۆی زۆر بە گەورە دەزانی و برا چاو سەوزەکەیدا لە( چارشی پازار ) دا ماڵێکمان بە کرێگرتبوو ، لە وێ‌دادەنیشتین ، لەو ڕۆژەی وا مێردەکەم ون بوو بوو ، ماڵەکەی ئێمەش تووشی تێکچون و نەهامەتی بوو بوو . باوکی مێردەکەم لەدوای ئەو هەموو پارەیەی کەواکوڕە گەورەکەی بە شەڕ کردن بەدەستی هێنا بوو تازە دەستی بە ئاوێنە فرۆشی کرد بوو . کچێکی خزمەتکارمان هەبوو ، بۆ ئەوەی کە پارەی پێنەدەن ، شەوێکی زستان بردیان بۆ بازار و لەوێ‌ فرۆشتیان و داواشیان لە من دەکردکە کارەکانی ئەو ئەنجام بدەم ، ئەبوایە چێشتم دروستبکردایە و جل و بەرگم بشۆردایە ، تەنانەت دەبوایە

بڕویشتمایەتە بازاڕ و شتم بکڕیبایە . هیچ گلەییم نەدەکرد ، و دانم بە سەر دڵی خۆمدا دەگرت و هەموویم ئەنجامدەدا ، مێردەکەم برایەکی هەبوو کە ناوی حەسن بوو ، لە گومرکدا ئیشی دەکرد و پارەیەکی زۆری دەست دەکەوت. هەر چەند پارەی زیاتری دەست دەکەوت ، زیاتر هەستی بە پیاوەتی دەکرد .ئەم حەسەنە ناپیاوە لە بەر ئەوەی کەوا خزمەتچییەکی‌وای نەما بوو کە شەوان بیباتە ژوورەکەی خۆی ، وردە وردە قەرەی خۆی لە منداڵەدا و دەیویست شەوان بێتە ناو ژوورەکەمەوە ، سەرم سوڕ مابوو ، نەمدەزانی چیبکەم . خۆ دەمتوانی یەکسەر بگەڕێمەوە ئێرە (ماڵی باوکم ) . بەڵام بە گوێرەی قازی مێردەکەی من هێشتا دەژیا و نەمرد بوو ، هەر بویە ئەگەر ماڵی باوکی‌مێردەکەم تووڕە ببایەن ئەوا دەیانتوانی بەزۆر بمبەنەوە ماڵی خۆیان و باوکیشمیان دەگرت و سزایان دەدا ولە نێو خەڵکیدا ئەیانشکاند .

ئەوەی ڕاستیش بێت دەمتوانی لەگەڵ حەسەنیشدا جۆر ببم ویەکتریمان خۆشبویستایە ، بەڵام ئەگەر هەروا لە خۆمەوە وەهام بکردایە ، خودا نەکا! دەبووم بە قەحپەی دەرماڵەکەی . ئەوان لەوە دەترسان کە من لەگەڵ منداڵەکانمدا بگەڕێمەوە ماڵی باوکم و داوای بەشە ماڵی خۆم بکەم ، هەر بۆیە هیچ لایەنگری ئەوە نەبوون کە قازی وەها بڕیار بدات کە مێردەکەم مردووە . لە بار و دۆخێکی ئاوەهاشدا نەمدەتوانی لەگەڵ حەسەن یان کسێکی‌تردا زەماوەند بکەم . ئەمەش وایدەکرد کە ژیانی هاوسەری من بە ماڵەوە گرێدرا و بێت . هەر بۆیە ئەوان حەزیان دەکرد کە دادوەر وەها بڕیار بدات کە مێردەکەم ناپەیدایە ، ئەوەشتان لە بیر نەچێت کە من کاری ماڵم بۆ دەکردن و جل و بەرگەکانیانم دەشۆرد ، لەوەش زیاتر یەکێك لە ئەوان

شێتانە عاشقی من بوو . ڕێگا چارەی گونجاو بۆ حەسەن و باوکی ئەوە بوو کە من مێرد بە حەسەن بکەم . بەڵام پێویست بوو کە چەند شایەتێك جۆر بکرێن و کەسانی خزمی مێردەکەم وەکوو باوك و براکەی نارەزای نەبایەن ، شایەتەکانیش لە بەرامبەر چەن ئاکچەدا بیانگوتبایە : "ئێمە دەزانین ، ئەم پیاوە مردووە " ، لە دواییدا دادوەریش وەکوو مردوو حیسابی دەکرد . بەڵام کێشەی هەرمەزن ئەوە بوو کە دەبوایە وەها نیشانم بدایە کە داوای بەشە ماڵ ناکەم و لەگەڵ حەسەندا دەژیم و مێردی پێدەکەم و بۆ ئەو شوو کردنەش داوای پارە ناکەم ، لەوەش گرنگتر ئەوە بوو کە دەبوایە وەها نیشانم بدایە کە بە هەڵبژاردنی خۆم حەسەنم خۆشویستوە ودەبووکە متمانەم پێبدایە و لەگەڵیدا جۆر ببایم . هەڵبەت ئەمە بۆ ئەوە نییە کە حەسەن کەیف خۆش بێت وپێی خۆش بێت ، بەڵکوو تەنیا لە بەر ئەوەیە کە بەشێوەیەکی باوەڕ پێکراو وەها دیار بکەم کە حەسەنم خۆشدەوێت .بەڵام لە ڕاستیدا ئەگەر تۆزێکیتر هەوڵبدەم ئەوا دەتوانم عاشقی حەسەن ببم . هەشت ساڵ لە مێردە ون بووەکەم  بچووکتر بوو ، کاتیٚ کە مێردەکەم لە ماڵ بوو وەکوو برایەکی خۆم چاوم لێدەکرد ، هەر بۆیە نێوانمان خۆش بوو ، خۆی بە گەورە نەدەزانی ، زۆر گرێداو بوو ، لەگەڵ منداڵەکانمدا یاری دەکرد و جاری واش وەکوو ئەوەی کە خەریك بێت لە تینوویەتیدا بمریٚ و منیش پەرداخێك شەربەتی گێلاسی پێبدەم ، بە تامەزرۆییەکەوە سەیری منی دەکرد .  بەڵام لە لایەکیتریشەوە دەمزانی کە ناتوانم بە ئاسانی عاشقی کابرایەك ببم کە جلم پێدەشۆریٚ و خواردنم پیٚ دروستدەکات و دەمنێریٚ بۆ بازاڕ و بە بێشەرمییەوە وەکوو کوێلەیەك لەگەڵمدا هەڵسوکەوت دەکات . ڕۆیشتمەوە ماڵی باوکم و تەماشای قابلەمە و قاپ وکەوچکەکانم کرد و

سەیرێکی‌کوپەکانم کرد و تێر تێر گریام ، حەسەن نەیدەهێشت کە لەگەڵ منداڵەکانمدا باوەش بکەین بەیەکدا و هاوکاری یەکتری بین ، هیچ مەجالیکی پێنەدەدام . بۆ ئەوەی کە ببم بە هاوسەری و بتوانم لەگەڵیدا بژیم ، پێویست بوو کە مەجالێکی پێبدایەم تا وەکوو بیرم لێبکردایەتەوە . لە بەر ئەوەی کە متمانەی بە خۆی نەبوو ، چەند جارێك ویستی بێڕەوەشتی بکات . چەند جاریك ویستی دەست لە مەمکەکانم بدات و ماچم بکات و گوتی : " مێردەکەت ناگەڕێتەوە ، ئەگەر لەگەڵمدا جۆر نەبیٚ دەتکوژم " ، هەرەشەی لێدەکردم ، وەکوو منداڵێك دەگریا و بەم هەڵسو وکەوتانەی خۆیەوە هەلی بە دروستبوونی‌عەشقێکی ئەفسانەیی و ڕەسەن و بەشکۆ وەکوو ئەوەی کە لە کتێبەکاندا نووسراوە نەدەدا . هەر لە بەر ئەوەش تێگەیشتم کە ئیدی ناتوانم لەگەڵیدا بژیم و مێردی پێبکەم . شەوێك لەگەڵ مندالەکاندا خەو تبووم کە دەرگای ژوورەکەی کردەوە و ویستی بەزۆر بێتە ژوورەوە ، لە خەو ڕاپەڕیم و گوێم نەدایە ئەوەی کە منداڵەکان بترسن و دەستم بە قیژە قیژ و هاوار کردن کرد . وتم : جندۆکەیەکی خراپ هاتوەتە ناو ماڵەکەمانەوە ، باوکی مێردەکەم لە خەو هەستاند ، حەسەن هەر لەویٚ بوو ، چێژی دانەمرد بووەوە لە ناو ئەو قیژە قیژ و بانگ و هاوارەدا باوکی هات و حەسەنی بینی و یەکسەر زانی کە ئەو قیژە قیژەی وادەیکەم لەبەر جندۆکە نییە و هەمووی درۆ و دەلەسەیە و تێگەیشت کە حەسەنی کوڕی‌سەر خۆشە و ویستوویەتی بچێتە ژووری ژنی براکەیەوە . لە شەرماندا سەری داخست. وتم : " تابەیانی ناخەوم ، بۆ ئەوەی کە منداڵەکانم بپارێزم ، لەبەر دەرگاکەدا ڕادەوەستم و لەگەڵ ئەو جندۆکەدا شەڕ دەکەم " . باوکی مێردەکەم پیاوێکی ژیر بوو ، هیچ دەنگی نەکرد . بەیانی وتم : " ئەچمەوە

بۆ ماڵی باوکم ، نەخۆشە، دەچم و سەردانێکی دەکەم ، منداڵەکانیشم دەبەم " . شکستی قەبووڵ کرد . مێردەکەی خۆمم نەفرۆشت ، ئەو کاتژمێرەی وا مێردەکەم لە مەجارستانەوە بۆی هێنا بووم ، لەگەڵ ئەو قامچییە وا بۆ ئەسپە تووڕەکانی عەرەب دروستکرا بوو وەکوو نیشانەکانی ژیانی هاوسەری هەڵگرت و شەترەنجە تەوریزییە شفری فیلینەکەم دابەدەستی منداڵەکانەوە بۆ ئەوەی کە لەوێ یاری بکەین و ڕۆیشتمەوە بۆ ماڵی باوکم . لەگەڵ بە جێهێشتنی ماڵی مێردە و ون بووەکەمدا ، ئەوەیوا چاوەڕێم دەکرد ڕووی نەدا ، بەڵکوو بە پێچەوانەوە حەسەن کە تێگەیشت باوکی کارەکانی پەسەند ناکات بۆیە ئەمجارەیان دەستیکرد بە نووسین و ناردنی نامەی جۆرا و جۆری عاشقانە و دەیگوت : " کە ئیدی کاری ماڵم پێناکات و پارەی زۆری هەیە و شتانی لەو چەشنەی بۆ دووپات دەکردمەوە " .

بەر لەوەی کە خەیرییە نانی ئیوارە دروستبکات ، قاوەیەکی باشی گوڵی خورمای عەرەبستانم بۆ باوکم دروستکرد و کەوچکێك هەنگوینم تێکرد و لەگەڵ ئاوی لیمۆدا تێکەڵاوم کرد وبە بێدەنگی لە پاڵیدا دانیشتم . (( کتاب الروح )) ی دەخوێندەوە .

بەو جۆرەی کە دەیەویست دامنایە بەر دەمی . بە دەنگێکی ناسك و خەماوییەوە وتی : بەفر دەبارێ ؟

یەکسەر تێگەیشتم کە ئەمە دوایین بەفرێکە کە باوکم لە ژیاندا دەیبینێ .

## (( من دارێکم )) (10)

**من دارێکی تەنیام ، کاتیَ کە باران دەباری دەست بە گریان دەکەم ، بۆ خاتری خوا گوێم بۆ ڕاگرن با وەکوو هەندێك قسە و باستان بۆ بکەم ، قاوەکەتان بخۆنەوە باوەکوو چاوتان وەکوو جندۆکە دەرپەڕی وتەماشام بکەن تا وەکوو پێتان بڵێم کە بۆچی ئەوەندە تەنیام .**

**1- ئەڵێن : تەنیا لە بەر ئەوە ی کە پێویستە لە پشتی سەری ماﻣﯚستای بالۆرە ویژەوە دارێك هەبێت وێنەی تۆیان کێشاوە ، ڕاستە ، وینەی داری قەڵەمی وناسکیان لە لای من نە کێشاوە ، گیا حەوت پەلەکانی دەشتە سەوزە لانییەکان و ئەو تاشە بەردانەی وا جار جار لە مرۆڤ دەچن و جارجاریش لە شەیتان دەچن لەناو ئەم وێنەیەدا بەرچاوناکەون . پۆل پۆل هەورە چین چینەکانیش لێرە ڕۆیشتوون و باریان کردوە . تەنیا من و زەوی و ئاسمان و خەتێکی ئاسۆ ماوینەتەوە ، بەلأم داستانەکەم هێشتا بە تێکەڵاوی ماوەتەوە .**

**2- مەرج نیە من وەکو دارێك هیچ نەبێت بەشێك نەبم لەو کتێبە ، بەلأم لەبەر ئەوەی کە من وێنەی دارێك نیم لەناو هەموو کتێبێکدا ، نائاسوودە و پەرێشانم . کە نەتوانم لەناو کتێبێکدا شتێك نیشانبدەم و وێنەکەشم بە**

دیواره وه هەڵدەواسریٚ ، وەکوو کافیر و بوتپەرستان بوت پەرستیم دێتەوە یاد. ئامانتان بم بادارو دەستەی ئەرز ڕوومییەکان گوێیان لێنەبێت ،ئێستا کە ئاوا بە دزییەکەوە تاریفی خۆم دەکەم لەدوایدا ناچار دەبم کە بە شەرمێکەوە بترسم .

3- هۆکاری سەرەکی تەنیاییەکەشم ئەوەیە کەمن هێشتا نازانم بە شێکی کام داستانم . باباسی ئەوەتان بۆ بکەم کە خەریك بوو ببم بەبەشێك لە داستانێك ، بەلاّم لە ئاکام دا وەکوو پەلێك کەوتمە خوارەوە و لەویٚ نەمامەوە .

4- داستانی کەوتنە خوارم لە کتێبی داستانەکەم وەکوو کەوتنە خواری پەلێکی داری کتێبەکەی شا "تاماسووبی " پادشای ئێرانیەکان دوژمنی خوێنە خوارەی عوسمانییەکان بوو ، ئەم شایە لەهەموو پادشاکانی‌تری دونیا زیاتر حەزی لە نەخش و نیگار کێشان دەکرد .

چل ساڵ بەر لەئێستا پێی نابووە تەمەنەوە و لەخەڵەفاندا بوو . دەستی بەڕابواردن و کەیف و خۆشی کرد، گوییٚ لەمۆسیقا و شیعر دەگرت و شەرابی دەخواردەوە ، ئینجا تەماشای نەخش و نیگاری دەکرد . تا ماوەیەك بەم شێوەیە ڕۆژگاری خۆی تێپەر دەکرد ، بەلاّم لە دواییدا دڵی لەمانە سارد بووەوە وتەنانەت دەستی لە خواردنەوەی قاوەش بەردا . مێشکی ڕاوەستا بوو . لەبەر گومانی پیرەمێردەکانی دەوروبەری کەوا دەیانگوت لەوانەیە دەوڵەتی عوسمانی شەڕیان پێبفرۆشیٚ پایتەختی خۆی لە تەورێزەوە کە ئەوسا موڵکی ئێرانییەکان بوو گواستەوە بۆ قەزوین . کە پیرتر بوو ، ڕۆژێك جندۆکە دەستی لێوەشاند و کەوتە ناو قەیرانێکی ڕۆحییەوە و وتی : "ئیدی ئیدی واز لە شەراب خواردنەوە و یاری کردن

بە منداڵەکان دێنم و ئیدی تەماشای نەخش و نیگار ناکەم و تەوبە دەکەم . ئەمەش خۆی ئەوە دەسەلمێنیٚ کە کاتیٚ ئەم پاشا پایە بەرزە دەستی لە خواردنەوەی قاوە بەردا وە ئاوەها عەقڵی خۆی لە دەستداوە و شێت بووە.

هەر لە بەر ئەمەش نەخش و نیگار کێشەکانی ئێران کەوا لە ماوەی ئەو بیست ساڵەدا شتە هەر باش و دەر ئاساییەکانی دونیایان دروستکرد بوو ، وەکوو جووڵکی مریشك لەم شارە بۆ ئەو شار بڵاوبوونەوە .

((سوڵتان برایم میرزا )) برازای " شا تاماسووب " بوو ، کچەکەی پاشای لە خۆ مارە کرد بوو ، بوو بوو بە پارێزگاری شاری " مەشهەد " . ئەم کابرایە لێهاتووترین وێنەکێش و خۆشنووسەکانی لەوێنەکێشخانەکەی خۆدا کۆ کردبووەوە و دەیەویست مەسنەوییەکەی " جامی " کە ناوی ( حەوت ئۆرنگە ) و لە کاتی تەیموردا نووسرا بوو ، دووبارە بنووسێتەوە و بە نەخش و نیگار بیڕازێنێتەوە . کتێبێکی زۆر جوانی لێدروستکرد ، پادشا لەلایەکەوە حەزی لێدەکرد و لە لایەکیتریشەوە بەخیلی پێدەبردەوە . پەشیمان بوو لەوەی کەوا کچەکەی خۆی پێدا بوو ، " شا تاماسووب " کە باسی ئەم کتێبەی بیست زۆر تووڕە بوو، بەر پرسیارییەکەی لێوەر گرتەوە و لە پارێزگاری " مەشهەد " لایبرد و کردی بە پارێزگاری (( کاین )) ، لە دوایشدا هەر بە تووڕەییەوە ناردی بۆ قەزایەکی بچووکتر بە ناوی (( سەبزەوار)). بەم شێوەیەش وێنەکێش و خۆشنووسەکان لە شارەکاندا بڵاو بوونەوە و چوونە ناو نیگار خانەی سوڵتان و شازادەیترەوە . بەڵام بە شێوەیەکی دەرئاسایی کتێبەکەی " سوڵتان برایم میرزا " بەنیوەکاری نەمایەوە و تەواو بوو .

کتێبدارێکی ڕاستکرداری هەبوو ، ئەم کابرایە سواری ئەسپەکەی دەبیٚ و

دەچـێته " شـیراز " و لـەوێ لـەلای ئوسـتادێكی جوانكـاری كتێبەكـە دەڕازێنێتەوە ، لە دواییدا دوو ڕووپەڵی لێدەگرێت و دەچێ بۆ " ئەسفەهان " بۆ لای ئوستادێكی خۆشنووسی و بە خەتی (( نەستەعلیق )) ئەو دوو لاپەڕەیە دەنووسێ ، لە دواییدا بە ڕێگای چیاوە دەچێتە " بوخارا " و دەڕواتـە لای خـانی (( ئۆزبـەك )) و لـەوێ لـە لای وێنەكێشـە باشـەكان وێنـەكان لـە سـەر یـەك كەڵەكـە دەكـات و جێگیریـان دەكـات . دوایـی دادەبەزێتـەوە بـۆ "هـەرات " و لـەلای ئۆسـتادێكی‌نیوه كـوێر وێنـەی گیـا و پەلـەكانی دەكێشێ ، لـە وێشـەوە دەچێتە لای كابرایـەكیتری خۆشـنووس و نووسراوی سەر بەرگەكە بە ئاوی زێڕ دەنووسێ و لـە وێشـەوە بەرو باشوور ڕێدەكەوێ و دەچێتە ((كاین )) و دەڕواتـەوە لای (( سوڵتان برایم میرزا )) و ڕووپەلەكان دەباتە لای و ئافەرینەكەی وەردەگرێت .

لە دوای شەش مانگ كار كردن دیسان كتێبەكە هەر ناتەواو بوو .

بەمجۆرە دەزانن كـە ئـەم كتێبـە تـەواو بوونی بۆ نیە . هـەر بۆیـە چەندین هەواڵبـەری " تاتـار " بـە كرێـدەگرن و هـەر یەكـەوە نامەیـەكیان پێـدەدەن و دەیـاننێرن بـۆ لای وێنـە كێشـەكان ، ( لـەناو نامەكانـدا داوا كارییـەكان دەنووسن ) . هـەر كـە هەواڵبـەرەكان لـە تـەواو ئێـران و ئەوپـەڕی ئاوەكەدا (( ماوراء النهر )) بڵاو بوونەوە ، دروستبوونی كتێبەكەش خێراتر بوو . جاری وا هەبوو كەلە شەوێكی زستانیدا بەفر دەباری و دەنگـی لـوره لـورەی گـورگ دەبیسرا ، لاپەرەی ( 59 ) و ( 161 ) لەگەڵ یەكدا بەراورد دەكران كاتێ كە دەیازانی بۆ تەواو كردنی یەك كتێب تێدەكۆشن بۆ ئەوەی كە بزانن ئەمە كام بەشی "مەسنەوییە " كەیە باشترسەیری كارەكانی یەكترییاندەكرد.

بە داخەوەوە! ئەمڕۆ هەواڵی تەواو بوونی ئـەم كتێبـەم پێگەیشت ، بڕیار

وا بوو کە منیش لە ناو لاپەرەیەکی ئەم کتێبەدا جێبگرم ، بەڵام بە داخەوە ! ڕۆژێك ڕێگایالە ئەو تاتارەی وا منی پێبوو بڕی و تێریان لێدا ، لە دوایشدا بە پێی نەریتی جەردە و ڕێگرەکان ڕووتیان کردەوە و بەر بوونە گیانی و تا نەیانکوشت وازیان لێنەهێنا . هەر لە بەر ئەوەش منیش نازانم کە لە کام لاپەڕەوە داکەوتووم . تکایە باش سەیرم بکەن ، باوەکوو بزانن کە من هی کام لاپەڕەم . ئایا دەبووم بە سێبەری ئەو کاتەی وا مەجنون لە جل و بەرگی شوانیدا تەماشای لەیلا دەکات ؟ یان وەکوو بۆ ئەوەی کە بیٔئومێدیتان پێبناسێنم لەگەڵ تاریکایی شەوگاردا تێکەڵ دەبووم ؟حەزم دەکرد کەهاوڕێی دوو خۆشەویست بایەم کە لە هەموو دونیا هەڵدێن و بەرە و دوورگەیەکی پڕلە داری سێو دەچن کە پەلەوەر و گوڵی جوانی تێدایە .ئایا دەبووم بە سێبەری ئەو کاتەی کەوا ئەسکەندەر هیندوستانی گرتبوو و ئەوەندە خۆر لێیدا بوو کە خوینی لووتی ڕانەدەوەستا وهە تا نەیکوشت وازی لێنەهێنا ؟ یان وەکوو تەمەنی ئەو باوکەیوا عاشقی کوڕەکەی خۆی بوو و ئاموژگاری دەکرد بە منەوە دیاری دەکرا ؟ کابرای هەواڵبەریان کوشت و یەکێك لە جەردەکانیش منی هەڵگرت و بەسەر چیا و نێو شارەکاندا گەڕاندمی ، جار جار قەدرم دەزانیٚ و دەڵی : " تەماشا کردنی وێنەی دارەکە بەشێکی کام داستانە،ودواتر زوو دڵتەنگ و بێتاقەت دەبیٚ ".

لەوە دەترسام کە بمدڕێنیٚ و بمهاوێژیٚ ، کەچی وای نەکرد وگۆڕامییەوە بە گۆزەیەك شەراب . ئەم پیاوە دڵناسکەشەوان سەیری منی دەکرد و لەبەر تیشکی مۆمەکەدا دەگریا، لە سایەی سەری ئەم پیاوە بالۆرە وێژەوە کەوا منی وەرگرتبوو توانیم بگەمە ئەستەنبووڵ ، ئێستاش زۆر لەوە خۆشحاڵم کەوا لە نێوان وێنەکێشە چاو باز و دەست ڕەنگینەکانی شای عوسمانیدام .

هەست بە سەر بەرزی دەكەم ، هەر بۆیە بۆ خاتری خودا داواتان لێدەكەم كەوا گوێی مەدەن بە قسەی ئەوانەی وا دەڵێن ئەم وێنەیە بە دەستی كابرایەكی وێنە كێشەوە بەپەلەپەل بۆ ئەوەی لە پشتی سەری كابرایەكی بالورە وێژەوە دابنرێت وهەڵواسریٚ دروستكراوە . سەیر كەن بزانن كەبە بێعارییەوە چ درۆ و دەلەسەیەكیان بۆ هەڵواسیوم . دوێنێ ئێوارە ئوستادەكەم وێنەی سەگێكی هەڵواسی بوو و چیرۆك و بەسەر هاتەكانی (( مەلا هوسرەت )) ی دەگێرایەوە . هەر لە بەر ئەوە لایەنگران و خۆشەویستانی(( مەلا نوسرەت )) لەوە تووڕە بوو بوون كە گوایا لە باسەكانیدا قسەی بە (( مەلا نوسرەت )) وتووە . ئایا دەتوانین بە وتار بێژی گەورە ، ماموستا (( مەلا نوسرەت )) بڵێین كە توخمە زۆڵە ؟ ! حاشا ! ئەمە تا ئێستا بە مێشكی كەسێكتاندا تێپەڕ بووە ؟ ئەمە چ جۆرە فیتنە و ئاژاوە دروستكردنێكە ؟ چۆن دەتوانن بە بێشەرم و بێپەروایییەوە ئەو شتە بڵێن ؟ مادام كە ئێستا باسی (( مەلا نوسرەت )) و (( مەلا هوسرەت )) تێكەڵ و پێكەڵ بووە ، منیش ئێستا باسی مەلا (( نەدرەتە چاوزاقی سیواسی)) تان بۆ دەكەم . ئەم مەلا ((نەدرەتە سیواسیە ))خۆی حەزی لە كوڕی جوان دەكرد و دەیگوت : " نەخش و نیگار كێشان كارێكی لەعنەت لێكراوە و خواردنەوەی قاوەش كاری شەیتانە و ئەوەی بیخواتەوە دەچێتە دۆزەخ " . ئەریٚ ئەی پیاوی سیواسی جەنابت لە بیرت چووە كە چۆن لەقێكم چەماوەتەوە ؟! باستان بۆ دەكەم ، بەڵام بە مەرجێك كە سوێند بخۆن بۆ كەسی ناگێڕنەوە . چوونكە مەگەر خودا خۆی دەتوانێت كە لە بوختانی ئەم و ئەو بمانپارێزێت . بەیانییەك سەیرم كرد ، كە پیاوێكی بالاّ بەرز و دەست و مەچەك گەورە لەگەڵ ئەوەی وا لە ژوورەوە ناویم برد ، هاتنە سەر ئەو

لەقەی من و خەریکی ئەنجامدانی کارەکە بوون و لەگەڵ یەکدا جۆر و جووت بوون ، لە دواییدا تێگەیشتم ئەمە شەیتان بوو کە خەریکی ئەم کابرایەی کاری خۆمان بوو ، لە لایەکەوە جوان جوان گوێکانی ماچ دەکرد و لە لایەکیتر یشەوە دەیچپاندە گوێیەوە و دەیگوت : "قاوە حەرامە و خواردنەوەی گوناحە " ئەمە بە پێی فەرموودەکانی دینەکەمان نالێت کە قاوە حرامە ، بەڵکوو بە پێچەوانەوە ئەو قسەکانی شەیتان دووبارە دەکاتەوە .

لە دوایشدا باسی وێنە کێشە فەرەنسییەکانتان بۆ دەکەم ، بۆ ئەوەی کەسانێك کە گرنگیان پێدەدەن دەرسی لێوەر بگرن . ئەو نیگار کێشانە ئەوەندە جوان وێنەی پادشاکان و پاپاو پیاو ماقوولان و تەنانەت ژنانیش دەکێشن کە ئەگەر لە بازاڕدا بیانبینی دەیانناسیتەوە . ژنەکانیان بە ویستی خۆیان لە بازاڕدا دەسووڕێنەوە ، ئیدی خۆتان بیری لێبکەنەوە کە چی دەبێ . بەڵام ئەمەش بەشی نەکردوون و کاری لەوەش خراپتریان کردووە ، بەهەڵە لێم تێمەگەن باسی گەوادی ناکەم ،یانی تەنیا لە وێنەکاندا... .

وێنەکێشێکی گەورەی فەرەنسییەکان لەگەڵ مامۆستایەکیتری بە ناو بانگدا لە ناو سەوزەلانییەکدا ڕێدەکەن و پێکەوە قسە دەکەن ، ئەوەندە ڕۆیشتوون تاوەکوو گەیشتونەتە ناو دارستانێك . ئەوەیان وا زوو شارەزاتربووە وتوویەتی : " بە پێی نەریتی تازە، پێویستە ئەگەر وێنەی دارێکی ئێرەت کیشا یەکسەر خوێنەر ئارەزووی دیتنی ئێرە بکات و کەهات یەکسەر بیناسێتەوە و لە دارەکانیتر جیای بکاتەوە ، من فەقیرم . ئەم وێنەیەمیان بە عەقڵێکی وەهاوە دروستنەکردووە ، هەر لە بەر ئەوەش

شوكر و سوپاسی خودا دەكەم . ئەگەر بە پێی نەریتی فەرنسییەكان بكێشرابایەم هەموو سەگەكانی ئەستەنبووڵ وایاندەزانی كە من دارێكی ڕاستە قینەم و میزیان پێدا دەكردم . هەر لە بەر ئەوەشە كە نامەوێ ببم بە دارێكی ڕاستەقینە ، بەڵكوو دەمەوێ ببم بە واتاو مانای دارێكی ڕاستەقینە.

## (11) (( ناوی من ڕەشەیە ))

درەنگی شەو بەفر دەستیپێكرد و تاوەكوو ڕۆژمان لێبووەوە هەر دەباری . شەو تابەیانی نامەكەی شەكوورەم دووبارە دەخوێندەوە : لە ژوورێكی ماڵە چۆڵەكەدا دەچمە خوار و دێمە سەرەوە ، ئەوەندە توورەم كە خۆم لە دەر و دیوار دەدەم ، لە بەر تیشكی لەرزۆكی مۆمەكاندا بیرم لەو هەڵسو كەوتانەی خۆشەویستەكەم دەكردەوە كەوا بە توورەییەوە ئەنجامیدەدان و مۆمدانەكانم دەخستە خوارەوە ، لە دواییدا بیرم لە ڕۆیشتنە بەلەنجە و لارەكەی دەكردەوە ، لە ناكاو كرانەوەی دەلاقەكە و دیار بوونی خۆشەویستەكەم و پێكەنینە خەماویەكەی دەهاتە پێش چاوم . ڕەنگی

لێوی ئەو ڕوخسارانەی وا لەماوەی شەش حەوت ساڵی ڕابردوودا لە خەیەڵەکانی خۆمدا لەباتێ ڕوخساری شەکوورە بینیبومن ، هەر لە ڕەنگی هەڵوژە دەچون . کە چاوم بە ڕوومەتە ڕاستەقینەکەی کەوت هەموویانم لەبیرچووەوە . ئێواران خۆمم بەخەیاڵەکانی ژیانی هاوسەری‌یەوە خەریك دەکرد لە خەیاڵمدا هیچ گوومانێکم بەرامبەر عەشقەکەی خۆم و بەرامبەرەکەم نەبوو وەبەخۆشیەوە زەماوەندمان دەکرد ، بەلاّم لەماڵێکی پلیکانەداردا خەیاڵەکانم وەکوو ئەوەی کە لەسەر بەفر نیشتبێت دەتوانەوەو نەدەمان و وندەبوون ، کارێکی ڕێك و پێکمان پێکەوە نە دەکرد و شەڕمان دەکردوو یەکتریمان دەشکاندو گوێم لەقسەکانی نەدەگرت .

لە شەوانی بێ هاوسەریدا لەعەربستان کاتێك کە((أحیاء العلوم)) ی((غەزالیم)) دەخوێندەوەو چاوم بەو لاپەڕانە دەکەوت کەوا باسی خراپیەکانی ژن هێنانیان دەکرد ، یەکسەر خەیاڵەکانم ڕەش و خەماوی دەبوون ، بۆیە شەوان هەڵدەستام و هەر لەو لاپەڕانەدا باسی خۆشی و قازانجەکانی ئەو ژیانەم دەخوێندەوە . زیاتر لە دەیان جار ئەو سوودانەم خوێندوەوەتەوە بەلاّم تەنیا دونیا لەبیرماوون ، یەکێکیان ئەوەیە کەوا ئەگەر پیاو ژن بهێنێت ، کەسێك ناوماڵەکەی بۆ ڕێك و پێك دەکات ، بەلاّم لەو ماڵە پلیکانەدارەدا من چاوم بە ڕێك و پێکی نەکەوت ، دووهەمیشیان ئەوەیە کەوا لەڕۆیشتن بۆ لای جندەو قەحبەکان لەگەڵ گەوادەکاندا لەکۆلاّنە تاریکەکانەوە نەجاتت دەبێ . بیرم لەم ڕزگاربوونەوە دەکردەوە ، لەدواین کاتەکانی شەودا تەزبیحەکەم گرتە دەست و ویستم کەتۆزێك ڕابکشێم . بەپێی عادەتی خۆم چوومە گۆشەیەکی ژوورەکەو دانیشتم ، بەلاّم تازە تێگەیشتم کە تەزبیحەکەم بە دەستەوە نی‌یە ! هەروەهاش بوو کەبیرم لەوە

کردەوە لەدوای دوانزە ساڵ دیسان عاشق بوومەتەوە و ئەمەش بەڵگەیەکی حاشا هەڵنەگری ئەوەیە ،چۆش و خرۆش و ترسێکی گەورەی لەدەروونمدا هەستاندەوە . هەر وەکوو لەرزە لەرزی مۆمەکە ئەم لا و ئەولام دەکرد و لە ناو ژوورەکەدا دەهاتم و دەچووم . ئەگەر شەکورە دەچێتە بەر پەنجەرە و خۆیم پێنیشان دەدات بۆچی‌نامەیەکی پێچەوانەی ئەو کردەوەیەم بۆ دەنێرێت ؟ ئەگەر کچ حەزم لێناکات ، بۆچی باوکی دەعوەتم دەکات؟ نەکا! ئەم باوك و کچە گەمەم لەگەڵدا بکەن ؟ لەناو ژوورەکەدا دەچێتە خواروو دەێتەوە سەرەوە ، دەرگا و دیوارەکان و ڕاخراوەکانیان کە دەیانەوێت وەڵامی پرسیارەکانم بدەنەوە زمانیان دەگیرێ و ناتوانن قسە بکەن .

تەماشای وێنەکەم کرد ، سالانێك بەر لەئێستا کێشا بووم . باسی چۆنیەتی عاشق بوونی شیرین بە وێنە هەڵواسراوەکەی خەسرەو دەکات کەبەدارێکەوە هەڵواسرابوو . بۆ کێشانی ئەو وێنەیە ئیلهامم لەو کتێبەوە وەرگرت کەوا لە تەورێزەوە هێنابوویان و کەوتبووە دەستی زاواکەمان . تەماشاکردنی وێنەکە شەرمی سادەیی دەربڕینی عەشقەکەمی لەیاد نەدەبردمەوە و دڵخۆشی‌یەکەی کاتی لاوی بۆ نەدەگەڕاندمەوە . بەرەو بەیانی بیرم لەناردنەوەی ئەو وێنەیە کردەوە ،بەڵام لەدوایدا تێگەیشتم کە ئەمە یەکەمین هێرشی گەمەیەکی شەترەنجیە بۆ دەستپێکردنی عەشقێکی گەورە کە زۆر وەستایانە داڕێژراوە . بەبێئەوەی کەسەرم سوور بمێنێ دانیشتم و نامەیەکم بۆ شەکوورە نووسی . دوای ئەوەی کە تۆزێك خەوتم بەیانی نامەکەم خستە سەر سینەم و لەناو کۆڵانەکاندا کەوتمە ڕێ ، زۆر ڕۆیشتم ، بەفر کۆڵانەکانی ئەستەنبووڵی فراوانتر کردبوو جەنجاڵی لە شار دوور کردبوو ، هەموو شتێك وەکوو ئەوانەی دەورانی منداڵی بێدەنگ وبێ

جموجوڵ بوو. وەکوو گومانەکانی‌کاتی منداڵیم سەربان و ناو حەوشە و سەر منارەی مزگەوتەکان پڕبوون لەقەلەڕەش و هەموو جێگایەکیان داگرتبوو . گوێم لەدەنگی پێی خۆم دەگرت و تەماشای هەڵمی دەمم دەکرد بیرم لەوە دەکردەوە کە دەبێ کۆشکی وێنە کێشانەکەش زاواکەمان باسی کردبوو وەکوو کۆڵانەکان بێدەنگ بێ، تووشی گەرم و گوڕییەکی سەیر بوو بووم ، بە پەلە پێم هەڵدەگرت . بۆئەوەی کەنامەکە بگەیەنمە دەستی شەکورە پێویست بوو ئەستەر ببینم ، بەرلەوەی بچمە ناو گەڕەکی جوولەکەکانە هەواڵم بۆ ناردبوو وبەر لە نوێژی نیوەڕۆ وادەم بۆناردبوو . زووتر لەوادەی خۆم ڕۆیشتمە ئەو وێنە کێشخانەکەی پشتی مزگەوتی ((ئەیاسوفیا)) وە . کاتی خۆی بەڕێگای زاواکەمانەوە هاتووچۆی ئەوێم دەکردو لەوێ شاگردیم دەکرد . لەوەزیاتر کە لە پاساری بانی وێنە کێشخانە کەوە سەهۆڵ شۆڕ بووبوونەوە شتێیکی تر نەگۆڕا بوو . شاگردێکی جوان و قۆز کەوتبووە پێشمەوە و منیش بە دوایدا دەڕۆیشتم . چاومان بە هەندێك وەستای پیری بەرگساز کەوت کە سەریان لەبەر بۆنی زەمق و سەرێش گێژ بوو بوو . هەروەها ڕوخساری وەستا پشت چەماوەکانیش کە لەبەر کاری زۆر وایان لێهاتبوو کەوتە ناو نیگای چاوانمەوە . لەنێوان ئەو گەنجانەوە تێپەڕبووین کە وا نیگاکانیان لە تیشکی ئاگرەکەدا ونبوو بوو و بە بپئەوەی وا تەماشای کاسەکەی سەر ئەژنۆیان بکەن ڕەنگەکانیان تێکەلاو دەکرد ، لەسووچێکەوەکەوە چاوم بە پیرەمیردێك کەوت کە بە وردییەوە هێلکەی ((ووشتر مرخێکی)) ڕنگدەکرد، لەلایەکتریەوە مامەیەکم بینی کە کەوچکێکی ڕەنگدەکردو لەبەرامبەریشیانەوە کوڕە جوانکیلەیەك دانیشتبوو و بەسەرنجەوە سەیری

دەکـردن . لەدەرگایـەکی کراوەشـەوە چـەند خوێنـدکارێکم بینـی کـەوا دەمـو چاوە سوورەکانیان تـا ئەنـدازەی لێك کـەوتن نزیکـی لاپـەڕەکان دەکـردەوە ، مامۆسـتا ئەمـەی وەکـوو سـزای هەڵـەکانیان پێـدا بـوون . لەحوجرەیـەکیتردا چاوم بە شاگردێکی خـەمبار کـەوت کـەوا ڕەنـگ و وێنەکێشانی لـە بیر چوو بوو و تەماشای ئەو کۆڵانەی دەکـرد کـەوا مـن بـە پەلەپـەل لـەوێوە هـاتبووم ، لەبـەر چـەند دەرگـای کراوەشـدا کەسانێك هـەبوون کـە نموونـەی وێنـەیتریان دەکێشـا و ڕەنگیـان تێکـەڵاو دەکـرد وقاڵبیـان دروسـتدەکرد ، کـاتیٚ کـە منـی نائاشنا و غـەریبیان بینـی وەکـوو ئـەوەی کـە چاویان بـە دوژمـن بکـەویٚ بـەلا چاوێکەوە سەیریان دەکردم وپلیکانەکان سەهۆڵیان گرتبوو ، سـەر کـەوتم ، هـەیوانی قـاتی دووەم دەوری هـەر چـوار بینانەکـەی گرتبـووو لـەوێوە تێپـەر بـووین . لـە حەوشـی خـوارەوە لـە نێـو بەفرەکـەدا دوو منـاڵ ڕاوەسـتا بـوون ،لەگەڵ ئەوەی کەوا عەبا و جلی شـۆڕ و گـەرمیان لەبـەردا بـوو دیسـان لـەرز دایگرتبـوون ، نـازانم سـەرمایان بـوو بـوو یـان وەکـوو لـەژێر ئـەو بـەفرەدا چاوەرێی تەواو بوونی سزاکەی خۆیان دەکرد . یەکسـەر کـاتی منـداڵی خـۆم هاتـەوە یـادم ، ئـەو کاتانـە ئەگـەر خوێنـدەوارێك هەڵەیـەکی بکردایـە یـان وەکوو ڕەنگێکی گرانـی بڕشتبایە ، بە دارێك ئەوەنـدەیان لـە ژێـر پێـی دەدا تـاوەکوو خـوێنی لێـوە دهـات . ڕۆیشـتینە نـاو ژووڕێکـەوە ، چـاومان بـە هەنـدێك ئوسـتاد کـەوت کـە چـوار مشـقیان دابـوو ، ئەمانـە ئـەو ئوسـتادانە نـەبوون وامـن خـەیاڵم دەکـردن ، هـەموویان شـاگردی دوێنـیٚ و ئۆسـتادی تازەکـار بـوون . ئەمـە ئـەو ڕووژە بـوو کـەوا زەمانێـك منـیش بـەڕێزێکی تایبەتەوە دەمەویست بچمە ناوی و گەرماییەکی زۆری لەمندا دروستدەکرد ، لە بەر ئەوی کـەوا ئۆسـتادە ، لێهاتووەکـان وەکـوو ئەوانـەی وا نـاز ناویـان

لێنا بوون لەماڵی خۆیاندا ئیشیان دەکرد ، ڕەنگ و بۆنی نیگار خانەی شاهیپێوەنەمابوو ، بەڵکوو زیاتر لە ژوورێکی چۆڵی کاروانسەرایەکی ناوچیاکان دەچوو . تۆزێك لەو لاترەوە چاوم بە وستا عوسمان کەوت کە لە سەر کورسییەکی دارینددا دانیشتبوو، ئەوە بۆ پانزە ساڵ دەچێ کە نەمبینیوە . شێوەی ڕوخساری لە سێبەرێك زیاتر لە هی جندوکەیەك دەچوو ، لەکاتی ڕیبواری و سەفەرەکانمدا کە دەمەویست وێنە بکێشم ،یەکسەر وەکوو ئۆستاد (( بەهزاد )) ئەم ئۆستادە گەورەیەشم دەکەوتەوە یاد . لە بەر ڕووناکی ئەو بەفرەیەدا لە پەنجەرەی سەر کۆڵانی مزگەوتی ((ئەیا سۆفیا))وە دەهاتە ناو ژوورەکەوە جلە سپییەکانیم بەئاشکرایی دەبینی ، وەکوو ئەوەی کە ئەمە زەمانێکی درێژ بێت کە ئەم دونیایەی بە جێهێشتبێت ، ئاوەها بێدەنگ بێدەنگ دانیشتبوو .

دەستەپڕ لە نیشانەکانیم ماچکردو خۆمم پێناساند و خۆمم هێنایەوە بیری و وتم : ((لەکاتی منداڵیمدا زاواکەمان منی دەهێنا بۆ ئێرە و لێرەدا شاگردیم کردووە ، بەڵام لە دواییدا قەڵەمەکەمی پەسەند کرد ولێرە ڕۆیشتم ، ساڵانێکی تەمەنم بە نووسەری لە ڕێگا و شارەکانی ڕۆژهەڵاتدا تێپەڕ کردووە ، لەگەڵ سەرحەد پاشا وپادشاکانیتردا لە تەورێز و شارەکانیتردا لەگەڵ وێنە کێش و خۆشنووسەکاندا ئاشنا بووم و کتێبم بۆ ئامادە کردوون . لە شارەکانی بەغدا و تەفلیس و حەڵەبیشدا ماومەتەوە و شەڕی جۆرا و جۆرم بینیوە )) .

ئۆستادی گەورە هەناسەیەکی هەڵکێشا و وتی : " ئاخ تەفلیس " ! . وتەماشای ئەو تیشکەی کرد کە لە نایلۆنی پەنجەرەکەوە دەهاتە ماڵ و وتی : " ئێستا لەوێ بەفر دەبارێ ؟ " وەکوو ئەو ئۆستادە ئێرانیانەی والەبەر

كاری هونەری كوێراییان دادێ و كە تەمەنیشیان زیاتر دەبێ وەكوو ئەولیا دەژیــن و خڵــەفاو دەبــن و داســتان و ئەفســانەی بێكۆتــایی دەگێرنــەوە هەڵسـوكەوتی دەكـرد، لـە چـاوەكانییەوە كـە لـە هـی جندۆكـە دەچـوون تێگەیشتم كـە چـەندە ڕەقـی لـە زاواكەمانـە و لـە بـەر ئـەوەش گۆمـان لـە مـن دەكـات ، سـەرەڕای ئەمانـەش باسـی ئـەوەم بـۆ كـرد كـە لەبیابانـەكانی وڵاتـی عەرەبدا وەكوو ئێرە بـەفر نابارێتـە سـەر مزگـەوتی " ئـەیا سۆفیا " بـەڵكوو دەبارێتـە ناوخـەیاڵی مرۆڤەكانـەوە ، هـەروەها گـوتم : كـە لـە قـەڵای تـەفلیس بەفر دەبارێ وژنەكان بە ڕەنگـی گـوڵ گـۆرانی دەڵێنـەوەو جل و بەرگـەكانیان دەشــۆرن و منداڵــەكانیش لــەژێر پێخەفەكانیانــدا دۆندرمــە بــۆ هــاوین دەشارنەوە .

ووتی : (باسی ئەوەم بۆ بكە كە لە و وڵاتانەی وا تۆ گەڕاوی وێنە كێشان چی دەكێشن )) . لاوێكی

جوانكیلــە لەگۆشــەیەكی ژوورەكــەوە جــەدوەلی بــۆ ڕووپەلــەكان دروستدەكرد و لەگـەڵ خەیاڵـەكانی خۆیـدا ڕۆیشـتبوو . لەگـەڵ ئـەوا نـیتردا لایەكی لە من كردەوە و وەكوو ئەوەی كە بڵێت : ڕاستەقینە ترین داستانم بۆ بگێـڕەوە ، سـەیرێكی بـەمانای كـردم . لەگـەڵ ئـەوەی دەمزانـی ، كـە زۆر كەسیان نازانن دوكانداری گەڕەكەكەیان كێیەو ئاگایان لەوە نییە كە بۆچی دراوسـێكەیان لەگـەڵ سـەوزە فرۆشـەكەدا شـەڕی كـردووە و نـازانن كـە "وەقەیەكی *" نان بە چەندە ، بەڵام لەدەوبەری خۆیانەوە هەواڵی ئەوەیان بیستووە كە لە تەورێزو قەزوین دا كـێ چـۆن نـەخش دەكیشـێ و كـام خـان و پاشا و شازادە بۆ دروستكردنێكی كتێبێك چەندە پارە دەدەن ، دیسان هەر باسی ئەو شتانەم بۆ كـردن ، خـۆی لەڕاستیدا ئـەم شـتانە وەكوو نەخۆشـی

بڵاو دەبوونەوە. بەڵام من لە ڕۆژ هەڵاتەوە هاتبوومەوە ماوای شەڕ و پێکدادانی شازادەکان و سووتان و تالاَنکردنی شارەکانە و جێگایەکە کە هەموو ڕۆژێك باسی شەڕوئاشتی تێدا دەکرێ و سەدان ساڵە شیعری هەرەباشی تێدا دەگوترێتەوە و وێنەی جوانی تێدا دەکێشرێتەوە .

ووتم : "وەکوو ئاگادارن ، شا تاما سووب پەنجا و دووساڵ لەسەر تەختی دەسەلاَت دانیشت ، لەسالاَنی دواییدا پشتی کردە نیگار کێش و خۆشنووسەکان و نیگار و خەتی فەرامۆشکرد و دەستی بە عیبادەت کردو لە دوایشدا مرد ئیسماعیلی کوڕی چێگای گرتەوە ،باوکی لەبەر ئەوەی کەدەیزانی کوڕەکەی کوڕێکی بەدخۆ و بەدکردارە بیست ساڵ خستبوویە ناو زیندانەوە ، کوڕەکە لە زیندان دەرکەوت و یەکسەر براکانی خۆی کوشت و سەری بڕین ، بەتەواوەتی هاربووبوو ، هەندێکشی کوێر کردو لەخۆی دووری کردنەوە .

بەڵام زۆری نەخایاند کەدوژمنەکانی بەژەهر کوشتیان و برا گەورەکەی "موحەمەدی خودا بەندە"یان خستە جێگاکەی ، هەڵبەت ئەویش پیاوێکی نیوعاقڵ بوو ، لە زەمانی ئەم پادشایەدا هەموو شازادە و خانەدانەکان سەریان هەڵداو دەستیان بە ڕاپەڕین کرد ، شەڕ و شۆڕێکی زۆر دروستبوو ، لەگەڵ سەرحەد پاشای خۆماندا دەستیان کرد بە شەڕ ، وای لێهات کە ئێران بوو بەوێرانیەکی تەواو . ئەم پادشا کوێرە کە عەقڵێکی تەواویشی نیە ، ئێستا بێ هێز و بێ پارە ماوەتەوە و توانای دروستکردنی کتێب و نەخش و نیگاری نیە .

بەم شێوەیەش ئەو وێنە کێشانەی کەوا لە وێنە کێشخانەکەی شاتاماسووبدا کاریان دەکرد و شتانی نائاسایی و سەیرو سەمەرەیان

دروستده کرد ئێستا فڵچەکانیان خستۆتە پشتیئەسپەکانیان و چوار ناڵ ئەسپەکانیان غاردەدەن و بۆ ئەملاو ئەولا دەچن .هەندێکیشیان جێگا و ماوایەکیان نیە و لە بیٚپارەیی و هەژاریدا ماونەتەنەوە .

هەندێکیان باریان کردوە بۆ باکوور و ڕۆیشتون بۆلای (( شەبانییەکان )) و هەندێکیش ڕۆیشتوون بۆ هیندوستان و ئەستەنبووڵ . هەندێکیشیان تفیان کرد لە شەرەفی خۆیان و دەستیان بە کاری خراپ کرد . کەسانێکیش هەبوون کە هەریەکەو چوونە لای یەکێك لەوشازادانەی وا لەگەڵیەکدا شەڕیان دەکرد و دەسیان بە درۆستکردنی کتێبی بچکۆلە بچکۆلە کرد،هەربۆیەش زۆری نەخایاند کە هەموو جێگایەك پڕ بوو لەو کتێبە هەرزانانەیوا زۆر سەر پێیانە دروستکرا بوون .

وەستا عوسمان وتی : " ئەمانە بە چەند تەواو دەبوون؟ " .

ئەڵێن وەستای بەڕێز و بە ناوبانگ " مامۆستا سادقی " کتێبێکی بە چل ئاڵتون بۆ سەربازێکی ئۆزبەك درووستکردووە. کاتیٚ کە لە سەفەری ڕۆژهەڵاتەوە دەگەڕامەوە بۆ ئەرزڕووم ، لە چادری پادشایەکی بێڕەوشتدا چاوم بە کارێکی ئۆستاد " سیاوەش " و چەندین وێنەی ڕووت و قووت کەوت . هەندێك لەو وێنە کێشانەیوا لە وێنە کێشان واز ناهێنن ، بە پەلەپەل وێنەی کتێبێك یان وەکوو چیرۆکێك دەکێشن و دەیفرۆشن . کاتیٚ کە تەماشای ئەو وێنەیەش دەکەن ، ناڵێن کە ئەمە بەشێکە لەکام داستان و کام کۆبوونەوەی نیشان دەدات و تەنیا بۆ خۆشی تەماشای خودی وێنەکە دەکەن ، بۆ نموونە دەڵێت : " ئەسپێکی جوانە یان نا ؟ " و لەبەر ئەوەش پارە دەدات بە وێنە کێشەکە .پێویستە ئەوە بڵێم کە وێنەی شەڕ نرخی زۆرە و باوی هەیە . کەسانێکیش هەن کە تەنیا لەبەر ئەوەی مشتەرییان

دەستکەویٚ ، بەبیٚ ڕەنگ لەسەر لاپەڕەیەکی بیٚ نەخشدا ویٚنەی ڕەش و سپی دەکیٚشن و دەیفرۆشن . وەستا عوسمان وتی : " جوانکاریٚکی دلٚ خۆش و بە هونەرمان هەبوو کە زۆر بە ناسکییەوە کاری دەکرد ، پیٚمان دەگوت : " وەستا زەریف ئەفەندی " ، بەلاٚم بەجیٚیهیٚشتین و ڕۆیشت ، ئەوە شەش ڕۆژە دیاری نییە و نەگەڕاوەتەوە و پیٚی ناوەتە نیٚو نهیٚنیەکانەوە .

وتم : مرۆۋ چون دەتوانیٚ ئەم ویٚنەکیٚشخانەیە بەجیٚ بهیٚلٚیٚ ، کە وەکوو مالٚی باوکی وایە ؟ وتی : ((چوار ئۆستادی لاوم هەیە بەناوی زەریف ، پەپوولە ، لەق لەق ، زەیتوون ، ئەمانە لەکاتی شاگردییەوە تاوەکوو ئەوکاتەی کە بوون بە ئۆستاد لەلای خۆم بوون ، ئیٚستا لە مالٚی خۆیاندا ئیش دەکەن .

بە پیٚی ئەو شتەی کەلە ڕووەوە دیارە ئەمە بۆ ئەوەیە کە ویٚنەکیٚشەکان بتوانن بە ئاسانی کار بۆ دروستکردنی " جەژننامە " کە بکەن ، بەلاٚم ڕاستیدا ئەم جارەیان پادشا نەیدەویست ویٚنەکیٚشەکان بۆ دروستکردنی کتیٚبیٚکی تایبەت لەگۆشەیەکی ویٚنە کیٚشخانەکەدا ئیش بکەن ، بەلٚکوو فەرمانی دابوو کە هەرکەس لەمالٚی خۆیدا ئیش بکات ! ))

یەکسەر ئەوە گەیشت بە میٚشکمدا کە دەبیٚ ئەمە بۆ کتیٚبە نهیٚنییەکەی زاواکەمان بیٚت و بیٚدەنگ بووم . ئۆستاد عوسمان چەندە بە ماناوە قسەی دەکرد ؟

وەستا عوسمان بانگی کابرایەکی سارد و سڕ و پشت چەماوی کرد و وتی : نوری ئەفەندی ! پیٚگەیەك بدە بە " ڕەشە چەلەبی " .

لەکاتی جوانیدا کە گەرم بووم هەموو شتیٚکی ئەم بینایەم مەراق دەکرد . وەزعییەت و پیٚگە بۆنەیەك بوو کە لە کاتیٚکدا پادشا لەماوەی دوو مانگ جاریٚکدا سەردانیٚکی ویٚنەکیٚشخانەکەی دەکرد بەڕیٚوە دەبرا ." هازمی"

خەزێنــەدار و " لوقمــانی " شاهنامەچــی و وەســتا عوسمــانی ســەرۆكی وێنەكێشان لەگەڵ پادشادا دەگەڕان و ئەوەیان بۆدەگێڕایەوە كە كام ئۆستاد چی دەكات و كێ چی دەڕازێنێتەوە و چ كەسێك كام وێنە ڕەنگ دەكات و جوانكارەكان چییان لە دەستدێت .

لەبەر ئەوەی كە ئەم وێنەكیشخانەیە وەكوو جاران گەرمایی لە پاشادا دروستناكات و شاهنامەچییكەی ئەوێ یانی " لوقمان " كە نووسراوەی هــەموو كتێبــەكان دەنووســێ ، نەیــدەتوانی لــەماڵ دەركــەوێ و وەســتا عوسمانیش هەموو كات لەنێو دووكەڵێك لە تووڕەیی و شكان و نەفرەتدا ون دەبوو و چوار ئۆستادە لێهاتوەكەش یانی زەیتوون و لەق لەق و زەریف و پەپوولەش بە فەرمانی پادشا لەماڵی خۆیاندا كاریان دەكرد ، پادشا هاتووچۆی ئەوێی نەدەكرد ، هەر بۆیە ئەو ڕێو ڕەسمە نەدەگیرا ، ئەمەشم زۆر پێنـاخۆش بـوو . زۆر وێنەكێشـم بینـی كـە بێئـەوەی بتـوانن بـبن بـە هونەرمەندێكی باش پشتیان چەماوەو لە خۆڕایی ژیانەكەشیان لە كیس چووە . بۆ نمونە ئەو " نوری ئەفەندییە " ساڵانێكی زۆر لەپشتی تەختەی وێنەكێشانەوە كاری كردووە و پشتی چەماوە ، كەچی هەمووشی بێهودە بووە ، بەڵام هەموو كاتێك سەیری ئەوەی دەكرد كە بزانێ چ كەسێ كام لاپەڕە جوان دەكێشێ .

تەماشای لاپەڕە ئەفسانەییەكانی جەژننامە كە ( سوور نامەكە )م كرد ، باســی ســوننەتكردنی شــاهزادەكان دەكــات ، هــەموو كەســێك و هــەموو ڕێكخراوێك بەشداری تێدا دەكات . باسی ئەم كتێبەم لە ئێرانەوە بیست بوو هێشتا خەریكی دروستكردنی بوون كە من دوام كرد بوو . یەكەم وێنە كە دایاننایە بەردەستم ، وێنــەی حــەزرەتی پاشــای گــەورەمان بـوو كـە لـە

شانشینی کۆشکەکەی ڕەحمەتی " ئیبرایم پاشا" وە بە لێبووردەییەکەوە تەماشای شاییەکەی ناو مەیدانی ئەسپەکانی دەکرد ،وێنەی ڕوخساری لەهی کەسانیتر جیا نەدەبووەنەوە بەڵام زۆر باش و بە ڕێزەوە کێشرا بوو ، وێنەیەکی دوولاپەڕەییان لەلای چەپی پادشاوە دروستکرد بوو ، لەلای ڕاستیشیەوە پادشا و وەزیر و باڵوێزەکانی ئێران و تاتار و فەرەنسە و وەنیز ( ئیتاڵی ) دانیشتبوون ، لەبەر ئەوەی کە ئەوان پادشا نەبوون ، وێنەکانیان زۆر بێسرنجانە کێشا بوون ، هەموویان سەیری جەنجاڵی ناو مەیدانەکەیان دەکرد لە وێنەکانیتریشدا هەر ئەو جێبەجێکردن و کەڵەکە کردنە بەکار هێنرا بوو ، هەرچەندە کەلە کێشانی دار و دیوار و خشتە سوورەکانیشدا ڕەنگی جیاوازیان بەکار هێنابێ بەڵام دیسان هەر تووشی ئەو هەڵەیە بوونەتەوە . کاتێ کە خۆشنووسەکان نووسراوەکانیان تەواو کرد و وێنەکانیش ئامادەبوون و بەرگی چەژنناماکە ( سوورنامەکە ) یان گرت ، ئەو خوێنەرەی واڵاپەلەکان هەڵدەداتەوە و لەژێر نیگای پاشادا تەماشای جەنجاڵەکە دەکات ، هەر جارە و جۆش و خرۆشێکیتر دەبینێ .منیش ئەوەم بینی . لەدوایشدا سەدان کەسم بینی کە کاسە برنجیان ناوەتەبەر دەستی خۆیان و گۆشتی سووروٚکراوی ڕەشەوڵاخیش دەگرن بە دەستەوە و پەیتا پەیتا پارووی لێدەگرن . کەسانێکیشم بینی کە کاتێك کەروێشك و پەلەوەرەکان دەردەپەڕن زیڕە دەکەن و خۆیان دەشارنەوە .

لە لایەکیتریشەوە گرووپێکی ڕێکخراوم بینی کە بە گالیسکەیەکەوە هاتبوونە بەر دەمی پاشا و پیاوێکیان ڕووت کردبووەوە، مسگەرەکانیش لە سەر سینەی ئەو پیاوە مسیان پاندەکردەوە بە بێئەوەی چەکوشەکە بەر لاشەی ئەو پیاوە بکەوێ ، گرووپێکیتر لە پێشەوەی وشترەکانەوە کە باری

شـەكەريان پێبـوو دەڕۆیشـتن و دەهاتنـە بـەردەمی پاشـا ، شووشـە گـوڵی میخەكیان دانـا بـوو ، لـە پـێش هەمووشیانەوە گۆرانیبێـژە دەنـگ خۆشـەكان هـاتبوون كـە شـێعریان دەخوێنـدەوە ، لـە نـاو هەنـدێك لـە قەفەسەكانیشـدا تووتییان هێنا بوو ، لە ناو گالیسكەكانیشدا كلیلی هەڵواسراوی ددانـدار و جێگادار لەگەڵ كلیلی چەكمەجەدا پیشاندەدران لە پاڵ ئەوانـەدا ئـەو كلیـل سازە پیرانەیوا بە دەستی ئەم دەرگا تازانەوە دەناڵێنن و گلەیی لێدەكەن بە جوانی كێشرا بوون . كە چاوم بە وێنـەی فیڵبازەكـان كـەوت ، یەكسـەر زانـیم كـە پەپوولـە و لـەق لـەق و زەیتـوون لەسـەر ئـەم وێنەیـە كارییـان كـردووە ، یـەكێك لـە فیڵبازەكـان چـەند هێلكەیـەكی لەسـەر توولێكـەوە كەلـە گولەیـەكی پان دەچوو دەبرد بە ڕێوە و ئەویتریش دەفی بۆ لێدەدا . هەروەها چاوم بـەو وێنەیەی كەوت كەوا باسی ئەو دەكات كـە چـۆن كاپیتـان ( كلَچ عەلی ) لە دەریادا تووشـی نەهامـەتی دێ و چـۆن و بـە چ فێڵێـك كافرەكـان دەخاتـە نـاو تەڵـەوە و بەگولـەی تـۆپ وڵاتەكـەیان وێرانـدەكات . ئـەو وێنەیـە هەنـدێك قەسـابی بـێ سمـێڵ و ڕیـش و سـاتۆر بـە دەسـتی نیشـاندەدا كـەوا ڕەنگـی جلـەكانیان لـەرەنگی گـوڵ و تەماتـە دەچـوو و تەماشـای پێسـەكانیان دەكـرد كەوا بە قولابەوە هەڵواسراو بوون و بزەیان لێدەدا . شێرێكی زنجیر كراویان نیشـان داوە كـە گاڵتـەی پێدەكـەن و تـووڕەی دەكـەن ، ئـەویش لـە بـەردەم پاشـادا چـاوی پڕبـووە لـە خـوێن ونـازانێ چـیبكات . ئـەم شـێرە نیشـانەی ئیسلامەكانەوە و بەرازەكەی لاپـەڕەی تـریش كەوالە دەستی شـپرەكە هـەڕا دەكات ، نیشانەی كافرەكانـە . لەسـەر گالیسـكەكەوە كابرایـەكیان سـەراوژێر هەڵواسـیبوو كـە كـاكی دەلاك سـەری بـۆ چـاك دەكـرد و شـاگردێكی سـوور پۆشیش كاسەی سابوونەكەی بۆ گرتبوو و چاوەڕێی بەخششی لێدەكرد .

کـە ئەمانـەم هینایـە بـەر یـەك ،تێگەیشـتم کـە ئەمـە کـارێکی دەرئاسـاییە و پرسـیارم کـرد کـە کـێ ئـەم وێنەیـەی کێشـاوە ؟ (( ئـەوە گـرنگ نییـە کـە کێکێشـاویەتی ، بـەڵکوو گـرنگ ئەوەیـە کـە وێنەکـە بـە جـوانی خۆیـەوە دەمانباتـە نـاو دەوڵەمەندیـەکانی ژیـان و خۆشەویسـتی و ڕێـز گـرتن بـۆ ئـەو ڕەنگانەی وا خودا لەو عالەمەیدا دروستیکردوون ، هەروەها دەمانباتـە نـاو بیرکردنەوەیەکی قووڵ و باونگەوازی ئیمان هێنانمان بۆ دەکات . ))

نوری ئەفەندی دەیزانـی کـە زاواکـەمان منـی بـۆ پرسـیار کـردن ناردووە ، بۆیـــە زۆر بـــە تـــەدبیرەوە نزیـــك دەبـــووەوە ، نەمـــدەزانی ئایـــا بەڕاســـتی کەسێکی ناسکە یان وەکوو قسەکانی وستا عوسمانم بۆ دووبارە دەکاتـەوە . پرسـیارم کـرد و وتم : ئـەم ڕازاندنەوانـە کـاری زەریـف ئەفەندییـە ؟ کـێ لـە جێگای ئـەودا جوانکـاری دەکـات ؟ لەبـەر ئـەو دەرگایـەی کـەوا بـەرەو نـاوەوە دەکرایەوە قیڕەقیڕ و هاواری منـداڵێك دەسـتیپێکرد ، لەوانەیـە یـەکێك لەسـەر تیپـــەکان لـــە خـــوارەوە شـــاگردێك لـــە بـــەر دزینـــی پـــەلێکی زێـــڕاوی یـــان شاردنەوەی خۆیی یاقووت فەلاقە دەکات . ئەو وێنە کێشە گەنجانـەی وا بـە دوای ساتێك ڕابواردندا دەگەڕێن ، بەرەو لای دەرگاکە هەڵهاتن .

نوری ئەفەندی وتـی : " منداڵەکان ! زەوی مەیدانەکە وەکوو ئـەوەی کـەوا وەستا عوسمان فەرمویەتی بـەرەنگی پەمـەیی گوڵی ڕەنـگ بکـەن ، ئـەو دوو پەلـەش دەڕازێنێتـەوە . وەسـتا عوسمـان بـە زەریـف ئەفەنـدی وتبـوو کـە دەمەوێ هەرجارەو مەیـدانی ئەسپەکان بە ڕەنگێکـی جیـا بۆیـاخ بکردرێـت ، پێویسـتە جـار جـار پەمـەیی گـوڵی بێـت و جارجـاریش سـەوزی هینـدی و بەرەنگی ڕیقنەی قاز بێت . لە گۆشەیەکیترەوە چاومان بە لاپەڕەیـەك کـەوت کـە هێشـا وێنـەی لـە سـەر نەکێشـرا بـوو، شـاگردێکی یاریـدەر ئەمـەی

داخستبوو ، ئەمە باسی سەرکەوتنی تیپێکی سەربازی دەکات شەڕدا دەکات . بەڵام لەوە دەچێت کە ئەم شاگردە کاتێك دەنگی هاواری ڕەفیقەکەی ژێر فەلاقەدا دەبیسێت ئەوەی داخستبێ و بەرەو لای دەرگاکە ڕۆیشتبێت . لە ڕووی قاڵبێکەوە چەند کەشتییان بۆ مۆدیل کێشا بوو ، لە دووکەڵی کەشتییەکانەوە وەها دەر دەکەوت کەلە سەر ئاو نەنیشتوە ، لار و خێچ دروستکرا بوون ، نیشانەی با دیاری نەکراو بوو ، دیارە ئەوەش لە خراپبوون و لاری قاڵبەکانەوە نایەت ، بەڵکوو لە ئەنجامی لێنەهاتوویی وێنەکێشێکی تازەکارەوەوە وەها دەرکەوتووە ، نەمزانی کە قاڵبەکە لە چی دروستکراوە . لەوانەیە وەکوو ئەوەی کتێبە کۆنەکان زۆر دڕندانە لە پێستی حەیوانێك درووستکرابێ . زۆرم پێناخۆش بوو دیار بوو کە ئیدی وەستا عوسمان گوێی نەدەدایە زۆر شت . کاتێك کە نۆرە گەیشتە کارەکەی نوری ئەفەندی ، بەسەر بەرزییەوە وتی : " ئەوە سێ حەفتەیە کەلە سەر ڕازاندنەوەی تاجێك کار دەکەم و تەواوم کردووە . " دیار نەبوو کە ئەمە بۆچی درۆستکراوەو بۆ کێی دەنێرن ، لە لاپەڕەیەکی سپیدا کێشا بوویان . بەرێزێکی تەواوە سەیرم کرد . لە ڕۆژهەڵاتدا کاتێ کە پادشاکان تەماشای ئەم تاجە جوانەیان دەکرد کە سەمبۆلی هێز و ڕەسەنایەتیە دەستیان لە ڕاپەڕین و سەر هەڵدان بەردەدا . لە دوایشدا تەماشای دوایین کارە نائاساییەکانی جەماڵی خۆشنووسمان کرد . هونەری ڕاستەقینەی خەت و نووسینە . بۆ ئەوەی کە مافمان نەدابێت بە دوژمنانی ڕەنگ و نەخش کە دەڵێن : نەخش بەهانەیەکە بۆ پێشخستنی خەت ، بە زوویی ئەوەمان بەجێهێشت .

ناسری جەدوەل کێش بەلالێویکەوە وتی : خەریکی پینە کردنی

لاپەڕەیـــەکی حەماســـەکەی نیـــزامیم کـــەوا لـــە کـــاتی کوڕەکـــانی تەیموردادروستکراوە ، ئـەم لاپەڕەیـە باسـیئەو کاتـەیوا خەسـرەو شـیرین لەکاتی مەلەکردندا بە ڕووتـی دەبینـێ دەکێشـێتە نـاو وێنەکـەوە . ئۆسـتادی نیوە کوێری تەمەن نەوەدو دوو ساڵە دەیگوت: بیست ساڵ بەر لە ئێستا لە تـەورێز چـاوم بـە ئۆسـتاد بـەهزاد کـەوتووە و دەسـتەکانیم ماچـکردوون ، هەروەها لەوە زیاتر کەبلێ ئۆستادی گەورە کوێرایی داهاتووەو سـەر خۆش بـووە شـتێکیتری لانـەبوو، قوتـوی قەڵـەمێکی نیشـانداین کـە بـە دەسـتە لەرزۆکەکانی خۆیەوە خەریکی دەبوو ، دەیگوت : سیٚمانگیتر تەواو دەبیٚ، دەمــەویٚ وەکــوو خــەڵاتی چــەژن پێشکەشیپادشــای بکــەم . لــە قــاتی خوارەوەی نیگارخانەکەدا زیاتر لە هەشتا ئوستاد و شاگرد کاریان دەکرد ، کەچـی مـات و بێـدەنگ بـوو ، ئەمـەش لـە بێـدەنگی دوای لێـدان دەچـوو ، نمونــەی وەهــام زۆر بینیبــوو ، جــاریوا هەیــە قاقایــەکی ڕۆخێنــەر ، یــان گاڵتەیەکی نابەجیٚ ، یان نزگەرەیەك یاخود نرکە و ناڵەی بەرلـە گریان ئـەو ئەو بێدەنگییە دەشکێنیٚ . ئۆستادەکانی وێنەکێشیش بۆ خۆشیان دەورانـی شاگردی و ئەو کاتانەیان دەکەوێتەوە یاد . ئەو ئۆستادە نـەوەد و دوو سـاڵە کـە خـەریك بـوو کـوێرایی دابێـت شـتێکی قـووڵ و بـەواتای پـیٚ فێـر کـردم ، ئەوەش ئەوە بوو کە لێرە ، سـەرەڕای دوور بـوون ،لـەوە دەچـیٚ ، بـەر لـەوەی کە ڕۆژی حەشر و قیامـەت بێـت ، بێدەنگییـەکی لـەم شـێوەیە هـەموو لایـەك بگرێتەوە ، نەخش بێـدەنگی عـەقڵ و مۆسـیقای چاوە . کـاتیٚ کـە بۆ خـودا حافیزی دەستی وەستا عوسمانم ماچکرد ، لە بـاتی ڕێـز، شتێکم بیست کـە ڕۆحمی سەر وژێر کرد و تێکیدا : ئەمە بەزەییەکی تێکەڵ بە سەر سووڕمانە کــەوا لــە بەرامبــەر ئەولیاکانــدا ئەنجامــدەدرێت ، هەســتێکی زۆر ســەیری

تاوانبارییه ، لەوانەیە ئەمە لەبەر ئەوە بێت کەئەو زاواکەمان بەڕەقیبی خۆی بزانێـت کـە بـەنهێنی بـە ئاشـکرایی لاسـایی فەرەنسـیەکان دەکاتـەوە . پێموابوو کە ئەمە دوا دیدارم بێ لەگەڵ ئەو ئوستادە پیرەدا ،جابۆئەوەی کە تۆزێك خۆشحاڵی بکەم ، بە گەرماییەکەوە پرسیارم لێکرد وتم ! مامۆستای گـەورە و ئەفەنـدی : وینەکێشـێکی تایبـەت و یـەکێکی ئاسـایی چۆن لەیـەك جیـا دەکرێنـەوە ؟ مامۆسـتا عـادەتی بـەوجۆرە پرسـیارانە کردبـوو کـە ناوەڕۆکەکانیان ماستاوچێتی و پانکەرانەیە . وامدەزانی کە وەڵامێکی سـەر پێم پێدەداتەوە ، بگرە لەوانەیە ئێستا کانە منیشی لـەبیر نەچووبێ . وتـی : هیچ پێوانێك نییە بۆ ئەوەی کەوینە کێشی تایبەت و ئەوەی بێئیمان لە یەك جیا بکرێنەوە ، ئەمە بەپێی زەمان دیار دەبێت ، بۆ ئەوەی کە وێنەکـەمان لـە بەرامبـەر بێڕەوشـتی و خراپەییـدا بپارێزرێـت ، بـارودۆخی ڕەوشـتی وێنەکێشەکە زۆر کاریگەر دەبێت . ئەمڕۆ بۆ ئـەوەی کـە بزانم وێنەکێشـێکی گەنج چەندە تایبەت و بە توانایە سێ پرسیارم لێکرد .

چـی بـوون ئەوانـە ؟ وتـی : ئایـا دەتـوانی لـە بەرامبـەر نـەریتی نـوێی چینەکان و فەرەنسەییەکاندا بڵێی کە با منیش نەریتێکم هـەبێت و پێـداگری لێبکـەی ؟ ئایا تـۆ وەکوو وێنـە کێشـێك دەتـەوێ کـە لـە هـەموو کەسـێکی تـر ئاکـارێکی جیـاوازترت هـەبێ و وەکـوو ئوسـتادە فەرەنسـییەکان ئـەوەش بـە ئیمزا و نیشانەی خۆت بسەلمێنی  یان نا ؟

بۆ ئەوەی کە لە ئەمانە تێبگەم یەکەم جارباسی ئیمزاو شێوازم کرد .

بەڕێزێکەوە وتم ئەی دوایی چیبوو ؟

وتـی : لـە دواییـدا ویسـتم کـە بـزانم ئەگـەر ئـەو پاشـایانەی وا ئـەم کتێبانەیان پێڕاسپارد بوو بمرن و کتێبەکانی ئەمدەست و ئەو دەست بن و

لە دواتردا وێنەکانی ئەم کتێبانە بۆ کتێبی تر بە کاربهێنن ، ئەم وێنەکێشە هەست بە چیدەکات ؟ کەس ناتوانێت چ بە خۆشیو چ بە خەمناکی ڕووبەڕووی شتێکی ئاوەها ببێتەوە لەم ڕووەشەوە پرسیاری کردوگوتی کوڕم دەزانی کاتی نەخش و کاتی خودا کەیە ؟

وتم نا و وتم : ئەی سێهەمیان ؟

وتی : سێهەمیان کوێر بوونە ! بێئەوەی کەشیبکاتەوە بێدەنگ بوو . بە گرژبوونەوەیەکەوە وتم : کوێرایی داهاتنە ؟

" کوێر بوون ، بێدەنگییە ، ئەگەر ئەو دووەی وا تۆزێك بەر لەئێستا باسمکردن لەگەڵ یەکدا بەراورد بکەی ئەوا سێهەمیش دەردەکەوێ ، جێگای هەرە قووڵی وینەکێشان ئەوەیە کە وا لە تاریکایی خودا دا شتانی دیارو ئاشکرا ببینی " .

بێدەنگ بووم ، هاتمە دەرەوە و بێ پەلەپەل لە پلیکانە سەهۆڵ گرتووەکانی بیناکەوە هاتمە خوارەوە . دەمزانی کەئەو سێ پرسیارەی ئوستادی گەورە تەنیا بۆ قسەنیە ، بەڵکو بۆ ئەوەیە کە لە هاوتەمەنەکانی خۆم ( پەپولە – زەیتون – لەقلەق ) بپرسمکە خەریکن دەبن بە ئەفسانە .و بۆئەوەیە کە لێیان تێبگەم . یەکسەر نەڕۆیشتم بۆ ماڵی ئەو ئوستادانە، لەلای ملەکەی خەلیجدا لەبازاڕێکدا کە ڕووی کردبووە ملە تازە دروستکراوەکە ئەستەرم بینی، لە نێو جەنجاڵی ئەو ژنە کوێلانەی واهاتبوونە بازاڕ و خەرێکی کڕینی گێزەر و تەماتە و پیاز و بەی بوون دادەهات. ئەستەر بە جلوبەرگە باشەکەی خۆیەوە ئیشارەتی لێدام . ئەم ئەستەرە قسەی زۆری دەکرد و دەمی ڕانەدەوەستا ، بەخۆشی جاران هاتو یەکتریمان بینی ،کە نامەکەم وامدەزانی کەتەواوی بازاڕەکە بەدزییەوە

تەماشـای مـن دەكـات . بەشـێوەیەكی نهێنـی و زۆر وەسـتایانە نامەكـەی خستەناو پانتۆڵەكەیەوە ، بەخشیشەكەم پێداو وتم : " ئامان ، بەقوربانت بم یەك ڕاست بیگەیەنە دەستی خۆی ."

بوخچەیەكی پیشاندام و تێی گەیاندم كە كاری زۆری هەیە و تا نیوەڕۆ ناتوانێت نامەكە بگەیەنەتە شەكورە. وتم : " بە شەكورە بڵێ كە ڕۆیشتووم بۆ بینینی سێ ئوستادە گەرەكە " .

## (( پێم ئەڵێن پەپولە )) (12)

بـەر لـە نوێـژی نیـوەڕۆ بـوو كـە لەدەرگاكەیانـدا ، ڕەشـە چـەلەبی بـوو ، لەكاتی شاگردیدا ئەویش ماوەیەك لەگەڵماندا بوو ، باوەشمانكرد بەیكداو یەكترمان ماچكرد ، وتم لەوانەیە لە زاواكەیەوە هەواڵێكی هێنابێت ، كەچی وتی : هاتووم بۆ ئەوەی تەماشای وێنەكانت بكەم و سەیرێكی ئەو لاپەڕانە بكەم وا ڕازاندووتەتەوە ، بۆ دۆستایەتی هاتووم و بەناوی پادشاوە دەمەوێ بە پرسیارێكەوە ئەزموونێكت لێوەربگرم .

وتم : باشە ، پرسیارەكەت چیە ؟ .

وتی : باشە !

شێواز و ئیمزا

وتم : ئەگەر كەسانی ناڕەسەن و بێ دایك وباوك كە تەنیا بۆ پارە وێنە دەكێشن ڕوو لـە زیـادبوون بكـەن ، ئـەوا شـتانی وەكـوو شـێواز و ئیمـزاو تەنانەت شتانی پیستر لەوانەش وەكوو تەماكاریش دەردەكەون و ئێمەش بە چاوی خۆمـان دەیـانبینن . مـن ئـەم كـارەم لەبـەر ئـەوەی كەبـەپێی نەریتـە دەستپێكردوە ، نەوەكوو لەبەر ئەوەی كە بڕوام پێی هەبووبێت ، چونكە لە

ڕاستیدا هوونەری ڕاستەقینە لەگەڵ پارە و ناوبانگدەرکردندا بەراورد ناکرێت . ئەگەر ڕاستیتان بوێت پارەو ناوبانگ دەرکردن چۆن مافی منە ، مافی هەر هونەرمەندێکی تریشە و ئەمەش دەبێت بە هۆی ئەوەی کە لەو ڕێگایەدا زیاتر هان بدرێین . بەڵام ئەگەر باسی ئەمانە بکەم وێنەکێشە بەخیل و هیچ نەزانە هاربووەکانی دەستەی وێنەکێشان پەلامارم دەدەن و حەیام دەبن . بەڵام لە بەر ئەوەی کە بسەلمێنم لەوان زیاتر حەز لەم ئیشە دەکەم، لە سەر دانەیێکی برنج وێنەی دارەختێکم کێشا ، پاپاکان بە وێنەکانی خۆیانەوە ئوستادە چینیەکانیان دەخەڵەتاند وبەوجۆرەش کاریگەری وێنەکێشە فەرانسەییەکان لە سەریان دروستدەبوو ، ویست و ئارەزووی ناوبانگ دەرکردن شێۆاز و کەسایەتی تایبەتیش هەر بەرێگای ئەم وێنەکێشە چینیانەوە گەیشتوەتە نزیکی خۆشمان . ئەگەر مۆڵەتم پێبدەن سەبارت بە ئەم بابەتە سێ ڕووداوی کورتتان بۆ دەگێرمەوە.

( سێ بەسەر هاتی سەبارەت بە شێۆاز و ئیمزا ) .

ئەلف ) – ڕۆژێك لە ڕۆژان خانێکی گەنج هەبوو کە لە قەڵاکەی خۆیدا لە ناو ناوچە شاخاوییەکانی هەراتدا ژیانی دەبردە سەر ، خان لە حەرەمسەراکەی خۆیدا تەنیا یەك ژنی خۆشدەویست . سەرشێتانە شەیدای بوو، ژنەش بەهەمان شێوە حەزی لێدەکرد شەوان هەتا بەیانی لە باوەشی یەکتریدا دەمانەوە و بە ئارەقی لەشیانەوە یەکتریان تەڕ دەکرد و لەگەڵ یەکدا جۆر دەبوون و لاقەیان دەکرد . لە یەك نەدەبێزان و هیوایان وا بوو کە ئەم دڵخۆشیەیان تا سەر بەردەوام بێ بۆ ئەوەی کە ئەم هیواییان بێتە دی هەموو ڕۆژ و شەوێك بەبێ ڕاوەستان تەماشای کتێبە کۆنەکانیان دەکرد ، بەبێئەوەی سەریان سوور بمێنێ دووبارە سەیریان دەکردەوە و وەها

هەستیان دەكرد كە كات ڕاوەستاوەو دڵخۆشیەكانی چاخی زێڕین كەوا لە كتێبە كۆنەكاندا باسیان لێوەدەكرێ، لەگەڵ خۆشییەكانی ئەواندا تێكەڵاو بووە . وێنەكێشخانەی ئەم خانە مامۆستایەكی لێبووە كە مامۆستای هەموو ئۆستادە كان بووە و توانیویەتی هەر ئەو وێنانە بە بێ كەمو كوڕی بكێشێتەوە .

بەپێی ئەو عادەتەی كە باو بووە وێنەكێشەكە لەباتی وێنەی فەرهاددا كە لەدەردی عەشقی شیرین دەناڵێ ، یان وەكوولەباتی لەیلا و مەجنون دا كە بە تامەزرۆییەوە تەماشای یەكدەكەن .یان لە جێگای خەسرە و شیریندا كە لە باخچە بێهەتاوەكەدا بە زمانی چاو لەگەڵ یەكتریدا قسە دەكەن ، وێنەی خان و خۆشەویستەكەی دادەنێت . كاتێ كە خان و خۆشەویستەكەی تەماشای ئەم لاپەڕانە دەكەن ، ئیدی وەها بڕوا دەكەن كە خۆشەویستیە– كەیان كۆتایی پێنایەت و گیرفانەكانی كابرای وێنە كێش پڕدەكەن لە زێڕ و ئاڵتوون . بەئەم بایەخدان و زێڕ و ئاڵتونانەوە لە دواییدا ئوستادەكەیان لە ڕێ لابرد و خستیانە دوای شەیتانەوە . لە دواییدا وای لێدێت كە ئەم ئوستادە ئەوەی لە بیر بچێت كە هەموو ئەم شتانە لە ئوستادە كۆنەكانەوە فێر بووە و هەست بە هیچ جۆرە قەرزارییەك بەرامبەر بە ئەوانە ناكات و وەها هەستبكات كە ئەگەر تۆزێكیتر لە نیشانەكانی كەسایەتی خۆی ئاوێتەی وێنەكان بكات ئەوا بێنمونە و جوانتر دەردەچن . بەڵام كاتێك كە خان و خۆشەویستەكەی تەماشای ئەم نیشانە و شوێنە دەستانە دەكەن، وەكوو عەیبێك چاوی لێدەكەن و دڵتەنگ دەبن .

ئیدی هەر چەندە تەماشای ئەم وێنانە دەكەن ، زیاتر هەستدەكەن كە تام و چێژی جارانی نەماوەو خۆشەویستیەكەیان لەتمەی پێگەیشتووە .

لەوەو بەدوا خان بەخیلی  بە وێنەی ئەو کچە جوانە تاتارە دەبردەوە کە لە لاپەڕەکاندا کێشرا بوو ، بۆ ئەوەی کە تۆڵەی لێبسێنێتەوە وکارێك بکات کە ئەویش بەخیڵی بباتەوە ژنێکیتر جۆر دەکات و لەگەڵی دەخەوێت و جووت دەبێ . ورتە و بۆڵەکانی ناو حەرەمسەرا زوو بڵاو دەبێتەوە  و دەگاتەوە گوێی ئەم کچە جوانە تاتارە ، زۆری پێناخۆش دەبێت و بە بێئەوەی کەسێك بزانێ لە داری حەوشەی حەرەمسەراکەوە خۆی هەڵدەواسێو خۆی دەخنکێنێ . خان لە دواییدا تێدەگات کە چ هەڵەیەکی کردووە ! کاتێکیش تێدەگات کە ئەمە شێواز و تەرزی تایبەتی خودی وێنە کێشەکە بووە ، هەر لەو ڕۆژەدا هەر دوو چاوی دەردێنێ و کوێری دەکات .

بێ )– لەیەکێك لە وڵاتەکانی ڕۆژ هەڵاتدا پادشایەکی پیردەبێت کە زۆر حەزی لە نەخش و نیگار کێشانە ، ژنی پاشا دەمرێت و ژنێکیتر دەهێنێ ئەم ژنە تازەیەی خەڵکی چین دەبێت و زۆریش جوان دەبێت،بەوجۆرەش ژیانێکی پڕلە خۆشی  دەبەنە سەر، دوای ماوەیەك کوڕی شا( لە ژنە پێشووەکەی) لەگەڵ ئەم ژنە تازەیەی باوکیدا دڵیان لەیەك دەچێت . کوڕ لە ترسی ئەم خەیانەتەی کە بەرامبەر باوکی کردوویەتی زاوری دەتۆقێ و لەم عەشقە قەدەخەکراوەی خۆی تەریقدەبێتەوە و دەچێتە وێنەکێشخانە و خۆی بە وێنەکێشانەوە خەریك دەکات .

ئەو وێنانەی کەوا بە هێزی خەم و پەژارەی عەشقەکەیەوە دروستیکردبوون ، یەك لە یەك جوانتر دەردەچوون و ئەوەی تەماشای بکردایە دەیگوت لە وێنەی ئوستادە کۆنەکان ەچێ . پادشاش بێخەبەرلە هەموو شتێك شانازی بەم کوڕەی خۆیەوە دەکرد ، ژنەکەشی تەماشای وێنەکانی کردووە و گوتویەتی : بەڵێ زۆر جوانە ! بەڵام ئەگەر ئیمزا نەخاتە

پـاڵ ئـەو جوانكارییانـە دوای سـاڵانێكیتر كـەس نـازانیٚ كـیٚ ئەمانـەی دروستكردووە . پاشاش گوتویەتی : ئەگەر كوڕەكەم ئیمزای بداتە پاڵ ئەو ڕەسمانە ئەوا بە ناحەقییەوە مافی ئوستادە كۆنەكان دەخوات ، لەوەش زیاتر ئەگەر كەمو كوڕییەكی هەبیٚ بە ڕێگای ئیمزاكەی خۆیەوە ئاشكرای دەكات و دەڵێت كە من كردوومە ، ژنە چینییەكە كاتیٚ كەزانیٚ ناتوانیٚ سەبارەت بە ئیمزا مێردە پیرەكەی ڕازی بكات بەهەر شێوەیەك بێت باس و لاقردی ئیمزاكە دەگەیەنێتە گوێی كوڕە گەنجەكەی پاشا كە دەرگای وێنەكێشخانەكەی لەسەر خۆی داخستبوو . ئەو كوڕەی وا دەبوایە بە ناچاری عەشقەكەی بشارێتەوە و لە سەر ئەوەش غووری تێكشكا بوو ، بە قسەی باوەژنەكەی وبە هاندانی شەیتانەوە دەخەڵەتیٚ و لە گۆشەی ڕەسمێكەوە ئیمزایەكی خۆی دادەنێت . ئەو وێنەیەش كەوا ئیمزای كرد بوو باسی كوڕەكەی خەسرەو(شیرویە )ی دەكرد كە عاشقی شیرینی ژنی باوكی بووبوو . ئەم كوڕە شەوێك لە پەنجەرەوە دەچێتە ناو ژوورەكەی باوكی و خەنجەرێك دەكات بە سكی باوكیدا و دەیكوژێت ، شیرینیش بە ناسكییەوە خەوی لێكەوتووە و ئاگای لێنابێت . كاتێك كە پاشا پیرەكە تەماشای ئەم وێنەیە دەكات كەوا كوڕەكەی ئیمزای كردووە ، لە ناكاو هەست بە كەم و كورتییەكی ئەو ئەو وێنەیە دەكات ،هەراساندەبیٚ و دەڵێت ئەمە كەمو كوڕییەكی بچكۆلانەیە .بەڵام كاتێك كە وێنەكێشەكان بۆ شاردنەوەی ئەو عەیبە هیچیان پیٚناكرێت پاشا پیرەكە زیاتر هەراسان دەبێت ، چونكە ئەو شتە باس لە داستانێك یان وەكوو ئەفسانەیەك ناكات بەڵكو ڕاستییەك دێنێتە سەر زمان . پیرە پیاوەكە هەست بەمە دەكات ، زۆر دەترسێت ، لە هەمانكاتیشدا كوڕەكەوی وەكوو ئەوەیوا لە ڕەسمەكەدا

نیشـــاندراوە لـــە پەنجەرەکـــەوە دەچـــێتە ژوورەکـــەی بـــاوکی و بـــە چەقۆیەکیگەورە وەکو ئەوەی لە وێنەکەدا هەیە بێئەوەی تەماشای چاوە دەرپەڕیوەکانی باوکی بکات سینگی هەڵدەدڕێت .

جیم )– لە میژووی ( ڕەشیدە دینی قەزوینی )دا وەها هاتووە کە دوو سەد و پەنجاە ساڵ بەر لە ئێستا ڕازاندنەوەی کتێب و خۆشنووسی و وێنەکێشان لە قەزوێندا هونەری هەرە بەڕێز و شکۆدار بووە .فەرمانەکانی ئەو پاشایەی کەوا لەو کاتانەدا لە سەر تەختی دەسەڵات بووە ، لە بیزانس و چین و چل ولاتیتردا برەوی هەبوو،کێدەزانێ ( لەوانەیە حەز و خۆشەویستی ) ئەم پاشایە بەرامبەر وێنەکێشان هێزی شاراوەی ئەم حوکمە بووبێت ! بەداخێکی زۆرەوە ئەم پاشایە وەجاخی کوێر دەبێ و کوڕی نابێ ، لە بەر ئەوەی  ولاتانی ژێر دەسەلاتی ئەو پارچە نەبن و لەیەك جیانەبنەوە ، بەدوای شوویەکی ژیر و وێنەکێشدا دەگەڕا بۆ کچە جوانەکەی . بەم بۆنەوە لە نێوان سێ وەستای جوان و هەرزەکاری وێنەکێشخانەکەدا کێبڕکێیەی ساز کرد بوو ، بە پێی مێژووەکەی ڕەشیدەدینی قەزوینی بابەتی کێبەرکێکە شتێکی زۆر سادە بوو ! ئەوەش ئەوە بوو کە کێ دەتوانێ جوانترین وێنە بکێشێ ؟ هەر بە پێی ئەم مێژوویە  هەر سێوێنە کێشەکە بە گوێرەی نەریتی  ئوستادە کۆنەکان وێنەیان کێشاوە و هەر سێشیان بەبێئەوەی ئاگاداری یەکبن ئەو وێنەیە دەکێشنەوە کەوا لە هەموو زیاتر حەزی لێدەکرێ .

باخچەیەکیان کێشا بوو کە لە ڕاستیدا لە بەهەشت دەچوو ، پڕ بوو لە داری قەنافە ( سەدر ) و سەرو ، لە نێوان پەلەوەرەکان و کەروێشکە ترسەنۆکەکاندا وێنەی کچێکی خەمباریان کێشا بوو کەلە دەردی عەشق

**دەینالاند . هەموویان وەکوو وەستاکۆنەکان وەکوو یەك کێشا بوویان . بەڵام یەکێك لەوانە کە ویستبووی  فەرق و جیاوازی تێبخات ، لە ژێر وێنەکەدا لە ناو باخچەکەدا و لە نێوان گوڵێکی نێرگزدا ئیمزایەکی خۆی دانابوو . بەڵام لە دواییدا هەرلە بەر ئەمەو  لە بەر ڕووداری و دوور کەوتنەوەی لە سادەیی‌و خاکیبوونی وەستا کۆنەکان ، لە قەزوێن دوور خرایەو بۆ چین . بەمجۆرەش کێبەر کێکە لە نێوان ئەو دوو وەستاکەیتردا بەردەوامبوو . ئەم جارەیان هەردووکیان وێنەی کچێکی جوانیان لەناو باخچەیەکدا کێشا کەوا سواری ئەسپێك دەبوو . هەردووکیان وێنەکەیان بە جوانی شێعرێك کێشا بووەوە . بەڵام یەکێکیان ، نازانم لەبەر فڵچەکە بووە یان بەقەستەوە وایکردووە لمۆزی ئەسپەکەی گەورەتر کێشا بوو . پاشا و کچەکەشی ئەمەیان وەکوو عەیبێکی گەورە بینی و دووریانخستەوە بۆ بیزانس . ئەم کابرایە ئیمزای لێنەدا بوو بەڵام لمۆزی ئەسپەکەی وەها کێشا بوو کە یەکسەر هەست بە جیاوازییەکەی دەکرا . پاشا گوتبووی : کەمو کورتی بیرهێنانەوەی شێواز وتەرزەو بڕیاری بوو ئەو وێنەکێشەی وابە بێ هیچ کەمو کوڕییەك وێنەکەی وەکوو ئوستادە کۆنەکان کێشا بووبکات بە زاوای خۆی ، لەوەو بە دوا وێنەکێشەکە ئامادە کارییەکانی گێڕانی جەژنی هاوسەری لەگەڵ کچەکەی پادشادا دەکرد، بە گوێرەی مێژووە ئەستوورەکەی  ( ڕەشیدە دین قەزینی ) لەدواییدا ڕووداوێکیش دروست بووە ، ڕۆژێك بەرلە زەماوەندەکە کچەکەی پاشا بەخەمێکی زۆرەوە تەماشای ئەو وێنەیە دەکات کە ئەوجوانە کێشا بووی وا دووسبەی دەبێ  بە هاوسەری، لە تاریکایی شەودا دەچێتە لای باوکی و دەڵێ : وەستا کۆنەکان وێنەی کچەجوانەکانیان وەکوو چینییەکان دەکێشایەوە ، ئەمە یاسای ئەم**

ئیشە بووە . باوکی دەڵێ : ڕاستە .

کچ دەڵێ : بەڵام ئەمانە کاتێك خۆشەویستێکیان هەبایە ، نیشانەیەکی ئەویان لە نێو چاوانیان لەسەر پرچ یا خود لە پێکەنین ، تەنانەت لە برژانگی ئەو جوانەدا جێی دەکردەوە ، ئەم عەیبە بچووکە دەبوو بەنیشانەیەك بۆ عەشقەکەیان کە تەنیا خۆیان و خۆشەویستەکەیان لێی تێدەگەیشتن .ئەمڕۆ تەماشای کچە جوانەکەی سواری ئەم ئەسپەم کرد ، هیچ نیشانەیەکی منی پێوە نییە ! لەوانەیە ئەم کوڕە جوانە وەستایەکی گەورە و قۆزیش بێت ، بەڵام حەزم لێناکات ! بەم جۆرەش پاشا زەماوەندەکە بەتاڵ دەکاتەوە و کچە و باوکی تا دوایی تەمەنیان پێکەوە دەژین .

ڕەشە بەڕێزێکەوە وتی : " بە گوێرەی داستانی سێهەم شێواز ( ئوسلوب ) هەمان دەستپێکردنی هەڵەکانە .ئەو ڕوخسارە جوانەی کەوا وێنەکێشەکە عاشقیەتی لە چاوەوە یان لە پێکەنینەکەوە ، یان لە ئیشارەتێکی نهێنییەوە دەردەکەوێ و دیار دەبێ ؟ " بەدڵنیایی و بە شێوەیەکی لەخۆباییەوە وتم : " نا". ئەوشتەی وا وەستای وێنەکێش لە خۆشەویستەکەیەوە وەری دەگرێت و دەیباتەناو وێنەکەوە ، نابێ بەکەمو کوڕی ، بەڵکوو دەبێ بە یاسا . چونکە دوای ماوەیەك هەموو کەسێك لاسایی ئەو وەستایە دەکاتەوە و بەسەدان وێنەی ئەو کچە جوانە دەکێشنەوە .

تۆزێك بێدەنگماینەوە . ڕەشە بەهەموو سەرەنجێکی خۆیەوە گوێی دەدایە ئەو سێ بەسەر هاتە ، بەڵام کاتێك کە لە سووچی دەرگاکەوە ، چاوی بە ژنە جوانەکەم دەکەوت کەلە هەیوانەکەدا تەقەتەقی دەستی دەهات ، سەرەنجی ئەچووە سەر ئەو .

زاق زاق تەماشای نێو چاوانیم کرد وگوتم : بەسەر هاتی یەکەم دەڵێ شێواز (ئوسلووب ) جۆرێکی هەڵە و کەموکوڕییە . بەسەر هاتی سێهەمیش عەقڵی بەشی یەکەم و دووهەم کۆدەکاتەوە و پێمان دەڵێت کە شێواز (ئوسلووب ) خۆ هەڵخەڵەتاندن و خۆ گەورە کردنێکی ڕووداراانە و گێلانەیە .

لە بەرخۆمەوە وتم : ئەو پیاوە چەندە لە وێنەکێشی تێدەگات کە من وانەی پێدەڵێمەوە ؟

– : لە گێڕانەوەی ئەو بەسەر هاتانەوە تێگەیشتی کەمن کێم ؟

– : "تێگەیشتم ". بەلاَم من بڕوام پێنەکرد . بە شێوەی تێگەیشتنی ئەوەوە خۆتان سنوردار مەکەنەوە ، بابەڕاشکاوی پێتان بڵێم کەمن کێم :من هەموو شتێکم لە دەست دێت .

دەتوانم وەکوو وەستا قەزوێنییەکان بەپێکەنین و بە ڕابواردنەوە وێنە بکێشم و بۆیاخ بکەم . بەپێکەنینەوە دەڵێم کە لە هەموو کەسێك باشترم . ئەگەر هەستەکانم ڕاستم پێ بڵێن و هۆی هاتنی ڕەشە بۆ لای من ون بوونی " زەریف ئەفەندی " بێت ، بابە ڕاشکاوی بڵێم کە هیچ پێوەندییەکم پێوەنییە .

ڕەشە وتی : ئەی باشە ، ژیانی هاوسەری و ژیانی هونەری چۆن پێکەوە دەگونجێنن ؟

– بە ویستی خۆم ئیشی زۆر دەکەم ، لەگەڵ جوانترین کچی گەڕەکەدا زەماوەندم کردووە ، کاتێ نەخش ناکێشم ، لەگەڵ ئەوەدا جووت دەبم و پێکەوە لاقە دەکەین و خۆشەویستی دەکەین .لە دواییدا دیسان دەست بە ئیش دەکەمەوە .

ووتم : ئەوە کێشەیەکی گەورەیە . لەوانەیە وێنەکێش بتوانێ بەفڵچەکەی دەستییەوە لەسەر ڕووپەڵەکان شتانی دەرئاسایی دروستبکات ، بەڵام کە دەڕواتە لای ژنەکەی تووشی ئەوە نابێت و ناتوانێ ئاوەها بکات، ئەوەشم پێ زیاد کرد کە بە پێچەوانەکەشی ڕاستەو ئەگەر وێنەکێشەکە بتوانێ ژنەکەی دڵخۆش بکات و قامیشەکەی (ئالەتیجنسی پیاوان) کار بکات ، ئەوا قامیشەکەیتری لەسەر کاغەز کەمڕەنگدەبێتەوە.

وەکوو هەموو ئەو کەسانەی کە بەخێڵی بەهونەری وێنە کێشان دەبەنەوە ، ڕەشەش بڕوای بەم درۆو دەلەسانەی من کرد و زۆر خۆشحاڵ بوو و لەدوایشدا وتی : دەمەوێ ئەو لاپەڕانە ببینم کەوا ڕازاندونەتەوە . بردمە لای جامۆڵکەی ڕەنگەکانم و لە نێوان فڵچەو قەڵەمەکانمدا لەسەر تەختەکەم جێگام کردەوە . کاتێک ڕەشە سەیری ئەو دوو لاپەڕەیەی دەکرد وا بۆ جەژننامە ( سوور نامە )ی سونەتی شازادە ئامادەم کردبوون ، منیش لەسەر دۆشەکە سوورەکە لە تەنیشتیەوە دانیشتم . لەگەرمایی دۆشەکەکەوە تێگەیشتم کەتۆزێك بەر لە ئێستا ژنە قون جوانەکەم لەسەر ئەمە دانیشتووە . کاتێك کە من بە قەڵەمە قامیشەکەوە خەم و پەژارەی تاوانبارە بێچارەکانی بەردەم پاشام دەکێشا ، ژنە ژیرەکەم قامیشەکەی منی دەگرت ئای کە خۆش بوو! ئەو دوو لاپەڕەیەی وا دەمکێشا ، باسی ئەو تاوانبارانەی دەکرد کەقەرزیان وەرگرتبوو وە نەیاندەتوانی قەرزەکانیان بدەنەوە و لەبەر ئەوەش کەوتبوونە ناو زیندانەوە ، بەڵام بە بەزەیی ولێبووردەی پاشاوە خۆیان و بنەماڵەکانیشیان نەجاتیان دەبوو . وەکو ئەوەی وا لە بۆنەکەدا دەیبینم، پادشا لەسەر قاڵییەکی سوور دانیشتبوو کە دەیان تەلیسی زێڕی لەسەر دانرابوو . تۆزێك دواتریش نووسەرەکیان

دانابوو ، كەدەفتەرێكی قەرزی پێبوو و خەریك خوێندنەوەی بوو . تاوانبارەكانیشیان بەزنجیر كراوی هینرابووە بەردەم پادشا . وەكوو ئەوەی كە تەریق بووبێتنەوە و لەئازارێكی زۆردا بن، چاویان شۆڕ كردبۆوەو ڕوویان ترشكردبوو ، تەنانەت هەندێكیشیان بەفرمێسكەوە كێشرابوو، كاتێك پاشا لە خەزێنەكەی خۆی پارەی قەرزەكەی ئەوان دەداتەوە ، دەست بە خۆشی و شاییدەكەن و عوودچی و تەمبوورچییەكان بوگۆرانی وتنەوە مۆسیقا لێدەدەن ، بەوردی بە جوانیەوە كێشرابوون . بۆ ئەوەی كە دەردی قەرزاری باش بگەیەنێت ، لە پاڵ ئاخرین تاوانباردا وێنەی ژنە جل شڕۆڵەیەك و كچە جوانكیلەیەكی پرچ درێژو خەمباریان كێشابوو، جێكردنەوەی ئەو هەموو تاوانبارە لەو دوو لاپەڕەیەدا و واتا شاراوەكەی سوورایییەكە دووشتن كە تاكوو ئوستادە گەورەكانی تر ئەمەیان نەكردووە . خەریك بوو وەكوو چۆن بە پێكەنینەوە بۆ ژنەكەی خۆم باسكردبوو ، پێی بڵێم كە بۆچی سەگەی تەنیشت پاشام بەجوانی كێشاوە و بەڕەنگی تەقلەكەی سەری پاشا ڕەنگم كردووە كە پرسیارێكی لێكردم ، بەڕاستی زۆر عەیب بوو !

ووتی : بەگوێرەی تۆ، لەوانەیە ئیستا زەریف ئەفەندییە بێچارەكە لەكوێ بێت؟

ووتم : بێچارەی چی ، ئەوە لاساییكەرێكی بێقیمەتە ، ئەو تەنها بۆ پارە جوانكاری دەكرد و گێلێكی بێ ئیلهامە و بەس . نا ، نازانم .

ووتی : ئایا هیچ بیرت لەوە نەكردۆتەوە كەلەوانەیە گرووپێك لە هێرشكەرەكانی مەلا ئەرزڕوومییەكە شتێكیان خراپیان بەسەرداهێنابێ ؟ خۆمم ڕاگرت و نەمگووت كە ئەویش لەوانەیە

ووتم :نا ، بۆچی ؟

مەلا ئەرزڕوومییەکە دەڵێت : " ئەسیری و هەژاری ئەم شارەی ئەستەنبووڵ وبڵاوبوونەوەی وە باو هۆی ڕیسوابوون بێرەوشتبوونمان هەمووی دەگەڕێنەوە بۆ ئەوەی کەلە ئیسلامییەتییەکەی زەمانیە پێغەمبەر دوور کەوتووینەتەوە و عادەت و خووی پیسمان وەرگرتووە و بەپێی نەریتی فەرەنسیەکان هەڵسووکەوت دەکەین" و.. لەمە زیاتر هیچ ناڵێت .

–بەڵام دوژمنەکانی دەڵێن کە : " ئەرزڕوومییەکان هێرش دەکەنە سەر ئەو تەکیانەی وا مۆسیقای تێدا دەژەندرێ دەڵێن ئەوانە گۆڕی ئەولیاکان هەڵدەتەکێنن و دەیانەوێ پادشاش هەڵخەڵەتێنن " .

لەبەرئەوەی کەوا وەکوومن ئەوان دژایەتی حەزرەتی ئەرزڕوومی ناکەم دەیانەوێ زۆر بەڕێزانە پێم بڵێن کە تۆ زەریف ئەفەندیت کوشتووە . لەناکاو ئەوەش هات بە مێشکمدا کە بەڕاستی لەنێو وێنەکێشاندا ئەم گێڕانەوەانە باسدەکرێن و جەماعەتی بێئیلهامەکان بەخۆشییەوە باس لە پیاو کوژبوونی من دەکەن و ئەوەش بڵاودەکەنەوە .

تەنیا لەبەرئەوەی کە بڕوای بە تۆمەتی ئەو جەماعەتە بە خیلە کردووە ویستم کە تەقلەکەی سەری ڕەشە لەو سەرە زلەی داگرم . ڕەشە تەماشای ژوورەکەی دەکردوو هەموو شتێکی لەمێشکی خۆیدا ڕادەگرت . تەماشای مەقەستە درێژەکەی کاغەزەکەو کاسە پڕ لە پارە وردەکان و کاسەی ڕەنگەکان و ئەو سێوەی دەکرد وا لەکاتی کارکردندا جارجار قەپێکم لێدەگرت ، تەماشایەکی کووپەکانی قاوە ی پاڵ ئوجاخەکە و دۆشەکەکانی کرد ، سەیرێکی ئەو وێنەیەی کرد وابۆ تاقیکردنەوەی ئەندامی وێنەکانی تر بەکاری دێنم ، لەدوایشدا سەیری ئەو تیشکەی کرد وا لەپەنجەرەکەوە

دەهاتە ناو و بە سەرنجێکی تەواویشەوە نیگاکانی گێڕایەوە سەر پشتوێنە سوورەکەی ژنەکەم کەوا لەکاتی ڕۆیشتن بۆ کردنەوەی دەرگاکە دایخستبوو . لەگەڵ ئەوەی کەوا بۆچوونەکانی خۆمی پێنالێم بەلاَم بە بێترسانە وێنەکانی خۆم و هەموو ئەو شتانەی ناو ژوورەکەم پێنیشاندا و تەسلیمی نیگای چاوە هێرشکەرەکانیم کرد . دەزانم کە هەمووتان سەرتان سووردەمێنێ لەوەی کە من لەهەر وێنە کێشێك زیاتر پارە قازانج دەکەم و لە هەمووشیان باشترم ! چونکە خودا ویستوویەتی کە نەخش کێشان ببێت بە ڕازاندنەوەی جەژنی ئەو کەسانەی وا دەزانن سەیری وێنە بکەن .

## (13) (( پێم ئەڵێن لەق لەق ))

وەختی نوێژی نیوەڕۆ بوو کە لە دەرگایاندا ، ڕەشە بوو ، هاوڕێی کاتی

**مندالّیم بوو ، باوشمان کرد بەیەکدا . لەسەرماندا ڕەقی برد بووەوە ، بە بێئەوەی پرسیار بکەم ، ڕێگای مالّت چۆن دۆزیوەتەوە بردمە ژوورەوە .زاواکەیان لەبەر ئەوەی کە بزانیٚ زەریف ئەفەندی چیلێهاتووە نارد بووی بۆ لای من بۆ ئەوەی کە بۆنی دەمم تاقیبکاتەوە . بەلاّم لەلای وەستا عوسمانیشەوە هەوالّێکی هێنا بوو .**

**ووتی : " پرسیارێکم هەیە ، بە گوێرەی وەستا عوسمان جیاوازی وێنەکێشێك تایبەت لەگەلّ ئەویتردا لە زەمان دایە . تۆ لەسەر کاتی وێنەکێشان چۆن بیردەکەیتەوە ؟ "**

**–باشە گوێم لێڕا بگرە تاپێت بلّیم .**

**(( نەخش و کات))**

**وەکوو ئەوەی کە هەموو کەس دەزانیٚ وێنەکێشە کۆنەکانی دونیا تەنانەت هی عەرەبەکانیش وەکوو چۆن کابرایەکی فەرەنسی تەماشای دونیا دەکات ، ئاوەها سەیری دونیایان دەکرد ، تووتکە سەگێکی هەرچی و پەرچی ناو کۆلاّنی و کابرای فرۆشیار و کەرەوزەکانیان لە جێگای خۆیاندا دەکێشا . ئەو وەستا فەرەنسە–ییانەی وا ئەمڕۆ بە شانازییەوە باسیان لێوە دەکریٚ ، لە نەریتی (دیدگا)وە بیٚئاگا بوون و دونیاکەیان تەنیا تووتکە سەگ و کەرەوزەکانی دەبینی و هەربەو شەوە سنووردارە دەمایەوە بەلاّم لە دواییدا شتێك ڕوویدا کە دونیای وێنەکێشانی تووشی گۆڕانکاری کرد، هەر لەوێوە دەستی پێدەکەم و باستان بۆدەکەم .**

**(( سیٚ بەسەر هاتی کات و نەخش ))**

**ئەلف ) – لەو کاتانەی کە (( ابن شاکر )) گەورەترین و ناودارترین خۆشنووسی جیهانی عەرەب و دونیای ئیسلامەتی دەژیا ، یانی سیٚ سەد و**

پەنجا ساڵ بەر لە ئێستا ، کاتێك کە مەغوولەکان بەغدایان داگیر کرد، سەرەڕای سەرماوسوڵەی ڕۆژانی ڕەشەمە هەموو جێگایەکیان تالانکرد . ( ابن شاکر ) لە تەمەنی گەنجێتی خۆیدا زیاتر لە بیست بەرگ کتێبی نووسی کە زۆربەیان قورئانی پیرۆز بوون و هەمووشیان لەکتێبخانەکەی بەغدادا پەیدا دەبوون . لەبەر ئەوەی کە بڕوای وابوو ئەم کتێبانە تا قیامەت دەمێننەوە بە فیکرێکی قووڵ و بیٚکووتاییەوە ژیانی دەبردە سەر . بەڵام لە ماوەی چەند ڕۆژێکدا سەربازەکانی هۆلاکۆی مەغوول یەکە بە یەکەی ئەو کتێبانەیان پەڕوپووتکرد و سووتاندیان و لەدوایشدا خستیانە ناو ئاوی دیجلە . کیٚدەزانیٚ کەبۆ ئاخرین دانەی ئەم کتێبانە بە قارەمانییەوە چەند شەو لەبەر تیشکی لەرزۆکی مۆمەکاندا کاری کردبوو.

ئەم وەستا عەرەبە ڕێگا چارەی ڕزگاری لە کوێرایی و تاریکایی لەپشتکردنە هەتاو و تەماشاکردنی ئاسۆ و ڕۆژئاوا و بیرکردنەوە لەسەر بیٚمەرگی کتێبەکان و نەریتەکاندا دەبینی .

بەیانییەك زوو لەبەر کزەی سەرمادا ڕۆیشتە سەر منارەی مزگەوتی خەلیفە و هەموو ئەوشتانەی بینی کەوا نەریتی پێنج سەد ساڵەی نووساندن لەبەر ناسراوی و بەناوبانگی لە ناو دەبەن ، بۆیەکەم جار هاتنی سەربازەکانی هۆلاکۆی بۆ ناو شار بینی و لەسەر منارەکەیەوە تالانکردن و سووتاندنی شار ، سەر بڕینی سەدان کەس بە شمشێر و کوشتنی دوایین خەلیفەی ئەو خەلافەتەی وا پینج سەد ساڵە بەردەوام لەبەغدادا حوکمدەکا بەچاوی خۆی بینی ، سوار بوون لە سەر ژنان و سوتاندنی کتێبخانەکانی بینی و بە دڵێکی خەماوییەوە تەماشای ئەو لاپەڕانەی کرد کەوا بەر بەشی ئاوەکەی دیجلە کەوتبوون . ڕۆژی دواتر لەبەر بۆنی لاشەی مردووەکان و

هــاوار و ناڵــەی بەرلــە مەرگــدا ســەیری ئاوەکــەی دیجلــەی دەکــرد کــەوا بەمورەکــەبی کتێبــەکان ســوور بــوو بــوو ، بــیری لــەو کتێبانــە دەکــردەوە وا بەخــەتی جــوان نووســیبوونی و ئێســتاکانەش تــەفر و توونــا بــوون بــڕوای وا بــوو کــە ئیــدی ڕاوەســتاندنی ئــەو کوشــت و کوشــتارە مەترســیدارە هــیچ سوودێکی نییە .

لــە دوایيــدا ســوێندیخوارد کــە ئیــدی قەڵــەم نــەگریٚ بــە دەســتەوە و هــیچ شــتێك نەنووســێتەوە، لــەوەش زیــاتر ئــەو وەســتایەی کــە تــا ئــەو ڕۆژە وێنەکێشــانی وەکــوو ســەر هەڵــدانێك بەرامبــەر بــە خــودا دەبینــی و گاڵتــەی پێدەکرد ، لە سـەر لاپـەڕەیـەك کـەوا لـە خـۆی دووری نـەدەکردەوە دەسـتی بـە کێشــانی وێنــەی ئــەو شــتانە کــرد کــەوا بــە چــاوی خــۆی بینــی بــوونی . دوابــەدوای ســێ ســەد هێــز و جیــاوازی وێنەکێشــی ئیســلامی لەگــەڵ هــی بوتپەرەســتان و خاچپەرەســتان لــەوەوە دەهــات کەلــەو وێنــە دەرئاســاییەدا دونیــا لــە ڕوانگــەی خــودا وبڵنــدایی ئاســۆوە بینــراوە و وێنــە کێش بەخــەم و پەژارەو بەزەییەکی تەواوەوە کێشراون .

( ابــن شــاکر ) بــە وێنــەکانی بــەر دەســتییەوە و بــە ویســتێکی گــەورەی وێنەکێشــانەوە لەدڵیــدا بــەر و بــاکوور یــانی بــۆ ئــەو جێگاییــەی واســەربازە مەغوولــەکان لــەوێوە هــاتوون ڕۆیشــت، لەگــەڵ فێــر بــوونی شــێوازی وێنــە کێشــانی وەســتا چــینییەکان ئــەوەی بــە ئاشــکرایی بــۆ دەرکــەوت کــە ئــەو بیرۆکەیــەی بێکۆتــایی بــوون کــە پێــنج ســەد ســاڵ بەرلــە ئێســتا لەلایــەن خۆشنووســە عەرەبەکانــەوە داهێنــرا بــوو لــە خەتــدا نییــە ، بــەڵکوو لــە وێنــە کێشــاندایەو بەڵگــەی حاشــا هەڵنــەگر بۆ ســەلماندنی ئــەم شتەش ئەوەیە کە نووسراوەی کتێبەکان دەدڕێن و فڕێدەدرێن بەڵام وێنەکانیان لە کتێبیتـردا

بەكار دەبرێن و بەم شێوەیە بە بەردەوامی دونیای خودا نیشاندەدەن .

بیٚ ) – هەمووشتێك ، هەمووشتێكیتر دووبارە دەكاتەوە لەم ڕووەشەوە ئەگەر مەرگ نەبایە ئەوا مرۆڤ هیچ كات هەستی بە هەبوونی كات نەدەكرد و جیهانیش بەداستان و وێنەی دووبارەوە لە هەمان كاتدا دەكێشرایەوە . وەكوو ئەوەی وا لە مێژووە كورتەكەی ( سەلیم سەمەرقەندی )دا هاتووە ، ئارتەشە بچووكەكەی ( فاخر پاشا ) سەربازەكانی (سەلاحەدین خان ) یان پەرێشان كردووە . بەپێی عادەتی ئەو كاتانە ، فاخر پاشای سەركەووتو ، سەلاحەدین خان دەكوژیٚ و مۆری خۆی لە كتێبخانەكەی دەدا و سەردانی حەرەمسەراكەشی دەكات . بەرگدارە بە ئەزموونەكەی كتێبخانەكە كتێبەكانی پڕوپووتدەكات و هەر بەو لاپەڕانە خەریكی دروستكردنی كتێبیتر دەبیٚ ، خۆشنووسەكان ناوەكانی سەلاحەدین خانیانلە سەر كتێبەكان كەوا بە جوانی نووسرا بوون پاكدەكەنەوەو و لەباتی ئەوانەدا ناوی فاخر پاشای پیرۆز دادەنێن و وێنەكێشەكانیش هەر بەو شێوەیە خەریكی گۆڕانی وێنە جوانەكانی سەلاحەدین خان لەناو باشترین كتێبەكاندا و دانانی وێنەی پاشای نوێی لەوێدا دەبن .

كە ڕۆیشتە حەرەمسەراكەوە بە بیٚ زۆر و زەحمەتی جوانترین ژنی هەڵدەبژێریٚ. بەڵام لە بەر ئەوەی لە نەخش و نیگار كێشان و كتێب تێدەگەیشت و پیاوێكی ژیر و ناسك بوو ، زۆری لێنەكرد و هەوڵیدا كە دڵی بدزیٚو بەدەستی بهێنیٚ.ژنە جوانە چاو تەڕەكەی سەلاحەدین خان یانی نەریمان سوڵتان ڕازی بوو بەڵام تەنیا داوای شتێكی لە مێردە تازەكەی كرد ، ئەوەش ئەوە بوو كە لە كتێبێكدا كە باسی عەشقی لەیلا و مەجنوون دەكات و لەباتی لەیلادا وێنەی نەریمان سوڵتان و لە باتی مەجنونیش

وێنەیسەلاحەدین خان خان کێشراوە ، دەستکاری ئەو کتێبە نەکرێت و وەکوو خۆی بمێنێتەوە و هیچ نەبێت ئەو بێمەرگییەیوا ئەو ڕەحمەتییە لە کتێبەکاندا بەدوایدا دەگەڕا لێی درێخ نەکرێ .

فاخر پاشای سەر کەوتوو داواکارییەکەی بە جێهێنا و بە جۆرەش هیچ وێنەکێشێك دەستی لەو کتێبەنەدا . نەریمان و فاخر پاشا دەمیان نایە ناو دەمی یەك و باوشیانکرد بەیەکدا و وردە وردە لەگەڵ یەکدا جووتبوون و پشتی ماوەیەکیش حەزیان لەیەك کرد و ڕۆژانی مەترسیداری ڕابردوویان فەرامۆشکرد . بەڵام فاخر پاشا وێنەکانی ناو کتێبەکەی لەیلا و مەجنوونی فەرامۆش نەکرد و هەرلە یادی مایەوە .

ئەو شتەی وا دەیپەشۆکاند وئۆقرەی لێدەبڕی ، بەخێڵی بردنەوە و خانووگمانیکردن لەکێشانی وێنەی ژنەکەی لەگەڵ مێردەکەی جارانیا نەبوو ، بەڵکوو ئەوە بوو کە بۆچی وێنەکەی لە ناو ئەو کتێبە دەرئاساییەدا نەکێشرا بوو و لەگەڵ ژنەکەیدا تێکەڵاوی بێکۆتاییبوون نەدەبوو . شەوێك لە دوای ماوەیەکی زۆر خۆهەڵپێچان و جووتبوون لەگەڵ نەریماندا بەبێدەنگییەوە وەکوو دزێك چووە ناو کتێبخانەکەی خۆی . کتێبەی کردەوەو لەباتی وێنەکەی سەلاحەدین خاندا دەستیبە کێشانی وێنەکەی خۆی کرد . بەڵام وەکوو هەموو خانێکی وێنەدۆست باشی لێنەدەزانی و وێنەکەی جوان دروستنەکرد . بەیانی کابرای کتێبدار ، لەسەر گومانێك کتێبەکەی کردەوە و لە جێی وێنەی سەلاحەدین خاندا وێنەی کەسێکیتری بینی کە لە هی فاخر پاشا نەدەچوو . وتی : " ئەمە وێنەی ( عەبدوڵا... پاشا )ی دوژمنی سەرەکی و ڕەقیبی فاخر پاشایە . "

ئەم قسەیە دەم بە دەم گێرایەوە و لە نێو سەربازەکانی فاخر پاشادا بڵاو

بووەوە و وەرەیانی دابەزاند ، هەر بەو شێوەش ئەمە گەیشتەوە گوێی ( عەبدوڵا... پاشا ) و جەسارەتی پێدا و لەیەكەم شەڕدا لەشكرەكەی فاخر پاشای شكەستدەدا و لە دواییدا دەیكوژێ ومۆری خۆی لە كتێبخانەكەدەدا و دەبێ دەبێ بە مێردی تازەی نەریمان سوڵتان .

جیم )– لە نێو وێنەكێشاندا بەسەر هاتی كابرایەك بەناوی ( حەمە درێژ ) كەلە ئێراندا بە موحەمەدی خۆراسانی ناسراوە بۆ نموونەی كوێرایی داهاتن و تەمەن درێژی دەگێڕنەوە . بەڵام لە ڕاستیدا ئەمە بەسەر هاتێكە كە بابەتەكەی نەخش و زەمانە .

تایبەتمەندی ئەم وەستا گەورەیەی وا لە نۆ ساڵەییەوە بووە بە شاگرد و سەد و دە ساڵ بەبێ ئەوەی كوێر ببێ وێنەی كێشاوە ئەوەیەكە بێ تایبەتمەندی بووە .

لێرەدا یاری بە وشەكان ناكەم بەڵكوو لەدڵەوە تاریفی دەكەم . هەرشتێكی وەكوو ئوستادە كۆنەكان كێشاوەتەوە . هەر لەبەر ئەوەش وەستایەكی گەورەبووە . وێنەكێشانی وەكوو خزمەت بە خودا بینیوە و لەبەر دڵنزمی و گرێدانی بەكارەكەیەوە ، لە ئاژاوەكانی ناو وێنەكێشخانەكان خۆی دوور خستۆوەتەوە و سەرەڕای لەبار بوونی تەمەن ویستی بوون بە سەرۆكی وێنە كێشانی لەدڵدا نەبووە. لە و سەدو دە ساڵ تەمەنی وێنەكێشیدا لە گۆشەیەكدا دەمایەوە و وردە كاری دەكرد و خەریكی كێشانی گوڵ و گیا و پڕ كردنەوەی لاپەڕەكان و هەزاران پەلی دار و پێچ و پلۆوچی هەورەكان و یاڵی ئەسپەكان بە شانەكراوی و كەڵەكە كردنی خشتی سووری دیوارەكان و دەیان هەزار ڕوومەتی چاوجوان و چەناكە درێژی وەكوو یەك دەبوو. زۆر خۆشبەخت و بێدەنگ بوو ، هیچ كات خۆی

نەدەخستە ناومەیدانەوە و دوای شێواز و تەرزی تایبەت و کەسایەتی و ناوبانگ دەرکردن نەدەکەوت .

بۆکام خان و پاشا کاری بکردایە و لەکام وێنە کێشخانەدا بایە ، ئەوێی وەکوو ماڵی خۆی دەزانی و خۆشی وەکوو کەلووپەلێکی ئەو ماڵە دەبینی .

کاتیٚ کە پادشاو و خانەکان پێکەوە شەڕیان دەکرد و یەکترییان سەردەبڕی ، وێنە کێشەکانیش وەکوو ژنانی حەرەمسەرا ئەم شارە و ئەو شاریان پێدەکرا و لەوەش بەدواوە شێواز و تەرزی وێنەکێشخانە تازەکان لە کێشانەوەی پەل و چیمەن و لار و خێچی تاشە بەردەکان و سەبر و خۆڕاگری ئەم وێنەکێشانەدا دیار دەبوو .

تەمەنی ئەم وێنەکێشە لە هەشتا سالاٚندا بوو ، بەلاٚم کاتیٚ خەلٚك تەماشای وێنەجوانەکانی ئەم وەستایەی دەکرد ، هاتنی سالاٚنی مەرگی ئەو پیاوەیان لەبیر دەچووەوە و نیگاکانیان لەودیمەنە جوانانەدا ون دەبوو . لەوانەیە هەرلەبەر ئەمەش بووبیٚ کە هەندێك کەس گوتوویانە ئەم پیاوە لە دەرەوەی زەمان دەژی و هیچ کات پیر نابیٚ و نامریٚ . بە بیٚ ئەوەی مالٚ و ولاٚتێکی هەبێت لە ژوورێکی وێنەکێشخانەکەدا یان وەکوو لە چادرەکاندا ژیانی دەبردە سەر و شەوگاری تێدەپەڕاند . سەرەڕای ئەوەی کە زۆربەی کاتەکانیش سەری دادەنەواند و تەماشای لاپەڕەکەی بەردەمی دەکرد ، بەلاٚم دیسان کوێر نەدەبوو ، هەر لە بەر ئەوەش زۆر کەس ئەم وەزعە دەرئاساییەی ئەم پیاوەیان دەبردەوە سەر بەدەربوونی لە بازنەکانی زەمان . کەسانێکی تریش هەبوون کە دەیانگوت : " خۆی لە ڕاستیدا کوێر بووە ، بەلاٚم لەبەر ئەوەی کە هەموو شتێکی لەبەر کردووە ، دەتوانیٚ بیانکێشێتەوە وپێویستی بە چاو نییە ."

ئەم پیاوە ژنی نەهێنا بوو و هیچ کاتێکیش لەگەڵ ژناندا جوّر و جووت نەبوو بوو . بەڵام بۆ ماوەی سەد ساڵ بە بەردەوام وێنەی کوڕێکی جوانی دروستدەکرد کە وێنەی لە مانگ دەچوو . بە چەناکە باریکەلەو چاوە ڕاکێشراوەکانیەوە لە جوانیدا نموونەی نەبوو . لە سەد و نۆزدەهەمین ساڵی تەمەنیدا چاوی بە کوڕە جوانکیلە- یەکی خۆش سیما کەوت کە لە وێنەکێشخانەکەی شاتاماسووبدا بەردەستیدەکرد . ئەم کوڕە خەڵکی چین بوو بەلاّم خوێنی (کرواتەکانیش) لەدەمارەکانیدا دەجووڵایەوە . وەستا حەمە درێژی کاری خۆمان یەکسەر عاشقی کوڕە دەبیٚ و بۆ ئەوەی کەبیٚ بە خاوەنی ئەو جوانییە نائاساییە دەست بە هەموو کارێك دەکات . وەکوو وێنەکێشەکانیتر دەکەوێتەناو شەڕ و ئاژاوەی دەسەلاّت و دەست بە درۆ و دەلەسە و دانانی فێڵ و تەڵەکە دەکات و دەیەویٚ بگات بەو شتەی کەوا سەد ساڵ لێی دوور ماوەتەوە . کاتیٚ کە ئەم ویستە لەگیانی وەستا خوراسانییەکەدا زیندوو دەبێتەوە ، یەکسەر لە بیٚکۆتایی بوونی ئەفسانە کۆنەکان دادەبڕیٚ و لە عەسرێکی ڕووژێکیی ساردا نیگای چاوانی لە ڕوومەتی کوڕەکەدا نوقم دەبیٚ و لەبەر با ساردەکەی شاری تەورێزدا سەرمای دەبیٚ ، ڕۆژی دواتریش چاوەکانی کوێر دەبن و دوابە دوای ئەوەش لە پلیکانە بەرزەکانی وێنەکێشخانەکەوە دەکەوێتە خوار و گیانی دەردەچیٚ و دەمریٚ .

بۆ ئەوەی دیار بکات کە لە داستانەکانی من تێگەیشتووە ڕەشە بە ناسکییەوە وتی : " ناوی حەمە درێژی خوراسانیم بیستبوو ، بەلاّم ئەم بە سەر هاتەییم نەدەزانی".

بۆئەوەی تێر تێر تەماشای من بکات ، تۆزێك بیٚدەنگ مامەوە . لەدوای

گێڕانـەوەی دووهـەمین داسـتان لـە دەرگاکـەیان دابـوو ، دوای کردنـەوەی دەرگاکـە ، لەبـەر ئـەوەی کـە بێئیشـی ناڕەحـەت و دڵتـەنگی دەکـردم دەسـتم بەکار کردبوو .

شاگردە جوانەکـەم هەمیشـە لـە خـوار ئەژنۆمـەوە دادەنیشـێ و ڕەنگـەکانم بـۆ تێکـەڵ دەکـات و قەڵەمـەکانم بـۆ دەچـەکێنێو جارجـارێکیش هەڵـەکانم دەسڕێتەوە . مەحموود ، لەبەر دەستمدایە و بە خێرایی گوێم بۆ ڕادەگرێ و زۆر بەبێـدەنگیش تەماشـام دەکـات . لـەناکاو دەنگـی کاسـە و کەوچکەکانی بەر دەستی خێزانەکەم هات .

ڕەشە وتی : " هەی لەوە ! پادشا هەستاوەتە سەرپێ . "

بەسەر سووڕماییەکەوە تەماشای وێنەکەی دەکرد . منیش وەکوو ئەوەی کە ئەو تەماشا کردنە لەلام بێبایەخ بێ ، ئاوەها هەڵسووکەوتم دەکـرد . بابـە دزی و بەڕاستی ئەوەتان پێبڵێم کە لـەو ماوەیـەی وا خـەریکی دروسـتکردنی کتێبی ( سـوورنامە )( جەژننامـە )ی سوننەتکردنی شازادەکانین ، دووسـەد وێنەمان چاك کردووە کەلە هەموویانـدا پادشـا دانیشـتووە ، بـەس تـەنیا لـەم وێنەیـەدا کـەوا مـن کێشـاومە پاشـا هەسـتاوەتە سـەرپێ و لەکاسـەیەکی پڕلـەپارەدا پـارە بەسـەر جەماوەرەکـەدا بڵاودەکاتـەوە ، بـۆ ئـەوەی کـە بتـوانم سـەر سـووڕمایی و دڵخۆشـی جەماوەرەکـە لـەوەرگرتن و پەیـدا کردنـی پـارە نیشـان بدەم ، ئەوانـەم نیشـاندا بـوو کـە چـۆن خەڵکەکە لەگـەڵ یەکدا ئـاژاوە دەکەن و چنگ دەخەنە قوڕگی یەك و شەق هەڵدەدەنە یەك .

ووتم : " ئەگـەر بابـەتی وێنەیـەك عەشـق بـێ ، پێویسـتە وێنەکـەش بـە عەشقەوە بکێشرێ ، ئەگـەر خـەم و پەژارەشـی تێدا بێت ، پێویستە وێنەکە خـەماویی بێـت. بـەڵام ئـەو خـەم و پەژارەیـە لـە کەسـایەتی و فرمێسـکی

چاوانیان زیاتر ، پێویستە لە یەکەم کاتی چاو پێکەوتنی وێنەکەدا دیار ببێت و هەست بەوە بکرێت کە ئەمە لە ئاهەنگی ناوەوەی ڕەسمەکەوە دەردەکەوێت . "

من وەکوو ئەو وەستایانەم نەکرد وا سەدان ساڵە بۆ پیشاندانی سەر سووڕماویی کابرایەك ، پەنجە گەورەکەی دەخەنە ناو دەمیەوە . بەڵکوو بە کێشانی هەستانەوەی پادشا هەموو وێنەکەم خستۆوەتە ناو سەر سووڕماوییەوە .

وەکوو ئەوەی کەبەدوای شتێکدا بگەڕێت ، تەماشای کەلووپەلی ناوماڵەکەمی دەکرد ، هەر بیرم لێدەکردەوە . لەدواییدا بە چاوی ئەوەوە تەماشای ماڵەکەی خۆمم کرد . ئەگەر شارەزاییتان هەبێ و ئاگاداربن ، ماوەیەك لە شیراز و تەورێزدا وێنەی کۆشك و حەمام و قەڵایان دروستدەکرد ، بۆ ئەوەی کە تەریبی خودا لەسەر وێنەکە دیار بێت ، وێنە کێشەکە هەموو گۆشەکانی کۆشکەکەی دەکێشا ، کە تەماشات دەکرد واتدەزانی کە بەپێی موعجیزەیەکی ئەفسانەیی لە ناوەڕاستەوە کراوە بە دوولەتەوە ، قاپ و پەرداخ و هەڵچنینی ئەو دیوارانەی وا لە دەرەوە نابینرێن و پەردە و تووتی ناو قەفەسەکە و گۆشە شاراوەکان و ئەو سەرێنانەیان دەکێشا کەواکچە جوانەکەپاڵی پێوەدەدان .

وەکوو کەسێك کە تەماشای ئەو وێنەیە بکات ، سەیری ماڵەکەی منی دەکرد . تەماشای لاپەڕە و ڕەنگ و کتێبەکان و شاگردەکەمی دەکرد ، سەیری وێنەی جل و بەرگ و ئەو لاپەڕە جوانکراو ڕازێندراوانەی دەکرد وا بۆ گەشتیارە فەرەنسەییەکانم دروستکرد بوو . هەروەها تەماشای وێنەی ژنە ڕووت و قووتەکانیشی کرد .

لە شووشەکانەوە بگرە تاوەکوو جامۆڵکە بۆر و برۆنزەکان و قەڵەمتراشە شفرەی فیلینەکەم هەمووی لە بەر چاودەرباز کرد.

بۆ ئەوەی کە بێدەنگییەکە بە هەبوونی خۆمەوە پڕبکەمەوە وتم : وەکوو هەموو وەستا کۆنەکان شەڕی زۆرم بینیوە و لەشکرەکان و کوژراوەکانی و سەراپیتەی چادری خانەکانی پاشاکەمانم کێشاوە . هەروەها وێنەی گەڕانەوەی سەربازەکان لە کۆتایی شەڕدا بۆ ئەستەنبووڵ و قەبرستانی شەڕەکەشم کێشاوە، هەموو کەسێك شەرمیان لێدەکات ، تەرمی لەتلەتکراو و بورجی ئەو قەڵایانەی وا حەشار دراون و ئەو سەربازە کافرە بێچارانەی وا بەترسێکی گەورەوە تەماشای تۆپەکانی لەشکەرەکەمانیان دەکرد و سەری بڕاوی سەر هەڵداوەکان و خۆشی ئەو ئەسپانەی‌وا بە چوار ناڵەوە غاردەدەن ، هەمووی بە دەستی من کێشراون . ئەو شتانەی وا دەیانبینم لە عەقڵم دەرناچن . قاوە کوتێکی تازە یان حەڵقەی تازەی پەنجەرەیەك و تۆپێك یا خود پەلە پیتکەی چەکێکی تازەی فەرەنسەیی ، یان وەکوو کێلەکام میوانیدا چ جۆرە جلێکی لەبەر کردووە و چی خواردوە و دەستی خستوەتە کوێی ، هیچیانم لە بیر ناچێتەوە .

ڕەشە بە کورتی و بە شێوەیەکی لێپرسینەوە وتی : ئەی باشە ، بەشی ئەم سێ داستانە چییە وا گێرانتەوە ؟

وتم : " داستانە منارەدارەکەی (( ئەلف )) باسی ئەوە دەکات کە جوانی و بێ کەمو کووڕی وێنەکە ( هەرچی دەبێ بابێ ) دەگەڕێتەوە بۆ کات .

ئەو داستانەی ( بێ ) واباسی حەرەمسەرا و کتێبەکە دەکات ، ئەوە پیشاندەدات کە تەنیا ڕێگای دەرکەوتن لەکات ، هونەر و وێنە کێشانە و بەس .

جیم ! . ڕەشە بە متمانەییەکەوە وتی : ئەگەر ( ئەلف و بێ ) تێکەڵ بکەی ،واتای ئەو داستانەی واباسی وێنە کێشە سەد ونوزدە ساڵەکە دەکات دەردەکەوێت . ئەو وێنەیە ئەوەمان پێنیشاندەدات کە ئەگەر بێ کەموو کوڕییەکان لە ژیان و وێنە کێشان جودا ببنەوە ، ئەوا کاتی بە سەر دەچێ و دەمرێ .

## (( پێم ئەڵێن زەیتوون )) (14)

دوای نوێژی نیوەڕۆبوو ، بە دڵ خۆشی و بە پەلەپەلەوە وێنەی چەند کوڕێکی ڕوخسار شیرینم دەکێشا ، لە دەرگایاندا ، دەستم لەرزی و قەڵەمەکەم دانا ، بەئەسپایی تەختەکەی باوەشی خۆمم دانا و بە خێرای بەرەو لای دەرگاکە هەڕامکرد . بەر لەوەی کە دەرگاکە بکەمەوە دوعایەکم کرد : " خویاخۆت لە پیاوە پەست و ڕەزیلەکانی پادشا لەم دونیا پیس و پۆخڵەدا بمانپارێزێ " .

هیچ شتێکتان لێناشارمەوە و شتەکانی ناو کتێبەکەتان بۆ باس دەکەم " ئەکبەرخانی " پاشای هیند ، کە دەوڵەمەندترین پاشای جیهانە ، دەیەوێت کتێبێکی تازە دروستبکات کە لە هەموو دونیادا یەکەم بێت ، هەر بۆیە هەواڵی بۆ وێنەکێشە شارەزاو دەست ڕەنگینەکانی هەر چوار لای جیهانی ئیسلام ناردووە کە بچن بۆ کۆشکەکەی ئەو لە هیند ، ئەو پیاوانەی وا ناردوونی بۆ ئەستەنبووڵ ئەمڕۆ هاتنەلای من و دەعوەتیان کردم کە

بچم بۆ وڵاتی هیند . دەرگاکەم کردەوە، بەڵام ئەم جارەیان ئەوان نەبوون ، ڕەشەبوو ! لە منداڵیمەوە تاکوو ئێستا... لە بیرم چووبووەوە ، جاران نەدەهاتەلامان و بەخیلی پێدەبردینەوە . بەڵێ ؟ !

بۆ قسەکردن و دۆستایەتی بینینی وێنەکانم هاتبوو ، وتم : فەرموو . بۆ ئەوەی کەبتوانێ تەماشای هەموو شتێکم بکات ، تازە دەستی وەستا عوسمانی ماچکردبوو . وەستای گەورە ، قسەیەکەی گەورەی پێگووتبوو ، وتبووی : " تایبەت بوونی وێنە کێش لەکاتی باسکردن و چۆنیەتی بیرکردنەوەی لەسەر کوێرا بیداهاتنداا دیار دەبێت .

کەوایە تێبگەن

(مێشك وکوێرایی)

بەر لە نەخشە کێشان تاریکایی هەبووە و لەدوایشدا هەر تاریکایی دەبێت . بە ڕەنگ و هونەرو بە عەشقەکانمان و بە گووتنەکانی خوداوە ، بینیەکانمان وەبیر دەهێنێتەوە ، بیر هێنانەوەش خۆی زانستی شتە بینراوەکانە ، زانستیش وەبیر هینانەوەی ئەو شتانەیە کەوا دەبینی ، بینیش زانستێکی بێ بیر هێنانەویە . وەستا گەورەکان دەزانن کە عەشقی وێنەو ڕەنگەکان و بینین لە تاریکایەوە دروستکراوە و خوداش دەیەوێت کە ئێمە بە ڕێگای ڕەنگەکانەوە بگەڕێینەوە بۆ تاریکایی . هەمووی ئەو وەستا گەورانەی وێنەکێشان ، لەناو ڕەنگەکاندا بە دوای تاریکاییە قووڵەکەی دەرەوەی زەماندا دەگەڕێن . بۆ ئەوەی کە بزانن بیر هێنانەوەی ئەو تاریکیەی وا وەستا گەورەکانی هەرات دۆزیویانەتەوە چ مانایەك دەدات ، سێ بەسەرهاتتان بۆ باسدەکەم .

ئەلف ) – لە وەرگێراوە تورکیەکەی کتێبی (( نفخات الانس )) ی جامی

شاعیریدا بەسەرهاتی گەورە پیاوان و ئەولیاکان نووسراوە ، لە جێگایەکدا نووسراوە کە وەستای گەورەو ناودار شێخ عەلی تەبریزی خەریکی ڕازاندنەوەی نوسخەیەکی نائاسایی کتێبی لەیلا و مەجنون بووە ، بە گوێرەی ئەو شتانەی وا من بیستوومە وەستای گەورە بۆ ماوەی دە ساڵ خەریکی ئەو کتێبە بووە و هونەرێکی وای ڕژاندوەتە سەر لاپەرەکان کە تەنیا وەستا بەهزاد توانییەتی شتی وەها بکات . جیهانشاهیش تێگەیشتوە کە دەبێت بە خاوەنی بێهاوتاترین کتێبی دونیا .

لە بەر ئەو ترس و بەخیلییەی وا لە بەرامبەر حەسنە درێژی فەرمانڕەوایی ئاککویونلوەکاندا هەیبووە ئەوەی بە خەیاڵدا هاتووە کە نەکا حەسنە درێژ بتوانێ کتێبێکی باشتر لەمە دروستبکات کە ناو و ئاوازەی بۆ دروست بکات . بە ترسی ئەوەی کە خۆشیەکەی ئەو ببێ بە هی کەسێکی تر ! ئەم خەیاڵە بە ژەهری بەخیلی بردنەوە ئاو درابوو . لای خۆیشی وەها بیر دەکردەوە کە ئەگەر وەستای شێوە کار کتێبێکیتر دروستبکات لەمە باشتر دەبێ و بۆ حەسنە درێژی دوژمنی خۆینە خوارەی دروستیدەکات . بەم جۆرەش لە بەر ئەوەی کەسێکی تر نەبێ بە خاوەنی کتێبێکی ئاوەها لەدوای تەواوو بوونی کتێبە کەبڕیاریکوشتنی شێخ عەلی تەبریزی دەدات . بەڵام ژنە چەرکەسە دڵڕەحمینەکەی ناو حەرەمسەراکەی پێی گووتوە کوێر کردنی وەستا بەسە و پێویست بە کوشتنی ناکات . جیهانشاش ئەمە پەسەند دەکا و بریارە بریقەدارەکەی بە ماستاوچیەکانی دەورو بەری خۆی ڕادەگەینێ . هەر چۆنێك دەبێ ئەم قسەیە دەگاتەوە گوێی شێخ عەلی . بەڵام ئەو وەکوو وەستا سەر پێیەکان کتێبەکەی لە نیوەدا بەجێناهێڵێ و هەڕاناکا ، بەڵکو بە پێچەوانەوە زۆرتر کار دەکات بۆ ئەوەی کەموکوڕی تێدا نەبێت و

تەنانـەت زوتـریش تـەواو ببێـت ، بـەیانیان دوای نوێـژ تـا درەنگانـەی شـەو ، تـاوەکوو ئەوکاتـەی کـە فرمێسـکێکی مانـدوو لـە چـاوانی دێتـە خـوار ، بـە ویسـت و برواپـەکی زۆری کـاری لـە سـەر کـردوەوە و وێنـەی ئەسـپەکان و عاشقە بالاّ بەرزەکان و شازادەی جوان و ئەژدیهای کێشاوە زۆر جاریش بـە ڕۆژان تەماشـای وێنـەکانی وەسـتا کۆنـە هەراتیـەکانی کـردوە لـە دوایـدا بـە بێئەوەی سەیری لاپەڕەکان بکات ، لە خۆیـەوە وێنەیـەکی تـری کێشـاوە ، لـە ئەنجامدا کتێبەکەی جیهانشای فەرمانڕەوایی کاراکویونلوەکان تـەواو دەبـیٚ وەکوو ئەوەوی وەستا خۆی چاوەڕوانی دەکرد لە پێشدا زۆر تـاریفی دەکـەن و پەسـنی دەدەن و بەهاوسـەنگی خـۆی زێـری پێدەبەخشـن و دواتـریش بـەدەرزی کـوێری دەکـەن .بەرلـەوەی ئازارەکـەی ڕاوەسـتیٚ ، هـەرات بەجیٚئەهێڵیٚ و دەچێتە لای حەسەنەدرێژی فـەرمانڕەوای ئاککویونلووەکان و دەڵـیٚ : " ڕاسـتە کـەمن کـوێرم ، بـەلاّم دەسـتەکانم بەبێئـەوەی چـاوم ڕێنموننیـان بکـات ، توانـای کێشـانیان هەیـە ، یـانزە سـاڵ خـەریکی کتێبێـك بووم ، دەستەکانم هەموو جوانییەکان و ئەو فلّچانەی وا لێیـداون لـەبیر مـاوە و دەتوانیٚ بیانکێشێتەوە، (خاقانەکەم) ! دەتوانم جوانترین کتێبـی دونیـات بۆ بڕازێنمـەوە ، لەبـەر ئـەوەی کـە چاوەکانم کوێرن و پیسـاوییەکانی دونیـا نابینن ، تەواوی جوانییەکانی خـودا لـە مێشـکمدا کـۆ بوەتـەوە و دەتـوانم بـە پاکترین و جوانترین شێوە بیانکێشمەوە . " حەسەنە درێـژ یەکسـەر بـڕوای پێـدەکات . لەدوایشـدا حەسـەنە درێـژ لـە نزیکـی ( بینگـۆل )دا بـە هەڵمـەتێکی بەسـەردا چوونانە هێـرش دەکاتـە سـەر لەشـکەری جیهانشـا و شکسـتیدەدا و دەیکـوژیٚ . هەمووکەسێك لـە کاریگەرییەکـەی کتێبـی شـێخ عەلی بۆ بەرز کردنەوەی ورەی حەسەنە درێژ و هێزی مەعنـەوی لەپشـتی ئـەو

سەرکەوتنە ئاگادارە .

لەدواییدا کاتێك حەسەنە درێژ لەشەری ئوڵتوکتبەلیدا لەبەرامبەر فاتیح سوڵتان موحەمەدا شکست دەخوات ، هەردوو کتێبە دەرئاساییەکەش دەبن بە بەشێك لە خەزینەی پاشاکەمان .ئەوەی بینیویەتی دەزانیٚ .

بیٚ ) – سوڵتانی یاسا ، سولەیمان خان ( جێگای بەهەشتبیٚ ) بایەخێکی زۆری بە خۆشنووسی دەدا . جا بۆیە وێنەکێشە بەدبەختەکانی ئەو کاتەش ئەم داستانەیان وامن ئێستا باسی دەکەم ، بۆسەلماندی باشتر بوونی وێنەکێشان لە خۆشنووسی گێڕاوەتەوە . بەلاّم ئەگەر لە ڕاستیدا باش تەفرەنجەی ئەم داستانە بدرێت ، ئەوا دەزانرێت کە ئەمە باسی مێشك و کوێرایی دەکات .

پشتی مردنی تەیموری فەرمانڕەوای جیهان ، کوڕان و کوڕەزاکانی لەنێو خۆیاندا دەستیان کرد بە شەڕ و ئاژاوەیەکی وێرانکەر و هێرشیان دەکردە سەر یەك و بە خوێنی یەکتری تینوو بوون ، کاتیٚ شارەکانی یەکتریان داگیر دەکرد ، یەکەمجار بە ناوی خۆیانەوە پارەیان لێدەدا و وایان دەکرد کەلە مزگەوتەکاندا بەناوی ئەوانەوە خوتبە بخوێندرێت و لە دوایشدا هەموو کتێبەکانیان پەڕ و پووت دەکرد و لەسەر کتێبەکان ڕەستەیەکی جیاوزتریان دەنووسی کە باسی خۆیان بکات ، وەکوو ( دەسەلاّتدارێکی دونیا ) ، و پێشەشکردنێکی تازەشیان بۆ دادەنا و بەرگیان دەگرتەوە . ئەمەش تەنیا لەبەر ئەوەی بوو کە کاتێك خوێنەر تەماشای کتێبەکە دەکات بزانێت کە فەرمانڕەوای دونیا کێیە . یەکێك لەمانە عەبدولەتیفی نەوەی تەیمور و کوڕیئوڵوخ بووە . کەلە دوای داگیر کردنی هەرات ، بۆ دروستکردنی کتێبێك بە ناوی باوکییەوە، هەموو وێنە کێشان و

خۆشنووسانی هەرات کۆدەکاتەوە و دەڵێ کەبە پەلە ئەم کتێبەم بۆ ئامادە بکەن . هەر لەبەر ئەوەش کتێبەکانی‌تری پەڕ و پووت کردووە و لاپەڕەکانی هێناوەتە بەر دەستی وەستاکان . وەزعەکە وای لێهاتبوو کە هەموو شتێك تێکەڵ و پێکەڵ بووە. بە بێئەوەی کە بزانێ کە کام وێنە بۆ چییە و بەکەڵکی چی‌دێ  هەموو ئەمانەی تەنیا لەبەر جوانییەکانیان کۆ کردبووەوە . بەڵام لە دواییدا تێدەگات کەوەها نابێ و بۆ دروستکردنی کتێبێك کە شایستەی ( ئوڵوخ )بەی بێ پێویستەهەموو وێنە کێشانی هەرات کۆکاتەوە تاوەکووتەرتیبێکی باشیان بۆ دانێن و بزانن کە کامەیان باسی چیدەکات . بەڵام هەرکەس لەسەرێکەوە باسی شتێکی‌جیاوازی کردووە و ئەوەش بووە هۆی تێکەڵاوتر بوونی شتەکە ،

سەرۆکی وێنە کێشان کە پیاوێکی پیری فەرامۆشکار بوو لە ماوەی پەنجا و چوار ساڵی دواییدا بۆ هەموو پادشا و فەرمانڕەوایەکی هەرات کتێبێکی دروستکردبوو و لەبەر خاتری ئەوان نووری چاوانی خۆی ڕشتبوو . گەڕان بە دوایدا و دۆزیانەوە . بەڵام کاتێ زانیویانە کوێر بووە پەشۆکاون . کەچی وەستای پیری داوای منداڵێکی نەخوێندەوار بەڵام ژیری کردووە کە هێشتا تەمەنی نەبووبێ بە حەوت ساڵ ، یەکسەر دۆزیویانەتەوە و هێناویانە . وەستا وێنەیەك دادەنێتە بەر دەستی منداڵەکە و پێی دەڵێ ئەوەی‌وا دەیبینی بۆم باسکە ، لە دواییدا تەماشای ئاسمان دەکات و گوێ بۆ قسەی منداڵەکە ڕادەگرێ و دەڵێ : " ئەمە ئەو بەشەی شاهنامەیە کەوا باسی مەرگی دارا دەکات و ئەسکەندەریش دەیگرێ بە باوەشیەوە ... داستانی مامۆستا بۆ شاگردە جوانەکەی لە گوڵستانی سەعدی ... کێرکێی پزیشکەکان لە مەخزەنولئەسراری نیزامی ... "

وێنه كێشانی تر لێی تووڕه دەبن و دەڵێن : ئێمەش ئەمانەمان گوتووه ، هەریەكەیان بەشێكی داستانێكی به ناو بانگه . وەستای پیر وێنەی هەر سەخت دەخاته بەردەستی منداڵەكه و بەباشی گوێی بۆ ڕادەگریٚ و دەڵیٚ : داستانی ئەو پیاوەیەكەوا ژنەكەی و خۆشەویستەكەی لەسەر دار هەرمێییەك دەبینیٚ، ئەمه بەشێكی مەسنەوییەكی مەولەوییه و وێنەیەكی كەم بەهایه . بەمجۆرەش هەموویانی دەرخستووه و بەرگی كتێبەكانی گرتووه . كاتێك ( ئوڵوخ بەی ) به خۆی و لەشكەرەكەیەوه دێته هەرات پێی گوتووه : باشه نهێنی ئەمه لەچیدایه كه تۆ بەنابینایی خۆتەوه توانیوته وێنەكان بناسیتەوه كەچی ئەوانیتر به چاو ساخیشەوه نەیانتوانیوه شتی وەها بكەن.

پیرەش گوتوویەتی : وەكوو بیرۆكەی باو ، ئەمه له بەر ئەوه نییه كەمن نابینام و هێزی مێشكم زیاتره ، بەڵكوو ئەمه لەبەر ئەوەیه كەمن تەنیا به خەیاڵ شتەكان وەبیر ناهێنمەوه بەڵكوو به وشەكانیشەوه وەبیر خۆمیان دێنمەوه .

ئوڵوخ بەی گوتوویەتی : خۆ وێنەكێشانیتریش ئەو وشانه دەزانن ، ئەی بۆ ئەوان نەیانتوانیوه وەكوو تۆ ڕیزیان بكەن ؟

شێوەكاره پیرەكەش گوتوویەتی : چوونكه ئەوان تەنیا بیرله وێنەیەك دەكەنەوه كه دەستكردی خۆیان بیٚ و بیر لەهی وەستا كۆنەكان ناكەنەوه كەله یادەوەرییەكانی خوداوه دروستكرابیٚ .

ئولوخ بەی گوتوویەتی : ئەی باشه منداڵەكه ئەمەی چۆن زانیوه ؟

پیرەش گوتوویەتی : منداڵەكه نازانێت ، تەنیا منم كه دەزانم خودا جۆرێك

دونیای دروستکردووە کە منداڵێکی حەوت ساڵانیش بتوانێ بیبینێ ، خوداش لە پێشدا دونیای بۆ بینین ئافراندووە ، بۆئەوەی کە دواتر دیتنەکانمان پێکەوە بەش بکەین و بتوانین قسە بکەین ،وشەی پێداوێن ، بەڵام ئێمە لەو وشانەوە داستانمان دروستکرد و واشمانزانی کە نەخش بۆ ئەم داستانانە دروستکراوە بەڵام لە ڕاستیدا نەخش گەڕانێکە بەدوای بیرەوەرییەکانی خودا و بینینەوەی ئەو دونیایەی وا خودا دەیبینێ .

جیم ) – وێنەکێشانی عەرەب لە بەر ترسە هەمیشەییەکەی جەماعەتی وێنەکێشان لە داهاتنی کوێرایی ، ماوەیەك لەکاتی خۆرهەڵاتندا تەماشای ئاسۆی ڕۆژ ئاوایان دەکرد . سەد ساڵ دوای ئەوەش شیرازییەکانیش هەرلەبەر ئەو ترسە، بە مەژگە گوێز زکی خۆیان پڕ دەکرد و پەلی کوتراوی گوڵیان دەخوارد . هەرلەو سەر دەمەشدا کە وێنەکێشە پیرەکانی ئەسفەهان تووشی وەبا دەبن و کوێر دەبن ، وایاندەزانی کەلەبەر تیشکی هەتاو کوێر بوون . هەر لەبەر ئەوەش ژووری کارەکەیان وەها دروستدەکردکە خۆر نەیگرێت و لەبەر مۆمدا ئیشیان دەکرد ، شێوەکارە ئوزبەکیەکانیش ئێواران چاوی خۆیان بە ئاوێك دەشۆردەوە کە شێخەکان دووعایان پێدا خوێند بوو . لە ناو هەموو ئەم نەریتانەدا ئەوەیوا بەباشی و بەپاکی لەگەڵ ئەم کێشەیەدا هەڵسووکەوتی کردووە وەستا سەیید مەریکی وەستای وەستا بەهزاد بووە . بە گوێرەی ئەو کوێرایی داهاتن بەڵایەکی خراپ و دەردێکی پیس نییە ، بەڵکوو خۆشییەکە کە خودا لە دوای ئەوەی وێنەکێش تەواوی تەمەنی خۆی بۆ جوانییەکانی ئەو تەرخان دەکات پێیدەبەخشێ. چونکە نەخشکێشان گەڕانێکە بە دوای دۆزینەوەی چۆنیەتی بینینی خودا ، کە ئەمەش بەکارێکی زۆرەوە و بە ماندوو بوونێکی زۆری چاوەکانیان و

داهـــاتنی کـــوێرایی و لـــەکار کـــەوتنی وێنەکێشـــەکە ، لەبیرەوەریەکانـــدا دەدۆزرێتـــەوە . کـــەوابێ شـــێوەی بینینـــی خـــودا لـــە مێشـــکی وێنەکێشـــە پیرەکاندا هەیە و بەس . کاتێ وێنەکیشی پیر لەم خەیاڵەوە دێتە سەر خۆی و بۆ ئەوەی لە تاریکایی کوێراییداهاتندا و لە دیار بوونی دیمەنی خودا بتـوانێ بـە ئاسـانی وێنـەی جـوان و دەرئاسـایی بکێشـێ ، هەرلـە ئێسـتاوە دەستی خۆی فێر دەکات و ڕایدەهێنێ .

میرزا مەحمودی داگلووتی مێژوونووس لەسەر وێنەکێشان و قارەمانانی ئـەو سـەردەمەی هـەرات شـتی نووسـیوە و لـەبارەی چـەمکی وەسـتا مـەریك داســتانی کێشــانی وێنــەی ئەســپێك دەگێڕێتــەوە . بــەگوێرەی ئەمــە ، وێنەکێشێکی بێهونەر و بێتواناش لەبەر ئەوەی مێشکی هیچی تێدا نییـە ، دەتــوانێ وێنــەی ئەســپێك لەبــەر خــۆوە وەکــوو وەســتا ڕۆژئاواییــەکان بکێشـێتەوە . چـوونکە کـەس نـاتوانێ لەیـەك کاتـدا تەماشـای ئەسـپەکە و لاپەڕەکـەی بەردەسـتیبکات ، تەنانـەت ئەگـەر بەئەنـدازەی چـاو پرتـانێکیش تەماشای ئەسپەکە بکات ، دیسان ئەوەی وا دێتـە سەر کاغـەز ئەوەیەوا لـە مێشکمەوە دێت ، ئەمەش بەڵگەیەکی حاشا هەڵنـەگرە بۆ ئـەوەی بسـەلمێنێ وێنە لە مێشـکمەوە مومکین دەبێت . ئـەنجامی ئـەو چـەمکەی وا ژیـانی پڕلـە جموجۆڵی وێنەکێش وەکوو زەمینەیەك بۆ دوایی و کاتی داهاتنی کوێرایی دەبینێ ، ئەوەیە کە وێنەکێشان و کتێب دروستکردن بۆ پادشاکان و کتێب دۆستان وەکوودووبارە کردنەوە و دەست فێر کردن دەبیـنن و وێنەکێشاندن بە بێ ڕاوەستان و کار کردن لەبەر تیشکی مۆمدا وەکوو ڕێگایەك دەبیـنن کـە بەرە و خۆشی کوێراییداهاتنیان دەبات .

وەسـتا مـەریکی شـێوەکار بەقەسـتەوە وێنـەی دارێکـی بـە هـەموو لـەق و

پەلەکانیەوە لەسەر دانەیەکی برنج و تاڵە موویەك و نینۆکێك کێشاوە ، کەمتر لە تاریکاییدا دانیشتووە و باخچەی ڕوو لە خۆر و ڕووناکی کێشاوە ، بۆ ئەوەی کە ئەو کاتە زۆرتر بێت و هەمیشەیش بە دوایدا گەڕاوە . لە حەفتا ساڵی تەمەنیدا سۆڵتان حسەین وەکوو خەلاتێك دەرگای خەزێنەی بەرووپداکردۆتەوە،ئەویش سێ ڕۆژ و سێ شەو تەماشای وێنەکانی کتێبە دەرئاساییەکانی وەستا کۆنەکان هەرات دەکات و کوێر دەبێت . بە دڵخۆشییەوە وەکوو ئەوەی کە فریشتەکان لە دەوریدابن پێشوازی لەم وەزعە تازەی خۆی دەکات ، بەلام لە دواییدا هیچ قسەی نەکردووە و ئیدی وێنەی نەکێشاوە . میرزا موحەمەد حەیدەری دوگلاتی نووسەری مێژووی ڕەشیدی ئەمە وەکوو گەیشتنی وێنەکێشێك بە بێمەرگی و بێکۆتاییەکانی خودا دەبینێ کە جارێکیتر ناگەڕێتەوە بۆ دروستکردنی کتێب بۆ مردووە بێنرخەکان و دەڵێ : لەو جێگایەی وا وێنە کێشە کوێرەکە لە خەیاڵەکانیدا گەیشتوەتە خودا ، بێدەنگی و تاریکایەکی تەواو و بێکۆتایی بوونی لاپەڕەیەکی سپی هەیە .

من دەمزانی کە ڕەشە ئەم پرسیارەی وەستا عوسمانی لەسەر مێشك و کوێرایی بۆ ئەوە لەمن نەکردووە کە وەلامی ڕاست بدۆزێتەوە ، بەڵکوو بۆ ئەوە بوو کە تەماشای کەلوپەلی ناو ماڵەکەم بکات . لەگەڵ ئەوەشدا دیسان پێمخۆش بوو کە باسمکرد بوو ، پێمگوت کە کوێر بوون دونیایەکی پڕلە خۆشییە کە شەیتان و تاوان ناتوانن ڕێی پێپەیدا بکەن .

ڕەشە گوتی هەندێك لە وەستاکانی تەورێز کەبە پێی نەریتی کۆن کار دەکەن و کوێر بوون وەکوو خێری خودا دەبینن ، لەگەڵ ئەوەی هێشتا کوێر نەبوون لاسایی یەکێکی کوێر دەکەنەوە و لە کوێر نەبوونی خۆیان شەرم

دەكـەن ،ئـەم ڕەوشـتـە كاریگـەری جەماڵـەدینی قـەزوینی لـە سـەرە و وەسـتا پێڕەوەكانیشی بۆ ئـەوەی كـە بتـوانن وەكـوو كوێرێك شـتـەكان ببیـنن لـە بـەر تیشكی لەرزۆكی مومێكی كزدا لـە بەرامبـەر چـەند ئاوێنـەدا دادەنیشن و بـە ڕۆژانــە تەماشــای وێنــەی وەســتاكۆنەكانیان دەكــرد . لــە دەرگاكــەیان دا ، كردمـــەوە و تەماشـــام كـــرد ، بەردەســـتێكی چـــاو جـــوان و جوانكیلـــەی وێنەكێشخانەبوو ، وتی جەنازەكەی زەریف ئەفەندییان لـە بن چاڵە ئاوێكدا دۆزیوەتەوە و تەرمەكەی ئەمڕۆ عەسر لە مزگەوتی ( میهرماه ) هەڵدەگیرێ . بۆئەوەی كە هەواڵەكە بگەیەنێتە كەسانیتریش بەهەڕاكردن ڕۆیی .

خودایە خۆت بمانپارێزە !

---

1. بــە گــەورە پیــاوان و گــەورە توورکــەكانی ئاســیای ناوەڕاســت و مەغوولەكا دەگووترا .

2. پارێزگایەكی باكووری كوردستانە .

## (( ناوی من ئەستەرە )) (15)

نازانم عەشق وا لە مرۆڤ دەكات كە گێل و گەوج ببێت ،یان وەكـوو تـەنیا گێـل و گەوجـەكانن كـە عاشـق دەبـن ؟ سـالانێكە دەستفرۆشـی و گـەوادی دەكــەم ، وەلامــی ئــەم پرســیارانە دەزانم . جووتێــك هەیــە كــە هەرچــی

دەچیٚ زیاتر دڵیان لە یەك دەچیێت فیڵبازتروو عاشقتر دەبن ، زۆر دەمەویێت کوڕەکە بناسم .

کاتیێك کوڕیێك دەستی بە دانانی داو و فیڵی بچووك کرد ( ئەو فیڵانەی وا خۆم دەیانزانم ) ئەوا بزانن کەئەو کوڕە هیچ عاشق نەبووە . ڕەشە ئەفەندی خۆمان هەر لە ئیێستاوە خوێنساردی خۆی لەدەستداوە و کاتیێك من دەبینیٚ و باسی شەکورە دەکات ، نازانیٚ چۆن قسە بکات و پیێوانەکانیقسە کردنی لەبیر دەچیێتەوە . لە بازاڕدا هەندیێك لەو قسانەم بە ڕەشە گووت ، کەوا بە هەر کەسیێکی دە ڵیێم و گوتم : "شەکوورە هەموو کات باسی تۆ دەکا و چاوەڕوانی وەڵامی تۆیە ." جۆریێك سەیری دەکردم کە بەزەییم پیێداهاتەوە . داوای لیێکردم کە بەزووترین کات نامەکە بگەیەنمە شەکورە . ئەم دڵدارە گێل و گەوجانە وا دەزانن کە دەبیێت تەنیا بۆ کاری ئەوان پەلە پەل بکردریێت و بەو جۆرەش چەکیێك دەدەن بە دەست عەشقەکانیانەوە، بەگویێرەی من ئەگەر ئەوانیش تۆزیێك عەقڵیان هەبیێت وەڵامەکانیان درەنگ دەخەنەوە . ئەگەر ڕەشە ئەفەندی بیزانیبایە کە لە پیێشدا نامەکەی دەبەم بۆ جیێگایەگی تر ، سوپاسیێکی باشی لیێدەکردم ! ئەوەندە چاوەڕیێم کردبوو کەلەبەر ئەو سەرمایەدا ڕەقم بردبووەوە . لە ڕیێگای گەڕانەوەدا بۆ گەرمبوونەوە سەردانیێکی یەکیێك لە ڕۆڵەکانی خۆمم کرد بەوانەی وا نامەکانیانم بردووە و هیێناوە و کردوومن بەهاوسەری یەك دەڵیێم ڕۆڵە ! ئەم کچە زۆر سوپاسی من دەکات و کاتیێك سەردانی دەکەم ، وەکوو پەپوولە بە دەورمدا دەخولیێتەوە و هەر جارەش چەند ئاکچەیەك دەخاتە نیێو دەستمەوە، دووگیان بوو ، زۆر خۆشحاڵ بوو ، دارچینیێکی بۆ لیێنام . بەتامەوە خواردمەوە . کەتەنیا مامەوە پارەکەی ئەو ڕەشە ئەفەندییەشم ژمارد، هەمووی بیست ئاکچە بوو .

کەوتمەوە ڕێ و بەناچاری لەنێو قوڕو لیتەکەوە تێپەڕبووم و گەیشتمەبەر دەرگای ماڵەکە . هەستی گاڵتەچێتی دایگرتم قیڕاندم و گوتم : بوخچەچی هاتووە ، بوخچەچی : قوماشی باشم پێیە ، شایستەی پاشاکانە، لە کەشمیرەوە هاتووە ، پشتوێنی جوانیشم هەیە . چارچەفی دۆشەك و پێخەفیشم لایە ، دەستماڵی ڕەنگاوڕەنگم پێیە ، بوخچەچی هاتووە ! دەرگاکە کراوەیە و ڕۆیشتە ژوورەوە ، ماڵەکە وەکوو جاران بۆنی خەو و ڕۆنی سوورۆکراو و شتی تەڕی لێدەهات . بۆنی هەرزەکاری ژن نەخواستوو کەبەرەو پیری بچێت زۆر خراپ و مەترسیدارە !

وتی : چەنە باز ئەوە بۆ دەقیڕێنی ؟ هیچ شتێکم نەگوت ، نامەکەم دەرهێناو پێمدا . ڕۆیشینە ژوورەکەی تەنیشتەوە، هەموو کاتە چرایەکی لێبوو ، لەبەردەرگاکەدا ڕاوەستام و گوتم : " باوکی بەڕێزتان لە ماڵ نیە ؟ " وەڵامی نەدایەوە . لەسەر خۆی نەبوو ، نامەکەی دەخوێندەوە وازم لێهێناو گوتم با بیخوێنێتەوە . لەبەرئەوەی لەو لای چراکەوە دانیشتبوو چاوم بە ڕوومەتی نەدەکەوت . تەواوی کرد بەڵام جارێکیتریش خوێندییەوە .

– : " بەڵێ چی نووسیوە ؟ "

حەسەن نامەکەی خوێندەوە :

" شەکوورە خانی خۆشەویست : لەبەر ئەوەی منیش ساڵانێکی زۆر بەخەیاڵی تەنیا کەسێکەوە دانیشتووم ، لەوە باش تێدەگەم کە بیر لەکەسی تر نەکەنەوە و چاوەڕوانی مێردەکەتان بن . لەژنێکی وەکوو تۆش زیاتر لە دروستی و پاکداوێنی هیچ شتێکی تر چاوەڕوان ناکرێت . ( حەسەن دای لە قاقای پێکەنین ) . بەڵام سەردانەکەی من لەباوکت بەبۆنەی شێوەکارییەوەیە و هیچ پێوەندییەکی بە ئێوەوە نییە و نابێ ئێوە بێزار بکات . تەنانەتە

شتی وام بەعەقڵیشدا نەهاتووەو هیچ شتێك، تەنانەت ئیشارەیەكیشم لە ئێوەوە نەبینیوە كە جەسارەتم پێبدا ورەم بەرزبكاتەوە . كاتێ ڕوخساری جوانی تۆ وەكوو ڕوناكییەك چاوەكانمی ڕازاندەوە، لە لای خۆم وامزانی كە ئەمە بەخششێكی خودایە و لەوە زیاتر بیرم لە هیچ شتێكیتر نەكردۆتەوە . چوونكە تەنها خۆشی بینینی ڕوخساری تۆ بۆ تێركردنی نیگای چاوەكانی من بەسە . ( حەسەن بە تووڕەییەوە گوتی : ئەمە لە نیزامییەوە وەرگیراوە ) بەڵام مادام كەوای لێهات و تۆ دەڵیی نێزیكی من مەبەرەوە . پێم بڵێ بزانم تۆ فریشتەی كە نێزیكبوونەوە لێت مەترسیداربێت ؟ گوێم لێبگرە ، گوێ بۆ ئەمە ڕابگرە : نیوەشەوان زیاتر لە چەتەو ڕێگر و پیاوێكی بێئومێد ، كەس لە یەكێك لەو كاروانسەرا چۆڵ و هۆڵانەی ناو بیابانەكاندا نامێنێتەوە . من لەو نیوەشەوانەدا لە دەلاقەكەوە تەماشای ڕووتایی چیاكانم دەكرد كە تیشیك لێیدەدا، ئەوسا گوێم بۆ لووره لووری گورگەكان ڕادەگرت و لە دواییدا خەوەنوونچكە دەیبردمەوە ، ڕۆژێك لە خۆمەوە خەیاڵی ئەوەم دەكرد كە ڕۆژێك لەبەر ئەو پەنجەرەیەوە چاوم پێت دەكەوێ . گوێ بگرە : ئێستا كەمن هاتوومەتەوە و تۆش ئاوەها بەپەلە ئەو وێنەیەم بۆ دەنێریتەوە كە لە كاتی منداڵیدا بۆ تۆم دروستكرد بوو ، ئەمە وەكوو ئیشارەتێكە بۆ من كە تۆم دۆزیبێتەوەە . دەزانم ، تۆبێ مەرگی . ئورهانی كوڕتم بینی ، هەتیوە بێچارەكە دەبم بە باوكی !"

وتم : " خوای لێ ڕازی بێ زۆر جوانی نووسیوە ، بووە بەشاعیر " . حەسەن گووتی ! "ڕستەی ! "مەگەر فریشتەی كە كەس نەوێرێ نێزیكت بێتەوە " ، لە ( ابن زرهانی ) كوڕی زەرهانی وە دزیوە . من لەو باشتر دەنووسم " . نامەكەی لەگیرفان دەرهێنا و گوتی بۆ شەكورەی بەرە . كاتێ

پارەکەم لێوەرگرت تووشی پەشۆکان و بڕسکان بووم . عەشقێکی شێتانە و قووڵ ! کەبەرامبەرەکەی وەڵامی نەداتەوە شتێکی قیزەونە . وەکوو بڵێی کە حەسەن بۆ چوونەکانم پشتڕاست بکاتەوە ، لەدوای ماوەیەکی درێژ پیاو ماقووڵییەکەی نایەلایەکەوە و پاڵەوان ئاسایی گوتی : " پێی بڵێ ، ئەگەر بمانەوێ بەزۆری قازی دەێنینەوە ئێرە "

گوتم : " بەڕاستی پێی بڵێم ؟ " . بێدەنگییەك دروستبوو ،

– : " پێی مەڵێ . " تیشکی چراکە دایلە ڕوومەتی ، وەکوو منداڵێك کە ئاگای لە تاوانەکەی خۆی بێت سەری داخستبوو . لەبەر ئەوەی کە ئاگام لەم وەزعەیان هەبوو ، ڕێزم لێدەگرتن و نامەکانم بۆ دەبردن . بەپێچەوانەی بۆ چوونی هەندێك کەس ، من ئەم کارە لەبەر پارەناکەم . خەریك بوو لە ماڵەکە دەرکەوم کە حەسەن لەبەر دەرگاکەدا ڕایوێستاندم و بەپەشۆکاوی و بێعەقڵییەوە ئەمەی لێی پرسیم : " بە شەکوورە ئەڵێی چەندە خۆشم ئەوێ؟ "

– : " مەگەر ئەوەت لە نامەکەدا نەنووسیوە ؟ "

– : " پێم بڵێ ، چۆن دەتوانم خۆی و باوکی ڕازی بکەم ؟ " بەرەو دەرگاکە ڕۆیشتم و گوتم : " وەکوو پیاوێکی باش " . بەخەمێکی قووڵ و ڕیشەدارەوە گوتی : " لەم تەمەنەدا زۆر درەنگە "

وتم : حەسەن (چاوش ( ! دەستت بە کۆکردنەوەی پارەیەکی زۆر کردووە ، تەنیا ئەمەمرۆڤ باش ناکات و لە ماڵەکە دەرکەوتم . ناو ماڵەکە ئەوەندە تاریك و گەرم بوو کە کاتێ هاتمە دەرەوە وامزانی هەوا گەرم بووە . تیشکی خۆر دایلە دەمو چاوم . لەبەر خۆمەوە وەهام بیر کردەوە کە دەمەوێ شەکوورە خۆشبەخت بێ، بەڵام بیریشم لەو بێچارەیەی ناو ماڵە

تاریك و ئەم دارەکەش دەکردەوە . بە بێئەوەی کە لەبەرنامەمدا هەبێت و بە بیریشمدا تێپەڕ بووبێت ، ڕێگاکەم کەوتە بازاڕی بەهارات فرۆشەکانی لالە ، لەدڵمەوە وەهام بۆ هاتبوو کەبەویدا بچم ، وامدەزانی کەلە نێو بۆنی دارچین ، زەعفەران و بیبەردا دێمەوە سەرخۆ ، بەلاّم وانەبوو ، بەهەڵەدا ڕۆیشتم ! لە ماڵی خۆیاندا نامەکەم دا بە دەستی شەکوورە . یەکەم شت پرسیاری ڕەشەی لێکردم . گوتم لە ئاگری‌عەشقدا زۆر بێبەزەییانە هەموو گیانی سوتێندراوە . پێی خۆشبوو . قسەکەم گۆڕی وتم " هەموو کەس تەنانەت ژنانی ماڵەوەش باسی ئەوە دەکەن کە بۆچی زەریف ئەفەندییە بێچارەکەیان کوشتووە . "

شەکورەش گوتی : " خەیرییە ! حەلْوا دروست بکە با ژنە داماوەکەی زەریف ئەفەندییە بێچارەکە بیبات بۆ سەر قەبران . "

ووتم : " هەموو ئەرزڕوومیەکانیش دەچنە سەر قەبران وخزمەکانیشی گوتویانە ئەو خوێنە لە سەر عەرز ناهێڵنەوە " ، شەکوورە دەستی بە خوێندنەوەی نامەکە کرد بوو . بەوردی و بەنەفرەتەوە تەماشام کرد . ئەم ژنە ئەوەندە ئەزموونی ژیانی هەیە کە دەتوانیٚ خۆشی و ناخۆشییەکان و ڕەنگدانەوەکانیان لەسەر ڕوومەتی خۆی کونترۆڵ بکات . وا هەستمکرد کە بێدەنگی منی لە کاتی خوێندنەوەی نامەکەدا پێخۆش بوو . هەروەها ئەوەشی بە گرنگی پێدانی من بە نامەکەی ڕەشە لەقەڵەمدا . بەمجۆرەش کاتیٚ کە نامەکەی تەواو کرد بزەیەکی لێدا و منیش بەناچاری ئەم پرسیارەم لێکرد "" چی دەڵیٚ ؟ " گوتی : " وەکوو کاتی منداڵی ، عاشقی منە . " گوتم : "چۆن بیر دەکەیتەوە ؟ " گوتی : " من مێردم هەیە و چاوەڕێی دەکەم ." وەلاّمەکەی ڕاستە و ڕاست ئەوە بووکەمن چاوەڕوانم دەکرد . بەلاّم لە

دواییدا داوای لێکردم کە گرنگی بەم مەسەلەیە بدەم ، منیش لێی توورە نەبووم ، بەڵکوو بە پێچەوانەوە زۆر ئاسوودەتر بووم . ئەگەر ئەو کوڕ و کچانەی وامن نامەم بۆ دەبردن و دەهێنان ، بە ئەندازەی شەکورە دیقەتیان بکردایە ، هەم کارەکەی من ئاسان دەبوو ، هەم هی ئەوانیش . تەنانەت هەندێکیشیان دەیانتوانی شوویەکی باشتر پەیدا بکەن .

پرسیارم لێکرد و گوتم : " ئەوی‌تر چی دەڵێ ؟ " گوتی : " نامەوێ ئێستا نامەکەی حەسەن بخوێنمەوە " . وتم : حەسەن دەزانێ ڕەشە هاتووەتەوە بۆ ئەستەنبووڵ ؟ " وتی : " لە هەبوونیشی ئاگادار نییە . " چاوە ڕەشەکانی کردەوە و گوتی : " لەگەڵ حەسەندا قسە دەکەی ؟ " گوتم لەبەر ئەوەی تۆ دەتەوێ بەڵێ . لە ناو ئازارەکانیدا خۆیدا دەتلێتەوە و زۆر حەزت لێدەکات ، هەر چەندە کە دڵت بە کەسێکی‌تریشەوە بێت ، بەڵام لەمە و بەدوا ڕزگار بوونت لە دەستی حەسەن زۆر سەختە قەبووڵکردنی نامەکانی هیوایەکی زۆری پێدەدا . ئامادەکاری سەلماندنی مردنی براکەی دەکات بۆ ئەوەی بتوانێت لەگەڵ تۆدا زەماوەند بکات . " بۆ ئەوەی لایەنی هەڕەشەی قسەکە بشارمەوە و خۆم نەکەم بە قسەکەری حەسەن پێکەنینێکم کرد" .

وتی : " ئەی ئەویتر چیدەڵێ ؟" بەڵام نەیدەزانی کە پرسیاری کێ دەکات . گوتم : " وێنە کێشەکە ؟ " گوتی : " لە ناکاو عەقڵم تێکەڵ و پێکەڵ بوو . پێموایە هەموو شتێکیش تێکەڵ و پێکەڵتر دەبێ ، باوکم خەریکە پیردەبێ لە داهاتوودا من و ئەو هەتیوانە چیمان بەسەردێ ؟ وا هەستدەکەم کە خراپییەك ڕوو بە ڕووم دەبێتەوە و شەیتان خراپەیترمان بۆ ئامادە دەکات ،ئەستەر ! شتێکم پێ‌بڵێ کە تۆزێك دڵم خۆش بکات ."

لە دڵەوە دەلەرزیم .

گوتم : هیچ خەمت نەبێ شەکوورە گیان ، هەم ژیری هەم جوانی ، لە چاوەکانتەوە وا دیارە کە ڕۆژێك لەگەڵ مێردێکی قۆزدا لەژێر پێخەفێکدا دەخەوی و دەست دەکەنە ملی یەك و هەموو شتێکت لەبیر دەچێتەوە .

هەستێکی خۆشەویستی تەواو دڵمی گرتەوە و چاومی پڕکرد لە فرمێسك .

ووتی : " باشە ، کامەیان دەبێ بە شووم ؟ "

گوتم : " مەگەر دڵەژیرەکەت ئەمەت پێنالێ ؟ "

ووتی : " لەبەر ئەوەی دڵم پێم دەڵێت ، تێناگەم بێئومێد و خەمبارم " .

بێدەنگییەك دروست بوو . بۆساتێك وەهام بیردەکردەوە کە شەکوورە بڕوام پێناکات و بۆ ئەوەی قسەم پێدەربێنێ ، بە شێوەیەکی وەستایانە بێبڕواییەکەی خۆی دەشارێتەوە.کە تێگەیشتم ولامی نامەکان ناداتەوە ، ئەو شتانەم پێگوت وا بە کچە چاو خێلەکانم دەگوت و بوخچەکەم هەڵگرت و خۆم دزییەوە بۆ ناو حەوشەکە و گوتم : ئەگەر ئەو چاوە جوانانەت بکەیتەوە هیچ شتێکت بەسەردا نایەت . خەمت نەبێ .

# (( من شەكورە )) (16)

جـاران وەهـام بیردەكـردەوە كـە كاتێـك ئەسـتەری بوخچـەگێڕ هـات ، بێـوەژنێكی ژیـری جـوان وپـەروەردە كـراوی وەكـوو مـن كـە بەشـەرفە و دڵـی عاشـقەكەی خـۆی كـوت كـوت دەخاتـە لێدانـەوە ، یەكسـەر نامـە دەنووسـێ و دەیـــنێرێ بۆخۆشەویســـتەكەی . دەمزانـــی ئـــەو نامانـــەی وادێـــن هـــی خوازبێنەكانمە ، بەڵام لەبەر ئەوەی چاوەڕوانی مێردەكەمم ، كاتێ ئەستەر دەچێ وا دەزانم كە زۆر بێچارەم و مێشكم تێكەڵ و پێكەڵ دەبێ . گوێم دایـە دەنگەكانی دونیا . لە موتبەخەكەوە دەنگی كوتانی شتێك دەهات و بۆنی پیـاز و لیمـو گەیشـتە بـەر لـووتم . دەمزانـی كـە خەیرییـە خـەریكی دروستكردنی كوولەكەیە ،گوێم لـە قیڕە قیڕی ئورهـان و شـەوكەت بـوو كەلـە لای دار هەناری ناو حەوشەكەدا یاری شمشێریان دەكرد . باوكم بێدەنگە و لـە ژوورەكـەی تەنیشـتمدایە . نامەكـەی حەسـەنم كـردەوە و خوێندمـەوە ، وەكوو جاران شتێكی تازە و سەیری تێدا نەبوو . تەنیا ئەوە نەبێ كە تۆزێك زیاتر لێی ترسام . ئەو كاتەی بەیەكەوە لە ماڵێكدا دەژیاین دەیەویست شەو بێتە باوشمەوە ، بەڵام من نەمدەهێشت و خۆم ڕادەگرت ، ئێستاش شانازی بەوەوە دەكەم . لە دوایشدا نامەكەی ڕەشەم وەكوو ئەوەی كە شكەستەمەنی بێـت و شـایەنی خـەم خواردنـەوە بێـت گرتـە دەسـتەوە و و خوێندمـەوە . مێشكم تێكـەڵاو بـوو بـوو ، جارێكیتر نامەكـەم خوێنـدەوە ، خـۆرە تـاو بـوو ، وابیرم كردەوە " كە ئەگەر شەوێك لە شەوان بچووبایەمە باوەشـی حەسـەن و

لەگەڵیدا جووت و جۆر ببایەم ، لە خودا زیاتر کەس ئاگای لێی‌نەدەبوو ، شێوەی زۆر لە میردە ون بووەکەم دەچوو ، هەمان شت بوو . توخوالێم مەگرن جار و بار ئاوەها شتی هەڵەچە و پەڵەچە دێت بە مێشکمدا. خۆر دەرکەوتبوو، کاتیێ گەرم بوومەوە هەستم بە زك و لاشە و مل و مەمکەکانم و بگرە سەری مەمکەکانیشم کرد . لەبەر دەرگاکەدا خۆر لێیدەدام . ئورهان هات و گوتی : " دایە ئەوە چی دەخوێنیتەوە ؟ "

باشە با پێتان بڵێم تۆزێك بەرلە ئێستا پێمگوتن کە نامەکان ناخوێنمەوە ، درۆم کرد و دیسان خوێندمەوە ، بەڵام ئەم جارەیان بەڕاستی نامەکانم خستە گیرفانم و بە ئورهانم گوت وەرە بزانم وەرە باوەشم ، ئەی ماشەڵا چەندە قورسی ! خۆ بووی بە پیاو ! ماچمکرد و گوتم خۆ ڕەقت بردۆوەتەوە ، وەك سەهۆڵ وای . پشتی هەسوویە مەمکەکانم و گوتی : دایە چەندە گەرمی . لەدواییدا باوشمان کرد بە یەکدا و بێدەنگ بێدەنگ دانیشتین . پێمان خۆشبوو . بۆنی ملیم کرد و ماچمکرد و بە توندی باوشم پێدا کرد ، بێدەنگییەك دروستبوو و هەروا ماینەوە . ماوەیەك دواتر وتی : ختۆکەم دی . گوتم : " ئەگەر پادشای جندۆکەکان بێتە ئێرە گەورەترین ئارەزووت چییە بۆ ئەوەی کە بیهێنێتە دی ؟

– : " دەمەویێ شەوکەتیش لە لامان بێت . "

– : " شتی‌ترت ناویێ ؟ بۆ نموونە باوکێکت ناویێ ؟

– : " نا ، کە گەورە بووم خۆم دەتخوازم . "

شتی هەر خراپ لەم دونیایەدا بۆ مرۆڤێك پیری ، یان ناشیرینی و تەنانەت بێوە ژن بوون و نەداریش نییە بەڵکوو ئەوەیە کە کەسێك نەبیێ بەخێڵیت پیێبباتەوە . زکی ئورهان گەرم بوو بوو ، لە باوەشی خۆم دامگرت

. لەبەر خۆمەوەگوتم پێویستە کەسێکی ڕۆح پیسی وەکوو من لەگەڵ پیاوێکی باشدا زەماوەند بکات و بەرە و لای باوکم ڕۆیشتم . گوتم : " پادشاکەمان تەواو بوونی کتێبەکە دەبینیٚو ئەمجارەش خەڵاتێکتان پێدەبەخشێت . جارێکیتر دەڕۆیتەوە بۆ وەنیز ؟"

باوکم گوتی : " نازانم ، دووژمنان بە هێزن و ئەم پیاو کوژییەش دەمترسێنیٚ."

وتم : " ئەم وەزعەی منیش هێزیان پێدەبەخشیٚ و وایان لێدەکات کە وەرەیان بەرز ببێتەوە و لەسەر شتی

بیٚپایە و بونیات ئومێدوار بن ."

– " چۆن ؟ "

- گوتم :" تۆزێك زووتر دەبیٚ شوو بکەم . "

- گوتی : " لەگەڵ کێدا ؟ خۆ تۆ مێردت هەیە !ئەمە لە کوێوەهات ؟ کیٚ داوای کردووی ؟

باوکە بەرێزەکەم بەردەوامیکرد و گوتی : " ئەگەر داواکاریەکەشت ماقووڵانە و لەجێی خۆش بیٚ ، من بڕوا ناکەم کە بتوانیٚ مێردێکی باش بدۆزیتەوە ، خۆت باش دەزانی کە بۆ ئەوەی بتوانی ژیانێکی هاوسەری بکەی پێویستە زۆر شتان بکەی و زۆرشتیش چارە سەر بکردرێن " . لە دوای بێدەنگییەکی درێژیشەوە گوتی : " گیانەکەم دەتەویٚ بڕۆی و بەجێمبهێڵی ؟ " گوتم : "دوێنیٚ خەوم بینی و وامدەزانی مێردەکەم مردووە . " بەڵام وەکوو ژنێك کە بەراستی ئەو خەوەی بینیبیٚ نەگریام وەکوو چۆن کاتێك تەماشای وێنە دەکەی ، دەبیٚ بتوانی بیخوێنیتەوە ، پێویستە بزانی کە چۆن خەو بخوینێتەوە . وەکوو ئەوەی کە لەم باسە ماندوو بووبین ، بە

شێوەیەکی ماقووڵانە و بۆ ئەوەی کە قسەکانمان لە شتانی دیکە جودا بکەینەوە ، تاوانەکانی خۆمانمان لەبەر چاو دەرباز کرد و هەر یەکەو بزەیەکمان لێدا .ووتی : " من بەراستی شیکردنەوەکەت لەسەر خەوەکەت بڕوام هەیە . بەڵام پێویستە گوێ بدەیتە قسە باوك و برای مێردەکەشت ، لەوەش زیاتر پێویستە هەندێك شت هەبن کە قازی بڕوای پێبکات کەئەم پیاوە مردووە " .

گوتم : " ئەوە بۆ دوو ساڵ دەچێ کە دەستی منداڵەکانم گرتووە و هاتوومەتەوە ماڵی باوکم ، کەچی ئەوان نەهاتوون بە دوامدا " .

گوتی : " چونکە دەزانن کە کەمو کوڕی و عەیبیان هەیە . بەڵام ئەمە بەو مانایە نایەت کە ئەوان بەجیا بوونەوەی تۆ ڕازی بن " .

– : " ئەگەر مەزهەبەکەمان مالکی یا حەنبەلی بایە لە دوای چوار ساڵ ، قازیحەقی جیا بوونەوە و نەفەقەشی پێدەدام ، بەڵام شوکر بۆ خودا کە ئێمە حەنەفین و ناتوانین ئەمەش بکەین ."

– : " باسی ئەوانەم بۆ مەکە ، ئەوانە شتی خراپن . "

– : "لە گەڕەکی ئوسکوداردا کەسێکی شافێعی هەیە . تەواوی ژنە ئەستەمبووڵییە مێرد نەگەڕاوەکان دەچن بۆلای ، ئەویش پرسیاری ئەوە دەکات کە چەندێکە نەگەڕاوەتەوە و ئایا لە بەڕێوەبردنی ژیاندا تووشی کێشە دەبێ یان نا و بەو جۆرە لەیەك جیایان دەکاتەوە . "

– : " کێ ئەمانە دەخاتە مێشکی کچە جوانەکەی من ، کێ عەقڵی بردووی ؟ خۆت کۆ کەرەوە . "

– : " لە دوای جیا بوونەوەم ، ئەگەر کەسێك هەبێ کە عەقڵم دەرپەڕێنێ ، ئەبێ ئێوە پێم بڵێن ، لە بارەی ژیانێکیتری هاوسەرییەوە چاوەڕێی بڕیاری

ئێوه دەكەم . "

باوكە فێڵبازەكەم كاتێ تێگەیشت كە كچەكەشی بە قەدەر خۆی فێڵبازە ، چاوەكانی دەستی بە پرتەپرت كرد. لەڕاستیدا باوكم لەبەر سێ هۆ خێراتر چاوی دەپرتێنێ .

1- لە كاتی تەنگانەدا بۆ دۆزینەوەی فێڵ و تەڵەكەیەكی‌تر مێشكی بەكار دێنێ و چاوی دەپرتێنێ .

2- كاتێك كە تووشی خەم دەبێ و خۆی بێچارە دەبینێ.

3- لە كاتی تەنگانەدا بۆ ئەوەی فێڵبازی بكات وانیشانبدات كە دەیەوێ بگری چاوی دەپرتێنێ .

ووتی : " دەستی منداڵەكانت دەگری و باوكە پیرەكەت بەجێدێڵێ ؟ من لەوە دەترسم كە كتێبەكەم تەواو نەبێ و بمكوژن ، بەڵام مادام كە تۆ خۆت دەتەوێ دەستی منداڵەكانت بگری و بچی ، من خۆم دەمەوێ بمرم . "

- باوكە گیان مەگەر خۆت نەتدەگوت كە بۆ نەجات پەیدا كردن لەكارە پیسەكانی برای‌مێردەكەت پێویستە جیا ببیتەوە ؟ "

- وتی : " نامەوێ بە جێم بهێڵی . لەوانەیە ڕۆژێك مێردەكەت بگەڕێتەوە ، ئەگەر نەگەڕاوە ، بەو مەرجە دەتوانی ژیانێكی هاوسەری پێك بێنی كەلەم ماڵدا بمێنیتەوە . "

گوتم : " لەوە زیاتر كە بتوانم لێرەدا لەگەڵ ئێوەدا بژیم هیچ شتێكیترم ناوێ ."

وتی : " ئەی گیانی من كێ بوو تۆزێك بەرلە ئێستا باسی شوو كردنی دەكرد؟"

- " ئـەنجامی قسـەکردن لەگـەڵ باوکمـدا وایـە ، هەمیشـە لـە دواییـدا تێدەگەم کە هەڵەم کردووە ".

تەماشای بەرپێی خۆمم دەکرد ،خەریك بوو بڵێم .... بەڵام بۆ ئەوەی نەگریم بەزۆری خۆمم ڕادەگرت ، هەقدارییەکەی خۆمم هاتەوە یاد و ورەم بەرزبووەوە .

– : " ئەی جارێکیتر شوو نەکەم ؟ "

– : " ئەو پیاوەی نەتباو لەمن دوورت نەکاتەوە لەسەر سەرم جێگای هەیە ، داواکارەکەت کێیە ، لەم ماڵەدا دادەنیشێت ؟ " بێدەنگ بوو ، بەڵام هەردووکمان دەمانزانی کە ئەگەر لەم ماڵەدا بمێنێتەوە باوکم ڕێزی لێناگرێت و وردە وردە ئەیتلێقێنیٚوئازاری پێدەگەیەنیٚ . بەناوی دەعوەتکراوی ماڵی کچ باسی زاوای دەکردو بەشێوەیەکی وەستایانە و ساختەچییانە بچووکی دەکردەوە ، خەریك بوو منیش بچووك بکاتەوە و وتی : " ئەگەر مۆڵەتی باوکت نەبێت ناتوانی مێرد بکەیت و منیش ڕەزام لەسەری نییە و ناهێڵم شوو بکەی . "

– : " نامەویٚ مێرد بکەم ، بەڵکو دەمەویٚ جیا ببمەوە . "

–: " کچە جوانەکەم ، گیانەکەم نامەویٚ کەحەیوانێکی هەرچی و پەرچی لەبەر خاتری بەرژەوەندی خۆی ئازارت پێبگەیەنێت ، خۆت دەزانیت کە چەندەم خۆش دەوێیت . پێویستە ئەم کتێبەش تەواو بکەین . "

بێدەنگ بووم ، ئەگەر دەستم بە قسەکردن بکردبایە ، کەشەیتانیش خۆی مەلاس دابوو ، پێمدەگوت کەدەزانم شەوان خەیرییە دەباتە ژوورەکەی خۆی . بەڵام ئەمە شایستەی کچێکی وەکوو من نەبوو کە لەگەڵ باوکمدا ئاوەها قسە بکەم و تۆمەتی بخەمە پاڵ . بەڵام هەر لەو کاتەدا وەها خەیاڵم کرد کە

چاوم بەباوكم و خەيرييە دەكەوێ كەبەو حاڵە پێكەنيناوی و پيسەی خۆيانەوە لەناو جێگاكەدا خەوتوون . خەريك بوو بگريم .

تەماشای بەر پێی خۆم كرد و گوتم : " لەسەر ئوجاخەكە كولەكە دانراوە ، دەسووتی . "

چوومە ژوورەكەی تەنيشتەوە و لەبەر پەنجەرەكەيدا ڕاوەستام كە ڕووی لە چاڵە ئاوەكە بوو . پەنجەرەكەش نەدەكرايەوە . بەهەستی دەستەكانم پێخەفەكانم دۆزييەوە،جێگاكەم ڕاخست و خۆمم ڕاكێشا . ئای چەندە خۆشە كەلەكاتی منداڵيدا ناحەقيت پێبكرێت وبچيتە سەر جێگاكەت و هۆن هۆن بۆ خۆت بگريت و تەپاو تل بكەيت . تەنيا حەز لە خۆم دەكەم . تەنيای زۆر بە ئازارە ، كاتێك دەگريم ،ئێوە مانان گوێتان لە هۆڕە هۆڕی من دەبێ و دێن و ئاشتم دەكەنەوە . تۆزێك دواتر سەيرم كرد و بينيم كە ئورهان لەسەر جێگاكەی من خەوتووە و سەری خستوەتە نێو مەمكەكانمەوە ، ئەويش گريا بوو ، چاوەكانی تەڕ بوون . بەرەو لای خۆم ڕامكێشا .

ووتی : " دايە گيان مەگری باوكم لە شەر دەگەڕێتەوە ."

گوتم : "چۆن دەزانی ؟ " بێدەنگ بوو . بەلآم زۆرم پێخۆشبوو . كاتێ سەريم پاڵدا بە سينگمەوە ، هەموو ئازارەكانی خۆمم لە بير چووەوە . بەر لەوەی باوەش بكەم بە سينگە نارينەكەی ئورهان وخەو بمباتەوە ، با شتێكتان پێ‌بڵێم : تۆزێك بەرلە ئێستا بە تووڕەييەوە باسی باوكم و خەيرييەم كرد ، ئێستا زۆر پەشيمانم . نا ، ئەو شتەی وا گوتوومە درۆ نييە ، بەلآم لە وتەكانی خۆم شەرم دەكەم ، ئێوەش فەرامۆشيان بكەن . وەكوو ئەوەی واينەگوتبێ و باوكم و خەيرييەش وايان نەكردبێ ، سەيری ئێمە

بکەن . مەگەر نابیٚ ؟

## (( من زاواکەتانم )) (17)

خاوەنی کچ بوون شتیٚکی زۆر سەختە ، زۆر ، لە ناوەوە دەگریا گویٚم لە دەنگی هەنیسەکانی بوو . بەڵام لە تەماشاکردنی ڕووپەڵەکانی کتیٚبەکە زیاتر نەمدەتوانی هیچ شتیٚکیتر بکەم . ئەو کتیٚبەی وا دەمخویٚندەوە ( کتاب الاحوال القیامە ) بوو کە باسی ئەوەی ئەکرد وا سیٚ ڕۆژ دوای مردن ڕۆح لە خودا مۆڵەت وەردەگریٚ و دەگەڕیٚتەوە بۆ ناو ئەو لاشەیەی وا تیٚیدا ژیاوە، ڕۆح کە چاوی بە تەرمە خویٚناوی و پتوورکاوەکەی خۆی دەکەویٚ یەکسەر خەم دایدەگریٚ و دەڵیٚ : تەرمە بیٚچارەکەم !لاشە کۆنە خۆشەویستەکەم و دەست بە گریان دەکات و پرسەی بۆ دەگریٚ. کەوا بیٚ ڕۆحی زەریف ئەفەندییە بیٚچارەکەش بۆ تەماشای جەستەکەی خۆی لەباتی مەزار دەچیٚ بۆ چاڵە ئاوەکە . کە بیرم لەمە دەکردەوە زۆرم پیٚناخۆش بوو .

كه هەنیسكەكانی شەكورە بڕایەوە دەستم بە خوێندنەوەی كتێبەكانی مەرگ كرد . كراسێكیترم لە بەر كرد و پشتوێنە جەواڵەكەشم بە توندی گرێدا ، ئیدی پشتمی گەرم دەكردەوە، شەواڵێكم هەبوو كە لە تووكی كەروێشك دروستكرا بوو ، ئەویشم لە پێكرد . لە ماڵ دەركەوتم، شەوكەت گوتی : " باوە بۆ كوێ دەچی "

گوتم : " تۆ بڕۆرەوە بۆ ماڵ من بۆ سەر جەنازە دەچم . " ماڵە دارزاوو پتووركاوەكانی هەژارەكان لە كۆلانە چوڵەكاندا ،لەژێربەفرەقورسەكەدا بە زۆر خۆیان ڕاگرتبوو ، لە تەنیشت ئەوانەوە لە جێگایەكی سووتاوەوە تێپەڕبووم . لە گەڕەكەكانی كەنارەوە و لەلای بۆستانچییەكان و ئەوانەی وا تاقمی سەیارە و تایەكانی دەفرۆشن و لەپاڵ ئاسنگەرەكان و كورتانفرۆشەكان و ناڵبەندەكانەوە و لەگەڵ ئەو پیرە پیاوانەی والەبەر ئەوەی ون نەبن لەتەنیشت ئاوەكەدا دەرۆیشتن ، تێپەڕ بووم . نازانم لەبەر چی جەنازەكەیان لە مزگەوتی ( میهریماە ) لە ( ئەدیرنە قاپی ) ششتوەو هەڵیان گرتووە . لەبەر مزگەوتەكەدا دەستم كردە ملی برا مل قوتە سەر سووڕ ماوە تووڕەكانی و سەرە خۆشیم لێكردن .

لەگەڵ وێنەكێش و خۆشنووسەكاندا باوەشمان كرد بەیەكدا و دەستمان بە گریان كرد . لە ناكاو تەم و مژێك نزمبووەوە و هەموو زەوی داگرت . لەنێو ئەو تەم و مژەدا نوێژی مردوومان كرد ، لەسەر بەردەكەی ( موسەللا ) چاوم بە تابووتەكە كەوت و لەو ناپیاوە تووڕە بووم كەوا ئەم كارەی كردووە ، ئەوەندە تووڕە بووم كە بڕوانن چۆن دووعای ( ئەڵلاهوموبارەك ) لە مێشكمدا تێكەڵ و پێكەڵ بووە . دوای نوێژ جەماوەر جەنازەكەیان لە سەر شان هەڵگرتو ڕۆیشتن ، بەڵام من هێشتا لە نێو وێنەكێش و

خۆشنووسەکاندا بووم . لەگەل لەقلەقدا باوەشمان دەکرد بەیەکدا و ئەو شەوانەمان لەبیر چوو کەوا تابەیانی لەسەر کتێبەکە کارمان دەکرد و باسی زەریف ئەفەندیمان دەکرد . ئەو دەیگوت جوانکارییەکانی زەریف ئەفەندی زۆر بێ قیمەت و سووکن و هەر چەندە وا دیاربن کە دەوڵەمەند کراون بەڵام لە ڕاستیدا وا نییە و هەموو جێگایەك بە ڕەنگی نیلی بۆیاخ دەکات ، منیش دەمگوت ڕاست دەکەی بەڵام ناچارییە و کەسیترمان نییە . زەیتوون بە نیگایەکی پڕلە ڕێز و حورمەت و دۆستایەتییەوە سەیری کردم و باوەشی پێدا کردم ( ئەوەی بزانێ باوەش بکات بە پیاوێکی تردا پیاوێکی باشە) زۆرم پێخۆش بوو ، جارێکیتریش وام بیر کردەوە لە نێو وێنەکێشاندا ئەوەی لەهەموو زیاتر بڕوای کتێبەکەم هەیە ئەوە . لەبەر دەرگای حەوشەکەدا لەگەڵ وەستا عوسماندا شان بە شان ڕێکییەکهاتین ، نەماندەزانی کەچی بڵێین . کاتێکی سەیر و کشاوە بوو ، یەکێك لە براکانی خوا لێخۆشبوو دەستی بە گریان کرد و ئەویتریش خۆی فش کردەوە و ویستی خۆی نیشانبدات و دەستی بە قیڕە قیڕ کرد .

وەستا عوسمان پرسیاری لێکردم و گوتی : " دەیبەن بۆ کام قەبرستان ؟ " گوتم : " نازانم " بەڵام لەبەر ئەوەی کە وامدەزانی هەڵویستێکی دژبەرانەیە ، پەشۆکام و بەبێئەوەی کە بیر بکەمەوە منیش پرسیارێکم لە پیاوێکی تەنیشتی خۆم کرد و گوتم : " بۆ کام مەزاری دەبەن ؟ بۆ ئەدیرنەقاپی ؟ "

گەنجێك لەولاوە کە کەرێکی نەفام بوو گوتی : " ئەیووب " .

گەڕامەوە و بە وەستا عوسمانم گوت بۆ ئەیووبی دەبەن . سەرێکی لەقاند و گوتی : " تێگەیشتم . " وا هەستمکرد کەنابێ ئەو چاو پێکەوتنەمان لەوە

زیاتر درێژ بكات . وەستا عوسمان ئەوەی پێ قبوول نەدەكرا كە پادشا ئەركی نەخش كێشان و وێنە دروستكردنی بۆ كتێبە نهێنیەكەی بەمن ڕاسپاردووە و لەوەش زۆر تووڕە بوو بوو .

لە لایەكیتریشەوە پاشا كەوتبووە ژێر كاریگەری نەریتی ڕۆژ ئاوایییەكان كەوا بە ڕێگای منەوە هاتبووە ناو وێنە كێشی ئێمەوە . بە بیرم دێت پاشا جارێك وەستا عوسمانی ناچار كردبوو كە وێنەیەك لە وێنە كەسیەكەیبكێشێتەوە كەوا وەستایەكی ئیتاڵی بۆی كێشابوو . وەستا عوسمان لەو وێنەیە بێزی دەهاتەوە لەوەشدا منی بە بەرپرسیار دەزانی ، كە من مافیشی پێدەدەم . لە ناوەراستی پلیكاكاندا ڕاوەستام و تەماشای ئاسمانم كرد ، كاتێ دڵنیا بووم پاش ماومەتەوە وردە وردە هاتمە خوارەوە دوو پلیكانە هاتم و نەهاتم كە یەكێك دەستی كرد بە قۆڵمدا و باوشی پێدا كردم " ڕەشە بوو . وتی : " زۆر ساردە سەرماتان نابێ ؟ " گومانم لەوە نەبوو كە ئەوەی وا عەقڵی شەكورەی تێكداوە ڕەشەیە. دیار بوو كە متمانەیەكی زۆری بە خۆ هەبوو ، كاتێ دەستی كرد بوو بە قۆڵمدا هەستم بەوە كردبوو . لە هەڵۆێستەكانیدا ئەوە دەردەكەوت كە بەڵێ دوانزە ساڵ كارم كردوە و بووم بە پیاو . پلیكانەكان كۆتای پێ هات ، با ڕووداوەكانی وێنەكێشخانەم دوایی بۆ بگێرێتەوە ، وتم : تۆ لە پێشەوە بچۆ ڕۆڵەگیان ، بچۆ ، بگە جەماوەرەكە .

پێی سەیر بوو ، بەڵام بە ڕووی خۆیدا نەهێنا . دەستمی بەر داو پیاو ماقوڵانە ڕۆیشت . شیوەی ڕۆیشتنەكەیم پێ خۆش بوو لە گەڵ خۆشم وتم ئەگەر شەكورەی پێبدەم لە گەڵمدا دەمێنێتەوە و یان نە ؟ ڕۆیشتبووینە دەرەوەی ( ئەدیرنەقاپیەوە ) . خەریك بوو لە ناو تەمو مژەكەدا ون دەبووین

، چاوم بە شێوەکاران و خۆشنووسەکان و شاگردەکان کەوت ، جەنازەکەیان هەڵگرتبوو ، لە لاپاڵەکەوە بەرەو خەلیج دەڕۆیشتە خوارەوە ، ئەوەندە بەپەلە ڕۆیشتبوون کە نیوەی ڕێگای دۆڵە قوڕاوییەکەی ئیووبیان بەو هەموو بەفرە بڕیبوو . لەلای چەپەوە دووکەڵی مۆمخانەکەی سوڵتان خانم بە خۆشیەوە بەرز دەبویەوە . لە ژێر دیواری قەڵاکانی ( ئەیوب ) دا حەیوان سەر برو پێست گورووەکان گوڕایگوڕ کاریان بۆ قەسابە ڕووسیەکان دەکرد، بۆنی لاکی حەیوانەکانی ئەوێ تا جێگای دیار و نادیار دەڕۆیشت و دەگەیشتە لای مزگەوتی هەڵبژێردراوی ئەیوب و دارە درێژەکانی قەبرستانەکەش و لە وێشەوە بڵاو دەبوەوە . لە دوای تۆزێك ڕێی کردن کەوتنە نێو گەڕەکی تازەی یەهودیەکان و گوێم لە دەنگیئەو منداڵانە بوو وا یاریان دەکرد . کاتێك گەیشتمە ئەیوب پەپوولە پێچاپێمەوە و بابەتەکەی کردەوە و وتی : " زەیتون ولەق لەق ئەم کارەیان کردوە ، ئەوان دەیانزانی کە من و ئەو خوالێخۆشبووە ناکۆکیمان هەبووە و ئەوەشیان دەزانی کە هەموو کەسێکیش ئاگای لەوە هەیە . لە سەر ئەوەی کە وەستا عوسمان کێ بکات بە سەردەستەی وێنە کێشان ناکۆکیمان هەبوو . تەنانەت دژ بە یەکیش قسەشمان دەکرد و هەستەکانیشمان دەردەبڕی،بۆیە ئێستاش ئەمانە تاوانەکە دەخەنە سەر من . هیچ نەبێ خەزێنەدار وەها بیر دەکاتەوە و ئەوەش دەگەیێنێتەوە گوێی پادشا و پادشاش لە ئێمە دوور دەکەوێتەوە .

- " گووتت ئێمە ، ئێوە کێن ؟ "

- " ئێمە ئەوانەین کە دەڵێین پێویستە شێوازی کۆن لە وێنەکێشخانەکەدا بمێنێتەوە و لە نەریتی ئێرانیەکان کەڵك وەر بگرین و دەبێ لە بەر خاتری پارەش هەموو شتێك نەکێشین . ئێمە دەڵێین لە باتی

ئەوەی لە کتێبخانەدا باسی چەك و داگیرکراوەکان و ئەسیرو ئەرتەشەکان بکەین با باسی ئەفسانە کۆنەکان و پاڵەوانە قارەمانەکان و داستانەکانیان بکەین و لە پێوانە کۆنەکان دەر نەچین ، هەر وەها لە دوکانەکانی بازاردا لە بەر خاتری چەند ئاکچەیەك وێنە نەکێشرێت . حەزرەتی پادشاش حەقمان پێ دەدات" . وتم : " لە خوت و خۆڕایی کەس تاوان بار مەکە. لەبەر ئەوەی هەندێك لە ئێوە جۆرە ڕەسمێکتان کێشاوە کە جاران نەکێشراوە ، پێویست بە شەڕ و ئاژاوە ناکات . ئێوە هەمووتان بران ، من بڕوا ناکەم ئەوەی ئەو کارەی کردبێ یەکێك لە ئێوەی وێنە کێش بێت " . بەڵام هەر لەو کاتەدا وەکوو چۆن یەکەم جار بیستم ، ڕاستیەکم بینی " ئەوەش ئەوە بوو کە بکوژی زەریف ئەفەندی یەکێکە لە وێنە کێشانی کۆشك و ئێستاش خۆی دزیوەتەو لە ناو جەماوەورکەو لە لاپاڵەکەدایە . لەوە دڵنیا بووم کە ئەمە دوژمنی کتێبەکەی منە و هاتووتە ماڵەکەشم و ڕاسپاردەی وێنە و نەخشی وەر گرتووە .

ئایا پەپوولەش وەکوو زۆربەی ئەو وێنە کێشانەی هاتوو چۆی ماڵەکەم دەکەن عاشقی کچەکەم بووبوو ؟ لەوە دەچێ لە کاتی گووتنی ئەو قسەو تۆمەتانەدا ئەوەی لە بیر چووبێ کە بابەتی وێنەی دەهێنا و منیش پێچەوانەکەیم پێ دەگووت، یان وەکوو دەیەویست تانەم لێبدات ؟ لە دواییدا بیرم لێکردەوەو گوتم ، باڵێ ! تانەم لێنادات ، وانییە ! پەپوولەش وەکوو وەستاکانیتر منەتباری منە ،

لەبەر شەڕ و ئاژاوە و کەمتەرخەمی پادشا ، خەریکبوو پارەیان لێبڕن و هەدیەی کەمیشیان دەدانێ ، بەڵام لەسایەی سەری کتێبەکەی منەوە پارەیەکی زۆریان چنگ کەوتووە. دەمزانی کەلە سەر من بەخیلی بەیەك

دەبەنەوە ، هەر لەبەر ئەوەش ( ئەگەرچی هەمووشی ئەوە نەبێ ) لە ماڵ خۆمانەوە یەك یەك دەمبینن و ئەمەش نەدەبوو بە هۆی ئەوەی کە دوژمنایەتی من بکەن . وێنە کێشەکانم لەبەر سەردەستەکانیان ، ئەگەر حەزیان لەیەکێك بکردایە ، یەکسەر بەدوای هۆیەکی مرۆڤانە دەگەڕان و پیاو ماقوڵانە هەڵسوو کەوتیان دەکرد .

بۆ ئەوەی کە بێدەنگییەکە بشکێنم و نەگەڕێینە سەر بابەتەکە گوتم : " ماشاللا ! خۆلەلاپاڵەکە و تێپەڕ بوون و تابووتەکەشیان بردە سەرەوە "، پەپوولە لەسەرمادا هەموو ددانەکانی دەرخست و بە شیرینیەکەی خۆیەوە بزەیەکی لێدا . بیرم لەوە کردەوە کە دەبێ ئێستا پیاوێك بکوژێت ؟ بۆ نموونە لەبەر بەخیلی ، لەوە دەچی بمکوژن ؟ بەهانەیەك دەدۆزنەوە ، بۆ نموونە دەڵێن ئەم پیاوە جنێو بە دینەکەماندەدا و خراپەی پێدەڵێ ، بەڵام ئەم هونەرمەندێکی تەواوە بۆ بیکوژین ؟ پیر بوون تەنیا ترسان لە هەورازی نییە ، لەوانەیە ترسی زیاد لە مردنیش بێت ، یان بێداخوازێتی بێت یان وەکوو بردنی کچە خزمەتکارێك بۆ ناو جێگای خۆت نە بە گەرم و گوڕی و هەڵچوونەوە بەڵکوو بە دزی و ترسە ترسەوە .

لەناکاو بەو بڕیارەی بەپێی هەستەکانی خۆم گرتبووم گوتم : " کتێبەکەم تەواو ناکەم!"

پەپوولە ڕووی هەڵگەڕاو گووتی : " چۆن ؟ "

گوتم : " نەهامەتی تێدایە ، پادشاش پارەکەی بڕیوە ، بە زەیتوون و لەق لەقیش بڵێ

: " لەوانەیە دووبارە پرسیاری بکردایە ، بەڵام کاتێ سەرنجمان دا خۆمان لە نێو دارەکانی لاپاڵەکەو بەردەکانی قەبرستاندا بینیوە . لە دەنگی ( بسم اللە

، الله ، میلەتی ڕەسولْ الله ) وە و لەشیوەنی گریانی سەر مەزارەكەوە زانیم كە خەریكن تەرمەكەی دەخەنە ناو قەبرەوە . یەكێك گوتی : " ڕوومەتی باش لادەن، كفنەكەی لادەن " . كفنەكەیان لیٚ دەپێچاند ، لە سەرە تلیقاوەكەیەوە تەنیا چاوی مابوو . لە گەلْ مردووەكەدا چاو بە چاو تەماشای یەكتریمان كرد . لە بەر ئەوەی لە دواوەوە بووم هیچ شتێكم نەدەبینی و، لەباتی تەماشاكردنی چاوی مردن تەماشای جێگایەكیترم كردبوو.

یادەوەرییەك ! باپیری پادشاكەمان ( جێگای بە بەهەشت بیٚ ) سیٚسالْ بەر لە ئێستا ویستوویەتی دوورگەی ( قوبرس ) لە ڕوومیەكان بسێنێت . ( شێخ الاسلام) ئەفەندیش یەكسەر فتوایەكی دەر كردووە و گوتوویەتی كە : كاتی خۆی ئیسلام لە ڕێگای ئەم دوورگەیە و بەرە و جێگایتر بلاٌو بووەتەوە بۆیەپێویستە جێگایەكی پیرۆزیئاوەها لە ژێر دەستی گاورەكاندا نەمێنێتەوە . بەمجۆرەش یەكەم ئەركی بالْوێزیم بۆ دەركەوت . دەبوایە بڕۆیشتمایە لای وەنیزییەكان ( ڕومیەكان ) و ئەم بڕیارە ناكاوییەم پێڕابگەیاندنایە و داوام لێبكردایەن كە دوورگەكەمان بدەنیٚ . كلیساكان گەڕام ، لە بەرامبەر كۆشك و پەردەكاندا سەرم سووڕ مابوو . وێنەكانی مالْە دەولْەمەنەكان و ، كاریگەرییان لێدەكردم ، لە گەلْ ئەم سەر سووڕمانە و سەرەڕای میوانداریەكەیان نامەی هەڕەشەكەم پێدان و ئەوەی پادشا گوتببوی پێمڕاگەیاندن . ئەوەندە تووڕە بوبوون ، كە لە كۆبوونە نائاسایەكەی خۆیاندا بڕیاری ئەوەیان دابوو كە هەر قسەشی لە سەر نەكەن . لەوەش زیاتر جەماوەرێكی جەنجالْ لە كۆشكی دۆچدا تەنگیان پیٚ هەلْچنیبوم . هەندێك سەر سەری و هەرچی و پەرچی پاسەوان و

دەرگاکانیان تێپەڕاند و گەیشتنە من ، دەیانە ویست سەرم بڕن ، بەڵام دۆچ دوو لە پاسەوانەکانی خۆی خستە تەکم و لە دەرگای پشتەوە ناردمیە دەرەوە . ئەو کاتەش لە تەمو مژێکی وەکوو ئەمڕۆدا یەکێکی پرچ درێژ و جل سپی چاوەڕێی دەکردم . دەیویست دەستم بگریٚ ، وام زانی مەرگەو هاتوە بە پیرمەوە ، تەماشای نێو چاوانیم کرد ، لە خەیاڵمدا کتێبەکەم تەواوو کردوەو جارێکی تر بۆ وەنیز دەچوومەوە . کاتیٚ گەیشتمە سەر قەبرەکە کە بە جوانی سەری داپۆشرابوو ، زانیم کە ئێستا لەوێدا فریشتەکان لێپرسینەوەی لێدەکەن ، ڕەگەز ، دین و پێغەمبەرەکەی لێدەپرسن ، مەرگی خۆمم بیر کەوتەوە ، قەلەرەشێك لە تەنیشتمدا نیشتەوە ، شیرین شیرین تەماشای نێو چاوە ڕەشەکانیم کرد و ویستم کە دەستی بگرم و لە گەڕانەوەدا هاورێیەتیم بکات . بە ڕەشەم گوت کە دوو سبەی لە ماڵی خۆماندا بۆ کار کردن لە سەر کتێبکە چاوەڕێی دەکەم ،چونکە کاتیٚ بیرم لە مەرگی خۆم دەکردەوە و نەدەکردەوە ، جارێکیتر تێگدەیشتم کە بە چ نرخێك دەبیٚ بایێی پێویستە ئەو کتێبە تەواو ببێت.

## (18) (( لە دوایدا پێم دەڵێن پیاوکوژ ))

کاتیٚ خوڵی سارد و قوڕاویان دەخستە سەر تەرمە پارچە پارچە کراوەکەی زەریف ئەفەندیە بێچارەکە ، لە هەموو کەس زیاتر من دەگریام .

ئـەم قیڕانـدو هـاوارم دەكـرد : بـا لـە گـەڵ مردووكـەدا منـیش بمـرم ، لیـرەدا بمنیـژن، بـۆ ئـەوەی نەكەومـە نـاو گۆڕەكـە لـە دواوە باوەشـیان پیـدا كـردم . وەكـوو ئـەوەی كـە هەناسـەم لـیٚ بڕابـیٚ ، لـەپیان نایـە سـەر تـەوێڵم و بـەرەو دواوە كێشـایان ، (بۆئـەوەی بتـوانم هەناسـە بكێشـم) لـە نیگـای چـاوەكانی خزمـەكانی  خـوا لێخۆشبووەوە تێگەیشـتم كـە زۆر گریـاوم و هەنیسـكەكانم سـنووری خۆیـان تێپەڕانـدووە . لـە بـەر ئـەو هـەموو شـیوەن  و گریانـە ئەوانەی وێنەكێشخانەكە  وەها تێگەیشتن پەیوەندیـەكی (دڵـەكی)  لـەنێوان من و زەریـف ئەفەندیـدا هـەبووە . بـۆ ئـەوەوی زیـاتر سەرنجڕانەكێشـمە سـەر خـۆم ، ڕۆیشـتمە دوای دواوەوە و لـەبن دارچـناریٚكدا دانیشـتم . خزمـە گێلەیـەكی ئـەو گەمژەیـەی وا نـاردبووم بـۆ دۆزەخ هـات و پـاڵی پیـوەدام و چـاوی بڕییـە چـاوەكانم و باوشـی پیـدا كـردم. ئـەو بـیٚ مێشـكە لـە دواییـدا گوتی:"تۆ شەمەی یا چوار شەمەی"

وتم:"چوارشـەمە كـاتی خـۆی نـاوی ئـەو خوالیٚخۆشـبووە بـوو".سـەری سووڕما.

ئـەو نازناوەنـەی وا تـاوەكوو ئێسـتا ئێمـەی بەیەكـەوە بەسـتووەتەوە داستانێكی زۆر سادەی هەیە ، لە دەورانی شاگردیماندا هـەمووماندا حـەزمان لـە وەسـتا عوسـمان دەكـرد كـە تـازە بـوو بـوو بـە وەسـتا ، ڕێزمـان دەدایـیٚ و حـەیران و عاشـقی بـوو بـووین . لـە ڕاستیشـدا وێنـە كێشـێكیزۆر گـەورەیـە ، ئەو هەموو شتێكی پیٚ فێر كردین . خودایش هـەم هونـەرێكی جوانی پیٚدا بـوو ، هـەم عـەقڵێكی وەكـوو هـی جندۆكـەی پیٚدا بـوو ، هـەر بەیانییـەك یـەك كـەسمان دەچـووە  بـەر مـاڵی وەسـتا عوسمـان و جانتاكـەی و قوتـوی قەڵەمەكـەی و بەرگەبەسـتە پڕلـە لاپەڕەكـەیمان بـۆ هەڵـدەگرت و لەگەڵیـدا

دەهاتین بۆ وێنەکێشخانەکە . هەموومان حەزمان دەکرد کەلەگەڵیدا بێین و فرتەفرتمان دەکرد بۆئەوەی ڕۆژێك زیاتر بچین بۆلای .

لە ڕاستیدا وەستا عوسمان یەکێکی ( دەست نیشان ) کرد بوو بەلاّم لە بەر قسە بێکۆتاییەکان ناو وێنە کێشخانەکە ، بە ناچاری ڕۆژی بۆ دانابووین ، دەبوو هەر ڕۆژە و یەکمان بچووبایەین . وەستای گەورە ڕۆژانی هەینی کاری دەکرد بەلاّم ڕۆژانی شەمە نەدەچوو بۆ وێنەکێشخانە .

وەستا کوڕێکی هەبوو کە زۆری خۆش دەویست ،ئەویش وەك ئێمە بەر دەستی بۆ دەکرد و ڕۆژانی دووشەمە لە گەڵیدا هاتوو چۆی دەکرد . بەلاّم کوڕەکەی لە دواییدا ژیانی هونەری بە جێهێشت و خەیانەتی بە ئێمە و باوکیشی کرد . برایەکی بالاّ بەرزمان هەبوو کە ڕۆژانی پێنج شەمە دەچوو ، لە هەمووومان زیرەکتر و لێهاتووتر بوو ، بەلاّم لەو تەمەنە جوانەیدا تووشی نەخۆشیەکی نادیار نەزانراو بوو کە بە گەرما و بەتا کوشتی و ژیانی لە دەستدا . زەریف ئەفەندی خوالێخۆشبووش ڕۆژانی چوارشەمە دەچوو ، لە بەر ئەمەش بە چوارشەمە دەناسرا. وەستاکەمان لە دواییدا نازناوەکانمانی لە لە سێ‌شەمەوە بۆ زەیتوون و لەهەینی‌وە بۆ لەق لەق و لەیەکشەمەوە بۆ پەپوولە گۆڕییەوە لەبەر خۆشەویستی و لە بەر ناسك کاری‌وجوان کارییەکانی بەویشیی‌دەگوت زەریف ، لەوانەیە وەستای گەورە چۆن بە ئێمەی گوتووە بەویشی گوتبێ‌ کە " بەخێر هاتی چوارشەمە ، چۆنی بزانم " وامزانی کە ئەگەر ئەوە بە بیر بهێنمەوە کە چۆن بانگی دەکردم ، یەك سەر دەکەومە پەڵمەی گریان ،بەڵام.... لە کاتی شاگردیماندا سەرە ڕای ئەو هەموو لێدانەی کە دەمانخوارد ، کە دەمانزانی وەستا عوسمان حەزمان لێدەکا کاتێ‌

تەماشای نەخشەكانمانی دەكرد و چاوی پڕ دەبوو لە ئاو و دەست و دەموچاوی ماچ دەكردین ، بە عەشقێكی زیاترەوە هونەرەكەمان گوڵی دەكرد و وامان دەزانی كە لە بەهەشتداین .

رەنگی سێبەری بەخیڵیبردنەوەكانی ئەو ساڵە خۆشانەشمان جیاوازتر بوو !

وەكوو ئەو مرۆڤانەی كە وەستایەك خوّی وەستایەكیتریش دەزگیرانەكەی كێشابێ ، منیش هەست بە دووبەشبوونی خۆم دەكەم . ترسەنۆكێكی وەكوو من كە لە خودا دەترسێ ، ئەگەر لە دەستی دەربچێ و پیاوێك بكوژێ زوو زوو ڕانایەت . بۆ ئەوەی كە ژیانی كۆنیشم بەردەوام بێت و بتوانم بە گۆیرەی ئەوە هەڵسووكەوت بكەم ، پێویستە بە گۆیرەی پیاو كوژ بوونەكەشم دەنگێكی تریش پەیدا بكەم . ئێستا بە ئەو دەنگە خاینە ڕابوێرە قسە دەكەم كە لە ڕابردوودا هیچ تێكەڵاوی ژیانی خۆمم نەكردبوو . ئەگەر پیاو كوژ نەبایەم بە دەنگە ناسراو و زانراوەكەی خۆمەوە قسەم بۆ دەكردن، بەڵام...

نازناوەكەشم (من پیاوكوژمی ) پێوەنییە . با كەس ئەم دووانە تێكەڵ نەكات ! چوونكە شێواز و كەمو كورتیەكم نییە كەبمدا بەدەستەوە . بڕوام وایە كە ئەوەی وێنە كێشێك لە ئەوی تر جیادەكاتەوە كەم و كوڕییە ، بە پێچەوانەشەوە لە خۆبایی بوون نابێت بە كەسایەتی تایبەت . بەڵام لە هەمان كاتیشدا ئەوەش قبووڵ دەكەم لەم وەزعە تایبەتەی مندا كێشەم بۆ دروستدەكات ، چوونكە ئەگەر نازناوەكانی وەستا عوسمان بەكاربهێنم كەوا زاوای بەڕێزیش بە خۆشییەوە بەكاریان دێنێ ، ئەوا لە نازناوەكەمەوە دەزانن كەمن زەیتوونم یان لەق لەق یاخود پەپوولەم و لەوانەیە یەكڕاست

تەسلیمی ئەشکەنجەکانی جەلادەکەشم بکەن . هەر لەبەر ئەوەش بیر ناکەمەوە و هەموو شتێکتان بۆ باس ناکەم .

لەبەر خۆمەوە وەها بیر دەکەمەوە کە لەوە دەچێت ئێوەش تاقیبی من بکەن . هەر بۆیە بە بێ مێشکییەوە وردە کارییەکانی ژیانی خۆم و ئەو شتانەی وا بمدا بە دەستەوە ناهێنمە سەر زمان،

کاتێك باسی سێ داستانەکەی ( ئەلف ) و ( بێ) و ( جیم ) م بۆ دەکردن لە گۆشەیەکی عەقڵی خۆمدا نیگاکانی ئێوەشم بەکاردەهێنا . شەڕکەرە قارەمانە ئەفسانەییەکانلە بەر کیژەجوانکیلەیەك یا خودلە بەر حەز کردن لە وێنە یەك لە کاتە ئەفسانەییەکاندا چنگ دەدەن و یەکتری دەکوژن ،شەڕەکانیش هەر لە بەر ئەوانە ڕوودەدەن . ئەگەر شێوازو کەسایەتییەکی تایبەتم هەبێت ، نەتەنیا لەناو وێنەکاندا بەڵکوو لەپیاو کوژییەکەشمدا شاراوەیە .

ئادەی بزانم ! لە ڕەنگی وشەکانەوە بمدۆزنەوە بزانن من کێم ! ئەگەر بمگرن ڕۆحی زەریف ئەفەندییە بێچارەکەش شاد دەبێت .

ئێستا لەژێر ئەم درەختانە و لەنێوچووکە چووکی پەلەوەرەکاندا تەماشای ئاوە زێڕینەکانی خەلیج و گۆمەزەکانی ئەستەنبووڵ دەکەم . ئای کە ژیان خۆشە ! سەرەنجم دایە ، یەك لە دوای یەك بە بێڵ خۆڵی دەخەنە سەر ! ئەو زەریف ئەفەندیە بێچارەیە لەم دواییانەدا لەگەڵ پیاوە چاو شۆڕەکانی مەلا ئەرەزڕوومییەکەدا هەڵسوکەوتی دەکرد ، هەر دوای ئەوەش لەگەڵ مندا نێوانی خراپ بوو ، هەڵبەت لەبەر ئەوەی لەو بیست و پێنج ساڵەی دواییدا پێکەوە کتێبمان بۆ پادشا دروستکردبوو جارجاریش نێوانمان باش دەبووەوە . بیست ساڵ بەر لە ئێستا کاتێك شانامەکەی

**باوكی خوا لێخۆشبووی پادشاكەمانمان دروستدەكرد ، بۆ بووین بە دۆستی یەك ، بەڵام ئەمە تا تەواوكردنی هەشت لاپەرەی دیۆانەكەی ( فزولی ) بەردەوامی كرد . ئەو كاتانە داواكاری لە جێی خۆی هەبوو ، بەڵام زۆر بێ مەنتق بوو ( دەیگوت پێویستە هەست بەو بابەتە لە ڕۆحی خۆیدا بكات كە دەیەوێت بیكێشێت ) ئێوارەیەكی هاوین بوو ، دەستە دەستە پەرەستووەكان سەر شێتانە دەفڕێن و خۆیان نیشاندەدا، چەند دێڕێكی هۆنراوەكانی ( فزولی ) بە بەزم و ئاهەنگ خۆیندەوە . بە لێبوردییەكەوە گۆیم لێڕا گرت ، دێڕەكە ئەمە بوو : " من من نیم ، من ئەو تۆیەم وا هەموو كات باسی دەكەم"، هێشتا لە بیرمدا ماوەتەوە پرسیاری ئەوەم لە خۆم دەكرد كە دەبێ ئەم دێڕە چۆن نەخش بكردرێت ؟**

**كە زانیم لاشەكەیان دۆزیوەتەوە ، بە هەڕا كردن بەرەو ماڵەكەیان ڕۆیشتم ، جاران لەوێ پێكەوە شیعرمان دەخۆیندەوە . باخچەكەیان وەكوو هی هەموو ماڵێكیتر لە ژێر بەفردا مابووەوە . وا هەستم كرد كە بچووك بووەتەوە ،لەراستیدا ماڵەكەشی هەر بچووك بوو ، لە ژورەكەی تەنیشتەوە دەنگی قیژە قیژی ژنان بەرز دەبووەوە و دەگەیشتە گۆێ ، دەتگووت كێ بەر كێیان داناوە . كاتێ برا گەورەگەی قسەی دەكرد زۆر بە وردی گۆیم بۆ ڕادەگرت : " ڕوومەتی زەریف ئەفەندیە بێچارەكەی برامان پەڵاش پەڵاش بووە و سەری تلیقاوە . دوای چوار ڕۆژ لە بنیچاڵە ئاوەكەدا دەریان هێناوە ، براكانی بە زۆری ناسیانەوە ، لەوەش زیاتر ( قەلبیە ) بێچارەكەی ژنیشی نەیناسیەوە ، بەڵكوو بە جلەكانیدا زانی كە ئەمە مێردەكەیەتی "، یەكسەر یوسفم كەوتەوە بیر كە بە دەستی برا بەخیلەكانیەوە خرابووە ناو چاڵە ئاوەكە و بازەرگانەكان ڕزگاریان كرد بوو . زۆر حەز دەكەم وێنەی یوسف و**

زوڵەیخا بکێشمەوە ، چونکە باسی هەستی بەخیڵی بردنەوەی نێو براکان دەکات کە هەستێکی زۆر سەرەکیە .

کاتێ بێدەنگ بووم وامدەزانی کە هەر کەس تەماشای من دەکات . بگریم یان نا ؟دوودڵ بووم،لە ناکاو چاوم بە ڕە شەدا هەڵتۆقی . هەی پیاوی دڵ نزم ! خەریکە خۆی فش دەکاتەوە و دەیەوێ وا نیشانبدات کە لە لایەن زاوای بەڕێزەوە کراوە بە بەرپرسیاری دۆزینەوەی ڕاستی کێشەکە . برا گەورەکەی زەریف ئەفەنی قیژانی و گوتی : " کێ دەتوانێ ناپیاوی ئاوەها بکات ؟ کام بێویجدان دەتوانێ ئەم برایەمان بکوژێ کە لەوانەیە نەیتوانیبێ ئازار بە مێرولەیەکیش بگەیەنێت"، منیش دەمەویست وەکوو ئەو بە گریانەوە وەڵامی ئەو پرسیارە بدەمەوە و ڕێگا چارەیەك بۆخۆم بدۆزمەوە . دوژمنانی زەریف کێ بوون ؟ ئەگەر من نەمکوشتبایە کێ دەیکوشت؟ کاتی خۆی – وابزانم کاتی ئامادە کردنی هونەرنامە بوو – لەگەڵ هەندێك کەسدا کە نەریتە کۆنەکانیان ڕەتدەکردەوە و بە پەلە پەل جوانکاری وێنەیان دەکرد و جوانکارییەکانی ئێمەیان بە ڕەنگ خراپ دەکرد ، شەڕمان کردبوو . ئەوانە کێ بوون ؟ بەڵام ئاژاوەکانی ئەم دواییە لە سەر ئەمە نەبوو ، دەیانگوت لەقاتی دووەمداعاشقی کوڕە جوانکیلەیەکی بەردەست بووە . پێشك وگومان ببەم هەر ئەمەبوو ئەگینائاژاوەکانی‌تر زۆر کۆنن . لە لایەکی تریشەوە ئەوانەی‌وا باسمکردن دڵیان چوبووە لار ولەنجەکەی زەریف ئەفەنی،هەر وەکوو ژنان دەچوو بەڕێوە ، بەڵام پەیوەندییەکانیان هۆی‌تری‌هەبوو .

زەریف وەکوو کۆێلەیەك گرێدراوی‌نەریتی کۆن بوو، وێنە و جوانکارییەکانی بە مووی ڕەساسی بۆیاخ دەکرد . لە لای وەستا عوسمانی

سەر دەستەی وێنەكێشان باسی كەمو كوڕییەكانی شێوە كارەكانی تری وەكوو من دەكرد . دوایین ئاژاوەشی لەسەر ئەوە بوو كە دیگوت نابێ شێوەكاران لەدەرەوەی ڕاسپاردەكانی كۆشك ڕاسپاردەی دیتر لەملاوئەولا وەربگرن . وەستا عوسمانیش لەسەر ئەوە زۆر دمارگیری دەكرد و زۆریش تووڕە دەبوو . بەڵام لەم ساڵانەی دواییدا كەكەمتەرخەمیەكانی پادشا دەستپێكرد و خەزێنەدارەكەشی پارەی وێنە كێشخانەی كەم كردەوە ، وێنە كێشان وردە وردە دستیان بە سەر لێدانی ماڵە دوو قاتەكانی پاشاكان و ماڵی زاوای بەڕێز كرد .

هیچ گوێم نەدایە بەهانە بێخێرەكەی زاوا كە دەیگوت كتێبەكە تەواو ناكەین . هەڵبەت ئەو دەیزانی كە زەریفە چۆلەكە مێشكی هاوكارمان كە كتێبەكەی دەڕازاندەوە لە لایەن یەكێك لە شێوەكارانەوە كوژراوە . ئەگەر ئێوە لە جێگای ئەودا بایەن هەر دوو حەفتە جارێك پیاو كوژێكتان دەهێنایە ماڵی خۆتان ؟ یان وەكوو لە پێشدا دەتانگوت كە پیاو كوژەكە كێیە و باشترین شێوەكار كامەیانە ؟ گومانم لەوە نەبووكە لە ماوەیەكی كورتدا تێدەكۆشێ بۆئەوەی بزانێ كێ لە هەموو باشترە وكێ جوانتر ڕەنگ دەكات و جەدوەل و ڕوخسار دەكێشێ و باشتر وێنە دەڕازێنێتەوە ،دڵنیام لەدواییدا لەنێو هەموو ئەو وێنە كیشانە دا كە هاتوچووی ماڵی دەكەن من بە باشترین هەڵدەبژێرێ و لەگەڵ مندا ئیشەكەی بەردەوام دەكات .بڕوا ناكەم كە ئەوەندە ورد بێتەوەو بزانێ كەمن پیاو كوژێكی هیچ و پووچم ،بەپێچەوانەوە وادەزانێ كەمن شێوەكارێكی گەورە و هونەرزانم . بەلاچاوێكەوە سەیری ڕەشە ئەفەندییە گێل و گەمژەیە ئەكەم كە لەگەڵ خویدا هێناویەتی . كاتێ ئەو دووانە لە قەبرستانەكە جیا بوونەوە و لەگەڵ

جەماوەرەکــەدا بــەرە و گــوێی ئاوەکــەی (ئــەیووب) دەڕۆیشــتن منــیش لــە دوایانــەوە دەهاتمــە خــوارەوە . ئــەوان ســوار بەلــەمێکی چــوار بێــڵ بــوون و منیش لە گەڵ شاگردە دەم بە پێکەنینەکانـدا سواری بەلـەمێکی شـەش بێڵ بووم . بەلەمـەکانمان ئەوەنـدە نزیکـی یـەك بوونـەوە کـەتۆزێکی مـابوو لەیـەك بدەن . چاوم بە ڕەشە کەوت کە شتێکی دەچپان بە گوێی زاوای بە ڕێـزەوە ، جارێکیتر هەستم کرد کە لە پیاو کوشتن ئاسانتر شتێکیتر نییە . یاڕەبی تۆ ئــەم هێزەتــداوە بــە هــەموومان بــەڵام بــۆ ئــەوەی بەکارێشــی نــەهێنین هـەمووشمانت ترسـاندووە !بـەڵام پیـاو ئەگـەر جارێـك ئـەم ترسـە بشـکێنێ یەکسەر دەبێ بەکەسێکیتر . جاران نەتەنیا لە شـەیتان بـەڵکوو لـە بچووکترین هەسـتی خراپـەیی نـاو دەرونیشـم دەترسـام و زاورم دەتـۆقی . ئێسـتاش وا دەزانم کە خراپە شتێکی باشە و مرۆڤ دەتوانێ تەحەمولی بکات . تەنانەت بۆ شێوەکارێکیش ئەمـە زۆر پێویستە. ئەگـەر چـەند ڕۆژێ دوای کوشتنی ئـەو هەرچی و پەرچیە بخەینەلایەکەوە کەتۆزێ دەستم دەلـەرزی ، لـەو ماوەیـەی وا زەریــف ئەفەنــدیم کوشــتووە زۆرجــوانتر وێنــە دەکێشــم، ئازایانــەتر و درەوشاوەتر بۆیاخ دەکەم ولەوەش زیاتر هێزی خـەیاڵم شتانی دەرئاساییتر دەخوڵقێنێ . بەڵام داخو چەند کەس لە ئەستەنبوولدا هـەن کـە نەخشـەکانی من پەسەند دەکەن ؟ لە ئاسۆی جیبالییـەوە و لـەنێو خەلیجـەوە بـە تووڕەیی تەماشـای ئەسـتەنبووڵم کـرد ، گۆمـەزەکان لـەژێر تیشـکی خـۆرە لـە ناکـاو دەرکەوتووەکـەدا دەبریقانـەوە . شـارێك چـەندە گـەورە و فـرە ڕەنـگ بـێ ، بـە هـەمان ئەنـدازەش گۆشـەیزیاتری هەیـە بـۆ شـاردنەوەی تاوانـەکان، چـەندە ژمارەی دانیشتوانی زۆر بێت بەهـەمان ئەندازەش دەتـوانین خۆمـانی تێکـەڵ بکەین و تێیدا نوقم ببین . پێویستە عەقڵی شارێك بە زاناکان و کتێبخانەکان

و وێنـەكێش و خۆشنووسـەكانیەوە مەزەنـدە نـەكرێ ، بـەڵكوو پێویـستە بـە پیـاو كوژەكـانی نـاو كولانەكانیـەوە پێوانـە بكردرێـت كـەوا سـەدان سـاڵە بـە فێڵبـازی و ساختەچێتیوە كۆلانـەكان بـەڕێوە دەبـەن بە پێـی ئـەم ژێربیریـە ئەستەنبوولْ ئاگاترین و هۆشیارترین شاری دونیایە .

لـەگوێ ئـاوی (ئـون قاپانیـدا) منـیش بـەدوای ڕەشـە و زاوەكـەیدا بــە ڕێوەبووم، شانیان دابوو بەیەكەوە و لەبەرە و ژووركەكەوە دەڕۆیشتن ، هـەر بەدوایانـەوە بـووم . لـەلای مزگـەوتی سـوڵتان موحەمـەدا ، بۆ جاری دوایـی ڕاوەستان و تۆزێ پێكەوە قسەیان كرد و لەیەك جیا بوونەوە ، زاوەی بە ڕێز تەنیا مایەوە ، بۆ ساتێك وەكوو پیرەمێردیكی هیچ لێنەهاتوو هاتە بەر چاوم ، بەهـەڕا كـردن خـومم پێگەیانـد و تۆمەتـەكانی ئـەو هەرچـی و پەرچییەم لێ پرسی و گوتم : "ئایا قسەكانی زەریف ئەفەندی ڕاستە كە گوتوویەتی ئەو وێنانەی وا دروستییدەكەین، بە لاڕی بردنی متمانـەی پادشـایە و خەیانەتـە لەبەرامبـەر دینەكـەمان و نـەریتی شـێوەكاریمان، ئایـا ئەمانـە ڕاسـتن ؟ وێنـە گەورەكەتان تەواو كرد ؟ "

1. بەرەو ئێوارە لە ناوەڕاستی كۆلانە بەفراویەكەدا ڕاوەستام ە تەماشـای ئەو مندالانەم كرد كەلەگەڵ باوكانیاندا بـەرە و مـاڵ دەڕۆیشتنەوە و سـەیری دوایـی ئـەو كۆلانـەم كـرد كـە مـن و جندۆكـە و فریشـتە و پەرییـەكان و جەردەكان و ڕێگرەكانی لە نێو تاریكیدا دەهێشتەوە ، لەو پـەڕی كۆلانەكـەدا لـەنێوانلق وپۆپەرووتەكـەیدارە كەسـتانەكەوە چـاوم بـە ماڵـە دوو قاتەكـەی زاوای بەڕێز كەوت ، لەژێر سەقفی ئـەو ماڵـەداجوانترین ژنـی دونیـای لێیـە ، بەلام من نامەوێ كە عەقڵم نەمێنێ و شێت ببم.

1- لێرەدا مەبەست خۆشەویستی پیاو و پیاو بەتایبەتی بووە کە لە باتی پیاو و ژندا جاران باوی هەبوو.
2- نەریتێکی کۆنە کە دوو پیاو وەکوو دووخۆشەویست و دەزگیرانی یەك لەگەڵ یەکدا هەڵسوکەوت دەکەن .

## (( من ، پارە )) (19)

ئاڵتوونی بیستو دوو عەیاری عوسمانیم ، نیشانەی پەناگای دونیا حەزرتی پادشام لەسەرە ، لە دوای نیژانی تەرمەکە ، یەکێك لە وێنەکێشە بەناوبانگەکانی پادشا کە ناوی لەق لەقە لە نیوە شەودا ، لێرە لەم قاوەخانەدا وێنەی دەکێشام ، بەڵام هێشتا ئاوی زێڕیان بەسەردا نەکردووم ، قەیناکا ئێوە خۆتان تەواوی کەن ، ڕوومەتم لێرەدایە ، بەڵام خۆم لە کاسەکەی برای وێنە کێشتان لەق لەقدام ، ئێستا هەڵدەستێ و لە کاسەکەدا دەرم دەخا و پیشانی ئێوەم دەدات ، مەرحەبا ! مەرحەبا ! ، سڵاو بۆ هەموو وەستا و میوانە بەڕێزەکان چاوەکانتان بە بریقەدانی من سێحراوی دەبێ . تیشکی چراکە لێمدەدات و دەگەڕێتەوە نێو چاوانتان و ئێوەش بەخیلچی دەبەنەوە بە لەق لەقی خاوەنی من، حەقتان پێدەدەم ، چونکە پێوانەی نەخش و هونەر هەر منم و لەمن زیاتر شتیتر نیە ، وەستا لەق لەق لە ماوەی سێمانگی ڕابردوودا چل وحەوت دانەی وەکوومنی قازانج کردووە ، بڕوانن لەق لەق چەلەبی نامانشارێتەوە و هەموومان هەر لە کاسەدا دادەنێت ، ئەوەش باش دەزانێ کە کەس زیاترلەو پارە وەرناگرێت . لەبەر ئەوەی لە نێو وێنەکێشاندا بەیەك پێوان پەسەند کراوم ، ڕێگا بە باسی بێجێگاوڕێگاله سەرمن نادرێت . زۆر شانازی بە خۆمەوە دەکەم . جاران کە

هێشتا فێری قاوه نەبوو بووم و مێشکم نەکرا بوو بووەوە ، وێنەکێشە بێ مێشکەکان لەگەڵ یەکدا لەسەر ئەوەی کێ هونەرمەندی ڕاستەقینەیە وکێ باش ڕەنگدەکا و کێ زۆر باش درەخت و هەور دەکێشێ باس و ئاژاوەیان دەکرد و بەوەش نەدەوەستانەوە و هەموو شەوێك شەڕیان دەکرد و ددانی یەکیان دەشکاند ، ئێستاش کە بەسەر هەموو شتێکدا ژێر بیری من زاڵە و لە سەر تەرتیبی کاری وێنە کێشخانەکەدا کاریگەری کردووە و ئاهەنگێکی باشی پێداوە، بگرە جوانی دەدا بە پەیکەری وەستا کۆنەکانی هەراتیش، دەتوانن زۆر شتم لەگەڵدا بگۆڕنەوە ، بۆ نموونە: کچە جوانکیلەیەکی خزمەتکار ، ئاوێنەیەکی دەلاکی کە لە دار گوێزەوە دروستکرابێ و ئەملا ولاکانیشی لە ئێسقانەوە دروستکرابێ، سندوقێك کە ناوەکەی جوان ڕەنگ کرابێ ، سەد و بیست نانی تازە ، بەشی سێ کەس تابووت و خۆڵی مەزار ، بازو بەندێکی ڕەساسی و یەك لە دەی ئەسپێك ، قاچ و قولەکانی پیرە ژنێکی خزمەتکار ، گوێرەکەیەك ، دوو قاپی باشی چینی ، یەك مانگ ڕۆژانەی دەروێش مەحموود و وێنە کێشە ئێرانیەکانی وەکوو ئەو ، هەروەها زۆر شتیتر کەنا ژمێردرێن .

بەر لەوەی بێمە ئێرە دە ڕۆژلە گۆرەوییە چڵکنەیەکی کوڕە بۆیاخچییەکدا بووم ، ئەو بێچارەیە هەموو شەوێك کومەڵێ شتی ڕیز دەکرد کە دەیتوانی بە من ئەنجامی بدات و ئەوسا خەوی لێدەکەوت، پارە وەکوو دێرە درێژەکانی لایە لایە شیرینە و دەتوانێ هەموو کونێکی پێبگرێتەوە . باسی کونم کرد و ئەوەم بیر کەوتەوە کە ئەگەر بەسەر هاتەکانی خۆم بەر لەوەی بێمە ئێرە باسبکەم دەتوانن دەیان کتێبی لەسەر بنووسن . خۆمان بە خۆمانین و ئەگەر بە کەسێکی نەڵێن و بۆ لەق لەق ئەفەندیشی باس

نەکەن نهێنییەکەتان  بۆ دەر دەکێنم ،سوێند دەخون یان نا ؟ باشە، دەچمە ژێر هەموو شتێك و خۆم دەدەم بە دەستەوە ، من ئاڵتوونێکی بیست و دوو عەیار نیم ، من پارەیەکی ساختەم و لە ونیزەوە هێناوومیان ، لەویٚ بە زێڕی هەرزان دروستیان کردووم و لێرەشدا بە نرخی زێڕی عوسمانی دەمفرۆشن.

زۆر سوپاسی هەڵۆێستە کەتان دەکەم . بەگوێرەی ئەو شتەی کەمن دەیزانم لە زەربخانەکەی وەنیزدا شتی وەها زۆر دەکرێت . هەتا ماوەیەکیش بەر لە ئێستا شتە هەرزانە کەم عەیارەکانی وەنیزیان دەهێنا و لێرەداو لە ڕۆژهەڵاتدا بڵاویان دەکردەوە . هەرلەوێشدا پارەی وەنیزیشیان دروستدەکرد ، چونکە عوسمانی‌یەکان ڕێزی تایبەتیان بۆ ئەو شتانە هەیە کە نوسراویان لەسەرە . کاتێك ئێمەشیان هێنا، کەس سەرنجی نەدەدایە زێڕەکەی دەروونمان و وەکوو زێڕی تەواو وەریان ئەگرتین، چونکە نووسراومان لەسەر هەبوو ، لە ماوەیەکی کورتدا تەواوی ئەستەنبووڵمان گرتەوە، لە دوایشدا وتیان ئەو پارەیەی وا زێڕی کەم بێت و مسی زیاد بێت ڕەقترە.بەڵام هەرچی بێت بە بیٚ پارەهیچ ناکرێت ،بۆ نموونە بەرەولای ئەو مەحمودە جوانکیلەیە هەڕا دەکەی کە هەموو جیهان عاشقیەتی و تۆش لە ئاگری عەشقیدا دەسووتی ،بەڵام بەر لەوەی تامی بکەی پارەکەت لێوەردەگریٚ ودوایی گازی لێدەگرێت ،لەوەش زیاتر لە باتی سەعاتێك نیو سەعات ڕێگات پێدەدات .

کاتێك کافیرە وەنیزیەکە چاوی بە ئەنجامە خراپەکانی ئەم پارەیە کەوت وتی : با ئاڵتونی ساختەی عوسمانی دروستبکەم خۆ ئەمانە پێی نازانن . ئێستاش سەرنجتان بۆ سەر ئەم وەزعە ڕادەکێشم، ئەم گاورە وەنیزییە کاتێك دەست بە کێشانی وێنە دەکات وادەزانیٚ ڕاستینەی شتەکان

دروستدەكات، بەڵام كاتێك پارەش دروستدەكات ڕاستەقینەكەی دروستناكات بەڵكو ساختەكەی دروستدەكات .

لە وەنیزدا ئێمەیان خستە ناو سندوقێكی ئاسنینەوە و سواری كەشتیان كردین ، بە لەقەلەق گەیشتینە ئەستەنبووڵ ، خۆمم لە دوكانێكی كابرایەكی سەڕافدا بینیوە كە دەمی بۆنی سیری لێوە دەهات . تۆزێك چاوەڕێ بووین و نەبووین كە گێلێكی لادێیی هات بۆ گۆڕینەوەی زێڕ . فێڵبازی كوڕی فێڵباز ! كاكی وەستای سەڕاف گوتی بابزانم زێڕەكەت ساختەیە یان نا، بمدەیە با گازێكی لێبگرم و ئاڵتونی گوندییەكەی خستە دەمی خۆی . لەدەمی كابرای سەڕافدا ڕووبەڕی ئاڵتونی گوندییەكە بوومەوە ، زێڕی بیست و دوو عەیاری عوسمانی بوو، لە نێو بۆنی سیرەكەدا منی بینی و گوتی :" تۆ دروستكراو و ساختەی !"

حەقی خۆی بوو ، بەڵام كە بە لەخۆبایی‌بوونەوە گوتی، شەرەفی منی تێكشكاند . لە بەرامبەردا درۆمپێگوت و وتم : " خۆت ساختەی ! " لەم بەینەشدا گەوجە لادێیەكە وتی : " پارەی من ساختەنیە ، ئەوە بیست ساڵ دەبێت كە لەژێر خۆڵدا شاردوومەتەوە . ئەو كاتانە بێڕەووشتی لەم چەشنە نەبوون "، بە لە خۆبایی‌بوونەوە وتی:" منیش نەمدەزانی چییە و مەراقیشم دەكرد ".سەڕاف منی لە دەمی خۆی دەری هێناو وتی : " بگرە ئەوە ئاڵتونەكەتە ، ئەمە پارەی دروستكراوی وەنیزییە هەرچی و پەرچییەكانە .شەرم لە خۆت ناكەی؟ بێ‌ئەخلاق!" و لە گوندییەكە تووڕە بوو قیڕاندی بە سەریدا .

ئەویش تۆزێك وەڵامی دایەوە ومنی هەڵگرت و ڕۆیی . كاتێ هەر ئەو قسەیەی لە سەڕافەكانی تریشەوە بیست دڵی شكاو وەكوو ئاڵتوونی كەم و

شکاو منیگۆڕیوە بە ئاکچە ، ئەوە حەوت ساڵە لەم دەست بۆ ئەو دەست دەگەڕێم و بەم شێوەیە گەشتە بیٚ کۆتاییە کانم دەست پێکرد . وەکوو پارەیەکی ژێر زۆربەی کاتی خۆمم بۆ گەڕان لەم کاسەیە بۆ ئەویتر و لەم پشتوێنەوە بۆئەو گیرفان تەرخان کردووە وشانازی بەمەشەوە دەکەم . ترسم ئەوەیە کە بمخەنە ناو گۆزەیەکەوە و لە ناو باخچەیەکدا لە بن بەردێکدا بمشارنەوە و سالأنێك وەها بمێنمەوە ، ئەگەر بڵێم لەم جۆرە بەسەر هاتانەم بەسەردا نەهاتووە وانیە بەلأم نازانم لە بەر چیە کە ئەم دەورە دڵتەنگکەرانە زوو تەواو بوون .

ئەوانەی وا منیان کەوتووەتە دەست بە تایبەت ئەوانەی وا زانیویانە کە من پارەی دروستکراوم ویستویانە زووتر لە من ڕزگاریان ببێت . تا ئێستا ڕوو بە ڕووی کەسێك نەبوومەتەوە کە بە کڕیارە بیٚعەقڵەکانم بڵیٚ ئەمە زێڕێکی دروستکراوە ، بەلأم ئەوانەی لە دواییدا تێدەگەن کە من زێڕێکی دروست کراو و ساختەم ، لەو قۆڵبڕینە تووڕە دەبن و دەیانەویٚ بە زووترین کات لێم نەجاتیان ببیٚ و لە بیٚئومێدی و بیٚئوقرەییوقەیراندا ژیان دەبەنە سەر . بەدەیان جار دەیانویست قۆڵی یەکتر ببڕنەوە و من بدەن بە یەك( بەلأم لەبەر تووڕەیی و پەلە پەل کردنیان سەر نەکەوتوون ) ، هەمیشە بەو کابرایەی وا قۆڵی خۆیانی بڕیوە دەڵێن : هەی بیٚڕەوشت ! و پڕ بە دڵی خۆیان جنێوی پێدەدەن . لەم پێنج ساڵەی دوایدا پێنج سەد و شەست دەستم گۆڕیوە و دوکان و مزگەوت و کڵێسا نەماوە کە نەڕۆیشتبم، هەر چی زیاتر دەگەڕێم ئەو قسانە زیاتر دەبیسم کە لەسەر من دەکریٚ و زیاتر ئاگام لەو درۆ و دەلەسە و ئەفسانانە دەبیٚ کە سەبارەت بە من دەگوتریٚ ،ئیدی هیچ بایەخێکم نەماوە چاوەکانیشم کوێر بوون،منیش حەز بە پارە دەکەم

بەڵام مەخابن !

ئەو دونيايە لەسەر من بەندە ومنيش دەتوانم هەموو شتێك بكڕم كەچی بەبێ ڕاوەستان پيساوی و دڵنزمی و سووكێتيەكانم لە نێو چاوانم دەدەنەوە . ئەوانە كاتێ دەزانن من زێرێكی دروست كراوم ، زۆر تووڕە دەبن و شتی خراپم پێدەڵێن كە ئەوەش نرخی ڕاستەقينەم دادەخات و هەر ئەوەش دەبێ بە هۆی بەرز بوونەوەی نرخی درۆينەم . بەڵام لەگەڵ هەموو ئەم درۆ كاری و خۆ بەدەستەوەدانە بێعەقڵانەوە ديسان خەڵك زۆر خۆشيان دەوێم وبڕوام وايە كە حەز كردنێكی لەم شێوەيە كە هەمەگير و بەر بڵاوبێت شتێكە كە لەم زەمانە بێخۆشەويستيەدا هەموو كەسێك خۆشحاڵ دەكات .

كۆڵان بە كۆڵان و گەڕەك بە گەڕەكی ئەستەنبووڵم بينی و دەستی جوولەكەو ئاباز و عەرەب و مينگەريشم ناسی، جارێك لە كاسەی ماموٚستايەكی ئەديرنەييدا بووم و بەيەكەوە لە ئەستەنبووڵ دەر كەوتين و ڕۆيشتين بۆ مانيسا. لەرێگادا جەردەكان ڕێگايان لێگرتين و هاواريان كرد و گوتيان يان دەبێ گيانتان بدەن يان ماڵەكانتان. ماموٚستای بێچارە بەپەلەپەل و هەڵچوونەوە لەناو كونی دوايی جانتاكەيدا ئێمەی شاردەوە . ئێرە لە دەمی ئەو كابرايەی وا بۆنی سيری لێوە دەهات خراپتر بوو تەنانەت جێگاكە تەنگتريش بوو ، بەڵام لە دواييدا شتێكی خراپتريش بوو و جەردەكان گوتيان يان دەبێ بتانكوژين يان وەكوو دەبێ لەگەڵتاندا جووت ببين و ... لە دواييدا ماموٚستا و كەسيتريشيان ڕيز كرد و ... !

با باسی ئەوەتان بۆ نەكەم كە لە نێو ئەو كونە تەنگەدا ئێمەش چيمان بەسەر هات!... هەر لە بەر ئەوە حەزم لەوە نەدەكرد كەئيدی لە ئەستەنبووڵ دەركەوم ! لە ئەستەنبووڵدا هەميشە حەزيان لێدەكردم و وەكوو مێردی ناو

خەیاڵەکانی کچێك ماچیان دەکردم و لە نێو کاسە و ژێر سەر و نێو سینە و شۆرتەکانیاندا دەیانشاردمەوە لە نێو چەکمەیەکدا و لە پاڵ ئۆجاخی حەمامدا ولە دوکانێکی عەتر فرۆشدا و لەبنی شووشەیەکدا و لەگیرفانە شاراوەکەی کابرایەکی ئاشچیدا خۆمم شاردۆتەوەو لەنێو پشتوێنی چەرمدا لەگەڵ کرِیارە مسرییەکاندا و لە ناو پێڵاوەکاندا و لە گیرفانە شاراوەکاندا لە کوڵانە تەنگەکاندا، تەواوی ئەستەنبووڵ گەرِاوم . وەستا ( پەترۆی ) سەعاتچی لە بەینی کاتژمێرێکدا و دوکاندارە رِۆمییەکەش لەبنی زەرفی پەنیرێکدا دەیانشاردمەوە . لەگەڵ زێرِ و ئاڵتوونەکانیتردا لەگەڵ مۆر و کلیلەکاندا خۆمان دەپێچایە چوغەی دەلاقەکان و لە نێو ئۆجاخەکان و لەژێر پەنجەرە و دۆشکە دروستکراوەکان و جێگا نهێنیە کانیدۆڵابەکان و سندوقەکاندا خۆمم شاردۆتەوە . چاوم بەو باوکانە کەوت کە لە سەر سفرەی خواردندا ئارامیان نەدەگرت ودوا بەدوای یەك چەند جار سەردانی منیان دەکرد ، ئەو ژنانەشم بینی کە بە بێ هیچ پێویستیەك وەکوو شەکەر دەیانخستمە ناو دەمیانەوە و مناڵی واشم بینیوە بە جۆرێك بۆنی دەکردم کە خەریك بوو بچمە ناو لووتیەوە ، هەروەها چاوم بەو پیرە مێردانەش کەوتووە کە پێیان لە ناو قورِدا بوو و تا رِۆژی حەوت جار لە کاسە چەرمینەکانیاندا تەماشای منیان نەکردبایە ئۆقرەیان نەدەگرت .

ژنە گورجوگۆڵەیەکی چەرکەس هەبوو کەلە دوای ئەوەی هەموو رِۆژی ماڵی خاوێن دەکردەوە ، ئێوارانیش ئێمەی دەماڵی و پاکی دەکردینەوە ، سەرافێکی یەك چاو هەمیشە دەیخستینە سەر یەکەوە ، حەماڵێك هەبوو، بۆنی گیا لە دەستەکانیوە دەهات، لەگەڵ ژنەکەیدا وەکوو ئەوەی تەماشای دیمەنێکی جوان بکەن سەیریان دەکردم . جوانکارێکی شێوە کاریش کە

ئێستا لە نێوماندا نیە ــ پێویست نیە ناوی بەرم ــ هەموو شەوێك بە بەزم و تەرتیبێکەوە ڕێکی دەکردین .تەنانەت بە دەمپایشەوە گەڕاوم و چوومەتە ناو کۆشکەکان ، لە نێو کتێبێکی هەراتییەکان و تۆپی ئەو پێڵاوانەدا وا بۆنی گیایان لێوە دێت ئەملاوئەولام کردووە و لەسەر زینی ئەسپدا خۆمم شاردۆتەوە . زیاتر لە پەنجا ڕوومەتیپیس و مودار و خڕۆڵە و چەور و لەرزۆکم بینیوە . لە دانیشتنی بەنگکێشان و لە مۆمخانەدا ماومەتەوە و بۆنی ماسی کوتراو و ترێی ئەم شارەم بە لووتدا هاتووە . کەچی سەرە ڕای ئەم هەموو بەسەر هاتانە ، ئەو پیاوکوژە ناکەسە کە کابرایی سەر بڕی و منی خستە گیرفانی خۆی پێی گوتم : " تف لێت ! ئەمە هەمووی لەبەر تۆیە " . بەراستی زۆرم پێناخۆش بوو . دەمەویست تەفر و توونا ببم ونەمێنێم، بەڵام ئەگەر من نەبم کەس ناتوانیٚ نەخشی باش و خراپ لەیەك جودا بکاتەوە و وێنەکێشەکانیش بەردەبنە گیانی یەك ، هەر بۆیە خۆمم ون نەکرد و ڕۆیشتمە ناو کاسەی هونەرزانترین و ژیرترین شێوەکار و هاتم بۆ ئێرە .

ئەگەر بڕواتان وایە کە لە لە شێوەکاریدا لە ئەو باشترن ، دەفەرموون ومن بخەنە ناو دەستی خۆتان .

# (( ناوم ڕەشەیە )) (20)

باوکی چەندە ئاگای لەو نامانە هەبوو بوو کە من و شەکورە دەماننارد بۆ یەکتری ؟ ئەگەر سەرنجم بدایەتە سەر ئەو نامانەی وا وەکوو کچێکی بیٚزاور کەلە باوکی دەترسیٚ نوسیبووی، دەبوایە بگەیشتمایەتە ئەو ئەنجامەی کەوا لە بەینی خۆیاندا بچووکترین قسەیەکیشیان لە سەر من نەکردووە . بەڵام لە هەمان کاتیشدا وا هەستمدەکرد کەوەزعەکە ئاوەهاش نیە .لە چۆنیەتی هەڵسوکەوتی من لە بەرامبەر دیاربوونە سیحراوییەکەی شەکورە لەبەر پەنجەرەکە و بێچارەیەکەی خۆم لە ژێر نیگا فێڵاوییەکانی ئەستەر ورەفتارم لە بەرامبەر پێداگری زاواکەمان بۆ ئەوەی کە سەردانی وێنەکێشان بکەم و ئەوەی کە ئەمڕۆ بانگی کردم ، ئەوە دەردەکەوێت کەمن

کەسایەتیەکم کە زوو هەڵدەچم .

بەیانی زاواکەمان لە بەرامبەر خۆیدا دانیشاندم و داینەنیشاندم ، یەکسەر باسی وێنە کەسییەکانی وەنیزی بۆ کردم و باسی ئەوەشی بۆ کردم کە بە سیفەتی باڵوێزی، جێگا و کۆشك و ماڵی دەوڵەمەندەکان و کڵێساکانی ئەوێی بینیوە و لە بەرامبەر هەزاران وێنەی کەسیدا بە ڕۆژان ڕاوەستاوە و تەماشای کردوون ، لە سەر قوماشی ڕاکێشا و، لەسەر تەختەیەك یان لە نێو چوار چێوەیەکی گەورەدا یان وەکوو لەسەر دیوارێکدا وێنەی هەزاران ڕوومەتی بینیوە ، کە هەمووی وێنەی تاکەکەسی جیاوازتر لەیەك بوون ! دەیگوت خۆشی وجوانی ئەم وێنانە لە جۆرا و جۆری و ڕەنگەکانیان و تیشکەنەرمەکەی سەریان تەنانەت لە شێوەی ڕەقبوونەکانیانیشەوە دێت وگوتی: " نەڵێیدروستکردنی وێنەی کەسی نەخۆشیەکی هەمەگیرە ! هەموو دەوڵەمەند و پیاوە بە هێزەکانی وەنیز بۆ ئەوەی یادگارییەکی ڕابردوویان بۆ بمێنێتەوە ئاوەها وێنەی خۆیانیان کێشاوە لە لایەکیتریشەوە ئەمە نیشانەی دەوڵەمەندی و دەسەڵاتداریانە ، ئەوەش بۆ ئەوەیە کە هەموو کات لە بەرامبەرماندا ڕاوەستن و وەها دیار بکەن کە لە هەموو کەسێك جیاوازترن ".

وەکوو ئەوەی کە باسی بەخێڵیبردنەوە و تەماکاری و زۆرخوازی بکات ، وشەکانی بە زمانی بچوککردنەوە وتەحقیرەوە بەکار دەهێنا ، بەڵام کاتێك باسی وێنەی کەسی وەنیزییەکانی دەکرد ڕوومەتی وەکوو منداڵێك ڕۆشن دەبووەوە و پڕدەبوو لە ژیان و دەیگووت :" ئەوشازادە دەوڵەمەند و بنەماڵە گەورانەی وە لایەنگری وێنەکێشی بوون هەموو هەلێکیان بۆ کێشانی وێنەی خۆیان بەکار دەهێنا ، بۆ نموونە ئەگەر بەسەر دیواری کلیسەوە

وێنەی ئەنجیلیان کێشابایە ، لەپاڵ ئەوەشدا وێنەی خۆیان ئەکێشایەوە ،بۆنمونە ئەگەر سەیری وێنەی نیژانی (عەزیز ئیستەپاند) بکەی لەنێو ئەو جەماوەرەدا کە دەگرین چاوت بە یەکێك لەو شازادانە دەکەوێت کە لە سەردیواری کۆشکەکاندا وێنەی کێشراوە .

یان ئەگەر تەماشای وێنەی نەخۆشەکانی پاڵدەستی (عەزیز پەترە )تان بکردایە ، لەپاڵ ئەو بێچارەیەی والەتاو ئازاردا بە خۆدا پێچدەخواتەوە ،بەرازەکەی برایتان دەبینی . ئەگەر ڕۆژی دواتریش تەماشای وێنەی زیندووبونەوەی مردووەکانتان بکردایە ، چاوتان بەو پیاوە قەڵەوە دەکەوت وا دوێنێ لەسەر مێزەکە لە تەنیشتانەوە نانی دەخوارد ."

وەکوو ئەوەی کە ترسی شەیتانی لەدڵدا بێ قسەی کرد و وتی :" هەندێکیان زۆر بێتامیان کردبوو ، تەنیا بۆ ئەوەی وێنەیان بکێشین حازربوون وەکوو خزمەتکارێك کە پەرداخێك وسیکی پڕ بکات یان وەکوو ژنێکی قەحبە، یان وەکوو بێبەزەییەك کەوا قەحبەیەك بەردباران بکات یاخود وەکوو پیاو کوژێکی خوێنخوار وێنەی بکێشرێت" .

بەنا بە دڵییەکەوە گوتم : " وەکوو ئەوە وایە کە چاومان بە وێنەی شا ئیسماعیل بکەوێ لەسەر تەختەکەی کەوا بەدەستی وێنەکێشە ئێرانییەکانەوە دروستکرابێ ، یا خود وەکوو ئەوە وایەکە لە وێنەی خەسرەوشیریندا چاومان بە وێنەی تەیمور بکەوێت و ئاسوودە ببین . "

لەناو ماڵەوە دەنگی جیڕە جیڕێك دەهات یان نا ؟...

لە دواییدا زاواکەم وتی : " ئەڵێی ئەم وێنە فەرەنسییانەیان بۆ ترساندنی ئێمە دروستکردووە . بە تەنیا بە دەوڵەمەندی و هێزەوە ئێمە ناترسێنن ، بەڵکوو لە لایەکیتریشەوە دەیانەوێ ئەوەمان پێبسەلمێنن

کەمانەوە لەم دونیایەدا وەکوو شتێکی تایبەت و ڕازدارە . دەیانەوێ وەها نیشانبدەن کە چاوەکانی ئەو ڕوخسارە بێهاوتایانە و وەستاکانیان و هەر جوولانەوەیەکیان سێبەری بوونەوەرێکی نهێنی دارن و بەم شێوەیەش ئێمە بترسێنن . جارێکیان لە گوێی بەحری کۆمۆدا باسی ئەوەیان بۆ دەکردم کە چۆن سەر شێتێکی خاوەن مەراق لە گەنجینەی کابرایەکی دەوڵەمەنددا ، وێنەیەك دەدزێ، ئەو تابلۆیە وێنەی ڕوخساری پاشاکان و کاردنیالەکان و سەرباز و شاعیرەکان وهەموو پیاو ماقوولانی فەڕەنسەی تێدابووە . هەڵبەت ئەمە لە کاتێکدا بوو کە من خۆم داوام لێکرد بوو کە تۆزێك بگەڕێم و کابرای خاوەن ماڵیش لەبەر میوانداری ڕێگای پێدا بووم . ئەم وێنانە کە زۆربەیان لە ڕاستی دەچوون و زەق زەق تەماشای نێو چاوانمیان دەکرد . بە قسە، هەموو پیاو ماقوولانی وەنیز بوون . بەلام تەنیا جێگایەکی زۆرتر لە دونیادا دەگرنەوەو هیچیان ماقوول نین . شتێکیان لەو وێنەیەدا کێشا بوو کەوای لێدەکردن بێهاوتابن ، تەنانەت منیش لە بەرامبەر ئەوانەدا خۆمم پڕلە کەموکووڕی دەبینی و ئەگەر هۆی هەبوونی خۆشم لەم دونیایەدا بکێشمەوە ئەوا باشتر لێی تێدەگەم ".

دیارە لەوەی وا تێبگات کە شێوەکاری لە دونیای ئیسلامدا بە دەستی وەستا هەراتیەکانەوە بە هێز بووەوئەمڕۆش بە زیاد بوونی مەراق و داخوازی وێنە کەسییەکان لە ناو دەچێ ، ترساوە .

لە بەردەوامدا گوتی : " دەمەویست وەها دیار بکەم کەلە هەموو کەس جیاوازترم و نموونەم نیە ". بەم شیوەیەش وەکوو ئەوەی کەوا شەیتان هەموومان بەرە و تاوان دەبات ، ئەویش تێگەیشتووە کەوا بە هێزەوە بەرە و ئەویدەچێت .

گوتی : " نازانم چۆن بوو ، ئەمە وەکوو داواکارییەکی تاوانبارانە بوو ، وەکوو ئەوەی کەوا خۆت لە بەرامبەر خودادا بەگەورە بزانی و خۆتت پیٚگرنگ بیٚ و خۆت بە مەرکەزی هەموو دونیا بزانی ، شتێکی ئاوەها بوو . لە دواییدا ئەمە گەیشتە عەقڵم کە ئەو شتەی وا وەکوو یاریچەیەك کەوتووەتە دەستی شێوەکارە فەرەنسییەکان، ئەگەر بکەوێتە دەستی پادشاکەمان دەیخاتە خزمەتی دینەکەما".

هەرلەم کاتەدا بیری دروستکردنی کتێبێك کە وێنەی پاشاکەمان و ئەو شتانەی تێدابیٚ کە نوێنەرایەتییان دەکات دەکەوێتەمێشکیەوە . هەر بۆیە کاتیٚ گەڕاوەتەوە ئەم پیشنیارەی بۆ پادشاکردووە و گوتوویەتی ، ئەگەر بە پێی نەریتی ڕۆژ ئاواییەکان ئەم کتێبە ئامادە بکرێت زۆر باش دەبێت ، پادشاش هەرلە سەرەتاوە ڕەتی نەکردۆتەوە وگوتویەتی : " شتی بنەمایی داستانەکەیەتی ، وێنەیەکی جوان بە ناسکییەوە داستانێك تەواو دەکات . کاتیٚ بیر لە ڕەسمێك دەکەمەوە کە داستانەکەی تەواو ناکات وەکوو بۆتێك دێتە بەر چاوم . لەبەر ئەوەی بڕوا بە وێنەیەکی بیٚ داستانیش ناکەین ئەو کاتە بڕوا بەو ڕەسمە و بەو شتانەدەکەین کە داستانیان هەبێت.ئەمەش وەکوو بۆتپەرەستییەکەی مەکە بووە بەر لەوەی پێغەمبەر بۆتەکان بشکێنیٚ . بۆ نموونە ئەگەر ئەو مێخەکە ، یان ئەو بەدبەختی باڵا کورتە بەشێکی داستانێك نەبن چۆن دەتوانین وێنەیان بکێشین ؟ جوانی گوڵە مێخەکەکە بیٚهاوتاییەکەی نیشان ئەدات ، بەڵام ئایا لە دواییدا لە کاتی کەڵەکەکردن و داڕشتندا دەیخەنە ناو مەرکەزی شتەکانەوە ؟ "

زاواکەمان گوتی : " دەترسم ! بۆ ساتێك بیرم لە خوم کردەوە کە لە جێگای پادشادام و لە بەر ئەوەش تووشیهەڵچوون و پەشۆکان بووم " .

بەمجۆرەش زانیم  زاواکەمان لەوە دەترسێت کە شتێك زیاتر لە نیەتی خودا لەناوەندی لاپەڕەکاندا جێگیر بکات .

پادشا گوتویەتی : " لە دواییدا ئەو وێنەیەی وا کورتە بالاکەت خستۆتە نێوە ڕاستی هەڵیواسە !"

وەکوو ئەوەی وابیرم دەکردەوە ، بە ڕاستی زاواکەم ترسا بوو .

پاشالە بەردەوامیدا گوتویەتی :  " بەلاّم ڕەسمەکە هەڵنەواسیت ، چونکە بتەوێ و نەتەوێ کاتێك هەڵتواسی پێویستە بیپەرەستی . ئەگەر وەکوو گاورەکان بڕوام بە خودایی حەزرەتی عیسا بکردایە وە وەها بیرم بکردایەتەوە کە خودا لە شێوەی مرۆڤێکدا دیار دەبێت ئەوسا ئەمتوانی کە هەڵواستنی وێنەکە پەسەند بکەم . ئەگەر وێنەیەك هەڵواسم لە دواییدا بەبێ ئەوەی کە هەستی پێبکەم بەناچاری دەیپەرەستم ، خۆ تێدەگەن ؟ "

زاواکەشمان گوتویەتی : " باش تێدەگەم " . لە بەر ئەوەی کە منیش لەوە تێدەگەیشتم ، زۆر لەو شتە دەترسام کەهەردووکمان بیرمان لێدەکردەوە . زاواکەمان بە بزەیەکەوە وەکوو شەیتان چپاندی بە گوێمەوە و گوتی : "بەلاّم ئەمەشی دەویست ! "

لە دواییدا پادشا گوتویەتی : " بەلاّم دەمەوێ بەپێی نەریتی ڕۆژ ئاواییەکان وێنەیەکم بکێشرێت و پێویستە ئەوەش لە لاپەڕەکانی کتێبێکدا بشاردرێتەوە ، دەبێ تۆش بڵێیت کە ئەو کتێبە چی بێت . "

زاواکەمان گوتی : " بۆ ساتێك سەرم سووڕما و کەوتمە ناو تاریکاییەوە . "

لە دوایشدا وەکوو پێکەنینە شەیتانیەکەی پێشووی خۆی بزەیەکی‌تری لێدا . منیش بۆ ساتێك وا هەستمکرد کە زاواکەمان دەگۆڕێ و دەبێ بە

کەسێکیتر.

گوتی : " حەزرەتی پاشاکەمان فەرمووی پێویستە بە زووترین کات کتێبەکە دەست پێبکردرێت . لە دڵخۆشیدا سەرم گێژ دەچووکە پادشا گوتی :لە دواییدا ئەو کتێبە وەکوو هەدیە دەبەیتە لای دۆچەکەی وەنیز و پێیدەدەی." پێویست بوو کە لە سەر کتێبەش مێژووی کۆچی لێبدرێ بۆ ئەوەی کە نیشانەی شکۆداربوونی پادشای ئیسلام بێت . بەڵام بۆ ئەوەی کە وەنیزییەکان وا نەزان کە ئێمە ئامادەی پەیمان بەستنین و لەناو وێنەکێشخانەکەدا ئاگری بەخیڵیبردنەوە گوڕتر نەبێ ، داوای کرد کە کتێبەکە بە نهێنیەوە دروستبکرێت ، بۆیە منیش بە دزیوە خەریکی دروستکردنی وێنەکان بووم ".

## (( من زاواتانم )) (21)

بەم شێوەیە بەیانی ڕۆژی هەینی باسی ئەوەم بۆ کرد کە ئەو کتێبەی وا ڕەسمی پادشای تێدەخەین ، چۆن کتێبێکە و چی لێدێت . خاڵی دەست پێکردنەکەیشم ئەوە بوو کە چۆن بۆ پاشام گێڕاوەتەوە و چۆن بۆ دروستکردنی کتێبەکە پادشام فریوداوە . مەبەستەکەشم ئەوە بوو ئەو

داستانانەی کە دەبێ لە پاڵ وێنەکاندا بنووسرێ و منیش نەمتوانیوە تا ئێستا هیچیان بنووسم ، بدەم بە ڕەشە بۆ ئەوەی کە بیاننووسێ .

وتم : " زۆربەی وێنەکانم کێشاوەتەوە ، وێنەی دوایش بەرەو تەواو بوون دەچێت . لە کتێبەکەمدا وێنەی مەرگ کێشراوە ، بۆ ئەوەی کە پادشا جێگایەکی پڕلە ئاسوودەیی نیشانی خەڵك بدات وێنەی دارێکم تێخستووە کە بە شێوەکارە ژێرەکەم ( لەق لەق )م گوتبوو بیکێشێ ، شێوەی شەیتانیشی تێدایە ، وێنەی ئەو ئاسۆیەکی تێدایە کە بەرە و جێگایەکی دوورمان دەبات ، هەموو کاتێك وێنەی سەگێکی فێڵباز و فرەزانی تێدایە ، پارەی تێدایە ...."

بە ڕەشەم گوت : " ئەمانەم دابوو بە شێوەکارانی وێنەکێشخانە کەبیانکێشن ، بڕوا بکە ئەوەندە جوان کێشاویانە کە ئەگەر تەماشایان بکەی یەکسەر دەزانی کەدەبێ نووسراوەکانیان چیبێ ، شێعر و وێنە ، ڕەنگ و وشە هەموو برای یەکن،خۆ خۆت باش دەزانی ." ماوەیەك بیرم لەوە کردەوە کە پێی بڵێم ئەگەر کچەکەمت پێبدەم لەمماڵەدا لەگەڵماندا دەمێنێیتەوە یان نا ؟ لە دوایشدا بە خۆمم گوت تەماشای ئەوە مەکە کە ئێستا گوێڕایەڵیت دەکا و فریوی ڕوخسارە مندالأنەکەشی مەخو ، ئەمە دەیەوێ شەکورە هەڵگرێ و هەڕا بکات .

لە نوێژی هەینی گەڕاینەوە و گوتم خاڵی بە یەکگەیشتنەوەی هەموو وەستا وەنیزییەکان لە سێبەری وێنەکانیاندایە .

وتم : " پێویستە وەکوو ئەو وەستا ڕۆژ ئاواییانە کە وێنەکانمان دەکێشین ، ئێمەش بتوانین ئەو شتەی لە ناو کۆڵانێکدا زیاتر دەبینرێ بیکێشین و فێری ئەوەش ببین کە سێبەرەکەی تێدا جێ بکەینەوە ". ڕەشە

پرسیاری کرد و گوتی : "چۆن دەتوانرێ سێبەر بکێشرێ ؟" جارجار چاوم بە نائارامی و بێ‌سێبەرییەك لە ڕوخساری ئەم خوشکەزاگەمدا دەکەوت کە گوێی لێڕادەگرتم . یاری بەو جامۆڵکە مەغوولییە دەکرد کەوا خۆی هێنا بووی ، جارجاریش دەستی لە ئاسنی ئۆجاخەکە دەدا و ئاگردانەکەی تێکدەدا ، جارجاریش وەها خەیاڵم دەکرد کە دەیەوێت ئاسنەکە هەڵگرێت و لە تەوقی سەرمی بدات .

وتم : " لە بەر ئەوەی کە دەمەوێ لە ژێر نیگاکانی خودادا خۆم بدزمەوە ، بە ئارەزوی خۆمەوە دەمەوێ خەیانەت بە نەریتی پێشینەی وێنەکێشان و وەستا هەراتیان بکەم و پادشاکەشم بۆ ئەمە هەڵخەڵەتاندوە ". جار جارادەنیشت و بۆ ماوەیەکی درێژ بە بێئەوەی کە چاو بپرتێنێ تەماشای نێو چاوانمی دەکرد ، وامدەزانی کە لە دڵی خۆیدا دەڵێ کچەکەشت لێدەستێنم و دەبم بە کۆیلەشت . وەکوو چۆن لەمنداڵیدا جارجار وامدەکرد ، دەستیم گرت و بردمە ناو باخچەکە و وەکوو باوکێك باسی لۆژیکی توانەوەی بەفر و هەبوونی دار و پەلەکانی و تیشکی هەتاو و بچووك دیار بوونیماڵەکەم لەدەرەو بۆ کرد ، بەڵام ئەو کارەی کە دەمکرد زۆر هەڵە بوو ! هەر ئەم ماوە کورتە ئەوەی پینیشاندام کەئەوجۆرە پەیوەندی باوکی و کوڕییەی کە لە نێوانماندا هەبوو نەماوەو لەناو چووە . ویستی زانخوازی کاتی منداڵی نەمابوو ، لە باتی ئەوەدا وەکوو ئەوەی کە سەبری هەبێ و گوێ بۆ ناماقوڵی بگرێ و فلْتەفلْتی خلْەفاوێك ببیسێ کە دڵی بە کچەکەیەوە بێ ، ئاوەها گوێ بۆ من ڕادەگرت . دوانزە ساڵ گەڕان بەم وڵات و ئەو وڵات و قورسایی شارەکان، ڕۆحی خوشکەزاکەمی وشك کردبوو،بۆیە لە منیش ماندوو بووبوو، بەزەییم پێداهاتەوە ، پێموایە ئەمە تەنیا لەبەر ئەوە نیە کە

دوانزه ساڵ بەرلە ئێستا کچەکەم پێنەدابوو ، بەڵکوو لەبەر ئەوەش بوو کە من هەمیشە دەمەوێت لە نەریتی وەستا ئەفسانەییەکان و وێنەکێشە موسوڵمانەکان دەرچم و خەیاڵم وایە کە شتی تازە بخولقێنم . دەزانم کین و نەفرەتی زۆری لێم هەیە . وەهاش بیر دەکەمەوە کە مردنەکەم لە داهاتوودا بە دەستی ئەوەوە دەبێ . بەڵامْ لێینەدەترسام و بە پێچەوانەوە من ئەوم دەترسان ، ترساندنەکەش ئەوە بوو کە داوام لێکرد نووسراوەکەم بۆ بنووسێ.رەشە بۆ ئەم کارە زۆر لەبار و گونجاو بوو . وتم : " پێویستە مرۆڤ وەکوو واتا خۆی بخاتە ناوەندی وێنەکانەوە . یەکێك لە وێنەکێشەکانم شێوەی مەرگی زۆر جوان کێشاوە، حەز دەکەی سەیری بکەی ؟ " بەمجۆرەش ئەو وێنانەم پێنیشاندا کە شێوەکارەکانم لە ماوەی ساڵێکدا بە دزیوە کێشابوونیان . سەرەتا شەرمی دەکرد تەنانەت تۆزێکیش دەترسا ، کاتێ کە بینی مەرگەکە بە ئیلهام وەر گرتن لەدوو داستانی شانامەکێشراوە کە یەکێکیان سەربڕانی سیاوەش بە دەستی ئەفراسیابەوە وئەویتریش کوژرانی کوڕەکەی ڕۆستەم بە دەستی ڕۆستەم بە نەزانینەوەیە ، ئەو سا کرایەوە و کەوتە ناو باسەکەوە . ئەم وێنەیە بەو ڕەنگە ماقووڵانە خەماوییەی وا لە وێنەی جەنازەکەی سوڵتان سولەیماندا بە کار براوە ڕەنگکراوە و داڕشتنەکەی بە پێی چەمکی ڕۆژئاواییەکان و بە قەڵەمی خودی خۆشم هەندێك سێبەرکاری تێدایە . ئاماژەیەکم کرد بە خەتی ئاسۆو تێکەڵبوونی هەورەکان و قووڵاییە شەیتانیەکەی . ئەوەشم وەبیر هێنایەوە کە وا لە بەر ئەوەی تایبەتن و بە پێی نەریتی ڕۆژئاواییەکان کێشراون هەر یەکە و کەسایەتی تایبەت بە خۆیان هەیە .

وتم : " دەیانەوێ ئەوەندە بێهاوتابێ کە مرۆڤ لە مەرگ نەترسێ بەڵکوو

لە ویستی جیا بوونەوە و جیاواز بوونەوە بترسیٚ ، تەماشای ئەم ویٚنەیە بکەو داستانەکەی بنووسە ، مەرگ قسە دەکات ! ئەوە قەڵەم و ئەوەش دەوات و کاغەز ، نووسراوەکانت دەدەم بە خۆشنووسەکان بۆ ئەوەی بینووسنەوە . "

ماوەیەك بیٚدەنگ بوو لە دواییدا پرسیاری ئەوەی کرد کە کیٚ ئەم ویٚنەیەی کیٚشاوە ؟ وتم : " پەپوولە ، لە هەمووان لیٚهاتوو ترە ، وەستا عوسمان ساڵانیٚکی دریٚژ عاشق و حەیرانی بوو بوو . "

رەشە گوتی : " ویٚنەیەکی هاوشیٚوەی ئەم سەگەم لە قاوەخانەکەدا لە پشتی باڵۆرە بیٚژەکەوە بینیوە ، هەڵبەت ئەو تۆزیٚك گەورەتر بوو . "

زۆربەی ئەو شیٚوەکارانەی‌من کە بە ڕۆحەوە گریٚدراوی وەستا عوسمانن، خۆشیان بڕوا ناکەن کە ویٚنەی لەم جۆرەیان کیٚشابیٚ . ناتوانم بیر لەوە بکەمەوە کە چۆن بە بۆنەی پارەوە ویٚنەیان بۆ کیٚشاوم و لە قاوەخانەکەشدا ناماقوڵانە قیڕەقیڕو ئاژاوەیان کردووە . بە زەختی من پادشاکەمان ماوەیەك ویٚنەکانی خۆی بەدەستی ویٚنەکیٚشیٚکی گەنجی وەنیزیوە دەکیٚشا ، من ئەو ویٚنە کیٚشەم بە زۆری خۆم هیٚنا بووە ئیٚرە . دواتر کە وەستا عوسمان ویٚنە کیٚشانی بۆیاخی چەور و ئاویٚنەکەی ئەو کوڕەی پەسەند کرد، ئیدی بە دەستی ئەو هەموو شتیٚکی دروستدەکرد . پادشا وەستا عوسمانی ناچار کرد کە بە لاساییکردنەوەی ئەم وەستا وەنیزییە ویٚنەیەك بکیٚشیٚتەوە ، وەستا عوسمانیش لەسەر ئەوە منی بە تاوانبار دەزانی . هەڵبەت هەقی پیٚدەدەم.

لەو ڕۆژەدا دەرەوەی دوایین ویٚنەکە هەموو ویٚنەکانیترم پیشاندا و هانمدا بۆ ئەوەی داستانی ویٚنەکان بنووسیٚت ، باسی خەیاڵی ویٚنەکیٚشانم

**بۆ کرد ، هەروەها ئەو پارەیەشم بۆ ژمارد کەبە وێنە کێشانم دابوو وتەماحم خستە بەر دەمی . چەندە باسی ئەوەمان کرد کە ئەگەر دەست بە کێشانی وێنە لە لایەکەوە بکەین تووشی تاوان دەبین و گونابار دەبین یان نا ، ئەوەندەش باسی تەماحکاری و زۆرخوازی زەریف ئەفەندیمان کرد و گوتمان لەوانەیە هەر لەبەر ئەوە کوژرا بێ . لە دواییدا ڕەشە گەڕایەوە بۆ ماڵی خۆی .**

**ئیدی گومانم لەوە نەبوو کە دووسبەی دەگەڕێتەوە و وەکوو خۆی دەیگوت گوێ لە داستانی وێنەکانم دەگرێتەوە. لەبەر دەرگاکەوە گوێم لە ونبوونی دەنگی پێی گرت . لە ناودڵی ئەو شەوە ساردەدا شتێك هەبوو، ئەوەی بۆمن دەردەخست کە بکوژە بێخەو و پەشۆکاوەکەم لە خۆم و کتێبەشم بە هێزترە .لە دوای ئەوە دەرگاکەم بە باشی داخست و وەکوو هەمووشەوێك گۆزەکەم دانایە جێگاکەی خۆی،ئەو گۆزەیەم لە باتی گوڵداندا بە کارم دەهێنا وە لە دواییدا ئاگردانەکەم گەشکرد ، بەر لەوەی بخەوم سەیرم کرد کە شەکورە لە نێو تاریکیدا کە بەماکسی‌یەکی سپیوە خۆی وەکوو تارمایی نیشاندا وهاتە بەرامبەرم .**

**پرسیارم لێکرد و گوتم : " دەتەوێ لە گەڵ ئەم پیاوەدا ببی بە هاوسەر ؟ "**

**وتی : " نا ، نا باوکە گیان ، من لە زووەوە لەو بڕیارەی خۆم پەشیمان بوومەتەوە ، لەوەش زیاتر من هاوسەرم هەیە . "**

**وتم " ئەگەر دەتەوێ ، ڕێگات پێدەدەم . "**

**– : " نا ، نامەوێ . "**

**– : " بۆ ؟ "**

– : " چوونکە ئێوە ناتانەوێ و ئەوەش کەوا ئێوە نەتانەوێ منیش بەدڵم نیە".

بۆ ساتێك لە ناو چاویدا چاوم بە ڕۆشنایی سڵکەکان کەوت کە بریقەیان دەدایەوە . چاوەکانی تەڕ بوو بوون ، ئەوەش لە بەر بێ ئومێدی نەبوو ، بەڵکوو لەبەر کین و نەفرەت بوو . بەڵام هیچ جۆرە شکان و تووڕەییەك لە دەنگیدا دیار نەبوو ، وەکوو ئەوەی نهێنییەکی پێبڵێم گوتم : " ڕەشە زۆر حەزت لێدەکا "

– : " دەزانم "

– : " لەبەر عەشقی وێنە گوێی بۆ ئەو شتانە ڕانەدەگرت وا ئەمڕۆ باسمدەکرد، بەڵکوو لەبەر عەشقی تۆ بوو . "

– : " گرنگ ئەوەیە کە کتێبەکەتان تەواو دەکات . "

– : " ڕۆژێك شووەکەت دەگەڕێتەوە . "

– : " نازانم لەبەر چی بوو ، لەوانەیە لەبەر بێدەنگییەکەشم بوو بێت ، کە ئەمڕۆ تێگەیشتم ئیدی مێردەکەم هیچ کات ناگەڕێتەوە ، دەبێ ئەو شتەی وا لە خەیاڵمدا بینیبووبێتم ڕاست بوو بێت ، کوشتوویانە و زۆر لە مێژەوە بووە بە خۆراکی گورگ و پەلەوەرەکان ."

ئەم قسەیەی دوایی وەکوو ئەوەی بەخەبەربێ بە چپەوە پێی گوتم و لە گوتنە کانیشیدا تووڕەییەکی سەیر شاراوە بوو .

– : " سوێند بخۆ کە ئەگەر منیان کوشت تۆ ئەم کتێبە تەواو دەکەی . "

– : " سوێند دەخۆم ، بەڵام کێ ئەمە دەکات . "

– : " ڕەشە ! تۆ دەتوانی ئەمەی پێبکەی . "

– : " خۆ خەریکە پێك دێن باوکە گیان . ئیدی پێویستیتان بە من نیە .

"

– : " ڕاستە ،بەڵام لەبەر تۆ لەگەڵ مندا ڕاهاتووە، ئەگەر من بکوژن دەترسیٚ و لەوانەیە پەشیمان ببێتەوە . "

کچە ژیرەکم بە پێکەنینەوە وتی : " ئەو کاتەش ئەو لەگەڵ مندا زەماوەند ناکات . "

من ئەو پێکەنینەم لە کوێوە دەرخست ، خۆ کاتیٚ لەگەڵ ئەودا قسەم دەکرد زیاتر لە بریقەی چاوانی شتێکیترم نەدەبینی . لە نێوە ڕاستی ژوورەکەدا ڕووبە ڕووی یەك بووبووینەوە و لە سەر پیٚ ڕاوەستا بوو . خۆم پیٚڕانەگیرا و وتم : " هەواڵ دەنێرن بۆ یەك ؟ ئیشارەت لەیەك دەدەن یان نا ؟ "

وتی : "هەیرۆ!بابە گیان چۆن بیر لە شتی وەها دەکەنەوە ؟ "

بیٚدەنگییەکی درێژ و ئازاردەر دروستبوو، لە جێگایەکی زۆر دوورەوە سەگێك دەیواڕاند . تۆزێك سەر سام بووم . هەڵچووم و پەشۆکام . ئیدی ژوورەکە ئەوەندە تاریك بوو کە یەکمان نەدەبینی ، تەنیا هەستمان دەکرد کە لەبەرامبەر یەکداین . لە دواییدا ، لە ناکاو بە هەموو هێزێکمانەوە باوەشمان کرد بە یەکدا . دەستی بە گریان کرد و وتی : " بیری دایکم کردۆتەوە" . ماچی پرچەکانیم کرد ، بۆنی قژەکانی دایکی لێوە دەهات ، دەستم پێدا هێنان ، بردمە جێگاکەی و لەلای منداڵەکانیدا هەلاّمژاند . کە بیرم لەو دوو ڕۆژەی ڕابردوو دەکردەوە ، هیچ کومانێکم لەوە نەدەما کەوا لەگەڵ ڕەشەدا هەواڵ دەنێرن بۆ یەك .

# ((ناوی من ڕەشەیە)) (22)

شەو کە گەڕامەوە بە زوویی خۆمم لە ژنە خاوەن ماڵەکەم ڕزگار کرد کەوا خۆی خستبووە جێی دایکم . ڕۆیشتمە ژوورەوە و بیرم لە شەکوورە کردەوە . گوێم لە جیڕە جیڕی دەرگاکە بوو ، بە قەد دەریارییەك بەلامەوە خۆش بوو، هەر لەوێوە بۆتانی دەگێڕمەوە. هیچ گومانێك لەوە نەبوو کە دەوروبەری گرتووم و هەموو کات تەماشام دەکات و وەکوو مێردی ئایندەی خۆی مەزەندەم دەکا . هەر لە بەر ئەوەش وا هەستمدەکرد کە منیش ئەو دەبینم . ئێستاکانە لەو قسەیەی ( ابن العربی ) باش تێدەگەم کە دەڵێ " عەشق نەبینراوەکان دەبینێ و هەموو کاتیش لە پاڵ خۆدا هەست بە ناپەیداکان دەکات " لە دەنگەکانی ناو ماڵ و جیڕە جیڕی تەختەکانەوە ئەوەم بۆ دەردەکەوێ کەشەکورە هەموو کات سەیری من دەکات . دڵنیام لەوەی کە ماوەیەك لەگەڵ منداڵەکانیدا لە ژووری تەنیشت هەیوانەکەدا بوو، چونکە دەنگی ئاژاوە کردنی منداڵەکانم دەبیست .لەوانەیە لە ترسی ئیشارەتە ترسێنەرەکانی دایکیان بووبێ کە دەنگیان کز دەکردەوە . جارجاریش وەکوو ئەوەی کە شتێکی نائاسایی هەبێ و بیانەوێ سەرەنجی یەکێك لە سەر نوێژ ڕابکێشن، دەیانچپاندە گوێی یەکەوە و لە دوایشدا ، هڕ هڕ هڕ ... دەکەنین. گوێم لە هەمووی ئەمانە دەبوو . جارێکیش کە باپیریان باسی ڕۆشنایی سێبەری ناو وێنەکانی بۆ من دەکرد هەر دوو منداڵەکەی ، یانی شەوکەت و ئورهان هاتنە ناوەوە، سینیەکەی دەستیان هێنایە بەردمم . بە وردی چنرا بوو . قاوەیان پێدام . لەوانەیە ، دەبوو ئەم کارە خەیرییە

بیکردایه بەڵام دایکیان بە دەستی ئەنقەست ویستبووی ئەمان بیهێنن . بە بڕوای من ئەمە بۆ ئەوەبوو کە منداڵەکان باوکی ئایندەیان ببینن و دایکیان هەلی وای بۆ ڕەخساندبوون ، چونکە لەوانەیە بیەوێت لەسەر من قسەیان لەگەڵدا بکات. تەماشای شەوکەتم کرد و وتم:" چاوێکی جوانت هەیە ". بەڵام یەکسەر هەستم بە بەخیلیبردنەوەی برا بچووکەکەی کرد و وتم :" چاوی تۆش جوانە ". لە ناکاو گوڵە مێخەکێکم لە گیرفان دەرهێنا و خستمە ناو سینییەکەوە و گۆنای هەردووکیانم ماچکرد . ماوەیەکی پێچوو ، لەناو ماڵەوە دەنگی پێکەنین و جیڕەجیڕی تەختەکانم بیست . جاری واش هەبوو کە سەیری دەرودیواری ماڵەکەم دەکردو سەرنجم دەدایە سەر جێگا شەقبردووەکان و گرێی دارەکان و لەخۆمەوە خەیاڵم دەکرد و دەمگووت داخۆ ئێستا شەکورە لە کامیانەوە تەماشام دەکات یاخود گوێم لیٚ دەگرێت ؟ دەبێت چۆن دانیشتبێت ؟ لەخەیاڵی خۆمدا شتێکم بۆ دەدۆزییەوە و سەرنجم دەدایە سەر ئەو درزە یان ئەو گۆپکەدارەی وا خەیاڵم دەکرد . جارجاریش ئەگەری توڕەبوونی زاواشم دەدایە بەر چاو ، بەڵام دیسان وەکوو ئەوەی کە لە قسەکانی سەرم سووڕمابیٚ لەناو ژوورەکەدا دەستم بە هاتوچۆ دەکرد و تەماشای درزەکانم دەکرد. کاتیٚ لەو درزانەدا چاوم بەچاوی شەکورە دا هەڵنەدەتۆقی هەستم بە دڵنیایی نە دەکرد و خۆمم وەکوو کەسایەتی‌یەکی بێئارام دەبینی کە نازانێت چی بکات جاری واش هەبوو کە وامدەزانی شەکورە سەیرم دەکات و بڕوام بەوە دەهێنا کەلە ژێر نیگاکانی ئەودام و هێزم لێوەردەگرت وەکوو کەسێك کە بیەوێت لەوەی کەوا دیارە خۆی قووڵتر و بەهێزتر نیشان بدات ، بە بەزمەوە جوڵەجوڵم دەکرد و ئەملا و لام دەکرد . لە دوایشدا وەها بیرم دەکردەوە :ئێستاکانە شەکورە و

**منداڵەکانی من و باوکە ونبووەکەیان و مێردە نقوومبووەکەی کە هیچ کات ناگەڕێتەوە پێکەوە هەڵدەسەنگێنن ولەگەڵ یەکدا بەراوردمان دەکەن . لەلایەکی تریشەوە ئەقڵم لەلای قسەکانی زاواکەم دەمایەوە کە باسی ئەوەی دەکرد وا وێنە کێشە وەنیزییەکان چۆن وێنە دروستدەکەن. تەنیا لەبەر ئەوەی شەکورە ئەمانەی لە باوکی‌وە بیستبوو، دەمویست ئەمانە لەیەك بچوێنم کەوا هەندێکیان ناوی خۆیان بە چلەگرتن لە ژوورەکاندا  بەدەست هێناوە و بە پێچەوانەی مێردە ونبووەکە کەناوی خۆی بە نووکی شمشێرەکەی و ژمارەی ئەو سەرانە بەدەست هێنابوو کەوا پەڕاندونی و بە کتێبانەی وا نووسیویانە و ئەو وێنانەی وا کێشاویانە ناودار بوون. بە گوێرەی قسەکانی زاواکەمان ئەو وێنانە و ئەو ناودارانە بە ئیلهام وەرگرتن لە گۆشە تاریکەکانی دونیا کیشراون (کەوا بەچاو دەبینرێن ). منیش بۆ ئەوەی ئەوانە لەپێش چاوی خۆم زیندوو بکەمەوە هەڵ و تەقەلای زۆرم دەدا ، لە دوایدا کە نەمدەتوانی خۆمم بچوك دەبینی و ڕوو بەڕووی شکست دەبوومەوە . ماوەیەك تێپەڕ بوو کە شەوکەتم لەبەرامبەر خۆدا بینیەوە . بۆ ساتێك ویستم وەکوو نەریتی هۆزەکانی عەرەب لە ئەو پەڕی ئاوەکەوە ( ماوراء  النهر ) یان وەکوو هی گەلی چەرکەس بکەم کەوا کاتێك میوان دێ کوڕی گەورەی ماڵ دەستی ماچ دەکات و لەکاتی ڕۆیشتنیشدا هەر بەجۆرە ماچی دەکات و دەستی خۆمم درێژ کرد بۆ ئەوەی شەوکەت ماچی بکات و بیخاتە سەرسەری خۆی . هەر لەو کاتەدا لە جێگایەکی نزیکەوە گوێم لە دەنگی پێکەنینی شەکورەبوو ، داخۆ بەمن پێدەکەنێت ؟ توشی هەڵچوونێکی سەیربووم ، بۆ ئەوەی لەمە نەجاتم ببێت ، هەر دووگۆنای شەوکەتم ماچ کرد ، کاتێك ئەمەم کرد دەمزانی کە قسەی زاواکەمان دەبڕم و**

هەربۆیە بۆ ئەوەی وەها دیاربکەم کە نەمویستووە بێڕێزی پێبکەم ، بزەیەکم بۆ لێدا . لە لایەکیتریشەوە بۆنی شەوکەتم دەکرد بۆئەوەی بزانم بۆنی دایکی پێوەیە یان نا . کاتیٚ هەستم بەوە کرد کە شەوکەت کاغەزێکی خستوەتە ناو دەستمەوە ، شەوکەت لە زووەوە پشتی تێکرد بووم و ڕۆیشتبوو . لاپەڕەکەم وەکوو زێڕێك لەنێو دەستە مشتکراوەکەمدا شاردەوە ، کاتیٚ بە تەواوی دڵنیا بووم کەئەمە نامە بچکوولانەیەکی شەکورەیە ، خەریك بوو لە خۆشیدا دەست بە پێکەنینێکی سەیر بکەم ، بەڵام خۆمم پێڕاگیرا ، ئایا هەر ئەمە سەلمێنەری ئەوە نیە کە شەکورە منی دەویٚ ؟

بۆ ساتێك خەیاڵم لەوە کردەوە کە من و شەکورە پێکەوەین و وەکوو دوو سەر شێت پێکەوە خەریکین و لەگەڵ یەکدا جووت دەبین . ئەو شتە چاوەڕوان نەکراوەی وا خەیاڵم دەکرد ، بە بیٚ هیچ پێوانێك بڕوام پیٚ هێنا بوو ، لەبەر ئەوەی وا هەستمدەکرد کە لە بەرامبەر زاواکەماندا شتەکەم ڕاست دەبێتەوە،تەریق بوومەوە. ئایا شەکورە ئەمەی بینیبوو ؟ بۆ ئەوەی دیقەتم بڵاو ببێتەوە ، ماوەیەکی درێژ گوێم بۆ قسەکانی زاواکەمان ڕاگرت . لە دواییدا کاتیٚ زاواکەمان دەیەویست وێنەی لاپەڕەیەکیتری کتێبەکەم پیشانبدات و خۆی درێژ کرد بۆ ئەوەی بیهێنیٚ ، منیش لەو مەجالەدا تەماشای کاغەزەکەم کرد ، بۆنی گوڵی لەولاوی لێوە دهات . بەڵام هیچی تێدا نەنووسرا بوو ! لەبەر ئەوەی بڕوام بەمە نەدەکرد لاپەڕەکەم ئەملا و ئەولا پیٚکرد . زاواکەمان گوتی : " پەنجەرە! دیدگای ئەمەش وەکوو ئەوە وایە کە تۆ لە دەلاقەیەکەوە سەیری عالەم بکەیت . ئەو کاغەزە چیە ؟ "

: " هیچ نیە زاوا ئەفەندی " بەڵام لە دواییدا زۆر بۆنم کرد . دوای نانی نیوەڕۆ لەبەر ئەوەی نەمدەویست لەسەر کاسەی ئاو دەستی زاوا دانیشم

یارمەتیم لێوەرگرت و ڕۆیشتمە ئاودەستی ناو حەوشەکەوە و دانیشتم ، زۆر سارد بوو ، بۆ ئەوەی قوونم سەرمای نەبێ بە پەلەپەل دەرکەوتم . شەوکەت وەکوو ئەوەی ڕێبەری کردبێ ، بە بێدەنگییەیەکی فێلبازانەوە هاتە بەر دەمم ، کاسەی ئاو دەستەکەی باپیری پێبوو ، هێشتا هەڵمی لێ هەڵدەستا ، ڕۆیشتە ناو ئاو دەستەکەوەو کاسەکەی بەتاڵ کرد . لە دەرەوە بە گوپە خڕەکانیەوە چاوی بڕییە نێو چاوانم .

وتی:" تۆ چاوت بە پشیلەی مردوو کەوتووە ؟ " لووتی لە هی دایکی دەچوو ، ئایا سەیرمانی دەکرد ؟ تەماشای ئەو پەنجەرەیەم کرد کە دوای سالآنێکی درێژ لەوێوە شەکورەم بینیبوو . گوتم : " نا "

– :"لە ماڵی یەهوودییە هەڵواسراوەکەدا پشیلەیەکی مردووت پێنیشان بدەم؟" و بێ ئەوەی چاوە ڕێی وەڵامەکەم بێت ، ڕۆیشتە ناو کولآنەکەوە . چل و نۆ هەنگاومان هەڵگرت و ڕۆیشتمە ناو باخچەیەکی چۆڵ ، بۆنی گەلآی تەڕ و گەنیو و کەفی لێوەدەهات ، تۆزێك لە پێشەوە لەپشتی دار هەنجیرێکی خەمباروودار بادامێکەوە لە پەناگایەدا ، وەکوو ئەوەی خۆی شاردبێتەوە ڕاوەستابوو . وەکوو کەسێکی شارەزا کە هەنگاو بە هەنگاوی ئێرە بناسێت چوومە ناو ماڵەکە . ماڵەکە چوڵ بوو بەڵام وەکووئەوە وابووکە هێشتا کەسی تێدایە، ناوەوە وشك و گەرم بوو، وتم : " ئەمە ماڵی کێیە ؟ "

– : " هی جولەکەکانە . دوای مردنی مێردەکەی ، ژنەکە دەستی منداڵەکانی گرت و باریان کرد بۆ گەڕەکی جولەکەکان لە گۆیی ئاوی ( یەمیش ) ئێستاش بە ڕێگای ئەستەر بۆخچەچی ماڵەکە دەفرۆشن . " ڕۆیشتە گۆشەیەکی ژوورەکە و هاتەوە و وتی : " نەماوە . پشیلەیەکی مردوو دەتوانێ بچێت ؟ باپیرم دەڵێ مردووەکان دەگەڕێن . "

– : " خۆیان نا بەڵكوو ڕۆحەكانیان دەگەڕێن " . كاسەكەی دەستی بە توندیەوە گرت و وتی : " تۆ لە كوێوە دەزانی ؟ "

– : " دەزانم ، تۆ هەمیشە دێی بۆ ئێرە ؟ "

– : " دایكم و ئەستەر دێن ، ئەڵێن بە شەوان تارمایی و خێوی لێیە . بەڵام من لێرە ناترسم ،تۆ پیاوت كوشتووە ؟

– : " بەڵێ "

چەند كەس ؟

وتم : " زۆر نا بەس دووانم كوشتووە " .

" بە شمشێر ؟ "

" بەڵێ بە شمشێر " .

"رۆحەكانیان دەگەڕێن ؟ " .

" نازانم بەڵام بەگوێرەی كتێبەكان پێویستە بگەڕێن " .

: " مامە حەسەنم شمشێرێكی سووری هەیە ، ئەوەی خۆی لێبدات دەیبڕێ ، خنجەرێكیشی هەیە كە دەسكەكەی یاقووتینە . تۆ باوكی منت كوشتووە ؟ " بە لەقاندنی سەر ، نە نا ، نە بەڵێ ، هیچم پێنەگوت .

: " تۆ لەكوێوە دەزانی باوكت كوژراووە ؟ "

: " دوێنێ دایكم پێی گوتم ، خەوی بینیوە " .

ئەگەر مەجالمان هەبایە ئەو شتانەی كە وا بۆ بەرژەوەندییەكانی خۆمان و بۆ عەشق دەمانكرد و ئەو هێزەی گڕی هەست و داخوازی كە وامان لێدەكات ببین بە پیاوێكی دڵشكاو هەموویانمان بۆ كاری باشتر بەكار دەهێنا و هێزەكەشمان بۆ ئەوە تەرخان دەكرد . جارێكی تر بڕیارم دا كە ببم بە باوكی ئەم هەتیوانە . كاتێ گەڕامەوە بۆ ماڵ ، بە جوانی گوێم بۆ

قسەکانی زاوا ڕا گرت کە وا بریار بوو نووسراوەی کتێب و وێنەکانی بۆتەواوبکەم. با لەو وێنانەوە دەستی پێبکەم کە زاواکەمان نیشانی دابووم بۆ نموونە لە ئەسپەکەوە :

1- لەگەڵ ئەوەی کە ئەم وێنەیە ڕەسمی مرۆڤی تێدا نیە و دەور و بەری ئەسپەکەش چۆڵە ، دیسان من نەمدەتوانی بڵێم ئەمە بە تەنیا وێنەی ئەسپێکە . ئەسپەکە لەوێدا بوو ، بەڵام لەوانەیە خاوەنەکەشی لەولاتر بێت. یان وەکوو بەپێی نەریتی قەزوینییەکان لەناو دەوەنێکدا بێ و خەریك بێ دەرکەوێ . بتەوێ و نەتەوێ دەتوانی لە زینی ئەسپەکەوە ئەمە تێبگەی . چونکە نەخشی بێگانەی پێوەیە . لەوانەیە هەر لەولای ئەسپەکەوە هەندێك کەسی شمشێردار پەیدا بن . دیار بوو زاوا داوای لە شێوەکارانی وێنە کێشخانە کرد بوو کە وێنەی ئەم ئەسپە بکێشن . لەوانەیە ئەو وێنەکێشەی وا ئەو شەوە هاتبێ ، زانیبێتی کە ئەم ئەسپە بەشی داستانێکە ، بۆیە وەها کێشاویەتی . بۆ نموونە دەبێ لە شەڕەکاندا و لە وێنەی عاشقاندا بە هەزاران جاری ئەمەی بینیبێ و کێشابێتی . لەوانەیە زاواش دەستی تێوەڕدابێ و پێی گوتبێ کە بە پێی نەریتی ڕۆژ ئاواییەکان بیکێشە و سوارەکەی مەکێشە و تۆزێك دوورتر لە ئەسپەکە لە دواوەوە وێنەی دارێکی بچووك بکێشە . ئەم شێوە کارەش لەگەڵ زاوادا لە پشتی تەختەکەوە دانیشتووە و لەبەر ئەوەی پارەیەکی باشی پێدراوە و وێنەیەکی جوانیش بووە ، بە حەزی خۆیەوە ئەم وێنە سەیرەی کێشابێ . بەلام ئەم وێنە کێشەش وەکوو زاواکەمان بە تەواوی نەیدەزانی کە ئەم ئەسپە چ بەشێکی کام داستانە. ئەو شتەی وا لە منی دەویست ئەوە بوو کە لەبەرامبەر ئەم وێنەیە کەوا نیوەی بە نەریتی ڕۆژ ئاوایی و نیوەشی بە نەریتی

ئێرانییەکان کێشراوە دانیشم و داستانەکانیان بنووسمەوە . بۆ ئەوەی شەکورەم پێبدات پێویست بوو ئەمانە بنووسمەوە ، بەڵام لە باسکراوەکانی بالۆرە بێژەکە زیاتر هیچی ترم بە مێشکدا نەدەهات .

## (( لە داهاتوودا پێم دەڵێن پیاو کوژ )) (23)

کاتژمێرە تایەدارەکەم بە چرکە چرکەوە دەیگوت ئێوارە هاتووە ، هێشتا بانگیان نەدابوو زۆر زووتر لەوە مۆمدانەکەی سەر مێزەکەم داگیرساند بوو . قەڵەمەکەم دەژەند بە مورەکەبی حەسەن پاشا و دەمهێنا بەسەر لاپەڕە پۆڵیش کراوەکەدا و بەپەلەپەل وێنەی بەنگکێشێکم دەکێشا . کاتێ ئەو دەنگە هاتە بەر گوێم کەوا هەموو شەوێك دەیبیسم ، ڕاوەستام . بریارم وا بوو کە شەو نەچمە دەرەوە و لە ماڵدا کار بکەم ، تەنانەت ویستم کەلەمدیوەوە دەرگاکە بزمارکوت بکەم . ئەم کتێبەی وا بە پەلەپەل تەواوم کرد بوو ، ڕاسپاردەی کابرایەکی ئەرمەنی بوو . بەیانی زوو هێشتا کەس لە خەو هەڵنەسا بوو ، لە دەرگاکەی‌دا ، لەگەڵ ئەوەی زمانی گیری تێدایە ، دیسان وەرگێڕان دەکات و ڕێبەریی گەشتیارەکان دەکات . کە گەشتیارە فەرەنسی و وەنیزییەکان داوای شتێکی لێدەکەن یەکسەر من دەدۆزێتەوە . مامەڵەی باش دەکات . بەیانی لەسەر ئەوەی کە لە وێنەکەدا هەموو جۆرە مرۆڤێکی ئەستەنبوولی بۆ بکێشم بە سەد و بیست ئاکچە مامەڵەمان پێکەوە

کرد بوو ، هەر بۆیە ئێوارە لە دوای بانگدان لە دانیشتنێکدا بە سەرەنجێکی باشەوە وێنەکانم بۆ کێشا : ( شیخ الاسلام ) و کەبابچی و مەلا و قازی و سوپایی و جگەرفرۆش و جەللاد ـ وێنەی جەلاد لەکاتی ئەشکەنجەداندا ماقووڵانەترە ـ لەتەچن و ئەو ژنەی وا دەچێ بۆ حەمام و بەنگکێش و شتیتریشم بۆ کێشا . لەبەر خاتری چەند ئاکچەیەك چەندین کتێبی لەم جۆرەم درۆستکردووە . ئەوەندەم کێشاوە کە دەتوانم بەبێئەوەی قەڵەمەکە هەڵگرم وێنەی قازییەکە دروست بکەم و بە چاو گرتوویی شێوەی لەتە چنەکە دەکێشم و بەمجۆرەش یاری بۆ خۆم دروستدەکەم .

کە بانگی ئێوارە دەدرێ . هەموو تارماییەکان و شاعیر و خەمبارەکان لەگەڵ جندۆکە و شەیتانەکانی ناو دڵیانەوە ، خۆ هەڵدەکوتن و قازانەکە هەڵدەگرن و دەزانن کەوا بە لاڕێدا براون . دەنگە بێئارامەکەی ناو دەروونمان هاوار دەکا و دەڵێ : " بۆ دەرەوە ، بۆ دەرەوە ، هەڕابکە و بچوو بۆ ناو کەوتوویی‌و تاریکایی و پۆخڵەی مرۆڤەکانیتر " .من ساڵانێکی خۆمم بۆ ئاهۆن کردنەوەی ئەم جندۆکە و شەیتانانە تەرخان نەکردووە . ئەو وێنانەی کەوا من دەیانکێشم و زۆر کەسیش وەکوو شتانێکی دەرئاسایی دەیانبینن ، بە یارمەتی ئەم جندۆکە و شەیتانانە دروستمکردوون . بەڵام لە حەوت ڕۆژی پێشووەوە کە ئەو دڵنزمەم کوشتووە تاکوو ئێستا ئیدی گوێم لێڕاناگرن و بەقسەم ناکەن . وەها هەڵکوتان و داکوتان دەکەن کە دەڵێم ئەگەر بچمە دەرەوە تۆزێك بگەڕێم ئاهۆن دەبنەوە . کە ئەم قسەیەم کرد ، نازانم چۆن بوو کە خۆمم لەناو کۆڵانەکەدا دۆزییەوە ، بەپەلەپەل ڕۆیشتم . بەبێئەوەی ڕاوەستم لە کۆڵانە بەفر گرتووەکان و ڕێگا قوڕاوییەکان و لاپاڵە سەهۆڵ گرتووەکانەوە ڕێگام گرتەبەر . هەرچی زیاتر لە شەوی تاریکدا

ڕێبکەم و داکەومە ناو گۆشە بێدەنگ و تاریکەکانی شار بە قورسایی خۆم تاوانەکانم لە دوامەوە دەمێننەوە و هەرچەندە زیاتریش دەنگی هەنگاوەکانم لە دیوار و کولانە تەنگەکان و قوتابخانە و مزگەوتەکانەوە دێتەوە گوێم ، ترسەکانم سووکتر دەبن . پێڵاوەکانم لە خۆیەوە منی هێنایە ئەم گەڕەکە چۆڵە، ئەم گەڕەکە ئەوەندە چۆڵ و مەترسیدارە کەوا ئەگەر جندوکەکانیش بێن، بەترس و لەرزەوە دێن . دەڵێن نیوەی پیاوانی ئەم گەڕەکە لە شەڕدا کوژراون و نیوەیتریشیان لەبەر ئاخر شەڕی ئەم گەڕەکەیان بە جێ هێشتووە ، بەڵام من بڕوا بەم شتانە ناکەم . تەنیا خراپەیەك کەوا ئەم شەڕانە هێنابێتیانە سەری ئەم گەڕەکە جوانە ئەوەیە کە چل ساڵ بەر لە ئێستا دەرگای تەکیەکانیان داخستووە و زنجیریان لێداوە. بۆنی توتڕك لەم هەوا ساردەشدا دەهات ، لە پشتی دارەکانەوە گەڕامەوە و وەکوو جاران تەختەکانی پەنجەرەکانم لادا و ڕۆیشتمە ناوەوە و دووبارە هەڵمچنیوە . بۆنی دووکەڵ و کەڕووی سەد ساڵەم هەڵکێشایە ناو جەرگمەوە ، هەبوونم لێرە ئەوەندە خۆشحاڵی کرد بووم کەوامدەزانی لە خۆشیدا دەگەڕێم . ئەگەر تا ئێستا نەمگوتبێ دەمەوێ ئێستا بڵێم، لە خودا زیاتر لە کەسیتر ناترسم و لە سزای ئەم دونیایەش هیچ ناترسم . تەنیا ترسم ئەوەیە کە قورئانی کەریم بۆ نموونە لە سوورەی فورقاندا دەڵێت لە ڕۆژی قیامەت و لەودونیادا پیاوکوژی وەکوو من پلە بە پلە سزا دەدرێت . لەو کتێبە کۆن و دەگمەنانەی کەوتوونەتە دەستمەوە ، کاتێ تەماشای وێنەی دۆزەخ دەکەم وا عەرەبەکان لە سەر پێست دروستیان کردووە و تۆزێکیش منداڵانەیە ، هەروەها کاتێ سەیری دیمەنی ئەشکەنجەدانی شەیتانەکان دەکەم کەوا بەدەستی چینییەکان و مەغوولەکانەوە کێشراوە ، ڕەنگ و شێوەیان دێتە بەر چاوم و

ڕێگایەکی درێژ دەگرمە بەر و تا ئەو ژێر بیرییە وە ڕنەگرم ئارام ناگرم . لە ئایەتی سی وسێهەمی سوورەی ئەسرادا چیدەڵێ ؟ " بەبێ هۆی ڕاست و بەحەق ئەو گیانە مەگرن کەوا خودا حەرامی کردووە . " مەگەر وا ناڵێ ؟ باشە ، ئەو کات : ئەو دڵسووکەی ناردم بۆ دۆزەخ کەسێك نەبوو کە گرێدراوی بکوژەکەی خودا بێت . دووهەمیشی ئەوەیە کە بۆ کوشتنی ئەوو پەرش و بڵاو کردنی کاسەی سەری دەیان سەبەبی بەهەقم هەیە . ئەو لە بەرامبەر ئەم کتێبە نهێنیەدا کەوا بە فەرمانی پادشا دروستدەکرا زماندرێژی دەکرد و قسەی پێدەگوت، خەریکبوو کە من و زاوای ئەفەندی و وەستا عوسمان و وێنەکێشانیتریش وەکوو زەندیق بە ناو بکات و بمانخاتە بەردەم پیاوەکانی مەلا ئەرزڕوومییەکە . ئادەی بزانم، با یەکێك بە دەنگی بەرز بڵێ کە وێنە کێشێك شتی بێدینی دەکات ، ئەوسا بزانن کە چیدەبێ ! ئەو جەماعەتە ئەرزڕوومییە بەدوای بەهانەیەکدا دەگەڕێن بۆ ئەوەی کە هێزی خویان نیشان بدەن ، لە کوشتنی وێنەکێشان زیاتر ، وێنەکێشخانەکەش لەگەڵ خاکدا یەکسان دەکەن و لەناوی دەبەن ، بڕوامویە کە پادشاش تەنیا سەیر دەکات.

وەکوو هەر جارێك کە دێم بۆ ئێرە ، یەکسەر دەورووبەری خۆمم خاوێن کردەوە و وەها هەستمکرد کە عەبدالێکی ماقووڵی خودام . هەستی باشە کاری لە دەروونمدا گڕی گرت . تۆزێك گەرم بوومەوە ، بۆ ئەوەی خودا لە شەڕی باشە کاری بمانپارێزێ دوعام کرد . ئازارە فێڵبازەکەی دەوری قورگم دەستی پێکرد و دەرکەوتم. هەر لەو حاڵەتە سەیرەی ڕۆحیدا خۆمم لە گەڕەکێکیتردا بینیەوە . نەمدەزانی کە لە نێوان گەڕەکی تەکیە چۆڵکراوەکە و ئەم گەڕەکەدا چی هەیە و چۆن بووە کەوا هاتوومەتە نێو ئەم کۆڵانەی

كەوا لە هەر دوولاوە دەرەختی تێدا چنراوە ، بەڵام چەندەش ڕێبكەم دیسان بیرێك لە مێشكمدایە كەهەر چی دەكەم لە كۆڵم نابێتەوە و ناتوانم بەریدەم و وەكووكرمێك دەروونم دەخواتەوە . ئەگەر بە ئێوەی بڵێم لەوانەیە تۆزێك لە بارەكەم كەم ببێتەوە . دەتانەوێ پێی بلێن تومەتباركەرێكی ڕیسوا و دڵنزم ، یان وەكوو بلێن : زەریف ئەفەندییە بێچارەكە ! بۆ من هیچ فەرقێك ناكات ، چونكە هەر دوو یەك شتن و هەردوو جاشی كەرێكن . ماوەیەكی كورت بەر لەوەی كە بە ڕەحمەت ببێ ، زاوا ئەفەندی تاوانبار دەكرد . ئیدی بەلای منەوە باسی ئەو شتانەی نەدەكرد كەوا دەیكێشا و دەیگوت : " زاوا ئەفەندی هەموو وێنەكان بە پێی نەریتی گاورەكان دروستدەكات . " كە دەیبینی من گوێشی لێڕاناگرم ، ئەمجارە دەیگوت : " دوایین وێنە هەیە ، لەدوایین وێنەدا بە ڕاشكاوی كفر دەكات و جنێو بە هەموو شتێك دەدات ، ئەمە لە زەندیقیش خراپترە و خودی كافر بۆ خۆیە . " لە ڕاستیدا سێ هەفتە بەر لەوەی كە ئەم دڵنزمە ئەم تومەتانە بڵێت ، زاوا ئەفەندی داوای لە من كرد بوو كەوا لە گۆشەكانی لاپەڕەیەكەوە ، بە پێی نەریتی ڕۆژ ئاواییەكان ، بە ئەندازەی جۆراوجۆر وێنەی شتی جیاوازی وەكوو پارە و مردن و ئەسپ و ... بكێشم . ئەو وێنانەی كەوا من كێشا بووم جەدوەلی بۆ درۆستدەكرد و دەیدا بە زەریف ئەفەندییە بێچارەكە بۆ ئەوەی كەوا جوانیان بكات و بیانڕازێنێتەوە ، لە دوایشدا بۆ ئەوەی كە كەسیتر ئەو جوانكارییانە نەبینێ ، دەیخستنە ناو لاپەڕەیترەوە . دەمەوێ جارێك پرسیار لە زاوا ئەفەندی بكەم و بڵێم ئەم دوایین وێنە چیە ؟ بەڵام زۆر شت وای لێدەكردم كە خۆم ڕابگرم . خۆ ئەگەر پرسیاریشی لێبكەم ئەوا لە سەر كوشتنی زەریف ئەفەندی گومانم لێدەكا و ئەو گومانەش لە هەموو لایەكدا

بڵاو دەبێتەوە . شتی دیکەش کە وا بێ ئارامم دەکات ئەوەیە کە ئەگەر پرسیاری لێبکەم ، حەق دەدات بە زەریف ئەفەندی . جار جاریش بە خۆم دەڵێم وەکوو گومانێك کە وا زەریف ئەفەندییەوە فێر بووم پێیناڵێم و بەڵکوو وەکوو ترسێکی خۆم پرسیاری لێدەکەم . بەڵام ئەمەش لە ترس و ئازارەکانم کەم ناکاتەوە . بەڵام خۆ ئەگەر بەبێ ئەوەی ئاگات لێبێ دژایەتی دین بکەی ، گونا وتاوانێکی زۆری نیە . بەڵام من ئێستا ئاگام لە هەموو شتێکە .

ئەو پێیانەم کەوا هەموو کاتێك لە مێشکم ژیرتر بوون ، منیان برد بۆ کۆڵانەکەیماڵی زاوا ئەفەندی و خۆمم خستە ناو کولانێکی تاریکەوە و ماوەیەکی زۆر تەماشای ماڵەکەم کرد. ماڵێکی دوو قاتی سەیر لە نێوان دارەکانەوە ! نەمدەزانی کە شەکورە لە کام لایەتی . ماڵەکە لە ئەو وێنانە دەچوو کەوا لە کاتی دەسەڵاتی شا تاماسوبدا لە تەورێز دە کێشران و وات دەزانی کە لەنێوە ڕاستدا بوون بە دوو لەتەوە . بەڵام دیسان من نەمدەزانی کە شەکورە لە کام لادا دادەنیشێ و بۆ دۆزینەوەی جێگاکەی لە خەیاڵی خۆمدا وێنەیەکم کێشا . دەرگاکە کرایەوە ، لە تاریکییەکەدا چاوم بە ڕەشە کەوت کە لە ماڵەوە دەرکەوت . زاوا ئەفەندی بۆ ساتێك بە بەزییەوە تەماشای ڕەشەی کرد و دەرگاکەی داخست و ڕۆیشتە ژوورەوە . تەنانەت ئەو مێشکە گەوجەی منیش کە لە خۆیەوە خۆی خستبووە ناوخەیاڵەوە ، کاتێ ئەمەی بینی سێ ئەنجامی بە ئیشی لێوە دەرخست.

1- زاوا ئەفەندی کتێبەکە بە دەستی ئەو تەواو دەکات .

2-شەکورە جوانکیلەکە شوو بە ڕەشە دەکات .

3-قسەکانی زەریف ئەفەندییە بێچارەکە هەمووی ڕاست بوون و هەر لە خۆڕاییەوە ئەوم کوشتبوو .

لە بارودۆخێكی بەم شێوەیەدا ، یانی ئەو ئازارەی كە دڵمان نایەوێ بە هیچ شێوەیەك دەریخات و لە ئەنجامدا عەقڵە بێ بەزییەكەمان دەریدەخات ، تەواوی جەستەمان لە بەرامبەریدا دەست بە ڕاپەڕین و سەرهەڵدان دەكات. لە بەر ئەنجامی سێهەم كەوا دەڵێ من پیاو كوژم ،جەستەم و نیوەی عەقڵیشم بە هەموو هێزێكیانەوە دەستیان بە نائاسوودەیی و ڕاوەستان كرد . هەردوو پێی من كە هەموو كاتێك ژیرانە تر لە عەقڵم هەڵسوكەوتیان دەكرد لە زووەوە كەتبووە دوای ڕەشە ئەفەنییەوە ، چەن كۆڵانێك ڕۆیشتبوین كە تێگەیشتم كوشتنی ئەم ڕەشە ئەفەندییەی وا زۆر لە خۆباییانە ڕێدەكات زۆر ئاسانە . كاتێ ئەمەم لە گەڵ ئەو دوو ئەنجامەدا بەراورد كرد كەوا عە قڵم پێیان گەیشتبوو ، بیرم لەوە كردەوە كە دەتوانم خۆم نەجات بدەم . تەنانەت نەدەكەوتمە ئەو وەزعەی وا زەریف ئەفەندیم تێدا بەخۆڕایی كوشتبوو . ئەگەر ئێستا هەڕام بكرادیەوە و زەربەیەكم لە تەوقە سەری بدایە، هەموو شتێك وەكوو جارانی لێدەهاتەوە و زاوای بەرێز بانگی دەكردم و دەیگوت وەرە كتێبەكە تەواو بكەین . بەڵام لایەنێكی عەقڵم كە دروست و پارێزكارە گوتی هێشتا وەها بڕوا دەكەم كە زەریف ئەفەندی تۆمەتباركەرێكی هیچ و پوچ بووە . ( مەگەر دروستی لە زۆربەی كاتەكاندا خودی ترسە نۆكی نیە ؟ ) . ئەگەر ئەمە ڕاستیبێ ، كەواتە لە كوشتنی ئەو پیاوەدا حەق بەمن بووە و زاواش بۆ دروستكردنی كتێبە نهێنیەكەی بانگم دەكات بۆ ماڵی خۆی . بەڵام كە تەماشای ڕەشەم دەكرد وا لە پێش منەوە ڕێی دەكرد یەكسەر تێگەیشتم كە هیچ یەك لەمانە نابن و ڕوونادەن و هەمووشی خەیاڵە ، جاری وا هەیە لەسەر شتێ بیردەكەینەوە و خەیاڵی بۆ دروست دەكەین ، بۆ نموونە جلێك ،كچێك ،یان ڕوومەتێك ، یان خود

شتێکی خۆش دەبینین ، کەچی لە دواییدا تێدەگەین  وا نیە . بۆ نموونە فلان کچت نادەنێ ، یاخود فلانە پلەت پێنادەن ، ئای کە ناخۆشە!

پشت مل و سەر و بان و ژێر کردنی ملی ڕەشە مێشکی مرۆڤ تێکدەدات ـ ئەڵێی هەنگاوەکانی بەزەییان بە دونیادا دێتەوە و دەر حەق بە دونیا چاکە دەکەن ـ بەکین و نەفرەتێکەوە کە لە دڵمی گەرم کرد بوو و خۆی لێهەلپێچا بوو سەیری ڕەشەم دەکرد، کەسانی وەکوو ڕەشە لە عەزابی ویژدان دوورن و ئایندەیەکی پڕلە خۆشییان هەیە و وەکوو پادشایەك کە دەچێتە ناو گەوڕی خۆی دەتوانن بچنە هەموو جێگایەك وبەر هەر دەرگایەك و ئێمەمانان بچووك دەبینن. بۆ ئەوەی بەردێك هەڵنەگرم و هەڕا نەکەم و نەیدەم بە سەریدا بە زۆری خۆمم ڕاگرت. ئێمە دوو پیاو بووین کە عاشقی ژنێك بووین، ئەو لە  پێشەوە و من لە پاشەوە بەبێ ئەوەی کە هیچ ئاگای لێی بێت کۆلانە لار و خێچەکانی ئەستەنبووڵ دەگەڕاین ، لەو کۆلانە بێدەنگانەی وا بۆ شەڕە سەگ جیا کرابوونەوە و لەو جێگا سوتێندراوانەی وا جندۆکەکان لەوێدا چاوەڕێیان دەکرد و لە حەوشەی مزگەوتە منارە دارەکانەوە کە فریشتەکان پاڵیان پێوەدا بوو و لەپاڵ ئەو دارە درێژانەی وا بە مڕەمڕ لەگەڵ ڕۆحەکەیاندا قسەیان دەکرد و لەپاڵ ئەو قەبرستانانەی وا تارمایی و خێو لەوێدا کولەیان دێت و تۆزێك لەولای ئەو شەوەیانەی وا قوڕگی مرۆڤ دەدڕن و لە تەنیشت ئەو دوکانانەی وا کوتاییییان نایەت و لە پاڵ گەوڕ و تەکیە و مۆمخانەوە و لە نێوان دیوار و جێی کورتان فرۆشەکانەوە ، وەکوو برا تێپەڕ بووین. وەها بیرم دەکردەوە کە لەوەی زیاتر بە دوایدا بچم و تاقیبی بکەم ، لاساییم دەکەمەوە .

## (( ناوی من مەرگە )) (24)

وەكوو چاوتان پێدەكەویٚ من مەرگم . بەلاٚم مەترسن من تەنیا وێنەی مەرگم ، خۆ خودی مەرگ نیم ! بەلاٚم لەگەلٚ ئەوەشدا تەماشای نێوچاوانی ئێوە دەكەم و ترسەكانتان دەخوێنمەوە . ئێوە وەكوو منداڵێك كە بەراستی سەرقاڵی یاری بێت و بە تەواوی خۆی لە یاریەكە وەر دەدات ، وادەزانن لە ڕاستیدا مەرگ ڕووبەڕووتان بووەتەوەو دەترسن و زاورتان دەتوقیٚ . ئەوەی ڕاستی بێت منیش ئەمەم زۆر پیٚ خۆشە . كاتیٚ تەماشای من دەكەن

وادەزانن دوایین کاتە کانتان هاتووە و منیش وا هەستدەکەم کە ئێوە شەق دەبەن و خۆتان پیس دەکەن . ئەمە گاڵتە نیە: کاتێ ڕووبەڕووی مەرگ دەبنەوە ( بە تایبەت ئەو پیاوە شێر ڕەوشتانەش ) بە خۆتاندا دەچنەوە و بیر لە خۆتان دەکەنەوە . ئەو مەیدانی شەڕانەی وا بە هەزاران جار وێنەیمان کێشاون و ئێوەش پێیان دەزانن ، وەکوو ئەوەی دەگوترێ بۆنی خۆین و گولە و باروت و زرێیان لێنایەت ، بەڵکوو بۆنی گۆشتی گەنیو و گوویان لێدێت .

دەزانم ! بۆ یەکەم جارەکە وێنەی مەرگ دەبینن . ساڵێك بەر لە ئێستا پیرەمێردێکی باڵا بەرز و باریکەڵە کە ژیانی پڕ لە ڕاز و نهێنییە وەستایەکی گەنجی دەعوەت کرد بۆ ماڵی خۆیان (کە منی دەکێشا) . لە ژوورە نیوە ڕۆشنەکەی ئەو ماڵە دوو قاتەوە کە بۆ کاری وێنەکێشان بە کار دەبرا بۆنی عەنبەر دەهات ، قاوەیەکیان بە خەستی ئاوریشم پێشکەش کرد . مێشکی گەنجەکەی کردەوە . لەدوایشدا لە ناو ژوورێکدا کەوا بە ڕەنگی شین ڕاخرابوو ، جوانترین لاپەرەی هیندی و فلچەی تووکی سمۆرە و لاپەرەی زێڕاوی و قەڵەمی جۆرا و جۆر و قەڵەمتراشی مەرجانیان پیشان دا و ئاماژەیەکی وەهایان پێکرد کە پارەی زۆری پێدەدەن و بەو جۆرەش ویست و ئارەزویان بزواند ، لە دوایدا پیرەمێردەکە وتی : "وێنەی مەرگم بۆ بکێشە."

ئەو وێنەکێشە دەست نا ئاساییەی کەوا منی دەکێشا وتی : " من کە لە ژیانمدا مەرگم نەبینیوە چۆن دەتوانم وێنەی مەرگ بکێشم"

پیرەمێردە باریکەڵە درێژەکە وتی : " بۆ کێشانی وێنەی شتێك مەرج نیە لە پێشدا وێنەکە ببینی . "

ئەو شێوە کارەی وا منی دەکێشا وتی : " بەڵێ لەوانەیە کە پێویست نەبێ ، بەڵام ئەگەر بتەوێ وەکوو وێنەی وەستا کۆنەکان جوان دەربچێ ، پێویستە بەرلەوە بە هەزاران جار کێشرابێ . شێوەکار چەندە شارەزا دەبێ با ببێ ، بابەتێکی تازە وەکوو بەر دەستێك دەکێشێ کە ئەمەش هیچ شایەستەی من نیە ، ناتوانم بۆ کێشانی وێنەیەکی مەرگ ، هەموو وەستایی و شارەزایەکەم بخەمە لایەکەوە ، چونکە ئەمە بۆ من وەکوو خودی مردن وایە . "

پیرەمێردە کە وتی : " لەوانەیە ئەم مردنە تۆ نزیکی بابەتەکە بکاتەوە ."

ناسینی بابەت بە ژیان نامانکات بە وەستا بەڵکوو نەبینینی بابەتەکە لە ژیاندا دەمانکات بە وەستا ، جابۆیە پێویستە ئەم وەستایە لەگەڵ مەرگدا ئاشنا ببێت .

بەمجۆرەش وەکوو وەستا گەورەکان کەوا پێکەوە کێبرکێ دەکەن لەگەڵ یەکدا بە ماناوە قسەیان دەکرد و هەموو قسەیەکیان دوو توێ بوو ، لە بەر ئەوەی باس باسی من بوو ، بە وردی و بە باشی گوێم بۆ قسەکانیان ڕادەگرت. گەرمای قسەکانیان وەکوو هی قاوەکەمان وابوو ، تا وەکوو جارێك کار هاتە ئەوێ کە شێوەکارە چاو جوانە دەست دەرئاساییەکە لەگەڵ ئەوەی کە خۆی وەڵامەکەشی دەزانی پرسیارێکی لە پیرمێردەکە کرد و وتی : " ئایا فراوانی و گەورەیی هونەری وێنەکێشەکان لەوە دایە کە کارەکانی وەستا کۆنەکان بە بێ کەموکوڕی دووپات بکەنەوە ؟ یان وەکوو ئەوەیە کە بتوانێ بابەتی تازە بخاتە ناورەسمەکەوە ؟ "

پیرەمێردەکەش وتی : " لەلای وەنیزییەکانی پێوانی بەهێز بوونی نەخشی شێوەکارێك لە دۆزینەوەی بابەتی تازەدایە . "

ئەو شێوەکارەی وا منی دەکێشا وتی : " ونیزییەکان وەکوو وەنیزی دەمرن . "

پیرەکەش وتی : " بەڵام مەرگی هەموو کەس لە یەك دەچیٚ . "

شێوەکارە ژیرەکەش وتی : " نەخش و ئەفسانە ئەوە نین کەوا هەموو کەس لە یەك بچووێنیٚ ، بەڵکوو باس لە لەیەك نەچوونیان دەکات ، وەستا بەوە دەبیٚ بە وەستا کە ئەفسانە لە یەك نەچووەکان بە شێوەیەك بکێشێتەوە کەوا لە ئێمە بچن."

بەم شێوەش قسە هاتە سەر ئەوەی کەوا مەرگی وەنیزی و موسڵمانێك ، هی عیزراییل و فریشەکانی خودا و وێنەی گاورەکان لەگەڵ یەکدا بەراورد ناکرێن . ئەو وەستاییەی وا ئێستا من دەکێشیٚ و لە قاوە جوانەکەدا تەماشای من دەکات بە دەست ئەم قسە گەورانەوە لە گیانی خۆی بێزار بووە ، دەستەکانیشی ئارامیان نیە و دەیانەویٚ من بکێشن بەڵام نازانن کە چۆن شتێکم . تیشکی ئەو چراییەی وا لە ژوورەکەدا بە خوری دەسوتیٚ کەوتە نێو چاوانی وەستاکە و بریقەی داوە ، پیرەمێردە فێڵ بازەکە وا دەیویست فریوی بدات وتی : " ئەو شتەی وا وەنیزییەکان وەکوو مەرگ کێشاویانە لە شێوەی مرۆۋ دەچێت ، کەچی ئەوەی ئێمە فریشتیەکی وەکوو عیزراییلە لە شێوەی مرۆۋێکدا . وەکوو کاتی دابەزینی قورئانی کەریم کەوا جبرەئیل لە شێوەی مرۆۋێکدا ڕووبەڕووی پێغەمەر بوو بووەوە. تێدەگەی ؟ " .

تێگەیشتم ئەو وەستا گەنجەی وا خوداوەند لێهاتوویەکی پیٚ بەخشیوە بۆ کێشانی من بێئارامی دەکات . چونکە پیرەمێردە شەیتانییەکە ، ئەو بیرە شەیتانییەی خستبووە مێشکییەوە . ئێمە شتێکمان نەدەکێشا کە هەموو لایەکی ڕووناك بێت ، بەڵکوو دەمانەویست شتێك بکێشین کە ئەگەر بکرێت

نیوەی تاریك بێت . ئەو وێنەكێشەی وا تۆزێكی تر من دەكێشێ وتی : " من مەرگ ناناسم . " پیرمێردەكەش وتی : " هەموومان ئاگامان لە مردنە و لێشی دەترسین و بەڵام هیچ كەسمان نایناسین . تۆ ئەم ترسە بكێشە . "

تۆزێكی تر منی دەكێشا . كاتێ ملی تەزیو دەستی ڕاكێشا وا هەستم كرد كەوا بە نووكی پەنجەكانیەوە بە دوای قەڵەمەكەیدا دەگەڕێ . بەڵام لە بەر ئەوەی وەستایەكی گەورە بوو ، دەیزانی كە ئەو ڕاكێشانە عەشقی نەخش قووڵتر دەكاتەوە ، هەر بۆیە خۆی پێڕاگیرا ،پیرەمێردە تەڵەكە بازەكەش كە دەیزانی تۆزێكی تر وێنەكە دەكێشرێ ، هەندێك بەش لە كتێبەكەی ئەلجەوزی یانی ( كتاب الروح ) و كتێبی ( الاحوال قیامە ) ی غەزاڵی و سویوتی بۆ خوێندەوە .

بەم شێوەیەش ئەم وێنە كێشە دەست نائاساییە ئەوەی بیست كەوا فریشتەی مەرگ لە ئاسمانەوە دێت و دەچێتە هەموو جێگایەك و باڵەكانی زۆر هەڵات و ڕۆژ ئاوا دەگرنەوە و هەزاران باڵی هەیە كە هەر یەكەیان بۆ تاوانباران وەك بزمارێكن ، ئەم فریشتەیە باوەش دەكات بە پیاوە دیندارەكاندا و دەیانپارێزێ ، لەبەر ئەوەی زۆرینەی وێنە كێشان دۆزەخین ، منیبە بزماركوت كراوی كێشا . ئەم فریشتەیەی وا خداوەند بۆ گرتنی گیانی ئێوە دەینێرێت بۆ سەر زەوی دەفتەرێكی پێیە كەوا ناوی هەموو كەسێكی تێدایە . لە هەندێك لە لاپەڕەكانی ئەم دەفتەرەدا هەندێك ناو بە خەتی ڕەش نووسراون و خەتێك كێشراوە بە دەورروو بەریاندا ، بەڵام تەنیا خودا ئاگای لە مەرگی مرۆڤەكانە ودەزانێ كەی دەمرێ ، كاتێ كەسێك بمرێ ، گەڵایەك لە دارەكەی عەرش دەكەوێتە خوارەوە . ئەم گەڵایە بگرن و بیخوێننەوە . بەم شێوەیە شێوەكارەكە گوێی لەوە ڕاگرت كە نۆرەی كێیە و

دەستی بە کێشانی من کرد . بەڵام لەبەر ئەوەی کە وا پیاوێکی بیرەمەند بوو ، منی مەترسیدار ، بەڵام بە حەسێب و کتێبەوە کێشا . لەبەر ئەوەی پیرە مێردە میشك بچووکەکە وەهای خوێند بوەوە کە لە دوای ئەوەی فریشتەی مەرگ قوربانییەکە دەست نیشان دەکات و گیانی دەکێشیٚ، ڕووناکییەکی زۆر هەمووجێگایەك دەگرێتەوە ڕۆشنایی دەبێت ، وەستا لاوەکەش منی لە ناو ڕۆشنایی و تیشکدا کێشا ، چونکە دەیزانی ئەوان چاویان بە ڕووناکییەکەی تەنیشت من ناکەویٚ .ئەو وێنە کێشە دەرئاساییە گوێی بۆ قسەکانی پیرە مێردەکە ڕادەگرت و سەرەنجی دەدایە سەر ئەو بەشەی ( کتاب الروح ) کەوا باسی ئەوە دەکات کە قەور هەڵکەنەکان گوتویانە لە نێو قەبرەکەدا لاشەکان بزمار کوتکراون و گڕی ئاگر لە سەر قەبری تازە مردووەکان هەڵدەستێت ، هەر بۆیە لە کاتی کێشانی وێنەکەدا هەموو شتێکی ترسێنەری تێدا جێگیر کرد بوو . بەڵام لە دواییدا پەشیمان بووەوە ، هەڵبەت لەو ترسە پەشیمان نەبووەوە کە وا لە وێنەکەدا جێگیری کرد بوو . بەڵکوو لە هەموو وێنەکە پەشیمان بووەوە ، هەستی منیش وەکوو هی کەسێك بوو کەوا بە شەرم و پەشیمانییەوە باوکی خۆی کەوتبێتەوە یاد .

ئەم وەستا دەست موعجیزاوییە بۆ چی لە کێشانی من پەشیمان بوو بووەوە ؟:

1-لەبەر ئەوەی ناتوانیٚ وێنەی من یانی وێنەی مەرگ وەستایانە بکێشیٚ ، وەکوو ئەوەی وادەیبینن و چاوتان پێیدەکەویٚ من لە وێنەی وەنیزییەکان و لە هی وەستا هەراتییەکانیش ناچم . ئەم وێنە خرچ و خێڵەی وا وەستا گەورەکە شایستەی مەرگی نازانیٚ لە لای منیش پەسەند ناکرێت .

2-لەبەر ئەوەی کەوا پیرە مێردەکە بە ڕێگایەکی شەیتانییەوە فریوی دا

بوو و ئەویش بە بێ مێشكی و لە ناكاوەوە لاسایی نەریتی وەستای ڕۆژ ئاواییەكانی كردبوو ، بۆ یەكەم جار هەستی بەوە دەكرد كە پیاوێكی زۆر سەیرە و بەم بێشەرەفییەی خۆی خەریكە بەرامبەر بە وەستا كۆنەكان بێڕێزی دەكات و ئەمەش ڕۆحی دەخواردەوە .

3- پێویستە یەكسەر ئەوە بێتەوە عەقڵی ئەو گێل و گەوجانەی وا گاڵتە بە من دەكەن و پێدەكەنن ، كەوا لەگەڵ مردندا گاڵتە ناكردرێت ، ئێستاش ئەو وێنە كێشەی وا منی كێشاوە شەوان بەبێ ڕاوەستان لە كۆڵاكاندا ڕێدەكات و وەكوو زۆربەی وەستا چینییەكان خۆی بەو شتە دەزانێت كەوا كێشاویەتی .

## (( ناوی من ئەستەرە )) (25)

**پارچەی منارە سوور و قوماشی ژنە خەماوییەکان ( پشیلە ڕەش دارەکان ) و پارچەی مۆر و سووری دوڵمەی بیلەجیکیان داوا کرد بوو ، بەیانی زوو هەموویانم خستە ناو کۆڵەکەمەوە . قوماشێکی سەوزی ئاورێشمینی چینییان بە کەشتی پورتوغالی بۆ هێنا بووم ، هەر لەو قوماشە بەلاّم ڕەنگە شینەکەیم خستە ناو کۆڵمەوە ، لەبەر ئەم بەفرە بیٚکوتاییەی ئەم زستانە ، بە دەیان جووت گۆرەوی بەنیِن و پشتوێنی ئەستوور و هەموو جۆرێکی یەلەکی بەنینم بە جوانی دەقکرد و لە کۆڵەکەمدا جێگام کردنەوە . لە دواییدا دەستماڵی ئاورێشمینم بۆ ئەو ژنانە جیا کردەوە کەوا بۆ ورتە و بۆڵە دەچوون بۆ لای یەك . کاسەی پارەشم خستە ناو کۆڵەکەمەوە . کاسەیەکی بە کار هاتووی حەمامیشم هەڵگرت و دەستم برد بۆ کۆڵەکەم . زۆر قورس بوو بوو . ئای پشتم دیٚشیٚ! ئەم کۆڵە پشتم دەشکێنیٚ . دامنایەوە ، سەر لە نویٚ کۆڵەکەم کردەوە و تەماشام کرد ، بۆ چی دەریان بهێنم ؟ لە دەرگایاندا ، نەسیم دەرگاکەی کردەوە و بانگی کردم. بەر دەرگاکە خەیرییەی لێبوو ، چپاندی بە گوێمەوە و وتی شەکورە خان ئەمەی ناردووە . ناو چاوم دا بەیەکدا ونامەکەم لێوەر گرت ، لە دواییدا کچە گەوجەکەم حاڵی کرد ( بۆ ئەوەی لە کاتی گەڕانەوەدا کەس نەیبینیٚ) . نەسیم سەیری دەکردم . ئەو کاتانەی کە نامەکەم پێدەبوو ، کۆڵەزل و سووکەکەم هەڵدەگرت . وتم : " کچی زاواچەلەبی لە ئاگری ئەویندا پل پل دەسووتیٚ ، خەریکە بە تەواوی عەقڵی ئەو بێچارەیە لە سەری دەر دەپەڕیٚ . " قاقایەکم لێدا و ڕۆیشتمە دەرەوە، بەلاّم یەکسەر شەرمێکی سەیر هەموو جەستەمی داگرت . لە ڕاستیدا نەمدەویست گاڵتە بە عەشقەکەی شەکورە بکەم ، بە پێچەوانەوە تەنانەت دەمویست جارێك بۆ ئەو حاڵە خەمبارەی**

بگریم و فرمێسکی بۆ هەڵبڕێژم ، چەندە جوانیشە کچە جوانە خەمبارەکم ! بەو بەیانییە ساردە بە پەلەپەل لە پێش ماڵە شڕۆڵەکانی گەڕەکە تەنیا و بێچارەکەی ئێمەی جوولەکەوە تێپەڕ بووم . لە دواییدا لە کۆڵانەکەی ماڵی حەسەندا چاوم بەو سواڵکەرە کوێرە کەوت کەوا لە گۆشەیەکدا جێگای خۆی گرتبوو و پاڵیدا بوو و تەماشای هەموو شتێکی دەکرد . بە هەموو توانایییەکەمەوە قیڕاندم و گوتم : "بوخچەچی هاتووە . "

وتی : " ژنی قەڵەوی عفریتە ! نەش قیڕێنی خۆ هەر لە دەنگی پێتەوە دەتناسمەوە . "

وتم : " چەپەڵی کوێر ! تاتاری بێخێر ! کوێرەکان کە سانێکی خراپ و بەڵان کە خودا لە خۆی دووری کردوونەتەوە ، خودا تووشی شەڕت بکات ،ئاخر شەر! "

جاران لەم شتانە تووڕە نەدەبووم و گوێشم لێنەدەدا ، باوکی حەسەن دەرگاکەی کردەوە ، ئابازییەکی چەلەبی و ناسکۆڵەیە . وتی : " بابزانم ئەم جارە چیت بۆ هێناوین . "

– : " کوڕە تەمبەڵەکەت هێشتا لە خەودایە ؟ "

–: " خەوتووە ؟ چاوەڕوانی هەواڵێکی تۆیە ، چاوی لە ڕێتە . "

ئەم ماڵە ئەوەندە تاریکە کاتیٚ دەچمە ناوەوە وادەزانم دەچمە نێو قەبرەوە . شەکورە هیچ پرسیاری ئەوە ناکات کە ئەمانە چیدەکەن ، بەڵام هەر جارە و بە شێوەیەك باسی بۆ دەکەم کە جارێکیتر بیر لە گەڕانەوە بۆ ئەو ماڵە نەکاتەوە . تەنانەت خەیاڵی ئەوەش شتێکی سەختە کە ماوەیەك شەکورە کەیوانۆی ئەم ماڵە بوو بیٚ و لەگەڵ منداڵە چەتوونەکانیدا لێرەدا ژیانی بردبێتە سەر . ناوەوە بۆنی خەو و مەرگی لێوە دهات ، ڕۆیشتمە

ژوورەکەی‌ترەوە و خۆمم خستە ناو تاریکاییەکی قووڵترەوە ، چاو چاوی نەدەبینی ، هێشتا نامەکەم دەرنەخستبوو کە حەسەن پەیدا بوو ، هاتوو نامەکەی لێوەرگرتم . وەکوو هەموو جارێك بەرمدا بۆ ئەوەی مەراقەکەی بکوژێتەوە ، یەکسەر سەری لە سەر نامەکە هەڵگرت و وتی : " شتی‌ترت نەهێناوە ؟ " بەڵام خۆی باشی دەزانی کە هیچی‌ترم نەهێناوە .

وتی : " ئەمە نامەیەکی کورتە " و خوێندییەوە : " ڕەشە ئەفەندی ! لەبەر کتێبەکەی باوکم هاتووچۆی ماڵی ئێمە دەکەی و تەواوی ڕۆژ لێرە دادەنیشی ، بەڵام بە گوێرەی ئەو شتەی کە بیستوومە تەنانەت ڕستەیەکیش نانووسی . تاوەکوو کتێبەکە تەواو نەکەی بە هیچ جۆرێك خۆت ئومێدوار مەکە . " نامەکەی لەدەستدا بوو ، وەکوو ئەوەی کە هەمووی ئەو شتانە قەباحەتی من بیٚ و من تاوانبار بکات ، ئاوەها سەیری چاومی دەکرد . حەز لە ئەمانەی ناو ئەم ماڵەو بێدەنگییەکەی ئێرە ناکەم .

– : " ئیدی باسی هاوسەردار بوونەکەی ناکات و ناڵیٚ کە مێردەکەی لە شەڕ دەگەڕێتەوە . لەبەر چی ؟ "

– : " من بۆ بزانم ، لەبەر چی ؟ خۆ من ئەم نامانە نانووسم . "

– : " جارجار گومان لەویش دەکەم" و.. نامەکە و پێنج شەش ئاکچەی پێدام.

وتم : " هەندێك لە مرۆڤەکان کاتیٚ قازانجی زۆرتریان دەستدەکەویٚ ، زیاتر چەپەڵ و پیس دەبن "

ئەم حەسەنە لایەنێکی شەیتانی و جۆرە زەکایەکی تێدایە کە کاتیٚ مرۆڤ لێی تێدەگات ، ئەوسا دەزانیٚ کە بۆچی تاوەکوو ئێستا شەکورە نامەکانی وەردەگریٚ"

– : " کتێبەکەی باوکی شەکورە چیە ؟ ئەزانی چیە ئەڵێن پادشا هەموو پارەکەی دەدات . لەبەر وێنەکانی ئەو کتێبە شێوەکاران یەکتری دەکوژن، نازانم ئەمە لەبەر پارەکەیەتی یان ـ حاشا ـ لەبەر ئەوەی وا لە بەرامبەر دینەکەماندا کوفر و بێڕزی تێدایە ، ئەڵێن کەسێك سەیری بکات یەکسەر کوێردەبێت . " کاتێك ئەمانەی دەگووت بە شێوەیەك پێدەکەنی کە مرۆڤ تێدەگەی پێویسیتە بە جدی وبە وریایی تەماشای بکات . ئەگەر قسەیەکی جدیشبایە ، بە گوێرەی ئەو لایەنێکی تێدا نەبوو کەمن بەڕاستی وەربگرم . حەسەنیش وەکوو هەموو ئەو پیاوانەی کە نامەکەیان دەبەم و دەیهێنم کاتێك غروری دەشکا منی بچوك دەبینی . منیش لەبەر ئیشەکەم وەها دیار دەکەم کە زۆرم پێناخۆش بووە ، ئەمەش تەنیا لەبەر ئەوەیە کە دڵی ئەوان خۆش ببێت . بە پێچەوانەشەوە کاتیٚ کچان غروریان دەشکیٚ باوەشم پیا دەکەن و دەگرین . حەسەن لەبەر ئەوەی کە دەیزانی دڵم شکاوە وتی:" تۆ ژنێکی ژیری ، زوو ئەمەی بۆ بەرە ، زۆر حەزدەکەم بزانم وەڵامی ئەو گەوجە چیە . " لە دڵمەوە دەمویست بڵێم ڕەشە پیاوێکی گەوج نیە. لە وەزعیەتی وەهادا ئەو پیاوانەی ڕەقیبی یەکترین پارەیەکی زۆر چاك دەدەن بە ئەستەر ، بەڵام لە قەیرانی ڕەقێکی ناکاو ترسام و خۆمم ڕاگرت . کاتیٚ دەر کەوتم گوتم : " لەتەچنەکەی سەر سووچەکە ، زۆر بیٚتەربیەتە . " و لەبەر ئەوەی لەگەڵ ئەو کوێرەدانەبیٚ بە قسە و باسمان لەو سەریتری کۆڵانەکەوە ڕۆیشتم . و بەو بەیانییە زووە چوومە ناو بازاڕی مریشکەکانەوە . بۆچی میلەتی موسوڵمان سەر و قاچی مریشك ناخۆن ؟ ئوی لەمانە کە سەیرن !

دایکم ( خۆڵی قەبرەکەی زۆربیٚ ) دەیگوت کاتیٚ کە لە پورتوغاڵەوە هاتوون بۆ ئێرە لەبەر ئەوەی قاچی مریشك هەرزان بووە هەموو کات

**کڕیویانە و بە کولاوی خواردوویانە . ژنێکم بینی کە کوێلەکان ئەملا و ئەولایان گرتبوو، زۆر لە خۆبایی بوو ، لەوە دەچیٚ ژنی پاشایەك ، یا خود کچە دەوڵەمەندێك بێت ، تەماشایەکم کرد و هەناسەیەکم هەڵکێشا ، لەوانەشە کەسێك بێت عەقڵی بستێك لە زەوی بەرزتر بێت ، لەوانەشە مێردەکەی لە شەڕی سەفەویدا دەستکەوتێکی زۆری هێنابیٚ . شەکورەش وەکوو ئەم ژنە لەخۆباییە دەژیا . لە هەموو کەسێك زیاتر ئەو شایستەی ئەم شتانەیە .**

**کاتیٚ گەیشتمە کۆڵانەکەی لای ماڵی ڕەشە دڵم توندتر لێیدەدا . ئایا دەمەویٚ شەکورە لەگەڵ ئەم پیاوەدا ژیانی هاوسەری بکات ؟ هاوسەنگی نێوان پێوەندیدار بوون و بیٚپەیوەندی بوونی شەکورە و حەسەن ڕادەگرم ، بەڵام ئەوەی ئەم ڕەشەیە چۆن دەبێت ؟ عەشقەکەی بەرامبەر شەکورە نەبیٚ ئەویتر ڕێك و پێکە .**

**بۆخچەچی !!! نامەداییٖن بە دەستی ژنی بیٚمێرد و پیاوی بیٚژن و کوڕ و کچیعاشق بەیەك کە تۆزێك گێل و گەوجیش دەبن ناگۆڕمەوە بە هیچ شتێکیتر .**

**دڵنیام لەوەی ئەگەر بەر لەوەی ئەو نامەیە بخوێننەوە کەوا تازە گەیشتووەتە دەستیان هەواڵێکیخراپیشیان پێبگات ، دیسان هەستێکی هیواداری دەروونیان دادەگرێت . لەبەر ئەوەی شەکورە باسی گەڕانەوەی مێردەکەی نەکردووە و بۆ ئومێدوار بوونی ڕەشەش مەرجی داناوە ، من خۆم ماۆ دەدەم بە ڕەشە ئەگەر هیوادار بێت ، بە تامێکەوە تەماشای خوێندنەوەی نامەکەیم کرد . لە خۆشیدا هەڵچوو بوو . تەنانەت تۆزێکیش ترسا بوو . کاتیٚ بۆ نووسینی وەڵامی نامەکە ڕۆیشتە دواوە ، منیش وەکوو**

ئەوەی هەمووژنێکی ژێری بۆخچەچی دەیکات جانتایەکی ڕەشی پارەم دەرهێنا و نیشانی ژنە خاوەن ماڵەکەی ڕەشەمدا و وتم : "ئەمە لە باشترین چادری ئێرانییەوە دروست کراوە ." وتی : " کوڕەکەم لە شەڕدا کوژراوە ، تۆ نامەی کێت هێناوە بۆ ڕەشە ؟ " لە ڕوومەتیەوە وەهام دەخوێندەوە کە کێ دەزانێ لەوانەیە کچە لە ماڵ ماوەکەی خۆی یا خود هی کەسێکیتری بۆ شێرە کوڕێکی وەکوو ڕەشە دانابێ .

– : " هی هیچ کەس نیە ، یەکێك لە خزمەکانی لە ژوورەکانی بایرام پاشادا خەریکی مردنە و داوای پارەی لێکردووە . " بەبێ ئەوەی بڕوا بکات وتی : " هەیڕۆ ، کێیە ئەو بێبەختە ؟ " لە ڕەقاندا منیش گوتم : " کوڕەکەت لە شەڕدا کوژراو بوو ؟ " لە دوایشدا بە دوژمنایەتییەکەوە سەیری یەکمان کرد . بێوەژنێکی تەنیا و تاکەس ژیانەکەشی چەندە سەخت و زۆرە !

ئەگەر ببن بە ژنێکی دەسفرۆش و نامەبەری وەکوو ئەستەر ، ئەوا تێدەگەن کە تەنیا دەوڵەمەندی ودەسەلاَت و داستانی بێوێنەی عەشق دەتوانێ والە مرۆۋ بکات کە خاوەن مەراق و زانخواز بێت . خەم و جیابوونەوە و بەخێڵێبردنەوە و تەنیایی و دوژمنایەتی و فرمێسك و ورتە و بۆڵە و دەماودەم بوونی قسە و هەژاری و نەداری بێکۆتایی وەکوو کەلوپەلەکانی ئەم ماڵە هەمووی لەیەك دەچن : گڵێمە کۆنێکی ڕەنگین کە ڕەنگی چووە و کاڵ بووەتەوە ، قاپ و کەوچکێك لەسەر سینییەکی بۆرەك ، دوو سندووقی گەورە و بچووکی کۆن و لەکار کەوتوو ، بێوەژنێك کەوا دیارە هێشتا تەنیایە و شمشێرێکی کۆن بۆ ترساندنی دز و جەردە . ڕەشە گەڕایەوە و چووە لای کاسەیەك کەچمکی ڕووپۆشەکەی زەنگۆڵەی پێوەیە .

لە دواییدا بۆ ئەوەی کە ژنە مەراقدارەکەی خاوەن ماڵیش گوێی لێبێ بە دەنگێکی بەرز گوتی : " ژنی بۆخچەچی ! ئەمە بگرە و بیبە بۆ ئەو نەخۆشە بێچارەیە و پێیبڵێ ئەگەر وەڵامێکی هەبوو چاوەڕوانی دەکەم ، ئەمڕۆش لە ماڵی زاواکەمانم" هیچ پێویستییەك بەم گەمە و یارییانە نیە ، نابێ بۆ کوڕێکی هەرزەکاری وەکوو ڕەشە نامە و دەستماڵ ناردن و ئیشارەت وەرگرتن و گەڕان بە دوای هەڵبژاردنی کچێکدا عەیب بێت . نەکا بەراستی لەبەر ئەوەبێ کە چاوی بڕیبێتە کچی خاوەن ماڵەکە ؟ جارجار هیچ بڕوام بە ڕەشە نایەت و زۆر لەوە دەترسم کە لە دواییدا شەکورە هەڵخەڵەتێنێ . سەرەڕای ئەوەی تەواوی ڕۆژ لە ماڵێکدا لەگەڵ شەکورەدا دەمێنێتەوە کەچی ناتوانێ ئیشارەتێکی لێبدات . لە کۆڵانەکەدا جانتاکەم کردەوە، لەگەڵ نامەیەکدا دوانزە ئاکچەی تێدا بوو . زۆر دەمویست کە بزانم چی تێدایە ، هەر بۆیە بە هەڕا کردن بەرە و لای حەسەن ڕۆیشتم . لەبەر دووکانی میوە فرۆشەکاندا کەلەرم و گێزەریان دانا بوو ، بەڵام تەنانەت تاقەتی ئەوەشم نەبوو کە بڕۆمە لای ئەو پیازانەی وا هاواریان دەکرد و دەیانگوت وەرە ئەستەر ، وەرە دەستێکمان لێبدە بزانە چۆنین ، کە ڕۆیشتمە ناو کۆڵانەکە ، لەتە چنە تاتارەکە دیسان دەستی بە قسە کردن کرد . وتم : " سەیرە بەخوا ! " و تفێکم کردە نێو چاوانی ، ئەم سەرما و سۆڵەیە بۆ چی ئەم ناپیاوە نابەستێ و نایکوژێ ؟ . حەسەن نامەکەی لەبەر خۆوە دەخوێندەوە ، منیش بە زۆری خۆمم ڕادەگرت . لەدواییدا خۆمم پیڕانەگیرا و گوتم : " بەڵێ ؟ "

ئەویش دەستی بە خوێندنەوەی نامەکە کرد :

" شەکورە خان گیان ! داوای تەواو کردنی کتێبەکەی باوکتم لێدەکەی ، بابزانی لەوە زیاتر هیچ مەبەستێکم نیە و هەر بەو ئامانجەش هاتووچۆی

مالّی ئێوە دەكەم . وەكوو ئەوەی جاری پێشوو خۆیشت باستكرد بوو ، مەبەستم تێكدانی ئاسوودەیی ئێوە نیە ، ئێستا بە باشی هەست بەوە دەكەم كە عەشقی من بەرامبەر بە تۆ دەردی خۆمەو بەس. بەڵام ئەوەی ڕاستی بێت هەر لەبەر ئەم عەشقەش ناتوانم دەست بۆ قەڵەم بەرم و ئەو كتێبە بنووسم وا باوكت داوای لێكردوم ، هەر كات هەست بە هەبوونی تۆ لەو ماڵەدا دەكەم وشك دەبم و ڕادەوەستم و ناتوانم هاوكاری باوكت بكەم . زۆر بیرم لێكردەوە ، ئەم شتە تەنیا یەك هۆی هەیە ، ئەوەش ئەوەیە كە لە دوای دوانزە ساڵ تەنیا یەكجار ، ئەویش لەبەر پەنجەرەكەوە چاوم بە ڕوخسارت كەوت ، ولە لەدەستدانی ئەو خەیاڵە زۆر دەترسم . ئەگەر جارێكیتر لە نێزیكەوە تۆم بدیبایە ، ئیدی لە ونكردنی تۆ نەدەترسام و كتێبەكەی باوكیشم بە ئاسانی دەنووسی .شەوكەت دوێنێ بردمی بۆماڵە چۆڵەكەی جوولەكە هەڵواسراوەكە ، لەو ماڵە چۆڵەدا كەس نامانبینێ ، ئەمڕۆ دەبێ یان هەركاتێك كە تۆ بتەوێت دەتوانین بچین و لەوێ یەكتری ببینین . شەوكەت دەیگوت ، دوێنێ لە خەوتدا مێردەكەت بە مردوویی بینیوە . " لە هەندێك جێگای نامەكەدا زیكەزیكی دەنگی حەسەن وەكوو هی ژنێكی لێدەهات و لە هەندێك جێگاشدا وەكوو عاشقێكی سەرشێت و دەنگ لەرزۆك قاقای لێدەدا و پێدەكەنی . ڕستەی " دەمەوێ جارێكیتر بتبینم " ی بە شێوەیەكی گاڵتەپێكردن و بە فارسی گوتەوە و وتی :" كە بینینی شەكوورە هیوایەكی پێدا ، یەكسەر كەوتە ناو مامەڵەكردنیشەوە ، ئەم مامەڵەكردنانەش كاری عاشقێكی ڕاستەقینە نیە". بە هەموو پاكییەكی خۆمەوە گوتم :" بەڕاستی عاشقی شەكورەیە ".

– :" بەم قسەیەت ئەوەت سەلماند كە لایەنگری لە ڕەشە دەكەیت . هەر

ئەوەی کە وتوویەتی کاکەی منی لە خەودا بە مردوویی بینیوە ، خۆیمانای ئەوە دەدات کە مەرگی مێردەکەی قبوڵ دەکات ".

منیش وەکوو گەمژەیەك وتم :" ئەمە تەنیا خەیاڵێکە ."

وتی : " خۆم دەزانم کە شەوکەت چەندە ژیر و فێڵبازە . چەند ساڵی تەواو پێکەوە لەم ماڵەدا ژیاوین، ئەگەر زۆر لێکردنی دایکی نەبایە ، شەوکەت ڕەشەی نەدەبرد بۆ ماڵە چۆڵەکەی جوولەکەکە . شەکورە ئەگەر وادەزانیٚ کە دەتوانیٚ کاکەم و ئێمەش لە دوای خۆیەوە بهێڵێتەوە و پشتمان تێبکات زۆر بە هەڵەدا دەچێت، کاکەم هێشتا سەلامەتە و لە شەڕیش دەگەڕێتەوە . " قسەکەی هێشتا تەواو نەکرد بوو کە ڕۆیشتە ژوورەکەی ناوەوە ، دەیویست بە ئاگری ئاگردانەکە مۆمێك داگرسێنیٚ کە دەستی سووتا ، قیڕەیەکی بەرزی لێوە هات ، لە دواییدا بە دەست لێسانەوە چراکەی داگیرساند و داینایە سەر مێزەکە. لە ناو دەواتەکەوە قەڵەمێکی ئامادەی دەرهێنا و لەسەر لاپەڕەیەك بە پەلەپەل هەندێك شتی نووسی . وا هەستمکرد کە پێیخۆشە سەیری دەکەم ، بەڵام بۆ ئەوەی نەترسی خۆمی پێنیشان بدەم بە هەموو توانایەکەمەوە بزەیەکم لێدا .

– : " ئەم ماڵە هی کام جوولەکەیە ، تۆ دەزانی ؟ "

– : " تۆزێك لەو لای ماڵیانەوە ماڵێکی زەردی لێیە، ئەوەیە . ئەڵێن پزیشکی خۆشەویستی پادشا کە زۆر دەوڵەمەندیش بووە لە دوای ئەوەی جووولەکەکانی ( ئاماسیا ) دەکەونە ناو مەترسییەوە ، بەیارمەتی پادشا براکەی خۆی لەوێدا شاردۆتەوە ( بە قسەی ئەوانە ) ساڵانێك بەر لە ئێستا ڕۆژێك بەرلە جەژنی بیٚهەویر لە گەڕەکی جوولەکەکاندا لاوێکی ڕوومی ون بووە و لە دوایشدا ژنەکەی سەر دەبڕن کە خەریکی ئامادەکاری جەژنی بیٚهەویرە . کە شایەتی درۆینە دەردەکەون و یەهودییەکان تاوانبار دەکەن ،

کوشتاری یەهوودییەکان دەستپێدەکات . پزیشکی پادشاش براکەی و ئەم ژنە جوانە دەفڕێنیٚ و بە یارمەتی پادشا دەیانشارێتەوە ، پیاوەکەیان هەڵواسی و لە سیٚدارەیاندا ، بەڵام تاوەکوو مردنی پادشا کەس دەستی لە ژنەکە نەدا . "

حەسەن وتی : " ئەگەر شەکورەش چاوەڕێی هاتنەوەی کاکم نەکات ، سزای دەدەن" ونامەکانی پێدام . لە ڕوومەتی‌دا لەباتی کین و نەفرەت ، بیٚبەختی و بیٚئومێدی تایبەت بە عاشقان دیار بوو . لە چاوەکانیدا وەها دیار بوو کە عەشق لە ماوەیەکی کورتدا ئەم پیاوەی پیر کردووە . ئەو پارەیەش کە قازانجی دەکرد ، گەنجی نەدەکردەوە . لە نیگا شکاوەکانیدا وەها دیار بوو کە دەیەویٚ پێم بڵیٚ چۆن دەتوانم شەکورە فریو بدەم .بەڵام گەیشتبووە ئەو ڕادەیەی کەوا لەبەر خراپی خۆی پرسیاری ئەمەشی نەدەکرد . کاتیٚ مرۆڤ ئەوەی پیٚقبووڵ کرا کە کەسێکی باش نیە ــ ( کەرەتکران لە عەشقدا کاریگەرییەکی زۆری هەیە ) ــ دوابە دوای ئەوە شتی مەترسیدار خۆی لە خۆیەوە دێت. چاوم بەو شتە کەوت کە منداڵەکان باسیان کرد بوو، ئەو شمشێرە سوورەم بینی کەوا هەر شتێکی بەربکەویٚ دەیبڕیٚ. ئەوەندە ترسام کە وەکوو ئەوەی بمەویٚ هەڕا بکەم بە زۆری و بەپەلەپەل خۆمم خستە ناو کۆڵانەکەوە . لەبەر ئەوەش بە خۆڕایی کەوتمە بەر قسە و جنێوی لەتەچنە تاتارەکەوە . بەڵام خۆمم کۆ کردەوە و بەردێکی بچووکم لە زەوی هەڵگرت و خستمە ناو دەستماڵەکەیەوە و گوتم : " بگرە ، تاتاری گەڕ . " بەبیٚ ئەوەی پێکەنم تەماشای ئەوم دەکرد کە چۆن دەست دەبات بۆ بەردەکە کەوا دەزانیٚ پارەیە . گوێم نەدایە جنێوەکانی و ڕۆیشتمە ماڵی یەکێك لەو کچانەی کەوا دابووم بە شوو .

کچە شیرینەکەم بۆرەکێکی ئەسپەناخی پێدام ، هی دوێنیٚ بوو ، بەڵام

کرتە کرتەکەی مابوو ، بۆ نیوەڕۆش گۆشتی بەرخی لێدەنا ، وەکوو ئەوەی وا من حەزی لێدەکەم ، پڕی کرد لە هێلکە و بە هەڵوژەش تۆزێك ترشی کرد و لێیگەڕا بۆ ئەوەی باش دەم بکێشێ . لەبەر ئەوەی دڵی دانەمێنێ دانیشتم و بە نانی گەرمەوە تۆزێکم لێخوارد. خۆشاوی ترێشی لێنابوو ، بەبێئەوەی شەرم بکەم داوای دۆشاوەکەشم کرد و کەوچکێکم لەگەڵ خۆشاوەکەدا تێکەڵکرد و بۆ ئەوەی خواردنەکە بکوتێتەوە خواردم و لە دواییدا نامەکانی شەکورە خەمبارەکەم برد .

## (( من شەکورەم )) (26)

کاتێ خەیرییە وتی ئەستەر هاتووە ، خەریکی خستنە ناو دۆلابی ئەو جەلانە بووم وا دوێنێ شتبوم . خەریك بووم بڵێم ... ، بەڵام با درۆتان پێنەڵێم ، لە بەر چی درۆتان لەگەڵدا بکەم ؟ باشە ، کاتێ ئەستەر هات لە کونی دۆڵابەکەوە تەماشای ڕەشەم دەکرد کەلەگەڵ باوکمدا دانیشتبوو ، لە لایەکی تریشەوە زۆر بێ ئارام بووم و چاوەڕوانی هاتنی نامەکانی ڕەشە و حەسەنم دەکرد ، بۆیە عەقڵیشم لە لای ئەستەر بوو . لە بەر ئەوەی ترسی باوکم لە مەرگ پشتی بە گومانێکی بەحەقەوە دەبەست ، منیش ترس دایگرتبووم . هەروەها ئەوەشم دەزانی کە عەشقەکەی ڕەشەش لە بەرامبەر من تا سەر نیە و ئەوەها نامێنێتەوە . ڕەشە چەندە عاشقە ، ئەوەندەش بیر لە هاوژینی دەکاتەوە . هەر لە بەر ئەم ویستی هاوژینیەشە کەوا زوو عاشق دەبێ . ئەگەر منیش نەبم و بیەوێ لەگەڵ کەسیتردا هاوژینی بکات ئەوا عاشقی ئەو ژنەش دەبێت. خەییریە ئەستەری بردبووە ناو موتبەخەکەوە و شەربەتێکی ئاوی گوڵی دابوو بەدەستیەوە، لەو ساوەی کە باوکم دەچووە

سەر باسەکە و قسەی دەکرد گومانم لەوە کرد بوو کە خەیرییە هەموو ئەو شتانەی وا ڕوو دەدەن دەیگێڕێتەوە بۆ باوکم . زۆر دەترسام .

ئەستەر وتی : " چاو ڕەشەکەم ! کچە بەخت ڕەشەکەم ! لەبەر ئەوەی بەرازەکەی مێردم نەیدەهێشت درەنگ هاتم. باشی ئەوەیە کە تۆ مێردت نیە تا بچیێ بە گژتا ، نرخی ئەم شتە بزانە . " کەنامەکانی دەرهێنا ، پەلاماری دەستیمدا و وەرمگرت ، خەیرییە لە دەوروبەرماندا نەبوو ، بەڵام دەمزانی کە ئێستا خۆی لە شوێنێکدا مەلاس داوە ، بۆ ئەوەی کە چاوی بە ڕوومەتم نەکەوێ ، پشتم هەڵکردە ئەستەر و نامەکەی ڕەشەم لە پێشدا خوێندەوە . کە بیرم لە ماڵە چۆڵەکە کردەوە لە ناکاو لەرزەیەك هەموو گیانمی داگرت . بە خۆمم وت مەترسە شەکوورە ! تۆ توانایی ئەوەت هەیە کە ڕوو بە ڕووی هەموو شتێك بیتەوە. نامەکەی حەسەنم خوێندەوە ، ئەویش خەریك بوو هاربێ : " شەکوورە خان : خەریکە پل پل دەسوتێم ، بەڵام دەزانم کەتۆ هیچ خەمێکت نیە ، شەوان لەدوای خەیاڵی تۆوە خۆم لەتەپۆڵکە بێدەنگەکانەوە بەردەدەم و هەڕا دەکەم . دەزانم کە ئەو نامەیەی وا بۆ تۆم ناردوون، دەیانخوێنیتەوە ، بەڵام هەر جارێك بێ وەڵام دەیانهێڵیتەوە ، ئەمەش وەکوو ئەوە وایە کە تیرێکی سێ سەر لە دڵم کەوتبێ . لە بەر خۆمەوە وتم لەوانەیە وەڵامی ئەمەیان بداتەوە بۆیە نووسیم . بیستویانە و قسەکەت دەم بە دەم گێردراوەتەوە و دەڵێن کە بە مناڵەکانت گوتوە خەوم بینیوە کە مێردەکەم مردووە و ئیدی منیش بووم بە بێوە ژن . نازانم ئەمە ڕاستە یان نا ،بەڵام تەنیا شتێك کە من دەیزانم ئەوەیە کە تۆ هاوسەری براکەمی و ئەندامێکی ئەم بنەماڵەی . ئیدی لەبەر ئەوەی کە باوکم حەقم پێیدەدا، ئیمرۆ دەچین بۆ لای قازی بۆ ئەوەی کە تۆ بگەڕێنینەوە . لەگەڵ

چەند پیاوێکدا دین بە دواتا ، با باوکیشت ئاگادار بێ، کۆڵ و بارەکەت حازر کە ، دەگەڕێیتەوە بۆ ماڵ . وەڵامەکەم بە ئەستەردا بۆ بنێرە . " بۆ جاری دووهەم نامەکەم خوێندەوە و تەماشای ئەستەرم کرد . بەڵام لە بارەی هیچ کامیانەوە شتێکی تازەی پێنەگوتم . قەڵەمێکم لە پاڵ مەنجەڵەکەدا شاردبووەوە ، دەرم هێناو لاپەڕەیەکم خستە سەر تەختەی نانەکەو خەریك بوو نامەیەك بۆ ڕەشە بنووسم کە ڕاوەستام . شتێك هات بە مێشکمدا ، گەڕامەوە و تەماشای ئەستەرم کرد، شەربەتەکەی وەکوو منداڵێکی گووپن هەڵقووڕاند ، کە تەماشام کرد وامزانی کە دەزانم ئەستەر ئاگادارە لەو شتەی کەوا من بیری لێدەکەمەوە . شتێکی زۆر پڕ و پووچە و فڕی بە ڕاستیەوە نیە . قەڵەم و کاغەزەکەم خستەوە جێگای خۆی و بزەیەکم بە ڕووی ئەستەردا لێدا . وتی : " سەیر کە چ شیرین دەکەنێ کچە جوانەکەم ، خەمت نەبێ هەموو شتێك بە خۆشییەوە کۆتایی پێدێ . هەر پەنجەیەکت هونەرێکی لێدەبارێ ، کچێکی ژیر و دانامەی ، بە سەدان کەسی دەوڵەمەند و وبەدەیان پاشا لەم شارەدا هەن کە ببن بە هاوسەرت . " دەزانن کە جار جار بڕوامان بە شتێك هەیە . بەڵام کاتێك باسی دەکەین بە شێوەیەکیتر دەیگێڕینەوە ، و لە دوایشدا دەڵێن بۆچی من وادەکەم ؟ ! لەگەڵ ئەوەی بڕوام بە شتەکە هەیە دیسان بە شێوەیێکیتر باسی دەکەم !

– : " بەڵام ئەستەر ! کێ ئامادەیە لەگەڵ بێوەژنێکدا ببێت بە هاوسەر کە دوو منداڵی هەتیووی هەبێت ؟ "

– : " لەگەڵ تۆدا ؟ ! زۆر کەس هەن کە دەیانەوێ " تەماشای نێو چاوانمی کرد . وەها بیرم دەکردەوە کە حەزی لێدەکەم . ماوەیەکی زۆر بێدەنگ بێدەنگ دانیشتم . کە زانی نامەی پێنادەم و تەنانەت پێویستە کە

بچیٚ ، یەکسەر کۆڵەکەی هەڵگرت و ڕۆیی . نازانم چۆن پێتان بڵێم ! لە دوایی ڕۆیشتنی ئەرستەریش هەروا بێدەنگ مابوومەوە و لە گۆشەیەکدا بۆخۆم دانیشتبووم . دوایی هەستامە سەر پیٚ و پاڵمدا بە دیوارەکەوە وە لەسەر پیٚ مامەوە . بیرم لە خۆم دەکردەوە ، چیبکەم ؟ چی لەو ترسە بکەم کەوا لە دڵمدا گەورەتر دەبێت ؟

لەم بەینەدا گویٚم لە دەنگی ئورهان و شەوکەت بوو کە لەسەرەوە پێکەوە لەگەڵ یەکدا قسەیان دەکرد . شەوکەت دەیگووت :" وەکوو ژن ترسنۆکیشی " ئورهان دەیگوت :" تۆ لە دواوە هێرش دەکەیت ، ددانم دەلەقێتەوە " لە لایەکی تریشەوە ئەقڵم لەلای قسەو باسەکانی باوکم و ڕەشەبوو . لە بەرئەوەی دەرگا شینەکەی ژوری نەخشەکێشان کراوەبوو ، بە ئاسانی گویٚم لە هەموو شتێك دەبوو . باوکم وتی :" لەدوای تەماشاکردنی وێنە کەسییەکانی ( پۆرترا ) وەنیزەیەکان مرۆڤ بە ترسێکەوە تێدەگات کە لەو وێنەدا چاوی هەر کەسێك لەیەك ناچێت وە شتە خرۆڵەیەکی کۆن نیە ، بەڵکوو بەپێچەوانەوە وەکوو ئاوێنە گەڕانەوەی ئەوە دەکات و وەکوو چاڵەئاویش پڕ دەبێت و دەقاو دەق وەکوو چاوی ئێمەیە . لێوەکان وەکوو لاپەڕە شتانێکی ڕێك و ڕاست نین کەوا لەسەر ڕومەت کێشرابیٚ ، بەڵکوو بە جەم بوونەوە و نەرم بوونەوەی خۆیانەوە گوزارشت لە خۆشی و ناخۆشی و ئازارەکانمان دەکەن . هەر لێۆێك سوورێکی جیاوازە و گرێیەکی واتادارە . لوتیش ئەوە نیە کەوا وەکوو دیواری بەین تەنیا ڕوومەتمان بکا بە دوو کەرتەوە . بۆیە هەر وێنەیەك شتێکی جیاواز و بوونەوەیەکی زانخوازە " داخۆ کاتیٚ باوکم بە ناوی ئێمەوە باسی ئەو گاورانەی دەکرد کە وا وێنەکانیان دروست کردووە ڕەشەش هەر وەکوو من سەری سوور دەبیٚ یان

نا ؟ لە کۆنەوە سەیرم کرد ، ڕەشە ڕەنگی هەڵگەڕابووەوەو کاڵ بووبوو ، بۆ ساتێك زۆر ترسام . ڕەشە ئەسمەرەکەم ! گیانەکەم ! پاڵەوانە خەمبارەکەم ! لە وە دەچێ شەو خەوت لێنەکەوتبێ‌و بیرت لەمن کردبێتەوە بۆیە ئەوەها ڕەنگت هەڵگەڕاوە ؟ لە وانەیە کە نەزانن : ڕەشە پیاوێکی باریکەلە و باڵا بەرزە ،کوڕێکی قۆز و ناو چاو پانە و چاوەکانی وەکوو بادام کێشراوەیە ، لوتێکی جوان و گەورەی هەیە ، دەستەکانی وەکوو کاتی منداڵی هەروا درێژە ، پەنجەکانی زۆر جوڵە جوڵ دەکەن ، کاتێ هەڵدەسێتەوە وەکوو تولێك وایە، ڕێك و بەرزو ناوشان پانە. لە منداڵیدا سینە و دەم وچاویشی جێگای خۆی نەگرتبوو . لە دوای دوانزە ساڵدا کە لەم پەنجەرە تاریکەوە تەماشای ڕەشەم کرد ، هەستم بەوە کرد کە گەورە بووەو بووە بە پیاوێکی تەواو . ئێستاش کە چاوم دەخەمە سەر کونەکەوە ، چاوم بە خەم وپەژارەیە دەکەوێ کە وا دوانزە ساڵ بەر لە ئێستا لە ڕوومەتیدا دیار بوو، وەکوو خۆی ماوەتەوە .

لەبەر ئەوەی لە بەر من ئەم هەموو ئازارەی کێشاوە لە لایەکەوە خۆم تاوانبار دەبینم و لە لایەکی تریشەوە شانازی بە خۆمەوە دەکەم . کاتێ باوکم تەماشای وێنەیەکی دەکرد و قسەی بۆ ڕەشە دەکرد ، ڕوومەتی وەکوو هی منداڵێك پاك و بێگەرد دەبوو . هەر لەو کاتەدا کە دەمە پەمبەیەکەی دەکردەوە لە دڵەوە دەمویست سەری مەمکە سپییەکانم بخەمە ناو دەمییەوە لێی گەڕێم بۆ ئەوەی تێر تیر بیمژێ . وا خەیاڵم دەکرد کە دەستم بە پشت ملیدا دەگەڕێنم و نەوازشی دەکەم و پەنجەکانیشم دەخەمە ناو قژەکانیەوە ، ڕەشەش وەکوو پەناگەیەك سەر دەخاتە نێو مەمکەکانمەوە ، ئەو بێچارەیە وەکوو منداڵەکانم ئارام دەگرێ ! و لە خۆشیدا تەزوویەك

دێت به لاشیدا و چاوەكانی دەگریٚ . له ڕاستیدا تێگەیشتم كه بەمانەوە ڕەشه هەتادوایی گرێدراوی من دەمێنێتەوە . ئەم خەیاڵەم ئەوەنده لا خۆش بوو كه تۆزێك ئارەقەشم كرد بوو و واشم دەزانی كه ڕەشه تەماشای ئەو وێنه شەیتانیانه ناكات كەوا باوكم نیشانی دەدات ، بەڵكوو به سەر سوورڕمایی و به سەرەنجێكی تەواوەوە تەماشای مەمكه گەورەكانم دەكات . نەتەنیا مەمكەكانم بەڵكوو وەكوو سەرخۆشێك سەیری قژ و شان و مل و هەموو جێگایەكمی دەكرد . ئەوەنده دڵی لەمن چوو بوو كه ئەو قسانەی وا له كاتی جوانیدا نەیدەتوانی پێم بڵیٚ هەمووی پیٚگوتم . له ڕوومەتی و له نیگاكانیەوە دیاربوو له لەخۆبایبوونەكانم ورەشایی چاوەكانم و لەبەرامبەر تەربییەت و نامەكەم و چاوەڕوانكردنی شووەكەمدا سەری سووڕ ماوە . لەبەر ئەوەی نەیدەهێشت جارێكیتر شوو بكەم زۆر له باوكم تووڕە بووم : له بیرەوەریەكانی وەنیزی و وێنەكانی كەوا له ژێر كاریگەری وەنیزییەكان و به چاوبڕینه ئەوان لەگەڵ شێوەكارانیدا درۆستیدەكرد بێزار بوو بووم .

كه چاوم گرتەوە ( خودایا خۆت ئاگاداری من ئەمەم به داخوازی خۆم نەدەكرد) له خەیاڵمدا ڕەشه زۆر شیرین بوو بوو ، نزیكم دەبووەوە. ئەوەنده شیرین بوو كەوا هەستم دەكرد له ڕاستیدا له تاریكاییەكەوە هاتووەته پشتی سەرم . هاتوو پشت ملم و نێوچاوانمی ماچكرد . دەستی هێنا بەپشت و جەستەمدا و پشت گوێمی ماچكرد . وامدەزانی زۆر بەهێزه ، لەبەر ئەوەی بەهێز بوو و تەندروستییەكەشی باش بوو پاڵیشم پێوە دابوو . وا هەستم كرد كه له پاراستن دام و خۆمم له ئاسوودەییدا بینییەوە . پشت ملم ختوكەی دەهات، سەر مەمكەكانمی ماچكرد . وامدەزانی چاوەكانم بەستراوەو شتەكەی ڕەشەش ڕەپ بووە و نزیكی من دەبێتەوە ، سەرم خولی

دەخوارد ، ئاخۆ دەبێت شتەکەی ڕەشە چۆن بێت ؟ جاری وا هەیە لەخەومدا مێردەکەم شتەکەی خۆی بەئێش و ئازارەوە نیشان دەدام. لەلایەکەوە قەلغانەکەی خۆی لەبەرامبەر تیری سەربازە سەفەوییەکاندا بەرز کردۆتەوە و ڕێ دەکات و نزیکی ئێمە دەبێتەوە ، بەلاّم بەداخەوە چۆمێك لەنێوانماندا هەیە . لەولای ئاوەکەوە لەناو ئێش و ئازارەکانیدا بانگم دەکات، منیش تەماشا دەکەم و دەبینم کەوا شتەکەی لە جاران گەورەتر بووە. بەپێی ئەو شتەی کە بووکە گورجییەکە دەیگووت و پیرەژنە عەجووزەکانیش باسیان دەکەن ، ئەگەر ڕاست بێ‌و وەها بێ هی مێردەکەی من زۆر گەورە نەبووە و وەکوو جارانە. لەخۆمەوە وتم ئەگەر شتەکەی ڕەشە گەورەتر بێت ، یاخود ئەو شتەی کەوا لەدوای ئەوەی لاپەڕەیەکی نەنوسراوم بە شەکەوتەوە بۆنارد و لەخوار بەنەخوێنەکەیەوە بینیم هی ئەو بێ ــ کەهی خۆی بوو ــ ئەبێ چی ببێ ، ترسام و وتم یان وەکوو لەناوەوە جێی نابێتەوە یاخود زۆر ئازارم پێ دەگەیەنێ .

- : " دایکە شەوکەت لاسایم دەکاتەوە " ، لە گۆشەی دۆلاّبەکەوە هاتمە دەرەوە و بە بێ دەنگییەوە ڕۆیشتمە ژوورەکەی تر ، لەناو سندووقەکەدا چۆخە سوورەکەم هەڵگرت و لەبەرم کرد . دۆشەکەی منیان دەرهێنابوو و لەسەری یاریان دەکردو پاڵیان دەنا بەیەکەوە .

- : "مەگەر پێمنەگوتن کاتێ ڕەشە دێت بۆ ئێرە مەقیرێنن ؟ "

شەوکەت وتی : " دایە ! بۆچی ئەو چۆخە سوورەت لەبەر کردووە " ئۆرهان وتی : " بەلاّم دایە ! شەوکەت لاساییم دەکاتەوە ."

-: " مەگەر پێمنەگوتی لاسایی ئەو مەکەرەوە ؟ ئەم شتە پیسە چیە کەوا لێرەیە ؟ " پارچەیەك لە پێستی حەیوانێکی لێبوو . ئورهان وتی :"

لاك ، " شەوكەتیش لە ناو پیّ هەڵی گرت .

- : " یەكسەر بیبەنەوە ئەو جێگایەی كەوا لەویّ هێناوتانە " ئۆرهان وتی :" با شەوكەت بیبات "

- :" دەی زووكەن مەگەر من چیم وت ؟"

بەرلەوەی بگەمە ئەوان دەستم بە گەزكردنی لێوم كرد . كاتێك چاویان بەمە كەوت یەكسەر زانییان كە چەندە جدیم و ڕۆیشتن ، شەلاّ زوو دەگەڕێنەوە و سەرمایان نابێت.

لە نێو هەموو وێنەكێشاندا تەنیا ڕەشەم بە دلّ بوو ، چونكە لە هەموو زیاتر حەزم لێدەكا و منیش دەمارەكانی دەناسم ، كاغەز و قەڵەمێكم دەرهێنا ولە ناكاو بەبێئەوەی بیر بكەمەوە ئەمەم نووسی :" باشە ، بەرلە بانگی شەو لە ماڵە چۆڵەكەی جوولەكە هەڵواسراوەكەدا دەتبینم ، كتێبەكەی باوكم زووتر تەواوبكە". یەكسەر وەلاّمی حەسەنم نەدایەوە چونكە ئەگەر بەراستی ئەمڕۆش بچێتە لای قازی ، باوكی و پیاوەكانی یەكسەر خۆبەسەر ماڵی ئێمەدا دانادەن و نایەن . ئەگەر وەها بایە نامەی نەدەنووسی و داوای وەلاّمی نەدەكرد و یەكسەر دەهاتە سەر ماڵەكەمان . ئێستاش چاوەڕێی وەلاّمی من دەكات ئەگەر وەلاّمی نەدەمەوە ، شێت و هار دەبیّ و ئەو كات دەست بە كۆكردنەوەی پیاوەكانی دەكات ، ئامان ئامان ! وەها بیر نەكەنەوە كە هیچ لێی ناترسم . ئەگەر ڕاستیتان بویّ ، لەبەر ئەوەی لە ئەو دەترسم بڕوام بە ڕەشە هێناوە . بەلاّم شتی ناو دڵی خۆمتان پیّ بڵێم: لەوە دەچیّ زۆریش لە حەسەن نەترسم ، چونكە حەز لەویش دەكەم . ئەگەر تووڕە بن و بڵێن ئەم خۆشەویستییەی تۆ بۆ بە چی ، حەقتان پێدەدەم ، ئەمە لەبەر ئەوە نیە كەوا لەو ساڵانەی وا پێكەوە لە ماڵێكدا

دەژیاین و چاوەڕێی میردەکممان دەکرد لە پیسی و پۆخەڵەیی و دڵنزمی ئەم پیاوە تێنەگەیشتووم ، تێگەیشتووم ، بەڵام ئەستەر دەڵێ ئێستا پارەی زۆر قازانج دەکا و منیش ڕاستی ئەمە لە ئەبرۆ قەڵخانییەکانی ئەستەرەوە تێدەگەم . ئیدی لەبەر ئەوەی پارەی هەیە ومتمانەی بە خۆ هەیە ، لایەنە خراپەکەی کەوای لێکرد دوور کەرەوە بێ نەمانەوە ومنیش وەها بیرم دەکردەوە کە لایەنە تاریکەکەی و ئەو شتەی وا وەکوو هی جندۆکەیە و زۆر سەیرە و سەمەرەیە خەریکە من بەرەو لای خۆی ڕادەکێشێ ، ئەم لایەنەیم لە پێداگری ناردنی نامەکانیەوە بۆ دەردەکەوت. ڕەشە و حەسەن لەبەر ئەوەی عاشقی من بوون ، ئازاری زۆریان کێشاوە ، ڕەشە دڵتەنگ بوو، دڵی شکا و دوانزەساڵ دوور کەوتەوە و دیار نەما ، حەسەنیش هەموو ڕۆژێك لە ناو ئەو لاپەڕانەی وا کەنارەکانی وێنەی پەلەوەر و ئاسکی لێکێشرا بوو نامەی بۆ دەنووسیم و دەینارد بۆم . سەرەتا لە خوێندنەوەی ئەو نامانەدا فێری ترس و لە دوایشدا بەرامبەر بە ئەو هەستی زانخوازیم پێشکەوت .لەبەر ئەوەی دەمزانی حەسەنیش مەراق دەکا و دەیەوێ هەموو شتێکی من بزانێ سەرم سووڕ نەما کە دەیزانی من گوتومە مێردەکەم لە خەودا بە مردوویی بینیوە . ئەوەی وا گومانم لێدەکرد ئەوە بوو کە لەوە دەچێ ئەستەر نامەکانم بۆ حەسەن بخوێنێتەوە ، هەر بۆیە نامەکەم بەرێگایی ئەستەرەوە بۆ نەنارد ، خۆ ئێوە خۆتان دەزانن کە گومانەکانی من چەندە ڕاستن ، یان نا .

کاتێ منداڵەکان گەڕانەوە گوتم لە کوێ بوون ؟ بەڵام یەکسەر زانیان من ئەمەم بە تووڕەییەوە نەگوتووە . بە دزی ئورهانەوە شەوکەتم هێنایە لای خۆم ، لە لای دۆڵابە تاریکەکەدا دامنایە باوشمەوە و شان و مل وقژ و تەوێلیم ماچکرد و گوتم : "گیانەکەم ! سەرمات بووە ، ئەو دەستە

جوانانەت بدە لە دەستی دایکی خۆت تا گەرم ببنەوە، دەستەکانی بۆنی لاشەی لێوە دەهات بەڵام هیچم نەگوت ، سەریم نووساندە مەمکەکانمەوە و باش باوشم پێدا کرد . تۆزێك دواتر گەرمی بووەوە و وەکوو پشیلەیەك بە شیرینیەوە و بەخستی دەیخیزاند . وتم : " بڵێ بزانم ، زۆر حەز لە دایکت دەکەی ؟ "

ئ ، ئ ، ئ ، ئم ، ئم .

بەڵێ ؟

بەڵێ .

لەهەموو کەس زیاتر ؟

" بەڵێ " منیش وەکوو ئەوەی نهێنییەکی پێبڵێم گوتم : " کەوا بوو شتێکت پیٚدەڵێم بەڵام بەکەس نەڵێی." لە بێخی گوێیدا وتم : " منیش تۆم لە هەموو کەس زیاتر خۆش دەوێ "

– : " لە ئورهانیش ؟ "

– : " ئەرێ ، لە ئورهانیش زیاتر ، ئورهان هێشتا منداڵە و وەکوو سلۆقەتەیەك وایە و هێشتا تێناگات ، تۆ ژیرتری و تێدەگەی . " بۆنی قژەکانیم کرد و ماچمکرد و گوتم : " لەبەر ئەوەش ئێستا داوای شتێکت لێدەکەم ، دوێنێ کاغەزێکی نەنووسراوت برد بۆ ڕەشە ، ئەمڕۆش بەبێئەوەی کەس بزانێ ئەمەی بۆ بەرە ، دەیبەی ؟ "

– : " ئەو باوکم کوشتووە ؟ "

– :" چی ؟ "

– : " دوێنێ خۆیلەماڵە چۆڵەکەدا پێی گوتم "

– : " چی گوت ؟ "

– : " گوتی من کەسی زۆرم کۆشتوە و باوکی تۆشم کوشتووە . " لەناکاو شتێك بوو بوو ، شەوکەت لە باوشم دەرکەوت بوو دەگریا . ئەم منداڵە ئێستا بۆ چی دەگری ؟ باشە .وابزانم تۆزێك بەر لە ئێستا خۆمم ڕا نەگرتبێ و شەپەزللەیەکم لێدابێ، نامەوێ کەس وا بیر بکاتەوە کە دڵێکی بەردینم هەیە بەڵام من لە بەر ئەوە تووڕە بوو بووم کە قسە بەو پیاوە دەڵێ وا من دەمەوێ لەبەر ئەوان لەگەڵیدا زەماوەند بکەم . هەتیوە بێچارەکە ! هێشتا دەگری ، زۆرم پێ‌ناخۆش بوو . خەریك بوو منیش بگریم . باوەشمان کرد بە یەکدا . جار جار هەنیسکێکی هەڵدەدا بەڵام ئایا دەبێ لەبەر زللەیەك ئەوەندە بگری ؟ دەستم هێنا بە پرچەکانیدا .

هەر شتێك وەها دەستی پێکرد : خۆ دەزانن ڕۆژی بەرێ لە نێو قسەکانمدا بە باوکم گوتبوو کە لە خەومدا مێردەکەمم بە مردوویی بینیوە . نەگەڕانەوەی مێردەکەم بۆ ماوەی چوار ساڵ لە شەڕی عەجەمەکاندا بوو بوو بە هۆی ئەوەی کە زۆر جار خەوی پێوە ببینم : تەرمێکی لێبوو ، نەمزانی هی ئەو بوو یان نا ، لێرەدا هیچ شتێك ئاشکرا نەبوو . خەو بینین هەموو جارێك بەکاری شتێکی‌تر دێت .

لەو پورتەغاڵەی وا دایە پیرەی ئەستەر لەوێوە هاتووە ، ئەمە بە کەڵکی جووتبوونی زەندیقەکان و شەیتانەکان لەگەڵ یەکدا هاتووە . ئەگەر ئەو کاتە داپیرەی ئەو لەگەڵ بنەماڵەکەیدا وتبێتیان ئێمە واز لە جوولەکایەتی دێنین و دەبین بە خاچپەرەستی کاتۆلیك ، ئەشکەنجەچییەکانی ئەوێ بڕوایان پێ‌نەهێناون و هەموویان ئازار داون و بەمجۆرەش لەگەڵ ئەوەی کە خەوی هاتنە لای‌یەکی زەندیق و شەیتانیان خستۆتە مێشکیان ، خەوی نەبینراوی تریشیان بە زۆری لێدان خستوەتە مێشکیانەوە و ئەوانیش

وایانزانیوه له خەویشدا ئەشکەنجه دەکرێن ، ئەمەش بۆ ئەوه کراوه که خۆ به دەستەوه بدەن و ناوی کەسی تریش بهێنن ، تاوەکوو تاوانبار بکرێن و بسوتێنرێن . بەمجۆرەش ئەم خەوه بەکەڵکی ئەوەهاتووه .

خەونەکان بۆ سێ شت بەکەڵك دێن : ئەلف = داوای شتێك دەکەی بەڵام ڕێگا بەوه نادەن که داخوازییەکەت دەربڕیت ، تۆش دەڵێی له خەودا بینیمه و بەمجۆرەش بەبێ ئەوەی که داوابکەیت داخوازییەکەت دەردەبڕیت.

بێ = دەتەوێ دەرهەق بەیەکێ خراپه بکەی . بۆ نمونه یەکێك تاوانبار دەکەیت. ئەوسا دەڵێی له خەومدا بینیومه که بۆ نمونه فلانه ژن زینای کردووه یان وەکوو بەسینی شەرابیان بۆ فلانه پادشا بردووه . بەمجۆره ئەگەر کەسیش بڕوا نەکات دیسان هەر بەشێکی تاوانەکه دەکەوێته پاڵ ئەوکەسه .

جیم = دوایی شتێك دەکەویت بەڵام خۆشت نازانیت چیت دەوێت . خەوێکی تێکەڵ و پێکەڵ دەگەڕێتەوه، یەکسەر شیدەکەنەوه و باسی ئەوەت بۆ دەکەن چیت دەوێت و دەتوانن چیت پێبدەن ، بۆنمونه دەڵێن : شوویەك منداڵێك ، یاخود ماڵێکت پێویسته و ... ئەم خەوه خەیاڵانه هیچ لەوانه نین وا له خەونەکانماندا دەیانبینین ، هەرکەس ئەو خەیاڵانەی وا لەڕۆژی ڕۆشندا کردوویەتی وەکوو هی شەو دەگێڕێتەوه بۆ ئەوەی سوودی لێوەربگرێت . ئەوکاتەش یان وەکوو گاڵتەت پێدەکەن یاخود وەکوو هەموو جارێك به خراپەیی بۆتی شیدەکەنەوه . هیچ کەس تەنانەت ئەوەی خۆشی خەیاڵی کردبێت بڕوا به خەونی ڕاستەقینەی ناکات . نەکا ئێوه بڕوای پێبکەن ؟ کاتێك به لالێوێکەوه باسی مردنی مێردەکەم بۆ باوکم کرد ، باوکم وتی خەونەکان هەموو ڕاستییەکت نیشان نادەن . بەڵام کاتێك له هەڵگرتنی

تەرمەکە گەڕابووەوە ئەم خەونەی منی پیٚڕاست بوو، بەم شیٚوەش لە ماوەی چوار ساڵدا کەکەس بڕوای بە مردنی شووەکەی من نەدەکرد ، هەروا بەئاسانی مرد و وەکوو بڵیٚیکە بانگەوازی کرابیٚ هەموو کەسیش پیٚیزانیبوو و زۆریش خەمبار بوو بوون . پرسیارم لە شەوکەت کرد و گوتم تۆ خەون دەبینی یان نا ؟ بە پیٚکەنینەوە وتی : " بەڵیٚ ، باوکم دیٚتەوە بەڵام خۆم دەبم بە هاوسەری تازەت . " لووتە باریکەڵە و چاوە ڕەشەکانی و پشتە پانەکەی لە هی باوکی نەدەچوو ، بەڵکوو لە هی من دەچوو ، جارجاریش لەبەر ئەوەی نەمتوانیوە نیٚو چاوە بەرز و پانەکەی باوکیان پیٚبدەم خۆم بە تاوانبار دەزانم .

دەهەستە بڕۆ لەگەڵ براکەت یاری شمشیٚر بکە . "

" بەڵیٚ " ، ماوەیەکی زۆر گویٚم لە دەنگی گەمە و یاری منداڵەکان ڕاگرت و تەماشای بن میٚچەکەم کرد و تیٚکۆشام بۆ ئەوەی بە سەر ترسەکەی نیٚو دڵمدا زاڵ ببم . ڕۆیشتمە موتبەخەکە و گوتم : " خەیرییە ! ئەوە چەند جارە باوکم داوای شۆربای ماسی دەکات ، لەوانەیە بتنیٚرم بۆلای کەشتییەکە . لەو باستیخەی وا شەوکەت حەزی لیٚدەکات چەند پەلیٚك دەرخە و بیدە بە منداڵەکان با بیخون ." کاتیٚ شەوکەت خەریکی خواردن بوو من و ئورهانیش چووینە ناو ژوورەکە و دانیشتین ، گرتمە باوەشمەوە و ملیم ماچکرد و گوتم : " بۆنی ئارەقت لیٚدیٚ، لووتت چی لیٚهاتووە ؟ "

– : " شەوکەت وتی ئەمە شمشیٚرە سوورەکەی مامەمە و لیٚیدام . "

– : " شین بووەتەوە . " دەستم لیٚدا و گوتم : " دیٚشیٚ ؟ ئەم شەوکەتەش چەندە بیٚفیکرە ! سەیر کە بزانە چیت پیٚدەڵیٚم: تۆ کوڕیٚکی ژیر و دڵناسکی ، داوای شتیٚکت لیٚدەکەم ئەگەر ئەنجامی بدەی نهیٚنییەکت

پیٰدەڵێم كە بۆ كەسی نادركێنم ، تەنانەت بۆ شەوكەتیش ."

– : " چی ؟ "

– چاوت بەم كاغەزە دەكەویٰ ؟ دەچیتە لای باوە پیرت و ئەوان و بیٰئەوەی كە كەس بیبینیٰ ئەمە دەدەیتە دەستی ڕەشە ئەفەندی ، تێگەیشتی ؟ "

" تێگەیشتم . "

" دەیبەی ؟ "

" چ نهێنییەكم پیٰدەدەی ؟ "

" تۆ ئەم لاپەڕەیە بەرە دوایی " . ملە جوانەكەی بۆنی مشكی لێوە دەهات ، ماچێكم كرد . ئەوە ماوەیەكی زۆرە كە خەیرییە ئەم مندالانەی نەبردووە بۆ حەمام . لەو كاتە بەدواوە كەشتەی شەوكەت لە كاتی بینینی ژنی جواندا ڕەپ و ڕاست دەبوو ، ئیدی نەچوو بوون . ماچمكرد و گوتم : " لە دواییدا نهێنیەكەت پێدەڵێم . تۆ زۆر جوان و ژیری ، بەلام شەوكەت كوڕێكی بەدخۆیە ، تەنانەت دەست لە دایكیشی بەرز دەكاتەوە . "

– : " نایبەم ، لە ڕەشە ئەفەندی دەترسم ، ئەو باوكمی كوشتووە . "

– : " شەوكەت وتی ! وایە یان نا ؟ زوو بچوو خوارەوە و بانگی بكە . "

كە چاوی بە جدیبوونەكەم كەوت ، بە فڕە ڕۆیشتە خوارەوە . لەوانەیە لەبەر ئەوەش كە شتەكە بە سەر شەوكەتدا دەتەقایەوە تۆزێكیش خۆشحاڵ بووبیٰ . تۆزێك دواتر هەر دووكیان بە ڕوویەكی سوور هەڵگەڕاوەوە هاتنە لام ، شەوكەت بە دەستێكەوە باستیخ و بەدەستەكەیتریشی شمشێرەكەی پیٰبوو . وتم : "بەبراكەت گوتووە ڕەشە ئەفەندی باوكمانی كوشتووە ، با جارێكیتر گوێم لەشتی وا نەبیٰ لەم ماڵەدا . دەبیٰ حەزی لێبكەن وڕێزی بۆ

دانێن ، تێگەیشتن ؟ ناتوانن تەواوی تەمەنتان بێ باوك بمێننەوە . "

شەوکەت بە ڕووداریییەوە وتی : " من ئەوم ناوێ ، دەگەڕێمەوە ماڵی مامە حەسەنم و چاوەڕێی باوکم دەکەم . " ئەوەندە تووڕە بووم کە شەپەزلەیەکم لێدا . شمشێرەکەی دانەنا بوو ، لە دەستی کەوت و بە گریانەوە گوتی : "من باوکم دەوێ . " بەڵام من لەو زیاتر دەگریام ، بەگریانەوە وتم : " ئیدی باوکتان نەما ، ناگەڕێتەوە ئێستا بێ باوك و هەتیون تێدەگەن توخمە زۆڵێنە ؟ " وەها دەگریام کە لەوە دەترسام دەنگمیان لە ناوەوە بیستبێ . شەوکەت بە گریانەوە گوتی : " ئێمە توخمە زۆڵ نین . " ئەوەندە گریاین کە چاومان پڕ بوو بوو لە خوێن ، لە دواییدا کە گریان تۆزێك نەرمی کردبوومەوە ، هەستمکرد کە وەکوو مرۆڤێکی باش دەگریم. بە گریانەوە باوشمان کرد بە یەکدا . خۆمانمان لەسەر دۆشەکەکە درێژکرد ، جارجار ئەوەندە خۆیان دەنووساند بە منەوە کە دەمزانی هێشتا نەخەوتوون. لەوانەیە کەمنیش لەگەڵ ئەواندا نەخەوتبێتم . بەڵام عەقڵم لە خوارەوە بوو . بۆنی خۆشی پرتەقاڵی کولاو دەهات . لە ناکاو لە خەو ڕاپەڕیم . منداڵەکانیش بەخەبەر بوونەوە . وتم : " بچنە خوارەوە با خەیرییە سکتان تێر بکات . " لە ژوورەکەدا تەنیا بووم ، بەفر تازە دەستی بە بارین کرد بوو . پاڕامەوە و گوتم : " خودایا خۆت یارمەتیم بدە و قورئانەکەم کردەوە و لە سوورەی ئالیعومراندا ئەو ئایەتەم خوێندەوە کەوا باسی ئەوانە دەکات کە لە ڕێگای خودادا کوژراون و دەچنە لای خودا و بەو شیوەیە دڵی خۆمم ڕەحەت کرد . باوکم وێنە تەواو نەبووە کەی پادشای نیشانی ڕەشە دابوو ؟ دەیگوت ئەم وێنەیە ئەوەندە لە ڕاستی دەچێت کە ئەگەر کەسێك تەماشای بکات ، وەکوو ئەو کەسانەی کە بە ڕاستی تەماشای

چاوی بکات ، دەترسیێ و چاوەکانی خۆی لە نیگاکانی دەفڕێنیێ. ئۆرهانم بانگ کردە لای خۆم و بەبێئەوەی بیکەمە باوەشمەوە سەر گۆناکانیم ماچکرد و گوتم : " ئێستاش بە بێئەوەی بترسی و بە بێئەوەی نیشانی باپیرتی بدەی ، بچوو ئەم کاغەزە بدە بە ڕەشە ئەفەندی . "

– : " ددانم دەلەقێتەوە . "

– : " کاتیێ گەڕایتەوە دەیکێشم ، کاتیێ چوویتە لای ، ئەویش باوشت پێدا دەکا و تۆش لە دواییدا نامەکەی پێبدە . تێگەیشتی ؟ "

– : " دەترسم . "

– : " شتێك نیە کەوا لێی بترسی ، ئەگەر ڕەشە نەبیێ کیێ دەبیێ بە باوکت . مامە حەسەنت ! دەتەویێ مامە حەسەنت ببیێ بە باوکت؟"

– : " نامەویێ . "

– : " دەی بە قوربانت بم . ئۆرهانە جوانەکەم ، ئەگینا لە دواییدا تووڕە دەبم ... تۆش دەگریت و جارێکیتریش تووڕە دەبم . "

نامەکەم قات کرد و خستمە ناو ئەو دەستە بچکوولانەیەوە کەوا بە بیێ ئومێدی و ڕاهاتووییەوە درێژی کرد بوو . خودایا بۆ ئەوەی ئەم هەتیوانە هەر وا نەمێننەوە، تۆش یارمەتیم بدە . دەستیم گرت و بەرەو دەرگاکەم برد ، کاتیێ ڕۆیشت جارێکیتر بە ترسەوە تەماشای کردم . گەڕامەوە بۆ گۆشەکەی خۆم و لە کونەکەوە چاوم لێبوو کە نزیکی باوکم و ئەوان بووەوە ، ڕاوەستا . بەناچارییەکەوە سەیری دوای خۆی کرد ، وەکوو ئەوەی کە بە دوای مندا بگەڕیێ تەماشای کونەکەی کرد و چاوی بە چاوم کەوت . گریا ، بەڵام لە دواییدا خۆی پێڕاگیرا و خۆی فڕیێ دایە باوەشی ڕەشەوە . ڕەشە بە ڕاستی هەقی کرد بوو ببیێ بە باوکی منداڵەکانم ، لەبەر ئەوەی نەیدەزانی

چی ڕوویداوە نەپەشۆکا و تۆشی هەڵچوون نەبوو ، ناو لەپی ئورهان گەڕا . ئورهان لە ژێر نیگای سەر سووڕماوی باوکمدا گەڕایەوە و خۆی خستە باوەشم . تێرتێر ماچمکرد و بردمە خوارەوە ودەمیم پڕکرد لەو مێژو وشکەی وا حەزی لێدەکرد . گوتم : " خەیرییە ! تۆ دەستی منداڵەکان بگرە و بچوو بۆلای کەشتیەکەو شتی شۆرباکە بکڕە بۆ باوکم . ئەوە بیست ئاکچەیە ، ئەوەی مایەوە بیدەبەشت بۆ منداڵەکان ، با شەوکەت و ئورهان تا ئێوارە بە کەیفی خۆیان بگەڕێن . "

کاتیٚ هەموویان ڕۆیشتن ماڵ چۆڵ و بێدەنگ بوو ، زۆرم پێخۆش بوو ، ڕۆیشتمە ژوورەوە ، خەزوورم ئاوێنەیەکی بە هەدیە پێدابووم کە خۆی دروستی کرد بوو ، لە ژێر بەرگە بۆن عەتراوییەکاندا(بەرگی سەرین) دەرمهێنا و لە دوورەوە ڕۆیشتمە بەرامبەری ، ئەگەر تۆزێك خۆمم بجولاندایەتەوە هەموو جەستەی خۆمم بە شێوەی بەش بەش و پارچە پارچە دەبینییەوە . چۆخە سوورەکەم پێکەوتبوو ، زۆر جوان ڕاوەستا بوو . بەلام دەمویست کراسە مۆرەکەی دایکم بکەمە بەر کە وا لە سندووقی جەهیزیەکەیدا دەرمهێنا بوو . سندووقەکەی داپیریشم کردەوە جاکەتە خورینە گوڵگوڵینەکەیم دەرهێنا و لەبەرم کرد ، داپیرم خۆی ئەم جاکەتەی دروو بوو . بەلام نابیٚ ، کە کراسە مۆرەکەم کردە بەر سەرمام بوو ، مۆمەکەش لەگەڵ مندا بە هێواشی لەرزایەوە . دەمویست کراسە سوورەکەم بکەمە بەر کەوا لە کورکی ڕێوی دروستکراوە بەلام پەشیمان بوومەوە ، لە هەیوانەکەوە تێپەڕ بووم و کراسە دەڵپ و درێژەکەم کردە بەر کەوا دایکم پێیدا بووم . زەختی دەخستە سەر مەمکەکانم بەلام پێم خۆش بوو . بە جوانی سەری خۆمم داپۆشی و پەچە کەتانەکەشم دابە ڕووی دەم و چاومدا

. ڕەشە ئەفەندی هێشتا دەر نەکەوتبوو ، لە هەڵچوون وپەشۆکانی خۆمدا بە هەڵەدا ڕۆیشتبووم. ئێستا ئەگەر بڕۆم ، بە باوکم دەڵێم لەگەڵ منداڵەکاندا ڕۆیشتبووم بۆ ماسی هێنان، وەکوو پشیلەیەك لە پلیکانەکانەوە ڕۆیشتمە خوارەوە ، دەرگاکەم وەکوو ڕۆحێك داخستەوە و ڕۆیشتمە ناو حەوشەکەوە . کاتیٚ ڕۆیشتمە ناو کۆڵانەکەوە ، ڕاوەستام و تۆزێك تەماشای دواوەم کرد . دەتگوت کە ئەم ماڵە ماڵی ئێمە نیە ! کۆڵانەکە کەسی تێدا نەبوو ، ترووکە ترووکە بەفر دەباری . بە دزیوە وبەلەرزە لەرز خۆمم خستە ناو ئەو حەوشە چۆڵە بەجێهێشتراوە کە خۆریش هیچ نایگریٚ . بۆنی گەڵای گەنیوو تەڕایی و مەرگی لێوە دەهات . کاتیٚ ڕۆیشتمە ماڵی جوولەکە لە سێدارە دراوەکەکە وامزانی کە لە ماڵی خۆمدام . دەڵێن ، جندووکەکان بە شەوان لێرەدا کۆدەبنەوە و ئاگردانەکە پێدەخەن و جوڵەجووڵ دەکەن . لە ماڵێکی ئاوەها چۆڵدا گوێگرتن لە دەنگی پێی خۆم زۆر ترسێنەر بوو بۆم . بەبێئەوەی بجووڵێمەوە ڕاوەستام و چاوەڕیٚ بووم لەم نزیکانەوە سەگێك وەڕاندی دەنگی وەڕینی هەموو سەگەکانی ئەم گەڕەکە دەناسمەوە ، بەڵام ئەمەم دەرنەخست و نەمناسییەوە .

لە بێدەنگییەکەی ئەو ئێوارەیەدا هەستم بەمەکرد : وامدەزانی لەمن زیاتر کەسیتر لێرەیە ، هەر بۆیە بۆ ئەوەی دەنگم نەبیسیٚ نەدەجووڵامەوە . چەند کەسێك بە قسەکردنەوە لەنێو کۆڵانەکەوە تێپەڕ بوون . بیرم لە خەیرییە و منداڵەکان دەکردەوە ، شەڵا سەرما نەخۆن . لەم بێدەنگییەی دواییدا هەستم بە پەشیمانی کرد ، ڕەشە نەهات ، تۆ ئەزانی کە چ هەڵەیەکم کرد ! بەر لەوەی لەمە زیاتر غروورم بشکیٚ بگەڕێمەوە بۆ ماڵ باشتر دەبیٚ . بە ترسێکەوە خەیاڵی ئەوەم دەکرد کە حەسەن بە دوامدایە و

تاقیبم دەکات . هەرلەم کاتانەدا دەنگی خشەخشێك هات و دەرگاکە کرایەوە . لە ناکاو بە پەلەپەل جێگاکەی خۆمم گۆڕی . نەمدەزانی کە لەبەر چی وەهام دەکرد ، کاتیٚ پەنجەرەکەم لەولای خۆمەوە هێشتەوە تیشکەکە کەوتە سەر سەرم . قسەکەی باوکم هاتەوە یاد و بڕواشم بەوە کرد کەبە ڕاستی ڕەشە من لە سێبەرەکەشمەوە دەناسێتەوە . پەچەکەم گرێدا و بە گویٚ گرتن لە دەنگی پێی چاوەڕێی بووم . هاتە بەر دەرگاکە ، چەند هەنگاوێکی هەڵگرت و لە خۆیەوە ڕاوەستا . هەر بەو شێوەیە پێنج شەش هەنگاومان بەرەولای یەك هەڵگرت . لەوەی کەوا لە کونەکەوە دەمبینی زۆر سەلامەت و بەهێزتر بوو . وەکوو ئەوەی بچپێنییٚ گوتی : " بەیارمەتی خۆت ، دەتوانی پەچەکەت بکەیتەوە."

" من هاوسەرم هەیە و چاوەڕێی مێردەکەم دەکەم ."

هەر بەو دەنگەوە گوتی : " پەچەکەت بکەوە ، دڵنیا بە ناگەڕێتەوە . "

" بۆ ئەوەی کە ئەمەم پیٚبڵێی بانگت کردووم ؟ "

" نا ، بۆ بینینی تۆ . ئەوە دوانزە ساڵە بیرت لێدەکەمەوە ، پەچەکەت بکەوە با کەڕەتێکیتر بتبینمەوە . "

کردمەوە ، بەبێئەوەی دەنگی لێوە دەرکەویٚ ، ماوەیەکی درێژ تەماشای ڕوومەت و نێو چاوانمی کرد . پێم خۆش بوو .

گوتم : " چۆن بەبیرم دێنیتەوە ؟ "

– : " بە ئازارەوە ، چونکە ئەو کاتانەی وا بیرم لێدەکردیتەوە ، دەمزانی بیر لە خەیاڵەکانت دەکەمەوە ، بە بیرت دیٚ کە لە کاتی منداڵیدا باسی وێنەی خەسرەو شیرینمان دەکرد کەوا عاشقی یەك بوون ؟ بۆچی شیرین کە یەکەم جار وێنەی خەسرەو دەبینیٚ یەکسەر عاشقی نابیٚ و دەبیٚ بۆ

سیٚجار تەماشای بکات ؟ تۆ دەتگوت ، لە چیرۆکەکاندا هەموو شتێك سیٚ جارەیە و منیش دەمگوت کە پێویست بوو عەشق لە یەکەم ڕەسمەکەدا گڕیٚ بگرتبایە . بەڵام کیٚدەتوانیٚ وێنەی خەسرەو بەو جۆرە بکێشێت کە کەسێك بیناسێتەوە و دڵی پیٚبسپێریٚ و عاشقی ببیٚ ؟ لەسەر ئەمە هیچ قسەیەکمان نەکرد ، ئەگەر لە ماوەی ئەم دوانزە ساڵەدا وێنەیەکی تۆم بەو شێوەیە لە لابایە ، لەوانەیە ئەوەندە ئازارم نەچەشتبایە"

لەم واتەیەدا و ئەویندار بوون بە تەماشا کردنی وێنە و شتی لەم بابەتە و هەروەها لەسەر ئەوەی لە چەندە لەبەر من مەینەتی چەشتووە ، قسەی خۆشی زۆری کرد . لەو کاتانەدا سەرەنجم چووە سەر ئەوەی وا هەنگاو بە هەنگاونزیکم دەبووەوە ، هەر بۆیە هەموو قسەکانیم لەبیر چووەوە . لەدواییدا بەبیرم دەهێنانەوە و زیاتر بیرم لێدەکردنەوە ، ئێستاکانە بەس سیحری قسەکانی دەمگریٚ ، خەریکبوو دڵم بە دڵیەوە دەبەستەوە. لەبەر ئەوەی دوانزە ساڵ ئازارم پیٚگەیاندووە ، خۆمم بە تاوانبار دەزانی . ئەم ڕەشەیە چ پیاوێکی قسەخۆش و و مرۆڤێکی باشە ! وەکوو منداڵێك پاکە . لە نێو چاوانیدا ئەمانەم خوێندەوە . ئەو هەموو خۆشە ویستییەی متمانەی پێدەبخشیم ، باوەشمان کرد بە یەکدا . ئەوەندەم پێخۆش بوو کە خۆمم بە تاوانبار دەزانی ، بە هەستێکی شیرینترلە هەنگوین لەسەر خۆم ڕۆیشتم . زۆرتر باوەشم پێدا کردو ڕێگام پێدا کە ماچم بکات، منیش ئەوم ماچ کرد . کاتیٚ کە یەکتریمان ماچ کرد وامدەزانی کە تەواوی دونیا چووەتە ناو تاریکاییەکی شیرینەوە . دەمەویست کە هەموو کەسێك وەکوو ئێمە باوەش بە یەکتریدابکات . وا بزانم بیرم کەوتەوە ! خۆشە ویستی شتێکی وەهایە. خۆشم لەکردەوەکەم هاتبوو، کە وامدەزانی هەمووعاڵەم لەگەڵ

ئێمەدا لە ناو باشییەکەدا نوقم دەبێ هیچ جۆرە خراپییەك نەدەهات بە عەقڵمدا . ئەگەر ئەم بەسەر هاتە بیچارەیەی من ! ڕۆژێك لە کتێبێکدا بنووسرێتەوە ، داخۆ وێنە کێشە هەراتییەکان وێنەی ئەم باوەش کردنەی من و ڕەشە بەیەکدا چۆن دەکێشنەوە . ئێستا باسیدەکەم : هەندێك ڕووپەل هەن کەوا باوکم بە هەڵچوون و پەشۆکاوییەوە نیشانم دەدات : داڕشتنی نووسراوەکان و شەپۆل شەپۆل بوونی لاپەڕەکان ، جۆش و خرۆش و گەرم و گوڕییەکی تێدایە ، ڕازا ندنەوەی دیوارەکان و جوانکاری لاپەڕەکان لە شانێکەوە دەبێ ولە حەپەسان و هەڵچوونی عاشقان دەچێ. عاشقەکان لە دوورەوە نیگای چاوی‌یەك دەدزنەوە و بە قسەی واتادار لەگەڵ یەکدا قسە دەکەن . ئەوەندە بچووك و لە دوورەوە دەیکێشن کە مرۆڤ بۆ ساتێك وا هەست دەکات ئەوەی وا کێشراوە وێنەی ئەوان نیە ، بەڵکوو هی ئەو حەوشەیە کە وا لەوێدا پێك گەیشتوون و شێوەیەکی گەڵای ئەو درەختانەی نێو تاریکاییەکە ڕووناکی شەو ڕۆشنیان دەکاتەوە . لەو جۆرە ڕەسمانەدا کە تەنیا بە خۆ سپاردنێکی دەروونی شێوەکارەکەوە دەکێشرێ ، ئەگەر سەرەنج بدەینە سەر داڕشتنی ڕەنگەکان و ئەو تیشکەی کەوا لە هەموو گۆشەیەکی وێنەکەوە دەردەکەوێ ، ئەوسا تێدەگەیەن کە ئەم وێنەیە لە عەشق و لە شتی لەم بابەتەوە دروستکراوە . بڕوام پێبکەن ، کە تەماشای دەکەی وا دەزانی لە خوری عاشقانەوە خۆیان دەدزنەوە ناو وێنەکەوە.

کە من و ڕەشە باوەشمان دەکرد بە یەکدا ، وامدەزانی تەواوی دونیا بەو شێوەیە لە ناو خۆشییەکەدایە . سوپاس بۆ ئەوەی کە ئەوەندە ئەزمونی خەیالّم هەیە . هیچ باشی و خۆشییەك ئەوەندە درێژ خایەن نیە . ڕەشە لە پێشدا مەمکە گەورەکانمی خستە ناو دەستەکانیەوە ، ئەوەندەم پێخۆش

بوو كە دەمەویست سەرەكانیشی بخاتە ناو دەمی خۆیەوە . ئەمەی بە تەواوەتی نەكرد ، چونكە خۆشی متمانەی بە كردەوەكەی خۆی نەبوو . نەیدەزانی چی دەكات ، بەڵام دەیەویست شتی زیاتر بكات ، بەم شێوەیەش كە زیاتر باوەشمان كرد بە یەكدا ترس و شەرم كەوتە نێوانمانەوە . لە پێشدا دەستی گرت بە سەر سمتەكانمدا و بەرە و لای خۆی ڕایكێشام ، شتەكەی ڕەپ و ڕاست بوو ، كاتێ هەسووی بە زكمدا زۆرم پێخۆش بوو ، مەراقم كرد ، شەرمم نەكرد . لە دوای ئەو هەموو ماچ و مووچ و باوەش پێدا كردنەدا ، سروشتی بوو كە شتەكەی ڕەپ ببێت و هەڵسێتەوە ، هەموو ئەمانەم بە شانازییەوە لەبەر خۆمەوە دەهێنایە سەر زمان . بەڵام كاتێ لە دواییدا دەریخست و پیشانیدام ، یەكسەر سەرم لادا ، بەڵام لەبەر گەورەیی شتەكەی نەمدەتوانی چاومی لێلادەم و هەر تەماشام دەكرد . دواتر داوای بێڕەوشتی هەندێك لە ژنانی لێكردم كەوا ژنانیتر لە حەمامدا دەیگێڕینەوە و دەڵێن ئاوەهایان كردووە . بە سەر سووڕ ماوی و بێبڕیارییەوە ڕاوەستام . پاڕایەوە گوتی : " نێو چاوانت گرژ مەكەوە و مەیدە بەیەكدا ، گیانەكەم بە قوربانت بم ! " هەستامە سەر پێ و پاڵم پێوە نا ، بەبێئەوەی گوێ بدەمە ئەوەی كە دڵی تەنگ ببێ و ناڕەحەت ببێ قیڕاندم بە سەریدا .

## (( ناوی من ڕەشەیە )) (27)

بە گوێرەی  ئەو شەکورە جوانەی وا لە ماڵی کابرا جوولەکە لە سێدارە دراوەکەوا ناو چاوی دابوو بەیەکدا و دەچوو بە گژی مندا ، من دەتوانم شتە ڕەپ و ڕاستەکەی خۆم بخەمەوە ناو دەمی ئەو کچە چەرکەسانەی وا لە تەفلیس بینیومن یان وەکوو دەتوانم بیخەمەدەمی ئەو بووکە فەقیرانەی وا لەبەر هەژاری لەشفرۆشی دەکەن یا خود بێوەژنە تورکمانی و ئێرانییەکان ، یا خود بیخەمە ناو دەمی قەحبە بێنرخەکانی ئەستەنبووڵ کە هەرچی دەچێ ڕوو لە زیاد بوون دەکەن و جندە کانی مینگاری و کچە نازدارەکانی ئابازایی و ژنە فێڵبازەکانی ئەرمەنی و سووریانی ئەمەیان لا ئاساییە ، تەنانەت دەمتوانی بە ئاسانی بیخەمە ناو دەمی ئەو کوڕانەی وا چاویان تێر نابێ ، بەڵام نەمدەتوانی ئەو کارە بە شەکورە بکەم .  بە گوێرەی شەکورە من کە لە شارە گەرمەکانی عەرەبستان و گوێ ئاوەکانی خەزەردا بە وەزعێکی مادی مامناندییەوە ماومەتەوە ، دەستم لە پیاوەتی بەرداوە و پەردەی شەرمم دڕیوە و ئەوەشم لە بیر چووە کە هەندێك لە ژنان شەرەفیان هەیە . ئەمە ئەو مانایە دەگەیەنێت کەوا  لە قسەکانمدا ڕووراست نەبووم ،

به جوانی گوێم له قسەكانی خۆشەویستەكەم دەگرت كەوا ڕەنگی له ڕووی شتەكەم بڕیبوو ، بەڵام دوو شتیش هەبوون كه مەمنونیان دەكردم .

1- زۆر جاران ئەمشتەم وەكوو حەیوانێك بەسەر ژنانی تردا دەهێنا ، بەڵام كاتێك به تووڕەیی‌یەوە قسەی پێ دەگوتم ، هەر لەو چەشنە وەڵامم نەدایەوە و بێدەنگ مامەوەو نەكەوتمه ناو قسەو باس .

2- لەوەی كەوا شەكوره هەستی به ڕێبواری‌یەكان و ژیانی گەشتیاری و گەڕیدەیی من و ئاكامەكانی دەكرد ، زۆر خۆشحاڵبووم . شەكوره كاتێك بینی لەبەر ئەوەی داخوازی‌یەكەم جێبەجێ نەبووه ، خەمو پەژاره دایگرتووم ، بەڕوخسارێكی خەماوی‌یەوە وەكوو ئەوەی داوای لێبوردنم لێبكات وتی :" ئەگەر بەڕاستی و به عەشقێكی پاكەوە منت خۆش بویستایه ، خۆتت پێڕادەگیرا و شەرەفی ئەو ژنەت نەدەشكاند وا به نیەتێكی جدیەوە ئۆمێدی پێ بەستوی، مەگەر تۆ ئەوه نیت كه بۆ ئەوەی بتوانی ببی به هاوسەری من و لەگەڵمدا هاوژینی بكەی دەست بۆ هەموو جۆره فێڵ و كەڵێكێك دەبەی ؟ كاتێ هاتی بۆ ئێره كەس بینیتی؟"

" نا "

وەكوو ئەوەی كەسێكیتر له ناو حەوشەكەدا هەبێ ئاوڕێكی دایەوە و بەو جۆرەش تامی بینینی ئەو ڕوخساره جوانەشی بەمن بەخشی كه وا دوانزه ساڵه نەمتوانی بوو به بیری بهێنمەوە . له ناكاو خشه خشەیەك هات ، هەردووكمان بێدەنگ بووین و چاوەڕێ ماینەوە . بەڵام كەس نەهاتە ژوورەوە . هەر له دوانزه ساڵیەوە له من تێگەیشتووتر بوو ، هەر بۆیه هەستی كەسێكی بێ خەیری له مندا دەووروژاند .

وتی : " تارمایی جوڵەكە هەڵواسراوە كه لێردا دەگەڕێ " .

" هاتوو چۆی ئێرە دەکەی ؟ "

وتی : پێویست بە هاتن بۆ ئێرە ناکات ، لەگەڵ هەڵکردنی بادا ، جندۆکە و چەتە وتارمایی دێنە ئێرە و دەچنە ناو شتەکانەوە و هەموو شتێك قسە دەکات و منیش گۆیم لە قسەکانیان دەبێت "

" شەوکەت منی هێنا بوو بۆ ئێرە کە وا پشیلەیەکی تۆپیوم پیٚ پیشان بدات ، بەڵام نەبوو "

– :" پیێت گوتوە کە باوکی ئەوت کوشتوە "

" بە تەواوەتی وەهام نەگوت ، بۆ ؟ قسە هاتووتە ئەویٚ ؟ نەم گوتوە کە باوکتم کووشتوە ، وەك وتم دەمەویٚ ببم بە باوکت ، لە پیێشدا پرسیاری ئەوەی کرد کە من هیچ مرۆڤێکم کووشتوە یا نا ، منیش ڕاستیەکەی گوتم دووانم کووشتوە. "

" بۆ لە خۆبایيبوون و لە خۆ تاریف کردن ؟ "

- : " هەم بۆ ئەوە ، هەم بۆ ئەوەی بکەومە چاوی ئەو کوڕەی کە وا حەز لە دایکی دەکەم . چونکە تێگەیشتم کە وا دایکیان دەسکەوتەکانی باوکی نیشانی ئەو چەتانە داوە و باسی قارەمانی باوکیانی لە شەڕدا بۆ گێڕاونەتەوە . "

: " کە وا بوو ، تاریفی خۆت بکە ! چونکە حەزت لیٚ ناکا " بە شانازی کەسێك کە هەڵەیەکی خۆشەویستکەی گرتبیٚ وتم : " شەوکەت حەزم لیٚ ناکات ، بەڵام ئۆرهان حەزم لێدەکات ، بەڵام من دەبم بە باوکی هەردووکیان " . بۆساتێك سێبەری شتێکی نەبوو لە نێوانمانەوە تێپەڕی ، بە پەشۆکاوی وهەڵچوونەوە لەرزەیەك کەوتم گیانمەوە . کاتیٚ هاتمە سەر خۆم ، شەکورە هەنسکی هەڵدەداو دەگریا . وتی : " شووە بێچارەکەم برایەکی هەیە ناوی

حەسەنە ، ئەوسا كە چاوەڕێی مێردەكەمم دەكردەوە ، لەگەڵ ئەو و باوكیدا دوو ساڵ پێكەوە لە ماڵێكدا ژیاوین ، دڵی لە من چووە . ئێستاكانەش گومانی بە هەندێك شت كردووە ، لە وانەیە وا بزانێت كە من لەگەڵ كەسێكی تردا ، یان وەكوو تۆدا پەیوەندیم هەیە و دەمەوێ ببم بە هاوسەری . هەر لە بەر ئەمەش ئۆقرەی لێ بڕاوەو هار بووە ، هەواڵی بۆ ناردووم دەیەوێ بە زۆر ببماتەوە بۆ ماڵ ، دەڵێن : لەبەر ئەوەی تۆ لە چاوی قازیدا هێشتا نەبووی بە بێوەژن ، دەتوانین بە ناوی مێردەكەتەوە بتهێنینەوە . لەوانەیە هەر كات بێن بەسەرماندا ، باوكیشم نایەوێ بە بڕیاری قازی ببم بە بێوەژن ، چونكە وا خەیاڵ دەكات كە مێردێكی تازە دەكەم و بە جێی دێڵم ، لە تەنیایی دوای مردنی دایكمدا من و مناڵەكانم باوكم پێكەوە ماوینەتەوە. هاتنەوەی تۆ ئێمەی زۆر دڵخۆش كرد . لەگەڵ ئێمەدا دەمێنێتەوە ؟ "

" چۆن ؟ "

" ئەگەر مێردت پێ بكەم ، لەگەڵ ئێمە و باوكمدا دەمێنیتەوە ؟ "

" نازانم "

" تۆزێك زۆرتر بیر لێبكەرەوە بڕوا بكە كاتێكی زۆرت نابێ ،باوكم وا هەست دەكات كە خراپە نێزیكی دەبنەوە ، منیش لەلایان خۆمەوە حەقی پێدەدەم ، ئەگەر حەسەن و پیاوەكانی لەگەڵ یەنیچرییەكاندا هاتن و باوكمیان بردە بەردەم قازی تۆ لەوێ بڵێ مێردەكەیم بە مردوویی بینیوە ، بڕوات پێدەكەن تۆ لەوێوە هاتوویتەوە ، وەها دەڵێی یان نا ؟ "

" دەڵێم بەڵام من ئەوم نەكوشتووە . "

" باشە ، لەگەڵ شایەتێكیتردا كە لە ئێرانەوە هاتبێتەوە دەڵێن كە لاشە خوێناوییەكەی شووكەی منتان لەمەیدانی شەڕدا بە مردوویی بینیوە ؟ "

" نەمبینیوە ، بەڵام لەبەر تۆ دەڵێم . "

" حەزلە منداڵەکانم دەکەی ؟ "

" خۆشم دەوێن . "

" دەپێم بڵێ ، بزانم حەز لە چییان دەکەی ؟ "

" بەبڕیار بوون و دروستی و پێداگری و ژیری و بەهێز بوونی شەوکەتم خۆش دەویێ و حەز لە ناسکۆڵەیی و بچووکی و ژیری ئورهانیش دەکەم ." تۆزێك پێکەنی ، چاوە ڕەشەکەم تۆزێکیتریش فرمێسکی هەڵڕشت و وەکوو کەسێك کە بییەوێت لە ماوەیەکی کورتدا کارێکی زۆر بکات ، ئاوەها بابەتەکەی گوڕی و گوتی : " پێویستە کتێبەکەی باوکم زووتر تەواو بکرێت و تەسلیمی پادشا بکرێت، چونکە ئەو نەهامەتیانەی وا تووشمان دەبێت و لەدەورو بەرماندا دەخولێنەوە هەمووی لەبەر ئەوکتێبەیە . "

– : " زیاتر لە کوشتنی زەریف ئەفەندی چ شتێکیتر هەیە ؟ " بۆ ساتێك حەزی لە پرسیارەکەم نەکرد ، لەبەر ئەوەی لە ناوەوە خۆی دەشاردەوە بە شاراوییەوە گوتی : " لایەنگرانی مەلا نەسرەتی ئەرزڕوومی دەڵێن لە ناو کتێبەکەی باوکمدا بێ دینی هەیە و لاساییکردنەوەی ڕۆژئاواییەکانی تێدایە ، ئەو شێوەکارانەی وا هاتوو چۆی ماڵی ئێمە دەکەن بەخیلی بە یەك دەبەنەوە و فێڵ و تەڵەکە بۆ یەك دادەنێن ، خۆ خۆت سەر دانت کردوون ، باش دەزانی . "

– : " برای شووە خوا لێخۆشبووەکەت هیچ پەیوەندیەکی نیە ، بەڵام حەسەن کەسێکی وا نیە کە کاری بە هیچ شتێکەوە نەبێت . " بە بێدەنگییەکی سەیر و پڕ لە ڕازەوە ڕاوەستا . وتم : " ئەو کاتەی پێکەوە لە ماڵێکدا بوون هیچ لە بەینتاندا هەبوو ، یان نا ؟ "

- : " بە ئەندازەی دوو ڕۆژ لە ماڵێکدا . " هەر لەم کاتەدا لە جێگایەکی دوورەوە دەنگی دوو سەگمان بیست کەوا لە کاتی ئەنجامدانی کارەکەیان و لە یەك چەقاندا بە پەشۆکاوی و هەڵچوونی دەیانوەڕاند . بۆم نەهات کە پرسیاری لێبکەم و بڵێم مادام مێردە خوا لێخۆشبووەکەت ئەوەندە شەڕی کرد بوو و دەستکەوتی قازانج کرد بوو بۆچی لە ماڵێکی بچووکدا لەگەڵ باوك و براکەیدا دایناوی و لەویٚ ماڵی بۆ دروستکردووی ؟ لە باتی ئەوە پرسیارم کرد کە بۆچی مێردت پێکرد ؟

- : " دەبوو کە هەر شووم بە یەکێك بکردبایە . " ئەمە ڕاست بوو ، بە شێوەیەك کەمن دڵگیر نەبم پەسنی مێردەکەشی داوە و وتی : " تۆ چوویت و نەهاتیتەوە ، لەوانەیە کە دڵگیر بوون نیشانەی عاشق بوون بیٚ ، بەڵام عاشقی تۆراو هەم پیاو ماندوو دەکات ، هەم ئایەندەشی نییە . " ئەمەش ڕاست بوو . ئەمە هۆی شوو کردنی بەو چەتەیەی مێردی نەبوو . لە نیگا فێڵبازەکانیەوە مرۆڤ بە ئاسانی تێدەگەیشت کە شەکورەش وەکوو کەسێکیتر لە ماوەیەکی کورتدا منی فەرامۆش کردووە . دەمزانی کە ئەم درۆ کلك درێژەی بۆ پینە کردنی دڵە شکاوەکەی من کردووە و ئەمەشم بە نیەتێکی باش نرخاند . بە پێویستم زانی سوپاسی لێبکەم و دەستمکرد بە باسی ئەو شەوانەی وا بیرم لێدەکردەوە و شێوەی ڕوومەتیشی نەدەهاتەوە یادم و وەکوو تارمایی لە خەومدا دەهاتەوە لام ، وامزانی کە ئەم شتانە بۆ کەسێکیتر باس نەکەم ، ئەمانە نهێنیترین و بە ئێشترین ئازارەکانی من بوون . ئەمانە هەمووی ڕاست بوون ، بەڵام وەکوو ئەوەی بە سەر سووڕ ماوییەوە هەستم پیٚکردبن ، هیچ کامیان ڕاستە ڕوو و پاك نەبوون ئەوە بۆ یەکەم جار بوو کە هەستم بە جیاوازییە دەکرد و ئەوەم دەزانی کە ئەگەر ڕاستییەکانی

ژیان وەکوو خۆی باسبکردرێن ، دەبن بە هۆی دروست بوونی جیابوونەوە و دوور کەوتنەوە . لەوانەیە نموونەی هەر باش لەلای ئەو وێنە کێشانە بێت کە پیاوکوژێك لەناویاندایە : بۆ نموونە وێنەی ئەسپێك ، ئەگەر بە جوانترین شێوەش دروستکرابیٚ و بیٚعەیبیش بێت و بە تەواوەتی بەپێی نەریتی وەستاکانی تریشەوە کێشرابێت ، دیسان لەوانەیە هەموو هەستی ئەو شێوەکارە نیشان نەدات کەوا دروستی کردووە . دڵسۆزی کەسانی وەکوو ئێمەش یانی عەبدەکانی خودا لەکاتی هونەر و لەکاتی چاوەڕوانکراودا دەر ناکەوێت ، بەڵکوو بە پێچەوانەوە لە کاتی هەڵخەڵەتاندنی زمان و شکانی دوای هەڵەکان و خەمەکانیدا دیار دەبێت . ئەو ویست و داخوازییەی وا ئێستا لە بەرامبەر شەکورەدا هەمە ، هیچ فەرقێکی نیە لەگەڵ ئەو ویست و داوا کارییەی وا لەکاتی سەفەردا بەرامبەر بە کچە دەم و چاو باریکەڵە ، ڕەساسی ڕەنگە ، لێو مۆرە قەزوینییەکە هەمبوو . هەڵبەت ئەمە بۆ ئەوە ناڵێم خاتوونەکانیتر دڵیان بشکیٚ و خەیاڵەکانیان بە فیڕۆ بچێت . شەکورەشم بە ئەزموونەکانی ژیانی خۆوە و بەو زانیارییانەی وا خودا پێیدا بوو دەیزانی کە لە لایەکەوە دوانزە ساڵ مەینەتی دوورییەکەیم وەکوو ئەشکەنجەی چین چێشتووە ، هەروەها لەوەش ئاگادار بوو کە لە ماوەی ئەم دوانزە ساڵەدا ئەوە یەکەمجارەکە ئاوەها تەنیا مابووینەتەوە ، هەرلە بەر ئەمانەش دەیزانی کە زیاتر لە کەسێك کەبە پەلەپەل بییەوێت هەستەکانی تێر بکات هیچیتر نابینی ، نیزامی دەیگوت کە : " دەمی جوان و شیرینی جوانەکان وەکوو جامۆڵکەیەکی پڕ لە هەنجیرە . " کاتیٚ سەگەکان بەهەموو تواناییەکەیانەوە ، جارێکیتر وەڕاندیان ، بەنا ئاسوودەییەکەوە گوتی : " بائیتر بچم " . ئەو کاتە تێگەیشتین کە ئێوارە بووە و تارمایی کابرای

جوولەکەکەش ماڵەکەی ڕەش کردووەتەوە . بۆ ئەوەی جارێکیتر باوەشی پێدا بکەم ، سینەم لە خۆیەوە دەرپەڕی، بەڵام ئەو وەکوو قومرییەکی ڕاوەستا و یەکسەر جێگاکەی خۆی گۆڕی . وتی : " زوو پێم بڵێ هێشتا وەکوو جاران جوانم ؟ "وتم و گوێی لە چەندە جوان بوونەکەی خۆی گرت و بڕواشی پێکردم .

" ئەی تیپ و جل و بەرگەکانم چوونە ؟" ئەوەشم بۆ گێڕایەوە .

" ئەی باشە بۆنی خۆشم لێدێت ؟ "

شەکورەش دەیزانی کە ئەو شتەی وا ( نیزامی ) وەکوو شەترەنجی عەشق باسی لێوە دەکات یاری ئەدەبی بەم شێوە نیە ، بەڵکوو جمو جۆڵێکی ڕۆحییە کەلە ژێرەوە لە نێو عاشقاندا هەیە . وتی : " ئێستا تۆ چ شتێك قازانج دەکەی ؟ دەتوانی باوکایەتی بۆ منداڵەکانم بکەی ؟ " باسی ئەو ئەزموونە تێر و پڕەم بۆ کرد وا لە ماوەی دوانزە ساڵ کار و باری دەوڵەت و نووسینەوە بە دەستم هێنا بوو هەر وەها هیواکانی دوا ڕۆژیشم بۆ هێنایە سەر زمان و باوەشم پێدا کرد . وتی : " تۆزێك بەرلە ئێستا چەنێ خۆش باوەشمان کرد بوو بەیەکدا ! کەچی ئێستا ئەو تامە سێحراوییەی نەماوە . " بۆ ئەوەی بڕوا بکات کە ئەم باوەش پێدا کردنەم لە دڵەوەیە ، تۆزێك توندتر باوەشم پێدا کرد و پرسیاری ئەوەم لێکرد کە بۆ چی ئەو وێنەیەی وا دوانزە ساڵ بەر لە ئێستا بۆم دروستکرد بوو ، بە ڕێگای ئەستەردا بۆم نارد بووەوە ؟ لە سەر سامی من سەری سووڕما . کاتێ لە چاوەکانیدا ئەوەم خوێندەوە کەلە دەروونیدابەرامبەر بەمن هەستی بەزەیی پیا هاتنەوە و خۆشەویستی بەرز بۆتەوە، یەکتریمان ماچ کرد . ئەمجارە وەکوو جاری پێشوو ملم نەکرد بە زەنجیری شەهوەت و ویستدا ، بەڵکوو بە پێچەوانە ئەمجارەیان عەشقێك چوو بووە ناو دڵی هەردووکمانەوە و وەکوو

هەڵۆیەك باڵم بە سەریدا دادا . مەگەر جووتبوون و جۆر بوون لەگەڵ ژنێکدا باشترین ڕێگای قووڵبوونەوەی خۆشەویستی نیە ؟ کاتیٚ دەستم لە مەمکۆڵەکانی دا . بە بڕیارێکی تەواوەوە پاڵی پێوە نام ، من پیاوێکی وەها نەبووم کە ئەگەر ئێستا یانی بەر لەوەی زەماوەند بکەین لەگەڵیدا جووت ببم، لە دواییدا ژیانی لەگەڵدا بکەم و ببم بە هاوسەری . من کەسێك بووم کە بەپەلە کارم دەکرد و شەیتانم تێکەڵاوی کارەکانم دەکرد و نەمدەزانی کە پێویستە بەرلە زەماوەند چ زۆری و زەحمەتی و لە خۆ بووردەییەك بکێشم . لە نێوان دەستەکانمەوە خۆی دەرخست و پەچەکەی داخست و بەرەو دەرگاکە ڕۆیشت . لە دەرگا کراوەی ماڵەکەوە چاوم بەو بەفرە کەوت کەوا دەباری ، لەو جێگاییەی وا پێکەوە چپەچپمان دەکرد قیڕاندم و گوتم : لەمەو بە دوا چی دەکەین ؟

وتی : " نازانم " و بەپێی یاری شەترەنج بە بێدەنگی ڕۆیشت و شوێنە پیٚکانی خۆی جێهێشت کەوا بەفر بە پەلەپەل دایدە پۆشتنەوە .

## (( لە دواییدا پێم دەڵێن پیاو کوژ )) (28)

لەو بڕوایە دام ئەو شتەی وا ئێستا باسی دەکەم بەسەر ئێوەشدا دێت ، کاتیٚ لە کۆڵانە بێکۆتاییەکانی ئەستەنبووڵدام ، یان لە چێشتخانەیەکدا پاروویەك دەخەمە ناو دەمم یا خود کاتێك تەماشای گوێی چمکی لاپەڕەیەك دەکەم کە لە قامیش دەچیٚ ، یەکسەر وا هەستدەکەم کە ئێستاش وەکوو ڕابردوو ژیاوم . وەکوو ئەوەی کە ئێستا لە کۆڵانەوە بەپیٚ لە سەر بەفردانانەوە بڕۆم و لە دڵمدا وا هەستبکەم کە لە کۆڵانەکەدا پێم لە سەر بەفر دانا بێت و ڕۆیشتبێتم . ئەم شتانەی کە باسم کردن شتانێکی سەیر و

سەمەرەن و وەكوو ئەوەی كە هەمووشمان دەزانین هەرلە كاتی ئێستادا ڕوویانداوە ، بەڵام وەكوو ئەوە وایە كە لە ڕابردوودا ڕوویان دابێ . بەرە و ئێوارە بوو ، تاریكایی خەریك بوو دادە تەپی ، ترووكە ترووكەی بەفر دەهات و منیش لە كۆڵانەكەی ماڵی زاوای بەڕێزەوە تێپەڕ دەبووم . بە پێچەوانەی هەندێك شەوانیترەوە ئەمجارەیان بە زانا بوونەوە ڕۆیشتبووم و پێم لە خۆیەوە منی لێرەوە نەهێنا بوو . وەكوو شەوانیتر بیرم لە شتانی دیكە دەكردەوە و دەرۆیشتم بە ڕێدا ، بۆ نموونە بیرم لەو چەخماخە دەكرد كەوا لە دەورانی تەیموورەوە بە جێما بوو ، یان بیرم لە كتێبە بێ زێڕاوەكانی هەرات و ئەو كاتەی بە دایكم گووتبوو بۆ كتێبێك حەوسەد ئاكچەم وەرگرتووە و بیرم لە تاوانەكان و گەمژەییەكانی خۆم دەكردەوە تا وەكوو گەیشتمە ئێرە . لەوە دەترسام كە كەس دەرگای حەوشە گەورەكەم بۆ نەكاتەوە ، كاتێ دەستم لێدا خۆی لە خۆیەوە كرایەوە . ئەمجارەش تێگەیشتم كە بە ڕاستی خودا لەگەڵ مندایە . ئەو بەردەڵانە بریقەدارەی وا شەوان بۆ زیاد كردنی وێنە لەسەر كتێبەكەی زاوای ئەفەندی دەهاتم و لەوێوە تێپەڕ دەبووم ، كەسی لێنەبوو . لەلای ڕاستەوە سەتڵی ئاوەكەم بینی كە چۆلەكەیەكی بە سەرەوە بوو ، هیچ گازندێكی لەو سەرما و سۆڵەیە نەبوو، لە پێشەوە ئاگردانێكی لێبوو كە نەمدەزانی لەبەر چی كوژراوەتەوە. لە لای چەپیشەوە گەوڕێكی لێبوو كە بە تەنیا ئەسپی میوانەكانیان لە وێدا دەبەستەوە . هەموو شتێك وەكوو خۆی مابووەوە . لە دەرگا كراوەكەی لای گەوڕەكەوە چوومە ماڵ ، پێم داكوتا و دام لە پلیكانەكە و كۆخەیەكم كرد و ڕۆیشتمە ژوورەوە . وەڵامی كۆخەكەم نەدرایەوە ، لە بەر دەرگای هەیوانەكەدا پێڵاوە قوڕاوییەكانم داكەند و بۆ بینینەوەیان لە پاڵ پێڵاوە

جووت کراوەکانیتردا دامنا . وەکوو هەرجارێك کە دەهاتم بۆ ئێرە تەماشای پێڵاوەکانم کرد ، پێڵاوە سەوز و جوانەکانی شەکورەی لێنەبوو ، وتم لەوانەیە کەس لە ماڵ نەبێ . وامدەزانی شەکورە و منداڵەکانی لە باوەشی یەکتریدا خەوتوون ، لە ناکاو یەکەم دەرگای لای ڕاستم کردەوە و ڕۆیشتمە ژوورەوە . دەستم دا لە دۆشەکە و پێخەفەکان و سندووقێك و دۆلابێکی سەر تووکنم کردەوە و تەماشام کردن . بە بۆنی بادامییەکەی ژوورەکەوە خەیاڵم چووە سەر شەکورە .دۆلابێکی سەرووترم کردەوە، سەرینێك کەوت و دایی لە سەرم و دوایی لەگەڵ پەرداخی پاڵ سوراحییەکەوە کەوتنە خوارەوە . ژوورەکە زۆر تاریك بوو ، هەستم بە سەرماکە دەکرد ، کاتێ پەرداخەکە دەنگی دەرخست ، زاوای بەڕێز لە ناوەوە بانگی کرد : " خەیرییە ! شەکورە ! کامتانن ئەوە ؟ " لە چاو پرتاندنێکا لە ژوورەکەوە دەرکەوتم و بەملا و بەولای هەیوانەکەوە تێپەڕ بووم و ڕۆیشتمە ئەو ژوورە بەشێن ڕاخراوەی وا زاوا لە کاتی زستاندا لەوێدا کاری دەکرد و گوتم :"منم ، زاوا ئەفەندی، من"..''تۆکێی؟''.

لەو کاتەدا تێگەیشتم کە ئەو نازناوانەی وا وەستا عوسمان لە کاتی شاگردیماندا بەوە بانگی دەکردین بە کەڵکی چی دێن . وەکوو خۆشنووسێکی لە خۆ بایی کە دواییین لاپەڕەکانی کتێبێکی شکۆ داری نووسیبێ ، خۆمم وەکوو پیاوی هەژار و تاوانبار بە ناو بانگ کرد و لەگەڵ ئەوەی کە گوتم لە کوێوە هاتووم بە قوورساییەکەوە ناز ناوو ناوی ڕاستەقینەی خۆم و باوکیشمم پێگوت . لە پێشدا وتی ها ! لە دوایشدا هەر وتی ها ! وەکوو ئەو پیرە مێردانەی کەوا لە چیرۆکە سوریانییەکاندا دەڵێی ، ڕوو بە ڕووی مەرگ دەبنەوە و بێدەنگییەکەیان هەتا دوایی دەبێ ، ئەویش

**بۆ ماوەیەکی کورت بێدەنگ بوو . لە بەر ئەوەی کە ئێستا باسی مەرگم کرد ، لەوانەیە کە وەها تێبگەن کە بۆ ئەنجامدانی کارێکی ئاوەها هاتووم بۆ ئێرە ، بەڵام ئەگەر کتێبەکەتان وەها خوێندبێتەوە ، زۆر هەڵەیە و بە هەڵەش تێدەگەن ، کەسێك کە بیەوێ کارێکی وەها بکات ، بۆ چی لە دەرگا دەدات ؟ ئایا پێڵاوەکانی دەر دەخات و بەبێ چەقۆ دێت ؟ وەکوو پیرەمێردەکانی ناو داستانەکان گوتی : " کەواتە هاتی . " بەڵام لە دواییدا زمانی خۆی بە هەوایەکیتردا گۆڕی و گوتی : " بەخێر هاتی کوڕم، بڵێ بزانم چیت دەوێ ؟ " تاریکایی داهاتبوو . ئەو پەنجەرەیەی وا لە بەهاردا بەرووی دار هەنار و دار چنارەکانەوە دەکرایەوە ، لەگەڵ ئەوەی کە داپۆشرا بوو ، دیسان تیشکێکی دەدایە ناوەوە ، ئەم جۆرە تیشکانە بە دڵی شێوەکارە چینییەکان بوو ، چونکە هەلی دۆزینەوەی هەڵەکانیانی بۆ دەرەخساندن . وەکوو جاران لە گۆشەکەی خۆیدا لەسەر مێزێك دانیشتبوو . دەم و چاومی بە تەواوەتی نەدەبینی ، جاران لەگەڵ ئەوەدا شەو تا بەیانی لە ژێر ڕووناکی ئەو مۆمەدا بە فڵچە و قەڵەم و مۆرەکانی نێوان جامۆڵکەکانەوە وێنەمان دروستدە کرد و لەسەر نەخش و نیگار قسەمان دەکرد . خەریکبوو بە هەڵچوون و پەشۆکاوییەوە هەستی نزیکبوونەوەی خۆم بەرامبەر بە ئەو لەو کاتانەدا زیندوو بکەمەوە . نازانم لەبەر چی بوو ، لەبەر ئەم هەستە بێگانەیە بوو ، یا خود لەبەر دوو دڵیەکانی خۆم بوو کە باسی ئەوەم بۆ نەکردئایا ڕاستە کاتێ وێنە دەکێشم تووشی گوناباری دەبم و گومانەکانی خۆمم لەو بارەیەوە پێنەگوت و نەمگوت کە کەسانیتریش دەزانن و لێی ئاگادارن . ئەم جارەیان بڕیارمدا کەوا دەردەکەی خۆمی بە شێوەی چیرۆك بۆ بگێڕمەوە .**

**لەوانەیە کە ئێوەش باسی بەسەر هاتی شێخ موحەممەدی**

**ئیسفەهانیتان بیستبێ :**

**ئەم شێوەکارە لە بواری هەڵبژاردنی ڕەنگ و کەڵەکە کردنی وێنە لە نێو لاپەڕەکاندا بە خرۆش کردنی وێنە وەکوو شیعر و دانانی ژێر بیری شاراوە وەکوو هێندسە لە ناو جەرگەی وێنەکەدا دەستی بالآی هەبووە . لە دوای ئەوەی لە تەمەنی لاویدا گەیشتۆتە پلەی وەستایەتی ، بە دەستە موعجیزاوییەکەی خۆیەوە لە دۆزینەوەی بابەت و خولقکاری‌دا وەستایەکی لێهاتوو بێ‌پەروا بووە . بە شارە زایی و بە هونەر و بەڕاگرتنی هاوسەنگی ، بە ڕەشایی قەڵەم توانی شەیتانە مەترسیدارەکان و جندۆکە شاخدارەکان و ئەو بوونەوەرانەی وا نێوەیان مرۆڤن و نیوەشیان حەیوانن بخاتە نێو وێنە هەستەوەر و ناسکەکانی هەراتەوە . لە هەموو کەسێك زیاتر سەرەنجی داوەتە سەر وێنە کەسیەکانی ڕۆژ ئاوایی و وێنەی ناو ئەو کتێبانەی دۆزیوەتەوە وا لە کاتی چەنگیز خاندا پەڕوپوت کرابوون و سەر لە نوێ کیشاونییەتەوە : وێنەی ئەسکەندەرکە بەلاچاوێکەوە تەماشای ئەو ژنە ڕووت وقووتانە دەکات کەوا مەلە دەکەن ، وێنەی مەلە کردنی شیرین لەبەر تیشکی مانگداو بە دەیان بابەتی‌تری لەم جۆرەی بەر لە هەموو کەسێك بە نەترسییەوە کێشاوە و پاشاکانی لە کاتی خۆخوران و سەگەکانی لە کاتی چەقان لەیەکدا و شێخەکانی لەکاتی سەر خۆش بوون بە شەرابەوە کێشاوە و ئەمانەشی  بە کۆمەڵگەی شێوەکاران داوە بە قەبلآندن و سی ساڵی تەواوی بە خواردنەوەی شەراب و بەنگکێشان و کارکردنی باش و بەجۆش وخرۆشەوە تێپەڕ کردووە . لە دوایشدا لە کاتی پیری، دەبێت بە موریدی پیاوێکی سۆفی و لەماوەیەکی کورتدا هەموو ئەو شتانەی کە ئەنجامی داوە و لە سی ساڵی ڕابردوودا دروستی  کردوون، بە بێ دینی لە قەڵەمیان دەدا**

و ڕەتیان دەکاتەوە لەوەش زیاتر لەو سی وساڵەکەی تری تەمەنیدا شار بە شار و کۆشك بە کۆشك گەڕاوە و هەموو کتێبخانەکانی لێك داوە و لە خەزێنەی پادشاکاندا وێنەکانی خۆی دۆزیوەتەوە و لەناوی بردوون سالأنێك لەوە و بەر چ وێنەیەکی دابیٚ بە کام کتێبخانە یان بەکام پاشا ، چی دەکرد و نەی دەکرد و بە فێلٚ بایە یان بە خۆشی بایە هەڵی دەخەڵەتاندن و وێنەکەی دەهێنا و لە هەلێکدا کە کەسێك چاوی لیێنەبایە یان دەیدڕاندن یاخود ئاوی بەسەردا دەڕژاندن ." ئەمەشم وەکوو نموونەی ئەوەی کەوا گەرم و گوڕی وێنە کێش لە ئیمان دەردەخات و ئازاری پیٚ دەگەیەنێت بۆ باس کردوو ئەوەشم بە بیر هێنایەوە لەبەر ئەوەی کە شێخ موحەمەد کەنەیدەتوانی یەکە یەکەی کتێبخانەکان بگەڕێت و کتێبەکانی خۆی بدۆزێتەوە ، شازادە عەباس میرزا کە حاکمی قەزوێن بوو کتێبخانە گەورەکەی خۆی بۆ سووتاندووە و داستانی مردنی شێوەکارەکەشم لە نێو ئێش و ئازاردا و لە کاتی سووتانی کتێبەکاندا وەکوو ئەوەی کە خۆم بم بۆ گێڕایەوە . زاوا ئەفەندی بە بەزەیی پێدا هاتنەوەوە گووتی دەترسی کوڕم ؟ ئەترسی لەو وێنانەی وە کێشاوتن ؟

ژوورەکە ئەوەندە تاریك بوو کە نەمزانی ئەمەی بە پێکەنینەوە گووت یان نا ، بەلأم خۆم وای بۆ دەچم . وتم : " شتێك بە ناوی نهێنی کاری کتێبەکەمان نەماوەتەوە ، لە وانەیە گرنگ نەبێت بەلأم لە هەموو جێگایەکدا باسی لەسەر دیکرێت دەلێن کە بە شێوەیەکی شاراوە و سەر گێراو قسە بەدینەکەمان دەڵێن و کوفر دەکەن . دەلێن کە بەگوێرەی داخوازی حەزرەتی پادشاکەمان کتێب ئامادە ناکەن و تەنانەت گاڵتەشی پێدەکەین و بەگوێرەی خۆمان دروستی دەکەین . هەندێکیش دەڵێن کە کتێبەکەمان شەیتان بە

ڕووخۆشی و جوانی نیشان دەدات . دەڵێن کەوا بە مەبەستی ڕێنمایی وەرگرتن تەماشای چاوی سەگ دەکەین و لەبەر ئەوەی کەوا مێشی ئەسپێك و مزگەوتێکمان پێکەوە دروست کردووە مێشەکەمان لەپێشەوەی مزگەوتەکەوە کێشاوە ، ئەمە بەمانای بە یەك زانینی بەهای ئەو دوانەیە . شەوانە کەبیر لەمانە دەکەمەوە خەوم لێ ناکەوێ .

زاوا ئەفەندی وتی : " ئێمە پێکەوە وێنەکانمان کێشاوە ، شتی وامان دروست نەکردووە و تەنانەت لە دڵیشمانەوە تێپەڕ نەبووە . وایە یان نا ؟ " بە شێوەیەکی گەوورە کراو وتم : " حاشا ! بەڵام نازانم لە کوێوە بیستویانە ، دەڵێن کە دواین وێنە لە نهێنی کاری زیاتر بە شێوەیەکی ئاشکرایانە کوفرو بێ دینی دەکات . "

وتی : " دواین وێنەت بینیوە ؟ "

بەسەرنج و پێداگیرییەکی تەواوە وتم : " بۆ وێنەیەکی دوو لاپەڕەیی ، پەلێکی گەورەتانە پێدابوم ، ئەو وێنانەی وا ویستبووتان کێشابووم ، بەڵام وێنەکەم نەبینیوە ، ئەگەر بمبینیایە هەموو ئەو تۆمەتانەم بە درۆ دەخستەوە و ویژدانم ڕەحەت دەبوو . "

– : " بۆچی هەست بە تاوانباری دەکەی ؟ ئەوەی کە ڕۆحت دەخواتەوە چیە ؟ چ شتێك تۆی لە خۆت خستۆتە ناو گومانەوە ؟ "

– : " گومان کردن لەوەی کە وا هێرش دەکەنە سەر ئەو کتێبانەی وا بە مانگان بە خۆشییەوە کاری بۆ دەکەی و بە بێئەوەی کە بمری سزای دۆزەخ ببینی ، دەبوایە کەو وێنەیەم ببینیبایە . "

– : " هەموو دەردێکت ئەوەیە . بۆ ئەوە هاتووی بۆ ئێرە ؟ " لەناکاو پەشۆکام. دەبێ کەبیر لە شتێکی چەپەڵی وەکوو کوشتنی زەریف ئەفەندییە

بێچارەکە بە دەستی منەوە بکات ؟

وتم : " ئەو شازادانەش کەوا دەیانەوێ پادشا لەدەسەلاّتداری بخەن و جێگای بگرنەوە کەڵك لەوە وەردەگرن و دەڵێن پادشا بە دزیوە هاوکاری و یارمەتییان دەکات . " بە حاڵێکی ماندوو بێزارەوە گوتی : " چەند کەس بڕوا بەمانە دەکات؟"

– : " هەر مەلایەك کەوا تۆزێك جەماوەری هەبێت و سەری بەم جۆرەوە شتانەوە بێشێ باسی ئەمانە دەکات ، چوونکە ئەمە دەرگای نان خواردنە .

" ئایا وەها بیر دەکاتەوە کە من تەنیا بۆ ئەوەی ئەم شتانەی پێ بڵێم هاتووم بۆ ئێرە ؟ بەدەنگێکی لەرزۆکەوە گوتم : " دەڵێن کە زەریف ئەفەندییە بێچارە خوا لێ خۆش بووەکەش لەم شتانە تێگەیشتووە و ئەم وێنانەی هەموو بینیوە و زانیویەتی کە دژ بە دین و کوفری تێدایە و هەر لەبەر ئەوەش ئێمە کوشتوومانە . ئاغای دەستەیەکی شێوەکاران ئەمانەی پێ گوتم، خۆتان دەزانن شاگردە بەردەست و شێوەکارانی وێنە کێشخانە کە لە سەر هەموو شتێك قسە دەکەن . " هەر بەم ژێر بیرییەوە هەرچی دەچوو گەرمتر دەبووم و قسەم بۆ دەکرد ، نەمدەزانی چەندەی ئەم قسانەم بۆ خۆم بیستووە ، یان چەندە لەوانەم لە پشتی کوشتنی ئەو ناڕەسەنە لە ترساندا هاتبێ بە مێشکدا، یان وەکوو چەندەی ئەوانە بەرهەمی خەیاڵی خۆمە.

وامدەزانی کە لەبەر ئەوەی لە پێشدا قسەم کرد و هەموو شتێکم بۆ گێڕایەوە ، زاوا دوولاپەڕەکە دەردینێ و وێنەکەم پیشاندەدا و ئاهۆنم دەکاتەوە . داخۆ بۆچی لەوە تێنەدەگەیشت کەوا ڕێگای ڕزگاریم لە گومانی ئەوەی کەوا خەریکە لەزەلکاوی تاوان و گوناباریدا دەخنکێم ، هەر بەو شێوەیە مومکین دەبێت ؟ ویستم بیهەژێنم و بە لە خۆ بووردەییەوە

پرسیارم کرد و گوتم : " ئایا دەبێت کە مرۆڤ بەبێئەوەی ئاگای لێبێت وێنەیەك دروست بکات کە بێدینی و بێئیمانی تێدا هەبێت ؟ " لە جێگای وەڵامدانەوە وەکوو ئەوەی کەوا منداڵێك لە ژوورەکەدا خەوتبێ بە ناسکییەوە دەستێکی هەڵبڕی و منیش بێدەنگ بووم . وەکوو ئەوەی کەوا بچپێنێ گوتی : " هەوا زۆر تاریك بووە ، با مۆمدانەکە داگیرسێنین . کاتێ مۆمدانەکە داگیرسا و تەماشای ڕوخساریم کرد ، شانازییەکی بێگانە بە ڕوومەتی زاوام بینی ، زۆرم پێناخۆش بوو . یان وەکوو ئەمە گوزارشتێك بوو بێ لە هەستی بەزەیی پێدا هاتنەوەی ؟ ئایا تێگەیشتووە کەمن پیاو کوژە ناپیاوەکەم و لەسەر ئەوە بیر دەکاتەوە یان وەکوو لە من دەترسێ ؟ لە ناکاو پەتی بیرەکانم لە دەست دەرچوو ، وامدەزانی ئەوبیرانە هی کەسی دیکەن و منیش بە سەر سوورماییەوە گوێیان لێڕادەگرم . قاڵییە ڕاخراوەکە شتێکی وەکوو گورگی پێوە بوو ، بۆ چی تاوەکوو ئێستا سەرەنجم نەداوەتێ ؟

کاکی زاوا گوتی : " ئەو کەسانەی وا حەز لە وێنە و نەخش و کتێبی جوان دەکەن ، بە تایبەت خان و پاشاکان و پادشاکان و هەر هەموویان سێوەرزیان هەیە : لە سەرەتادا لێهاتو و لەخۆبووردەن ، خاوەن مەراق و زانخواز و خۆهەڵقورتێنەریشن . لەبەر ئەوەی کەوا وێنە لە کەسانیترەوە دەبینن ، ئەوان وێنەیان بۆ شکۆداریەکەی دەوێ، لەم وەرزەدا تەنیا فێر دەبن . لەوەرزی دووهەمیشدا ئەو کتێبانەی وا بیانەوێ بە گوێرەی دڵی خۆیان دروستیدەکەن . لەبەر ئەوەی فێری ئەوە بوون کە لەدڵەوە تەماشای وێنەکان بکەن دەبن بە خاوەنی ناو ناوداری، لە دوای مردنیش ئەو کتێبانەی وا بە جێیان هێشتوون دەبن بە ناو شکۆداری بۆیان ودەمێننەوە .

له پاییزی ژیانیشدا ئیدی هیچ پادشایەك كاری بە كاری بێمردنییەكەی لەم دونیادا نابێت . خۆی لە خۆیدا ئەو فەرمانڕەوایانەی وا نەخشیان خۆشدەوێ كاتێك شتێك بە ئێمە دروستدەكەن و ناوی خۆیانی تێدەخەن، یان وەكوو جارجاریش كە مێژووكەی خۆیان دەنووسنەوە بێ مەرگییان بە دەست هێناوە . كاتێ پیردەبن دەیانەوێ لە دونیای دیتردا جێگایەكی باشیان هەبێت و هەمووشیان لەو كاتانەدا بڕیار دەدەن كە وێنە لە پێش ئەمەدا ئاستەنگی دروستدەكات . ئەو شتەش كەوا من ناڕەحەت دەكات ئا ئەمەیە . ئەو شا تاماسووبەی كەوا خۆی لە كاتی جوانیدا شێوەكار بووە و تەمەنی لاوێتی خۆی لە وێنە كێشخانەدا بردۆتە سەر ، كاتێ بەرە و مردن ڕۆیشتووە ، دەرگای وێنە كێشخانەكەی داخستووە و وێنەكێشە دەرئاساییەكانی لە تەورێزەوە دوور خستووتەوە و بەرهەمەكانیانیشی پەرش و بڵاو كردووتەوە و كەوتۆتە ناو قەیرانی پەشیمانبوونەوە . بۆچی هەموویان وەها بیر دەكەنەوە كە وێنە دەرگای بەهەشتیان لێدادەخات ؟ "

– : " دەزانن بۆ چی ؟ چونكە هەندێك كەس دەڵێن حەزرەتی پێغەمبەر گوتوویەتی لە ڕۆژی قیامەتدا خودای گەورە وێنەكێشان بە خراپترین جۆری سزادان سزا دەدات ."

– : " وێنەكێش نیە ! ئەوە حەدیسێكی بۆ خاراییەوە باسی پەیكەر تاشەكان دەكات"

به ئاگادارییەوە گوتم : " لە ڕۆژی حەشردا وایان لێدەكەن كە ئەو شتانە زیندوو بكەنەوە وا درووستیان كردوون بەڵام لەبەر ئەوەی ناتوانن بە ئاگری دۆزەخ سزا دەدرێن ، لە قورئانی پیرۆزدا ئەو كارەی ئەوان تایبەتمەندی خودایە . هەر خودایە كە خۆلقێنەرە و لە نەبوونەوە هەبوون دروستدەكات و

گیان بە بێ گیانان دەبەخشێ و نابێ‌کە هیچ کەس لەگەڵیدا کێبرکێ بکات، ئەو کارەش کە وێنەکێشان هەڵدەستن بە ئەنجامدانی و ئیدعایان وایە کە خولقێنەرن خۆی لە خۆیدا گەورەترین تاوانە . " وەکوو ئەوەی کە بە توندی ئەمانەم گوتبێ و ئەوم تاوانبار کردبێ زەق زەق تەماشای نێو چاوانمی کرد و وتی : " بە گوێرەی تۆ ئەمانەمان دەکرد ؟ " بەبزە لێدانێکەوە گوتم : " نا ، بەلاَم زەریف ئەفەندی کە دوایین وێنەکەی بینیبوو وەهای بۆ دەچوو و دەیگوت وێنە دروست کردن بە زانیاری یەك لایەنی و یەك دیدگاییەوە و بەکەڵك وەرگرتن لە نەریتی وەستا ڕۆژ ئاواییەکان ، دەستکردی خودی شەیتانە . هەروەها وتوویەتی کە لەم دوایین وێنەیەدا بە کەڵك وەرگرتن لە نەریتی ڕۆژ ئاواییەکان وێنەی کابرایەکی مردوومان کێشاوە ، کە کاتێ کەسێك تەماشای دەکات وا دەزانێت کە ئەمە ڕاستییەکەیەتی و دەیەوێ وەکوو ئەوانەی سەردیواری کلیسەکان کڕنووشیان بۆ بەرێت . وەهەروەها وتوویەتی زیاتر لەوەی کە بە پێی ئەم تێڕوانینە تازەیە وێنەمان کێشا بێت ، وێنەمان لە شێوەی دیتنی‌خوداوە دابەزاندۆتە شێوەی بینینی سەگێکی ناو کۆلاَنی، بە بەکارهێنانی نەریتی ڕۆژئاواییەکان و گۆڕانەوەی هونەری خۆمان بەهی ئەو گاورانە لە پاکی و سادەیی دوور دەکەوینەوە و وردە وردە دەبین بە کوێلە و کارەکەری ئەوان کە ئەمەش خۆی دەستێوەردانێکی تری شەیتانە . " زاوا ئەفەندی گوتی : " هیچ شتێك پاك و ساف نیە . هەر کاتێك کە شتێکی دەر ئاسایی دروست ببێت و لە وێنە کێشخانەکەدا جوانییەك دروست بکرێت کەوا چاوەکانم ئاو بدات و مووەکانم ڕاست بکاتەوە ، ئەو کاتە دەزانم لەوێدا دووشت یەکیان گرتووە کە نەدەهاتنە پاڵی یەك و ئەم شتە نا ئاسایە تازەیان دروست

**کردووه . جوانی وێنەی ئێرانییەکان قەرزاری دەرکەوتنی کەسی وەکوو بەهزادەو تێکەڵاوبوونی وێنەی عەرەبی و مەغوولی و چینییە لەگەڵ یەکتریدا . شاتاماسووب هەستەوەری تورکمانی تێکەڵ بە نەریتی ئێرانییەکان کرد ، ئەگەر ئەمڕۆش هەر کەس باسی وێنە کێشخانەکەی ئەکبەر خانی پادشای هیند دەکات و باسەکەش هەر تەواو نابێت ، لەبەر ئەوەیە کەوا وێنەکێشانی بۆ کەڵك وەرگرتن لە نەریتی ڕۆژئاواییەکان هانداوە، ڕۆژهەڵات و ڕۆژ ئاواش هەر دوو هی‌خودایە ، خودا ئێمە لەوانە بپارێزێ کە وا سافن و تێکەڵاو نەبوون . " ڕوومەتی لەبەر ڕووناکییەکەدا چەندە نەرم و ڕووناکە ، سێبەرەکەشی لەسەر دیوارەکە بە هەمان ئەندازە باریك و ترسێنەرە . لەگەڵ ئەوەی وا قسەکانی لە جێگای خۆو ماقووڵانە نەبوون و هەمووشیانم قەبووڵ دەکرد ، بەڵام بڕوام پێنەدەکرد . لەبەرئەوەی گومانی لێدەکردم ، منیش گومانم لێدەکرد . لە هەمانکاتدا گوێی بۆ دەنگی پێی یەکێك ڕادەگرت کە لە دەرگاکەوە بێت و لە دەستی من نەجاتی بدات . وتی : " باسی شێخ موحەممەدی ئیسفەهانیت بۆ کردم کە ڕابردووی خۆی ڕەتکردووتەوە و کتێبخانەیەکیان لەبەر ئەو سووتاندووە کە وێنەکانی ئەوی تێدا بووە و لە دوایشدا خۆیشی بە ئاگری ویژدان سووتاوەتەوە . با منیش باسی بەشێکی ئەو ئەفسانەیەت بۆ بکەم کەوا تۆ ئاگات لێی نیە . ڕاستە ساڵەکانی کوتایی تەمەنی خۆی بۆ دۆزینەوەی وێنەکانی تەرخان کردووە ، بەڵام کاتێك کە لاپەڕەکان هەڵدەداتەوە ، لە باتی وێنەکانی خۆی وێنەی دروست کراویتر دەبینێ کە لەهی ئەو دەچن ، لە ساڵانیتریشدا دوجیلی تازەی وێنەکێشانی بینیوە کە ئەو وێنانەی وا ئەو ڕەتی کردوونەتەوە ، کردوویانە بە قاڵب بۆ خۆیان و بە کاریان هێناوە و ئەو وێنانەیان لە**

مێشکدا کێشاوە و زیاتر لەوەی کە تەنیا لەبەریان بکەن لە ڕۆحیاندا جێگیریان کردوون . چەندە کە ئەو دەستی بە لە ناو بردنی وێنەکان کردبێ ئەوەندەیتریش لەرووی دروستکراوە و لەمێشکی هەمووواندا جێی گرتووە. ئێمەیش چەندە کتێب دەخوێنینەوە و تەماشای وێنە دەکەین ، ئەوەندەش تێدەگەین کە وێنەیەکی باش بە لایەنە دەرئاساییەکانەوە نەتەنیا لە عەقڵماندا دەمێنێتەوە بەڵکوو لە مێشکماندا جێدەگرێ و دیمەنەکانیشی دەگۆڕدرێ.ئەگەر هونەری شێوە کارێك بەمجۆرە لە ڕۆحماندا کاریگەری ببێ ، لە داهاتووشدا دەبێ بە داستانێك ودەکەوێتە سەر زاری هەمووانەوە . شێخ موحەممەدی ئیسفەهانی چەندە وێنەکانی سووتاندووە ، ئەوەندەیتریشی لێ دروست کراوەتەوە و زانیویەتی کە هەموو کەس وەکوو زەمانێك ئەو چۆن تەماشای دونیای دەکرد ئاوەها تەماشای دونیا دەکات ، لە لایەکیتریشەوە تێگەیشتووە کە ئەم وێنە دروست کراوانە وەکوو ئەوانەی خۆی نین و زۆر ناشرینن . " نەمتوانی پێش لە بەرز بوونەوەی هەستی حەیران مانەوەم بەرامبەر بە زاوا ئەفەندی بگرم و خۆمم خستە بەر پێی . کاتێ دەستەکانیم ماچکرد فرمێسك لە چاوەکانمەوە هاتە خوارەوە وا هەستمکرد کە جێگای وەستا عوسمانی بۆ من گرتۆتەوە .

بە شێوەیەکی لە خۆ ڕازی بوونەوە گوتی : " شێوەکار گوێ لە ویژدانی وێنەکە دەگرێ و بە پێی ئەو پێوانانەی وا بڕوایان پێدێنێ بەبێ ترسان لە هیچ کەسێك وێنە دەکێشێ و ئەوەشی بە خەیاڵدا نایەت و خەمیشی لەوە نیە کە دوژمنان و فرەبێژەکان و بەخیڵەکان چی دەڵێن . " بەڵام کاتێ دەستە لەکەدار و خاڵدارەکەیم ماچ کرد بیرم لەوە دەکردەوە کەوا زاوا ئەفەندی شێوەکار نیە . بەڵام وەکوو ئەوەی کە کەسێکیتر ئەم بیرە

شەیتانیەی خستبێتە مێشکمەوە ، یەکسەر شەرمم لە خۆم کرد . بەڵام سەرە ڕای ئەوانە ئێوەش دەزانن کە ئەو شتانەی وا من بیریان لێکردوونەتەوە هەمووی ڕاست و دروستن . زاوا ئەفەندی گوتی : " لێیان ناترسم ، چونکە من لە مەرگ ناترسم . " ئەوانە کێبوون ؟، وەکوو ئەوەی کە لێی تێگەیشتبێتم سەریکم بۆ لەقاندەوە ، بەڵام کین و نەفرەتێکیش لە دروونمدا کوڵەی دەهات . چاوم بە کتێبی ( کتاب الروح )ی ( الجەوزییە ) کەوت کە لە تەنیشتەوە دانرا بوو . ئەو خڵەفاوانەی وا دەیانەوێ بمرن حەز لەم کتێبانە دەکەن کەوا باسی بەسەرهاتەکانی ڕۆح لەدوای مردن دەکات . لە نێو سینییەکدا ، زیاتر لە قوتووی نووسراوەکان و قەڵەم و قەڵەمتراش و جامۆڵکە و مورەکەبەکان و قوتووی قەڵەمەکان ، شتێکیترم بینی ، ئەویش جامۆلکەیەکی برنجە بوو . بەلەخۆ بووردەییەکەوە وتم : " دوایین وێنەکە دەرخەن با نیشانیان بدین و پێیان بسەلەمێنین کە ناترسین . "

– : " ئایا ئەمە نابێ بە هۆی ئەوەی وا تێبگەن ئێمە هیچ نەبێ گرنگیمان داوە بەو تۆمەتانەی وا خستویانەتە پاڵ ئێمە ؟ شتی مەترسیدارمان ئەنجام داوە تاوەکوو بترسین؟ ئەو شتە چیە کەوا ترسەکەی تۆ بە حەق نیشان بدات؟ "

وەکوو باوکێك دەستی هێنا بەسەرمدا ، لەوە ترسام کە دووبارە نەتوانم بەری فرمێسکەکانم بگرم و باوەشم پێدا کرد . بە پەشۆکاوی و هەڵچوونەوە وتم : " دەزانم بۆ چی زەریف ئەفەندییە بێچارەکەیان کوشتووە . زەریف ئەفەندی تاوانباری دەکردین و بە تۆمەتەکانی خۆی پیاوەکانیمەلانەسرەتی بەردەدایە گیانمان و بڕیاری لەسەر ئەمەش ئەوە بوو کەوا بێدینی کراوە و ئەمەشی بەملا و ئەولا ڕاگەیاندووە و ویستوویەتی ئەو شێوەکارانە لە

بەرامبەرتاندا بورووژێنی کەوا ئیشیان بۆ دەکەن ، نازانم لە ناکاو بۆ ئەوەی کرد ؟ ، لەوانەیە لەبەر بەخیلی بێت یا خود گوێی بۆ قسەکانی شەیتان ڕاگرتبێت . شێوەکارەکانی‌تریش ئەوەیان بیستبوو کە زەریف ئەفەندی لەسەر ئەوەی هەموومان تەفر و توونا بکات بە بڕیار بووە . هەموویانی ترساندووە و هەمووشیان وەکوو من کەوتوونەتە ناو شك و گومانەوە . یەکێك لەوانەی شەوێك بردۆتە جێگایەك و ویستوویەتی بەرامبەر بە ئێوە و ئێمە و وێنە و نەخش بیورووژێنیٚ ، ئەویش حەپەساوە و لە هەڵچووندا دەست بە جیٚ ئەو ناپیاوەی کوشتووە .

" ناپیاو ؟ " . وەکوو ئەوەی کە لە بەرامبەرمدا دانیشتبیٚ قیڕاندم و گوتم : زەریف ئەفەندی بیٚنان و خوێیەکی خاین و خراپە پیاو بوو ، شیرەکەی حەرام بوو. " بێدەنگییەك دروست بوو ، لە من دەترسا ؟ من لە خۆم دەترسام . وەکوو ئەوەی کەوتبێتمە بەربای عەقڵ و تووڕەیی کەسێکی‌ترەوە ، ئاوەهام لێهاتبوو . بەڵام ئەمە جوان بوو .

– : " ئەو وێنە کێشە کێیە کەوا وەکوو تۆ و کابرای ئەسفەهانی کەوتۆتە ناو پەشۆکاوی و تووشی هەڵچوون بووە ؟ کیٚ کوشتوویەتی ؟ "

– : " نازانم " بەڵام دەمویست کە لە ڕەنگی ڕوومەتمەوە بزانێت کەوا درۆ دەکەم . دەمزانی کە بە هاتنم بۆ ئێرە هەڵەیەکی گەورەم کردووە . بەڵام من هیچ کات هەستی پەشیمانی و تاوانباری نامگرێتەوە . کە دەم بینی زاوا ئەفەندی گومانم لێدەکات ، پێم خۆش دەبوو و هێزیشم لێوەردەگرت . لەبەر ئەوەی کە دەمویست بزانم چییە و بیٚ دینی تێدایە یان نا و چۆن شتێکی لێدەرکەوتووە ، بەزوویی بیرم لەوە کردەوە کە ئەگەر بزانێت من کوشتوومە لێم دەترسیٚ و نیشانم دەدات . وتم :" ئایا گرنگە کە کیٚ ئەو ناڕەسەنەی

کوشتووه ؟ ئەوەی وا کوشتوویەتی کارێکی باشی نەکردووە ؟ " کە چاوی بڕییە نێو چاوانم ورەم بەرزتر بووەوە . کەسێك کە بڕوا بکات لە ئێوە بەرەوشتتر و باشترە و شەرمتان لێبکات ، بەم شێوەیە تەماشای نێو چاوانتان ناکات . بەڵام لەوانەیە لەبەر ئەوەش وەها تەماشا بکات کە بییەوێ ڕاپۆرتتان لەسەر بدات و بتانخاتە ژێر ئەشکەنجەی جەلادەکانەوە .

لە دەرەوە لەبەر دەرگای حەوشەکەدا سەگەکان وەکوو ئەوەی کە هار بوو بوون ، ئاوەها دەیانوەڕاند . وتم : " لەدەرەوە هەمدیسان بەفر دەبارێ ! بەم ئێوارە هەرکەس لە کوێیە ؟ بۆچی ئێوەیان بە تەنیا هێشتۆتەوە و ڕۆیشتوون ؟ تەنانەت مۆمێکیشیان دانەگیرساندووە "

– : " ئەمە زۆر سەیرە !نازانم. " ئەوەندە لە دڵەوە وتی کە بڕوام پێکرد و سەرەڕای ئەوەی لەگەڵ وێنە کێشانیتردا گاڵتەمان پێدەکرد ، تێگەیشتم کە بەڕاستی لەدڵەوە حەزی لێدەکەم . کاتێ تێگەیشت کەلە دروونمدا هەستێکی قووڵی ڕێز و خۆشەویستی بەرامبەر بە ئەو بەرز بۆتەوە وەکوو باوکێکی بە هەست و بە بەزەیی دەستی هێنا بە سەرمدا ، منیش هیچ ئاگام لێی نەبوو . ئەو کاتەش زانیم کە ئەو نەریتە هەراتییەی وا وەستا عوسمان هۆگری لێوە دەکات ئایندەیەکی نیە . ئەم بیرە ئەوەندە چەپەڵ بوو کە خۆشم لێی دەترسام . دوای بەسەر هاتێك وامان لێدێت کە بە ئومێدێکی کز و حاڵێکی پێکەنیناوییەوە و بەبێ ئەوەی کە گوێ بدەینە ئەوەی کە پێمان دەڵێن گەوج و گێل ، بۆ بەردەوامبوونی وەزعەکەی جاران دەپاڕێینەوە .

وتم : " با بەر دەوام بین لەسەر کێشانی وێنەی کتێبەکە و هەمووشتێك وەکوو جاران بێ ."

– : " لە نێو وێنەکێشاندا پیاو کوژیك هەیە . بۆیە کتێبەکە لەگەڵ ڕەشە

ئەفەندیدا تەواو دەکەم " .

ئایا دەیەوێت بۆ کوشتنی خۆی هانم بدات ؟

: " ئێستا لە کوێیە ؟ کچەکەتان ومنداڵەکانی لە کوێن ؟ " وا هەستم کرد کە هێزێکیتر ئەم قسانە دەخاتە ناودەممەوە ، کەچی خۆمم پێڕانەدەگیرا . لەمەو بە دوا بۆ بە هیوا بوون و هیوادار مانەوە ڕێگایەکم بۆ نەمابووەوە . تەنیادەمتوانی فرەزان و گاڵتەپێکەر بم .هەموو کاتێکیش هەستمدەکرد کەوا لە پشتی ئەم دوو جندۆکە شیرینە وا ژیر و گاڵتەچین شەیتانێك هەیە کەوا هەبوونەکەی خوی لە من دەدات . هەر لەم کاتانەدا سەگە بێخێرەکانی بەردەرگای حەوشەکە ، وەکووئەوەی کە بۆنی خوێنیان کردبیٚ سەر شێتانانە دەیانوەڕاند . ئایا من ئەم ساتەم لە پێشدا ژیا بوو یان نا ؟

لە شارێکی دووردا ، لە مێژوویەکدا کە ئێستاکانە بۆ من زۆر دوور بووەتەوە ، لە دەرەوەدا بەفرێك دەباری کەمن نەمدەبینی ، خەریکبوو بە گریان بیٚتاوانی خۆمم بۆ خڵەفاوێك دەسەلماند کەوا تۆمەدزینی ڕەنگەکانی لێدام . لەوکاتەشدا وەکوو ئێستا سەگەکانی بەردەرگای حەوشەکە وەکوو ئەوەی کە بۆنی خوێنیان کردبیٚ دەیانوەڕاند . ئێستاش دەزانم کە بە چرچ و لۆچەکانی ڕوومەتی و ڕوخسارە پیرەکەیەوە و بەنیگاکانی کە دەیتوانی لە چاوەکانمدا زەقیان بکاتەوە دەیەویٚ بمتلیقێنیٚ و بمخاتە لایەکەوە .ئێستاش خەتەکانی ئەو بیرەوەرییە بەر باد و تێکچووەی کەوا لە تەمەنی دەساڵەیمەوە و لە کاتی بەر دەستی وێنەکێشیمەوە مابووەوە ، لە عەقڵمدا بە ڕۆشنایی ماوەتەوە و ڕەنگەکانی کاڵ نەبوونەتەوە و دەیژێنم . ئەو شتانەی وا وێنە کێشی لێهاتوو وەستا عوسمان فێری کرد بووین لە عەقڵمدا مابوونەتەوە . هەستام و لە پشتی زاواوە کە دانیشتبوو سووڕێکم خوارد و

لەسەر تەختەی کارەکە و لە نێو جامۆڵکە شووشە و چینی و بلورەکاندا ، جامۆڵکە برنجەکەم هەڵگرت و بیرم لەو شتانە کردەوە کەوا دروستمکرد بوون ، وەکوو ئەوە وا بوون کە ئێستا دروستم نەکردبێتن ، لە بیرەوەرییەکی زۆر کۆن و ئاشکرا دەچوون کە ڕەنگەکانیشیان کاڵ بوو بێتنەوە .

وەکوو ئەوەی کە لە خەودا خۆمان لە دەرەوەدا ببینین لەرز دەمانگرێ . هەر بەو شێوەیە بە تەماشاکردنی جامۆڵکە دەم بچووکەکەی دەستمەوە گوتم : " لە دەساڵیمدا کاتێ شاگرد بووم جامۆڵکەیەکی وەهام بینیبوو . " زاوای بەڕێز گوتی: "ئەوە جامۆڵکەیەکی سێسەد ساڵەی مەغوولییە ، ڕەشە لە تەورێزەوە هێناویەتی، تەنیا بۆ ڕەنگی سووریش بەکار دەبرێ . " دیارە ئەو کەسەی کەوا لەو کاتەدا هانیدام بۆ ئەوەی ئەو جامۆڵکەیەی وا توند گرتوومە بدەم بەسەری ئەو لە خۆ ڕازییەدا شەیتان بوو . بە گوێیم نەکرد و بە ئومێدێکی نەفامانەوە گوتم : " من زەریف ئەفەندیم کوشتووە . "

تێدەگەن کە بۆ چی ئەمەم بە ئومێدەوە گوت وا نیە ؟ هیوام وایە کە زاوا لێم تێبگات و بمبەخشێ ، هەروەها لێم بترسێ و یارمەتیشم بدات .

# (( من زاواتانم )) (29)

کاتیٚ وتی زەریف ئەفەندیم کوشتووە ، بیٚدەنگییەکی دریٚژ ژوورەکەی گرتەوە ، وەهام بیر دەکردەوە کە منیش دەکوژیٚ ، ماوەیەکی دریٚژ دڵم توووند لیٚیدەدا ، بۆ کوشتنی من هاتبوو یان بۆ ئاشکرا کردنی خۆی ؟ یا خود بۆ ترساندنی من هاتبوو ؟ خۆی دەیزانی چیدەویٚ ؟ کاتیٚ کە زانیم ئەو شیٚوەکارەم نەناسیوە کەوا بە ساڵانە دەیناسم و کارە دەرئاساییەکانم بینیوە ، ترسام . هەستمکرد کەوا لە پشتی منەوە جامۆڵکەکەی پیٚیە ولە ڕیٚکی پشت ملمدا ڕاوەستاوە ، بەڵام نەگەڕامەوە و تەماشام نەکرد . دەمزانی کە بیٚدەنگییەکەم نائارامی دەکات و گوتم: "ئەو سەگانە تاوەکوو ئیٚستا بیٚدەنگ نەبوونەتەوە." بەم شیٚوەیەجاریٚکیتریش بیٚدەنگ بووینەوە ، ئەمجار مردن و ڕزگاریم بە تەواوەتی لە دەستی خۆمدا بوو . دەمزانی کە پیٚویستە هەندیٚك شتی پیٚبڵیٚم ، لە نەخش و نیگار زیاتر تەنیا شتیٚك کە لەبارەی ئەوەوە دەمزانی ژیری و لیٚهاتوویەکەی بووو بەس . خۆ ئەگەر

بڕواتان وابێ کە پێویستە ڕۆح و خۆیەتی و دەماری وێنەکێش تێکەڵ بە وێنەکەی نەبێت ، ئەمەی ئەو پێویستە کە شانازی پێوە بکردرێت .

باشە چۆن منی لە ماڵێکی چۆڵ و هۆڵدا پێوەدا بوو ؟ عەقڵە پیرەکەم بە پەلەپەل بیری لەمانە دەکردەوە ، بەڵام نەیدەتوانی لەم گەمە تێکەڵاوە تێپەڕ ببێت . شەکورە لە کوێ بوو ؟ پرسیاری کرد و گوتی : " لە پێشدا زانیوتە کە من ئەوم کوشتووە ؟ "

- " تێنەگەیشتبووم ، تەنانەت تا ئەو کاتەی کە پێت گوتم . لەوەش زیاتر گۆشەیەکی بیرم دەڵێت کە بە کوشتنی زەریف ئەفەندی کارێکی باشت کردووە ، چوونکە ئەو جوانکارە خوالێخۆشبووە دەترسا و سەری هەمووومانی دەخستە داوەوە . "

بەم شێوەیەش کە لەم ماڵەدا بەتەنیایی لەگەڵ پیاو کوژەکەدا مابوومەوە هەستێکی سوپاس کەرانە دایگرتم . وتم: " لەوە سەرم سووڕ نامێنێ کە کوشتووتە . ئەو کەسانەی کەوا وەکوو ئێمە لەگەڵ کتێبەکاندا دەژین و لاپەڕەکان لە خەودا دەبینینن ، هەموو کات لە شتێك دەترسن ، لەوەش زیاتر ئێمە لە وڵاتێکی موسڵماندا خۆمان بە شتێکی نایاسایی و حەرامەوە خەریك کردووە . لە ناو دڵی هەر وێنە کێشێکدا و لەهی هەمووماندا وەکوو دڵی شێخ موحەممەدی ئیسفەهانی هەستی تاوانبای و پەشیمان بوونەوە و بەر لە هەر کەسێك خۆ تاوانبارکردن و داوای لێبووردن لەخودا و جەماوەری تێدایە . کتێبەکەشمان وەکوو ئەوەی کەداوای لیبووردن بکەین دروست دەکەین . باش دەزانم کە تۆ سەر شۆڕ کردنەوەت بەرامبەر بەو مەلا و مامۆستا و ژن و شێخانە پەسند نەکردووە کە دژی ئێمە قسە دەکەن وهەر لە بەر ئەوە کوشتووتە . "

وتی : " یانی بۆ کوشتنی زەریف ئەفەندیە بیٚعەقڵەکە تاوانبارم ناکەن؟"

– : " ئەو شتەی وا لە نێو نووسراوە و وێنە و نەخشدا ئێمە بەرە و خۆی ڕادەکێشیٚ هەر لەناو ئەو ترسەدایە ، مانەوەمان لەبەر مۆمێکدا سەرەتای شەو تاوەکوو بەیانی و تاوەکوو ئەو کاتەی کوێراییمان دادێت ، تەنیا لەبەر پارە نیە ، بەڵکوو ڕاکردن و خۆ شاردنەوە لە جەماوەر و کەسافەتیتریشە . بەڵام لە هەمانکاتیشدا دەمانەویٚ کەسانیتریش ئەو وێنانە ببینن و سوپاسمان بکەن کەوا بە هەموو گرێدراویمانەوە و بە ئیلهامەوە کێشاومانە . بەڵام ئەگەر پێمان بڵێن بیٚئیمان ! خاوەن هونەرەکە چەندە ئازار دەکێشیٚ ؟ لە وێنەی ڕاستەقینەدا ئەمە لە ناو شتی نەبینرا و دروستنەکراودا شارایەوە . لەسەرەتاشدا لە ناو ئەو وێنەدایە کە هەر کەس بە خراپەیی و نەبوون و بێدینی لە قەڵەمی دەدا . وێنە کێشی ڕاستەقینە هەم دەزانێت کە پێویستە بچێت بەرە و ئەویٚ ، هەم لە تەنیاییەکەی ئەویش دەترسیٚ . بەڵام کیٚدەتوانی ژیانێکی پڕلە ترس و تەنیایی پەسەند بکات ؟ وێنەکێش بەر لە هەموو کەسێك خۆی تاوانبار دەکات و دەیەویٚ خۆی لەو ترسە ڕزگار بکات . تەنیا کاتێك خۆی بە دەستەوە بدا وراستییەکانی خۆی ئاشکرا بکات بڕوای پێدەکەن و دەیسووتێنن، وێنەکێشە ئەسفەهانییەکە خۆی ئەو کارەی کرد"

– : " تۆ شێوەکار نیت و ئەویشم لە بەر ئەوە نەکوشت کە وا دەترسام."

– : " بۆ ئەوەی بێترسانە وەکوو خۆت وێنە بکێشی ئەوت کوشت ! "

ئەو وێنە کێشەی وا دەیویست ببیٚبە بکوژم لە دوای ماوەیەکی درێژ قسەیەکی باشی کرد: "دەزانم کە هەموو ئەم شتانە بۆ خەڵەتاندن و ماتەڵ کردنیمن دەڵێی و دەتەویٚ لەم وەزعە ڕزگارت ببیٚ ، گوێم لێبگرە قسەی

دواییم زۆر ڕاست و له جێی خۆدایه." گەڕامەوە و تەماشای نێو چاوانیم کرد ، کە لەگەڵ مندا قسەی دەکرد وەکوو شێوازی جاران قسەی نەدەکرد ، دیار بوو کە سەری ئەو شێوازەی هەڵگرتبوو و ڕۆیشتبوو ، بەڵام بۆ کوێ بوو دەڕۆیشت ؟ نەمدەزانی لە پشتمەوە هاتە بەرامبەرم و قاقایەکی لێدا ، لایەنێکی خەماوی تێدا شاراوە بوو . گوتی : " خەمت نەبێ لەڕێز دانان بۆ تۆ کەمو کوڕی ناکەم ، هەر وەکووجاران هەڵسوو کەوتت لەگەڵ دەکەم . شتێك دەکەم بەڵام وا دەزانم بکەرەکەی من نیم، وەکوو بڵێی شتێك لە دەروونمدا بێ وهەموو خراپەیەکم پێ ئەنجام بدات . بەڵام زۆر پێویستیم پێی هەیە تەنانەت بۆ وێنە کێشانیش ."

– : " ئەمانە هەمووی قسەی دەر هێنراوی پیرەژنەکانە لەسەر شەیتان "

– : " یانی درۆ دەکەم ؟ " هەستم کرد ئەو ئازایەتییەی نیە کە من بکوژێ و دەیەوێ من تووڕەی بکەم .

– : " درۆ نیە بەڵام هەستەکانی ناو دڵت ناخوێنێتەوە . "

– : " نا ، بەجوانی شتەکانی ناودەروونی خۆم دەناسم ، هێشتا نەمردووم و سزای گەورەش دەبینم . دەبێ ئاگادار بی کە لەبەر خاتری تۆ تا قۆرگمان لە نێو گونا و تاواندا ماوینەتەوە ئێستاش بە من دەڵێی کە لە خۆ بووردە و ئازا بە! لەبەر تۆ بووم بە پیاو کوژ ، سەگە هارەکانی مەلانەسرەت هەموومان دەکوژن . "

کە بڕوام بە قسەکانی نەدەکرد ، جامۆڵکەکەی دەستی توونددتر دەگرت و بە تووڕەییەکی زیاترەوە دەیقیڕاند . داخۆ ئەگەر کەسێکی ڕێبوار گوێی لە قیڕەکانی من ببایە دەهاتە ژوورەوە ؟ لەبەر مەراق و لەبەر ئەوەی کە ویستم کاتێکی زۆرترم هەبێت پرسیارم لێکرد و گوتم : " چۆن کوشتت ؟ لەسەر

چاڵە ئاوەکەدا چۆن چاوتان بەیەك کەوت ؟ "

بە ویستێکی باسکردنی چاوەڕواننەکراوەوە گوتی : " ئەو شەوە کە لە لای تۆ دەر کەوت هات و منی پەیدا کرد وگوتی دواییین وێنەم بینیوە . زۆر ئەملا و ئەو لام کرد بۆ ئەوەی لە دەنگە دەنگکردن پەشیمانی بکەمەوە ، بردمە لای جێگا سووتاوەکەم و وتم لێرەدا پارەی شاراوەم هەیە ، کاتێ باسی پارەی بیست یەکسەر بڕوای کرد . ئەمەش بۆ سەلماندنی ئەوەی کەوا ئەو وێنە کێشە تەنیا لەبەر پارە ئیشی دەکرد بەڵگەیەکی حاشا هەڵنەگرە . هەر لەبەر ئەمەش من ناڕەحەت نیم ، وێنە کێشێکی خاوەن هونەر بوو بەڵام کەسایەتییەکی هیچ وپوچ بوو . حازر بوو بە نینۆك خۆڵە سەهۆڵ گرتووەکە بکەنێ . ئەگەر بەراستی لە پاڵی چاڵە ئاوەکەدا پارەی شاراوەم هەبایە ، هیچ پێویستی بەوە نەدەکرد کە بیکوژم . بۆ ڕازاندنەوەی وێنەکانت پیاوێکی سووك و ڕیسوات هەڵبژاردبوو، بەڵام دەستێکی گورج و گۆڵی هەبوو، لە دۆزینەوەی ڕەنگ و بەکارهێنانیدا زۆر باشبوو.

هیچ جۆرە شوێنە دەستێکم دانەنا بوو . ڕاستی ئەو شتەی کە پێی دەڵێن شێواز لە چیدایە ؟ ئێستاکانە ڕۆژئاواییەکان و چینییەکان باسی شێواز ( ئوسلوب) و ڕەنگ و هونەری وێنەکێش دەکەن . شێوەکارێکی باش پێویستە شێوازێکی جوداتر لە ئەوانی هەبێت یان نا ؟ "

: " خەمت نەبێ شێوازی تازە بە دەستی خودی وێنەکێشەوە دروست نابێت . شازادەیەك دەمرێ و پادشایەك شەڕەکەی دەدۆڕێنێ و ئەو دەورانەی کە هەر کەس وا دەزانێ کۆتایی نایەت تەواو دەبێت . کاتێ وێنەکێشخانەیەك دادەخرێ وێنەکێشەکانی ئەوێ هەر یەکەو بەرە و ولاتێك دەچن و پارێزەرێکیتر بۆ خۆیان دەدۆزنەوە . ڕۆژێك یەکێك لە پاشاکان ئەو

وێنه كێشانەی وا له جێگایەكیترەوه له حەلەب یان وەكوو له هەراتەوه هاتوون و بیٚجێگا و ڕێگان له چادرەكەی خۆیدا كۆ دەكاتەوه و له دوایشدا به وریاییەوه وێنەكێشخانەیەك بۆ خۆی دروستدەكات ، شێوەكاران له پێشدا وەكوو ئەوەی جاران فێری بوون و بەپێی نەریتی كۆن وێنه دەكێشن ، له دوایشدا وەكوو چەند منداڵێك كەوا به هەڵسوكەوت و ئاژاوه كردن و فێڵ كردن لەگەڵ یەكدا فێری یەك دەبن و بەیەك ڕادێن، له ئەنجامی ئەو ساڵانەی وا شەڕ و ئاژاوه و بەخیلێبردنەوەی تێدا بووه و كاری ڕەنگ و نەخش كراوه ، شێوازێكی تازه دەردەكەوێته مەیدانەوه ئەو وێنەكێشخانه هونەرمەندی هەره باش و دەستی لێهاتوو دیار دەكات و ئەوەش دەبیٚ به ئوسلوبی ( شێوازی ) ئەویٚ . با پێی بڵێن وێنەكێشی خۆششانس . ئەوەش كه هەتا دوایی تەمەنیان بۆ وێنەكێشانیتر دەمێنیتەوه لاساییكردنەوه و تەواو كردن بگره بریقەدار كردنی شێوازەكەی ئەوه ." به تەواوەتی تەماشای چاومی نەكرد ، به نەرمایيەكی چاوەڕواننەكراوەوه داوای دروستبوون و باشەی لێكردم ، وەكوو كچه عازەڵەیەك دەلەرزی و گوتی : " من شێوازێكم هەیه ؟ " بۆ ساتێك وامدەزانی كه فرمێسك له چاوەكانم دەردەپەڕیٚ ، به هەموو هێزێكمەوه دەمویست بەبەزەیی و باش بم و به ویستی خۆمەوه گوتم : " له ماوەی شەست ساڵ تەمەنی كەمو كوڕیدا و له ناو ئەوانەی وا من بینیومه ، وێنەكێشێكی دەرئاسایی و هونەردار و چاو باریك و سێحراوی له تۆ باشترم نەبینیوه ، له نێو وێنەی هەزار وێنەكێشدا دەستبەجیٚ ئەوانەی دەناسمەوه . "

: " منیش وەها بیرم دەكردەوه ، بەڵام تۆ بەو ئەندازەیه ژیر نیت كەوا له نهێنی هونەرەكەی من تێبگەی . ئێستا لەبەر ئەوەی له من دەترسی وەها

دەڵێی و درۆ دەکەی ، بەڵام سەرەڕای ئەوەش باسی شێوازەکەی من بکە . "

" ئەڵێی قەڵەمەکەت و خەتەکانت بە دەستی تۆوە ناجووڵێنەوە و خۆیان خۆیان دەدۆزنەوە. لە وێنەی کۆبوونەوەیەکی جەماوەریدا کە تۆ کێشابێتت ، تەماشاکردنی مرۆڤەکان ، کەڵە کردنی وێنەکان لە نێو لاپەڕەکەدا و بەدوادا چوونەوەی مانای بابەتەکە لە وێنەکەدا دەبیٚ بە چپەیەکی ئارام و کەم دەنگ کە کۆتایی بۆ نیە . من بۆ ئەوەی جارێکیتر گویٚم لەو چپەیە بێت دووبارە تەماشای وێنەکانی تۆ دەکەمەوە . لەهەر گەڕانەوەیەکمدا بە پێکەنینەوە تێدەگەم کەوا واتاکانیان گۆڕدراوە ، نازانم چۆن بڵێم ! وێنەکە وەکوو نووسراوەیەك دووبارە دەخوێنمەوە ، بەمجۆرەش کە قاپی واتاکان یەك لە دوای یەك ڕیز دەکرێن شتێکی لێدەردەکەویٚ کەوا دیدگای وەستا ڕۆژ ئاواییەکانیش لەدواوەوە دەهێڵێتەوە . "

– : " هم ، م ،م ، تۆ واز لە وەستا ڕۆژ ئاواییەکان بهێنە ، هەمدیسان باسی خۆم بکە . "

– : " وێنەکانت ئەوەندە جوان و دەرئاسایین کە کاتیٚ مرۆڤ سەیریان دەکات وادەزانیٚ وێنەکانی تۆ لە عالەم ڕەسەنترن . بەم شێوەیەش چۆن توانای ئەوەت هەیە کە بە وێنەکەت مرۆڤی تەواو لە ئیمان دەربخەی هەر بەو جۆرەش توانای ئەوەت هەیە کەوا کابرای بیٚئیمان بکەی بە خاوەنی ئیمان و بیهێنیتە سەر ڕێگای خودا . "

– : " ڕاستە ، بەڵام نازانم ئەمە پەسەندانە یان نا ، دیسان بیڵێرەوە . "

– : " هیچ وێنە کێشێك بە قەدەر تۆ لە خەستی و نهێنییەکانی ڕەنگ تێناگات ، تەنیا تۆ دەتوانی ڕەنگی هەرە بریقەدار و زیندوو و دەرئاسایی دروستبکەی . "

" باشه ، ئیتر! "

" تۆ دەزانی لەدوای بەهزاد و میر سەید عەلییەوە باشترین وێنە کێش تۆی ؟ "

" ڕاستە من دەزانم ، بەڵام ئەگەر تۆ دەزانی بۆچی کتێبەکەت بەدەستی من تەواو ناکەی و لەگەڵ ئەو ڕەشە ئەفەندییەدا تەواوی دەکەی کە گێل وگەوجێکی خودایە ؟ "

" یەکەم : لەبەر ئەوەیە کە ئەو کارەی وا ئەو دەیکات پێویستی بە هونەری وێنە کێشان نیە ، دووهەمینیشی لەبەر ئەوەیە کە ئەو وەکوو تۆ پیاو کوژ نیە " پێکەنینێکی شیرینی کرد، لەبەر ئەوەی ئەو پێکەنینە لەمێشکمدا هەستێکی فراوانبوونەوەی ورووژاند بوو ، منیش پیکەنی بووم . هەستم بەوە کردبوو کە بەم شێوازە لەوکێشەیە ڕزگاردەبم ، بەم شێوەیە بە باس کردنی بابەتەکە لەلای منەوە ، زیاتر لە باوك و کورێك وەکوو دوو وێنەکێشی دونیا دیدەی خاوەن مەراق لەسەر جامۆلکە مەغوولییەکەی دەستی پێکەوە قسەمان کرد. لە سەر قورسایی برۆنزەکە، هاوسەنگی جامۆڵکەکە ، قووڵاییەکەی ، درێژایی قامیشی وەستا کۆنەکان و نهێنی ئەو مورەکەبە سوورەی وا لە کاتی هەژاندنی جامولکەکەدا دەجوڵایەوە ولەسەر ئەوەش قسەمان کرد کە ئەگەر مەغوولەکان و چینییەکان ئەم ڕەنگە سوورەیان نەدۆزیبایەتەوە و نەیانهێنابایەتە ئێرە ، ئێمە لە ئەستەنبووڵ نەماندەتوانی لە قووڵایی واتاکەی تێبگەین ؟ هەر چی ئێمە قسەمان دەکرد وەکوو ئەوە وا بوو کە زەمانیش وەکوو ڕەنگ خەستێتی خۆی لە دەست دەدا و بە پەلەپەل تێپەڕ دەبوو . بە گۆشەیەکی عەقڵەوە بیرم لەوە کردەوە و عەقڵم لەوە تێك دەچوو کە بۆ چی کەس لەماڵ نیە ، دەمویست

**جامۆڵکەکەی دەستی دانێتە سەر زەوی ، بە ئارامی جاران و کاتی کار کردنییەوە پرسیاری کرد و گوتی : " کاتیٚ کتێبەکەت تەواو بوو ، خەڵك دەزانن هونەری وێنەکانی من لە چیدایە ؟ "**

**– : " بەسەلامەتی ئەگەر ڕۆژێك کتێبەکە تەواو بوو ، پادشا دەیگرێتە دەستی خۆیەوە و سەیرێکی دەکات ، دیارە لە پێشدا سەیری ئەوە دەکات کە بزانیٚ ڕووپەلە زێرینەکانی بەکار هاتوون یان نا ، لە دواییدا وەکوو ڕوخساری نامەیەك تەماشای دەکات و لاچاوێك دەخشێنیٚ بە وێنەکەی خۆیدا و دەیەویٚبزانیٚ جوان دەرکەوتووە یان نا ، خۆ ئەگەر لە دوای ئەوەش ئەگەر تەماشای وێنەکان بکات کە ڕەنجی زۆری بۆ کێشراوە و بە ئیلهام وەرگرتن لە ڕۆژ هەڵات و ڕۆژ ئاوا دروستکراوە شتێکی باشە ! تۆش باش دەزانی کە ئەگەر شتێکی دەرئاسایی ڕوو نەدات ، پرسیاری ئەوە ناکات کە کیٚ ئەم چوار چێوەیە دروست کردووە یان وەکوو کیٚ ڕازاندوویەتییەوە یا خود چ کەسێك منی لەو ساتەدا کێشاوە یا خود کیٚ ئەو ئەسپەی دروستکردووە ؟ لە دوایشدا کتێبەکە دەخاتە نێو خەزێنەکەیەوە. بەڵام دیسان ئێمەش وەکوو خاوەن هونەرەکانیتر هەر چاوەڕێیی ڕوودانی ئەو شتە دەر ئاساییە دەکەین. " تۆزێك بێدەنگ بووین ،دەتگوت کە هەردووکمان لەبەر شتێك سەبر دەکەین . پرسیاری کرد و گوتی : " کەی ئەو شتە دەرئاساییە ڕوو دەدات ؟ چ کاتێك ڕاستینەی ئەو وێنانە بۆ عالەم دەردەکەویٚ کەوا تا سنووری کوێرایی داهاتنمان کارمان لەسەر کردووە ؟ "**

**–:" هیچ کات . "**

**– : " چۆن ؟ "**

- : " هیچ كاتێك داواكاریەكانت بە جێناهێنن و لە داهاتووشدا كەمتر لێت تێدەگەن ."

سەرەڕای ئەوەی بێ‌متمانە بووبوو ، بە شانازییەكەوە گوتی : " كتێبەكان بە سەدان ساڵ دەمێننەوە . "

- : " بڕوات هەبێ وێنەی هیچ یەك لەوەستا وەنیزییەكان بە ئەندازەی ئەوەی تۆ شێعر وبڕوا و شەرەفی تێدا نیە و سافی و ڕۆشناییەكەشیان بە قەدەر ئەوەی تۆ نابێ ، بەڵام وێنەكانی ئەوان متمانەی زۆرترە و زیاتر لە خودی ژیان دەچن، ئەوان گوێ نادەنە ئەو شتەی كەوا پێی دەڵێن ڕێنموونی ولە ژوورەوە وەكوو ئەوەی لەسەر بەرزایی مزگەوتەكە تەماشا بكەن وەها ناكەن و بە پێچەوانەوە لە ناو خودی كۆڵانەكەوە ، هیچ نەبێ لە ناو ژووری شازادەكەوە جێگاخەوەكەی و میز و ئاوێنەكەو پڵنگەكە و كچ و پارەكانی دەكێشن ، هەموو شتێك دەكێشن . خۆت باش دەزانی من بە هەموو كردەوەیەكیان فریو ناخۆم . بەڵكوو لاسایی كردنەوەی دونیا لەلای منەوە وەكوو ئەوە وایە كە سووكایەتی كرابێ و زۆرم پێدەچێ . بەڵام لە ڕاستیدا ئەو وێنە تازانەیان ئەو هێزە ڕاكێشەرەی تێدایە . چاوت چی ببینێ وەكوو ئەوەی بینیبێتتان ئاوەها دەیكێشنەوە ، ئەوان ئەوەی دەیبینن دەیكێشنەوە ، ئێمەش ئەوە دەكێشین كەوا تەماشامان كردووە . كاتێ چاوت بە دەستكردەكانیان دەكەوێ ، تێدەگەی كەوا ڕێگای مانەوەی ڕوومەتت تاوەكوو قیامەت كێشانەوەی شێوەی ڕوخسارتە بە نەریتی ڕۆژ ئاواییەكان . هێزی ڕاكێشەری ئەمە ئەوەندە زیادە كە نەتەنیا وەنیزیەكان بەڵكوو بەرگدرووەكان و قەساب و سەرباز و پاپا و دوكاندار و.. كانی وڵاتانیتری ڕۆژئاواش وێنەی خۆیان بەو شێوەیە كێشاوە . چونكە كاتێ تۆش چاوت

بە وێنەی خۆت دەکەویٚ ، پێت خۆش دەبێت لەهەموو کەسێك جیاوازتر و تایبەتی‌تر و سەیرتر بیٚ و دەتەویٚ  بڕواشی پێبکەی . لە نەریتی تازەدا کێشانی وێنە لەوە زیاتر کە پێی دیتنی عەقڵ بێت بە پێی دیتنی چاوە و ئەو هەلەشت بۆ دەرەخسێنیٚ . لە داهاتوودا هەموو کەس وەکوو ئەوان وێنە دەکێشت . کاتیٚ باسی وێنەت کرد هەموو کەس لە دەستکردەکانی ئەوانەوە تێدەگات کە چی بە چیە ! لێرەشدا ئەگەر بە گدروویەکی بێچارەکە دەیەویٚ وێنەکەی بکێشرێتەوە ، لەبەر ئەوەیە کەوا دەیەویٚ بڕوا بکات بیٚعەیب و بیٚهاوتایە و کەسایەتییەکی تایبەتی هەیە، نەوەکوو لەبەر ئەوەیە کەوا لەنەخش و نیگار تێدەگات . "

پیاو کوژە گاڵتەچییەکە گوتی : " ئاە ! ئێمەش لەمە و بەدوا ئەو وێنانە دروست دەکەین . "

– : " دروستی ناکەین ! لەو زەریف ئەفەندییەی وا کوشتووتە فێری ئەوە نەبووی کە چەندە لەو وێنانە دەترسن؟ ئەگەر نەترسن و تەجرووبەی بکەن دیار دەبیٚ کە هەردووی یەك شتن . لە دواییدا نەریتەکانی ئێمە دەمرن و ڕەنگە کانیشمان کاڵ دەبنەوە و کەسێك سەرەنج ناداتە سەر وێنەو کتێبەکانمان . ئەوانەش کە سەرەنج دەدەنە سەریان لێیان تێناگەن و لێویان شۆڕدەکەنەوە و دەڵێن بۆچی تێڕوانینێکی یەك لایی تێدا نیە ، لەوانەیە هەر کتێبەکانیش نەدۆزنەوە .چونکە لەبەر کەمتەر خەمی و نەهامەتی وێنەکانمان لەنێو زەماندا وردە وردە دەخورێن و لە ناو دەچن . لەبەر ئەوەی کەوا بەرگەکانیان لە زەمەقی عەرەب و ماسی و ئێسقانەوە دروستدەکریٚ و لاپەڕەکانیشیان لە هێلکە و نیشاستە دروستدەکریٚ ، مشکی چاوکراوە و بەڕێزیش دەیانگەلمێنێتەوە و دەیانخوات . مێروولەی سپی و کرم و

هەزاران حەشەرەیتریش كتێبەكانمان دەخۆن و لەم میوانیەدا بەشدار دەبن، بەرگەكان پارچە پارچە دەبن ولاپەڕكان دەدڕێن . دزەكان وخزمەتكارە بیٚدیقەتەكان و منالٚ و ئەو ژنانەی وا ئاگردانەكە دادەگیرسێنن وێنەكان بەبیٚمێشكیەوە دەدڕێنن . منالٚی شازادەكان بە قەلٚەمی یارییەكەیانەوە وێنەكان تێكدەدەن ، چاوی مرۆڤەكان دەردێنن ، چڵمەكانی لووتیان بە لاپەڕەكاندا دەسڕنەوە ،كەنارەكانیشی بە قەلٚەمی ڕەش ڕەش دەكەنەوە. ئەوانەش كە هەروا باسی تاوان دەكەن وێنەكانمان ڕەش دەكەنەوە و دەیاندڕێنن، یان وەكوو بۆ كتێبێكیتر بەكاریان دێنن . دایكەكانیشیان دەلٚێن ئەمە بێڕەوشتییە و وێنەكان دەدڕێنن . پیاوەكانیش و كاكەكانیش كە تەماشای وێنەی ژنەكان دەكەن دەست بە یاری كردن بە شتەكانیان دەكەن و كاتیٚ ئاویان دێتەوە دەیڕێژنە سەر وێنەكان . لەمانەش زیاتر لاپەڕەكان لەبەر خراپی زەمق و هەبوونی نەم و تەڕایی و قوڕو تف و دەیان جۆرە خراپەیتر و كۆ بوونەوەی خواردەمەنی دەچەسپێنە سەر یەك . لەو جێگایەی وا پێكەوە لكاون كەڕوو ، لەكە وەكوو دۆمەلٚ گولٚ دەدەنەوە و لەدوایشدا لەو مالٚانەی وا تكە دەكەن . هەرەسی ئاو و گرداوی قوڕ كتێبەكان لەناو دەبەن . لەدوای ئەم ئاوو حەشەرە و كەمتەر خەمییانە كەوا كتێبەكان لە ناو دەبەن و پەڕ و پوتیان كردوون و لە دوای ئەوەی كە كتێبەكان وەكوو هەویریان لێدیٚ و ناخوێندرێنەوە و كون كون دەبن ، هەر یەك كتێب بە سلامەتی دەمێنێتەوە. بەلٚام ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەویش كە تۆ وەكوو موعجیزە دەیزانی دەبیٚ بە قوربانی بلێسەی ئاگرێك و لە ناو دەچیٚ . لە ئەستەنبوولٚدا گەڕەك هەیە كە بیست سالٚ جارێك نەسووتیٚ تاوەكوو كتێب بمێنێتەوە ؟ لە شارێكی وەكوو بەغدادا لە دوای هاتنی مەغوولەكان لە

هەموو شتێك زیاتر لەوێ كتێب لە ناو چوو بوون . كێ دەتوانێ ئیدەعا بكات كە كتێبەكەی زیاتر لە سەد ساڵ دەمێنێتەوە و وەكوو بەهزاد یادی لێدەكرێتەوە ؟ نەتەنیا دەستكردەكانی ئێمە بەڵكوو ئەوانەش كە بە سەدان ساڵە دروستكراون بە ئاگر و بە كرم و بە كەمتەرخەمییەوە لە ناو دەچن . بەم شێوەیە وێنەی شیرین كەوا لە پەنجەرەوە تەماشای خەسرەو دەكات و وێنەی خەسرەو لە كاتێدا تەماشای شیرین دەكات كە لەبەر مانگە شەودا مەلە دەكات و دزینەوەی نیگای عاشقان لەیەك كەوا بە ناسكییەوە ئەنجامیدەدەن و وێنەی ڕوستەم كەوا دێوە سپییەكە لە بنی چاڵە ئاوەكەدا دەخنكێنێ و حاڵە خەمبارەكەی مەجنون كەوا عەقڵی لەسەر نەماوە و لە بیاباندا لەگەڵ پڵنگ و ئاسكی كێویدا هاوڕێیەتی دەكات و وێنەی ئەو گورگەی كەوا هەموو شەوێك بزنێك لەگەلەكە دادەبڕێ و دەیبا بۆ هاوسەرەكەی كەوا هەمووشەوێك پێكەوە جووت دەبن ، لە دوایشدا ئەو گورگە بە دەستی سەگە خاینەكەی شوانەوە دەستگیر دەكرێ و هەڵدەواسرێ . تەنانەت ڕازاندنەوەی ئەو كەنارانەی وا بەگوڵ و فریشتە و لقی بەپەل و پەلەوەرو فرمێسكەوە دروستكراون، هەمووی لە ناو دەچن . هەروەها هەمووی ئەو عودچییانەی كەوا بۆ ڕازاندنەوەی شیعرەكانی حافیز كێشراون و نەخشی ئەو دیوارانەی وا چاوی دەیان شاگردیان كز كردووە و هی هەزاران وەستاشی كوێر كردووە و وێنەی سەردەرگاكان ، لەوحەی سەر دیوارەكان و ئەو ماڵانەی كەوا لە ناو چوار چێوەكاندا شاردراونەتەوە و ئیمزای شاراوە و ئەو پێخەفە گوڵ گوڵیانەی وا عاشقان دادە پۆشێ ، هەروەها وێنەی ئەو گاورە سەر بڕوانەش كەوا بەسەر بڕاوییەوە چاوەڕێی داگیر بوونی قەڵاكە لەلایەن پادشاكەمانەوە دەكەن و هی باڵوێزی كافرەكان

لەكاتێكدا پێی باپیری پادشاكەمان ماچ دەكات و وێنەی ئەو تۆپ و تفەنگ و چادرانەی كەوا لە پشتەوە دیارن و تۆش لە كاتی لاویدا لە دروستكردنێكیدا بەشدار بووی و شێوەی دروستكراوی شاخدار و بێ‌شاخ و كلكدار و بێ‌كلك و پەپووسولەیمانەی ئاگا و شارەزا و بولبول و شاعیر و چۆلەكە و هەزاران پەلەوەریتر و پشیلەی ئارام و سەگی بێ ئوقرە و هەوری پەلەپەل كەر و وێنەی ئەو گیا شیرینانەی وا لە هەزاران وێنەدا دووبارە كراونەتەوە و ئەو تاشە بەردانەی وا تازە كارێك سێبەری بۆ دروست كردوون و ڕەسمی ئەو كۆشكانەی وا لە ڕووی ئەوانەی زەمانی تەیمورەوە یان هی شا تاماسووبەوە دروستكراون وبەهەزاران خشتەوە لە ڕزاندنەوەی داستانە كۆنەكاندا بەكاریان هیناون هەروەها شێوەی هەزاران شازادەی خەمبار كە لە چۆڵەوانیدا قاڵیەكی سووریان ڕاخستووە و لەلای ژنە جوانەكاندا دانیشتوون و گوێ لە مۆسیقاژەنەكان دەگرن و ، قاپی چینی و ئەو قاڵییانەی كە تەواوبونیان قەرزاری فرمێسكی چاوی شاگردەكان و ئەو لێدانانەیە كەوا خواردویانە و ... بەمشێوەیە لەناو دەچن . "

جامۆڵكەكەی بەهەموو هێزێكەوە لەسەرمدا . لەپێشدا لەبەر هێزی جامۆڵكەكە بەڕاستی قیڕاندبووم ،ئەوەندە قوورسبوو كە ئازارێكی مەترسیدار و بێتاریفم چێشت ، بۆ ساتێك وامزانی كە هەموو عالەم تووشی ئازارەكەی من بووە و زەردبووەتەوە ، لایەكی زۆری ئەقڵم لەبەر ئەو زەربەیە كاری نەدەكرد ، بەشێكی تریشی بیری لەوە دەكردەوە كە بەنیەتێكی خەماوییەوە بەسەر شێتەكەی بكوژم بڵێم هەڵە دەكەی و بەناهەقی دەمكوژی . جارێكیتر جامۆڵكە بڕۆنزییەكەی دا لەتەوقەسەرم، ئەمجارەیان بەهەڵە نەبوو بەڵكوو بە قینەوە سەرشێتانە لێی دەدام ، لێدانەكەی ئەوەندە

قوورسبوو کە ئەولا بیٚ عەقڵەکەی عەقڵیشم زانی کە لەوانەیە کۆتاییەکەی ئەمە مەرگ بێت . ئەوەندە ترسابووم کە وەکوو ئەوەی بلوورێنم بەهەموو هێزێکمەوە قیژاندم .ئەگەر ئەوقیژەیەم بکێشرێت ، ڕەنگەکەی سەوز دەبێت . لە تاریکایی ئەم شەوەدا زانیم کەهیچ کەسێك لەم کۆڵانە چۆڵەدا ئەم ڕەنگە نابینێت و بەتەنیا ماومەتەوە . لەبانگ و هاوارەکانم ترسا و ڕاوەستا. بۆ ساتێك چاومان بەچاوی یەکتری دا هەڵتۆقی، لە ڕەشایی و گلێنەی چاوەکانیدا تێگەیشتم کە لە زووەوە فێری ئەو کارەیە کەوا ئێستا بەترس و شەرمەوە ئەنجامی دەدا . ئەمە ئەو وەستایە نیە کەوا من دەیناسم ، بەڵکوو بێگانەیەکەی خراپەکاری لە دوورەوە هاتووە کەوا زمانەکەی نازانرێت .

تەنیایی ئەوکاتەی منی بۆ سەدانساڵیتر درێژ کردەوە، بۆ ئەوەی کە باوەش بکەم بە دونیادا ویستم دەستی بگرم ، بەڵام سوودێکی نەبوو ، پاڕامەوە یان وامدەزانی کە دەپاڕێمەوە ؟ کوڕم ! کوڕم ! مەمکوژە وەکوو ئەوەی کە لەناو خەوندابێت گوێی لەدەنگی من نەبوو. جارێکیتر جامۆڵکەکەی لەسەرمدا ، عەقڵ و بیرەوەری و یادەوەرییەکان و چاوەکانیشم بوون بە ترسەکەی من و لەگەڵ یەکدا تێکەڵاو بوون . هیچ ڕەنگێگم نەدەبینی و وامدەزانی کە تەواوی ڕەنگەکان سوورن . خوێنەکەم ئەو مورەکەبە سوورەبوو کەوا گومانم لێدەکرد ، ئەو مورەکەبە سوورەش کەوا بە دەستییەوەبووخوێنە نەوەستاوەکەی من بوو ! ئەوکاتەش مردنم لەلا زۆر پێبیٚ ئینسافانە و بێبەزەییانە و ناهەقانە بوو ، بەڵام ئێرە کۆتایی ئەو جێگایەبوو کە مێشکە پیرەکەم هێنابوومی . لەدواییدا تێکەیشتم کە بیرەوەرییەکانم وەکوو بەفرەکەی دەرەوە سپی بوو ، سەرم لەناو دەممدا ترپەترپیلێوەدەهات و دەئێشا . ئێستا باسی مەرگی خۆمتان بۆ دەکەم

لەوانەشە کەلەزووەوە لەمە تێگەیشتبێتن " بەڵام مردن کۆتایی هەموو شتێك نییە " لە سەدا سەد وایە بەڵام وەکوو ئەوەی کەوا هەموو کتێبەکان نووسیویانە شتێکی لە ڕادە بەدەر ئازاردەرە. نەتەنیا کاسەی سەرم بەڵکوو وامدەزانی تەواوی گیانم دەچێتە ناو یەکەوە و باوەش دەکەن بە یەکدا و دەسووتێن . سووتان بەم ئازارە بێکۆتاییە ئەوەندە سەختە کە وامدەزانی بەشێك لە عەقڵم دەڵێ تەنیا ڕێگای ڕزگاری لەمە خۆ هاندانە بۆ ناو خەوێکی شیرین . لە کاتێکدا کە تەمەنی منداڵیم بە جێدەهێشت ، هەمیشە گوێم لە داستانێکی سووریانی ڕادەگرت . ئەوە هاتەوە یادم :

" پیرەمێردێکی تەنیا شەو لەخەو هەڵدەستێ و پەرداخێك ئاو دەخواتەوە . پەرداخەکە دادەنێتە سەر ئەو تەپڵەکەی کەوا مۆمی لەسەر نیە ، لە کوێیە ؟ تیشکێك وەکوو بەن لە ناوەوە دەهاتە دەرەوە . بە شوێنیدا دەچێت، دەچێت و دەچێت تاوەکوو دەچێتە ناو ژوورەکەی خۆیەوە و دەبینێ کەوا کەسێکیتر لە جێگاکەیدا خەوتووە و مۆمەکەشی بە دەستەوەیە . دەپرسێ تۆ کێی ؟ بێگانەکەش دەڵێ : مەرگ . پیرەمێردەکە بۆ ساتێك لە ناو بێدەنگییەکی ڕازداردا خۆی دەنێژێت و لە دواییدا دەلێت : کەواتە هاتی ! مەرگیش دەڵێ : بەڵێ . پیرە مێردەکەش دەڵێ: نا ، تۆ خەوە ناتەواوەکەی منی . کابرای نائاشنا فوویەك لە مۆمەکە دەکات و هەموو شتێك لە ناو تاریکیدا نۆقم دەبێت ، پیرە مێردەکە دیسان دەچێتەوە ناو جێگە چۆڵەکەی خۆی و دەخەوێ و بیست ساڵیتر دەژی . "

دەمزانی کە ئەو شتە بەسەر مندا نایەت . چونکە جارێکیتر جامۆڵکەکەی لە سەرم دابوو . ئەوەندە هەستم بە ئازارێکی قورس دەکرد کە بە حاڵ دەمزانی دووبارە جامۆڵکەکەی لە سەرم داوەتەوە . ڕەنگی ئەویش و

جامۆڵکەکەش لەبەر تیشکی مۆمی ناو ژوورەکە کاڵ بوو بوونەوە و ڕۆیشتبوون . هێشتا نەمرد بووم . وامدەزانی هێشتا دەژیم ، دەمەویست هەڵبێم و هەڕا بکەم . دەستەکانم نابووە سەر سەرە خوێناوییەکەمەوە. لە ئەوجموجۆڵانەی وا بۆ پاراستنی ڕوخساری خۆم کرد بووم تەنیا قەپێکم لە بیرە کە لە مەچەکیم گرتبوو و ئەویش جارێکیتر جامۆڵکەکەی دابوو بەسەرمدا و منیش زانیبووم کە هێشتا نەمردووم . ئەگەر وای پێی بڵێین وابزانم تۆزێك چنگماندابوو ، زۆر بە هێز و تووڕە بوو . وەکوو ئەوەی بییەوێت بزمار کوتم بکات لە سەر دەست درێژی کردم . . ئەژنۆکانی نابووە سەر شان وباڵم . بەبیٚ ڕێزییەوە هەندێك شتی بۆ پیرە مێردێکی وەکوو من باس کرد کە بەرە و مەرگ دەچێت . لەوانەیە لەبەر ئەوە بووبیٚ کە لێی تێنەگەیشتووم یا وەکوو گوێم بۆ ڕانەگرتووە یاخود خۆشم لە چاو خوێناوییەکانی نەهاتبیٚ کە وا جارێکیتر جامۆڵکەکەی دا بە سەرمدا. لەبەر پژانی مورەکەبە سوورەکە و خوێنەکەی من دەموچاووجلەکانی هەموو سوور بوو بوون . لە بەر ئەوە خەمم دەخوارد کە دوایین شتێك کەوا لە دونیادا دەیبینم ئەو پیاوە دوژمنەیە و چاوەکانم داخست . تۆزێك دواتر تیشکێکی نەرم و شیرینم بینی . ئەم تیشکە وەکوو خەو شیرین بوو ، وامزانی ئازار و ئێش و برینەکانم سارێژ دەکەمەوە . لە ناوەوە کەسێکم بینی . پرسیارم کرد و گوتم : تۆ کێی ! وتی : " من عیزرائیلم . من کۆتایی بە ڕێبواری ئادەمیزاد لەم دونیادا دێنم ، منداڵ لە دایك ، ژن لە مێرد و خۆشەویستەکان لە یەك و باوك لە کچ جیا دەکەمەوە ، لەم دونیایەدا هیچ گیاندارێك نیە کە ڕوو بە ڕووی من نەبێتەوە . " کاتیٚ زانیم مەرگم هاتووە و ڕێگای دەرچوونم نیە دەستم بە گریان کرد . گریانیش منی لە قووڵاییەوە

بێدەنگ دەکرد . لە لایەکیتریشەوە ئازارێکی هەبوو کە هەر چی دەچوو زیاتر دەبووو پیاوی گێژ دەکرد . ئەمە ئەوجێگا پەلەپەلکەر و بێبەزەییە بوو کەوا دەمو چاوم لە وێدا خوێناوی بوو بوون . بەڵام لە لایەکیتریشەوە جێگایەکی لێبووکە لەوێدا پەلەپەل کردن و ستەمکاری تێدا نەبوو کەچی بۆ من زۆر مەترسیدار بوو . کاتیٚ زانیم ئەو دونیا ڕوشنەی وا عیزرائیل من بۆ ئەویٚ دەبات خودی دونیای مردووەکانە زۆر ترسام . چونکە دەمزانی لە ناو ئەو دونیایەدا لە تاو ئازار و خەمەکانمدا بە خۆمدا دەپێچمەوە ، بەڵام لە لایەکیتریشەوە دەمزانی کە ماوەیەکی زۆر نامێنمەوە و لە دونیای ئازاری مەترسیدار و ئەشکەنجەدا هیچ گۆشەیەکم بۆ نەماوەتەوە . ئەگەر لەم دونیایەدا بمێنمەوە پێویستە ئەم ئازار و دەردانە بکێشم ، ئەمەش شتێك نەبوو کە وەزعە پیرەکەی من تاقەتی ئەوەی هەبیٚ . بەمجۆرەش خۆم بەر لە مردن دەمویست بمرم . بە دوای دۆزینەوەی وەڵامی ئە پرسیارە کەوا دەڵیٚ : چۆن دەبیٚ مرۆڤەکان بەسەر مردندا سەر بکەون ؟ بە دەیان کتێبم خوێندوەتەوە ، کەچی لە دواییدا تێگەیشتم کە وەڵامەکەی هەر ئەم داخوازییە بچکۆلانەیە و بەس ، هەر وەها لەوەش تێگەیشتم کە مردنیش فێری شتێکی کردم . لەگەڵ ئەوەشدا بیٚ بڕیاری کەسێك کەوا بەر لە ڕۆیشتنی یەکجارەکی دەیەویٚ جارێکیتر تەماشایەکی ماڵەکەی و کەلوپەلەکانی خۆی بکات دەروونمی داگرت ، بە پەشۆکاوی و بە بیرکردنەوەوە دەمەویست جارێکیتر کچەکەم ببینم . ئەوەندە دەمەویست بیبینم کە دەمتوانی ددان بە خۆمدا بگرم و لە تاوی تینویەتیدا نەقیڕێنم و چاوەڕوانی ئەو بکەم .

بەم شێوەیەش ئەو تیشکە مەرگ هێنەرە شیرینە تۆزێك کز بووەوە و

دەرگای دڵمی بۆ دەنگەدەنگ و جیرەجیڕی ناو ئەو دونیایە کردەوە کەوا خەریکبوو لێی دەر دەکەوتم . هەستم بەوە کرد کە بکوژەکەم لە ژوورەکەدا دەگەڕێ و دۆڵابەکە دەکاتەوەو لاپەڕەکانم تێکدەداو بە پەشۆکاوییەوە بەدوای دوایین وێنەدا دەگەڕێ، کە نایدۆزێتەوە لە تووڕەییدا تاقمی ڕەنگەکان تێکدەدا و سندوق و قوتوو و جامۆڵکەکان و مێزەکە دەداتە بەر شەق . دەمزانی کە جار جار دەنرکێنم و بە حاڵ و نەحاڵ جووڵە جووڵ بە دەستە وقاچە پیرە ماندووەکانم دەکەم و چاوەڕێ دەمێنمەوە ئازارەکانم ئاهۆن نابنەوە ، هەرچی دەچێ بێدەنگتر دەبن ، ئیتر نەمدەتوانی ددان بە خۆدا بگرم بەڵام ماوەیەکیتریش چاوەڕێ مامەوە .

لەپڕ ئەوە هات بە مێشکمدا کە ئەگەر کچەکەم بێتەوە بۆ ماڵ بکوژە ناپیاوە ڕەزیلەکەم دەبینێ ، بەڵام نەمدەویست بیرشی لێبکەمەوە ، بەڵام هەر لەو کاتەدا هەستم بەوە کرد کە بکوژەکەم لە ژوورەکەوە چووتە دەرەوە . لەوە دەچێ دوایین وێنەی ببینێ . زۆر تینووم بوو بوو ، بەڵام دیسان چاو لەڕێ مامەوە ، دەی کچەکەم! شەکوورە جوانەکەم ! دەی وەرەوە ... نەهات . ئیدی هێزم بەشی ئازارەکانمی نەدەکرد ، زانیم کچەکەم نابینم و دەمرم ، ئەمە ئەوەندە پڕ ئێش بوو کە ویستم تاوێك زووتر بمرم . هەر لەم کاتەدا لەلای چەپمەوە ڕوومەتێکم بینی کە زۆر نائاشنا بوو ، پەرداخێك ئاوی بۆ درێژ کردمەوە ،هەموو شتێکم لە بیر چوو و پەلاماری ئاوەکەمدا . پەرداخەکەی کێشاوە و گوتی : " بڵێ پێغەمەر درۆیە و ڕەتی بکەرەوە . " ئەمە شەیتان بوو ، وەڵامم نەدایەوە تەنانەت لێشی نەترسام . لەبەر ئەوە هیچ کات بڕوام بەوە نەکرد بوو کە وێنەکێشان هەڵخەڵەتاندن بە دەستی شەیتانە ، بە بەخۆ متمانەییەکەوە چاوەڕوان مامەوە و خەیاڵم لە ئایندە و

ڕێگا بێکۆتاییەکەی بەردەمی خۆم کرد . هەر لەو کاتەدا فریشتە تێشکدارەکە نزیك بووەوە و شەیتان ون بوو . لایەکی بیرم دەیگوت ئەم فریشتەیەی وا شەیتانی ڕاونا خودی عیزرائیلە ، بەڵام لایەنە سەر هەڵداوەکەیتری عەقڵیشم ئەوەی بە بیر دەهێنامەوە کە ( کتاب الاحوال القیامە ) دا نووسراوە عیزرائیل پەڕ و باڵی زۆری هەیە و هەموو ڕۆژ هەلات و ڕۆژ ئاوا دەگرێتەوە ، بەباشی عەقڵی تێك و پێك دام. نێزیك بووەوە و وەکوو ئەوەی کە غەزالی لە " دورە الفاخرە " دا باسیدەکات بەنەرمییەوە وەکوو ئەوەی کە بییەوێت هاوکاریم بکات گوتی:"دەمت بکەوە با گیانت دەرچێ " نەمتوانی پێی بڵێم کە لەو قسە و وتە زیاتر هیچیتر لە دەمم دەرناکەوێ . دەمزانی کە کاتم بەسەر هاتووە و ناتوانم لەوە زیاتر بەرگری لێبکەم . جارێکیتر بیرم لەوە کردەوە کە بەم وەزعە ڕەزیلەی خۆم و بەم جەستە خوێنیاوییەوە چەپەڵەمەوە چاوم بە کچەکەم ناکەوێ و ئیدی هیچ نابینمەوە ، زۆر شەرمم لە خۆم کرد . وەکوو چۆن کە بمەوێ کراسێکی تەنگ لەبەرداکەنم و لێی نەجاتم ببێ ، ئاوەهاش دەمەویست لەو دونیایە ڕزگاریم ببێت . دەمم کردەوە ، هەموو شتێك وەکوو وێنەی میعراجی پێغەمەر ئاوا ڕەنگا و ڕەنگ بوو . وەکوو چۆن ئاوی زێر ڕژابێ هەموو جێگایەك ڕۆشن بوو،چاوەکانم فرمێسکی دەردیان هەڵدەڕشت ، لە قووڵایی دڵمەوە بە زۆر هەناسەیەکم هەڵکێشا ناو دەمم و هەموو شتێك لە بێدەنگییەکی دەرئاساییدا مایەوە . ئێستا کە دەمبینی ڕۆحم لە جەستەم جودا دەبێتەوە دەمزانی بە دەستی عیزرائیلەوەیە . ڕۆحم بە قەدەر زەردە واڵەیەك دەبوو . لە ناو ڕووناکیدا بوو ، لەبەر لەرزە لەرزی دوای بە جێهێشتنی جەستەم لە دەستی عیزرائیلدا وەکوو جیوە هەڵدەفڕی . بەڵام

عەقڵم لەوەدا نەبووبەڵکوو لەو دونیا تازەیەدا بوو کەوا ئێستا ڕۆیشتبووم بۆ ئەویٚ . لە دوای ئەو هەموو ئازارە تۆزێك ئاسوودە بوومەوە و ئەو شتەی کە دەبیٚ بە مەرگ هیچ ئازاری پێنەدەگەیاندم . بە پێچەوانەوە زۆر ڕەحەتی کرد بووم . لە دواییدا تێگەیشتم کە ئەم وەزعە پایەدارە و ئەوەی کە لە کاتی ژیاندا هەبوو، تەنگهەڵچن و کاتی بوو. ئیدی هەموو شتێك بە سەدان ساڵ تاوەکوو ڕۆژی حەشر هەر ئاوەها دەمایەوە . هیچ گلەیی و ڕازینەبوونێکیشم بەرامبەر بە ئەمە نەبوو .ئەو ڕووداوانەی کەوا کاتی خۆی بە سەرمدا دەهاتن ئێستا لەو جێگا فراوانەدا بڵاو بوونەتەوە . وەکوو ئەوەی کەوا وێنە کێشە گاڵتەچییەکە ئێستا لەهەر گۆشەیەکی ئەو دوولاپەڕە گەورەیەدا شتانی بیٚجێگا و ڕێگا دەکێشیٚ ، هەموو شتێك ئاوەها وەکوو خۆی تێپەڕ دەبوو .

## (( من ، شەكورە )) (30)

ئەوەندە زۆر دەباری کە لە پەچەکەمەوە دەهاتە ناوودەچووە ناو چاوانمەوە . لەنێو گیاگەنیوەکان وقوڕ و دارە شکاوەکانی باخچەکەوە بەزۆری تێپەڕ بووم . کە ڕۆیشتمە ناو کۆڵانەکەوە سووکتر پێم هەڵگرت . دەزانم کە ئەتانەوێ بزانن بیرم لە چی کردۆتەوە . چەندە متمانە بە ڕەشە دەکەم ؟ دەی با بە ئاشکرایی شتێکتان پێبڵێم : منیش دەمەوێ بزانم کە بیر لەچی دەکەمەوە . تێدەگەن وانیە ؟ عەقڵم تێکەڵ و پێکەڵە ، لەگەڵ ئەوەشدا ئێستا ئەوە دەزانم نان و چێشت و منداڵەکان و باوکم و شتیتردا خەریك دەبم و لە دوایشدا بە بێئەوەی کە من پرسیار بکەم ، دڵم پێم دەڵێت کە چی ڕاستە و چی ڕاست نیە . بەیانی ناگاتە نیوەڕۆ تێدەگەم کە دەبێ لەگەڵ کێدا زەماوەند بکەم . شتێك هەیە کە دەمەوێ بەر لەوەی بچمەوە بەرە و ماڵ باسی بکەم بۆتان . نەگیانەکم ! واز لە شتە گەورەکەی ڕەشە بهێنن کەوا دەریهێنا و نیشانی دام ئەگەر بتانەوێ دوایی لەسەر ئەوە قسە دەکەین .

ئەو شتەی کە دەمەوێ قسەی لەسەر بکەم پەلەپەل کردنی ڕەشەیە ، خۆ بیر لەوەش دەکەمەوە کە چاوی زیاتر لە شەهوەت هیچیتر نابینێ ، بە

ڕاشکاوی دەڵێم ئەگەر واش بێ دیسان فەرق ناکات ئەوەی کەوا بە هەڵەمدا دەبات بێعەقڵییەکەیەتی ! من دەترسێنێ و دەیەوێ بمفڕێنێ ، دەیەوێ یاری بە شەرەفم بکات و هێمنیشم بکاتەوە ! تەنانەت ئەوە نایەت بەعەقڵیشیدا کە ئەمە ڕێگا بۆ شتی خراپتریش دەکاتەوە . لە ڕوخسارە خەم داگرتووەکەیەوە تێگەیشتم کەوا چەندە منی خۆشدەوێ وچەندە منی دەوێ . بۆچی لەدوای دوانزە ساڵ چاولە ڕێی دەیەوێ لە ڕێگەی کورتەوە بێت و دوانزە ڕۆژیتر سەبر ناکات ؟ ئێوە دەزانن کە عاشقی ئەو لێنەهاتووی و ئەو منداڵیەی بوو بووم . ئەمەم لەو کاتەی وا پێویست بوو خۆمی لێ تووڕە بکەم بە بەزەییەکەوە هەست پێکرد بوو . دەنگێك لە دەروونمەوە دەیگوت : ئەی مناڵە بێچارەکەم ! هەم دەتوانی ئەوەندە ئازار بکێشی هەم ئەوەندەش لێنەهاتووی . لە دڵمەوە دەمویست بیپارێزم. لەوانەیە شتێکی هەڵە بکات، دەتوانم خۆم بەو چوختەیە بدەم .

بیرم لە منداڵە بێچارەکانم کردەوە و سووکتر پێم هەڵگرت . هەر لەم کاتەدا لە ناو بەفرەکەدا کە چاو چاوی نەدەبینی لەژێر تاریکاییەکەدا کە زوو داکەوتبوو پیاوێکم بینی کە وامزانی وەکوو تارمایی خەریکە دەکەوێ بەسەرمدا . کەچی خۆمم فلیسکانەوە ودەر چووم ، کە لە دەرگای حەوشەکەوە چوومە ناو تێگەیشتم خەیرییە و مناڵەکان نەگەڕاونەتەوە ، باشە ! هێشتا بانگی ئێوارەیان نەدا بوو . لە پلیکانەکانەوە چوومە ژوورەوەماڵەکە بۆنی پرتەقاڵی لێوە دەهات . باوکم لە ژوورە تاریکەکەدایە . زۆر ساردە ، پێکانم بەستوویانە . کاتێ بە چراکەوە چوومە ناوەوە بینیم کەوا دۆڵابەکە کراوەتەوە و سەرینەکان کەوتوون و هەر لایەك پەرش و بڵاو بووە ، وتم ئەمە کاری شەوکەت و ئورهانە . بێدەنگییەکەی ناو ماڵ وەکوو هی

جاران نەبوو . جلەکانیماڵەوەم کردە بەر و بۆ ساتێك لەگەڵ خەیاڵەکانمدا ڕۆیشتم . لەم کاتانەدا لە ناو ژووری وێنە کێشانەوە لە تەنیشت موتبەخەکەدا جیڕەجیڕێك هات . باوکم بەو سەرمایە چوو بووە خوارەوە ؟ بەڵام لەبیرم نایەت کە چاوم بە ڕۆشنایی چرایەك کەوتبیٚ لەوێدا . خەریك بوو بیرم لەوە دەکردەوە کە جیڕەی دەرگای حەوشەکەم بیست . لە دوای داخرانی دەرگاکە کاتیٚ سەگەکان دەستیان بە وەڕاندن کرد سەغڵەت و بە گومان بووم . بانگم کرد و گوتم : " خەیرییە ! ئورهان! شەوکەت ! " سەرمام بوو . مەنقەڵەکەی لای باوکم گەش بوو ، وتم دەچم دادەنیشم و خۆم گەرم دەکەمەوە ، ئیدی بیرم لە ڕەشە نەدەکردەوە بەڵکوو بیرم لای منداڵەکانم بوو ، چراکەشم بە دەستەوە بوو . کە لە هەیوانەکەوە تێپەڕ بووم وتم با ئاو دانێمە سەر مەنقەڵەکەی خوارەوە بۆ ئەوەی کە بۆ شۆرباکە گەرم ببیٚ . ڕۆیشتمە ناو ماڵە بەشێن ڕاخراوەکە هەموو شتێك تێك چوو بوو . خەریك بوو بە سەر سووڕ ماوییەوە بڵێم  کە باوکم کردوویەتی بەڵام کاتیٚ باوکم لەسەر زەوییەکەدا بینی لە ترساندا قیژاندم ، جارێکیتر قیژاندم . لە دواییدا تەماشای لاشە مردووەکەی باوکمم کرد و بێدەنگ بووم . سەیرکەن ! لە بێدەنگی و خوێنساردییەکەتانەوە دەمزانی کە ئێوە زووتر زانیوتانە کەچی ڕوویداوە . ئەگەر هەموو شتێکیش نەبێت ئەوا زۆر شت دەزانن . ئێستاش مەراق دەکەن کە بزانن کاردانەوە و هەستی من چی بوو . هەندێك جار کە تەماشای وێنەیەك دەکەن بیرلە هاتنی داستانەکە تا ئەو جێگایە دەکەونەوە کە قارەمانەکە ئازار دەکێشیٚ، تەماشای کردەوەکانی من بکەن ئەگەر لە جێی مندا بایەن و باوکی ئێوە بکوژرایە هەستتان بە چیدەکرد؟ بە حەزەوە دەتانەویٚ لەمە تێبگەن نەوەك لە ئازارەکانی من.

باشه . ئێواره گەڕامەوە بۆ ماڵ ، یەکێك باوکمی کوشتبوو . بەڵێ، سەر و قژی خۆمم داڕنی و هۆن هۆن گریام ، وەکوو کاتی منداڵی باوەشم پێدا کرد و بە هەموو توانایەکەمەوە بۆنم کرد . بەڵێ ، لە ترساندا ولەبەر تەنیایی و ئازار ماوەیەکی زۆر گیانم دەلەرزی و هەناسەم هەڵنەدەکێشا . بەڵێ ، بڕوام بەو شتانە نەکرد کەوا بینیم و لە خودا پاڕامەوە که دیسان باوکم هەڵسێتەوە سەرپێ و بێدەنگ بێدەنگ لە گۆشەکەی خۆیدا دانیشێتەوە . هەستە باوکە ! هەستە مەمرە! دەی باوکە ! هەستە باوکە ! بەلاّم لە ناو خوێندا سەری پارچە پارچە کرا بوو ئەو پیاوەی کە باوکمیکوشتبوو لەقین و تووڕەییدا کتێب و کاغەزەکانی دڕاند بوو ، جامولکە و تەپڵەك و تاقمی ڕەنگەکانی شکاند بوو و فڕێی دابوون و میندەرێك و مێز و تەختەی نوێنەکانی پارچە پارچە کردبوو ، بە شێوەیەکی دڕندانە هەموو شتێکی شکاندبوو و تێکی دابوو . زۆر ترسام . ئیدی نەدەگریام لە کۆلاّنەکەی تەنیشتمانەوە دوو کەس بە پێکەنین و قسە کردنەوە دەهاتن، لە عەقڵی خۆمدا گوێم لە بێدەنگی تەواوی عالەم ڕادەگرت . فرمێسکی چاوەکانم و چڵمی لوتم بە دەست سڕی ، زۆر بیرم لە منداڵەکان و ژیانی خۆمان دەکردەوە ، دووبارە گوێم بۆ بێدەنگیەکە ڕاگرت و هەڕام کرد . قاچەکانی باوکمم گرت و بە ڕاکێشان بردمە ناو هەیوانەکەوە. نازانم لە بەر چی بوو کە لەوێدا زۆر قوورستر بوو . گوێم نەدایە و بردمە خوارەوە . لە نیوەی پلیکانەدا هێزم نەما ، دانیشتم . لەوانەیە بگریابایەم لە جیرە جیرێکدا وامزانی خەیرییە و منداڵەکان هاتوونەتەوە بۆیە قاچی باوکمم خستە بێخی باڵم بە پەلەپەل بردمە خوارەوە ، سەری باوکم ئەوەندە پارچە پارچە کرابوو کە لە کاتی کێشانە خواردا سەری وەکوو چۆن پارچەیەکی تەڕ لە کاتی

كێشاندا دەنگ دەرخات ئەوەها دەنگی لێوە دەهات . لە سەر بەردەكانەوە ڕامكێشا و بردمە ژووری وێنەكێشان لە هاویناندا . بۆ ئەوەی چاوم بە ناوە بكەوێ بەرەو لای ئاگردانی موتبەخەكە هەڕام كرد ، كاتێ گەڕامەوە و تەماشای چۆنیەتی تێكدرانی ئەوژوورەم كرد كەوا باوكمم تێ خستبوو زمانم بەسترا . كێ ئەمەی ... یارەبی! ... كامیان ... ؟ عەقلْم بە توندی كاری دەكرد ، زۆر شتم حیساب دەكرد . دەرگاكەم داخست و باوكمم لەوێ بە جێهێشت . سەتڵێكم لە چێشتخانەكە هەڵگرت و لە چاڵە ئاوەكە پڕم كرد و ڕۆیشتمە ژوورەكە و لە بەر ڕۆشنایی چراكەدا خۆینی سەر پلیكانەكە و هەیوانەكەم سڕی و بە پەلەپەل ڕۆیشتمە ژوورەكەمەوە و جلە خۆێنەویەكانم دەرهێنا وهیپاكترم كردە بەر . دەمەویست بە سەتڵەكەی دەستمەوە بچمە ناو ژوورەكەی باوكم كە گۆیم لە كرانەوەی دەرگای حەوشەكە بوو . هەر لەو كاتەشدا بانگی ئێوارەیان دەدا ، خۆمم كۆ كردەوە و بە چراكەی دەستمەوە لەسەر پلیكانەكانەوە چاوەڕێیانم كرد . ئۆرهان گوتی : "دایە ئێمە هاتینەوە" بە هەمووهێزێكمەوە قیڕاندم و وتم : "خەیرییە! لە كوێ مانەوە؟!" لە دوایدا وەكوو ئەوەی ناقیڕێنم و بە چپەوە ئەمەم پێگوتوە هەڵسوكەوتم كرد . شەوكەت وتی : " بەڵام دایە خۆبەرلە بانگی ئێوارە هاتینەوە ."

"بێدەنگ بن ! باپیرتان نەخۆشە و خەوتووە . " خەیرییە لە خوارەوە وتی : " نەخۆشە ؟ ! " بەڵام لە بێدەنگیەكەی منەوە هەستی بە تووڕە بوونم كرد و گوتی چاوەڕێ ماوین هەتا كەشتیەكە هاتەوە .

دەمەویست بچمە خوارە و خۆمی بەسەردا ناڕەحەت بكەم و لۆمەی بكەم ، بەڵام لە بەر ئەوەی كە وا ئەگەر بڕۆشتبایەم شەوقی چراكە خۆینی سەر

پلیکانەکەی دەخستە ڕوو ( زۆر بە باشی خاوێن نەکرابووەوە).

منداڵەکان هاتنە سەرەوە و بە هێواشی پێڵاوەکانیان داکەند .

وتم : " شش ش ، باپیرتان دەخەوێ بۆ ئەولا نەچن . " و بەرەو ژوورەکەی خۆمان پاڵم پێوە نان .

شەوکەت وتی : " دەچمە ژوورە بەشێن ڕاخراوەکە " بە چپەوە وتم : " باپیرتان لەوێ خەوتوە " بەڵام بینیم کە هەر لەوێدا ماونەتەوە لە دوایدا وتم : " مەچن با وەکوو جندۆکەکان دەستان لێنەوەشێنن ، چونەتە ناو جەستەی باپیرتانەوە . " دەستی هەردووکیانم گرت و بەرو ژووری نووستنم بردن .

وتم : " بڵێن بزانم تا ئێستا چیتان کردووە لە دەرەوە ؟ "

شەوکەت گوتی : " لە تەچنی عەرەبمان بینی "

وتم : " لەکوێ ؟ ئالایان هەبوو ؟ "

گوتی : " لە پاڵەکەدا ، لیمۆێکیان دابە خەیرییە و ئەویش پارەی پێدان ، سەریان بەفری پێوە بوو . "

" ئیتر ؟ "

" لە مەیدانەکەدا تیریان دەهاویشت . "

"بەم بەفرە ؟ " وەڵامی نەدامەوە گوتی : " دایە ! سەرمامە دەچم بۆ ژوورە بەشێن ڕاخراوەکە . "

وتم : " لەم ژوورە دەر نەچن ئەگینا دەمرن . من ئیستا مەنقەڵەکەتان بۆ دەهێنم."

شەوکەت وتی : " بۆچی دەمرین ؟ "

: " با باسی شتێکتان بۆ بکەم . بەڵام بۆ کەسی نەگێڕنەوە ، تێگەیشتن ؟

" قەولیان دا کە باسی نەکەن .

" کاتیێ ئێوە لە کۆڵانەکەدا بوون ، کابرایەکی مردوو و سپی پۆشی وەکوو بەفر هاتە ئێرە ، لە وڵاتێکی دوورەوە هاتبوو ، لەگەڵ باپیرتاندا قسەی کرد ، تومەزە ئەوە جندۆکە بوو " وتیان لە کۆی هاتبوو ؟

: " لەلای ئاوەکەوە "

شەوکەت وتی : " لەو جێگایەی کەوا باوکمی لێیە ؟ "

– " بەڵێ لەوێ ، جندۆکەکە بۆ تەماشا کردنی وێنەکانی کتێبەکەی باپیرتان هاتبوو ، ئەو تاوانبارەی کە تەماشای ئەو وێنانە بکات یەکسەر دەمرێ . " بێدەنگیەك دروست بوو . وتم : " سەیر کەن من دەچمە خوارەوە بۆ لای خەیرییە ، سینی نانەکەتان بۆ دەهێنم ، کەسێك نەیەتە دەرەوە چونکە جندۆکەکە هێشتا لە نێو ئەمماڵەدایە . " ئۆرهان وتی دایە مەڕۆ . گەڕامەوە لای شەوکەت و وتم : " تۆ بەرپرسیاری براکەتی ، ئەگەر لە ماڵ دەرچی و جندۆکەکەش دەستت لێنەوەشێنێ ئەوا خۆم دەتکوژم . " بەبێ ئەوەی شەپە زلەیان لێدەم چاوم لێ زیت کردنەوە و گوتم : " دەی ئێستا دۆعا بکەن با وەکوو باپیرتان نەمرێ ، ئەگەر کوڕی باش بن کەس کاری پێتانەوە نیە . " بە نابەدڵیەوە دەستیان بە خۆیندنەوەی دۆعا کرد . ڕۆیشتم خوارەوە .

خەیرییە وتی : " یەکێك مورەبای پرتەقاڵەکەی ڕشتووە ، ئەگەر بڵێم پشیلەیە پشیلە ناتوانێ ، ئەگەر بڵێم سەگە... " لەناکاوترسەکەی نێوچاوانمی بینی و وتی: " خێرە ئەوە چیە ؟ چیبووە ؟ باوکتان شتێکی پێ هاتووە ؟ "

" مرد . " قیژاندی ، پیاز و چەقۆکەی دەستی کووتایە سەر تەختەکە و

هەموو شتێك لە سەر تەختە پەرش   و بڵاو بووەوە. قیژەیەکیتری کرد . هەر دووکمان چاومان لە خوێنی پەنجە بڕاوەکەی بوو کەوا لە کاتی قیژەکەیدا بڕی بووی . ڕامکردە ژوورەوە بە دوای پەڕۆیەکدا دەگەڕام ، کاتێ زانیم لە ژووری منداڵەکانەوە قیڕەقیر و دەنگە دەنگێك دێت ، بە پەڕۆکەی دەستمەوە چوومە ژوورەوە ، شەوکەت سواری ئۆرهان بوو بوو ، قاچی نابووە سەر شان و ملی و خەریك بوو دەیخنکاند بە قیڕەوە وتم : "ئەوە چیدەکەن ؟"

شەوکەت گوتی :" ئۆرهان دەیویست لە ژوورەکەوە دەرکەوێتە دەرەوە ".

ئورهان گوتی : " درۆ دەکات ، شەوکەت دەرگاکەی کردبووەوە و خەریك بوو دەرکەوێ و منیش وتم مەچۆ. " و دەستی بە گریان کرد

گوتم : " ئەگەر بێدەنگ دانەنیشن هەر دووکتان دەکوژم . " ئۆرهان گوتی : " مەڕۆ دایە "

لە خوارەوە دەستی خەیرییەمان بەست و خوێنەکەمان ڕاوەستاند . کە وتم باوکم بە ئەجەلی خۆی نەمردووە، ترسا و دۆعای خودا بمانپارێزەی کرد و گریا . دەستی هێنا بە سەر چاویدا . لەبەر خۆشەویستی باوکم دەگریا یان وەکووبە قەدەر خۆشویستنەکەی خۆی دەگریا ؟ ڕۆیشتە ژوورەکەوە بۆ ئەوەی باوکم ببینێ، وتم لەو ژوورەدا نیە لە ژوورەکەی پشتەوەدایە . بە گومانەکەی ڕووی ڕوخسارییەوە تەماشای کردم . بەڵام کەزانی من ناچم و تەماشای تەرمەکە ناکەم ، ویستی مەراقی بەسەر ترسەکەیدا زاڵ بوو و چراکەی هەڵگرت و ڕۆیشت .لەبەر دەرگای چێشتخانەکەوە پێنج شەش هەنگاوی هەڵگرت و بە ڕێز و بە گومان و نابەدڵییەوە دەرگاکەی کردەوە ، لە

پێشدا تەرمەکەی نەبینی ، چراکەی زۆرتر بەرز کردەوە ،هەموو گۆشەیەکی ژوورەکە ڕوون بووەوە . ها . ها قیڕەیەکی کرد ، باوکمی لەو جێگایەدا بینی کە دامنابوو . بیٚئەوەی بجوولێتەوە تەماشای جەستەی باوکمی کرد ، تەنانەت سێبەرەکەشی لەبەر بەردەلان و دیوارە گەورەکە نەدەجوولایەوە کاتیٚ گەڕایەوە نەدەگریا ، پێم خۆش بوو کە توانای ئەوەی هەیە ئەو شتانە لە مێشکیدا بهێڵێتەوە کەوا پێی دەڵێم . وتم خەیرییە ئێستا گوێم بۆ ڕاگرە ، دەستم لە خۆیەوە چەقۆ ماسیاوییەکەی هەڵگرتبوودەمیشم قسەی دەکرد: " قاتی سەرەوە سەر و بن کراوە ، ئەو شەیتانە بیٚخێرە چووە و ئەوێشی تێك وپێك داوە و هەموو شتێکی شکاندووە . سەرو ڕوومەتی باوکمی لەوێدا پەرش و بلاوکردووەو لەوێدا کوشتوویەتی. لەبەر ئەوەی کە منداڵەکان نەیبینن و تۆش لە سەرەتادا نەترسی ، من تەرمەکەییم هێناوەتە خوارەوە ... ، لەدوای ئێوە منیش دەرکەوتبووم ، باوکم بە تەنیا لە ماڵدا بووە . "

بە ڕوودارییەکەوە گوتی : " نەمدەزانی، لە کویٚ بووی ؟ " تۆزێك بێدەنگ بووم و ویستم کە باش هەست بە بێدەنگییەکەم بکات . لە دواییدا گوتم : " لە لای ڕەشە بووم ، لە ماڵە چۆڵەکەی جۆلەکە هەڵواسراوەکەدا چاومان بە یەکتری کەوت بەلام ئەمە بە کەس نەڵێی . وەکوو ئەوەی کە هیچ نەبووبێت ئاوەها هەڵسوکەوت بکە " دەمویست بقیڕێنم و هاوار بکەم بەلام بێدەنگ بووم ، هەر دووکمان بێدەنگ بووین . دواتر وتم : " واز لەو ماسییە بهێنە ، سفرە بۆ منداڵەکان ڕاخە " بە هێواشی دەستم بە گریان کرد و باوەشم پێدا کرد ، توندتر باوەشمان بە یەکدا کرد . بۆ ساتێك نەتەنیا بە خۆم و منداڵەکانمدا بەڵکوو بەزەییم بە هەمووماندا هاتەوە ، لە

لایەکیتریشەوە کاتیَ باوەشم پێدا دەکرد شك و گومانێك دەروونمی گرتەوە : ئێوە دەزانن کە لە کاتی کوژرانی باوکم من لە کویَ بووم ، خۆتان دەزانن کە من خەیرییە و منداڵەکانم لە ماڵ دوور خستەوە بەڵام ئەمە بە مەبەستێکیتر بوو ، ئەمەش بە هەڵکەوت وای لێهاتووە . بەڵام خەیرییە ئەمە دەزانێت ؟ ئەگەر باسی بۆ بکەم تێدەگات یان دەکەوێتە گومانەوە .توندتر باوەشم پێدا کرد ، بەڵام زانیم بە عەقڵە خزمەتکارەکەی خۆیەوە دەزانێت کە ئەمەم بۆ شاردنەوەی فێڵەکەی خۆم ئەنجامداوە . منیش هەستم کرد کە خەریکم دەیخەڵەتێنم . کاتیَ باوکم دەکوژرا منیش لەولاتر ڕەشەم بینی بووحەز و خۆشەویستیمان دەکرد. ئێوەش وەها بیر دەکەنەوە . تەنانەت تۆمەتباریشم دەکەن ، وا دەزانن کە شتێکتان لێدەشارمەوە . چەندە بێچارەم ! چەندە بێبەختم ! دەستم بە گریان کرد . خەیرییەش گریا و باوەشمان کرد بە یەکدا .

لەسەر ئەو سفرەیەی وا لە ژوورەکەی سەرەوە ڕامانخست بوو وام نیشاندەدا کە زکم تێرە . جارجار دەمگوت با بزانم با پیرتان چۆنە و دەهاتمە دەرەوە و فرمێسکەکانم پاك دەکردەوە .زۆرتر کەوتنە ناو گومانەوە ، کاتیَ بردنمە ناو جێگاکە دەپێچان پێمەوە و ماوەیەکی زۆر نەخەوتن و هەر دەیانگوت جیڕەجیڕێك هات بیستت ؟ ودەجوولانەوە . بۆ ئەوەی کەوا ڕەحەتتر بن وەعدەی ئەوەم پێدان کە چیرۆکێکی عەشقیان بۆ بگێڕمەوە . لە تاریکاییدا وشەکان دەفڕن . شەوکەت گوتی : " دایە لەگەڵ کەسێکدا زەماوەند دەکەی ؟"

-: "جاریَ گویَ ڕاگرە " شازادەیەك هەبوو کە لە دوورەوە عاشقی کچیچکی جوان بووە ، ئەمە چۆن بووە ؟ بەر لەوەی کچەکە ببینیَ وێنەکەی

بينيبوو لەبەر ئەوە عاشقى بوو بوو . " وەكوو ئەوەى كەوا لە كاتى خەمباريدا دەمكرد ، چيرۆكەكەم وەكوو خۆى نەگێڕايەوە و هەندێكيشم لە خۆوە هەڵواسى و گێڕامەوە . لەبەر ئەو شتانەى كەوا لە دڵمەوە تێپەڕ دەبوون ، ڕەنگى بيرەوەرى و ئازارەكانى خۆمى پێوە بوو ، هەر لە وێنەيەكى بەسەر هاتەكانى خۆم دەچوو .

كاتێ منداڵەكان خەوتن ، لەگەڵ خەيرييەدا خەريكى كۆ كردنەوەى ئەوكەلوپەلانە بووين كەوا ئەو شەيتانە چەپەڵە پەرش و بڵاوى كرد بوون . سندوق و كتێب و قوماشى كونكراو و پەرداخە شكاوە فڕێدراوەكان و كاسەى گڵى و ديزە و جامۆڵكەكان و ميزە پارچە كراوەكە و قوتووى ڕەنگەكان و ئەو لاپەڕانەمان هەڵگرت كەوا بە نەفرەتەوە فرێدرابوون . كاتێ كارەكانمان تەواو دەكردجارجار يەكێك لە ئێمە دەستى بە گريان دەكرد . دەتگوت كە لەئەوە تووڕە نين كەوا باوكمى كوشتبوو، بەڵكوو زياتر لەوە تووڕەين كە هاتووتە ناو نهێنى و مەحرەمييەتمانەوە و ئەو هەموو شتەى تێكەڵ و پێكەڵ كردووە . لە ئەزموونى خۆمەوە دەزانم سروشتى مرۆڤ وايە كە ئەگەر خۆشەويستێكى بمرێ ، جارجار وادەزانێ كە هەموو شتێك وەكوو جاران بەڕێوە دەچێ و هيچ نەقەوماوە و وادەزانن كە پەردە و ڕووپۆشەكان و تيشكى هەتاو وەكوو جارانە و عيزرائيل خۆشەويستەكەى نەبردوون و ئاوەها خۆ دەخەڵافێنن . ئەو دەرگايانەى كەوا باوكم بە سەبروبە عەشقەوە تەماشاى دەكردن و ئەو نەخشانەى كەوا بە ناسكييەوە كێشرا بوون هەمووى بە دەستى ئەو ناپياوە خراپكرا بوون ، بۆيە دڵخۆشييەك و خەياڵێكى واى بۆ جێنەهێشتبووين . بەڵكوو بە پێچەوانەوە بێبەزەيى ئەو دۆزەخييەى دەهينايەوە يادمان و دەيترساندين ،

لەسەر داخوازی من خەیرییە ڕۆیشتە خوارەوە و لە چاڵەکە ئاوی تازەی دەرهێنا و دەستنوێژی گرت و هاتەوە و لەڕووی نووسخە دەسنووسە هەراتییەکەوە سوورەی ئالی عومرانی لە قورئاندا خوێندەوە کە باوکم زۆر حەزی لێەکرد . هەر دووکمان گوێمان لە جیڕە جیڕی دەرگای حەوشەکە بوو ، بەڵام کەسێك نەهات ، بەو نیوە شەوە سەیری سوزگی دەرکاکەمان کرد و پێکەوە گوڵدانی ڕیحانەکەمان دانایە لایەکەوە کەوا باوکم بەیانی بەهاران خۆی ئاوی تازەی دەردەهێنا و ئاوی دەدا . لەدوایشدا ڕۆیشتینە ژوورەوە . بۆساتێك وامانزانی سێبەری خۆمان کە سێکی ترە . کاتێك کەدەموچاوە خوێناوی‌یەکەی باوکمم دەشۆرد ، بیرم لەوە دەکردەوە کە پێویستە بڵێم بە مەرگی خۆی مردووە و لەوەش زیاتر چارەیەکم نیە . کە جلەکەیم دەگۆڕی خەیرییە بە بێدەنگییەکەوە گوتبووی دەستیم لە ژێرەوە پێبدە ، وەکوو ئەوەی کە عیبادت بکەین هەردووکمان ترسا بووین . کاتیٚ جلەکەیمان دەرهێنا ، سپیایی لاشەی باوکم بوو لەو ژوورە تاریکەدا تیشکی مۆمەکە دەکەوتە سەری زیاتر دیار دەبوو ، لەبەر ئەوەی کە هەردووکمان لە شتێکی مەترسیدار دەترساین ، سینە نیشاندار و لەکەدار و برینداره‌کەی باوکمان لە لاوە پیٚ ترسێنەر نەبوو . کاتیٚ خەیرییە ڕۆیشتە ژوورەوە بۆ ئەوەی جلەکانی باوکم بێنیٚ ، بەدزیوە تەماشای شتەکەیم کرد . بەڵام هەر دوای ئەوە شەرمم لە کردەوەکەی خۆم کرد . لەدوای ئەوە جلەکانمان کردە بەری و خوێنەکانی سەر و دەمو چاویمان پاك کردەوە باوەشم پێدا کرد . لووتم خستە ناو ڕیشەکانیەوە و تێر تێر گریام . با ئەوەش بڵێم کە لەبەر ئەوانەی کەوا من بەبیٚ ویژدان و تاوانبار دەزانن دوو جار گریام .

1-لە ژوورەکەدا کاتیٚ وام لە منداڵەکان دەکرد کە لە ڕووداوەکە تێنەگەن

، مۆرییەکی سەدەفیم بردە لای گوێم و گوێم دایە دەنگی دەریا و هەستم پێکرد .

2-دوایش کاتێ ئەو میندەرە سوورەم بە دڕاوی بینی کەوا باوکم بیست ساڵ لە سەری دانیشتبوو ، تێرتێر گریام .

لەدوای ڕێك و پێك کردنی شتەکان و خستنە لایەکی ئەو شتانەی وا دەبێ پینە بکرێن خەیرییە گوتی : دەمەوێ ئەمشەو لەلای ئێوە بخەوم . منیش زۆر بێبەزەییانە ڕەتمکردەوە و گوتم با بەیانی کاتێ منداڵەکان لەخەو هەڵسان گومان نەبەن . بەڵام ڕاستیەکەی لەبەر ئەوە بوو کە دەمەویست لەگەڵ منداڵەکانمدا تەنیا بم و خەیرییەش سزا بدەم . ڕۆیشتمە ناو جێگاکەمەوە ، ماوەیەکی زۆر نەخەوتم . ئەوەش لەبەر بەسەر هاتە مەترسیدارە نەبوو کەوا ڕوویدا بوو ، بەڵکوو لەبەر ئەوە بوو کە بیرم لە ڕووداوەکانی داهاتوو دەکردەوە .

## (( ناوی من سوورەیە )) (31)

لەدوای ئەو کاتەی کە فیردەوسی شاعیری شاهنامە چوو بوو بۆ غەزنە بۆلای شامەحموودولە لایەن شاعیرەکانی ئەوێوە گاڵتەی پێکرا بوو و پێیان گوتبوو لادێی! چوار ینەیەکی گوتووە کە سێ دێڕی دوایی بە قافیەیەکی سەخت تەواو دەبێ، منیش لەوێ بووم و لەسەر عەباکەی فیردەوسی بووم .

کاتیٚ کەرۆستەمی قارەمانی شاهنامە بۆدۆزینەوەی ئەسپەکەی دەچیٚ بۆ وڵاٚتانی دوور دەست منیش لەگەڵیدا بووم ، کاتیٚ کەدێوە ئەفسانەییەکی بە شمشێرکرد بە دوولەتەوە ، لەناوخوێنە ڕژاوەکەدابووم ، هەروەها کاتیٚ بە میوانی لەلای پادشا مایەوە و شەو لەگەڵ کچەکەیدا جۆروجووت بوو لەسەر لێفەکەی خەویدا بووم .

لەهەمووجێگایەکدا بووم و لەهەرجێگایەکیشم ، کاتیٚ کە (توور) بەناپیاوی سەری براکەی خۆی یانی (ئێوەجی) بڕی ، هەروەها ئەوکاتەی کەوا لەشکرەکان لە چۆڵەوانییەکاندا دەڕژانە یەك و ئەوکاتەی کەواخۆر لەسەر ئەسکەندەری دابوو و لووتی بەبیٚ ڕاوستان خوێنی لێوە دەڕژا منیش لەویٚ بووم ، بەهرامی کوڕی پادشای ساسانی هەر هەفتەیەك کراسی دەکردە بەروو هەر وەرزێك لەگەڵ جوانێکدا شەوی دەبردە سەر ، من لەسەر کراس وسوخمەی ئەو جوانە بووم کەوا ڕۆژانی سیٚ شەممە دەچوو بۆ لای .

هەروەها لەسەر تاج و هەموو جێگایەکی ئەو خەسرەوەدا بووم کەوا شیرین بە تەماشا کردنی وێنەکەی عاشقی بوو بوو . لەسەر ئاڵاٚی ئەو لەشکەرانەی وا قەڵاٚکانیان خستبووە چەمبەر و لەسەر ڕوپۆشی سوفرەی میوانیدا و لەسەر عەبای ئەو باڵویزانە بووم کەوا پێی پادشاکانیان ماچدەکرد . هەروەها لەسەر ئەو شمشێرەشدا بووم کە لە داستانە ڕاکێشەرەکەی منداڵاٚندا هەیە . لەسەر قەڵاٚکانی خزمەت بووم کەوا لەسەر لاپەڕە ئەستوورەکانی هیندوستانی و بوخاراییدا بە دەستی وەستا و شاگردە چاو جوانەکانەوە فلچەیان لێدراوە ، لە داڕشتن و چنینی دیوارەکان و لەسەر ئەو جلانەدام کەوا ژنە مل بەرزەکان کاتیٚ کە لە پەنجەرەوە تەماشای کۆڵاٚن دەکەن لەبەری دەکەن . پووپەی کەڵەشێرەکانم لە

کاتی شەڕدا نیشانداوەومیوە ئەفسانەییەکان و هەنارەکانی وڵاتی ئەفسانەیی دەمی شەیتان و خەتە باریکەکانی ناو چوار چێوەکان و نەخشە پێچ پێچەکانی چادرەکان و وێنەی ئەو گوڵانەی وا وێنە کێشان بۆ خۆشی خۆیان دروست کردوون و چاوە تووتڕکینەکانی پەیکەری ئەو چۆلەکانەی کەوا لە شەکەرەوە دروستکراون و گۆرەوی شوانەکان و بەرە و بەیانییە ئەفسانەییەکان و بەدەیان هەزار شەڕکەر و پادشا و برینی عاشقانم نیشانداوە حەز لە ئەو گوڵانە دەکەم کەوا خوێن لە مەیدانی شەڕدا درووستی کردوون و هەروەها حەز لە کوڕی جوان و وەستا و شاعیرەکان لە کاتی شەراب خواردنەوە و باڵی فریشتەکان و لێوی ژنان و هەسووان بەسەری بڕاوی مردووەکان لە ناو خوێن و  بریندا دەکەم .

گوێم لێیە کە پرسیاری چیدەکەن ، بوون بە ڕەنگ بە چی دەبێت ؟ ڕەنگ دەست لێدانی چاو و مۆسیقای بینابیە و وشەیەکی ناو تارییکاییە. دەیان ساڵە لەم کتێب بۆ ئەو کتێب و لەم کەلوپەل بۆ ئەوی‌تر ڕۆیشتووم و وەکوو منگە منگی با گوێم لە قسەی ڕۆحەکان بووە . هەر لەبەر ئەوەش دەست لێدانی من وەکوو هی فریشتەکانە . لایەکم بانگی چاوەکانتان دەکات : ئەوڵا گرانایی هەیە و لە جێگای خۆیدایە ، لایەکیتریشم لەگەڵ نیگاکانتاندا لە ئاسماندا دەفڕێ ، ئەوەیش لا سووکەکەی منە . لەبەر سوور بوونم چەندە دڵخۆشم ! جەرگم دەسووتێ : بەهێزم ! لە فیداکارییەکەی خۆشم ئاگادارم . هەر وەها دەزانم کەوا ناتوانن لە بەرامبەرم ڕاوەستن . خۆم ناشارمەوە : ئەمە بۆ من بە ناسکی و لاوازی و بێ‌هێزی دروست نابێ بەڵکوو بە ئیرادە و بە بڕیار بوونەوە دروست دەبێ، بۆیەخۆم دەخەمە مەیدانەوە . لە ڕەنگێکی‌تر و سێبەر و زۆر بوونی جەماوەروتەنیایی ناترسم . چەندە

خۆشە کە ڕوویەك بە ئاگرە سەرکەوتووەکەی خۆمەوە داپۆشمەوە ! لەو جێگایەدا کەوا من خۆم بڵاو دەکەمەوەچاوەکان بریقە دەدەنەوە ، تامەزرۆیی بەهێزتر دەبیٚ و ئەبرۆکان بەرزتر دەبنەوە ، دڵەکان توونددتر لێدەدەن. تەماشام بکەن ! ژیان چەندە خۆشە ! سەیرم بکەن ! وەرە ژیان ببینە . لە جێگایەکەوە چاویان پێم دەکەویٚ . ژیان بە منەوە دەست پێدەکات هەموو شتێك دەگەڕێتەوە بۆ من. بڕوام پێبکەن و بێدەنگ بن و گوێم لێڕابگرن و بزانن کە چۆن دەبم بە سوورێکی نائاسایی .

ئەو وەستایەی کەوا لە ڕەنگ تێدەگات . حەشەرە سوورە وشکراوەکە دەکوتیٚ کەوا لە شوێنە گەرمەکانی هیندوستانەوە هاتووە . سیٚ جامۆڵکە ئاوی خستە ناو قازانێکەوە لە دواییدا ئاوێکی تایبەتی تێکرد و بە جوانی تێکیدا بە ماوەی خواردنەوەی قاوەیەك کوڵاندی . کە ئەو قاوەکەی دەخواردەوە منیش وەکوو منداڵێك بۆ لە دایك بوون بێئارامیم دەکرد . قاوەکە عەقڵی کردبووەوە و چاوەکانی وەکوو هی جندۆکە لێکرد بوو . شتە وردوهان کراوەکەی تێکردو لە دواییدا بە دارێکی تایبەتی ئەو کارە تێکیدا ، ئێستا دەبووم بە سوورێکی ڕاستەقینە . بەڵام خەستەییەکەم زۆر گرنگە ، پێویستە ئاوەکەم زۆر بکوڵیٚ و زۆریش نەکوڵیٚ . بەو شووڵەی دەستی تۆزێك ئاومی هەڵگرت و دای لە نینۆکی پەنجە بەرانەی ( کە نابیٚ پەنجەکانیتر بن ) ئەوە چەندە خۆشە کە سوور بیت ! نینۆکەکەیم سوور کرد ، و لەسەر نینۆکەکەیەوە وەکوو ئاو نەڕژام . خەستییەکەم باش بوو ، بەڵام خڵتم هەبوو . قازانەکەی لەسەر ئاگردانەکە داگرت . لە قوماشێکی پاکەوە دایهێڵام و و پاکی کردمەوم و خڵتەکەی گرتم و لە دوایدا خستمیەوە سەر ئاگرکەو دوو جاری تر کەفەکەی گرتم . لە دوایدا دایگرتم بۆ ئەوەی سارد

ببمەوە .چەند ڕۆژ تێپەر بوو، بە بیٚ ئەوەی کەس خۆیم لیٚبدات لەوێدا مامەوە . لە دڵمەوە دەمویست خۆم بدەم بە هەموو جیٚگایەك و هەر لاپەرەیەکدا . کە چی لە دواوە هیٚشتبومیانەوە، ئەوەش دلٚ منی دەشکاند ، لەم بیٚدەنگیەدابیرم لەوە کردەوە کە سوور بوون چیە ؟

جارێك لە شارێکی ئیٚرانیەکاندا وێنەکٚشیٚکی کوێر ، وێنەی ئەسپیٚك دەکیٚشیٚ و بەر دەستەکەشی ڕووپۆشی زەمینەکە بە فلٚچە ڕەنگ دەکات ، لە هەمانکاتدا بیستوومە کە دوو وەستای تر لە لاوە قسەی لەسەر دەکەن . ئەو وێنەکیٚشەی وا ئەسپەکەی لەبەر خۆوە کیٚشابوو وتی : " لەبەر ئەوەی لە تەواوی ژیانی وٚێنەکیٚشیماندا بە ویست و بڕواوە ئیشمان کردووە دەزانین کە سوور چ جۆرە ڕەنگیٚکە و چ جۆرە هەستیٚکی هەیە و هەمووشی بە بیر دیٚنینەوە . بەلاٚم ئەگەر کۆیر ببوایەین چۆن دەمانتوانی بزانین ئەو سوورە چیە کەوا شاگردەکە بە وێنەکەدا دەیهیٚنیٚ . " ئەوی تریش وتی : " مەسەلەیەکیجوانە ، بەلاٚم ڕەنگەکان ئەو هەستانەن کەوا ناتوانی لیٚیان تیٚبگەی وەستا ! هەستی سوور بوون فیٚری ئەوە بکەن کەوا هیچ هەستی پیٚنەکردووە . ئەگەر بە سەری پەنجەکانمەوە دەستمان لیٚبدایە ئەوا لە نیٚو ئاسن و مسدا دەبوو ، ئەگەر بە مشت بمانگرتایە ئەوا دەیسووتاند ، ئەگەر بمانچیٚشتبایە وەکوو گۆشتی خویٚدار زمانمان ئەستور تر دەبوو ، کە بۆنیشمان بکردبایە بۆنی ئەسپی لیٚوە دەهات ئەگەر بۆنی گولٚیشی لیٚوە بهاتبایە بۆنی گولٚی سووری لیٚ نەدەهات ، بەلٚکو بۆونی گولٚە چەرمەلٚی لیٚدەهات .

سەد و دە سالٚ بەر لە ئیٚستا وێنەی وەستای ڕۆژئاوایەکان لای پادشاکان وەکوو خودای بڕوای پیٚدەکرا ، کە چی ڕەنگی سووریان زۆر بە

کار نەدەهێنا و بەکار هێنانی زۆریشیان وەکوو بیٚشەرەڤ ونەزانی لە قەڵەم دەدا . وێنەکێشە تازە کارەکانیش بۆ ڕەنگی سووری عەبایەك ڕەنگی سووری جیاوازیان بە کار دەهێنا ، سێبەر نابیٚ بە بەهانە، بە تەنیا سوورێك هەیە هەر بەوەش بڕوا دەکردرێت ." ئەو وەستایەی وا لە بەر خۆوە ئەسپەکەی کێشابوو جارێکی تر وتی : " مانای ئەم سوورە چیە ؟ " ئەوی تر گوتی : " مانای ڕەنگەکان لە بەرامبەرمان دایە و خودی بینینیانە ، تۆ لە بەر ئەوەی کە نابینی ناتوانی باسی بکەی . " ئەوەی وا ئەسپەکەی لە بەر خۆوە کێشابوو وتی : " کافیران و زەندیق و بیٚ بڕواکانیش دەڵێن بەڵگەی نەبوونی خودا نادیار بونیەتی . " ئەوەیتر گوتی : "بەڵام بۆ بینەرەکانی ئاشکرا دەبیٚ . لە بەر ئەوش قورئانی کەریم دەڵیٚ ئەوانەی وا دەبینن و ئەوانە وا نابینن نابن بە یەك . " شاگردە جوانەکە بە هێواشی منی کێشابوو بە سەر زینی ئەسپەکەدا . جێگیر بوون لەناو وێنەیەکی ڕەش و سپیدا هەستی شانازیم پێدەدات و کاتێك بە فڵچەی کلکە پیشلەیی دەمبەن و دەمهێنن لەخۆشیدا ختوکەم دیٚ . بەم شێوەیەش کاتیٚ ڕەنگ دەدەمەوە ، وەکوو ئەوە وایە کە بە دونیابڵێم پەیدا ببە و دونیاش لە ڕەنگی منەوە دروست ببیٚ . ئەوەی کەوا نایبینیٚ ئەمە ڕەت دەکاتەوە ، بەڵام لە ڕاستیدا من لە هەموو جێگایەکدام .

بەیانی زوو بەر لەوەی کەوا مناڵەکان لە خەو هەڵسن ، بە پەلەپەل نامەیەکم بۆ ڕەشە نووسی و داوام لێکرد  کە بێت بۆ ماڵی جوولەکە هەڵواسراوەکە و دام بە خەیرییە کەوا بەخێرایی بگەیەنێتە دەستی ئەستەر. ئەگەر لە کاتی وەرگرتنی نامەکەدا بێپەروایانە تەماشای نێو چاوانی کردبم ، ئەوا منیش لەبەر ئەوەی باوکێکم نەما بوو ، کە لێی بترسم بەو بێپەروایییەی وا تازە بە دەستم هێنا بوو تەماشای نێو چاوانم کرد . ئەمەش لەمەو بە دوا دەبوو بە یاسا و شێوازی هەڵسوکەوتی ئێمە لەگەڵ یەکدا . لە ماوەی ئەم دوو ساڵەدا لەوە دەترسام کە خەیرییە لە باوکمەوە منداڵێکی ببێت و دەست لە خزمەتکاری بەربدات و دەم لە خانمی بکوتێ . بەر لەوەی کە منداڵەکان لە خەو هەستن ، سەردانێکی باوکە بێچارەکەمم کرد . دەستێکی بە بەرد بڕا بوو ، بەڵام هێشتا نەرمایییەکەی جارانی مابوو ، ماچیم کرد . جوان جوان باوکمم داپۆشت و کاتێ منداڵەکانیش لە خەو هەستان گوتم باوکم چاك بووەتەوە و ڕۆیشتووە بۆ سالیح پاشا . خەیرییە گەڕابووە و سوفرەکەی داخستبوو ، مورەبای پرتەقاڵەکەی لە ناوەراستدا دانا بوو کە هەرکەس دەستی پێبگات ، منیش بیرم لەوە دەکردەوە کەوا ئێستا ئەستەر خەریکە لە دەرگای ماڵی ڕەشە دەدات. بەفر ڕاوەستا بوو، خۆر تازە دەرکەوتبوو. کاتێ لە دەرگای ماڵی کابرا یەهوودییە هەڵواسراوەکە ڕۆیشتمە ناو هەر ئەو شتانەی جاری پێشووم بینی . سەهۆڵەکانی پاساری ماڵەکە شۆڕ بوو بوونەوە و بەپەلەپەل بچووك دەبوونەوەودەتوانەوە ، حەوشەکە بۆنی کەڕوو و بەرگی گەنیوی لێوە دەهات و بە حەزێکی زۆرەوە خۆری لەخۆ دەگرت ، وەکوو ئەوەی چەند

حەفتە بەر لە ئێستا ڕەشەم بینیبیٚ ئاوەها مەسافەتی دوێنیٚ ئێوارە تاوەکوو ئێستا بۆ من درێژ بوو بووەوە . لەو جێگایەدا کەوا جاری پێشوو بینیبووم ، چاوە ڕێیم کرد .

پەچەکەم هەڵداوە و گوتم : " ئەگەر ئەو خۆشەویستیتان لە دلەوە دێت ، ئیدی لەمەوە بەدوا ناڕەزایەتی و دژبەایەتی و گومانەکانی باوکم نامێنێت ، دوێنیٚ ئێوارە کە تۆ لێرەدا دەتەویست ئەو کارە بێشەرەفانە بکەی ، شەیتانێکی چەپەڵ چووەتە ناو ماڵە چۆڵەکەمانەوە و باوکمی کوشتووە . " لە کاردانەوەی ڕەشە ئێوە مەراقی ئەوە دەکەن کە بۆچی من لەم ژوورەدا ئاوا قسە دەکەم ، کەچی تۆزێك قسەکانم بە دڵ نیە . وەڵامەکەی نازانم ، بەڵام لەوانەیە بگریم و ئەویش باوەشم پێدا بکات و زۆرتر نزیکی ببمەوە . " ماڵەکەی تێکداوە ، شتی زۆری شکاندووە ، دیارە کە قین و نەفرەتی زۆری بووە و زۆریش تووڕە بووە بڕوا ناکەم ئەوەی وا ئەو کارەی کردووە لەمەو بەدوا لە ماڵی خۆیدا ڕووی ئاسوودەیی ببینیٚ . دوایین وێنەی کتێبەکەی باوکمی دزیوە . دەمەویٚ کە من و ئێمە وکتێبەکەی باوکم لەو بپارێزیٚ . بەڵام کێشەکە لە دواییدایە کە بە چ تایبەتمەندی و چ جۆر خزمایەتییەك دەمانپارێزیٚ . "

خەریکبوو قسەیەك بکات ، بەڵام وەکوو ئەوەی هەموو کات دەیکەم بە نیگاکەمەوە بێدەنگم کرد

" بە گوێرەی قازی لە دوای مەرگی باوکم ، سەرپەرشتی من شووەکەم و ماڵی باوکی مێردەکەمە ، تەنانەت بەر لە مردنی باوکیشم هەروا بوو ، چونکە بە گوێرەی قازی مێردەکم هێشتا نەمردووە . لەبەر ئەوەی باوکی مێردەکەم لە کارە بیٚئەدەبییەکانی برای مێردەکەم کە دەیویست لە نەبوونی

میردەکەمدا کەڵکم لێوەر بگرێ کەوتبووە گومانەوە ، من توانیبووم بە بێ ئەوەی ببم بە بێوە ژن لەلای باوکم بمێنمەوە . ئێستا کە باوکم مردووە و براکەیشم نیە ، مانای ئەوە دەگەیەنێت کەمن خاوەنێکم نیە ، یان وەکوو خاوەنەکەم برا و باوکی مێردەکەمن ، خۆ دەزانی ئەوان دەیانەویست بە زۆری من بگەڕێننەوە و زەختیان دەخستە سەر باوکم و هەڕەشەیان لە من دەکرد . کە مردنی باوکم ببیسن و نەیبیسن یەکسەر دەمبەنەوە بۆ ماڵ. منیش لەبەر ئەوەی نامەوێ بگەڕێمەوە بۆ ئەو ماڵە مردنی باوکم دەشارمەوە . لەوانەیە کە لە خۆڕایشەوە دەیشارمەوە ، چونکە لەوانەیە هەر خۆیان ئەمەیان کردبێ . " لە دەلاقە شکاوەکەی ماڵی جوولەکە هەڵواسراوەکەوە گورزە ڕووناکییەکی باریك هاتە ناوەوە و تۆزی یەکساڵەی نێو ماڵەکەی ڕۆشن کردەوە وکەوتە بەینی من و ڕەشەوە. چاوەکانم بڕیە نیگا پڕ لە عەشقەکانی ڕەشە کەوا حەزم لێدەکا و گوتم : " تەنیا لەبەر ئەم هۆیانە مەرگی باوکم دەشارمەوە . لەوە دەترسم نەتوانم ئەوە بسەلمێنم کە لە کاتی کوژرانی باوکمدا لە کوێ بووم . هەروەها لەوە دەترسم شایەتیەکەی خەیرییە هەر چەندە کە نرخێکیشی نیە بگەڕێتەوە بۆ دژایەتی من ، یان وەکوو هیچ نەبێ دژایەتی کردنی کتێبەکەی باوکم. سەرەڕای ئەوەی کە کەسێکم نەماوە بەڵام لەوانەیە کە ئەمە لە سەرەتادا بۆ سەلماندنی ئەوەی کە پیاو کوژێك لە ئارادایە بە کەڵکم بێت ، بەڵام لە دواییدا تووشی ئاژاوەمان دەکات ، بۆ نموونە خەیرییە دەزانێ کە باوکم نەیدەویست من شوو بە تۆ بکەم هەر ئەمەش دەبێ بە شتێکی خراپ بۆ من . "

ڕەشە پرسیاری کرد و گوتی : " باوکت نەیدەویست لەگەڵ مندا زەماوەند بکەی ؟ "

" نەیدەویست خۆتیش ئاگاداری ! چونکە لەوە دەترسا کە تۆ من هەڵگری و لەو دوورم بکەیتەوە . ئێستاش کە تۆ خراپەیەکی ئاوەها دەرهەق بە باوکم ئەنجام نادەی ، ئەگەر هەبایە نارِەزاییەکی دەرنەدەبڕی، تۆ نارِەزاییەکت هەیە ؟ "

- " نا ، جوانەکەم . "

- " باشە ، سەر پەرەشتەکەی منیش داوای هیچ پارە و زێڕێکت لێ ناکات. لەبەر ئەوەی بە ناوی خۆمەوە مەرجی مارەبڕینم داناوە داوای لێبووردنت لێدەکەم. بەڵام مەخابن کە ناچار دەبم بڕۆمە ناو قووڵایی باسەکە و هەندێك مەرجی مارەیی خۆم بڵێم . " لەبەر ئەوەی ماوەیەکی زۆر بێدەنگ مامەوە ڕەشە وەکوو ئەوەی داوای لێبووردن بکات کە درەنگ وەڵامی داوەتەوە وتی : " بەڵێ . "

دەستم پێکرد و گوتم : " یەکەم : دەبێ لەلای دووشایەتدا سوێند بخۆی کە ئەگەر بە شێوازێکی خراپ – کە تەحەموول نەکردرێت ـ هەڵسوکەوتت لەگەڵدا کردم بۆ جیابوونەوە نەفەقەم پێبدەی . دووهەم : پێویستە لەلای دوو شایەتدا سوێند بخۆی کە ئەگەر لەماوەی شەش مانگدا بەهەر هۆیەك نەگەڕایەتەوە بۆماڵ ، ئەو وەزعە وەکوو جیا بوونەوە بزانی و نەفەقەشم بۆ ببڕێتەوە . سێهەم : لە دوای زەماوەند بێیتە ماڵی ئێمە و لەوێ دانیشی، بەڵام دەبێ تاوەکوو بکوژەکەیباوکم نەدۆزیتەوە یان نەدۆزرێتەوە ـ کە خۆم دەمەوێ ئەشکەنجەی بکەم ـ و تاوەکوو کتێبەکەی باوکم بە هونەر و لێهاتوویی خۆتەوە تەواونەکەی و تەسلیمی پادشای نەکەی لەیەك جێگادا ناخەوین و لەگەڵمدا جووت نەبی . چوارەم : دەبێ ئەو منداڵانەی کەوا من

لەگەڵیاندا لەیەك جێگادا دەخەوم وەكوو كوڕی خۆتیان بزانی و بە خۆشەویستیەوە هەڵسوكەوتیان لەگەڵدا بكەی . "

-: " باشە . "

" كەواتە ئەگەر ئاستەنگییەكانی بەر دەممان لابچن ، لە كاتێكی نزیكدا دێیتە ناو دونیایماڵەكەتەوە . "

" دونیای ماڵ باشە ، بەڵام لەیەك جێگادا نەخەوتن خراپە، نابێت . "

" ژیانی هاوسەری لەسەرووی هەموو شتێكەوە دێت ، پێویستە لە پێشدا ئەوە چارە سەر بكەین ، عەشق لەدوای ئەوە دێت . لەبیرت نەچێ كە لە دوای زەماوەند كردن ئاگری گوڕ گرتووی عەشق دەكوژێتەوە و تەنیا جێگای ئاگرێكی خەماوی لێدەمێنێتەوە. لە دوای زەماوەند عەشق كۆتایی پێدێت ، بەڵام لەجێگای ئەوەدا دڵخۆشی پەیدا دەبێت . بەڵام سەرەڕای ئەمەش هەندێك پیاوی گێل و گەوج بەر لە زەماوەند عاشق دەبن و هەموو عەشقەكەیان تەواو دەكەن ، بۆچی ؟ چونكە وادەزانن گەورەترین ئامانجی ژیان عەشقە ."

"راستییەكەی چیە ؟ "

" ڕاستییەكەی دڵخۆشییە ، عەشق و ژیانی هاوسەریش تەنیا بۆ خزمەتی ئەوە دەبێ، مێردێك ،ماڵێك ، منداڵەكانت یا خود كتێبێكە . سەیركە ! سەرەڕای ئەوەی كە من باوكم كوژراوە و مێردەكەشم ون بووە بەڵام وەزعی من لە تەنیاییەكەی تۆ باشترە ! ئەگەر ئەو كوڕانەم نەبن ئەمرم ، هەموو ڕۆژێك پێدەكەنن حەز لە یەك دەكەین ، لەیەك دەدەین . كەچی تۆش گیان دەدەی بۆ ئەوەی كە بتوانی لەگەڵ مندا بخەوی ، تەنانەت ئامادەی

لەگەڵ لاشەکەی باوکم و لە نێو جەنجاڵی منداڵەکاندا بخەوی و گویٚ بۆ قسەکانی من ڕابگری "

" گوێت لێدەگرم ."

" بۆ ئەوەی کە بتوانم جیا ببمەوە ڕێگای جۆرا و جۆر هەن ، بۆ نموونە شایەتی درویٚنە سویٚند بخۆن که مێردەکەم بەر لە مردن لەلای ئەوان سویٚندی خواردووە و گوتویوتی ئەگەر دوو ساڵ نەگەڕامەوە با ژنەکەم هەقی جیا بوونەوەی هەبێت . یان وەکوو سویٚند بخۆن کە لە مەیدانی شەڕدا چاویان بە تەرمی مێردەکەم کەوتووە و هەموو وردەکارییەکی باس بکەن . بەڵام لە لایەکیتریشەوە هەندێك لە قازییە ژیرە بە تەدبیرەکان ناڕەزایی باوك و برای مێردەکەم لەپێش چاو دەگرن و بەو شایەتانە ڕازی نابن . هەروەها ئەو قازیانەش کە وەکوو ئێمە حەنەفین سەرەڕای ئەوەش کە دەزانن مێردەکەم چوار ساڵ بەبیٚ نەفەقە بەجێیهێشتووم جیام ناکەنەوە . بەڵام قازی ئوسکودار بۆ ئەوەی کەوا هەلی جیا بوونەوە بدات بەو ژنانەی کەوا مێردەکانیان لە شەڕ نەگەڕاوەتەوە و هەموو ڕۆژێك ژمارەیەشیان لە زیاد بوون دایە ، بە ڕەزامەندی پادشا و ( شیخ الاسلام)، بە زانا بوون جێگرەکەی لە شوێنی خۆی دادەنیٚ کە مەزهەبی شافێعییە ، ئەویش جیایان دەکاتەوە و نەفەقەشیان بۆ دەبڕێتەوە . بەم شێوەیە ئەگەر دوو شایەت بدۆزیتەوە و هەندێك پارەیان بدەیتیٚ و هەر ئەم دوا نیوەڕۆیە بچینە لای ئوسکودار و وەها بکەین کە جێگرەکەی لەویٚ بێت و جیام بکاتەوە و لە دەفتەرەکەیدا بینووسیٚ ولە دواییدا کاغەزێکیشم پێبدات کە بتوانم مێرد بکەم ، دۆزینەوەی مەلایەك بۆ مارە بڕین زۆر ئاسان دەبیٚ و دەتوانیٚ هەر ئەمشەو لەگەڵ من و منداڵەکانمدا لەژێر بانی ماڵێکدا بخەوی و ئێمەش لە

جیڕەجیڕی شەوان وترسی هاتنی پیاوکوژەکە ڕزگار بکەیت و بەیانی کە مەرگی باوکیشمان ڕاگەیاند، من لە وەزعی ژنێکی بێکەس ڕزگار بکەی."

ڕەشە بە خۆشبینییەکی منداڵانەوە گوتی : " بەڵێ . دەتخوازم " تۆزێك بەر لە ئێستا باسی ئەوەم کرد بوو کە نازانم بۆچی ئاوا لە ژوورەوە بە دوور لە ڕاستی و ڕاستە ڕوویی لەگەڵ ڕەشەدا قسەدەکەم . ئێستا دەزانم! چونکە ڕەشە هەر لە منداڵیشەوە گێژ بوو ، بۆ ئەوەی کە بتوانم ئەو شتانەی پێ بقەبڵێنم کە خۆشم بە زۆری بڕوایان پێدەکەم ، پێویستە هەر ئاوەها هەڵسوکەوت بکەم . دەزانم کە ئەوان ئێوارە ئیدعای ئەوە دەکەن کە ئەو مارە بڕینە و ئەوجیا بوونەوە ــ ئەگەر خودا مەیلی ببێت ــ دروست نیە و بۆ ئەوەی کە کتێبەکەی باوکم تەواو نەبێ دوژمنایەتیمان دەکەن ،بۆیە پێویستە لەبەرامبەر ئەوانەدا زۆر شتان بکەین ، بەڵام لێیگەڕێ با مێشکی لەوە زیاتر تێکەڵ و پێکەڵ نەبێ ، چونکە خۆی لە خۆیدا تێکەڵاوە .

ڕەشە وتی : " عەقڵت تێکەڵ و پێکەڵ نیە ؟"

وتم : " ئەمانە هی عەقڵی من نین ، بەڵکوو هی ئەو ساڵانەیە کەوا بە قسە کردن لەگەڵ باوکمدا فێری بووم ." ئەمەم لەبەر ئەوە گوت کە وانەزانێ ئەمانە هەمووی لە مێشکی ژنانەی منەوە دەرکەوتوون و بڕوا بە قسەکانم بکات . قسەی هەموو ئەو پیاوانەی دوو پات کردەوە کە من بە ژیر دەزانن و لە ڕووبە ڕوومەوە پێم دەڵێن و گوتی: " زۆر جوانی . "

وتم : " بەڵێ " . زۆر حەز لە پەسەندرانی عقڵی خۆم دەکەم ، کاتێ منداڵ بووم، باوکم هەمیشە وای دەکرد. ، خەریکبوو بڵێم باوکم دەستی لە تاریف کردنم بەردا کە دەستم بە گریان کرد . کاتێ دەگریام وەکوو ئەوە وابوو کە دەبم بە ژنێکیتر و دەچمە دەرەوە و وەکوو بینەری وێنەکانم لێدێ

و چاوم بە بەسەرهاتەکەی خۆم دەکەوێ و بەزەییم بە خۆدا دێ و بۆ خۆم دەگریم . کە مرۆ بییەوێ وەکوو کەسێکیترچاو لە ئازارەکانیخۆی بکات و خەمیان بۆ بخوات ، لایەنێکی پاکی تێدایە ، کاتێ ڕەشە باوەشی پێدا کردم ، وامزانی کە باشە ڕووی لە دونیا کرد بەڵام ئەمجارەش باشەکە لە نێوانماندا دەمایەوە و بۆ دونیای دەورووبەرمان نەدەبوو .

## (( ناوی من ڕەشەیە )) (33)

کاتێ شەکورەی هەتیوی بێوەژن بە هەنگاوەکانی خۆیەوە وەکوو تووک هەڵفڕی و ڕۆیی بە بۆنی بادامیەکەی ئەوەوە لەگەڵ خەیاڵی هاوژینەکەمدا لە ماڵی جوولەکە هەڵواسراوەکەدا مامەوە . مێشکم تێکەڵ و پێکەڵ بوو بوو، بەڵام وەکوو ئەوەی بەزەیی پێمدا هاتبێتەوە کاری دەکرد . بە ئەندازەی خۆیشی خەفەتی مەرگی زاواکەمانم دەخوارد ، بەپەلەپەل ڕۆیشتمە ماڵی خۆمان . لەلایەکەوە کرمی گومان و دوو دڵی دەیخواردەوە و دەیگوت : شەکورە دەمخەڵەتێنێ و دەیەوێ وەکوو بەشێکی گەمەیەك بەکارم بێنێ و لەلایەکیتریشەوە خەیاڵە خۆشەکانی ژیانی هاوسەری لەپێش چاوم ون نەدەبوون . ژنە خاوەن ماڵەکەم لەبەر ئەوەی کە بزانێ بۆچی بەو بەیانیە زووە ڕۆیشتووم و هاتوومەتەوە هاتبووە بەر دەرگای ماڵ ، هەندێك قسەم لەگەڵدا کرد و ڕۆیشتمە ناو ژوورەکەی خۆم، لە دواییدا لە ناو ئاخنی کەمەرەکەمدا کەوا لە ناو دۆشەکەکەمدا شارد بوومەوە بیست ئاڵتوونی وەنیزیم دەرهێنا و خستمە ناو جزدانەکەمەوە . کە دووبارە کەوتمەوە ناو

**کۆڵانەکان زانیم کە ئەمڕۆ بە تەواوەتی چاوە تەڕ و خومارەکانی شەکورە لە پێش چاوم ون نابن . لە دواییدا پێنج دانە لە شێرەکانی وەنیزیم لەلای کابرا دەم بە پێکەنینە جوولەکەکە ورد کردەوە .**

**لە دواییدا گەڕامەوە بۆ ئەو گەڕەکەی کەوا تا ئێستاحەزم نەکردووە ناوەکەیتان پێبڵێم وە ئێستا دەڵێم ، یانی گەڕامەوە بۆ لای گەڕەکی یاقووت و بە مێشکێکی خەیاڵاویوە بەرەو لای ئەو ماڵە بەڕێ کەوتم کەوا شەکورە و منداڵەکانی و جەنازەی زاوا مردووەکەمان چاوەڕێیان دەکردم .**

**لە کۆڵانەکەوە بە هەڕا کردن ڕێم دەکرد ، دار چنارێك لەبەر ئەوەی کەوا لە ڕۆژی مردنی زاواکەماندا کراسێکی زەنگۆڵە دارم لەبەر کردووە و خەیاڵی زەماوەندم لەسەرە منی بە بچووك و سوك لە قەڵمدەدا . کانییەکەیش کەوا لەبەر توانەوەی سەهۆڵەکان ئاوی زیاد کرد بوو گوتی : " گوێی مەدەیە ، کارەکانت جۆرکە و بە دوای خۆشیەکانتا بچۆ . " عەقڵم چنگۆڵێکی لێگرتم و وتی : " باشە " . بەڵام تۆزێك دواتر پشیلەیەکی ڕەشی بێخێر کە گۆشەیەکی دەلێسایەوە گوتی : " تۆ لە هەموو شتێکدا تەنانەت لە کوشتنی زاواکەتانیشدا تاوانباری ، لەو بارەیەوە هەموو کەسێك تەنانەت خۆتیش گومانت لێدەکات . " پشیلەکە دەستی لە لێسانەوە بەر نەدا و بۆ ساتێك چاومان بە یەکدا هەڵتۆقی . خۆ خۆتان دەزانن لەبەر ئەوەی کەوا خەڵکەکە ڕوویان پێدەدەن ئەمانە ئاوەها هار بوون .**

**دواتر ڕۆیشتم بۆ لای مەلا. ئیمام ئەفەندی لە ماڵەوە نەبوو ، بەڵکوو لە حەوشی مزگەوتەکەدا بەچاوێکی شۆڕ و خەواڵووەوە ڕاوەستا بوو ، پرسیاری ئەوەم لێکرد کە شایەتی دان لە دادگادا چ کات پێویستە و چ کات بە دڵی مرۆڤ خۆیەتی . بە لە خۆبایبوونێکەوە وەڵامی دامەوە ، منیش**

وەکوو ئەوەی کەوا جاری یەکەم بێ ئەم وەڵامەم بیستبێ ئەبرۆکانم هەڵبڕی و گوێم لێگرت . وتی : " ئەگەر شایەتیتر هەبن کە ڕووداوەکەیان بینیبێ ، ئەوا بە دڵی خۆتە ، بەڵام ئەگەر تەنیا یەك کەس بێت ، بە پێی فەرمانی خودا پێویستە شایەتی بدات . "

وتم : " دەردەکەی ئێمەش ئەوەیە . " و کەوتمە ناو باسەکەوە : " بە سەر بابەتێك کە وا هەر کەسێك دەیزانێ ، شایەتەکان بە بەهانەی ئەم بە دڵی خۆ بوونەوە ،خۆ دەشارنەوە و تەمبەڵی دەکەن و نایەن بۆ دادگاو بەو جۆرەش کاری ئەو مرۆڤانەی وا من یارمەتیان دەدەم جێبەجێ نابێ . "

ئیمام ئەفەندی وتی : " ئەی ! تۆش تۆزێك دەمی کیسەکەت بکەرەوە . " منیش کردمەوە و ئاڵتوونە وەنیزیەکانم پێنیشاندا ، لەبەر ڕۆشنایی ئەو زێڕانەدا حەوشە گەورەکە و ڕوخساری ئیمام و هی هەمووومان ڕۆشن بووەوە . وتی : " کێشەکە چیە ؟ " خۆمم پێناساند و گوتم : " زاوای بەڕێز نەخۆشە ، دەیەوێ بەرلە مەرگی خۆی بێوەژن بوونی کچەکەی یاسایی ببێتەوە و نەفەقەشی بۆ ببڕدرێتەوە . " پێویستی بەوە نەکرد کەباسی جێگرەکەشی بکەم ، خۆی لە هەموو شتێك تێگەیشت و گوتی : " خۆی لە خۆیدا ئەوە ماوەیەکی درێژە کەوا خەڵکی گەڕەك خەم بۆ شەکورە بیبەختەکە دەخۆن . درەنگ ماونەتەوە . " لەباتی ئەوەی کەوا لەبەر دەرگای دادگای ئوسکوداردا بەدوای شایەتی دووهەمدا بگەڕێم ، ئیمام براکەی خۆی هێنا . ئێستا ئەگەر لەبەر ئەوەی ئاگای لە دەردی شەکورەیە کەوا لەم گەڕەکەدا دەژی و ئازاری منداڵەکانی دەزانێ ، ئاڵتوونێکی پێبدەم ئەوا خێرم دەگات . دوو ئاڵتوونیشم نیشانی ئیمام دابوو ، بۆ شایەتی دووهەم تۆزێك

پارەی کەم کردەوە ، لەگەڵ یەك جۆر بووین و ئیمام ئەفەندی چوو بۆلای براکەی .

ڕۆژانی داهاتوومان لەئەو داستانانە دەچوو کەوا بەدواداچوونی تێدا هەبوو و لە قاوەخانەکانی حەڵەبدا لەلایەن چیرۆك بێژەکانەوە دەگوترانەوە و لەگەڵیشیاندا هەڵپەرکێیەکیان دەکرد . تەنانەت ئەگەر کەسێك ئەم بەسەرهاتانەی بەخەتی جوان بنووسیبایە و بیکردبایە بە کتێب ، دیسان کەس بە جیدی وەرنەدەگرتن و وێنەیان بۆ نەدەکێشان بەڵام من تەواوی بەسەرهاتەکانم لە چوار بابەتدا کۆ کردەوە و وێنە ونەخشیشم بۆ کێشان .

لە بابەتی یەکەمدا پێویستە شێوەکارەکە لە کاتێکدا وێنەی ئێمە بکێشێت کە دەمانویست بۆ ئوسکودار بچین و لە ( ئون قاپیدا ) سواری بەلەمێکی سووری پاڕوودار بووین کە پاڕوو کێشەکانی هەموو پیاوی سمێڵ زل و بازوو زل بوون ، لەگەڵ ئیمام و برا ناو چاوڕەشەکەیدا سوار بووم و لەگەڕانەوە ناکاوییەکەشدا دیسان مەمنون بووم . لەگەڵ پاڕوو چییەکاندا برادەرایەتیم دەکرد و لەلای لووتی بەلەمەکەوە بە بیرمەندییەوە خەیاڵم لە خۆشییە بێکۆتاییەکانی ژیانی هاوسەری دەکردەوە و وەکوو ئەوەی کەوا لە بنی ئاوەڕۆکەی ( بوغاز ) کەوا لەم بەیانییە زووەدا زیاتر دەبریقێتەوە ، نیشانەیەکی بێخەبەری دەبینم بەترسەوە تەماشای بنی ئاوەکەم دەکرد ، بۆ نموونە لاشەی کەشتی دزەکان . کەواتە شێوەکارەکە چەندە دەریا و هەورەکان بە جوانی بکێشیٚ ، با بیکێشیٚ ، هەر بە قەدەر خەیاڵە خۆشەکان و ترسە لەرزێنەرەکانم ترسێنەر دەبیٚ ، هەر بۆیە پێویستە جۆرێك بیکێشیٚ کە مرۆڤ (خوێنەر و بینەر ) وا هەست نەکات کە

هەموو شتێك پاك و خاوێنە ، بۆ نموونە پێویستە لە بنی ئاوەکەدا ماسییەك بکێشیٚ .

پێویستە لە وێنەی دووهەمینیشماندا کۆشکی پادشاکان و کۆبوونەوە و دیوانەکان و چۆنیەتی قەبووڵکردنی نێردراوانی دەرەوە و ناوەوەی ماڵی جەنجاڵ بە هەموو وردە کاریەکانیەوە بکێشرێت و جوانی و زەرافەتێك کە شایەستەی بەهزاد بێت و لایەنی ڕابواردن و گاڵتەشیتێدا جێگیر بکردرێت . یانی پێویستە وێنەی قازی ئەفەندی بە شێوەیەك بکێشریٚ کەلە لایەکەوە دەستی هەڵبڕیٚ وەکوو ئەوەی کە بڵیٚ قەبووڵی ناکەم نابیٚ و لەلایەکیتریشەوە دەستەکەیتری وەکوو ئەوەی کە بپاڕێتەوە درێژی بەرتیلەکەی من بکات و ئەنجامی کارەکە هەر لەو کاتەدا دیار بێت کە پارەکە دەخاتە گیرفانیەوە ، هەروەها پێویستە وەها بکێشرێت کە یاریدەری قازی ئوسکودار لە باتی خودی قازی لە جێگایەکدا دانیشیٚ . جێکردنەوەی ڕووداوە دوابە دوا ی یەکەکان لە لاپەڕەیەکدا بە فێڵبازی و شێوازی کەڵەکە کردنی بابەتی شێوەکاریەکەوە مومکین دەبێت . بەم شێوەیە ئەگەر چاوێك لەپێشدا بەر تیل دانەکەی منی بینیبیٚ و هەروەها چاوی بە جێگرە شافێعییەکەی ئیمام کەوتبیٚ کەوا کەوا لەسەر میندەرە سوورەکە لە جێگای قازیدا دانیشتووە و خەریکی جودا کردنەوەی شەکورەیە لە مێردەکەی، ئەوا یەکسەر دەزانێت کە دووزێریشم خستۆتە ناو گیرفانی ئەویشەوە .

سێهەم وێنەش پێویستە هەر ئەو بەسەر هاتانە زیندوو بکاتەوە بەڵام ئەمجارەیان پێویستە لە نەخشکردنی دیوارەکاندا لەق و پۆی کەمتر بەکار ببریٚ و لە شێوەی ڕازاندنەوەی چینیەکان کەڵك وەر بگێردرێت و بە ڕەنگێکی تاریکترەو بۆیاخ بکرێت و لە ژوور جێگری قازیشەوە چەند پەڵە

هەورێك دابنرێت بۆ ئەوەی كە وا لەگەڵ بەسەرهاتەكەماندا یەكبگرێتەوە . سەرە ڕای ئەوە ئیمام و براكەی‌یەك بە یەك چونەتە لای قازی پێویستە وەها نیشان بدرێت كە پێكەوە چوونەتە لای و دەست بە قسە دەكەن و دەڵێن :" ئەوە بۆ چوار ساڵ دەچێت كە مێردی ئەم شەكوورە خەمبارە لە شەر نەگەڕاوەتە و بە خێوی ناكات هەر لە بەر ئەوەش لە هەژاریدا ژیان دەباتە سەر ، هەروەها خاوەنی دوو منداڵی هەتیوی چاو تەڕ و زك برسیە و لە بەر ئەوەی كە وا هێشتا هاوسەری هەیە كەس بەبێ ڕەزای مێردەكەی پارەی بە قەرز ناداتێ " و بە جۆرێك پێیادا دەچن و دەیگێرنەوە كە دیوارە بێ گۆێكانیش بە فرمێسكەكانی خۆیانەوە یەكسەر جیایان دەكەنەوە ، بەڵام جێگرە بێ دڵەكە كە هیچ خەمێكیشی نەبوو ، پرسیاری كرد و وتی : " سەرپەرشتی ئەمە كێیە ؟ " لە دوای ماوەیەك دوو دڵیەكەی خۆم تێپەر كرد و گوتم باوكی بەڕێزی كە چاوشی و نوێنەرایەتی بۆ پادشا كردوە و هێشتا نەمردووە .

جێگری قازی گوتی : " هەتا ئەو نەیەت بۆ دادگا جیای ناكەمەوە ! " بە پەشۆكاوی و هەڵچوونەوە وتم : " زاوای بەرێزم لە جێگادایە و خەریكە گیان ئەدات و تەنیا ئارەزوشی ئەوەیە كە بەر لە مردنەكەی كچەكەی بە جودا كراوی ببینێ " جێگر گوتی : " جیا دەبێتەوە كە چی بكات ! پیاوێك كە خەریكە دەمرێ بۆچی دەیەوێ  كچەكەی لە كابرایەك جودا بێتەوە كە وا لە مێژە لە شەڕدا كوژراوە و لە ناو چووە ؟ ها ! بنوارە ! ئەگە بڵێی كە زاوایەكی ڕێك و پێكی چنگ كەوتووە ئەو كات تێدەگەم ، چونكە دەیەوێ چاوی لە دواوە نەمێنێتەوە وەها بمرێ. "

وتم : " هەیە ، جێگری بەرێز "

: " کێیە ؟ "

: " من ! "

: " دەبێ ! تۆ پارێزەری ؟ سەر پەرەشتی ؟چیت؟ چ کارێك دەکەی ؟ "

" لە شارەکانی ڕۆژ هەلاتدا نووسەری و نامە نووسی و یاردەری دەفتەر داری بۆ پادشاکان دەکەم ، مێژوویەکی شەڕی ئێرانیەکانم نووسیوە کە پێشکەشی پادشاکەمانی دەکەم ، لە وێنە و نەخشتێدەگەم ، ئەوە بیست ساڵە لە بەر عەشقی ئەم کچە دەسووتێم . "

" خزمایەتیت لە گەڵیدا هەیە ؟ " لە بەر ئەوەی کە وا لە ناکاو بە دەست و داوێن ماچکردنەوە چووبوومە لای جێگری قازی و هەموو نهێنیەکانی ژیانی خۆمم بۆ درکاندبوو زۆر شەرمم لە خۆ کردبوو .

– : " لە باتی ئەوەی وەکوو شەڵغەم سوور ببیتەوە وەلامم بدەوە ، ئەگینا جیای ناکەمەوە . "

: " کچی پورمە "

: " هـ هـ هـ هم ، تێگەیشتم دەتوانی دڵخۆشی بکەی ؟ " کاتیٚپرسیاری کرد بە دەستی ئیشارەتێکی بێئەدەبانەی کرد . با شێوە کارەکە ئەم پیساییە نەکێشیٚ ، تەنیا ئەوە نیشان بدات کە ڕوومەتم چۆن  سووڕ هەڵگەڕابوو ، بەسە .

: " داهاتم باشە " جێگری بەرێز وتی : " لە بەر ئەوەی کە وا مەزهەبی شافەعیم هەیە و مێردی ئەم شەکورە بیٚ بەختە لە شەر نەگەڕاوەتەوە جیا بوونەوە ی ئەم شەکورەیە بە شتێکی دژبە کتێب و بڕواکەم نازانم . ئەوا جودام کردەوە و تەلاقمدا، ئیدی ئەگەر شووەکەشی بگەرێتەوە ناتوانیٚ داوای هیچ مافێکی لە سەر بکات " وێنەی دوای ئەمە یەعنی چوارەمیان

پێویستە وێنەی جوڵە پێکردنی قەڵەمەکەی جێگر و یەك لە دوای یەك ڕیز کردنی پیتە مل کەچەکان و نوسین و مۆر کردنی کاغەزی تەڵاق و جیا بوونە و ئاماژە کردن بەوە بیٚ کە دەتوانیٚ یەکسەر شوو بکات . هەروەها پێویستە داییني کاغەزەکە بە دەستی منیش نیشان بدات . خۆشیەکەی ئەو کاتەم بە سوور کردنی دیواری دادگا و چوار چێوەی خۆێناوی گوزارشت ناکردرێت . لە نێوان ئەو جەماوەرەدا کەوا هاتبونە بەر دەرگای جێگر و دەیانەویست تەڵاقی خۆشك و کچ و دادەکانی خۆیان بستێنن و لە بەینی شایەتە درۆینەکاندا ڕێگایەکم دۆزیە و بە هەڕا کردن ڕێگای ماڵم گرتە بەر .
ملەکەم بە جێهێشت و بەرەو گەڕەکی یاقوت هاتم ، دەستم نا بە ئیمام و براکەی کە دەیانەویست مارەکەشمان ببڕن پارەیەکی تریان دەست بکەویٚ.
لە بەر ئەوەی کە وا دەمزانی ئەوانەی دەمبینن و دەزانن کە خەریکە بگەم بە چ خۆشیەك ، بەخیلیم پیٚ دەبەن و خەریکی دانانی فیٚلٚ و کەڵەکەن بۆ من ، بە پەلە پەل هەڕام کرد و گەیشتمە کۆڵانەکەی ماڵی شەکورە . قەلە ڕەشە بیٚ خێرەکان لە کۆیوە زانیبویان مردوویەك هەیە کە ئەوەها لە سەر خشتەکان ئەملاو ئەلا دەکەن ودڵیان خۆش بووە؟ خەفەت نەخواردن بۆ مەرگی زاوا و تێر بە دڵی خۆم نەگریان لە بەر ئەو بە سەر هاتە ، خەریك بوو دەروونم وەرگەرێنێتەوە . لە دەلاقە بەستراوەکانی ماڵ و بێدەنگیەکەوە تێگەیشم کە هەرشتێك وەکووخۆی بەریوە دەچیٚ. هەستتان بەوە کردووە کە لەمجۆرە کاتانەدا پەلە پەل دەکەم . بەردە بچکۆلەیەکم لە زەوی هەڵگرت و بۆ دەرگای حەوشەکەم خست ، نەمپێکا ! بەردێکیشم خست بۆ ناو ماڵەکە ، بەڵام کەوتە سەر بانەکە ، بە تووڕەیەوە ماڵەکەم گرتە بەر بەرد ، پەنجەرەیەك کرایەوە ، ئەو پەنجەریە بوو کە وا چوار ڕۆژ بەر لە ئێستا ، لە نێوان لەق و

پۆی دار هەنارەکە و لە وێوە دوای دونزە ساڵ بۆ یەکەمجار چاوم بە شەکورە کەوتبوو ، ئورهانم بینی . لە بەینی پەنجەرەکەوە دەنگی شەکورە دەهات کە ئورهانی سەرزەنشت دەکرد . بۆ ساتێك بە هیواوە لە گەڵ جوانەکەمدا تەماشای یەکتریمان کرد ، چەندە خۆش بوو ! چەندە جوان بوو ! بە واتای چاوەڕێ بە ئاماژەیەکی کرد و پەنجەرەکەی داخست . هەتا ئێوارە وەختی زۆر مابوو . لە حەوشەکەدا لە نێو جوانی دونیا و دار و کۆڵانە قوڕاوییەکاندا بە سەر سووڕماویەوە چاوەڕێ مامەوە . زۆری پێنەچووکە خەیرییە هات ، وەکوو ژنێکی خاوەن ماڵ جلی لە بەرکردبوو ، دەتگووت خزمەتکار نیە، بە بێئەوەی کە نزیکی یەك بینەوە لە پشتی دار هەنجیرەکانەوە ڕۆیشتینە ژوورەوە پێم گوت : " هەمو شتێك باش بە ڕێوە دەچێ " . نامەکەی قازیم نیشان دا و گوتم : " شەکورە تەڵاقی سەند ، ئێستا مەلایەکیترمان گەرەکە " . خەریکبوو بڵێم دەیدوزمەوە کە گوتم دێت ، با شەکورە ئامادە بێت . خەیرییە وتی : " شەکورە دەیەوێت ئەگەر بچووکیش بێت دیسان شای بکرێت و خەڵك بانگ بکردرێن ، با خەڵکی گەڕەکەکە بێن ، دەیەوێت کە خواردنی زەماوەند بخوردرێت ، لە قازانەکەدا پڵاوی قەیسی و بادامم لێناوە . " خەریکبوو بە تامەوە باسی ئەوەی دەکرد کە چییان کردووە کە قسەکەیم بڕی و گوتم: " ئەگەر جەنجاڵ بەرپا بکەن ، حەسەن و پیاوەکانی ئاگادار دەبن و دێن بە سەرماندا و ڕێو ڕەسمیزەماوەندەکە بێکاریگەر دەکەن وناتوانین شتێك بکەین و خراپەیی و ڕیسواییمان بۆ دەردەخەن . لەوەش زیاتر تورەکەیەك هەنجیر بە فیڕۆدەچێ ، نەتەنیا حەسەن و باوکی بەڵکوو ناتوانین لەو شەیتانەی وا زاوای ئەفەندی کوشتووە خۆمان بشارینەوە . ئێوە ناترسن ؟ "

وتی : " ناترسین " و دەستی بە گریان کرد .

وتم : " هیچ شتێك بە کەسێك نەڵێن ، جلی خەوتن بکەنە بەر زاوا و وەکوو خەوتووی لێبکەن و بڵێن نەخۆشە و پەردەکەشی داخەن ، بالە ژوورەکەیدا چرا نەبێ بۆ ئەوەی بتوانی لە کاتی مارە بڕیندا ببێ بە سەرپەرشتی شەکوورە . نابێ جەنجاڵی بووکێنی بکردرێت ، لە دوایین کاتەکاندا چەند دراوسێیەك بانگ دەکەن ، هەر ئەوەندە و بەس ، کاتێ بانگتان کردن بڵێن کە دوایین داوا کاری زاوا ئەفەندی ئەمە بووە .ئەمە هیچ خۆش نیە ، دەبێ بە زەماوەندێکی فرمێسکاوی . ئەگەر نەتوانین ئەم ئیشە سەر بخەین ئەوا جێگای هیچ گومانێك نیە کە تێکمان دەدەن و لەناومان دەبەن تۆش سزا دەدەن تێدەگەی ؟ " بە گریانەوە سەرێکی لەقاند . سواری ئەسپە سپییەکەم بووم و گوتم زۆرم پێناچێ ، شایەتەکان دێنم و دێمەوە ، با شەکورە خۆی ئامادە بکات لەمە و بەدوا من دەبم بە پیاوی ئەم ماڵە ، ئێستاش دەچم بۆ دەلاکخانە و قژم چاك دەکەم .

لە پێشدا پیلانم بۆ جێبەجێکردنی هیچ یەك لەمانە دانەنابوو . لە کاتی قسە کردندا هەموو شتێکم دەهاتەوە یاد وەکوو ئەوەی کە لە هەندێك لە شەڕەکاندا هەستمدەکرد وامدەزانی کە خودا زۆر حەزم لێدەکات و هەموو کاتێك دەستم دەگرێ و دەمپارێزێ ، هەر لەبەر ئەوەشە کە کارەکان جۆر دەبن و دەچنە سەر ڕێگای خۆیان . ئەگەر جارێك متمانەییەکی وا لە دەرونتاندا دروست ببێ ، ئەوا چی بگات بە مێشکتاندا و چی بکردرێت ئەنجامی دەدەن و کردەوەکانیشتان ڕاست دەردەچن .

لە گەڕەکی یاقووتەوە بەرەو خەلیج چوار کۆڵانم بە جێهێشت مەلا ڕیش ڕەشە ڕوومەت نوورانیەکەی مزگەوتی یاسین پاشای گەڕەکەکەیترم لە

کاتێکدا بینی کە گزگێکی بە دەستەوە بوو و سەگە هارەبووەکانی لای مزگەوتی ڕاودەنا . دەردەکەی خۆم بۆ باس کرد و گوتم باوکی کچی پوورم خەریکە گیان دەدا و عەمری خودا دەکات ، دوایین ئارەزووی ئەم پیاوە مەرگ بەختە ئەوەیە کەمن و کچەکەی پێکەوەزەماوەند بکەین ، ئەمڕۆش کچەکە لەلای قازی ئوسکودار لە مێردەکەی کەوا چوار ساڵە نەگەڕاوەتەوە تەڵاقی سەندوجودا بووەوە . لەبەر ناڕەزایی مەلا کە وتی ژنێك کە تازە تەڵاقی سەندبیٚ بۆ ئەوەی بتوانی جارێکیتر شوو بکات پێویستە کە یەك مانگ ڕاوەستیٚ و چاوەڕێی بیٚ ، منیش گوتم : " ئەوە بۆ چوار ساڵ دەچیٚ کە مێردەکەی نەگەڕاوەتەوە و کچەکەش دوو گیان نیە ، قازی ئوسکوداریش ئەمڕۆ هەر بەو مەبەستە جیای کردنەوە . " ئەمانەم بۆ ئەوە گوت کە مەلا بزانێت هیچ ئاستەنگییەك لەبەردەم مارەبڕینەکەدا نەماوەتەوە . بەڵیٚ ، بووك کچی پوورمە ، بەڵام خۆ ئەمە لەبەرامبەر پێکەوە ژیانماندا ئاستەنگ نیە ، لەلایەکیتریشەوە مارەبڕینە کەیتر کۆتایی پێهاتووە ، هیچ جۆرە جیاوازییەکی دینی ، هاوسەنگی وماڵیشمان پێکەوە نیە . ئەگەر ئەو ئاڵتوونانەی بگرتبایە کەوا بۆم کێشابوو و لە نێو زەماوەندەکەدا و لە پێش چاوی ئەو هەموو عالەمەدا لە یەك مارەی بکردبایەین ، ئەوا خەیرێکی باشی دەرهەق بە هەتیوەکانی ئەو بێوەژنە دەکرد . تۆ بڵێی مەلا حەز لە شلەی قەیسی و پلاوی برنج بکات ؟ حەزی لێدەکات بەڵام هێشتا چاوی لە سەگەکانی بەرحەوشەکەیە . زێڕەکانی وەرگرت و پرسیاری ناونیشانی ماڵەکەی کرد . بۆم تاریف کرد ، وتی جلەکانم دەگۆڕم پێدا ویستیەکانم ئامادە دەکەم و سەیرێکی قژ و ڕیشم دەکەم و دێم مارەی دەبڕم . " لەپەلەپەل کردن بۆ ئەو مارە بڕینەی وا دوانزە ساڵ بەتەمای بووم و دیسان

لەوەی کەوا کاکی زاوا پەشۆکاوی و مەترسییەکانی لەبیر بەرێتەوە و خۆی بخاتە بەر بەزەیی دەستەکانی دەلاکێکی چەنەباز و تراشێکی زاوایانە بکات شتێکی سرووشتی‌تر هەیە ؟ ئەو دەلاکەی کەوا پێکانم لەخۆیەوە منی برد بوو بۆ لای ئەو ، هەمان ئەو دەلاکەی لای لە کۆڵانی ماڵە خرای لای بازاڕەکە بوو ، کەوا من و شەکوورە و زاوا و پوورم دەورانێکمان لەوێدا تێپەڕ کرد بوو و لە دوایشدا بە جێیان هێشتبوو . دوای دوانزە ساڵ کە بۆ یەکەم جار دەگەڕامەوە ئەستەمبووڵ لێرەدا چاوم بە چاوی ئەم دەلاکەدا هەڵتۆقی ، ئەمجارەیان کە دوای پێج ڕۆژ چوومە ژوورەوە باوشی‌پێدا کردم و وەکوو سەر تاشێکی باشی ئەستەمبووڵی کە لە کویٚ بووم و دوایی ڕووداوەکانی کۆڵان و گەرشەکی بۆ باس کردم و لە دوایشدا قسەکەی هێنایە سەر ئەوەی کە ئەو ژیانە لەرێبوارییە بە واتاکەیدا بەر و کوێمان دەبات.

ناتوانم بڵێم دوانزە ساڵ بووە کە ڕۆیشتووم بەڵکوودەڵێی دوانزە ڕۆژە لێرە ڕۆیشتووم . لەلەرزەلەرز کردن و سەما کردنی گوێزانەکەی دەستە نیشاندارەکەیەوە بەسەر گومانەکانمدا دیار بوو کە وەستای دەلاك پیر بووە ، ویسکی زۆری دەخواردەوە ، شاگردێکی پێست پەمەیی چاو سەوزی لێو جوانی هێنا بووە لای خۆی . کوڕەی بەر دەست بە سەر سووڕ ماوییەوە تەماشای دەستی وەستای دەکرد . بە گوێرەی دوانزە ساڵ بەر لە ئێستا ناوەوە زۆر پاك و خاوێن و ڕێك و پێکتر بوو هەندێك ئاوی گەرمی کرد بووە ناو سەتڵێکەوە بەوە بە پەلەپەل دەم و چاومی شۆرد . ئەو سەتڵە بە زنجیرێکی تازەوە لەسەرەوە هەڵواسرا بوو ، تەشتە کۆن و پانەکانی لە تەنەکە دروستکرا بوون ، مەقەڵەکەشی پاك و گوێزانە دەسکدارەکانیشی تیژ بوون . لە قوماشی ئەو ئاورێشمەی‌وا دوانزە ساڵ بەرلە ئێستا

دەیبەستەوە پشتە ماڵێکی خاوێنی لە پشت بوو . وەها بیرم دەکردەوە کە دەبێ بە هاتنی ئەم شاگردە باڵا بەرز و لاشە نەرم و ناسکەوە دوکانی وەستا و تەنانەت خودی وەستاش ڕێك و پێکتر بووبێ ، هەروەها خەیاڵم لەوەش دەکردەوە کە لەگەڵ دەستپێکردنی ژیانی هاوسەریدا مرۆڤ خۆی و کارەکەی و ژیانەکەشی ڕێك و پێکتر دەبێ . لە دوایشدا خۆمم لەبەر دەستی وەستا و خۆشی ئاوە گەرمە بۆنی گوڵدارە و سابووناوییەکەوە شل کردەوە .

چەندە کات بەسەر چووبێت نازانم ! لەژێر دەستە لێهاتووەکانی وەستا و لەبەر گەرمایی ئەو مەقەڵە کەوا وردە وردە دوکانە بچوکەکەی گەرم دەکردەوە ئازارەکانی ژیانی دەتوانەوە وەهام بۆ دەهات کە ئەمڕۆ لە ناکاو گەورەترین خەڵاتم پێدەبەخشن ، بە هەزاران جار سوپاسی ئەو خودایەم دەکرد و دەمەویست کە بزانم ئەمە لە کام لایەنی تەرازووە نهێنیدارەکەی عالەمە خولقێندراوەکەیەوە دەردەچێ، هەروەها بە هەستێکی خەماوییەوە بەزەییم بە زاوادا دەهاتەوە کەوا ئێستا بە مردوویی لەو ماڵەدا ڕاکێشراوە کەوا من تۆزێکیتر دەبم بە پیاوی ئەو ماڵە . چمکی دواینی ئەم بیر و خەیالانەم گرتبوو و دەمەویست خۆم بۆ ڕۆیشتن ئامادە بکەم . لە ناکاو لەبەر دەرگا هەمیشە کراوەکەی دەلاکخانەکەدا جووڵەجووڵێك کرا، گەڕامەوە و سەیرم کرد : شەوکەت ! پەشووکاو هەڵچوو بوو ، بەڵام بە متمانەیی بە خۆوە کاغەزێکی بۆ درێژ کردمەوە ، بەبێئەوەی کە بتوانم هیچ شتێکی پێبڵێم کاغەزەکەم وەرگرت ، وامزانی کە خراپترین هەواڵم بۆ هاتووە و بایەکی سارد دەروونمی گرتەوە ، کاغەزەکەم خوێندەوە : " ئەگەر شایی و زەماوەند نەکرێت ، مێردت پێناکەم ــ شەکورە . " باڵی شەوکەتم گرت و بە زۆر بەرەو لایی خۆمم ڕاکێشا و لە باوەشم گرت . دەمەویست بنووسم

بەسەر سەر و سەر چاوان خۆشەویستەکەم . بەڵام لەلای دەلاکێکی نەخوێندەواردا قەڵەم کەی دەست دەکەوێت !؟ بە بێدەنگی و بەرەچاوکردنی هەموو شتێك گوتم بە دایکت بڵێ باشە ، لە دواییدا گوتم ئەی باوە پیرت چۆنە ؟ " گوتی : "دەخەوێ " ئێستا دەزانم کە شەوکەت و دەلاك و ئێوەش لەسەر مەرگی زاوا گومان دەخەنە سەر من ( شەوکەت لە شتیتر گومان دەکات ) . مەخابن ! بەزۆر ماچمکرد ، بەڵام شەوکەت بەبێئەوەی حەزم لێبکات ڕۆیشت ، لە کاتی زەماوەندەکەشدا لە دوورەوە بە جلە جەژنانەکەیەوە وەکوو دوژمنێك سەیری دەکردم . لەبەر ئەوەی کە شەکورە لە ماڵی باوکیەوە نەدەهات بۆ ماڵی من و بە پێچەوانەوە من دەچووم بۆ ماڵی باوکی شەکورە بەرپا کردنی شایی و زەماوەندی بووکانە گونجاوتر بوو . سروشتی بوو کە من نەتوانم وەکوو کەسانیتر بانگی هاوڕێ دەوڵەمەندەکانم بکەم و سواری ئەسپیان بکەم و بیاننێرمە بەردەرگای ماڵی شەکورە . بەڵام سەرەڕای ئەوەش کاتیگەڕابوومەوە بۆ ئەستەنبووڵ دوو لەو هاووڕێیانەیوا پێیان گەیشتبووم( یەکێکیان وەکوو من بوو بوو بە کاتیب (نووسەر ) ئەویتریش گەرماوێکی بەڕێوە دەبرد ) لە کاتی قژ چاك کردندا هاتن و پیرۆزباییان لێکردم و داوای دڵخۆشییان بۆ کردم ، وەستای دەلاك کە ئەمەی بینی چاوی پڕبوو لە فرمێسك ، منیش ئەو وەستا خۆشەویستەم لەگەڵ خۆمدا هێنا . خۆشم ئەسپە سپییەکەی ژێری خۆمم کێشا و بەرەو ماڵیشەکورە گیان بەڕێ کەوتم ، وەکوو ئەوەی کە بمانەوێ شەکورە ببەین بۆ ماڵێکیتر و ژیانێکیتر پاڵمان نا بە دەرگاکەیانەوە . خەیرییە دەرگاکەی کردەوە بەخششێکی باشم پێدا ، شەکورە بە جلی سووری بوکێنی و تاراپەمەییەکەی سەریەوە لەنێو گریان و هەنیسکدان و قیرەقیڕ و ماشەڵا

گوتنەوەدا هاتە خوارەوە و بە هونەرێکی جوانەوە سواری دووهەمین ئەسپی سپی بوو کەوا لەگەڵ خۆماندا هێنا بوومان . ئەو دەهۆڵ و زوڕناچییانەی وا کاکی دەلاك لە دوایین کاتەکاندا بە بەزەیی پیاهاتنەوەیەکەوە جۆری کرد بوون ، بەزمێکی بووکانەیان لێدا و کەوتنە جموجۆڵ . شایە بووکانە[1] خەمبارە هەژارەکەمان لەگەڵ ئەوەی کەوا زۆرلەخۆ ڕازی بووین دەستی پێکرد ، ئەسپەکانمان کەوتنە ڕێ و نەکەوتنە ڕێ شاییەکەمان دەستی پێکرد ،

ئەوکاتە تێگەیشتم کە شەکورە بە فێڵبازییەکانی خۆیەوە ئەم شاییەی بۆ ئەوە ویستووە کە مارە بڕینەکەمان باش ببەستێتەوە بۆ ئەوەی کە هەموو کەس نەتوانێ بەرهەڵستی بکات . لەلایەکیتریشەوە ئەم بەزم و هەرایە وەکوومەیدان خوێندنەوە بۆماڵی باوك و برای مێردەکەی شەکورە وا بوو و دەبوو بە هۆی ئەوەی کە هەرکارەکە لە سەرەتاوە بکەوێتە ناو مەترسییەوە ، ئەگەر بەمن بایە بە بێدەنگی مارەم دەبڕی و لە دوایشدا بەبێ زەماوەند دەبووم بە مێردی و بەم شێوەیەش ژیانی هاوسەریەکەم دەپاراست . لەپێشەوەی جەنجاڵ و بەزمەکەوە بە سواری ئەسپە سپییە داستانییەکەمەوە لە کۆڵانی گەڕەکەکەوە تێپەڕ بووم و چاوم بۆبەینی دیوارێك یان حەوشەیەکی تاریك و کراوە دەگێڕا و لەوە دەترسام کە حەسەن و پیاوەکانی خۆیان مەلاس دابێ و هێرش بکەنە سەرمان ، چاوم بەو پیرە مێردانە کەوت کەوا لەبن دیوارەکاندا دانیشتبوون و سەریان لەم بەزمە ناکاویە سووڕما بوو بێڕێزیشیان نەدەکردلەلایەکیتریشەوە هەندێك کەسی نەناسراوم بینی کە دەستیان بۆ هەڵدەبڕین بەبێئەوەی کە بمەوێ چووینە ناو بازارە بچووکەکەوە ، لە خۆشی ئەو میوە فرۆشە کە چەند

هەنگاوێك هات بە دواماندا و نەیدەویست بەی و هەرمێكانی بەجێبهێڵێ و لە پێكەنینە خەماوییەكانی دوكاندارەكە و نیگا پەسەند كەرەكەی ئەو نانەوایەی وا بۆرەكی سووتاوی دەدا بە شاگردەكەی تێگەیشتم كەوا شەكورە زۆر هۆستایانە چپە و ورتە و بۆڵەی خەڵكی ورووژاندووە و لە ماوەیەكی كورتدا جیا بوونەوە و مێردكردنی لەلایەن هەمووانەوە قەبووڵ دەكرێ . بەڵام سەرەڕای ئەوەش لەبەرامبەر بەسەرداهاتنێكدا یان وەكوولە بەرامبەر قسەیەكی ناخۆشدا خۆمم ئامادە كرد بوو . هەر لەبەر ئەمەش لە هەرا و هۆریا و دەنگەدەنگی ئەو منداڵانە ناڕەحەت نەدەبووم كەوا لە پشتی دەركەوتن لە بازاڕەكەوە بەدوامانەوە بوون و داوای بەخشیشیان دەكرد . لە پێكەنینی ئەو ژنانەوە كەوا لەبەر پەنجەرەكانەوە سەیری ئێمەیان دەكرد و منیش وامدەزانی كە خەیاڵ و مەیاڵ دەبینم ، دەمزانی كە ئەم هەرا و بەزمە ئێمە دەپارێزی و ئەم كارەی ئێمەش پەسەند دەكرێت . لە دواییدا زۆر شوكر كە چاوم بە گەڕانەوەی شاییەكە كەوت كەوا ڕێگای هاتنەوەی گرتە بەر ، بەڵام لە ڕاستیدا دڵم لەلای ئازارەكانی شەكورە بوو . لە ڕاستیدا ئەو شتەی كەوا منی بۆ ئەو دەخستە ناو خەفەتەوە ئەوە نەبوو كە بەناچاری لە ڕۆژی مەرگی باوكیدا مێرد دەكات بەڵكوو هەژارانە بوون و بێدەنگ بوونی زەماوەندەكەمان بوو ، شەكورەم شایستەی زەماوەندێكی وابوو كە دراوسێكان بە هەموو زێڕەكانیانەوە بەجلی ئاوڕێشمنەوە بێن و سواری ئەسپەكانیان بن كەوا زینەكانیان لە پەمەوە دروستكرابێ ، هەروەها سەدان ئەسپی باركێش بە سەدان باری خەڵات بەرەو ماڵ بەرن و هەرا و هۆریای ژنە پیرەكانی حەرەمسەرای تێدابێ كەوا دادەنیشن و باسی دەوڵەمەندی ڕۆژانی ڕابردوو بۆ كچانی پاشاكان دەگێڕنەوە . بەڵام تەنانەت كچی ماڵە

دەوڵەمەندەکان کە بۆ خۆشاردنەوە لە نیگای ئەم و ئەو چارشێو دەدەن بەسەردا و چوار خزمەتکارەکانیشی لێنەبوو کە سەری ئەسپەکانیان بۆ بگرن . هەروەها هیچ جۆرە خزمەتکارێکیشی لێنەبوو کەوا زێڕ و زیو و لاپەڕەی زێڕاوی وبەردی بریقەداروموٚمی گەورە و ڕازاوەی زەماوەندی پێبێ.

لە شاییەکە لەبەر ئەو دەهۆڵچی و زووڕناچیەی کە زێڕیان بۆخۆشیان نەدەگرت وجارناجار ڕادەوەستان و بێدەنگ دەبوون ، هەروەها لەبەر ئەوەی کە کەسێکیش نەبوو بڵێ : " لاچن ، لاچن ، بووك هات " شایی هاوسەرییەکەمان لە بازاڕەکەدا تێکەڵ بە هەزاران خزمەتکار دەبوو کە وەکوو لافاو هەموو لایەکیان گرتبووە بەر ، هەر لەبەر ئەوەش لە شەرمکردن زیاترخەریکبووچاوەکانم پڕبێ لە فرمێسك و خەمێکی گەورە دایگرتم . لە گەڕانەوەدا کاتێ خەریکبوو بگەینەوە بەر ماڵ ، بەلە خۆ بووردییەکەوە لەسەر ئەسپەکە لایەکم کردەوە و بەرە و دواوە تەماشایەکم کرد، بینیم کەوا لە ژێر جلە سوورەکەی و تارا بوکێنییەکەیدا کە هیچ شایستەی ئەو نەبوو لەبەر ئەوەی کە شاییەکە بێ قەزا و بەلاّ تێپەڕ بوون پێدەکەنی ئەو ساتەش دڵم ئاهۆن بووەوە تۆزێك ئاسوودەتر بووم . بەم شێوەیەش وەکوو ئەوەی وا هەموو زاواکان دەیکەن شەکورەم لەسەر ئەسپەکە دابەزاند و قوڵم کرد بە قوڵیدا ، تۆزێکیتر مارەم دەبڕی . لە دواییدا چنگم کرد بەو کاسە ئاکچەیەدا کەوا لە پێشدا ئامادەم کرد بوو و بەم خۆشییەوە مشت بە مشت دەمپژاند بەسەریدا . ئەو مندالاّنەی لە ماوەی ئەو شاییە خەماوییەدا بە دوامانەوە بوون بۆ بە دەست هێنانی ئاکچەکان شەڕیان دەکرد و ئێمەش چووینە ناو حەوشەکەوە ، کاتێ ڕۆیشتین بە ترسێکەوە هەستمان بە بۆنی لاشەکە کرد .

كاتیٚ خەڵكەكە دانیشتن شەكورەش وەكوو پیاو پیرو ژن و منداڵەكان هەڵسوكەوتی كرد و وای دیار دەكرد كەبۆنی هیچ شتێك نایەت . ( ئورهان لە گۆشەیەكەوە بە دوو دڵییەوە تەماشای منی دەكرد ) گومان دایگرتم : لە مەیدانی شەڕدا چاوم بەو مردووانە كەوتبوو كەوا لاشەكانیان پارچە پارچە كرا بوو ، جلەكانیان دڕا بوو و چەكمەكانیان دەرهێنا بوون دەم و لووتیان بوو بووبە خۆراكی پەلەوەر ، تامی بۆگەنیان هێشتا لە دەممدا مابووەوە ، ئەمەش خەریكبوو كە جەرگەكانم بخنكێنیٚ ، هەر لەبەر ئەوەش بە هەڵەدا نەچوو بوو وم . لە خوارەوە ، لە چێشتخانەكەدا پرسیارم لە خەیرییە كرد و گوتم: " زاوا ئەفەندی لە كوێیە ؟ بۆنی لاشەكەی هەمووماڵەكەی داگرتووە ، هەموو كەسێك تێدەگات . " ئەم قسانەم خۆ لە گوتنیش نەدەچوو بەڵكوو زیاتر لە منگە منگ كردن دەچوو . لە لایەكیتریشەوە عەقڵم چووە سەر ئەوەی كە خەیرییە بۆ یەكەم جار وەكوو خاوەن ماڵێك قسەی دەكرد . ژن بە گریانەوە وتی : " وەكوو دەستوری جەنابتان لە ناو جێگاكەی خۆیدا درێژمان كردووە و جلە كانیمان كردووەتە بەری و لە ژوور سەریشیەوە پەرداخێكی شەربەتمان داناوە ،بۆنەكەش لە بەر گەرمای مەنقەڵی ناو ژوورەكەیەتی . دو دڵۆپ فرمێسكی ڕشتە ناو ئەو قابلەمەیەی كە وا پل پل گۆشتی بەرخی تێدا سوور دەكردەوە . لە پێشدا لە شێوەی گریانەكەیدا تێگەیشتم كاكی زاوا شەوان بردوویەتیە ناوجێگاكەی خۆیەوە، بەڵام لە دوایدا لەوشتەی كە وا بیرم لێكردبووەوە زۆر تەریق بوومەوە . لە گۆشەیەكی چێشتخانەكەدا ئەستەر شتەكەی دەمی قووت دا و هەستایە سەر پیٚ و وتی : " قیمەتی شەكورە بزانە ، دڵخۆشی بكە " دەنگی ئەو عودەی كە وا لە ڕۆژانی یەكەمی هاتنەوەم بۆ ئەستەنبووڵدا گوێم لێبوو بوو

لە دەرونەوە گەیشتەوە گوێم . بەڵام لە دوایشدا ئاهەنگ و موسیقای مارە برینی من و شەکورە لە یەك لە ژوورە تاریکەکەی باوکیدا لە پاڵ جەستە بێگیانەکەی باوکیدا لە دەرونمەوە بەرز بووەوە . خەیرییە لە ماوەیەکی کورت و لە چاو پرتکاندنێکدا هەوا ژوورەکەی گۆڕیبوو چراکەشی لە گۆشەیەکی نور بڕدا شاردبووەوە " زاوا ئەفەندی کە کەس نەیدەزانی نەخۆش نیە و لاشەیەکی بێ گیانە لە کاتی مارە بڕینەکەدا سەر پەرشتی شەکورە بوو ! دەلاکەکەی دۆستم و پیرەمێردە فرەزانەکەی گەڕەکەکەشمان شایەتەکانمان بوون . لە دوای ئامۆژگاری و هیوا داری و داخوازیەکانی مەلا کابرای فرە زان سەری لار کردەوە و لە نەخۆشیەکەی زاوا ئەفەندی کەوتە گومانەوە و سەری نزیك کردەوە ، هەر لەم کاتەدا کە مەلا مارەی بڕی و نەیپڕی یەکسەر هەڕام کرد و دەستی زاوام ماچ کرد و بە هەموو هێزێکمەوە قیراندم و وتم : " هیچ خەمتان نەبێ زاوا ئەفەندی گیان زکی شەکورە و منداڵەکان تێر دەکەم وژێر سەریان بۆ دادەنێم و بۆ ژیانێکی پڕ لە خۆشی و ئاسودەیی هەموو شتێکیان بۆ دەکەم "لە دوایشدا وەکوو ئەوەی کە زاوا ئەفەندی لە کاتی گیاندانا و لە جێگاکەیدا بیەوێ شتێکم پێ بڵێ سەرم لار کردەوە و بردمە بەر دەمی ، وەکوو ئەوەی کە سەعاتی ڕۆیشتنی پیرەمێردەکە هاتبێ کە زۆر ڕێزی لێدەگرین و بیەوێ هەموو ئەزمونەکانی ژیانیم لە دوو قسەدا بۆ بکات بە دیقەتەوە گوێم لێڕادەگرت ، مەلا و کابرای فرەزانیش ئەم کردەوەی منیان لەلا پێ باش بوو.، هیوادارم کە ئیدی کەس من بە تاوانباری مەرگ و کوشتنی زاواکەمان نەزانێت .

بە میوانەکانم گوت ئەم پیرەمێردە فەقیرە دەیەوێت بە تەنیا بمێنێتەوە . لە ساتێکدا هەر کەس ژوورەکەی بە جێهێشت و بۆ خواردنی پلاو و شلەی

قەیسی و گوشتی بەرخ ڕۆیشتنە ژوورەکەی تەنیشتەوە کەوا بۆ پیاوان جیا کرابووە وە . ( منیش ئێستا بۆنی لاشەی مردوو و بۆنی گۆشتی سووروٚ کراوی بەرخ تێکەڵاو دەکەم و دەیخۆم ) . ڕۆیشتمە ناو هەیوانەکەوە و وەکوو ئەوەی کە وا لە ماڵی خۆمدا بم بە بیٚ ئاگایی و وەکوو ئەوەی کە بۆ سەرەخۆشی گوتن بچم ڕۆیشتمە ناو ژوورەکەی خەیرییە ، کاتیٚ دەرگاکەم کردوە ژن و زا ترسی هاتنی پیاوێك دایگرتن، گوێم نەدانیٚ بە شیرنیەوە تەماشای شەکورەم کرد کەوا بە بینینی من لە خۆشیدا چاوانی دەدرەوشانەوە گوتم : " شەکورە !باوکت بانگت دەکات ، مارە برینەکە تەواو بوو دەبیٚ دەستی ماچ بکەی . "

ژن و کچەکانی دەور و بەری شەکورە کە لە دواین کاتەکاندا بۆ زەماوەندەکە دەنگ کرابوون بە پەلە خەریکی داخستنی پەچەکانیان بوون و بۆ مەزەندە کردنی منیش تەماشای منیان دەکرد ، لە دروستی نیگاکانیاندا وامدەزانی کە خزمن و بۆ شاییەکە هاتون . زۆر دواتر کە میوانەکان نان و گوێز و فستق شەکرورێحانیان خواردبەر لە نوێژی ئێوارە بڵاو بوونەوە . لە ژووری ژناندا فرمێسك ڕشتنی شەکورە و بەدخۆیی منداڵەکان و خۆشییەکەی دەرپەڕاند بوو : لە نێو پیاواندا باس لە شەوی یەکەمی کوڕی جیران دەکرا و منیش پێدەکەنیم و لە ناو بێدەنگیەکی خەماوییدار خۆمم ناشتبوو ئەمەشیان وەکوو خەم خواردنی من بۆ خەزوورم شیدەکردەوە . لە نێو ئەم هەموو تەنگە زارییەدا ئەو شتەی لە مێشکمدا بە قووڵاییەنەخشی بەستبوو ، ئەوە بوو کە بەر لە خواردن من و شەکورە بۆ دەست ماچکردن چووینە ناو ژوورەکەی باوکی ، کەچی لە تەنیشت ئەو جەستە بیٚگیانەدا بەڕاستی بە ڕێزەوە ڕاوەستاین و دەستە سارد و

هەڵئاوساوەکەیمان ماچکرد لە دوایشدا ڕۆیشتنە گۆشەیەکی تاریکی ژوورەکەوە و دەستمان بە ماچکردنی یەکتری کرد . کاتێ توانیم زمانە گەرمەکەی ژنەکەم بخەمە ناو دەممەوە زانیم کە تامی ئەو شیرینیەی لێدێت کەوا منداڵەکان دەیانمژن .

## (( من شەکورە )) (34)

لە دوای ئەوەی هەرکەس ڕۆیشت و دواییین میوانەکانی زەماوەندە خەماوییەکە پێڵاوەکانیان کردە پێیان و خۆیان داپۆشی و دەستی منداڵەکانیان دەکێشا کەوا دوا شیرینیەکانی شاییەکەیان دەخستە دەمیانەوە و دەرۆیشتن بێدەنگییەکی دەم درێژ ماڵەکەی گرتە باوەش . هەمووومان لە حەوشەکەدا بووین ، لە دەنگی چۆلەکەیەك زیاتر کەلە سەتڵە نیوەکەی سەر چاڵەکە ئاوی دەخواردەوە هیچ شتێکیتر نەدەبیسرا. تووکە کەمەکەی سەرە بچکۆلانەکەی لەبەر تیشکی ئاگردانەکەوە دیار بوو ، کاتی ئەوەش ون بوو بە ئازارێکەوە هەستم بەوە کرد کە لە نێو ماڵە چۆڵەکەماندا والەگەڵ تاریکایدا باوەشیان کردووە بەیەکدا باوکم بە مردوویی لە جێگاکەدا دریژ کراوەتەوە . وتم: منداڵەکان ( باش دەیانزانی کە دەمەوێ شتێکیان پێڕابگەیەنم ) وەرن بۆ ئێرە بزانم . هاتن .

" ئیتر باوکی ئێوە ڕەشەیە ، دەستی ماچ بکەن " بە هێمنی و بە شەرمەوە دەستیان ماچکرد . بە ڕەشەم گوت : " لەبەر ئەوەی ئەم هەتیوانەی من زۆر بێبەختانە گەورە بوون ، نازانن کە چۆن گوێ لە باوك بگرن و تەماشای نێو چاوانی بکەن و بە قسەکانی بکەن و متمانەی پێ بێنن

لەبەر ئەوەی بیٚڕیٚزیت بەرامبەر دەکەن وەکوو بیٚگانەیەك چاوت لیٚدەکەن ، خاویٚتی و مندالّی دەکەن هەر بۆیە پیٚویستە تۆ ئەمە بە حیسابی بیٚ باوك گەورە بوون و نەبینینی باوکیان بە تیٚر و تەسەری دابنیٚی ،"

شەوکەت گوتی : " من باوکم بە بیر دیٚنمەوە "

: " ششش ... گویٚ بگرە ، لەئیٚستا بەدواوە قسەی ڕەشە لەسەرەوەی قسەی منیشە " ڕووم کردە لای ڕەشە و گوتم : " ئەگەر بیٚڕیٚزیان کرد و گویٚیان لیٚنەگرتی و چەقاوەسوورییان بەرامبەرت کرد یەکەم جار ئاگاداریان بکەوە لە دواییدا لیٚیان ببوورە " ، خەریکبوو بلیٚم لیٚیان بدە کە زمانم پیٚچایەوە و گوتم لیٚیان ببورە " جیٚگای من لەکویٚی دلّتایە دەبیٚ هی ئەوانیش لەویٚدابیٚ "

ڕەشە گوتی : " شەکوورە خان ! من تەنیا لەبەر ئەوەی ببم بە میٚردی تۆ زەماوەندم نەکرد بەلّکوو بۆ ئەوەشە کە ببم بە باوکی ئەم هەتیوانەش "

-: " گویٚتان لیٚبوو کە چیم گوت ؟ " خەیرییە لەولاوە گوتی : " خودایا خۆت بمانپاریٚزی ! یاڕەبی نوری خۆتمان لەسەر کەم مەکەرەوە " وتم : " گویٚتان لیٚبوویان نا ؟ ئافەرین کوڕە جوانەکانم ! بەم خۆشەویستییەی باوکتانەوە ئەگەر لە قسەی باوکتان دەربچن دیسان هەر لیٚتان دەبووریٚ "

ڕەشە گوتی : " دواتریش هەر دەیانبەخشم " گوتم : " بەلاّم ئەگەر جاری سیٚهەم وتی مەکەن و بە قسەیتان نەکرد ... ئەو کاتە ئیدی کوتەکتان هەق کردووە تیٚگەیشتن ؟ باوکی تازەتان کە ڕەشەیە وەکوو ئەو باوکەی‌ترتان کە لەشەڕ نەگەڕاوەتەوە شەڕی زۆری بینیوە زۆر ڕەق و

نەنووشتاوەیە . باپیریان  ئەمانەی چەقاوەسوو کردووە خستووینیە سەر سەری خۆی لەمەو بەدوا باپیرتان زۆر نەخۆشە "

شەوکەت گوتی : " دەمەوێ بچمە لای باپیرم " وتم : " ئەگەر گوێ ڕایەڵ نەبن ڕەشە تێتان دەگەیەنێت کە لێدان لە بەهەشتەوە هاتووە ، جاران ئەگەرباوکم لە دەستی من ڕزگاری دەکردن ئەمجارە ناتوانێ لەدەستی ڕەشە نەجاتتان بدات ئەگەر ناتانەوێ باوکتان تووڕە ببێت پێکەوە ئاژاوە مەکەن ، لەهەموو شتێکدا بەشی یەك بدەن و درۆ مەکەن ، دوعا بکەن وسەعیەکانتان بکەن ، قسەی خراپ بەخەیرییە نالێن و گاڵتەشی پێناکەن ... تێگەیشتن ؟ " ڕەشە خۆی دانەواند و لە پەلامارێکدا ئورهانی گرتە باوەش بەڵام شەوکەت خۆی دوور کردەوە ،ویستم کە باوەشی پێدا بکەم و بیگرم ، هەتیوە بێچارە خەمبارەکەم ! شەوکەتە بێچارە بێکەسەکەم ! لەم دونیا گەورەیەدا چەندە تەنیای ! خۆمم بە قەدەر بچووکایی و تەنیایی شەوکەت هەستکرد ، بێچارەییەکەی خۆم و شەوکەتم  لەگەڵ یەکدا بەراوەرد کرد و لەرزەیەك هات بە گیانمدا . چونکە لەگەڵ یاد کردنەوەی منداڵیمدا ئەوەم بەبیر هاتەوە کە منیش وەکوو ئورهان دەچوومە باوەشی باوکم . بەڵام وەکوو ئەوە وا نەبووم کە لە میوەیەك بچم وا هێشتا ڕقی لە دارەکەی دەبێتەوە ، بەڵکووبە دڵخۆشییەوە لە باوەشیدا دادەنیشتم و وەکوو سەگ بۆنی لاشەی یەکتریمان دەکرد . ئەگەر تۆزێکیتری پێبچووبایە دەگریام ، بەڵام خۆمم ڕاگرت و بەبێ ئەوەی کە لە عەقڵمدا بێت گوتم : " دەی بە ڕەشە بڵێن ( بابە ) با بزانم! " چەندە سارد بوو ئەم شەو، حەوشەکەمان چەندە بێدەنگ بوو ! سەگەکان لە دوورەوە بە خەم و ئازارەوە دەیانوەڕاند . تۆزێکیتر تێپەڕ بوو تاریکایی و بێدەنگی وەکوو گوڵێك بەبێ ئاگادار

کردنەوە کرایەوە و بڵاو بووەوە ، زۆر دواتر گوتم : " باشە منداڵەکان ! بابڕۆینە ژوورەوە لێرەدا هەموومان سەرما دەگرین . " تەنیا من و ڕەشە نەبووین کە لە تەنیا مانەوەی بووك و زاوا دەترساین بەڵکوو خەیرییە و منداڵەکانیش دەترسان ، هەموومان وەکوو ئەوەی کە لە تاریکاییدا بچینە ناو ماڵێکیترەوە ئاوەها بەپێ دزەوە چووینەناو . لە ناوەوە بۆنی لاشەکەی باوکم دەهات بەڵام وا دیار نەبوو کە کەسێك هەستی بەمە کردبێ .

بە بێدەنگییەکەوە لە پلیکانەکانەوە سەرکەوتین ، لەبەر ڕۆشنایی چراکانی دەستمان سێبەرەکەمان دەکەوتە سەر دیوارەکان ، هەموو تێکەڵای یەك دەبوون ، یەك دەچێ یەك بچووك دەبێتەوە ، وامدەزانی ئەمە جاری یەکەمە کەوای لێدێ . لە ژوورەوە لە هەیوانەکەدا کاتێ پێڵاوەکانم دەرهێنا ، شەوکەت گوتی : "بەرلە خەوتن دەستی باپیرم ماچ بکەم؟" خەیرییە گوتی : " من تۆزێك بەر لە ئێستا تەماشام کرد ئازاری زۆری هەیە جندۆکەکان لە دەروونیدا جێگای خۆیان گرتووە و ئاگری نەخۆشییەکەی هەموو جێگایەکی گرتووە ، بچنە ناو ژوورەکەوە با جێگاتان بۆ ڕاخەم . " برد بوونیە ژووریشەوە ، کاتێ جێگاکەی ڕادەخست و ڕووپۆشەکانی دەکردەوە و لێفەکانی پان دەکردەوە و دەستی دەدا بە هەرشتێکەوە وەها قسەی دەکرد کە شتێکی دەرئاساییە و شەوێك لێرەدا لەناو ژوورە نیوە گەرمەدا و لە نێوان ئەم لێفەتووکەچۆلەکەیینانەدا خەوتن وەکوو ئەوە وایە کە لە ناو کۆشکی پادشایەکدا بخەوی . ئۆرهان لەسەر کاسەکەی خۆیدا دانیشتبوو ، وتی : " خەیرییە چیرۆکێکمان بۆ بگێڕەوە . "

خەیرییە گوتی : " کاتی خۆی پیاوێکی شین هەبوو ، لەلایەکیتریشەوە جندۆکەیەك هەبوو کە دۆستی گیانی بە گیانی ئەم پیاوە بوو . " ئورهان گوتی : " پیاوەکە بۆچی شین بووە ؟ "

وتم : " لەبەر خودا ، هیچ نەبێ ئەمشەو چیرۆکێکی جندۆکەدار و پەریدار و تارماییداریان بۆمەگێڕەوە . "

شەوکەت گوتی : " بۆچی نەیگێڕێتەوە ؟ دایە تۆ چاوەڕێ ئەبی ئێمە بخەوین و خۆت خۆت بچی بۆلای باپیرم . "

-: " باپیرتان خودا بیپارێزێ ، زۆر نەخۆشە ، بۆسەردان دەچم بۆلای بەڵام دیسان دەگەڕێمەوە بۆ جێگاکەم . "

شەوکەت گوتی : " باخەیرییە بچێت ، مەگەر شەوان ئاگاداری لە باپیرم ناکا؟ " خەیرییە بە ئورهانی  گوت : " تەواو بوو ؟ " بێ ئاگاییەکی شیرین ڕوومەتی داگرتبوو قونی ئورهانی پاك کردەوە و تەماشایی کاسەکەی کرد وا بزانم زیاتر لەوەی کەلەبەر بۆنەکەی بێت لەبەر ئەوەی کە کەمی کردووە ناوچاوانی دابەیەکدا . وتم : " خەیرییە کاسەکە والاکە و بیهێنەوە باوەکوو شەوکەت شەو نەچێتە دەرەوە. " شەوکەت گوتی : " بۆچی شەو نەچمە دەرەوە ؟ بۆچی خەیرییە چیرۆکی جندۆکەدار و پەریدارمان بۆ ناگێرێتەوە ؟ " ئورهان لە ترس زیاتر ، لەبەر ئەوەی کە هەمیشە لەدوای گو کردن وای لێدەهات ، بە خۆشبینییەکی گێلانەوە گوتی : " چونکە لە ماڵەکەدا جندۆکە هەیە ، گەمژە ! "

-" دایە ، هەیە ؟ "

- : " ئەگەر لەژوورەکە دەرکەون و بلێن کە سەردانی باپیرمان دەکەین جندۆکەکە دەتاندۆزێتەوە ."

شەوكەت گوتی : " ئەی ڕەشە لەكویٚ دەخەویٚ ؟ لەكویٚ جیٚگاكەی ڕادەخا ؟ "

– : " نازانم ، خەیرییە جیٚگای بۆ ڕادەخا . "

– : " دایە تۆ دیسان لەگەڵ ئیٚمەدا دەخەوی ؟ "

–:" چەند جار پیٚتان بڵیٚم ؟ وەكوو جاران لەلای ئیٚوە دەخەوم "

- " هەمیشە ؟ "

خەیرییە بە كاسەكەی دەستیەوە دەركەوت . ئەو ویٚنەیەی وا دزە بكوژەكە بردبووی نۆ ویٚنەیتریشی لەگەڵدا بوو بەڵام ئەوانەی نەبرد بوو ڕۆیشتم و لەو جیٚگایەی كە شاردبوومەوە هیٚنام بۆ ئەوەی كە لە نهیٚنیەكانی تیٚبگەم . زۆر تەماشام كردن ئەوەندە جوانن كە كاتیٚ مرۆڤ تەماشایان دەكات وادەزانی ئەمە بیرەوەریەكانی خودی مرۆڤە ، كە زیاتر تەماشایان دەكات وەكوو ئەوە وایە كە ویٚنەكان وەكوو نووسراوە لەگەڵ مرۆڤدا قسە دەكەن . كە تەماشای ویٚنەكانم دەكرد لە خۆم بیٚئاگا بوو بووم ، لەگەڵ مندا ئورهانیش سەری لە سوورایيە سەیرەكەی من سووڕما بوو ، ئەمەم لەكاتیٚكدا زانی كە سەری هیٚنابووە لای لووتم . جاریٚك ویستم مەمكەكانم دەربیٚنم و بیخەمە دەمی بۆ ئەوەی بیمژیٚ . لە دواییدا كە لە ویٚنەی مەرگەكەی ڕوو بە ڕووم ترسا و هەناسەیەكی هەڵكیٚشا ویستم بیخۆم. "دەتخۆم ، ئەزانی؟" وتی دایە ختوكەم بدە و خۆی خستە ئەو لاوە . قیڕاندم و گوتم:"هەستە لەویٚ! هەستە حەیوان!" چونكە خۆی خستبووە سەر ویٚنەكانەوە، وینەكان هیچیان لیٚنەهاتبووتەنیا ویٚنەی ئەسپەكە نەبیٚ كە لەسەرەوە تۆزیٚك لۆچ بوو بوو، بەڵام كەس پیٚیدەزانی و دیار نەبوو. خەیرییە بە كاسەكەی دەستیەوە گەڕایەوە ، ویٚنەكانم كۆ كردەوە و

خەریکبوو دەرکەوم کە شەوکەت بە حەپەساوی و هەڵچوونەوە گوتی : "بۆ کویێ دەچی دایە ؟ "

" دەگەڕێمەوە ." لە هەیوانەکەوە تێپەڕ بووم ، وەکوو سەهۆڵ وابوو . وێنەکانم خستە سەر میزەکەی سەر دۆشەکەکەی ئەو گۆشەیەکی کەوا ڕەشە چوار ڕۆژی تەواو لەوێدا دادەنیشت و لەگەڵ باوکمدا باسی وێنە و نەخش و ڕێنووێنییەکانیان دەکرد و باوکیشم لەسەر دۆشەکەکەی خۆی لەبەرامبەریدا دادەنیشت . لەناکاو لەبەر تیشکی مۆمەکە ڕەنگێك ژوورەکەی گرتەوە تیشکێك یان وەکوو گەرماییەك و گیانلەبەرێکی خێل بوو ! وەکوو ئەوە وابوو کە شتێك لەناکاو کەوتبێتە جووڵە جووڵ . بە بێدەنگی و بە ڕێزەوە بەبێ ئەوەی کە هیچ بجوڵێمەوە ماوەیەکی درێژ تەماشای وێنەکانم کرد ئەگەر تۆزێك بجووڵاباینەوە ئەو هەوایەی کە بۆنی لاشە بێگیانەکەی لە ژوورەکەیترەوە دەهێنا ، تیشکی مۆمەکەی دەجووڵاندەوە و بەو جۆرەش ئێمەش واماندەزانی کە وێنەکانی باوکم دەجووڵێتەوە لەبەر ئەوەی وێنەکان بوو بوون بە هۆی کوژرانی باوکم لە پێش چاوم گەورە بوو بوون . نازانم لەبەر سەیر و سەمەرەیی ئەسپەکە بوو یان وەکوو لەبەر بێ وێنەیی سوورەکە و خەماوی بوونی درەختەکە و مەینەتی عەودالە بوو کەوا دەستی سێحرم لێکەوتبوو یان وەکوو لە بکوژەکە دەترسام کە باوکم و لەوانەیە کەسیتریشی لەبەر ئەوانەکوشتبێ . ماوەیەکی دواتر من و ڕەشە تێگەیشتین بێدەنگییەکەمان بەو ئەندازەیەی کەوا لە وێنەکانەوە دێت ئەوەندەش لە تەنیا مانەوە لە ژوورێکەوە دێت هەر بۆیە هەردووکمان ویستمان قسە بکەین . وتم : " بەیانی کە لە خەو هەستاین پێویستە هەرکەس بزانێت کە باوکە بێچارەکەم لە خەودا مردووە و عومری خودای کردووە . " چەندە قسەکەشم

ڕاست بێت بەڵام وادیار بوو کەلە دڵەوە نیە . ڕەشەش بەو بەزمەوە لەگەڵ ئەوەی کە ڕاستی دەگوت بەبێئەوەی کە بڕوای پێبکات گوتی : " بەیانی هەر شتێك باش دەبێت . " ئەگەر بچووکترین جووڵەیەکی بۆ نزیکبوونەوە لە من بکردایە باش دەبوو چونکە دەمویست کەوا باوەشی پێدا بکەم وەکوو چۆن سەری منداڵەکان دەگرم لەنێوان هەردوو دەستمدا سەری بگرم . هەر لەو کاتەدا دەنگی کرانەوەی ژوورەکەی باوکمم بیست ، بەترسەوە ڕاپەڕیم و ڕۆیشتم دەرگاکەم کردەوە و سەیرم کرد . تەماشای ئەو تیشکەم کرد کەوا خۆی لە هەیوانەکەوە دەدزییەوە و بینیم کە ژوورەکەی باوکم بە نیوە کراوەیی ماوەتەوە ، لەرزێك هەموو گیانمی داگرت ، هەیوانەکە وەکوو سەهۆڵ سارد بوو ، ژوورەکەی باوکم لەبەر گەرمای مەنقەڵەکە هێشتا بۆنی لێوە دەهات ، شەوکەت هاتبوو بۆ ئێرە یان وەکوو کەسیتر هاتبوو ؟ لەبەر تیشکی مەنقەڵەکەدا باوکم بە جلی خەو وبە نووستوویییەوە بە حاڵ دیار بوو یەکسەر ئەوەم هاتەوە یاد کەوا لەو شەوانەی وا ( کتاب الروح ) م بۆ دەخوێندەوە دەمگوت : " شەوت باش بێت بابە گیان " و ئەگەر پەرداخێك ئاویشم پێبدایە ئەو دیگوت : " ئاو پێدەرت زۆربێ کچە جوانەکەم " و وەکوو کاتی منداڵیم ماچێکی گۆنامی دەکرد و لە نێزیکەوە تەماشای نێو چاوانمی دەکرد . تەماشای ڕوخسارە ترسێنەرەکەی باوکمم کرد و ترسام . لەلایەکەوە نەمدەویست کە تەماشای ڕوومەتی بکەم لەلایەکیتریشەوە بە هاندانی شەیتان دەمویست کە بزانم ڕوومەتی چەندە ترسێنەر کراوە . بە ترسە ترسێکەوە گەڕامەوە ژوورە بە شێن ڕاخراوەکە ، ڕەشە پەلاماری دام ، پاڵێکم پێوەنا . بەڵام لە تووڕەییدا نەمدەزانی چیدەکەم و لەبەر لەرزەلەرزی تیشکی مۆمەکەدا خۆماندا بەیەکدا وەکوو ئەوەی کە ئاژاوە بکەین و زۆران

بگرین چنگماندا . حەزمان لەوە دەکرد کە خۆمان لەیەك بدەین و دەستی یەك بگرین و دەست لەسینە و بەرۆکی یەك بەند بکەین . تێکەڵاو بوونیمێشکی منیش وەکوو ئەوە وایە وا نیزامی لە داستانی خەسرەوشیریندا باسی دەکات . وەکوو شیرین گوتم : " گۆناکانم ماچ مەکە ! مەیانڕووکێنە ، مەکە! "بەڵام ئایا ڕەشە کە ئەوەندە نیزامی خوێندۆەتەوە لەوە تێگەیشتبوو کە هەر لەدوای ئەوە گوتم بیکە ؟

وتم : " تاوەکوو ئەو شەیتانە نەدۆزیتەوە و ئەوە دەرنەکەوێت کە بکوژەکەی باوکم کێیە لەگەڵ تۆدا لەیەك جێگادا ناخەوم . " کاتیٚ لەوێوە بەهەڕا کردن دەرکەوتم شەرمێك تەواوی گیانمی داگرتەوە . چونکە وەها بە قیڕەوە قسەم کرد بوو کە ویستبووم خەیرییە و منداڵەکانیش قسەکانم ببیسن . لەوەش زیاتر دەمەویست تەرمەکەی باوکە بێچارەکەم و مێردەکەم کەوا کەس نازانێت لەژێری کام خۆڵدا پوتورکاوە گویٚ بیستی ئەمە بن . کاتیٚ ڕۆیشتمەوە لای منداڵەکان ئورهان گوتی : " دایە ! شەوکەت هاتە نێو هەیوانەکەوە"

وتم : " دەرکەوتی ؟ و دەستم بۆ لێدانی هەڵبڕی .

شەوکەت وتی : " خەیرییە " و باوەشی پێدا کرد . خەیرییە وتی : " دەرنەکەوت هەر لە ژوورەکەدا بوو . " بۆ ساتێك لەرز دایگرتم و نەمتوانی تەماشای نێو چاوانی بکەم . یەکسەر ئەوەم بە مێشکدا هات کە دوای ڕاگەیاندنی مەرگی باوکم منداڵەکان دەزانن کەوا ناتوانن خۆیان لە تووڕەییەکانی من بپارێزن و هەر بۆ ئەوەش خۆیان دەخەنە پشتی خەیرییە و نهێنییەکانمانی بۆ باس دەکەن و ئەویش لەو هەلە کەڵك وەردەگریٚ حوکممان بەسەردا دەکات و کوشتنی باوکم دەخاتە سەرمن و سەرپەرشتی

منداڵەكان دەدا بە حەسەن ، بەڵێ ! وەها دەكات ! هەموو ئەم بێعارییانەی لەبەر ئەوەیە كەوا ڕۆیشتۆتە ناو جێگاكەی باوكمەوە . ئیدی هیچ شتێكتان لێناشارمەوە بەراستی وەهای دەكرد . بەشیرینیە بزەیەكم بۆ لێدا و شەوكەتم گرتە باوشمەوە و ماچمكرد .

ئورهان گوتی : " دایە دەڵێم كە شەوكەت چووەتە ناو هەیوانەكەوە ! "

وتم : " بچنە ناو جێگاكەتان و منیش بخەنە بەینی خۆتان تاوەكوو باسی چیرۆكی چەقەڵە بێكەڵك و جندۆكە بێڕەوشتتان بۆ بگێرمەوە." شەوكەت گوتی : " بەڵام دایە ! تۆ بە خەیرییەت گوت كە چیرۆكی جندۆكەدارمان بۆ نەگێڕێتەوە بۆ چی ئەو ناتوانێت ئەمشەو باسی ئەوەمان بۆ بكات ؟ "

ئورهان گوتی : " لە شاری بێكەسانیشەوە تێپەڕ دەبن ؟ "

وتم : " تێپەڕ دەبن ! لەو شارەدا هیچ منداڵێك دایك و باوكی نیە ، خەیرییە تۆ بچوو جارێكیتر تەماشای دەرگاكان بكە ئێمە لە نیوەی چیرۆكەكەدا خەومان لێدەكەوێ . "

ئورهان گوتی : " من ناخەوم . "

شەوكەت وتی : " ڕەشە ئەمشەو لە كوێ دەخەوێ ؟ "

وتم : " لە ژووری نەخشكێشاندا ، دەی زووبن باوەشم پێدا بكەن تاوەكوو لەژێر لێفەكەدا گەرم ببنەوە ئەم پێساردە هی كامتانە ؟ "

شەوكەت گوتی : " هی منە ، ئەی خەیرییە لەكوێ دەخەوێ ؟ " تۆزێك دوای ئەوە كە باسی چیرۆكەكەم كرد ئورهان وەكوو هەموو جارێك خەوی لێكەوت ، دەنگی خۆمم بڕی . شەوكەت گوتی : " دایە ! كە منیش خەوم لێكەوت جێگاكە بەجێ ناهێڵی؟"

: " نا ، بە جێتان ناهێلم . " لەراستیشدا نیەتێکی وەهام نەبوو ، بیرم لەوە دەکردەوە کە چەندە خۆشە لە یەکەم شەوی دووهەمین ژیانی هاوسەریمدا لە باوەشی منداڵەکانمدا خەوتووم . سەرەڕای ئەوەی کە مێردێکی قۆز و بە مێشك و بە ویستیشم هەیە و لە ژوورەکەیتردایە بەم بیرانەوە خەوم لێکەوتبوو ، بەڵام خەوەکەم ڕووی ئاسوودەیی نەبوو . لە دواییدا ئەوەم بەبیر هێنایەوە کە لە دونیابێ‌خەیرە نائاسوودەکەی نێوان خەووخەیاڵ و هۆشیاریدا لەپێشدا لەگەڵ ڕۆحی تووڕەی باوکمدا دوایین حیسابەکانی خۆمانمان ڕێك و پێك کرد لە دوایشدا لەدەست تارمایی ئەو بکوژە هەڕام دەکرد کەوا دەیەویست منیش بنێرێ بۆلای ئەورۆحە . بەڵام ئەمەیان لە ڕۆحی باوکم ترسێنەرتر بوو و وازیشی لێنەدەهێنام و هەندێك تەقەڕەقیشی دەکرد . لەخەوەکەمدا ئاگری بەردایە ماڵەکەمان ، دای لە پەنجەرە و دەرگاکە و بەردێکیشی فڕێ دایە سەربان ، تەنانەت وەهام بۆ دەهات کە بە زۆر خەریکی کردنەوەی دەرگاکەیە لەدواییدا ئەم ڕۆحە پیسە کە ناتوانم بڵێم لە چ گیانلەبەرێك دەچوو دەستی بە لوورەلوور کرد یان وەکوو لە ناڵە ناڵێکی خەماوی دەچوو. ئیدی هەرلەدوای ئەوە دڵم کەوتبووە ترپەترپ و توندتر لێی دەدا. کاتێ لە خەو هەستام ئارەقەیەکی زۆرم کرد بوو ، ئایا بەراستی ئەو دەنگە سەیرەم لە خەودا بیستبوویان وەکوو لە ماڵەوە دەهات و من بەو دەنگە لە خەوهەستاوم ؟ لەبەر ئەوەی لەمە تێنەگەیشتم باوەشم کرد بە منداڵەکانمدا و چاوەڕێ مامەوە . خەریکبوو بڕوا بکەم کە ئەو دەنگە دەنگەم لە خەودا بیستووە کە ناڵە ناڵەکە دیسان دەستی پێکردەوە ، هەرلەم کاتەدا تێگەیشتم کە شتێکی گەورە بە دەنگە دەنگەوە کەوتە ناو حەوشەکە . ئەمەش بەرد بوو ؟ زاورم تۆقی . بەڵام

یەکسەر لەمە خراپتریش ڕوویدا دەنگی جیڕەجیڕێکم لە ماڵەوە بەر گوێ کەوت . خەیرییە لە کوێ بوو ؟ ، ڕەشە لەکام ژووردا نووستبوو ؟ تەرمی باوکە بێچارەکەم چۆن بوو ؟ خودایا خۆت بمانپارێزە ! منداڵەکان پرخەیان لێوە دەهات . ئەگەر بەرلە زەماوەندەکە بایە وەکوو پیاوی ماڵ هەڵدەستام و بۆ ئەوەی کە بە سەر دۆخەکەدا زاڵ ببم خۆمم ئامادەی ڕوو بە ڕوو بوونەوە لەگەڵ جندۆکەکاندا دەکرد و ترسەکانی خۆمم دەشکاند بەڵام ئێستا بەر چاوم مژاوییە . دیسان باوەشم کرد بە منداڵەکاندا . دەتگوت کە کەس لە دونیادا نەماوە ، کەس نەیدەتوانی یارمەتی من و منداڵەکانم بدات . چاوەڕێی خراپەیەکم دەکرد و دەستم بە دوعا کردن بۆخودا کرد . وەکوو ئەوەی نێو خەونەکانم تەنیا بووم. گوێم لە کرانەوەی دەرگای حەوشەکە بوو ، ئەوە دەرگای حەوشەکە نەبوو ؟ بەڵێ . لەناکاو خۆشم نەمزانی کە چی دەکەم ڕاپەڕیم و کراسەکەم کردە بەر و ڕۆیشتم لەسەر پلیکانەکانەوە بە هێواشی گوتم ڕەشە ! شتێکم کردبووە پێم و لە پلیکانەکانەوە دەرۆیشتمە خوارەوە هەر کە لەبەر دەلاّنی هەیوانەکە دەرکەوتم ئەو مۆمەی کەوا لە چاو پرتکاندنێکدا لە مەنقەڵیهەیوانەکە دامگیرساند بوو کوژرایەوە . بایەکی توند هەڵی کرد بوو بەڵام ئاسمان ساف بوو . کاتێ چاوم کرایەوە بینیم کە ( مانگی نیوە ) بە پیاو چاکی خۆی حەوشەکەی ڕووناك کردبووەوە ، زۆر سارد بوو بەلەرزەلەرز لەوێدا مامەوە ، بۆچی چەقۆیەکم لەگەڵ خۆدا نەهێنا بوو ؟ تەنانەت مۆمدانێك یا خود لەتە تەختەیەکیشم پێنەبوو . لە تاریکاییەکەدا بۆ ساتێك چاوم بە جووڵانەوەی دەرگاکە لە خۆیەوە کەوت . دواتریش گوێم لە جیڕەی دەرگاکە بوو، وەکوو ئەوی کە لە خەودا بیر بکەمەوە وەهام هاتەوە یاد . عەقڵم لەسەر خۆی بوو بەڵام وامدەزانی لە

حەوشەکەدا ڕێدەکەم . لە ناوەوەی ماڵیشەوە دەنگێکم بیست وەها تێگەیشتم کە ڕۆحی باوکە بێچارەکەم بە ئاسانی لە جەستەی دەرناچێ و زەحمەتی دەکێشێ . کاتێ وەها بیرم کردەوە کە ڕۆحی باوکم سزا دەکێشێ لەلایەکەوە بەزەیی ناو قوڕگمی گرتەوە لەلایەکیتریشەوە دەروونم ئاسوودە بوو و خۆمم ڕاگرت ،ئەگەر ئەم هەموو ترپە ترپە هی باوکم بێ هیچ زیانێك بە من ناگات . بەڵام لە هەمان کاتیشدا کە وامزانی ڕۆحی باوکم بۆ دەرکەوتن لە جەستەی ئازار دەکێشێ ئەوەندە ناڕەحەت بووم کە دوعام کرد خودا یارمەتی ڕۆحی باوکم بدات بۆ دەرکەوتن لە جەستەی . کاتێ بیرم لەوە دەکردەوە لە ڕۆحی باوکم من و منداڵەکانیشم دەپارێزێ دڵم ئاهۆن بووەوە . ئەگەر عیفریتەیەك لەودیو دەرگاکەوە دەیەوێ خراپەیەك بکات با لە ڕۆحە نائاسوودەکەی باوکم بترسێ . هەر لەو کاتەدا خەمی ئەوەم دەخوارد کە نەکائەمە ڕەشە بێت کە بووبێ بە هۆی نائارامبوونی ڕۆحی باوکم . ئایا باوکم دەیەوێ دەرهەق بە ڕەشە خراپە بکات ؟ ڕەشە لەکوێ بوو ؟ هەر لەو کاتەدا تۆزێك لەولای دەرگاکەوە چاوم بە ڕەشە کەوت کە لە کۆڵانەکەدا لەگەڵ یەکێکدا قسەی دەکرد ، ڕاوەستام . هەستم بەوە کرد کە یەکێك لەولای ڕێگاکەوە لە باخچەکەوە قسەی بۆدەکات . وەکوو چۆن زانیم کە ناڵە ناڵەکەی تۆزێك بەرلە ئێستا هی خاوەنی ئەم دەنگە بووە یەکسەر زانیم کە ئەوەش قسەدەکات حەسەنە . جۆرە گریان و پاڕانەوەیەك لە دەنگیدا دیار بوو بەڵام لایەنی هەڕەشە کردنەکەشی لێکەم نەبوو . لە دوورەوە گوێم لێیان بوو ، لە ناو بێدەنگی شەودا خەریکی پاککردنەوەی حیسابەکانیان بوون . هەر لەو کاتەدا تێگەیشتم کە لەم ژیانەدا من و منداڵەکانم تەنیا ماوینەتەوە . وامدەزانی کە حەز لە ڕەشە دەکەم بەڵام ئەوەی ڕاستی بێت تەنیا

دەمەویست حەزی لێبکەم چوونکە لە دەنگە خەماوییەکەی حەسەن و لە ئازارەکانیدا هەستم بە شتێك کرد بوو کە دڵم داخ دەکات . دەیگوت : " بەیانی قازی و یەنیچەری و شایەتیش دەهێنم و ئەوە دەسەلمێنم کە کاکم هێشتا ماوە و لە وڵاتی عەجەمەکاندا خەریکی شەڕە . " ڕەشە گوتی : " شەکورە ژنی تۆ نیە ژنی کاکی خوالێخۆشبووت بوو . " حەسەن بە متمانەییەوە گوتی : " کاکم سەلامەتە و هێشتا نەمردووە شایەت هەن کە ئەمەیان بینیوە . "

رەشە گوتی : " ئەم بەیانییە قازی ئوسکودار لەبەر ئەوەی مێردەکەی چوار ساڵ نەگەڕاوەتەوە شەکورەی جیا کردەوە ئەگەر سەلامەتە با شایەتەکان ئەوەی پیٚبلێن کەلە شەکورە جیا بووەتەوە . " حەسەن گوتی : " ئەگەر مانگێك تێپەڕنەبیٚ شەکورە ناتوانیٚ دووبارە شوو بکات ، ئەمە دژی دین و قورئانی کەریمە باوکی شەکورە چۆن ڕیسواییەکەی بەمجۆرە قەبووڵ دەکات . "

رەشە وتی : " زاوا ئەفەندی نەخۆشە و لە کاتی گیاندانایە و خۆیشی بەم زەماوەندە ڕازی بووە . " -: " پیێکەوە ژەهرتان داوە بە زاوا ئەفەندی ؟ یان وەکوو لەگەڵ خەیرییەدا ئەم کارەتان سەر خستووە؟"

ڕەشە گوتی : "خەزوورم لەبەرامبەر کردەوەکانت دەرهەق بە شەکورە زۆر نارەحەت بووە ئەگەر کاکیشت سەلامەتبیٚ ئەتوانیٚ حیسابی ئەوەت لێپرسێتەوە"

حەسەن گوتی : " ئەمانە هەمووی درۆیە شتانێکن کە شەکورە بۆ ئەوەی بتوانیٚ لە ماڵ هەڕا بکات دەری خستوون . "

لە نێو ماڵەوە دەنگی قیژەیەك هات ! خەیرییە بوو ، لە دواییدا شەوکەتیش قیڕاندی ، قیڕەیان کرد بەسەر یەکدا . بتەویٚ و نەتەویٚ منیش لە ترساندا قیژاندم و بە بێیەویٚ کە بزانم چیدەکەم بەرە و ماڵ هەڕام کرد . شەوکەت لە پلیکانەکەوە بە هەڕا کردن هاتە خوارەوە و گوتی : " باپیرم وەکوو سەهۆڵە ، باپیرم مردووە . " باوەشمان کرد بەیەکدا وگرتمە باوەشمەوە ، خەیرییە هێشتا دەیقیژاند ئەمجارە شەوکەت گوتی : " دایە ! خۆ تۆ ئێمەت بەجیٚنەدەهێشت ؟ ! " و دەستی بە گریان کرد عەقڵم لەلای ڕەشە بوو کە لەلای دەرگای حەوشەکەدا ڕاوەستا بوو . لەبەر ئەوەی مێشکی لەلای حەسەنەوە بوو نەیدەتوانی دەرگاکە دابخاتەوە . گۆنای شەوکەتم ماچکرد ، باوەشم پێدا کردو بۆنی ملیم کرد و ئاهۆنم کردەوە و دام بە باوەشی خەیرییەوە و بە هێواشی گوتم ئێوە هەردووکتان بچنە ژوورەوە . ڕۆیشتنە ژوورەوە ، منیش گەڕامەوە بۆلای دەرگای حەوشەکە . وامدەزانی کە ئەگەر چەند هەنگاوێك لەملای دەرگای حەوشەکەوە ڕاوەستم حەسەن نامبینیٚ. جیگاکەی لەوبەرەوە لەلای باخچە تاریکەکەدا گۆڕیبوو یان وەکوو ڕۆیشتبووە پشتی دارەکەی لای کۆڵانەکە ؟ بەڵام چاوی بە من دەکەوت و کاتیٚ قسەی دەکرد ڕووی قسەکانی لە منیش دەکرد . ئەو شتەی کە منی تووڕە دەکرد ئەوە نەبووکە یەکێك قسەم لەگەڵدا دەکات و نایبینم ، بەڵکوو ئەوە بوو کە هەرچی تاوانباری دەکردین لە ڕاستیدا منیش هەقم پێدەدا و وەکوو چۆن باوکم دەیگوت و هەمیشە تاوانباری دەکردم تێگەیشتم کە بەراستی تاوانم هەیە و لەوە زیاتریش زانیم کە عاشقی ئەم پیاوەم کەوا ئەم قسانە دەکات و هەرئەوە شە کەتووڕەم دەکات . خودایا خۆت یارمەتیم بدە ! عەشق سزا کێشانێکی لە خۆڕایی نیە ، مەگەر ڕێگای

گەیشتن بە تۆ نیە ؟ حەسن گوتی کە من و ڕەشە بووین بە یەك و باوکمان کووشتووە ، هەر وەها وتیشی کە قسەی منالّەکانی بیستووە و لە ڕاستیدا هەر شتێك وەکوو ڕۆژ ڕوون و ئاشکرا بووەتەوە . بە قسەی خۆی بەیانی هەموو شتێکی بۆ قازی دەگێڕایەوە ، ئەگەر من تاوانبار نەبایەم دەستم بە خوێنی باوکم سور نەبایە تاوەکوو گەڕانەوەی کاکی باوکایەتی بۆ من و منداڵەکانم دەکرد بەڵام ئەگەر من تاوانبار بایەم و زۆر بیٚبەزەییانە حاشام لە مێردەکەم بکردبایە کەوا لە شەڕدا گیان دەدا ئەوا هەر جۆرە سزایەکم هەق دەکرد . کە ئەمانەمان لە پشتی دارەکەوە بە لێبووردەییەوە گویٚ لێبوو، بۆ ماوەیەك بێدەنگ ماینەوە .

حەسەن ئەمجارە بە شێوازێکیترەوە گوتی : " شەکووره ! ئەگەر ئێستا بە دڵی خۆت بگەڕێیتەوە بۆ ماڵی مێردەکەت و دەستی منداڵەکانت بگریت و بەبیٚ ئەوەی کە کەس بتهێنیٚ خۆت بگەڕێیتەوە منیش باسی ئەم زەماوەندە دروستکراوە ناکەم و تاوانەکانیشتان لەلای کەس باس ناکەم و لێتان دەبوورم و بەیەکەوە ساڵانێکیتر چاوەڕوانی گەڕانەوەی کاکم دەکەینەوە . " ئەمە سەرخۆش بوو ؟ خەمم بۆ ئەوە دەخوارد کە نەکا ئەو شتەی وا لەپێش چاوی شووەکەمدا بەمنی دەڵیٚ ببیٚ بە هۆی کوژرانی . لەنێو دارەکانەوە بانگی کرد و گوتی : " تێدەگەی ؟ " لە نێو تاریکاییەکەدا نەمدەزانی کە بە تەواوی لە کوێدایە. خودایا یارمەتی ئێمە و هەموو عەبدە تاوانبارەکانت بدە!

وتی : " شەکورە ! دەزانم تۆ ناتوانیلەگەڵ پیاوێکدا لەژێر بانیماڵێکدا بژیت کەوا باوکتی کوشتووە." بۆ ساتێك ئەوە هات بە عەقڵمدا کە لەوانەیە ئەو باوکمی کوشتبیٚ و ئێستا پێمان ڕادەبوێریٚ . ئەم حەسەنە شەیتان بوو

، لەوانەیە کە واش نەبێ . ڕەشە ڕووی کردە تاریکاییەکە و وتی : " حەسەن ئەفەندی گوێ ڕاگرە : ڕاستە کە خەزوورم مردووە بەڵام ناپیاوێك کوشتوویەتی . "

حەسەن گوتی : " بەرلە زەماوەند کوشتوویانە وانیە ؟ لەبەر ئەوەی دژی ئەم زەماوەندە بووە و ئەو جیا بوونەوەی پێ نادروست بووە و دژی شایەتی درۆینە بووە کوشتووتانە . ئەگەر ڕەشەی بە پیاو بزانیبایە ساڵانێك بەرلە ئێستا کچەکەی خۆی پێدەدا . " لەبەر ئەوەی ساڵانێك لەگەڵ من و ڕەحمەتی مێردەکەمدا ژیاوە ڕابردووی ژیانی هەموومان دەزانێ لەوەش زیاتر قسەکانی من و مێردەکەم و بیرەوەریەکانمانی دەزانی ، لەوە دەترسام کە ئێستاکانە ئەوانە بهێنێتەوە یادم و ئەوسامنیش تێبگەم کە چەندە بەرامبەر بە ئەویش دوور بوومەتەوە و بێگانەم .

ڕەشە گوتی : " ئێمە گومان لەوە دەکەین کە تۆ کوشتبێتت . "

وتی : " ئەوەی ئاشکرایە ئەوەیە کە ئێوە بۆ ئەوەی بتوانن پێکەوە بژین کوشتووتانە کەچی من سەبەبێکم نیە تاوەکوو بیکوژم . "

رەشە گوتی : " بۆ ئەوەی کە ئێمە پێکەوە نەژین کوشتووتە ، کاتێ ئەوەت بیست کە ڕێگای بە جیا بوونەوەی شەکورە و زەماوەند کردنی ئێمە داوە عەقڵت لەسەر دەرپەڕی و هار بووی ، خۆی لە خۆیدا لەبەر ئەوەی شەکورەی بۆ گەڕانەوە بۆ ماڵ هاندا بوو تۆ ڕقت لە زاوا بوو . دەتەویست تۆڵەی لێبسێنیتەوە چونکە دەتزانی تاوەکوو ئەو ساغ و سەلامەت بێ شەکورە ناگەڕێتەوە . "

حەسەن گوتی:"درێژەی پێمەدە،گوێ لەمانە ناگرم. ئێرە زۆر ساردە بۆئەوەی سەرەنجتان ڕابكێشم بەردم فڕێ دەدا بەڵام تاوەكوو ئێوە هاتن ڕەقم بردەوە هیچ گوێتان لێم بوو؟"

من وتم : "ڕەشە لە ژوورەوە تەماشای وێنەكانی باوكمی دەكرد . " بەم گوتنە كارێكی هەڵەم كرد بوو ؟ وەكوو ئەوەی كە منیش جار بە جار لەگەڵ ڕەشەدا بە شێوەیەكی ساختە و دروستكراو قسەم دەكرد حەسەن ئاوەها قسەی دەكرد و گوتی : " شەكووره خان ! لەبەر ئەوەی كە تۆ ژنی براكەمی و شەرعیش وادەزانێ كە تۆ هێشتا هاوسەرت هەیە ئەگەر دەستی منداڵەكانت بگری و بگەڕێیتەوە بۆ ماڵی ئەو قارەمانە سووپاییەكارێكی زۆر باش دەكەی "

وەكوو ئەوەی بچپێنم لەو شەوەدا گوتم " نا حەسەن ، نا ."

وتی : " ئەو كاتە منیش بە گوێرەی ئەو بەرپرسیارییانەی بەرامبەر كاكم هەمە و لەبەر ئەو شتانەی كەوا بیستم بە ناچاری بەیانی دەچمە لای قازی و هەموو شتێكتان بۆ باسدەكەم ئەگینا دوایی حیسابم لێدەپرسنەوە ."

ڕەشە گوتی : " خۆی لە خۆیدا حیسابت لێدەپرسنەوە ، كە تۆ بەیانی بچیتە لای قازی منیش بەیانی ئەوە ڕادەگەیەنم كە تۆ پیاوی خۆشەویستی پادشا یانی زاوا ئەفەندیت كوشتووە . "

حەسەن بە هێمنییەوە گوتی : " باشە ، وەها بڵێ . "

قیژەیەكم كرد و گوتم : " ئەشكەنجەتان دەكەن ، مەچن بۆلای قازی هەموو شتێك ڕوون دەبێتەوە تۆزێك چاوەڕێ بن . "

حەسەن گوتی : " لەئەشكەنجە ناترسم ، دووجار ئەشكەنجە كراوم و باش تێگەیشتووم كە هەر ئەوە دەتوانێ تاوانبار و بێتاوان لەیەك جودا

بکاتەوە ، با خۆ بەدەستەوە دەران بترسن من باسی وێنەکانی زاواش بۆ قازی و ( شیخ الاسلام) و فەرماندەی یەنیچەرییەکان دەکەم. ڕاستی! هەرکەس باسی ئەوانە دەکات چییان تێدایە؟"

ڕەشە گوتی : " هیچیان تێدا نیە ؟ "

-" کەواتە یەکسەر تەماشاتان کردوون . "

" زاوا داوای لە من کرد کە کتێبەکەی تەواو بکەم . "

" باشە ئەگەر خودا بییەوێ پێکەوە ئەشکەنجەمان دەکەن . "

هەر دوو بێدەنگ بوون ، لە دواییدا دەنگی پێیمان لە باخچە بچۆکەکەوە بیست. دەچوو یان وەکوو بەرە و لای ئێمە دەهات ؟ نە چاومان پێی نەکەوت نەوەکوو زانیمان کە چی دەکات . ڕۆیشتنی لە نێوان دڕك و داڵ و تووترکەکانەوە شتێکی زەحمەت بوو . خۆ دەیتوانی بەبێئەوەی کە ئێمە بیبینین لە نێو باخچەکەوە لەبەر دەمی ئێوەوە تێپەڕ ببێت . بەڵام دەنگی پێیەکمان نەبیست کە بەرە و لای ئێمە نزیك بێتەوە بانگیم کرد و گوتم : " حەسەن ! ". بەڵام چرتەیەکیش نەهات، ڕەشە وتی بێدەنگ بە ! هەر دووشمان لەسەرمادا دەلەرزاین ، بەبێئەوەی کە چاوەڕوان بین دەرگاکانمان توند بەست و ڕۆیشتینەوە ناو ماڵ. بەر لەوەی کە بچمە ناو ئەو جێگایەی وا منداڵەکان گەرمیان کرد بووجارێکیتر سەیری باوکمم کرد ، ڕەشەش دانیشت و سەیری وێنەکانی کرد .

## (( من، ئەسپ )) (35)

تەماشای بێدەنگی و ئاسوودەییەکەی ئێستام مەکەن ، لە ڕاستیدا ئەوە سەدان ساڵە کە من قسە دەکەم ودەشتەکان تێپەڕ دەکەم و دەچمە ناو شەڕەکانەوە ، کچی پادشاکان دەبەم و دەیاندەم بە شوو ، لەبەسەر هاتەوە دەچمە ناو مێژوو لە مێژووشەوە دەچمە ناو ئەفسانە و لە کتێبەوە بۆ یەکێتر و لە لاپەڕەیەکیتر بۆ ئەویتر غارم دەدەن . لەبەر ئەوەی لە نێوان دەیان بەسەر هات و چیرۆك و کتێب و شەڕدا جێگام گرتووە و هاوڕێیەتی قارەمانەنەکۆنەکان و عاشقەئەفسانەییەکان و لەشکرە خەیاڵییەکانم کردووە و لەسەفەرەکانی پادشا سەرکەوتووەکاندا غارم داوە وێنەی زۆریان کێشاوم . ئەوەندە کێشرانی ڕەسمت چ جۆرە هەستێکی تێدایە ؟ سروشتییە کەوا شانازی پێوە بکەم ، بەڵام هەموو جارێکیش پرسیاری ئەوە دەکەم کە ئایا ئەوەی وا دەیکێشن بەراستی منم یان نا ؟ چی لەم وێنانەوە تێدەگەن ؟ لە مێشکی هەر کەسێکدا بە جۆرێك کێشراوم ، بەڵام سەرەڕای ئەوەش هەست دەکەم کە لە نێو هەموو وێنەکاندا لایەنێکی هاوبەشم هەیە . کە کۆنەکاران

باسی دەکەن و منیش گوێم لێبووە کە پاشای کافرەکان ویستوویە لەگەڵ کچی دۆچی وەنیزدا زەماوەند بکات و دەیخوازێت بەڵام ئەگەر کچی دۆچە وەنیزییەکە ناشیرین بێت چی دەبێت ؟ هەر لەبەر ئەوەش بە شێوەکارێکی لێهاتوو و زانا دەڵێت کە بچۆ وێنەی کچی دۆچ و ماڵ و سامانەکەیم بۆ بکێشە . ئەم وەنیزیانەش خۆ نازان نامەحرەم چییە ! نەتەنیا کچەکانیان بۆ دەردەخەن بەڵکووماینەکانیشیان بۆ دەردەخەن و دەرگای کۆشکەکانیشیان بە ڕووی شێوەکاردا دەکەنەوە . شێوەکاری هونەرمەندیش وەها دەیانکێشێت کە ئەگەر بیانبینێت یەکسەر دەیانناسێتەوە . پادشای فەڕەنسییەکان لە حەوشی کۆشکەکەدا دەڵێ بیخوازم یان نا و تەماشای وێنەکان دەکات . لە ناکاو ئەسپێك چاوی بە وێنەی ماینەکە دەکەوێت و دەیەوێ لێی بپەڕێ و ئەندە پێیدا دێنێت و دەیبات کە وێنەکە بە چوار چێوەکەیەوە تێکدەچێ و خراپ دەبێ ، لە دوایشدا قاوە دەخەنە دەمی ئەسپەکە و بە زۆری ئاهۆنی دەکەنەوە. دەڵێن ئەو شتەی کە ئەسپەدابەستەکەی هار کرد بوو و بوو بوو بە هۆی ئەوەی کە شتەکەی ڕەپ ببێ جوانی ماینەکە نەبوو.. خۆ بۆ جوانی بڵێی جوان بووە– بەڵکوو ئەوەیە کە توانیویانە وێنەی ماینەکەی وەکوو ماینێکی ڕاستەقینە بکێشن . ئێستاکانە ئەگەر وەکوو ئەو ماینە وێنەکەت وەکوو ماینێکی ڕاستە قینە بکێشرێت تاوانە ؟ بەم حاڵەی خۆمەوە وەکوو ئێوە دەزانن فەرقێکی ئەو تۆم لەگەڵ وێنەی ئەسپەکانیتردا نیە خۆ لە ڕاستیدا ئەوانەیواسەیرم دەکەن ئەگەر سەرەنج بدەنە سەر پشت و جوانی قاچەکانم و شانازی کردنم لە کاتی ڕاوەستاند تێدەگەن کە من لەگەڵ وێنەی ئەسپیتردا فەرقم هەیە ، بەڵام ئەم جیاوازییە لە ئەسپایەتییەکەمەوە نایەت بەڵکوو لە جیاوازی بوونی

هونەری شێوەکارەکەوە دێت کەوا منی کێشاوە . هەمووشتان دەزانن کە ئەسپێکی وەکوو من وجوودی نیە من تەنیا وێنە خەیاڵی ئەسپێکم لە دەروونی شێوەکارێکدا . تەماشای من دەکەن ودەڵێن : وای ! ئەم ئەسپە چەندە جوانە ! بەڵام لەراستیدا ئەوە پەسەنی من نادەنەوە بەڵکوو پەسەنی شێوەکارەکە دەدەنەوە. هەموو ئەسپەکان لەگەڵ یەکتریدا جیاوازییان هەیە و پێویستە بەر لە هەر کەسێك شێوەکاران هەست بەمە بکەن . وەرن سەیر کەن تەنانەت شتە درێژەکەی هیچ ئەسپێکی بەستەواریش وەکوو هی‌تر نیە ، دەتوانن لە نزیکیشەوە سەیری بکەن  تەنانەت دەتوانن دەستیشی پێدا بێنن، ئەوەی من ماشەڵای لێبێ تیپێکی تایبەتی هەیە، شتێکی زۆر جوانە بەس تەنیا تۆزێك پێچ و پڵوچی تێدایە.

لەگەڵ ئەوە کە خودای گەورە و بە شکۆ ئێمەی یانی هەموو ئەسپەکانی کێشاوە ، بۆچی دیسان شێوە کارەکان لەبەر خۆیانەوە ئێمە دەکێشنەوە ؟ بۆچی بەبێ ئەوەی کە تەماشای ئێمە بکەن ، پەسەنی خۆیان دەدەن و دەڵێن کە وێنەی هەزاران ئەسپمان کێشاوە ؟ چونکە دەیانەوێ لە شێوەی دیتنی خۆیان زیاتر بە چاوە خوداوە بیانکێشن . ئەمە بە واتای شەریك دانان بۆ خودا یان وەکوو ( حاشا! ) بە مانای ئەوە نایەت کە شێوەکار دەیەوێ بڵێ منیش دەتوانم ئەو شتە دروستبکەم کەوا خودا دروستی کردووە ؟ ئەو شێوەکارانە کەوا بە بینراوەکانی خۆیان قەناعەت ناکەن و ئەسپەکەی نێو خەیاڵیان وەکوو ئەوەی کە هی خودابێ دەکێشنەوە مەگەر لەگەڵ خودا کێبەرکێ ناکەن و بێدینی ناکەن ؟

نەریتی تازەی ڕۆژ ئاواییەکان بێدینی نیە بەڵکوو بە پێچەوانەوە بە گوێرەی دینەکەمانە . ئامان !  با برا ئەرزڕوومییەکانم بە هەڵە لێمان

تێنەگەن ، من حەز لە ژنە ڕۆژ ئاواییەکان ناکەم کەوا بەبێئەوەی بزانن مەحرەمییەت چیە بە نیوە ڕووتی دەگەڕێن و بە قاوەکەی دەستیانەوە لەگەڵ کوڕی جواندا چێژ وەردەگرن. هەر وەها حەزم لە پیاوەکانیشیان نیە کەوا بەبێ سمێڵ و بەبێ ڕیش لە هەموو جێگایەك دەگەڕێن و بڕوا بەوەش ناکەم کەحەزرەتی عیسا( حاشا ! ) خودایە ، تەنانەت زۆریش لێیان تووڕە دەبم ، ئەگەر یەکێکیشیان دێتەلام دەڵێم کە جووتەیەکی لێبدەم ، لەوەی کە نەچمە نێو شەڕ و وەکوو ژنان لەماڵدا دابنیشم و بە دەستی شێوەکارانەوە بە هەڵە بکێشرێم بێزار بووم . کە غار دەدەم لە پێشدا دوو قاچی پێشەوەم بە درێژ کراوی دەکێشن ، ئاخر بڵێ کەی ئەسپ وەکوو کەروێشك باز دەدا ! ئەگەر قاچێکی پێشەوە درێژ کرابێ ئەویتریان لە دواوەیە هیچ ئەسپێکیش وەکوو ئەوەی کەوا لە سەفەرەکاندا کێشراوە قاچێکی پێشەوەی لەزەویدا نیە و ئەوی‌تریشی وەکوو سەگی خاوەن مەراق و زانخواز لە پێشەوە نیە . وەکوو ئەوەی کە هەموو سێبەری یەك بن و لە قاڵبێك دروست کرابن زیاتر لە بیست ئەسپ لەلای یەك کێشراون ، هیچ ئەسپێکی سووپایی لە یەك کاتدا وەکوو ئەسپی‌تر هەر ئەو پێ‌دانانێتە سەر زەوی . کە کەسێك تەماشامان ناکات گیا سەوزەکانی بەر دەممان دەقرتێنین و دەیانخۆین و وەکوو ئەوەی کە لە وێنەکدا کێشراوە ڕاناوەستین و بە ناسکییەوە چاوەڕێ نابین . بۆچی ئەوەندە لە خواردن و خەو و خواردنەوە و سەنێرکردنمان شەرم دەکرێت ؟ بۆچی ئەوەندە لە کێشانەوەی ئەم شتەی زلەی من دەترسن ؟ بە تایبەت ژنان و منداڵان ئەگەر کەسێك نەبێ زۆر بە باشی بەمەی من چاوی خۆیان تێر دەکەن کەواتە چ زیانێکی هەیە ؟ مەلا ئەرزڕوومییەکە کە دژی ئەمەشە ؟

دەیگێڕنەوە و دەڵێن کە زەمانی خۆی لە شیرازدا پادشایەکی وەسواس و دوو دڵ هەبووە لەبەر ئەوەی ترساوە کە دوژمنەکانی لەسەر تەخت لای‌بەرن و کوڕەکەی بخنە جێگاکەی شازادەکەی وەکوو پارێزگار نەناردووە بۆ ئیسفەهان و لە ژوورێکی کۆشکەکەدا زیندانی کردووە . شازادە لە باخچەی حەوشەکەدا لە ناو ژوورێکی شاراوەدا سی و یەك ساڵ بە بەند کراوی ژیانی بردووەتە سەر. لەدوای مەرگی باوکی شازادە جێگای دەگرێتەوە . ئەم شازادەیە بە کتێب گەورە بووە، کاتیٚ دێتە سەر حوکم دەڵێت : " ئادەی ئەسپێکم بۆ بێنن ، لەکتێبەکاندا زۆرجار وێنەیم بینیوە ، بابزان چۆن شتێکە " . جوانترین ئەسپی دەشتاییەکەی کۆشکیان بۆ هێنا . کاتیٚ چاوی بە لمۆزی دەکەویٚ کە لە کلاّو و ڕۆشنە دەچیٚ و دەزانیٚ سمتی قونە بیٚ ئەدەبەکەشی وەکوو ئەوەی ناو وێنەکان نابریقێنەوە و پاشەڵێکی ناحەزیشی هەیە بە پەشۆکاوییەوە هەموو خەیاڵەکانی ورد و هان دەبیٚ و دەستوور دەکات کە تەواوی ئەسپەکانی وڵات بکوژن . ئەو کوشتارەی کە چل ڕۆژ بەردەوام دەکات ڕەنگی وڵاتەکە دەکات بە ڕەنگی پێسە و خوێن . ئەنجامی عەداڵەتەکەی خوداش وای لێدێت کە ئەم پادشا تازەیە لەبەر دەم هێزەکانی توورکمەن ئاغای کاراقویونلوەکاندا بیٚ هێزی سوارە دەمێنێتەوە و شکست دەخوات و لە دوایشدا هەنجن هەنجنی دەکەن و دەیکوژن ئەمەشلەبەر ئەوە بوو کە کەس خەمەی ئەوە نەخوات کەخوێنی ئەسپەکان وەکوو ئەوەی ناو کتێبەکان لە زەویدا ماوەتەوە .

## ((ناوی من ڕەشەیە)) (36)

کە شەکورە و منداڵەکانی ڕۆیشتنە ناو ژوورەکەی خۆیانەوە ماوەیەکی زۆر گوێم لە دەنگە دەنگی ئەوان و قوتەقوتە بێکۆتاییەکانی نێو ئەو ماڵە بوو . ماوەیەك شەوکەت و دایکی بە چپەچپەوە هەندێك قسەیان پێکەوە کرد بەڵام لە دوایی دایکی بە شششش وە بێدەنگی کرد . هەر لەو کاتەدا لەلای چاڵە ئاوەکەوە دەنگی کرتە کرتیٚ هات بەڵام بەردەوامی نەبوو . لە دوایشدا سەرنجم دایە سەر باڵندەیەکی نەوڕەس کە چوو بووە سەربانەکە ، بەڵام ئەویش وەکوو هەر شتێکیتر لە ناو بێدەنگیدا خۆی نێژا .

ناڵە ناڵەیێکم بیست ، دیار بوو کە لە قووڵایی دڵەوە دەهات ، دوایی تیچگەیشتم کە لە هەیوانەکەوە دێت، خەیرییە بوو لە خەودا دەگریا ، لە دواییدا ناڵە ناڵەکانی بوو بە کۆخەکۆخ کردن ، کۆخەکەیشی لە خۆیەوە تەقایەوە و ڕاوەستا و دووبارە ئەو بێدەنگییە بەربادە بیٚ کۆتاییە دەستییپێکردەوە . تۆزێك دواتریش وامزانی لەو ژوورەیدا وا تەرمی زاواکەمانی لێیە کەسێك دێت و دەچیٚ ، ڕاوەستام لە تەواوی ماوەی ئەو بێدەنگییەدا تەماشای وێنەکانم دەکرد وخەیاڵی ئەوەم دەکرد کە دەبیٚ زەیتوونی مەفتوون و پەپوولەی چاو جوان و جوانکارە خوالیٚخۆشبووەکە چۆن فلچەیان بەسەر ئەم لاپەڕانەدا کێشابیٚ . دەمەویست وەکوو ئەوەی کە هەندێك لە شەوان زاواکەمان دەیکرد بانگی یەك بە یەکی وێنەکان بکەم ، شەیتان! مەرگ ! کەچی ترسێك ڕایدەگرتم . سەرەڕای هەموو پێدا گرییەکانی زاوا ئەفەندی نەمتوانیبوو کە هەریەکە وداستانێك بۆ ئەو وێنانە بنووسم . هەر ئەمەش بوو بوو بە هۆی ئەوەی کە بە ئەندازەی خۆی تووڕە ببم ، لەبەر ئەوەی خەریکبوو ئەوە لە مێشکمدا جێگیر دەبوو کە مەرگی زاوا ئەفەندی لەبەر ئەمانە بووە ، هەستم بە ترس و نائارامییەك دەکرد تەنیا لەبەر نزیك بوونەوە بە شەکوورەش بیٚ بە ئەندازەی خۆی لەگەڵ زاوادا تەماشای ئەم وێنانەم کرد بوو و داستانەکانیشم گویٚ گرتبوو . مادام کە ئێستا شەکورە بووە بە ژنم بۆچی سەیری ئەم وێنانە دەکەم ؟ هەستێکی بێبەزەییانە لە دەروونمەوە دەیگوت کە " شەکورە لەدوای ئەوەی کە منداڵەکانی کردە خەو نەهات بۆلات " بەڵام بە هیوای ئەوەی کە چاو ڕەشەکەم دێت بۆ لام لەبەر تیشکی مۆمەکەدا ماوەیەکی درێژ بە تەماشا کردنی وێنەکانەوە چاوەڕوان مامەوە . بەیانی کاتیٚ بە قیژە قیژی خەیرییە

لە خەو هەستام مۆمدانەکەم هەڵگرت و ڕۆیشتمە ناو هەیوانەکەوە . خەریکبوو وەها بیر بکەمەوە کە حەسەن و پیاوەکانی هاتوونەتە سەرمان و دەمەویست کە بچم وێنەکان بشارمەوە . بەڵام تێگەیشتم کە خەیرییە بە ئەمری شەکورە وەها دەکات و دەیەوێ مەرگی زاوا بە خەڵکی گەڕەك و مناڵەکان ڕابگەیەنێت . لە هەیوانەکەدا لەگەڵ شەکورەدا ڕوو بە ڕووی یەك بووینەوە دەستمان کرد بە ملی یەکدا و باوەشمان کرد بە یەکدا .

منداڵەکانیش کە بە دەنگە دەنگی خەیرییە لە خەو هەستا بوون و هاتبوونە دەرەوە لە جێگای خۆیاندا ڕاوەستا بوون . شەکورە گوتی : " باپیرتان مرد نەچنە ناو ژوورەوە ." لە باوەشم دەرکەوت و ڕۆیشتە لای باوکی و دەستی کرد بەگریان . منیش منداڵەکانم بردە ناو ئەو ژوورەی وا لێیەوە دەرکەوتبوون . وتم : " جلەکانتان بگۆڕن سەرما دەخۆن ." لەپاڵ جێگاکەیاندا دانیشتم . شەوکەت گوتی: "باپیرم شەو مردووە ئەم بەیانییە نەمردووە" لەولایتریشەوە لەسەر جێگاکە بە تاڵێك قژی شەکورە جوانەکەم پیتی ( واو ) نوسراو بوو . لە ژێر لێفەکەدا هێشتا گەرمای شەکورە مابوو . ئێستاش گوێمان لە دەنگی گریان و هاواری شەکورە و خەیرییە بوو .

جۆرێك هاوار و قیڕەیان دەکرد کە باوکی بە شێوەیەکی لە ناکاو و نادیار مرد بێت بۆ ساتێك وا بیرم کردەوە کە شەکورەی خۆم ناناسم و جندۆکەیەك لە دروونیدایە کە نائاشنا و نەناسی منە . ئورهان وەکوو ئەوەی کە داوای مۆڵەتی گریان بکات سەیری کردم و گوتی : " دەترسم "

گوتم : " مەترسن ، دایکتان بۆ ئەوە دەگری کە دراوسێکان لە مەرگی باپیرتان ئاگادار بن و بێن . " شەوکەت گوتی : " ئەگەر بێن چیدەبێت ؟ "

گوتم : " ئەگەر بێن تەنیا ئێمە بۆ مەرگی باپیرتان نارەحەت نابین ، بەڵکوو ئەوانیش ناڕەحەت دەبن و دەگرین و بەو شێوەش ئازارەکانمان بەش دەبێت و سووك دەبێت . "

شەوکەت قیڕاندی و گوتی : " تۆ باپیرمت کوشتووە ؟ " منیش قیڕاندم و گوتم : "ئەگەر دایکت ناڕەحەت بکەی منیش ناتوانم بە هیچ جۆرێك حەزت لێبکەم" وەکوو باوەپیارە و کوڕ پێکەوە قسەمان نەکرد کە لەنێو دۆڵێکی پڕ لە هاژەهاژدا بن . لەو کاتەشدا شەکورە بۆ ئەوەی دەنگی باش ببیسرێ چوو بووە هەیوانەکە و خەریکی کردنەوەی تەختەی دەلاقەکان بوو . هەستم بەوە کرد کە ناتوانم بێدەنگ بمێنمەوە و چوومە ناو هەیوانەکە و بەیەکەوە خەریکی لێکردنەوەی پەنجەرەکە بووین و لەگەڵیدا چنگماندەدا . بۆ دواجار ڕامانکێشا ، پەنجەرەکە کرایەوە و تەختەکە کەوتە نێو حەوشەکەوە ، خۆر و سەرما دای لە چاو و ڕوومەتمان سەرمان لێشێواو بوو ، شەکورە وەکوو ئەوەی کەوا بانگی دونیا بکات دەیقیژاند و هۆن هۆن دەگریا . کە بە قیڕەقیڕ و هاوارەوە مەرگی زاواکەمان بە خەڵك ڕاگەیاندرا مەرگەکەیم لەوەی کە هەبوو بە ئازارتر و مەترسیدارتر هەست کرد . دەتەوێ کە ڕاست بێت یان نەبێت بەڵام گریانی ژنەکەم منی دڵگیر دەکرد و منیش بە شێوەیەکیچاوەڕوان نەکراوەوە دەستم بە گریان کرد . نەمدەزانی کە ئایا بەراستی لەبەر خەفەتی مەرگی زاوا دەگریام یان وەکوو لە ترسی ئەوەی کە بە تاوانباری مەرگەکەیم لەقەڵەم بدەن دەگریام. شەکورە دەیقیڕاند ودەیگوت : " باوکە ڕۆ ! هەی ڕۆ هەی ڕۆ ! باوکە ڕۆ باوکە ڕۆ! " قسەکان و هەنیسکەکانی منیش هەر بەو شێوەیە بوو بەڵام نەمدەزانی کە چی دەڵێم . ئەو کاتەش بە چاوی خەڵکی ئەو گەڕەکەوە کەوا لە سووچی دەرگا و بەینی

پەنجەرەکانەوە سەیری ئێمەیان دەکرد تەماشای خۆمم کرد و زانیم کە کردەوەکەم ڕاست و دروستە . کە زیاتر دەگریام لە گومانی ڕاستی و ناڕاستی فرمێسکەکان و دوو دڵی و تاوانبار کردنم بە پیاو کوژی و ترسی هاتنی حەسەن و پیاوەکانی پاکتر دەبووەوە .

شەکورە هی من بوو وامدەزانی کە بە گریانەکەشمەوە پیرۆزبایی ئەمە دەکەم . ژنەکەم (کەوا باوکە ڕۆی دەکرد ) کێشایە لای خۆمەوە بەبێئەوەی کە گوێ بدەمە ئەوەی کە منداڵەکلان بە گریانەوە نزیك دەبنەوە ماچێکی گۆنایم کرد سەرەڕای گریانەکەشم هەستم بەوە کرد کە گۆناکانی وەکوو لیفە ئاوڕێشمینەکەی نەرمە و وەکوو کاتی منداڵیشمان دیسان بۆنی بادامی لێوە دەهات .

لەدوایشدا لەگەڵ منداڵەکاندا چووینە لای تەرمی باوکی . ئیدی وەکوو ئەوەی کە ئەمە لاشەیەك نەبێت کە ڕۆژێکە مرد بێت و بۆنی کردبێ ، بەڵکوو وەکوو ئەوەی کەوا تازە مرد بێت ( لاالەالااللا ) م بۆ گوتەوە کە بەر لە مردن دووبارەی بکاتەوە و لەبەر ئەم دوایین قسەیە بچێتە بەهەشت . لە دوایدا وەکوو ئەوەی کە زاوا ئەفەندی دووبارەی کرد بێتەوە وە وەها هەڵسووکەوتمان کرد و تەماشای ڕوومەتە پارچەکراوەکەی باوکمان کرد و بۆ ساتێك پێکەنین . هەر لەو کاتەدا دەستم کردەوە و یاسینێکم خوێندەوە ، هەموو بێدەنگ بوون و گوێیان لێڕاگرتم . بە پەڕۆیەکی پاکەوە کە شەکوورە هێنا بووی دەمە کراوەکەیمان بەست و چاوە شەق بردوەکەشمان بەبەزەیی خۆشەویستیەوە داخست و جەستەیمان بە سووکی گێڕایەوە لایڕاستدا و خەواندمان و ڕوومەتە نەماوەکەیشمان بەرەو قیبلە دانا، شەکورە سەرچەفێکی پاکی دابەسەر باوکیدا . زۆرم پێخۆشبووکە منداڵەکان وەکوو

پزیشكێك به سەرەنجەوه سەیری هەموو ئەم شتانەیان دەكرد . كاتێ گریانەكەشیان تەواو بوو بێدەنگییەك ژوورەكەی داگرتەوه . لە دوایشدا هەستم دەكرد كه بەراستی ژنێكم هەیه و خاوەنی ماڵ و منداڵی خۆمم ئەمەش لە هەموو جۆره بیرێكی ترسێنەر بۆ من باشتر بوو . وێنەكانم كۆ كردەوه و لە ناو بەرگبەستەكەدا جێگام كردنەوه ، عەبا ئەستوورەكەم كردەوه بەرو بە هەڕا كردن لە ماڵ دەركەوتم و وەكوو بڵێی كه نەمبینیبێ لە حەوشەكە مانەوه لە پاڵ ئەو پووره پیرەی دراوسێوه تێپەڕ بووم كه گوێی لە باوكە ڕۆكەی ئێمە بوو و لەگەڵ نەوه چڵمنەكەیدا بۆ دڵدانەوەی ئێمە هاتبوو . كەوتمە ناو كۆڵانەكەو بەره ومزگەوتی گەڕەك بەڕێ كەوتم . ئەو كونە مشكەی كەوا ئیمام دەیگوت ئەمە ماڵمە جێگایەكی بچووك بوو لە پاڵی گومەزه گەورەكەدا لە حەوشە پانەكەدا كه مرۆڤ شەرمی لێدەكرد .

وەكوو ئەوەی كه زۆر زۆر چاوم پێدەكەوت ئیمام ئیدی بەوه ناڕەحەت نەدەبوو كه ئیدی ئەگەر ژنەكەی لە نێوان دوو داری ناو حەوشەكەدا جلە تەڕەكانی ڕابخات. لە حەوشەكەدا دوو سەگی بێعار پەلاماریاندام كه دیار دەبوو مەلا بە ئەندازەی بنە ماڵەی خۆی خاوەنداریيان لێدەكات ، بەڵام كوڕەكەی بە دەسكەگزگێكەوه ڕاوی نان و منیش لەگەڵ مەلادا لە گۆشەیەكدا دەستم بە قسە كرد . ئیدی دڵنیا بووم كه لەوه ناڕەحەت بووه وا دوێنێ نەمبردووه بۆ ماره بڕینی دوای جیا بوونەوه كه و بە ڕوویەكی ترشەوه گوتی: " خێره ! دیسان چ بووه ؟ "

وتم : " زاوا ئەفەندی ئەم بەیانییە عەمری خودای كردووه ." بە باشییەوه گوتی : " خودا بە ڕەحمەتی بكات جێگای بە بەهەشت بێ ! " بۆ چی ناوی ئەم بەیانییەم پێزیاد كردبوو؟ لە خۆڕاییەوه خۆمم خستبووه ژێر

گومانەوە ؟ لەو ئاڵتوونانەی کەوا دوێنێ پێمدا بوو یەکێکیترم خستە ناو دەستەکانیەوە وداوام لێکرد بەر لە نوێژی بەیانی سەلاَت بدات و براکەی بانگەواز بکات و مەرگی زاواکەمان بە گەڕەك ڕابگەیەنێت . وتی : " دۆستێکی نیوە کوێری براکەم هەیەکە من و ئەو پێکەوە بە جوانی مردوودەشۆرین . " شتی باشتر لەوە کە زاوا ئەفەندی بە دەستی نیوە کوێریك و شێتێکەوە بشۆردرێت چی هەیە . وتم کە نوێژی مردووەکە لە نیوەڕۆدا دەکرێ و لە وێنەکیشخانەو مەکتەب و جێگا پلە بەرزەکانەوە زۆر کەس دێن بۆ هەڵگرتنی جەنازەکە . هیچ شتێکم بۆ ڕوونکردنەوەی سەبەبی پارچە پارچە بوونی ڕوومەتی زاوای بەڕێز پێ زیاد نەکرد. چونکە بڕیاری ئەوەم دابوو کە تەنیا دەتوانم ئەم کێشەیە لەسەرەوە چارەسەر بکەم . لەبەر ئەوەی کە پادشاکەمان تاقیب کردنی خەرجی کتێبە ڕاسپێردراوەکە بە زاوای دابوو بە دەستی خەزێنەدارکەوە پێویست بوو لە پێشدا خەبەری مەرگی زاواکەمان بۆ ئەو بەرم . هەر بەم مەبەستە چوومە کارخانەی بەرگدرووەکان و چوومە لای ڕاخەرێکی پیر کە لە سەری باوکمەوە خزممان بوو و لە وێشدا کاری دەکرد ، دەستەکانیم ماچ کرد و بە پاڕانەوەیە کەوە باسی ئەوەم بۆ کرد کە ئەبێ چاوم بە خەزێنەدار بکەوێ . لە دوای ئەوەی کە تۆزێك لە ناو شاگردە کەچەڵەکاندا مامەوە کە خەریکی دروونی دوو تۆپ پارچەی پێچا و پێچ بوون زانیم کەوا سەر دەستەی بەرگدرووەکان بۆ حیسابێك دەچێتە کۆشك . منیشی خستە پاڵی ئەو .

کەلە دەرگای کانییە ساردەکەوە چووینە مەیدانی گاڵتە لە ڕۆیشتنە مەیدانی بەرامبەر بینای وێنەکێشان و ڕاگەیاندنی مەرگی زاوا بە شێوەکاران ڕزگارم بوو . مەیدانی گاڵتە هەر وەکوو جاران بۆ من تەنیا

دەهاتە پێش چاو بەڵام لە هەمان کاتیشدا پڕ بوو لە دەنگەدەنگ و جەنجاڵ، لە کاتی کۆ بوونەوەی دیواندا لای نووسەرەکان داخوازنامە خواز بە ڕیز ڕادەوەستان و ڕیزەکانیان درێژتر دەبوو و بەر دەرگای گەنجینەکانیشیان چۆڵ دەبوون بەڵام وامدەزانی کە دەنگە دەنگە هەمیشەییەکەی دارتاشخانەکە و نانەوا و پەنجەرەی ژووری نەخۆشەکان و گەوڕەکان و دەنگی ئەسپەکان ، لەبەر ئەو دەرگایەی کە بە سەر سووڕماییەوە تەماشای کەلوەکانیم دەکرد و لە نێو دارە درێژەکانەوە بەر گویٚ دەکەوت . ئەم پەشووکاوییەم گوڕییەوە بە ترسی تێپەڕ بوونم بۆ جاری یەکەم لە دەرگای دووهەم (دەرگای ئاشتی " باب السلام " ) . لە دەرگاکەوە سەرنجم دایە سەر ئەو گۆشانەی کەوا دەیانگوت هەمیشە جەللادی لێ حازر و ئامادەیە . بۆ ئەوەی کە وابزانن هاوکاری دەکەم تۆپێك قوماشم لەگەڵ بەرگدرووەکەدا هەڵگرتبوو . پاسەوانەکە بە لاچاوێکەوە سەیری کردم بەڵام من هەڵچوونەکەی خۆمم شاردەوە . کە ڕۆیشتینە مەیدانی دێوانەکە بێدەنگییەکی قووڵ هەموو جێگایەکی گرتەوە ، دڵم کەوتبووە کوتەکوت تەنانەت گوێم لە دەمارەکانی تەوێڵ و پشت ملیشم بوو . ئەو باس و تاریفانە کەوا ئەو کەسانە دەیانکرد واهاتوو چۆی ئێرەیان دەکرد و ئەو ڕەنگانەی کەوا زاوا ئەفەندی باسیدەکردن ئێستاکانە وەکوو باخچەیەکی ڕەنگا و ڕەنگ لە پێش چاومدا بوو بەڵام هەستەکانم وەکوو هە کەسێك کە بچێتە ناو بەهەشت وانەبوو ، بەڵکوو لە ناو ترس و دوو دڵییەکدا بووم و هەستم بەوە دەکرد کە پیاوێکی سادەی پادشاکەمانم کە خۆی بونیاتی ئەم دونیایەیە . کە تەماشای تاوسەکانم دەکرد وا سەمایان دەکرد و چاوم بە پەرداخە زێرینەکانی سەر کانیاوەکە کەوت کە خوڕەی لێوەدهات

هەروەهاکاتیٚ سەیری ئەو فەرمانبەرانم کرد کەوا بە جلی ئاوریٚشمینەوە وەکوو ئەوەی کە پیٚیان لە زەوی نەدات ڕیٚیان دەکرد لە خۆمەوە هەستی خزمەت کردن بە پادشا لە دەروونمدا دەجۆشا.

پیٚویست بوو کە ویٚنە نیوە و ناتەواوەکانی بەر دەستم و ڕاسپاردەکانی پادشا و کتیٚبەشاراوەکەیم تەواو بکردبایە . لە سەر سووڕماویی زیاتر بە ترسیٚکەوە لە نزیکەوە تەماشای کەلوی کۆشکەکەم دەکرد و بەبیٚ ئەوەی کە بزانم چیدەکەم لە دوای بەرگ درووەکەوە ڕیٚم دەکرد . وەکوو خەونەکانم بەترس و بیٚدەنگییەوە لەگەڵ کوڕیٚکی دەرگاواندا کە خستبوویانە پاڵمان ڕۆیشتینە ناو دیواخان و بینای خەزیٚنەدارەوە . هەستیٚکی وا دڵمدا بوو کە لە پیٚشدا ئیٚرەم بینیوە و پیٚی شارەزام. لە دەرگایەکی پانەوە ڕۆیشتینە ناو جیٚگایەك کە پیٚیان دەگوت ژووری کۆنی دیوان . لە ژیٚر گومەزیٚکی گەورەدا چاوم بە هەندیٚك وەستا کەوت کەوا بە قوماشەکانی دەستیانەوە و بە پیٚستی پارچەکراو و کالاٌنە زیٚوینەکانی شمشیٚر و سندوقی دەستیانەوە چاوەڕیٚ مابوونەوە . یەکسەر تیٚگەیشتم کە ئەمانە وەستاکانی پیشەکاری ناو خۆیی کۆشك و پادشان و دەسك دروستکەر و وەستای مەخمەڵ و زەڕەنگەری و شتی وەهان . ئەمانە هەموو بۆ حسیٚبی ڕۆژانە و وەرگرتنی ئەندازەی جلی کەسانی ناوەوە هاتوون کە نابیٚ هەروەها و لە خۆوە وبەبیٚ بەرنامە بچیتە لایان . کە لە نیٚو ئەمانەدا شیٚوەکاریٚکم نەبینی زۆرم پیٚخۆشبوو . ڕۆیشتینە لایەك و چاوەڕوان ماینەوە . جاریٚك دەنگی نووسەری خەزیٚنەدار هات کە لەبەر هەڵەیەك دوو جار حسیٚبەکەی خویٚندەوە و بانگی دەکرد . لە دوایشدا گویٚمان لە وەستایەکی کلیل ساز بوو کە بە ڕیٚزیٚکەوە وەلاٌمی دایەوە . دەنگەکان ئەگەر کەمیشبیٚ لە چیپە

کردن تێپەڕ دەبوون بەڵام دەنگی شرقەی باڵی کوترەکانی سەر گومەزەکە کە هات و چیان دەکرد لە قسە کردنەکان و گلەیەکانی ئێمەی پیشە کار کە بۆ پارە هاتبووین زیاتر و باشتر دەگەیشتنە بەر گوێ . نۆرە گەیشتە من ، خەزێنەدار چووە ناو ژوورێکی بچکۆلانەوە ، تەنیا بنووسێکی لێ مابووەوە . یەکسەر گوتم کێشەیەکەی گەورە هەیە و پێویستە بۆ خەزێنە داری باس بکەم ، ئەو کتێبەی کە پادشا ڕای سپاردووە لە گەڵ ئەوە کە وا بە گرنگی و بە وردە کاریەوە کاری لە سەر دەکرا بە نیوەی ماوەتەوە . بنووسەکە " هم هممم " ێکی کرد ، وا دیار بوو هەندێك شتی بیستبوو ، منیش وێنەکانی کتێبەکەی زاوا ئەفەندیم پیشان دا . کە چاوم بە ثێکەڵ و پێکەڵ بوونی عەقڵی لە بەر سەیر و سەمەرە بوون و ناباو بوونی وێنەکان کەوت یەکسەر ناو و ناز ناوی زاوا و کارەکەیم وت و ئەوەشم پێ زیاد کرد کە لە بەر ئەم وێنانە مردووە . هەموو شتێکە بە پەلە پەل دەگرد ، چونکە ئەگەر بەبێ بینینی پادشا لە کۆشك بگەڕایێتمەوە ئەوا هەر کەس دەیگوت کە من زاوام کوشتووە و ئەو حاڵە مەترسیدارەم بۆ دروست کردووە.لە دوای ئەوەی بنووسەکە ڕۆیشت خەبەر بدات بە خەزێنەدار منیش هەندێك ئارەقی ساردم هەڵڕشت . زاوا ئەفەندی پێ وتبووم کە خەزێنە دار هەمیشە لە گەڵ پادشایە و جار جار بەرماڵی نوێژەکەی بۆ ڕادەخا و جار جاریش دەبێ بە هاوو ڕازی . بەڵام ئایا پیاوێکی ئاوەها دەردکەوێ و دێت بۆ لای من ؟

هەر ئەوەش کە هەواڵێکم بۆ ناو دڵی کۆشك بە ڕێ کردووە خۆی شتێکی باوەر پێنەکراوو بوو. حەزرەتی پادشا لە کوێ بوون ؟ چووبووە خوارەوە بۆ لای کەسێك لە گۆێی چمکی ئاوەکەدا ؟ یان وەکوو لە حەرمدا بوون ؟ خەزێنەدار لە گەڵیدا بوو یان نا ؟ زۆر دواتر بانگیان کردم بۆ ناوەوە . بۆ

ساتێك هەستم بەبۆشایی خۆم کرد، یان وەکوو ئەگەر باشتر بڵێم ترسێك هات بە مێشکمدا . بەڵام کاتێ ڕێز و سەر سووڕ ماوی وەستای مەحمەڵەکەم بینی کە لە بەر دەرگاکەدا ڕاوەستابوو ، کەوتمە ناو دڵە ڕاوکێ و هەڵچوونەوە . کە ڕۆیشتمە ناوەوە بۆ ساتێك زۆر ترسام، وام دەزانی کە ناتوانم هیچ شتێك بڵێم . سەر پۆشێکی تاڵ تاڵی لە سەردا بوو کە تەنیا ئەو و وەزیرەکان دەیان توانی لە بەری بکەن : خەزێنەدار کێ بوو؟ ئەو وێنانەی کە وا بنووسەکە لە منی وەر گرتبوو دای نابوونە سەر مێزێك و سەیری دەکردن . وەکوو ئەوەی کە من ئەوانەم دروست کردبێ ئا وەها دەترسام . داوێنەکەیم ماچ کرد .

وتی : " کوڕم ! بە هەڵە بیستوومە ، زاواکەت عەمری خودا کردووە ؟ " نازانم لە بەر هەستی خۆ بە تاوانبار زانین بوو یان وەکوو لە بەر پەشۆکاوی و هەڵچوون بوو کە نەمتوانی وەڵامی بدەمە و بە تەنیا سەرێکم بۆ لەقاند . هەر لەو کاتەدا بە شێوەیەك چاوەڕوان نەکراو و دوو دڵۆپە فرمێسك لە ژێر نیگا سەر سورماو بە چەمکەکانی خەزێنەداردا لە چاوم ڕژان و بە سەر گۆنامدا شۆڕ بوونەوە . هەبوونم لە ناو کۆشکدا وهاتنی خەزێنەدار لە لای پادشاوە بۆ لای من و ئەوندە نزیك بوون بە پادشا حاڵەتێکی سەیری بۆ دروست کردبووم ! نازانم ، دڵۆپێ تریش لە چاوەکانمەوە دادەکەوتن و وەکوو پەتێك بە دوای یەکدا دەهاتن ، بەڵام ئیدی شەرمیشم نەدەکرد . خەزێنەدار گوتی : " چەندە دەتەوێ بگری کوڕم ." بە هەنیسك دانێکەوە دەگریام . وا گومانم دەکرد کە لەم دوانزە ساڵەدا پیر بووم و گەیشتوومەتە قەڵەمەکەی دەستی خۆم . بەڵام کە مرۆڤ ئەوەندە نزیکی پادشا و دڵی دەوڵەت بێتەوە ئەوسا دەزانێ کە وەکوو منداڵێك وایە .

گۆیم نەدایە ئەوەی کە وەستاکانی مەخمەڵ و زەرنگەرەکان گۆیان لە دەنگی هەنیسکەکانم بێت . ئیدی تێگەیشتبووم کە دەتوانم هەموو شتێك بۆ خەزێنەدار ببەم شێوە وەکوو ئەوەی کەوا لە دەرونمەوە دەهات هەموویم بۆ گێڕایەوە . کاتێ لەبەردەم خەزێنەداردا زەماوەندم لەگەڵ شەکورەدا و زۆرایيەکانی کتێبەکەی زاوا ئەفەندی و نهێنیەکانی وێنەکانی داهاتوو و هەڕەشەکانی حەسەن و گیان گرتنەوەی لاشەی زاوا ئەفەندیم دەهاتەوە پێش چاو ، زۆر دڵنیا و ڕەحەت بووم . لەبەر ئەوەی بڕوام وابوو کە ئەگەر خۆم بخەمە بەر دەستی عەداڵەتی پادشای جیهان پەنا لەو داوەی وا تێیکەوتووم ڕزگار دەبێ هەموو شتێکم بۆ گێڕایەوە . ئایا بەر لەوەی لێم تێبگا و تەسلیمی ئەشکەنجە گەرانم بکات قسەکانمی بۆ پادشا دەگێڕایەوە؟ وتی : " مەرگی زاوا ئەفەندی بە هەموو وێنە کێشخانەکە ڕابگەیەنن با هەموویان بەشداری هەڵگرتنی جەنازەکە بکەن . " بۆ ئەوەی کە بزانێ نارەزایەکم هەیە یان نا تەماشایەکی کردم . ئەو نیگایە هەم حەز و وابەستەیی هەم متمانەیەکیشی تێدا هەبوو . گومانەکانی خۆمم لەسەر هۆی کوژرانی زاوا ئەفەندی و جوانکارەکەی یانی زەریف ئەفەندی هێنایە سەر زمان و ئاماژەم بە پیاوەکانی مەلا ئەرزڕوومییەکە کرد کەوا بە بەهانەی سەما کردن و ژەندنی موسیقا هێرش دەکەنە سەر تەکیەکان . کە زانیم خەزێنەدار بە گومانەوە سەیرم دەکات گومانەکانیتری خۆشم هێنایە سەر زمان !

وتم " بانگ کردنی شێوەکارێك بۆ دروست کردنی وێنەکانی ئەو کتێبە هەم ئاکچەی زۆری تێدایە هەم ناو دەنگێکی باشیشی تێدایە هەر بۆیە بووە بە هۆی کێبرکێ و ڕەقابەتێکی سەیر لە نێو دەستەی شێوەکاراندا لەوانەیە

کە نهێنی بوونی کارەکە بووبێ بە هۆی کۆ بوونەوەی ئەم بەخێڵبردنەوە و نەفرەتە لەسەر یەك و ئاوەها کەوتبێتە جووڵەوە ." بەڵام کاتێ ئەمانەم بۆ دەگێڕایەوە بە پەشۆکاوی و هەڵچوونەوە هەستم بەوە دەکرد کەلەوەدەچێ خەزینەداریش وەکوو ئێوە لەمنەوە کەوتبێتە گومانەوە . یاڕەبی هەموو شتێك دەرکەوێت شتێکیترم لە تۆ ناوێت . بێدەنگییەك دروست بوو خەزێنەدار وەکوو ئەوەی کە شەرم لە قسەکان و چارە نووس و حیسابەکانی من بکات ئاوەها نیگای لەسەر من لابرد و چاوی بڕییە وێنەکان و وتی : " ئەمە نۆ دانەیە بەڵام ئێمە لەگەڵ کاکی زاوادا لەسەر کتێبێکی دەوێنەیی جۆر بوو بووین لەم ڕووپەڵانەی کەوا بە کاری هێناون زیاتر لاپەڕەی زێڕاویمان پێدا بوو . "

وتم : " دەبێ کە پیاو کوژەبێ ئیمانەکە لە ماڵە چۆڵەکەدا دوایین وێنەی بردبێ کە لاپەڕەی زێراوی زۆری پێوە بووە ."

" هێشتا نەمزانیوە کە نووسەری کتێبەکە کێیە . "

وتم : " ڕەحمەتی زاوا ئەفەندی هێشتا بابەتی وێنەکانی تەواو نەکرد بوو بەڵام داوای لە من کرد بوو کە تەواوی بکەم "

" کوڕم تۆ دەڵێی تازە گەڕاویتەوە ئەستەنبووڵ! "

" حەوتەیەك لەمەو پێش ، یانی سێ ڕۆژ دوای کوژرانی زەریف ئەفەندی"

" زاوا ئەفەندی ئەوە سێ ساڵە خەریکی کێشانی کتێبێکی نەنووسراوە؟"

" بەڵێ "

" بەسەر هاتەکانی ئەم وێنانەی بۆ تۆ گێڕابووەوە ؟ "

ووتم : " دەیگوت داخوازیەکانی پادشاکەمان ئەمانەیە ! لەگەڵ ئەوەی کە هەزار ساڵ بەسەر کۆچەکەی حەزرەتی موحەممەددا تێپەڕ بووە دیسان یەکەم ساڵی تەقویمی ئیسلامی نیشاندەدات و لە چاوی دۆچی ئیتاڵیدا ( وەنیز ) هێز و دەوڵەمەندییەکان و ترس لە شمشێر و شانازی ئیسلامی عەلی عوسمان لە دڵیدا جێگیر دەکات . شتە بەنرخ و قیمەتەکانی دونیای ئێمە نیشان دەدات و بەسەر هاتەکانی دەکات بە وێنە و لە دڵی وێنەکەدا جێگایان دەکاتەوە . لەبەر ئەوەی کە نەریتی وەستا ڕۆژ ئاواییەکانیش کەڵك وەرگیراوە کاتێك دۆچی وەنیز سەیری بکات ئەوا هەستی دۆسایەتی لە دڵیدا دەبزوێنێ . " ئاماژەیەکی کرد بە وێنەکان و گوتی : ئەمانە دەزانم ،بەڵام شتە بەنرخەکانی عەلی عوسمان ئەم دار و سەگانەن؟"

" زاوای ڕەحمەتیم دەیگوت کە کتێبەکە خودی دەوڵەمەندییەکانی پادشا نیشان نادات بەڵکوو وێنەی دەوڵەمەندی مەعنەوی و خەمە شاراوەکانی نیشاندەدات . "

" وێنەی پادشاکەمان ؟ "

وتم : " چاوم پێی نەکەوتووە . کێ دەزانێت لەوانەیە لەو جێگایەدا بێت کە بکوژە بێئیمانەکە شاردبێیتیەوە یان وەکوو لەماڵەکەیدا بێت . " زاوای ڕەحمەتیم ئێستا وای لێهاتووە کە لە بەرامبەر ئەو زێڕانەی وەری گرتووە دەکەوێتە ژێر پرسیارەوە و ئەو کتێبەیوا قەولی داوە ئامادەی نەکردووە و تەنیا ئەم وێنانەی دروستکردووە کە لە چاوی خەزێنەدارداشتانێکی بێسەر و بێقیمەتن . ئایا خەزێنەدار منی وەکوو کەسێك دەبینێ کەلەبەر ئەوەی لەگەڵ کچی زاوادا زەماوەند بکەم کوشتوومە یاخود وەکوو کەسێك دەمبینێ کە لەبەر لاپەڕە زێڕاوییەکان کوشتوومە ؟ لەنیگاکانیدا تێگەیشتم

کە دەفتەرەکەم لە پێچانەوەدایە . هەر بۆیە بە ئازایەتییەوە لە دواییدا گوتم زاواکەمان گوتویەتی لەوانەیە یەکێك لە شێوەکاران زەریف ئەفەندی کوشتبێ . هەر وەها باسی چۆنیەتی گومانەکانی زاوا ئەفەندیم لەسەر زەیتوون و پەپوولە و لەق لەق بۆ گێڕایەوە ، بەڵام زۆردرێژم نەکردەوە . هەم بەڵگەی زیادیشم پێنەبوو، هەمیش متمانەیەکی زۆرم بە خۆم نەبوو . واهەستم کرد کە خەزێنەدار ئێستا من وەکوو کابرایەکی ورتە و بۆڵەکەر و گەمژە و سووك و ناڕەسەن دەبینێ . لەو ڕوویەوە کەوا خەزێنەدار گوتی : لەبەر ئەوەی کە زاوا ئەفەندی بە مەرگی خۆی نەمردووە ، پێویستە ئەمە لە وێنەکێشخانەکەدا بشاردرێتەوە ، ئەمەم وەکوو ئاماژەیەکی هاوکاری کردن لەگەڵ خۆدا نرخاند و پێم خۆشبو . وێنەکان لەلای خەزێنەدار مانەوە . لەو دەرگایەی ( باب السلام ) کەوا تۆزێك بەر لە ئێستا هاتبوومە ناوەوە وامزانیبوو کە دەچمە نێو بەهەشت دووبارە دەرکەوتم و وەکوو کەسێك کە لەدوای سالانێکی دوور و درێژ بگەڕێتەوە بۆ ماڵی خۆیئاوەها دڵم ڕەحەت بوو.

# ((من زاواكەتانم)) (37)

جەنازەكەم وەكوو ئەوەی وا خۆم دەمویست ئاوەها جوان بوو بوو ، ئەوانەی وا دەمویستن هەمووی هاتبوون ، شانازیم بە خۆمەوە دەكرد ، لەو وەزیرانەی وا لەكاتی مردنمدا لە ئەستەنبووڵدا بوون حاجی حوسەین پاشای قوبرسی و باقی پاشای شەل كە كاتی خۆی خزمەتی باشم بۆ كرد بوون بە وەفای ئەو ڕۆژانەوە هاتبوونە سەر تەرمەكەم . لە ڕۆژانی مردنمدا بەهاتنی مەلەكە سووری پاشای دەفتەردار بۆ سەر تەرمەكەم حەوشە نزمەكەی مزگەوتی گەڕەكەكەمان كەوتە جموجۆڵ . هاتنی موستەفا ئاغای سەردەستەی پاسەوانەكان زۆر خۆشحاڵی كردم، ئەگەر بمابایەم و ژیانی فەرمانبەری دەوڵەتم بەردەوام بكردبایە ئێستا منیش لەپلەی ئەوەدا دەبووم . كەمالەدین ئەفەندی ناسنامە و پاسەوانەكانی كۆشك كە زۆربەیان یان دۆستی گیانی بەگیانیم بوون یان وەكوو دوژمنم بوون و سەلیم ئەفەندییە كەللەڕەقەكەی سەردەستەی نامەنووسان و كۆنە ئەركدارانیدیوان كەوا زوودەستیان لە كار و باری پڕ جموجۆڵ و ژیان بەردا بوو و هاوڕێكانی قوتابخانەم و كەسانیتر كە نەمدەزانی چۆن و لە كوێوە خەبەری مەرگمیان بیستووە لەگەڵ خزم و كەسانم و جوانەكاندا جەماوەرێكی جەنجاڵ و

شکۆدار و قورس و پان و چاو تێرکەریان پێك هێنا بوو . شانازیم بۆ جیدییەت و خەم ئازارەکانیانەوە دەکرد. هاتنی خەزێنەدار و بوستانچیباشی نیشانەی ئەوە بوو کە پادشا لە مردنی من زۆر دڵتەنگ بووە . نازانم ئەمە بە مانای ئەوە دەهات کە بۆ دۆزینەوەی ئەو پیاو کوژە سووك و هەرچی و پەرچییە زۆرتر تێدەکۆشن و ئەشکەنجە گەران دەست بەکار دەبن یان نا؟ بەڵام ئێستاکانە دەبینم کە ئەو مەلعونە لەگەڵ شێوەکارانیتردا بە ڕێزەوە لە حەوشەکەدا سەیری تابووتەکەم دەکات و تا ئەو جێگایەی بتوانیٚ بە حاڵەتێکی خەماوییەوە تەماشا دەکات . ئامان ! وەها بیر نەکەنەوە کە لە بەرامبەر بکوژەکەمدا ڕەقم هەڵگرتووە و بە دوای تۆڵە سەندنەوەدام و لەوەی کە بە شێوەیەکیخاینانە و بێبەزەییانە کوژراوم ڕۆحم نائاسوودەیە . ئێستاکانە لە ڕوو تەختاییەکیتردام و ڕۆحم لە دوای ئەو هەموو نائارامیانەی وا بە ساڵان لە دونیادا کێشاویەتی زۆر ئاسوودە و ئارامە .

ئازار و خوێندا مابووە . دوای ماوەیەك لەرزە لەرز کردن لەنێو ئەم تیشکەدا وەکوو ئەوەی بە دەیان جار لە ( کتاب الروح )دا خوێندبوومەوە لە نێو ئەم ڕووناکییە جوانەدا دووفریشتە هاتن و وەکوو ئەوەی هێشتا لاشەم هەبیٚدەستیان خستە بن باڵم و هەڵیانکێشام بەرە و سەرەوە . هەر لە خەیاڵە جوانەکان دەچوو ، بە نەرمایی ڕۆحم بە شێوەیەکی دەمکورت جەستەمی بە جێهێشت کەلەبەر زەربەکانی جامۆڵکەکەدا لە ناو و بەبیٚ لەرینەوە ڕۆیشتینە سەرەوە ! دارستانی ئاگرەکانمان بە جێهێشت و لە نێو چۆمی تیشکەکانەوە تێپەڕ بووین ولە دەریای تاریکیوە ڕۆیشتینە چیای بەفر و سەهۆڵەوە ، هەر یەك لەمانەش هەزاران ساڵی خایاند . بەڵام بۆمن وەکوو

ئەوە وابووكە لە چاو پرتكاندنێكدا وەها بووبێ . گەڕانی حەوت قاتی ئاسمان بە تێپەڕ بوون لەلای جەماوەری جۆرا وجۆر و گیانلەبەری سەیر و ئەو حەشەرانەی وا باسیان كۆتایی نایەت و لەتەنیشت ئەو زەلكاوانەوە تەواو كردكە پەلەوەرەكان لەسەری كۆدەبوونەوە . لەهەر قاتێكی ئاسماندا فریشتەیەك دەچووە پێشەوە و لە دەرگاكەی دەدا ئەویتریش ئەی گوت ئەوە كێیە ؟ كاتێ ناوی من و هەموو تایبەتمەندییەكانمی بۆ دەگێڕایەوە ئەوەشی پێ زیاد دەكرد كە ئەمە عەبدێكی باشی خودای گەورەیە ، ئەوسامنیش چاوەكانم پڕ دەبوو لە فرمێسكی خۆشی بەڵام ئەوەشم دەزانی كە تاوەكوو ڕۆژی قیامەت كە دۆزەخی و بەهەشتیەكان لەیەك جیا دەكەنەوە دەیان هەزار ساڵیتری پێدەچێ . چونكە دەرەوەی هەندێك گۆڕانكاری بچووك هەموو شتێك وەكوو نووسراوەكانی غەزاڵی لە ( الجەوزییە ) دا و نووسراوەی زاناكانیتر وابوو . ئەو شتانەی وا لە كتێبخانەكاندا وەكوو مەتەڵێك لە تاریكاییدا دانرا بوون و شتانێك بوون كە تەنیا مردووەكان پێیان دەزانی ئێستاكانە بە هەزاران تیشكی ڕەنگاوڕەنگ ڕۆشن بوونەتەوە . دەبێ چۆن تاریفی ئەو ڕەنگانە بكردرێت وا لە كاتی بەرز بوونەوە نائاساییەكەدا بینیبووم ؟ زانیم كە تەواوی عالەم لەو ڕەنگانە دروستكراوە و هەموو شتێكیش لەبنەڕەتدا ڕەنگ بووە . لەگەڵ ئەوەیكە زانیم ئەو هێزەی وا من لە هەموو شتێكیتر جودا دەكاتەوە خودی ئەم ڕەنگەیە تێگەیشتم كە ئەوەی وا ئەم هەموو عالەمە پێكەوە دەبەستێتەوە و پێوەندییان لە نێواندا دروستدەكات دیسان هەر ئەو ڕەنگەیە. ئاسمانی جۆرا و جۆری پرتەقاڵی ڕەنگم بینی ، جەستەی جوان و پەلی سەوز و هێلكەی قاوەیی و ئەسپی ئەفسانەیی و شینی ئاسمانیم بینی . حەزم لە هەموو شتێك دەكرد و هەموو

شتێك وەكوو وێنەكان و ئەوانەی وا لە ئەفسانەكاندا بوون ئاوەها بوون و لەم ڕووەشەوە بەسەر سوورڕماوەیی و بەحەیران مانەوەوە بۆ یەكەم جار تەماشای ئەمانەم دەكرد ، لەلایەكیتریشەوە وامدەزانی ئەمانە هەمووی لە بیرەوەریەكانی منەوە دەركەوتوون . وەها تێگەیشتم كە پێی‌دەڵێم بیرەوەری ، بەشێكی ئەم دونیایە و لەو دونیایەشدا لە پێشەوە ئەو كاتە بی‌سنوورە ئەزموون هەیە كە لە دواییدا دەبێ بە بیرەوەری . لە ئێستا بەدواوە هیچ شتێك بۆ من قەدەغە نیە ، هەروەها بۆ ئەوەی كە بتوانم تەواوی جێگا و كاتەكان بژیم كات و ڕێگاشم هەیە . كاتێ لە هەمووی ئەمانە تێگەیشتم ، بەترس و خۆشییەوە هەستم بەوە كرد كە نزیك بە ئەوم . هەروەها لەو كاتەدا هەستم بە هەبوونی سوورایییەكی بی‌وێنە كرد كەوا لەگەڵ هیچ شتێكیتردا بەراورد ناكردرێت و هەر لەبەر ئەوەش هەستم بە خۆشییەك كرد . لە ماوەیەكی كورتدا هەر شتێك سوور بوو بوو .

جوانی ئەم ڕەنگە لە ناو دەروون من و عالەمدا دەزایەوە . كاتێ هەستم بەوە دەكرد كە وردە وردە نزیكی ئەو دەبمەوە خەریكبوو لە خۆشیاندا پەڵەمەگریان بمگرێت لە خۆمەوە و لە ناكاو بەسەر و گیانی خوێناوییەوە دەچوومە پێش بارەگای ئەو . هەستم بە شەرمێكی گەورە كرد كە تەواوی گیانمی داگرتەوە. لایەكیتری عەقڵیشم دەیگوت بە گوێرەی ئەو شتەی وا خوێندوومەتەوە عیزراییل و فریشتەكانیتری ناردوومیان بۆ لای ئەو .

ئایا دەمتوانی ئەو ببینم ؟ وامدەزانی كە لەبەر جۆش و خرۆش و گەرمای ئەو كاتەدا ناتوانم هەناسە بكێشم . سوورێكی جوان خەریكبوو نزیكم دەبووەوە . هەموو وێنەكانی گرتبووە ناو خۆی كاتێ بیرم لەوە دەكردەوە كە بەشێكی ئەوم و ئاوەها نێزیكی ئەو بوومەتەوە ،

فرمێسکەکانی چاوم دەستیان بە پەلەپەل کرد لە هەمانکاتدا تێگەیشتم کە لەمە زیاتر نێزیکی من نابێتەوە لە وەڵامی پرسیارەکەی لە فریشتەکان کەوتی : ئەمە کێیە ؟ ئەوانیش پەسەنی منیان دایەوە و گوتیان ئەمە گرێدراوی فەرموودەکانی تۆ و ئەو شتانەیە کەوا قەدەخەت کردوون سەرنجی داونەتیٚ و نەیکردوون. لە دواییدا تێگەیشتم کە ئەویش منی وەکوو عەبدێکی باش بینی و حەزی لێکردم . ئەو خۆشی و حەزەی کەوا لە دەروونمەوە بەرز دە بووەوەبوو بە گومانێك و دەروونمی ژەهراوی کرد . بۆ ئەوەی لەم گومانە نەجاتم ببیٚ بە بێئارامی و بە تاوانبارییەوە پرسیارم کرد و گوتم : " لە ماوەی بیست ساڵی دوایی تەمەنمدا وێنەی کافیرەکان کاریگەرییەکی زۆی لەسەر داناوم تەنانەت چەند جاریش ویستوومە بە نەریتی ئەوان وێنەی خۆم بکێشرێت  بەڵام لەمە ترسام لەدواییدا وێنەی پادشاکەمانم بە نەریتی ڕۆژ ئاواییەکان کێشا کە سێبەری سەر هەموو عالەمە کەی تۆیە . " بە دەنگی ئەونا بەڵام لە خەیاڵەکانی خۆمدا وەڵامەکانیم وەبیر دەکەوتەوە کە  دەیگوت : " ڕۆژهەڵات و ڕۆژ ئاواش هیٚمنە . " لە دڵەڕاوکیٚ و ترساندا خۆمم بۆ ڕانەگیرا و گوتم : " ئەی باشە مانای هەموویان و هەموو ئەمانە و ... واتای ئەم دونیایە چیە ؟ " لە دەروونمەوە وەهام بیست کە دەڵیٚ : " نهێنی یان خۆشەویستی " . لەم دووەش دڵنیا بووم بەڵام لە هەڵسوکەوتی فریشتەکاندا تێگەیشتم کەوا دەرهەق بە من بڕیارێکیان داوە ، بەڵام تێگەیشتم کە دەبیٚ دەهەزار ساڵیتر لەگەڵ مردووەکانیتر تا ڕۆژی قیامەت و ڕۆژی بڕیاری دوایی لەم دونیای بەرزەخەدا چاوەڕیٚ بمێنمەوە . هەموو شتێك وەکوو ئەوەی ناو کتێبەکان وابووئەمەش منی دڵنیا دەکرد . کاتیٚ هاتینە خوار بە گوێرەی کتێبەکان

زانیم کە دەبێ جارێکیتر لەگەڵ جەستەمدا یەك بگرمەوە . بەڵام زۆر شوکر کە بە زوویی تێگەیشتم ئەم یەکگرتنەوە شتێکی واتاییە .

ئەو شتەی دەبێ بە هۆی شانازی کردنی من ئەوەیە کە جەنجاڵە بەڕێزەکەی سەر تەرمەکەی من لە دوای نوێژ جەنازەکەیان هەڵگرتم و بەرەو مەزارستانی سەر تەپۆڵکەکەیان برد ، سەرەڕای خەم و ئازارەکانیشیان چەندە بە ڕێکوپێکی دەچن ! لە ژوورەوە چاوم پێیان دەکەوێ وەکوو پەتێکی ناسك وەهان. لە جێگای خۆمدا چاوم بە چۆلاییەك دەکەوێ لە فەرموودەکەی ( ڕەسولوللا ) وە کە دەڵێ : " ڕۆحی پیاوێکی دیندار وەکوو پەلەوەرێکی لێدێت کە لە نێو دارەکانی بەهەشتدا شت دەخوات . " وەها دیار دەبێت کە ڕۆح لە دوای مردن لە ئاسماندا دەگەڕێت . بە گوێرەی ئەو شتەی کەوا ئەبو عومەری کوڕی ( عبدالبر ) ئیدەعای دەکات : واتای ئەم فەرموودە ئەوە نیە کە ڕۆح وەکوو پەلەوەرێك دەگەڕێ یان دەبێ بە پەلەوەرێك . لەراستیدا وەکوو ئەو شتەی کە ئەلجەزوییە بەجوانی باسی لێوە دەکات ڕۆح بە گەڕاوەی پەلەوەرێك دەچێتە هەموو جێگایەك. ئەو شتەی کە وەستا دیدگا دۆستەکانی ڕۆژ ئاوایی بە گۆشەی دیتن ناوی دەبەن جێگای دیتنی منیش و شیکردنەوەکانی ئەلجەزوییەشی پشت ڕاست دەکردەوە . لەو جێگایەی کەوا ئێستا تێیدام بۆ نموونە جەماوەری دەورووبەری جەنازەکە وەکوو پەتێك دەبینم لەوەش زیاتر دەتوانم لەو جێگایەی کە خەلیج تەواو دەبێ وەکوو وێنەیەك چاوم بە بەلەمێك بکەوێ کە بادبانەکانی بە باوە هەڵئاوساون و خێراتر دەچێ . لەبەر ئەوەی لە جێگایەك بە بەرزایی مینارەیەکەوە تەماشام دەکرد هەموو عالەم هەڵدانەوەی لاپەڕەکانی کتێبێکیان بە بیر هێنامەوە بەڵام لە بەرزاییەکی ئاوەهاوە و بە

گوێرەی ئەو کەسەی کە هێشتا بە تەواوەتی ڕۆحەکەی لە جەستەی دەرنەچووە زۆر شتم دەبینی ! لەوبەرەوە لە پشتی قەبرستانەکەی گەڕەکی ئوسکوداردا چەند منداڵێك یاری کەرە درێژیان دەکرد . دوانزە ساڵ و سێ مانگ بەر لەئێستا کاتێ ڕاغبە کەچەڵی (( سەدری ئەعزەم )) نێردراوی ئیتالییەکانی قەبووڵ کرد و ئێمەش ئەو نێردراوەمان لەماڵە جوانەکەی کەناری دەریا هێنا بەلەمە حەوت بێڵەکەی سەر دەستەی بنووسەکان زۆر بە جوانی لە سەر ئاوەکەوە دەڕۆیشت ،لە بازارە تازەکەی ((لانگاوە)) ژنێکی قەڵەو کەلەرمێکی وەکوو منداڵێکی ساوا کردبووە باوەشەوە ، خۆشییەکەم لە کاتی ڕەمەزانی پاسەوانی کۆشکە هاتەوە یاد لەبەر ئەوە دڵخۆش بوو بووم کە ڕێگای بەردەم پێشکەوتنم کرابووەوە ، هەروەها دایکمم دەبینی کە لە حەوشەکەدا جلی ڕادەخست و تەماشای جلە سوورەکەی دەکرد . هەروەها بە ڕەحمەت بێ دایکی شەکورەم دەبینی کە بە شەکورەوە دوو گیان بوو و ئازارەکانیشی دەستیپێکرد بوو و منیش بۆ دۆزینەوەی ماڵی مامانەکە هەموو جێگایەك دەگەڕام و تا گەڕەکیتر هەڕام کرد بوو .

ئێستا ئەو کاتەش دەبینم کە کەمەرەکەم دۆزییەوە کەوا چلساڵ بەر لە ئێستا لێم ون بوو بوو .( وسفی دزیبوی ) ، جارێکیش بیست ساڵ بەر لە ئێستا خەوم بە باخچەیەکی جوانەوە لە جێگایەکی دووردا بینیبووئێستا ئەوەش دەبینم ، لە داهاتووشدا ئەگەر خودا مەیلی هەبێت بەهەشتیش دەبینم . چاوم بەوەش دەکەوێ کە عەلی ئاغا لەدوای سەر کوتکردنی سەر هەڵداوەکانی قەڵای گوری لووت و گوێکانیانی نارد بوو . هەر ئێستاش چاوم بە شەکورە جوانەکەم دەکەوت کە لە ژن و کچەکانی دراوسێوە جیا دەبووەوە و لەحەوشەکەدا تەماشای ئاگردانەکەی دەکرد و بۆمن دەگریا .

کتێبە کۆنەکان و زانا کۆنەکان دەڵێن کە ڕۆح چوار ماوەی هەیە :

1- زکی دایك 2- دونیا 3- ئەوبەرزەخە کەوا من ئێستا تێیدام 4- ئەو دۆزەخ و بەهەشتە کەوا لەدوای قیامەت پێیان دەگەین . لە دونیای بەرزەخدا دەتوانی ئێستا و ڕابردوو پێکەوە ببینی و هەتاوەکوو ئەو کاتەی کە ڕۆح لە ناو بیرەوەریەکانیدا دەمێنێتەوە جێگایەکی دیاری کراوی بۆ نیە . بەڵام ئەمە لە کاتێکدا دەردەکەوێت و دیار دەبێت کە دونیا وەکوو کراسێکی تەنگ وابێ و ڕۆح لە زنجیری زەمان و جێگا ( مەکان ) دەرکەوێت . زۆر بە داخەوە ! کەسێك تا نەمرێت لەوە تێناگات کە لە دونیای مردووەکاندا ڕۆحی بێ جەستە باشترین دڵخۆشی هەیە و لە دونیای دیتریشدا جەستەی بێ ڕۆح باشترین کەیف و دڵخۆشی دەدات بە مرۆڤ . هەر لەبەر ئەوەش خەمم بۆشەکورە جوانەکەم دەخوارد کە چۆن لە کاتی هەڵگرتنی جەنازەکەمدا خۆی بۆ من ونجڕ ونجڕ دەکات و بێهوودە بۆ من دەگری . لە خودای گەورە پاڕامەوە بۆ ئەوەی کەوا لە بەهەشتدا ڕۆحێکی بێجەستەمان بداتێ و لە دونیاشدا جەستەیەکی بێ ڕۆحمان پێببەخشێ .

## (( وەستا عوسمان منم )) (38)

دەزانن ئەو پیرە مێردانەی وا ژیانی خۆیان بە جوانمێرییەوە لە ڕێگای هونەردا بەختكردووە چۆن كەسانێكن ؟ هەموو كەسێك سەرزەنشت دەكەن بالآیان بەرز دەبێ و باریكەڵەو بە ئێسقان دەبن . دەیانەوێ ئەو بەشە كورتەی ژیانیان كەماوەتەوە وەكوو بەشەزۆرەكەی لێببێت كەوا لە ڕابردووە ماوەتەوە ، زۆر قۆڕ دەبن و گلەیی لە هەر شتێك دەكەن ، هیچ كەسێك و هیچ شتێك پەسەند ناكەن . منیش یەكێك لەوانەم . شانازی بەوەوە دەكەم كە لە تەمەنی شانزە ساڵیمدا لە كاتێكدا كە بەر دەست بووم لەگەڵ ئوستادی ئوستادەكاندا وەستا نوورەدین چەلەبیدا لەم وێنەكێشخانەیەدا پێكەوە

دادەنیشتین . کاتیٚ ئەویش گەیشتە تەمەنی هەشتا ساڵی وەکوو منی لێهاتبووهەڵبەت ئەو وەکوو من تووڕە نەبوو . سیٚ ساڵ بەرلە ئێستا کە وەستا عەلیە زەردیشم بینی هەروەها بوو بەڵام ئەو بەقەدەرمن باریکەڵەو درێژ نەبوو . ئەو ڕەخنانەی کەوا لە پشتی ئەم وەستا ئەفسانەییانەوە دەکران کەوا وێنە کێشخانەکەیان بەڕێوە دەبرد ئێستاکانە وەکوو تیرێك دەچەقێنە پشتی منیش . هەندێك لەو قسانەی وا دوابە دوای یەك لەسەر ئێمە مانان دەکرێن بیٚبونیاتن .

دەمەویٚ کە ئێوەش بزانن :

راستی شتێکی تازە نیە کەوا پەسەندی بکەین بۆیە هیچ شتێکی تازە پەسەند ناکەین

ئەمە لەبەر ئەوە نیە کە بە تووڕەیی و بیٚئومێدی و کەمو کووڕییەوە ڕووشابین بەڵکوو لەبەر ئەوەیە کە زۆربەی خەڵك گێلن ئێمەش ئاوەها خەڵك بە گەمژە لە قەڵەم دەدەین بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر باشتر هەڵسوکەوتمان بکردایە ئەوا ناسکی و ژیر بوونێکمان تێکەڵاوی شێوەی هەڵسوکەوتی خۆمان دەکرد .

فەرامۆشکردنی زۆربەی ئەو شێوەکارانەی وا لە کاتی شاگردییانەوە تاکوو ئێستا لای خۆم بوون و پەروەردەم کردوون لەبەر ئەوە نیە کەواخلەفاوم و شت لەبیر دەکەم ، بەڵکوو لەبەر ئەوەیە کە سیمای ئەمانە ئەو ڕەنگەی تێدا نیە کە شایستەی وەبیر هێنانەوە بن .

زۆر تێکۆشاوم بۆ ئەوەی کەوا کردەوەکانی ئەو زاوا ئەفەندییە فەرامۆش نەکەم کەوا لەبەر گێل و گەمژەییەکانی خۆی خودا زووتر گیانی لێسەندەوە ، ئەو دەیویست من ناچاری لاساییکردنەوەی نەریتی ڕۆژئاواییەکان بکات .

له گەڕانەوەشم بە خۆدا وەها بیرم دەکردەوە کە کاتیٚ باشە و چاکەی کویٚر کردن و گیان لیٚسەندن کەخودا دەرهەق بەمن ئەنجامی بدات زۆری نەماوە . دیارە ئیٚوە بە ئەو ئەندازەیەی وا کتیٚبم دروستکردووە و ویٚنەکانم لە دڵتاندا خۆشی دروستکردووە و نیگای چاوەکانتانی ڕازاندوتەوە بەبیرم دیٚننەوە بەڵام دوای مەرگیشم دەمەویٚ ئەمەش بزاندریٚ کە : لە کۆتایی ژیانمدا و لە کاتی پیر بوونمدا شتانیٚك هەبوون کەوابە دڵخۆشییەوە منیان دەکەناند . وەکوو :

1- منداڵەکان ( ئەوانە هەموو یاساکانی دونیا کورت دەکەنەوە ) 2- بیرەوەرییە شیرینەکان ( کوڕی جوان ، ژن ، ویٚنەی جوان کیٚشان ، دۆسایەتی ) 3- ڕوو بە ڕوو بوونەوە لەگەڵ بەرهەمە دەرئاساییەکانی وەستاکانی هەراتدا ( ئەم شتە نەزانراوە ڕوون ناکریٚتەوە ) .

واتای سادەی هەمووی ئەم شتانە ئەمەیە : لە ویٚنەکیٚشخانەکەی پادشاکەماندا کەوا من سەرۆکیمی شتی دەرئاسایی دروست ناکریٚت . هەروەها ئەوەش دەبینم کە کارەکان بەرە و خراپی دەچن : هەموو شتیٚك لە ناو دەچیٚ و تەواو دەبیٚ . لەگەڵ ئەوەی کەوا تەواوی تەمەنی خۆشمان بۆ ئەم کارە تەرخان کردووە ، بە ئازاریٚکەوە هەست بەوە دەکەین کە تەنانەت ناتوانین کەمیٚکیش بگەین بە ئاستی جوانکارییەکانی وەستا هەراتییەکان ، خۆ ئەگەر بە بیٚ فیٚزییەوە ئەم ڕاستییە قەبووڵ بکەین ئەوا پەسەند کردنی ژیان لەلامان ئاسانتر دەبیٚت . خۆی لە خۆیدا لەبەر ئەوەی ئەم بیٚفیٚزییە ژیان ئاسانتر دەکات لە وڵاتی ئیٚمەدا وەکوو ڕەوشت بەرزی پەسەند دەکریٚت . من بە خاکی بوونەوە دەڵیٚم کەدەتوانم لە قوماشی مەخمەڵینی نەخشکراودا و بەستیٚکی بە زیٚڕ نەخشکراودا یاقوت و زۆمڕووت و شیلان و

شمشێر لە خشڵی فیرۆزەیی ، کەشتی و زنجیرەکەی ژێری و هەنجیر و ئەسپێکی سەرکێشی عەرەبی توندتر لە بروسکە کەوا مووەکانی لە زێویش زیاتر دەبریقێتەوە و و بەگی بەگەکانی میسر وخەلاّتی بۆ سوننەتکردنی شازادەکان جیٚ بکەمەوە . کەڵەکە کردن و جێگیر کردنی وێنەکان کاری منە . ئەسپەکان و شازادەکە و ئەو نوێنەرانەی وا سەیریان دەکرد بە دەستی شاگردەکانی منەوە ڕەنگکراون و خۆشم فلْچەم بە چەپ و ڕاستی وێنەکاندا بردووە و هێناوە . هەندێك لە پەلەکانی دار چناری نێو مەیدانی ئەسپەکانم بە ڕەنگی مۆرەوە ڕەنگ کردووە ، دوگمەکانی کراسەکەی نێردراوی خانی تاتارم بە ڕەنگی زەرد بۆیاخ کرد بوو، خەریك بوو تۆزێك زێڕاو لە هەوساری ئەسپەکە بدەم کەوا لە دەرگایاندا . ڕاوەستام، کوڕێکی دەرگاوان بوو ، خەزێنەدار لە کۆشکەوە بانگی کرد بووم . چاوەکانم بە شیرینایییەکەوە زۆر ئێشا بوون . هاوێنەکەم خستە ناوگیرفانی عەباکەمەوە و لەگەڵ کوڕەکەدا دەرکەوتم. لەدوای ماوەیەکی درێژ کار کردن چەندە خۆشە کە لە ناو کۆڵانەکاندا ڕێبکەی ! وەکوو ئەوەی کە بڵێی کە دونیا ئەمڕۆ بە دەستی خوداوە خولقێندراوبیٚ ئاوەها دیار دە بوو . چاوم بە سەگێك کەوت لە وێنەی هەموو سەگەکانیتر بە ماناتر بوو . ئەسپێکم بینی ، شێوەکارانی من لەمە بە ماناتر دەیکێشنەوە . لە مەیدانی ئەسپەکاندا چاوم بە دار چنارێك کەوت : ئەو دار چنارە بوو کەوا تۆزێك بەر لە ئێستا پەلەکانیم بەرەنگی مۆر بۆیاخ کرد بوو ئەگەر بەو مەیدانی ئەسپەدا تێپەڕ ببی کەوا دوو ساڵە دەستە سەربازییەکانی لێوە دەرباز دەبن وەها هەستدەکەی لە ناو ئەو شتەوە تێپەڕ دەبی کە خۆت کێشاوتە. گەڕاینەوە بۆ ناو کۆڵانێك . ئەگەر لە ناو وێنەیەکی ڕۆژ ئاواییدا بایەین ئەوا لە وێنەکە و چوار چێوەکە

دەردەكەوتین و دەڕۆیشتین . ئەگەر لە ناو وێنەیەكی وەكوو هی ئێمە و وەستا هەراتییەكانیشدا بایەین ئەوا دەڕۆیشتینە ئەو جێگایەی وا خودا ئێمەی تێدا دەبینیٚ . ئەگەر لە ناو وێنەی چینییەكانیشدا بایەین هیچ دەرنەدەكەوتین چونكە وێنەی چینییەكان بەبیٚ كۆتایی هاتن درێژ دەبنەوە و دەچن . كوڕە درگاوانەكە نەیدەبردم بۆ ژووری دیوان بۆ وەرگرتنی پارە و داینی خەڵاتی شێوەكاران بۆ پادشا. تەنانەت نەهاتووم بۆ ئەوەی باسی كتێب وهێلكەی نەخشكراوی وشترمرخ و تەندرووستی و ئاسوودەیی شێوەكاران و ڕەنگی پێویست و لاپەڕەی زێڕاوی و دابینكردنی شتانیتر و گلەیی و داخوازی سادەیتر و قسە و باس لەسەر كەیف و داخوازی پادشا و لەسەر خۆیی پادشا و باسی هەوا و زەوی و من و هاوێنەكەم و پشت ئێشەكەم و پیاوە دڵنزمەكانی خەزێنەدار و پشیلەكەی بكەین . بەڵكوو بە بێدەنگییەوە ڕۆیشتینە ناو باخچەی تایبەتەوە . وەكوو ئەوەی بۆ دزی بچین بە بێدەنگییەوە لەلای ئەو دارانەوە كە لە ئێمەش ناسكتر بوون دابەزینە خوارەوە، لە نانەوا خانەی دارودەستەی بۆستانچی باشییەوە بۆنی نان دەهات . خەریكبوو نێزیكی كۆشكی گویٚ ئاوەكە ببینەوە. چاومان بە پادشاكەمان دەكەویٚ ؟ بە خۆم دەڵێم كە لەوێن ، لەڕیٚ دەركەوتین ، دوو سیٚ هەنگاو ڕۆیشتین لە دەرگا كەمەرینەكەی بینایەكی بەردینەوە چووینە ناو . تۆزێك لەولاترەوە خەزێنەدار و بۆستانچی باشی دانیشتبوون: فریشتە و شەیتان !

بۆستانچی باشی لە باخچەی كۆشكەكەدا بۆ پادشا كەس ئێعدام دەكات و خەڵك ئەشكەنجە دەكات و فەلاقەیان دەكات . بە پێكەنینەوە تەماشایان دەكردم ، وەكوو ئەوە بوو كە دەبیٚ بە ناچاری لەگەڵ كەسێكدا لە

ژوورێکدا بمێنمەوە و ئەویش بەسەرهاتە بچووکەکانی خۆیم بۆ بگێڕێتەوە .
بەڵام خەزێنەدار دەستی بە قسە کرد . بە شێوەیەکی شەرمەزارانەوە گوتی :
" ساڵێك بەر لە ئێستا پادشای سەروەرمان بۆ ئەوەی کەوا لەگەڵ وەفدێکدا خەڵاتێك بۆ دەرەوە بنێرێت دروستکردنی کتێبێکی شاراوەی پێڕاسپاردم لەبەر شاراوەیی ئەم کتێبە نەیویست کە وەستا لوقمانی سەردەستەی شاهنامە چییەکان ئەمە بنووسێ ، هەروەها لەبەر ئەوەی کە ئێوە بە دروستکردنی سوور نامە ( جەژنامەکە )وە خەریك بوون دەست خۆشی لێکردن و نەیویست کە تێکەڵاوی ئەم کارە بن . " کە ڕۆیشتمە ئەوێ و نەڕۆیشتم وەها خەیاڵم کرد کە ناپیاوێك تۆمەتی لێداوم و گوتوویەتی لە وێنەکانیدا کوفر هەیە ، لەم وێنانەدا قسەتان پێدەڵێ و بەم قسانەی خۆیانەوە پادشای شکۆداریان خستۆتە ژێر ئەشکەنجەوە . بەڵام ئێستاش کە پادشا کتێبەکەی بە کەسێکیتر ڕاسپاردووە خەزێنەدار خەریکە دڵی من دێنێتەوە و قسەکانی لە هەنگوین شیرینتر بوون . داستانی کتێبەکەم دووبارە بیستەوە ، بەڵام فێری شتێکی تازەتریش نەبووم ، ورتە و بۆڵەکانی سەر ئەم کتێبەم دەزانی: هەم هی مەلا نووسرەتی ئەرزڕوومی هەم ناکۆکییەکانی وێنەکێشخانەکەشم دەزانی. تەنیا بۆ ئەوەی پرسیارێکم کردبێ پرسیارێکم لێکرد کە خۆشم وەڵامەکەیم دەزانی. خەزێنەدار وتی : " وەکوو دەزانن زاوا ئەفەندی " تەماشای نێو چاوانمی کرد و بەردەوامی کرد و ئەوەی پێ زیاد کرد کە " بە مەرگی خۆی نەمردووە . ئەمەتان دەزانی ؟ "

وتم : " نەمدەزانی . " ، وەکوو منداڵێکی بێگەرد و بێ جموجۆڵ و بێدەنگ مامەوە . وتی : " پادشاکەمان زۆر تووڕە بووە . " ئەو پیاوە گێلەی وا پێتان دەگوت زاوا ئەفەندی کابرایەکی نیوە عاقڵ بوو ، لەبەر ئەوەی کە لە

زانایی زیاتر لاسایی زانا بوونی دەکردەوە لە باتی عەقڵدا ویست و زانایی بە کار دەهێنا . خۆی لە خۆیدا لە هەڵگرتنی تەرمەکەیدا هەستم بە هەبوونی گەمەیەك دەکرد . " زۆر خراپە . خودایا خۆت بمانپارێزە . کێیە ؟ " خەزێنەدار گوتی : " بە فەرموودەی پادشا پێویستە ئەم کتێبەش وەکوو جەژننامە بە پەلە تەواو بکردرێت . " بۆستانچی باشیش گوتی : " دووهەمین فەرموودەشی ئەوەیە کە ئەگەر ئەو پیاو کوژە لە نێو دەستەی وێنەکێشاندا بێ پێویستە بە زووترین کات بدۆزرێتەوە و سزایەکی وەهای پێبدرێت کە هەموو کەس پەندی لێوەربگرن و هەڵنەسەن بە ئاستەنگی دروستکردن لە بەرامبەر دروستبوونی کتێبی پادشا و کوشتنی وێنەکێشەکەی . " وەکوو ئەوەی بزانیت کە پادشا چ جۆرە سزایەك دەدات بە تاوانبارەکە ترسێك لە ڕوومەتیدا دیار بوو . تیگەیشتم کە تۆزێك بەر لە ئێستا و لە یەك کاتدا لەلایەن پادشاوە ئەم ئەرکەیان پێڕاسپێردراوە و لەبەر ئەوەی کە پادشا نەیتوانیوە ڕق و کینەی خۆی بشارێتەوە هە دووکیانی ناچار کردووە کە پێکەوە کار بکەن . لە حەیران مانەوە زیاتر هەستم بە خۆشەویستییەك بەرامبەر بە پادشا کرد .

کوڕێك قاوەی هێنا. دانیشتین . وتیان زاوا ئەفەندی خۆشکە زایەکی هەیە کە لە نەخش و کتێب تێدەگا ، ڕەشە ! دەیناسم ؟ بێدەنگ بووم ماوەیەکی کورت بەر لە ئێستا بە دەعوەتی زاواکەی لە سنووری ئێرانەوە لەلای سەرحەد پاشاوە گەڕاوەتەوە . ( بوستاچی باشی بە نیگایەك کە ئاماژە بە گومان بکات سەیری کردم ) . لە ئەستەنبووڵدا بە باشی خۆی چەسپاندووە بە زاوا ئەفەندییەوە و فێری داستانی وێنەکان بووە . گوتوویەتی کە زاوا ئەفەندی پێی گوتووم بۆ کوژرانی زەریف ئەفەندی

گومانم لەسەر ئەو وێنەکێشانەیە کەوا شەوان هاتوو چۆی ماڵی ئێمە دەکەن، بە گومانی خودی ڕەشەش بکوژی زاواش یەکێك لەمانە بووە کە یەکێك لە وێنەکانی پادشای دزیوە کەوا زێڕاوی زۆر تێدا بە کار هێنراوە . ئەم گەنجە کوژرانی زاوای دوو ڕۆژ لە کۆشك و لە خەزێنەدار شادۆتەوە و لەبەر ئەوەی کە لە کاتی بەینی ئەم دوو ڕۆژەدا بە پەلەپەل کچی زاوای لە خۆ مارە کردووە و لە ماڵەکەی دا نیشتەجێ بووە هەدووکیان گومانی لێدەکەن . وتم : " ئەگەر لە کاتی پشکنینی ماڵ و جێگای یەکە یەکەی شێوەکاراندا وێنەکە بدۆزرێتەوە ئەوا دەردەکەوێ کە ڕەشە ڕاست دەڵێ . " بەڵام ئەوانە ڕۆڵە خۆشەویستیەکانی منن لە دەورانی شاگردیانەوە تاوەکوو ئێستا دەیانناسم کەسێکیان ناتوانێ مرۆڤ بکوژێ. بوستانچی باشی وەکوو ئەوەی گاڵتە بەو ناز ناوانە بکات وا من بە عەشقێکەوە بەوانە بانگی شێوەکارانم دەکرد گوتی : " ماڵ و دوکان و هەموو جێگایەکی زەیتوون و پەپوولە و لەقلەقیش دەگەڕێین . " لە دواییدا.. . " لە دواییدا بە حاڵەتێکی بێچارەییەوە گوتی : " زۆر شوکر کە لەم وەزعە نائاساییەدا مۆڵەتم لە قازی بۆ ئەشکەنجەدانیان وەرگرتووە . " وتیان لەبەر ئەوەی کە کەسێکیتری نێزیك بە دەستەی شێوەکاران کوژراوە لە شاگردەوە تاوەکوو هەموو شێوەکاران کەوتوونەتە بەر تۆمەت و لەبەر ئەوەش بە کار هێنانی ئەشکەنجە گونجاو دەبێت .

بە بێدەنگی بیرم کردەوە :

1- بە گوتنی گونجاو بوونی ئەشکەنجە ئەوە دەردەکەوێت کە پادشا مۆڵەتی ئەمەی نەداوە 2- ئەگەر بە کوێرەی قازی دادگا هەموو شێوەکاران لە ژێر تۆمەتدا بن ئەمە مانای ئەوە دەدات کە منیش وەکوو سەر دەستەیان

لەبەر ئەوەی کە بکوژەکەم نەدۆزیوەتەوە و ڕادەستی دادگام نەکردووە تاوانبارم .3- دیانەویٚ بە ئاشکرایی بێت یان بە بێدەنگی ڕەزامەندی من دەربارەی ئەشکەنجەدانی ئەو شێوەکارانە وەربگرن کەوا من سەر دەستەیانم و بە تایبەت زەیتوون و لەقلەق و پەپوولە کە لەم ساڵانەی دواییدا خەیانەتیان بە من کردووە .

خەزێنەدار گوتی : " لەبەر ئەوەی پادشا ویستوویەتی جەژننامەکەش و ئەو کتێبەی کەوا ئێستا بە ناتەواوەتی ماوەتەوە زووتر تەواو بکردرێت ، ئێمەش لەوە دەترسین کە ئەشکەنجە زیان بگەیەنێت بەسەر و چاو دەست و هونەری شێوەکاران." گەڕایەوە و ڕووی کردە لای من و گوتی : " وانیە ؟ " بوستانچی باشی زۆر بە نەزاکەتەوە گوتی : " ماوەیەك بەر لە ئێستاش هەر ترسێکی وامان هەبوو ، جارێك شەیتان چوو بووە ناو دڵی زەڕەنگەرێك و ئەویش دڵی لە فنجانێکی دەسك یاقووتیچووبووودزیبووی،ئەمەش خوشکی پادشای لەناو ئازار و خەمدا خنکاند بوو و ئەم ڕووداوەش لە گەڕەکی ئوسکوداردا ڕوویدا بوو ، پادشا ئەرکی دۆزینەوەی دزەکەی بە من ڕاسپارد بوو لەبەر ئەوەی کە دەمزانی پادشا و خوشکەکەشی لە بەرامبەر دەست و پەنجە و هونەری زەڕەنگەردا هەستیارن ، هەموویانم ڕووت کردەوە و خستنمە ناو حەوزە سەهۆڵ گرتووەکە و کردنم بە میوانی بۆق بۆقیلەکان جار جاریش دەرمدەهێنان و بە توندی قامچیم لێدەدان بەڵام دیقەتم کرد کە بەر دەست و چاویان نەکەویٚ . لە ماوەیەکی کورتدا زەڕەنگەرە دزەکە خۆی بە دەستەوەدا و بە سزاکەی خۆیشی ڕازیبوو . سەرەڕای ئەو هەموو سەرما و سۆڵەیەی کە خوارد بوویان و ئەو ئاوە ساردەی کە تێیدا بوون و ئەو قامیچیانەی کەوا لێیان درا بوو لەبەر خاوێنی ئاوەکە هیچیان

لێنەهاتبوو و دەست و چاویان زیانی بەر نەکەوتبوو . تەنانەت پادشاش پێی گوتم کە خۆشکەکەی زۆر ڕازییە و زەڕەنگەرەکانیش لەبەر ئەوەی کە تۆخمێکی چەپەڵ لەناویاندا نەماوە زۆر خۆشحاڵن و باشتر کار دەکەن . " لەوە دڵنیا بووم کە بوستانچی باشی لەگەڵ شێوەکاراندا کەللەڕەقانەتر هەڵسوکەوت دەکات . هەرچەندە لەبەرامبەر ویستی کتێب دروستکردنی پادشادا بە ڕێزیش بێت بەڵام بڕوای وایە کە نەخشکردن و وێنەکێشان دەگەنە سنوورەکانی بێدینی و پێویستە شێوەکاران سزا بدرێن ، تەنانەت ئەمەی وەکوو کارێکی ژنانە لە قەڵەمدەدا و بچووکی دەکردەوە . بۆ ئەوەی کە من بورووژێنی گوتی : " هێشتا تۆ نەمردوویت کە شێوەکاران بۆ گرتنەوەی جێگاکەت خەریکی فێڵبازی و داو و تەڵەکە دانانن . " ورتە و بۆڵەیەکی تازە هەیە یان وەکو فرتوفێڵێکی تر هەیە کە من پێم نەزانیوە؟!

خۆمم ڕاگرت و بێدەنگ مامەوە . خەزێنەدار هەستیبەوە کرد بوو کەمن لەبەرامبەر ئەودا کە بە عەقڵەنیوەو ناتەواوەکەی خۆی کە ویستوویەتی کتێب ئامادە بکات و لەبەرامبەر ئەو وێنەکێشە کوێرانەدا کەوا بۆ سێ چوار ئاکچەی زیاتر وێنەکانی ئەو کتێبانەیان کێشاوە چەندە تووڕەم و چەندە ڕقم هەستاوە . بۆ ساتێك بیرم لەو جێگایەدا گرتەوە کە داخۆ ئەبێ چ جۆرە ئەشکەنجەیەك لە شێوەکارانم بکردرێت؟ لە کاتی لێپرسینەوەدا پێستیان ناگوروون چونکە ڕێگای گەڕاندنەوەی نیە  هەروەها قۆڵیشیان نابڕن چونکەئەمە بەزۆری بۆ سزا دانی سەرهەڵداوان و ئەوانەی وا پەندیان لێوەربگرن بەکار دەبرێت . دەست و پەنجە و لاقیشیان ناشکێنن و ورد و هانی ناکەن . ئەشکەنجەی لە جۆری هی ئەو کەسە یەك چاوانەی وا ژمارەیان لە ئەستەنبووڵدا زیاتر بووە و لە کۆڵانەکاندا بەدی دەکرێن

شایستەی وەستایەكی شێوەكار نیە ، لە ڕاستیدا خۆی ئەمە شتێكی دروست نیە ، بەم شێوەیە كە بۆ ساتێك لە خەیاڵی خۆمدا شێوەكارە خۆشەویستەكانی خۆمم بە ڕووتی لە ناو حەوزەكەدا بینی كەلەبەر ئەو سەرما و سۆڵەدا بە تووڕەییەوە تەماشای یەك دەكەن لە خۆمەوە پێكەنین گرتمی . بەڵام خەیاڵی ئەوەشم دەكرد كە لەبەر ناماقووڵییەكانیان زەیتوون داخ دەكرێ و لەبەر ئەوەش دەقیڕێنێ و جەستەی پەپوولە گیانیشم زنجیر كراوە و لاشەشی زەرد هەڵگەڕاوەتەوە ،ئەم خەیاڵەم پێ‌ناخۆش بوو ، دڵم هەڵگەڕایەوە هیچ بیریشم لەوە نەكردەوە كە ئەو پەپوولەیەی‌وا لەبەر هونەر و زیرەكی خۆی جارجار چاومی پڕ دەكرد لە ئاو ، ئێستاكانە لەبەر دزی وەكوو شاگردێك فەلاقەی بكەن . هەروا مامەوە . مێشكە پیرەكەم بە سێحری بێدەنگییە قووڵەكەی ناو خۆیەوە بێدەنگ بوو . جارجار لەگەڵ ئەواندا هەموو شتێكمان لەبیر دەكرد و بە عەشقەوە وێنەمان دەكێشا . وتم : " ئەوانە شارەزاترین شێوەكارانی پادشان لێیان مەدەن . " خەزێنەدار لە جێگا خۆشەكەی خۆی هەستا و لەو پەڕی ژوورەكەدا لەسەر مێزێك كاغەزێكی درێژی هێنا و خستیە بەردەمم و وەكوو ئەوەی كە ژوورەكە تاریك بێت ، دوو مۆمدانی زل و گەورەی بە لەرزە لەرزی تیشكەكانیەوە نایە پاڵ سەرم . ئەمە ئەو وێنانە نەبوون . كاتێ هاوێنەكەم بەسەریاندا دەهێنا ، نازانم چۆن تاریفی بكەم! خەریكبوو پێكەنین بمگرێ . بەڵام لەبەر ئەوە نەبوو كە پێكەنیناوی بوون بەڵكوو لەبەر تووڕەیی بوو ، بەڵام خۆ شتانێكیش نەبوون كە بە جیددی وەربگیردرێن . وەكوو ئەوە وابوو كە زاوا ئەفەندی بە شێوەكارانی گوتبێ وەكوو خۆتان نا بەڵكوو وەكوو كەسێكیتر وێنەكان بكێشن ، دەتگوت ئەوانی ناچار كردووە كە خەیاڵ و

بیرەوەریەکانی خۆیان وەبیر بهێننەوە و خەیاڵی ئەوداهاتووە بکەن کە نایانەویٚ هیچ تێیدا بژین و وێنەکانیان بکێشن . شتی باوەر پیٚنەکراویش ئەوەیە کە بۆ ئەم شتە هیچ و پووچانە یەکتری دەکوژن . خەزینەدار گوتی : " کەتەماشای ئەم وێنانە بکەی دەتوانی بڵێی کام وێنەکێش قەڵەمی لەکام وێنەداوە ؟ " بە وریاییەوە گوتم : " ئەم وێنانەتان لە کویٚ دۆزیوەتەوە ؟ " خەزێنەدار گوتی : " ڕەشە هێناونی ، خۆی تەسلیمی کردووین ، دەیەویٚ پاکانەی خۆی و زاوای خوالیٚخۆشبووی بکات " وتم : " ئەشکەنجەی بکەن باوەکوو بزانین زاوا ئەفەندی چ شتێکی شاراوەی هەبووە . " بوستانچی باشی بە ویستەوە گوتی : " پیاوێکمان ناردووە بە دوایدا ، لە دوایشدا بە باشی ماڵی ئەم تازە زاوایە دەگەڕین و دەیپشکنین . " دواتر لە ڕوومەتی هەر دووکیاندا ڕووناکییەك و ترس و حەیران مانەوەیەك پەیدا بوو . هەستانە سەرپیٚ . بەبیٚ ئەوەی کە لابکەمەوە بۆ دواوە زانیم کە ڕۆیشتوون بۆلای حەزرەتی پادشا کە پەناگەی هەموو جیهانە .

## (( ناوی من ئەستەرە )) (39)

هەمیشە بەیەکەوە گریان چەندە خۆشە ! کاتێ خزم و کەس و کار و دۆست و ژنەکانیان لە ماڵدا بۆ مەرگی باوکی شەکورە گیان دەگریان منیش خۆم دەکوتا بە زەوییاو تێر تێر دەگریام، جارجار باوەشم دەکرد بە کچە جوانەکەی پاڵ دەستمدا و دەجووڵاینەوە و دەگریاین جارجاریش خەمی ئازارەکانی خۆمم دەخوارد و دەگریام و فرمێسکم هەڵدەڕشت . ئەگەر حەوتەیەك جارێك ئاوەها بگریم ئەوەم لەبیر دەچێ کە هەموو ڕۆژێك بۆ نان دەرهێنان لەم کۆڵان بۆ ئەو کۆڵان دەگەڕێم و ئەمەش لەبیر دەکەم کە یەهوودیم و بچووك دەبینرێم و لە هەموو جارێك زیاتر دەبم بە ئەستەرێکی چەنەباز . سەەڕای ئەوەی کەلە ناو بۆنەکاندا وەکوو بزنێکی ڕەش دیارم بەڵام لەبەر ئەوەی لێرەدا دەتوانم تێری زکی خۆم نان بخۆم ئەم بۆنانەم پێ خۆشە . لە ڕۆژانی جەژندا باقلەوا و هەویری نەعنا و نانی بادامین و لە جەژنی سونەتکردنیشدا پلاوی گۆشتدار و بۆرەکی فنجانی و لە بۆنەکانی پادشاشدا لەمەیدانی ئەسپەکاندا شەربەتی تووتڕك و لە زەماوەندەکانیشدا هەر شتێك دەدەن. لە دوای ناشتنی تەرمەکانیشیان حەلوای هەنگویندار و کونجیداربۆ جیران و دراوسێکانیان دەنێرن ، خودا هەڵناگرێ منیش هەرایان پێدەکەم ! لە خواردنی ئەمانە تێر نابم . بە بێدەنگییەوە ڕۆیشتمە ناو هەیوانەکە . پێڵاوەکانم کردە پێ و ڕۆیشتمە خوارەوە .بەر لەوەی بگەڕێمەوە بۆ ناو چێشتخانەکە گوێم لە دەنگێك بوو کە لە ژووری تەنیشت گەوڕەکەوە دەهات . دەرگاکەی نیوە کراوە بوو ، لە ناکاو دوو هەنگاوم هەڵگرت و ڕۆیشتمە ناوەوە ، تەماشام کرد کە ئورهان و شەوکەت کوڕی

ژنێکیان گرتووە کە دەگری . کوڕەکەیان بە پەت بەستبووەوە وبە فڵچەکانی ئەو خوالێخۆشبووەش ڕوومەتی کوڕەکەیان بۆیاخ دەکرد . شەوکەت زلەیەکی لێدا و بە کوڕەکەی گوت : " ئەگەر بتەوێت هەڕا بکەی ئاوەها لێت دەدەین . " بە دەنگە درۆینەگەی خۆمەوە گوتم : " ڕۆڵە ! مەگەر نابێ تۆزێك خۆشتر یاری بکەن و یەکتری ئازار نەدەن ؟ " شەوکەت قیڕاندی و گوتی : " جا تۆ هەقت چیە ؟ " خۆشکە بچکۆلە قژ زەردە ترسەنۆکەکەی کوڕە لێدراوەکەشم لە تەنیشتیاندا بینی . نازانم بۆ چی بوو کە خۆمم لەگەڵیدا گرتەوە و باوەشم پێدا کرد . هەموو شتێك لەبیر بەرەوە ئەستەر ! خەیرییە لە چێشتخانەکەوە بە گومانەوە چاوی لێدەکردم . گوتم : " هەر دووکانی چاوم لە گریاندا وشك بوون ، خەیرییە بۆ خوا تۆزێك ئاوم بەرێ " بە بێدەنگییەوە پێیدام . بەرلەوەی بیخۆمەوە تەماشای چاوە هەڵئاوەساوەکانیم کرد . وتم : " خۆی لە خۆیدا زاوا ئەفەندی بێچارە بەر لە مارە بڕینەکەی شەکورە مرد بوو ، خۆ دەمی خەڵك توورەکە نیە تابیدروویتەوە تەنانەت دەڵێن بە مەرگی خۆیشی نەمردووە . " ڕاشکاوانە تەماشای لووتی پێڵاوەکانی کردو بەبێ ئەوەی تەماشای من بکات گوتی : " خوا لە تۆمەتی وشك و نابەجێ بمانپارێزێ ." حەرەکەتی یەکەمی بە مانای ئەوە بوو کە ئەو وتەیەت ڕاستە، لە چوونیەتی قسە کردنیشیدا وەهادەردەکەوێت کەلە ناچاریدا ئەو قسەیە دەکات . لە خۆمەوە وەکوو هاوڕازێك گوتم : " چی دەبێ ؟ " بەڵام خەیرییە دوودڵەکە کە دەیزانی لە دوای مەرگی زاوا هیوای سەر کەوتنی بەسەر شەکورەدا نەماوە وتی : "من چیم بەسەردا دێت ؟ " وەکوو عادەتی خەبەر دایین گوتم : " شەکورە زۆر حەزت لێدەکات . " سەر قاپی دەبس و ترشییەکەم لادا و پارچەیەکم لێنایە

دەمم و بۆنی هەندێك شتیترم كرد و گوتم : " كێ ئەم حەڵوایانەی بۆ ناردوون ؟ " خەیرییە یەكیەك ناوی دەگوتن و دەیگوت : " ئەوە هی قاسم ئەفەندی قەیسەرییە، ئەوەش هی خەڵغانەكەیە كەوا دوو كۆڵان لەولای دەستەی شێوەكارانەوە دادەنیشێ ، ئەوەش هی حەمیدە سۆلاكی كلیل سازە ، ئەمەش سینی بووكە ئەدیرنەیەكەیە " ، كە شەكورە قسەی پێبڕی و وتی : قەلبیەی ژنی زەریف ئەفەندی خوالێخۆشبوو نەهاتووە بۆ سەرە خۆشی و هەواڵیشی نەناردووە ، تەنانەت حەڵواشی بەڕێ نەكردووە ! لە دەرگای چێشتخانەكەوە بەرەو پلیكانەی بەر دەلانەكە ڕۆیشت . زانیم دەیەوێت لە من و خەیرییە دوور كەوێتەوە و قسەبكات . بۆیە چاوم لێی بوو، وتی : زەریف ئەفەندی لەگەڵ باوكمدا دوژمنایەتییەكی نەبووە ئێمە لە ژووری ناشتنی جەنازەكەیدا حەڵوامان دروست كرد و ناردمان بۆماڵەوەی . چیدەبێ حەز دەكەم بزانم . " تێگەیشتم كە شەكورە چۆن بیر دەكاتەوە و گوتم : " ئێستا دەچم و تێدەگەم كە چی بووە . " لەبەر ئەوەی كە قسەم پێی درێژ نەكرد بووەوە ماچیكردم . لەگەڵ ئەوەی كە سەرمای حەوشەكە كاریگەری دەكردە سەر دەروونمان دیسان باوەشمان كرد بە یەكدا و هەروا ڕاوەستا بووین، لە دواییدا دەستم هێنا بە قژەكانی شەكورە جوانەكەمدا .

وتی : " ئەستەر دەترسم . "

وتم : " گیانكەم مەترسە لە كۆتایی هەر شتێكدا خەیرێك هەیە ، بنواڕە چۆن زەماوەندیشت كرد . " وتی : بەڵام نازانم باشم كردووە یان نا لەبەر ئەوەی كە ئەمەم دەزانی نەمهێشت شەو نزیكم ببێتەوە و لەلای باوكە بێچارەكەمدا مایەوە . " چاوە گەورەكانی كردەوە و تەماشای نێو چاوانمی كرد وەكوو ئەوەی كە بڵێ تێدەگەی ؟ تەماشامی كرد .

وتم : " حەسەن دەڵێ مارەییەکەتان لە چاو قازی هیچ نرخێکی نیە و ئەمەی بۆ ناردووی . " هەر چەندە کە وتی ئیدی نابێ بەلام کاغەزەکەی وەرگرت و کردییەوە و خوێندییەوە ، بەلام ئەمجارەیان پێی نەگوتم چی نووسراوە . حەقم پێدا چونکە لە حەوشەکەدا ڕاوەستا بووین . لەسەرەوە دارتاشێکی جوان خەریکی چاککردنەوەی پەنجەرەکەیەکەنازانرێت بەیانی لەبەر چی شکاوە . هەر لەو کاتەشدا لە دەرگایاندا و خەیرییە هات کە دەرگاکە بۆ کوڕی دراوسێ بە وەفاکە بکاتەوە کە گوتی : حەڵوا هاتووە . شەکورە وتی : " لە زووەوە ناشتوویانە ، ئێستا واهەستدەکەم کە ڕۆحی باوکە گیانەکەم بۆ دوایین جار و بۆنەگەڕانەوە لە جەستەی جودا دەبێتەوە و دەچێتە ئاسمان" لە باوەشم دەرکەوت و تەماشای ئاسمانی کرد و بۆ ماوەیەکی درێژ دەستی بە دۆعا خوێندن کرد و نەکرد بە بەحەز کردنێکەوە نێو چاوانی ماچکردم . وتی : " ئەستەر تاوەکوو بکوژەکەی باوکم لەم دونیادا زیندوو بێت ئەوا من و کوڕەکانیشم ئاسوودە نابین . "

بیرهێنانەوەی ناوی مێردەکەیم پێخۆش بوو . وتی : " بچۆ بۆ ماڵی زەریف ئەفەندی و بنی دەمی ژنەکەی تاقی بکەرەوە و بزانە بۆ چی حەڵوایان بۆ نەناردووین و یەکسەر هەواڵەکەم پێبگەیەنەوە . " وتم : " قسەیەکت بۆ حەسەن نیە ؟ " . نەك لەبەر ئەوەی کە ئەمەم پرسکردبێ بەڵکوو لەبەر ئەوەی کاتێ ئەمەم پرسکرد نەمتوانی تەماشای نێوچاوانی بکەم شەرمم لە خۆم کردەوە.

بۆ ئەوەی کە شەرمەکەم بشارمەوە خەیرییەم ڕاگرت و سەر قاپی حەڵواکەم لادا و تۆزێکم خستە ناو دەمم و وتم : " حەڵوای فستق دارە بەلام لالەنگیشیان تێخستووە . " کاتێ شەکورە وای نیشاندا کە هەموو

شتێك وەكوو خۆیە و پێكەنی دڵی منیش ڕەحەتتر بوو . بۆخچەكەم هەڵگرت و دەركەوتم . دووهەنگاوم هەڵگرت و هەڵنەگرت سەیرم كرد كە ئەو سەری كۆڵانەكە ڕەشەی لێیە . خەزوورەكەی تازە نێژرا بوو ، خۆیشی تازە زاوا بوو . لە خۆ بەگەورە زانینەكەیشیەوەتێگەیشتم كە لە ژیانی خۆی زۆر ڕازییە . بۆ ئەوەی خۆشییەكەی تێك نەدەم لەڕێ دەركەوتم و چوومە ناو بێستانەكەوە . لە حەوشەكەی ماڵی برا هەڵواسراوەكەی پزیشكی ناودار مۆشە هامونەوە تێپەڕ بووم . هەر جار كەلەم حەوشەوە تێپەڕ دەبووم تێدەگەیشتم كەوا بۆنی مەرگی لێدێت ، ئەوەندە خەم دایدەگرتم كە ئەوەم لەبیر دەچووەوە من بۆ پەیدا كردنی مشتەری و فرۆشتنی شتێك بە یەكێك هاتووم و لەم دەڤەرانەدا دەگەڕێم .

بۆنی ئەو مەرگەی وا لەم حەوشەی‌ماڵی زەریف ئەفەندیشەوە دەهات وەكوو ئەوە وابوو بەڵام هی ئەوان ڕەنگی خەم و پەژارەی پێوە نەبوو . وەكوو ئەستەرێك كەوا سەدان بێوەژنم ناسیوە و هاتوو چۆی ماڵیانم كردووە دەزانم ئەو ژنانەی كەوا بە زوویی مێردەكانیان لە دەستداوە یان ڕوو بەڕووی شكست دەبنەوە یان وەكوو تووشی تووڕەیی و سەرهەڵداوی و ئەفسووناوی بوون دەبن ( شەكورە گیانی من لەهەر دووكیان بەشی خۆی وەرگرتووە قەلبیە خانیش ژەهری تووڕەیی خوارد بووەوە ئەمەش كارەكەی منی ئاسانتر دەكرد . ) قەلبیە خان وەكوو ئەو ژنانەی وا لەبەرامبەر بێبەزەیی و ستەمكارییەكانی ژیاندا بێبەزەییانە هەڵسووكەوتیان دەكرد وا بوو . لەگەڵ ئەو كەسانەی واله ڕۆژێ خراپیدا دەهاتنەوە بەر دەرگای ماڵەكەی بەروو خۆشییەوە هەڵسوكەوتی نەدەكرد و وایدەزانی كە ئەمە هاتوون تەماشای ئازارەكانی ئەو بكەن و گاڵتەی پێبكەن بۆیە لەگەڵ

میوانەکانیدا قسەی خۆشی نەدەکرد و یەکسەر دەچووە ناو بابەتەکەوە ، بەم دوانیوەڕوویەی کەوا قەلبیە دەیەوێت قەند ( شەکری کلۆ) دروستبکات ئەم ئەستەرە بۆچی هاتووە ؟ لەبەر ئەوەی دەمزانی گوێ ناداتە ئەو ئاورێشمانەی کەوا لە چینەوە بە کەشتی هاتوون ، هەروەها سەرنجیش ناداتە ئەو دەستمالاّنەی کەوا لەبوورساوە هاتوون ، هەر بۆیە بەبێئەوەی بۆخچەکەم بکەمەوە چوومە سەرقسەکە و دەردی شەکورە چاوتەڕەکەم بۆ گێڕایەوە و گوتم کە: " بەبێئەوەی ئاگادار بن دڵی ئەو شەکورە بێچارەیەتان شکاندووە ئەمەش دەردێکیترە بە سەر ئازارەکانی ئەوەوە . "

قەلبیە خان بە شێوازێکی لە خۆ ڕازیبوونەوە ئەوەی پشتڕاست کردەوە کە پرسیاری شەکورەی نەکردووە و تەنانەت سەرە خۆشیشی لێنەکردووە و حەلّواشی بۆ نەناردووە و ماتەمەکەی لەگەلّدا بەش نەکردووە . لەپشت ئە خۆ بە گەورە زانینەشیدا خۆشییەکی پێبوو کە نەیدەتوانی بیشارێتەوە . ئەستەرە ژیرەکەتان لە دڵگیریەکەی تێگەیشت و لەو خاڵە لاوازەوە دەستی بە دۆزینەوەی هۆکارەکانی کرد . زۆری پێنەچوو قەلبیە ئەوەی ڕاگەیاند کە لەبەر ئەو کتێبەی وا زاوا ئامادەی کردووە لێی تووڕە بووە . وتی کە ڕەحمەتی مێردی لەبەر دوو یا سێ ئاکچەی زیاتر دەستی بە یارمەتی‌دانی زاوا نەکردووە بەڵکوو زاوا گوتوویەتی ئەمە بە فەرمودەی پادشا دروستدەکرێ بۆیە مێردەکەی ڕازی بووە . لە دوایشدا ئەوەی گێڕایەوە کە لە پێشدا جوانکاری پێکردووە و دواتریش وردە وردە وێنەی پێدروست کردووە کە هەندێك لەم وێنانەش بێ‌دینی و کافیری تێدا بووە ، مێردەکەشی لەوە زۆر ناڕەحەت بووە و لە نێو ڕاستی و ناڕاستیدا ئەملا و ئەولای کردووە . بەڵام لەبەر ئەوەی کەئەو لە زەریف ئەفەندی زیاتر بە تەدبیر و وریا

و هەستیارتر بوو ئەوەشی پیٚزیاد نەكرد كە میٚردەكەشی وردە وردە لەم گومانە تیٚگەیشتووە . لەبەر ئەوەی زەریف ئەفەندی تا ئەو كاتە ڕوو بە ڕووی كوفریٚكی ئاشكرا نەبووەتەوە نائاسوودەییەكانی وەكوو ترسی خۆی نرخاندووە . خۆی لە خۆیدا زەریف ئەفەندی گویٚی لە هەموو پەندەكانی مەلا نوسرەت دەگرت و ئەگەر لە كاتی خۆیدا نویٚژەكانی نەكرد بایە هەستی بە ناسوودەیی دەكرد . لەبەر ئەوەی وەكوو سۆفییەك گریٚدراوی دینەكەی بووە كەسانی هەرچی و پەرچی لە ویٚنەكیٚشخانەكەدا گاڵتەیان پیٚكردووە بەڵام ئەو زانیویەتی كە لە ڕاستیدا ئەم گاڵتە پیٚكردنەش لەبەر هونەر و لیٚهاتوویەكەیەتی .

لە چاو پرتاندنیٚكدا دڵۆپە فرمیٚسكیٚك لە چاوە گەورەكەی قەلبییەوە داكەوتە سەر گۆناكەی و ئەستەرە نیەت باشەكەش بڕیاریدا لە یەكەم هەلدا میٚردیٚكی بۆ بدۆزیٚتەوە . بە وریاییەوە گوتی : " هەموو ئەم شتانەشی لەگەڵ مندا باس نەكردووە و من لە میٚشكی خۆمدا ڕیٚك و پیٚكم كردوون و وادەزانم كە ئەو شەوەی لە ماڵی زاواوە دەركەوتبیٚ ئەم ڕووداوە ڕوویدابیٚ."

ئەمە جۆرە داوای لیٚبووردنیٚك بوو ، لە بەرامبەردا منیش گوتم : " كیٚ دەزانیٚ لەوانەیە هەر ئەو پیاوە دڵنزمەی كەوا زەریف ئەفەندی كوشتووە زاواشی كوشتبیٚ." و سەرنجم ڕاكیٚشایە سەر ئەو خاڵە هاوبەشانە كەوا لە ئازارەكانی ئەو و شەكورەدا هەن . ئیٚستا لەلایەكیتریشەوە هەتیویٚكی سەرزل كەوا بە وریاییەوە تەماشای منی دەكرد وەزعی هەر دووكیانی لەگەڵ یەكدا بەراورد دەكرد . بەڵام ژیر بیری گەوادیم پیٚیدەگوتم كە شەكورە زۆرجوانترو دەوڵەمەندتر و ڕازدارترە . شتەكەی ناو دڵم گوتەوە و گوتم : " شەكورە گوتوویەتی ئەگەر خراپییەكم هەیە ئەوا داوای لیٚبووردنی لیٚدەكەم

، خۆشکایەتی و دۆسایەتی خۆیت پێشکەش دەکات و دەیەوێ بیر بکەیتەوە و یارمەتی بدەی . ئەو دوایین شەوەی کەوا زەریف ئەفەندی لە ماڵی ئەوانەوە دەرکەوتووە زیاترلە زەریف ئەفەندی کەسیتری بینیوە یان نا ؟ تۆ دەتزانی کە کەسیتر دەبینێ یان نا ؟ لە ناو قوتویەکی حەسیردا کە سەر قاپەکەی لە گوێزەوە دروستکرا بوو و دەرزی نەخش و پارچەی قوماشی تێدا بوو و کاغەزێکی دەرهێنا و درێژی کردەوە بۆم و گوتی : " بەس ئەمە لە گیرفانی زەریف ئەفەندییە بێچارەکەم دەرکەوت . " کاغەزە لۆچ بووەکەم وەرگرت و لە نێزیکەوە تەماشام کرد . مورەکەبەکەی لەبەر ئاوەکە بڵاوبوو بووەوە بەڵام چەندین شێوەی جۆرا و جۆری هەبوو . تێگەیشیبووم کە ئەوانەچین بەڵام قەلبیە لەناکاو بانگی مێشکمی کرد و گوتی : " ئەوانە ئەسپن ، زەریف ئەفەندی خوالێخۆشبوو ساڵانێکی درێژ بەس کاری جوانکاری و ڕازاندنەوەی دەکرد و کەسیش داوای لێنەکرد بوو کە وێنەی ئەسپ بکێشێ . " بەپەلەپەل کێشا بوونی بەڵام ئەستەرە پیرەکە کاتێ تەماشای ئەسپە بڵاو بووەکانی دەکرد شتێکی زۆری لێتێنەگەیشت . وتم : " ئەگەر ئەم کاغەزە ببەم بۆ شەکورە زۆر خۆشحاڵ دەبێ . " بە لە خۆ بایی بوونێکەوە گوتی : " ئەگەر ئەم کاغەزەی دەوێ با خۆی بێت بۆ ئێرە . "

## (( ناوی من ڕەشەیە ))  (40)

لەوانەیەتائێستا تێگەیشتبن کە بۆچی کەسێکی وەکوو من کە ئەربابی خەمە سەرتاپای عەشق و ئازار و دڵخۆشی و نەداری کردووە بە بەهانەی تەنیاییەکی بێکۆتایی ، خۆشی گەورە و خەم خواردنی زۆر واتای هەبوون نیە . من ئەوە ناڵێم کە ئەگەر کەسانیتر خەمیان هەبێ و لەم هەستانەدا بژین ئێمە هیچ خەممان نیە و بەرامبەر بەوە هەستیار نین بەڵکوو بە پێچەوانەوە لە قووڵایی ئەم هەستانە و ئەو کەسانەی وا لەوانەدا دەژین بەباشی تێدەگەین . ئەو شتەی لێی تێناگەین ئەو هەڵچوونە سەیرەیە کەوا لەو کاتانە ڕۆحمانی تێدا نێژراوە . ئەم پەشۆکاوی و هەڵچوونە عەقڵمان ڕەش دەکاتەوە و لەبەرامبەر تێگەیشتن لە خۆشی و خەمە قووڵەکان ئاستەنگی دروستدەکات . زۆر شوکر ! باوکیمان نێژا . بە هەڕا کردن گەڕامەوە بۆ ماڵ و سەرە خۆشیم لە شەکورە کرد و باوەشم پێدا کرد . لە دواییدا ژنەکەم لەگەڵ منداڵەکانیدا کە وەکوو دوژمن سەیری منیان دەکرد خۆی خستە سەر

دۆشەکەکە و کەوتە پەڵەمە گریان. منیش ئاوەها لە جێگای خۆدا وشك ڕاوەستا بووم . خەمەکانی ئەو سەر کەوتنی من بوون . لە ساتێکدا لە خەیاڵەکانی کاتی جوانیمدا زەماوەندم کرد و لە دەستی ئەو باوکەی کەوا لە کاتی خۆیدا گاڵتەی پێدەکردم ومنی بچووك دەبینی ڕزگارم بوو بوو .

کێ بڕوای بە فرمێسکەکانی من دەکرد ؟ بەڵام نا بڕوا بکەن وانەبوو . بەراستی دەمویست خەفەت بخۆم بەڵام نەمدەتوانی . چونکە زاواکەمان هەمیشە دەرهەق بەمن باوکایەتی کردووە و باوکم ئەوەی نەکردووە لەوەش زیاتر لەبەر نەوەستانی دەمی مەلا فێڵبازەکە کەوا تەرمی زاوای شۆرد بووهەر لەکاتی هەڵگرتنی جەنازەکەدا ورتە و بۆڵە و باسی ئەوە دەکرا کە زاوا ئەفەندی بە مەرگی خۆی نەمردووە . هەروەها ئەمە چۆن لەسەر قەبران و مزگەوتەکەدا بڵاو بوو بووەوە لە گەڕەکیشدا دەنگی دابووەوە ، لەبەر ئەمە ئەگەرنەگریا بایەم بە خراپەیان دەنرخاند هەر بۆیە دەمویست خەفەت بخۆم . دەزانن کە ناوەکیترین ترس بۆ مرۆڤ ترسی ئەوەیە کە بەدڵ بەردینت لەقەڵەم بدەن. بۆ ئەوەی کەسانی وەکوو من لە ناو جەماوەردا دەرنەخەنە دەرەوە پوورە خاوەن چەمکەکان هەمیشە بەهانەی حازر و ئامادەیان پێیە ودەڵێن " بۆیە بۆیە مرۆڤ دەگری " . منیش بۆیە بۆیە دەگریم ، چۆن دەبێ ئەم خزمە دوورانە ئاوەها تێر تێر دەگرین ؟ بۆ ئەوەی چاویان بەمن نەکەوێ ویستم خۆم لە گۆشەیەکدا بشارمەوە و دەمگوت : ئایا پێویستە ئیدی وەکوو پیاوی ماڵ هەڵسوکەوت بکەم ! ؟ و بەسەر ئەو وەزعەدا زاڵ ببم ؟ کە لەم کاتانەدا لە دەرگایاندا . بۆ ساتێك پەشۆکام و وامزانی حەسەنە . بەڵام هەر لەم دۆزەخی گریانە نەجاتم ببێ بەهەر شتێك ڕازی دەبم ، کوڕە درگاوانێکی کۆشك بوو ، بانگیان کرد بووم . سەرم سووڕمابوو . کاتێ لە

حەوشەكەوە دەركەوتم ، لە ناو ئەو قوڕەدا ئاكچەیەكم لەسەر زەوی دۆزییەوە . لەبەر ئەوەی لە كۆشكەوە بانگیان كرد بووم زۆر دەترسام یان نا ؟ بەڵێ دەترسام ، بەڵام لەبەر ئەوەی بەم سەرمایە لەگەڵ سەگ و دار و مرۆڤەكاندا لە ناو كۆڵانەكەدا بووم زۆر مەمنون بووم . وەكوو ئەوانەی بەر لەوەی بیانبەن و تەسلیمی جەلادیان بكەن بیانەوێ لەگەڵ زیندانییەكانیتردا تۆزێك قسە بكەن و باسی ئەملا و ئەولای جوانییەكانی ژیان و هەوری سەر حەوشەكە و واقە واقی ناو ئاوەكان بكەن و دۆسایەتی بكەن ، منیش ویستم ئاوەها لەگەڵ دەرگاوانەكەدا هاوڕێیەتی بكەم . كەچی ئەم كوڕە زیپكنیە كوڕێكی ڕووترش و تاڵ دەركەوت . بە حەیران مانەوەیەكەوە تەماشای داری سەروە درێژەكانم دەكرد كەوا بە درێژایی پەتێك بە ناسكی ڕاكشابوون ، دوای ئەو هەموو ساڵە ئێستا لەگەڵ شەكورەدام ومردنی لەناكاوم شتێكی مەترسیدار دەبوو. لەباتی ئەوە لە جێگایەكدا لەگەڵ شەكورەدا بخەوم و تێری دڵی خۆم لەگەڵیدا جووت ببم ، گیاندان لە ژێر ئەشكەنجەی كۆشكدا بە ناهەقی دەزانم ، هەر ئەم ناهەقیەش لەرزی دەخستە گیانم . نەڕۆیشتینە ناو ئەو دەرگا ناوەراستینەی كەوا لە پشتی جێگای ئەشكەنجەگەران و جەللادە دەست سووكەكانەوە بوو . بە ترسە ترسەوە تەماشای كەلوەكانیم دەكرد . بەرەولای دارتاشخانەكە دەڕۆیشتین . كاتێ لەناو گەنجینە و ئەنبارەكانەوە تێپەڕ دەبووین چاوم بە ئەسپێكی كەژاڵ كەوت كە لە لموزییەوە هەڵم هەڵدەستا و پشیلەیەكیش لە بەینی لاقەكانیەوە خەریكی لێسانەوەی قوڕەكە بوو . پشیلەكەش وەكوو ئێمەی مرۆڤ زیادە لەحەد بە پیساوییەكەی خۆیەوە خەریك بووبوو و تەماشای ئێمەشی نەكرد . لەپشتی گەنجینەكانەوە دوو پیاو بە جلە مۆر و سەوزەكانی خۆیانەوە هاتن و بە

بێدەنگی منیان لە کوڕەکە وەرگرت ، نەمزانی ئەمانە پیاوی کێن . خستمیانە ناو ژوورێکەوە و دەرگاکەیان لێداخستم ، لە بۆنی تەختەکانیەوە دیار بووکە تازە دروستکراوە . دەمزانی خرانە ناو ژوورێکی تاریك ترساندنی بەر لە ئەشکەنجەدانە و وەها خەیاڵم کرد کە لەوانەیە کارەکەیان بە فەلاقە دەست پێبکەن هەروەها بیریشم لەوە دەکردەوە کە چ درۆیەك ڕێك و پێك بکەم بۆ ئەوەی کەوا لەم وەزعە ڕزگارم ببێ . لەوە دەچێ لە تەنیشتیشەوە جەنجاڵێك هەبووبێ بۆیە ئاوەها دەنگە دەنگەکە لەوێوە دوور دەبووەوە . تەماشای قسە دڵخۆشکەرەکان و گاڵتەکانی من دەکەن و وەها بیر دەکەنەوە وەکوو کەسێك قسە ناکەم کە بەرەو ئەشکەنجەدران بچێ . ئەوەم پێنەگوتبوون کە بڕوام وایە عەبدێکی خۆش شانسی خودام . ئەگەر ئەو پەلەوری شانسانەی وا لەم دوو ڕۆژەی دواییدا لەدوای هەموو زەحمەتییەکانم ڕوویان تێکردووم بەڵگەی خۆش شانس بوونی من نەبن دەبێ ئەو پارەییەی کە لە حەوشەکەدا دۆزیمەوە نهێنییەکی تێدا هەبێ . کاتێ چاوەڕوانی ئەشکەنجەم دەکرد زۆربە باشی بڕوام بەوە هێنا بوو کە ئەم ئاکچەیە دەمپارێزێت و خۆمم بەوە دڵخۆش دە کرد ، ئەوەم وەکوو ئامانجەیەك دەبینی کە خودا بۆی ناردووم . گرتم بە دەستمەوە و ماچمکرد.بەڵام کاتێ منیان لەو تاریکاییەوە دەرخست و بردمیانە ژوورەکەیترەوە و چاوم بە بوستانچیباشی کەوت و ئەشکەنجەگەرە کەچەڵە ( کراوتیە ) کانم بینی زانیم ئاکچەکەش قیمەتی نیە و پارەش ناکات . هەروەها ئەوەش تێگەیشتم کە دەنگە بێبەزەییەکەی دەروونم ڕاستی دەگوت کەوا دەیگوت : ئەم ئاکچەیە یەکێکە لە ئاکچەکانی سەری شەکورەیە کە چەند ڕۆژ بەر لە ئێستا لە حەوشەکەدا کەوتووە و منداڵەکانیش

نەیاندۆزیوەتەوە . بەم شێوەش کاتیٚ خۆمم تەسلیم بە ئەشکەنجە گەرەکەم کرد ئیدی هیچ خەیالێکم بۆنەمابوو کە دەستی پێوە بگرم . هەستیشم پێنەکرد بوو بەڵام فرمێسکی چاوەکانم دەستی بە ڕژان کرد بوو . ویستم بپاڕێمەوە کەچی دەنگم وەکوو ئەوەی ناو خەونەکانم دەرنەدەکەوت و نەمدەتوانی قسە بکەم . لە دەرەوە دەمزانی کە لە ڕێگای سیاسەتەوە لە چرکە ساتێکدا مرۆۋ لە ڕێگای ئەم ئەشکەنجە کردن ومەیدانی شەڕانەوە لەناو دەچیٚ و دەبیٚ بە هیچ . بەڵام من بۆیە بۆیە ئەمانە نەژیابووم . منیان ڕووت کردەوە ، چۆخە و کراسەکەیان لەبەر داکەندم . یەکێك لە جەللادەکان دانیشتە سەرم و ئەژنۆکانی خستە سەر دەستەکانم . یەکێکیتریش وەکوو ژنێکی بە ئەزمون دەستەکانی خستە ئەملا و ئەولای سەرم و قەفەسەکەی کردە سەرم و بە هێواشی دوکمەکەی دەچەرخاند ، ئەمە قەفەسە نەبوو مەنگەنەیەك بوو کەوا لە دوو لاوە زەختی دەخستە سەر سەرم . بە هەموو هێزێکمەوە قیڕاندم . بە وشەیەکی نەزانراوەوە دەپاڕامەوە . گریام. لەبەر ئەوەی کە دەمارەکانمی نەرم دەکردەوە ڕاوەستان و پرسیاریان کرد کە ئایا من زاوا ئەفەندیم کوشتووە ؟ هەناسەیەکم هەڵکێشا : " نا " . جارێکیتر دەستی بە بادانەوەی دوکمەکە کرد . ئازاری زۆری هەیە . جارێکیتر پرسیاریان کرد . وتم : " نا " .

- " کیٚ "

- نازانم ! " بیرم لەسەر ئەوە دەکردەوە کە ئایا بڵێم من کوشتوومە یان نا ، دونیا لە دەوری سەرمدا دەخولایەوەو بیٚوێستییەك دەروونمی داگرتەوە . پرسیارم لە خۆم کرد کە ئایا دەتوانم بە ئازار ڕابێم . من و جەلادەکان بۆ ساتێك هەروا ماینەوە . هیچ نەدەیەشا تەنیا دەترسام . لە

**ئاکچەکەی گیرفانمەوە تێگەیشتم کە نامکوژن ، لە ناکاو بەریاندام . لەراستیدا قەفەسی ئەو مەنگەنەیەی کەوا خستبوویانە سەرم زەختی کەمی هێنابووە سەر سەرم . ئەو جەلادەی کەوا ڕۆیشتبووە سەری من دابەزی بەڵام حاڵێکی وای نەبوو کە داوای لێبووردن بکات. کراس و چۆخەکەم کردە بەرم. ماوەیەکی درێژ بێدەنگی دروست بوو . لەو پەڕی ژوورەکەدا چاوم بە وەستا عوسمان کەوت و ڕۆیشتم و دەستیم ماچکرد . پێی وتم: " خەفەت مەخۆ ڕۆڵە ، تاقییان کردیتەوە " یەکسەر تێگەیشتم لە دوای زاوا ئەفەندی باوکێکیترم بۆ خۆم دۆزیوەتەوە . بۆستانچی باشی گوتی : " بە فەرموودەی پاشاکەمان ئێستا ئەشکەنجەت لێناکەین ،فەرمانی داوە کە لەگەڵ وەستا عوسماندا ئو پیاو کوژە بدۆزنەوە کەوا شێوەکاران و پیاوانی پادشا دەکوژێ . لە ناو سێ ڕۆژدا تەماشای وێنەکانیان دەکەن و لەگەڵیاندا قسە دەکەن و تێدەکۆشن بۆ ئەوەی بزانن ئەم ناپیاوە کێیە . پادشا لە قسەگێڕانەوەی فیتنەچییەکان لەسەر شێوەکاران و کتێبەکانی زۆر تووڕە بووە . وەکوو فەرموودەی پادشا من و هازم ئاغای خەزێنەداریش بۆ دۆزینەوەی ئەم ناپیاوە هاوکاریتان دەکەین . یەکێکتان خزمی زاوا ئەفەندین و گوێتان لە قسەکانی بووە ودەزانن ئەو شێوەکارانەی وا شەوان هاتوون چۆن کاریان کردووە و گوێتان لە داستانی وێنەکان بووە . ئەویتریشتان وەستایەکە کەوا پەسنی خۆی بەوە دەداتەوە شێوەکارانی لای خۆی وەکوو ناو لەپی خۆی دەناسێ . ئەگەر لە سێ ڕۆژدا ئەو ناپیاوە و ئەو لاپەڕە ون بووە نەدۆزنەوە کە لەم ڕۆژانەدا قسەی زۆر لەسەر دەکرێت پادشا فەرمانی داوە کە تۆ " کوڕم ! ، ڕەشە ئەفەندی بۆ یەکەم جار بخرێیتە ژێر ئەشکەنجەوە . لە دوایشدا گومان لەوە نیە کە نۆرە دەگات بە**

شێوەكارانیتریش . " لە نێوان ئە دوو دۆستە كۆنەدا یانی وەستا عوسمان و هازم ئاغای خەزێنەدار كە سالآنێكی درێژ پێكەوە كاریان كردووە و ڕاسپاردەی بۆ وەستا عوسمان دەهێنا و كەلوپەل و پارەی پێدەدا هیچ جۆرە ئامآژە كردنێكی بەمانام نەبینی . بۆستانچی باشی گوتی : " هەمووتان دەزانن ئەگەر لە ناو ژوورێك یا دەزگایەكی سەر بە پادشاكەماندا تاوانێك ڕوویدات تا ئەو كاتەی تاوانبارەكە دیار دەبێت و دەدۆزرێتەوە تەواوی دەزگاكە لە ژێر تۆمەتدا دەبیٚ و ئەگەر نەدۆزرێتەوە لە سەرووی هەموویانەوە ئاغا و گەورەی ئەو دەزگایەوتەواوی ئەندامەكانی وەكوو كەسان و دەزگایەكی پیاو كوژ و تاوانبار ناویان دەچێتە ناو دەفتەرەوە . لەم ڕووەشەوە پێویستە وەستا عوسمان چاوەكانی باش بكاتەوە و بە چاوە تێژەكانیەوە هەموو لاپەڕەكان لێكبداتەوە و ئەوفرت و فێڵ و فیتنەیەی وا شێوەكارە بێتاوانەكانی بەرداوەتە گیانی یەك بدۆزێتەوە و تاوانبارەكەش ڕادەستی عەدالەتی پادشای جیهان پەنا بكات . بۆ ئەمەش هەموو شتێكمان هێناوە و هەموو شتێكیتریشتان بۆ دێنین ، پیاوەكانم مالّی یەك بە یەكی وەستا شێوەكارەكان دەپشكنن و هەموو ئەو كتێب و وێنانەی كە كێشاویانە كۆدەكەنەوە و دەیهێنن بۆ لای ئێوە .

## (41) (( وەستا عوسمانم ))

لە دوایی ئەوەی کە بوستانچیباشی وخەزێنەدار فەرموودەکانی پادشایان پێڕاگەیاندین من وئەو لە ژوورەکەدا بە تەنیا ماینەوە. سروشتیە کە ڕەشە لەبەر فێڵی ئەشکەنجە کردنەکەو فرمێسکەکانی چاوی ماندووخەفەتبار بووبێ. وەکو منداڵێك بێدەنگ بووبوو. خەریك بوو لەوە تێدەگەیشتم کە حەزی لێدەکەم. دەستم پێوەنەدا. بۆ تەماشاکردنی ئەو لاپەڕانەی کە پیاوەکانی بۆستانچیباشی لە ماڵی شێوەکارانەوە هێنابوویان

وبۆ ناسینەوەی ئەم شێوەکارانە تەنیا سێ ڕۆژم ماوەم هەبوو. خۆ دەزانن کاتێك چاوم بە وێنەکانی کتێبەکەی زاوا ئەفەندی کەوت کە ڕەشە بۆ پاکانەکردنی خۆیو زاواکەی هێنابوون و تەسلیمی هازم ئاغای خەزێنەداری کردبوو بێزم هاتبوەوە وڕقم هەستا بوو. بەڵام پێویستە ئەوەش قبوڵ بکرێت کە ئەو لاپەڕانەی وا ئەوەندە ڕق و بێزاری کەسێکیان هەستاندووە تەواوی تەمەنی بۆ ئەم کارە تەرخانکردووە شتانێکیشی تێدایە کە چاوی ئێمەش نایانبینێ، چونکە هونەرێکی خراپ ناتوانێ ڕق و بێزاری هەستێنێتەوە. بە مەراقێکی ئاوەها دیسان تەماشای وێنەکانی ئەو گەمژەیەم کرد، کەلە نیوە شەواندا بەدەستی شێوەکاران کێشابووی. وەکو وێنەکانی ترلەناولاپەڕەیەکی چۆڵدا لە بەینی چوارچێوەکانی زەریف ئەفەندی چاوم بە وێنەی درەختێك کەوت. خەیالم لەوە دەکردەوە کەکام بەسەرهات لە کام کۆبوونەوەدا دەرکەوتووە ئەگەر بەشێوەکارەکانی خۆم یانی پەپولەی خۆشەویست و لەق لەقی ژێر بیرو زەیتوونی فێڵباز بڵێم کە وێنەی دەرەختێك بکێشن بۆ ئەوەی کەوا بە ئاسوودەییەوە بیکێشین لە سەرەتادا وە ها خەیاڵ دەکەن کە ئەمە بەشێکی داستانێکە. ئەگەر بەسەرنجەوە تەماشایی درەختەکەو لق وپۆپەکانی بکەم دەتوانم بزانم کەچ داستانێکیان ( بەسەرهات ) لەخەیاڵی خۆدا بەرجەستەکردۆتەوە. بەڵام ئەم دارە دارێکی تەنیا و بێچارەبوو: لەدوای ئەوەو بۆ ئەوەی کە درەختەکە تەنیاتر نیشانبدرێت خەتێکی بەرز کراوی ئاسۆی لێبوو کەنەریتی وەستا کۆنەکانی شیرازی وەبیردەهێنایەوە. لەبەر ئەوەی کە خەتی ئاسۆکەی بەرزکرابووەوە، لە نێو بۆشاییەکەدا هیچ شتێکی تریان نەکێشابوو. بەم شێوەیەش لە تێکەڵاوکردنی نەریتی ڕۆژئاواییەکان کە وێنەی درەختێك

وەکوو درەختێك دەکێشێتەوە و نەریتی ئێرانیەکان کە دەیەوێت لەسەرەوە تەماشای هەموو شتێك بکات وێنەیەکی ئاوەها خەفەتبار دروستکرابوو. شێوەکارانی من و ئەم پیاوە گێلە کەم عەقڵە کەویستبوویان دوونەریتی جیاواز تێکەڵاو بکەن شتێکی دوور لە هونەریان بەرهەم هێنابوو. ئەوەی کەمنی تووڕە دەکرد ئەوە نەبوو کە وێنەکە لە هەردوو دونیاکەدا خۆی بەخێو دەکرد و جێگای هەبوو، بەڵکو ئەوە بووکە وێنەکە هونەری‌تێدا نەبوو. کاتێ تەماشای وێنەکانیترو وێنەی ئەسپە نمونەییە خەیاڵیەکە و ژنە کورتە باڵاکەم دەکرد هەستم بەم شتانە نەدەکردە . شێوەی هەڵبژاردنی بابەتی دوو ئەم عەوداڵەش ڕقی منی هەڵدەستاند. ئەوە ئاشکرابوو کە شێوەکارانی من ئەمەیان خستبووە ناو کتێبکەی پاشاوە، دیسان لەبەرامبەر ویستی خودای گەورەدا کەبەر لە تەواو بوونی کتێبەکە گیانی زاوای گرتبوو حەیران مابووومەوە. تەواوکردنی ئەو کتێبە نەدەکەوتە دڵی من. ئایا توڕەبوونم لە بەرامبەر کەفی ئەو ئاوەدا کەوا وەکوو برایەك لە ژێر لووتمانەوە سەیری دەکردین و لەسەرەوە کێشرابوو لەدەستی مندایە ؟ چونکە کاتێ چاوم بەسادەیی وەستانی کەفەکە دەکەوت و ئەوەشم دەبینی کەلەکاتی نێزیککردنەوەی سەری خۆی بە خاکەکە بە نیگایەکی جوانی هەڕەشەکەرانەوە و سەیرمان دەکات و سپیایی و تیژی ددانەکانی دەردەخا، لەلایەکەوە حەیرانی ئەو هونەرو دەست و قەڵەمە دەبووم ( خەریکبوو تێبگەم کەکێ قەڵەمی لێداوە )و لەلایەکیتریشەوە لەبەر ئەوەی کەئەم هونەرەی خستۆتە بن خزمەتی ژێر بیرییە پڕوپووچەکانی ئیرادەیەکی نەزانراوەو نەمدەتوانی لێی ببورم ئارەزووی لاسایکردنەوەی ڕۆژئاواییەکان ویستی پادشاش لەسەر ئەوەی کە کتێبێك بەنەریتی ڕۆژئاوایی

دروستبکاو وەکوو خەڵات بۆ وەنێزییەکانی بنێرێ‌و شتی لەم چەشنە لەلای من پەسەندنیەو بۆشم نابەخشرێ. سوورایی وێنەیەکی خنجیلانە کەوا تێگەیشتبووم هەرلایەکی بەدەستی وێنەکێشێك فڵچەی لێدراوە منی دەترساند. لەنێو وێنەکەدا دەستێك کە نەمدەزانی هی کێیە بەپێی ژێر بیریەکی شاراوە بەڕەنگی سوور بۆیاخکرابوو، لەدواییدا ئەو دونیایەی کە وێنەکە نیشانیدابوو وردە وردە لە سوورابییدا دەخنکا. ماوەیەك ئەوەم بە ڕەشە نیشاندا و گوتم کە دارچناری ناو وێنەکە کاری لەق لەقەو کەشتیەکان و ماڵەکان بەدەستی زەیتوون دروستکراون و کۆلارەو گوڵەکان کاری پەپوولەیەو شتانیتری ناو وێنە جەنجاڵە کەشم بۆ دەستنیشانکرد. ڕەشە گوتی: شتێکی مسۆگەرە کەکەسێکی وەکو ئێوە کەسەردەستەیی شێوەکارانی کردووە هونەری شێوەکارانی خۆی و فڵچەو سروشت و خۆشەویستی‌یەك بەیەکیان دەزانێت. بەڵام ئە گەر کاتێك کتێب دۆستێکی سەیری وەکو زاوای من شێوەکارانی ناچاری ئەوە بکات بە نەریتی تازەترو نەزانراوەوە وێنە بکێشن ئەو کاتە ئێوە دەتوانن بیاندۆزنەوە چۆن دڵنیا دەبن کە کامەیان هی کێیە؟ بە گێڕانەوەی بە سەرهاتێك وەڵامم دایەوەو گوتم : کاتی خۆی لە ئیسفەهاندا پادشایەکی نەخش وکتێبدۆست لە ناو قەڵاکەی خۆیدا کەلە بەرزترین شوێنی ئیسفەهاندا بووە بە تەنیایی ژیانی بردۆتە سەر، ئەم کابرایە پادشایەکی ژیرو بە هێزەبووە بەڵام زۆر بێبەزەیی بووە . لەو کتێبانەی‌وا وێنەی دروستکراوی بە ویستی خۆی تێدا هەبووەو لە کچەکەی زیاتر حەزی لە هیچ شتێکیتر نەکردووە. ئەوەندە وابەستەی کچەکەی بووە کە ئەگەر دوژمنەکانی دیعایەی عاشقبوونی بە کچەکەی خۆیان لەسەر بڵاوبکردبەیەتەوە، ناهەق نەدەبوون. چونکە ئەوەندە خانە

گومان بوو کە ئەگەر لەوڵاتانی دراوسێوەپادشایەك یان شازادەیەك هەواڵی بناردبایە و بیوستبایە داوای کچەکەی بکات دەست بەجێ لەگەڵیاندا دەکەوتە ناو شەڕو پێکدادان. دیارە پادشا شوویەکی شایستەو باشی بۆ کچەکەی نەدۆزییووەوە. چل دەرگاشی لە کچەکەی دەخستبووەو لە چلە مین ژووردا شاردوویەتەوە. چونکە ئەویش بڕوای بەو شتە هەڵەیەبوو کەلەوێدا باوبوو دەیگوت کە ئەگەر کچەکەم چاوی بە کوڕێکیتر بکەوێ جوانییەکەی لەدەست دەدات و زەرد هەڵدەگەڕێتەوە.

دروستکردنی کتێبێکی خەسرەو شیرینی ڕاسپاردبوو، کاتێك نووسینەکەی تەواو بوو، قسەیەك لەناو شاردا بڵاوبووەتەوە کە بەڵێ ئەو کچە کاڵە جوانەی وا لە فلاّن لاپەڕەدایە وێنەی کچەکەی پادشاخانە گومانەکەیە: (خانوومان ). بەرلەوەی کە ئەم قسانە ببیستێتەوە خۆی بەدەستی لەرزۆك و فرمێسکەکانی چاوییەوە هەستی بەمە کردبوو وگومانی کەوتبووە سەر وێنەی کتێبەکە. بەپێی ئەو شتانەی کە دەگوترێ وێنەکە هی خودی کچەکە نەبووە بەلاّم جوانیەکەی زۆر لەو ئەچووە و وەکوئەوە وابووە کە نیوە شەوێك لە پشتی چل دەرگاکەوەو لە نێو کونی کلیلەکانەوە دەرکەوتبێ و چووبێتەوە ناو نیگاکانی شێوەکارەکەوە. ئەم وێنە کێشە بەبێئەوەیپاڵ بدات بە گۆشەیەکەوە ئەمەی کێشابوو، ئەمە وێنەی ئەوکاتە بووەکە شیرین لە کاتی گەشت وگوزار لەسەوزەلاّنییەکدا چاوی بە وێنەی خەسرەو کەوتووەو عاشقی بووە.

ڕەشە گوتی: وەستام! ئەفەندم! ئەمە ڕاستهاتەیەکی گەورەیە، چونکە ئێمەش حەز لەوێنەی ئەو چیرۆکە دەکەین:

وتم: ئەمانە چیرۆك نین بەسەرهاتن. تۆ گویٚ بگرە: شێوەكارەكە كچی پادشای لە باتی شیریندا نەكێشاوە. بەڵكوو وەكو كچە عوودچییەك كێشاویەتی كە عودژەنی دەكا و یارمەتی شیرین دەدات و سوفرە ڕادەخات ئەو كاتانەی كە وێنەی كچە نەدیمە (خزمەتكارە)كەی كێشابوو ئیلهامێكی تایبەتی بۆ هاتبوو.

بەو شێوەیەش جوانی شیرین لە بەرامبەر جوانی كچەكەدا كەم ماوەتەوە و هاوسەنگی وێنەكە تێكچووە. پادشا كاتیٚ چاوی بەوێنەی كچەكە كەوتووە داوایكرد كە شێوەكارەكەیبۆ بدۆزنەوە. بەڵام شێوەكارە فێڵبازەكەلە تووڕەیی پادشا ئاگادار بووەو بۆئەوەی كە نەیدۆزێتەوە وێنەكەی بە شێوازێكیتر كێشاوە هەروەها لەبەرئەوەی وێنەكێشیتریش دەست و قەڵەمیان لە وێنەكەداوە دڵی ئاسوودە بووە.

- باشە، پادشاكە چۆن وێنەكێشەكەی دۆزیوەتەوە؟
- بەتەماشاكردنی گوێكانیان !
- بەتەماشاكردنی گوێی كیٚ؟ هیكچەكەی یاخود وێنەی كچەكەی؟

لە ڕاستیدا هی هیچكامیان. لەپێشدا بە وردی تەماشایی ئەو كتێب و لاپەڕانەی كردووە كەوا شێوەكاران كێشاویانە و سەرەنجی داوەتە سەر ئەوەی كە هەریەكە و بە هیچ شێوەیەك گوێیان دروستكردووە، لەدواییدا ئەو شتەی دیسان بینییەوە كەوا سالآنێك بوو دەیزانی ! ئەوەش ئەوەیە كە هەر شێوەكارێك كیٚدەبیٚ بابیٚ و هونەرەكەی چیدەبیٚ بابیٚ بە گوێرەی خۆی وێنە دەكێشێت. حەز دەكەن وێنەی پادشایەك یاخود منالێك یان شەڕكەرێك، پێغەمبەرێك، یان وەكو ڕوویەكی شاراوە بێت لە پشت پەچەكەیدا تەنانەت حاشا! هی شەیتانیش بێت فەرق ناكات ئەو هەر وەك

خۆی دەیانکێشێ. هەر شێوەکارێك لەهەر وەزعێکدا وەکو ئیمزایەکی شاراوە شتێکی وەکو خۆی کێشاوەتەوە.

- بۆچی؟

- . وەستاکانی شێوەکاری لەکاتی کێشانی ڕوخسارێکدا سەرنج دەدەنە سەر ئەوەی کە گوزارشت لە چیدەکات، هەروەها سەرنج دەدەنە سەر ئەوەی کەلە قاڵبە کۆنەکان دەچێ یان ناچێیاخود جوانی تەواوی ڕوخسارەکە لە قاڵبەکە دەچێو لەگەڵیدا جۆر دەبێتەوە یا دەنا. بەڵام کاتێ گەیشتنە گوێ لەڕووی قاڵبەوە نایکێشن و لاسایی ناکەنەوە و تەماشایی گۆییەکی ڕاستەقینە ناکەن. کاتێك گوێ دروستدەکەن بیرناکەنەوە سەرنج نادەن و بەباشی لەسەری ڕاناوەستن، بەم شێوەیەش قەڵەمەکانیان لەبەر خۆیەوە دەسووڕێتەوە.

ڕەشە وتی:" بەڵام !مەگەر وەستا کۆنەکان وێنە دەرئاساییەکانی خۆیان بێ ئەوەی تەماشایی درەختەکان و ئەسپەکان و مرۆڤەکان بکەن ناکێشن و لەبەر خۆیانە وە نایانکێشنەوە؟"

وتم: ڕاستە . بەڵام ئەمە بە ساڵانێك بیرکردنەوە و مێشك ماندووکردنەوە مومکین دەبێت. لەبەر ئەوەی لە ژیان خۆیاندا بە ئەندازەیەکی زۆر ئەسپیان بینیوە، دەزانن کە ئەگەر لە کاتی کێشانی ئەسپێکداله پێشدا تەماشایی ئەسپەکە بکات و دوایی بیری لێبکاتەوەو بیکێشێجوانییە دروستبووەکەی ئەسپەکە لەناو مێشکیاندا تێکدەچێ. وەستا بەدەیان هەزار جار وێنەی ئەسپ دەکێشێ تاوەکو لەدواییدا نێزیکی وێنەی ئەو ئەسپە دەبێتەوە کە خودا دایڕشتووە. کاتێ ئەمەشی کێشا بە تەجرووبەوە ئەزمونی خۆی لەقەڵەمی دەدات. ئەو ئەسپەی لەخۆوە بکێشرێ بە هونەرو زانابوونەوە

ناكێشرێ‌و له ئه‌سپه‌كه‌ی خه‌یاڵی خوداوه نێزیكتره. به‌ڵام ئه‌گه‌ر به‌بێ كۆكردنه‌وه‌ی زانیاری وێنه‌ی گوێ بكێشێ و ئه‌زانی كه چیده‌كات و گوێ نه‌داته گوێی كچی پادشا، ئه‌وا ئه‌و گوێ هه‌میشه ده‌بێت به‌كه‌موكوڕییه‌ك و ده‌مێنێته‌وه. له‌به‌ر ئه‌وه‌ی كه‌مووكوڕی هه‌ر شێوه‌كارێك جیاوازه، له واتایه‌كدا ئه‌مه ده‌بێته به‌جۆره ئیمزایه‌كی ئه‌و وێنه‌كێشه. ده‌نگه ده‌نگو جموجۆڵێك هات. پیاوه‌كانی بۆستانچیباشی! وێنه‌و لاپه‌ڕه‌ی كۆنه‌كانی وێنه كێشخانه‌كه‌یان كۆكردبووه‌وه‌و هێنابوویان. وه‌كو ئه‌وه‌ی بمه‌وێ ڕه‌شه پێبكه‌نێ گوتم: خۆی له‌خۆیدا گوێ كه‌مووكوڕی مرۆڤه، له‌هه‌ر كه‌سێكدا جۆرێكه‌و له‌هه‌موو كه‌سێكیشدا یه‌ك جۆره، شتێكی پیسه.

-: ئه‌و شێوه‌كاره‌ی كه‌وا به ئیمزای گوێوه خۆی دابوو به‌ده‌سته‌وه چی به‌سه‌رهاتووه؟

-: كوێركرا، بۆ ئه‌وه‌ی كه‌وا ڕه‌شه خه‌فه‌تی زیاتر نه‌خوات گوتم: دوایی له‌گه‌ڵ كچی پادشادا زه‌ماوه‌ندی كرد. له‌و ڕۆژه‌شه‌وه تاووه‌كوو ئه‌مڕۆ ئه‌م شێوازی دۆزینه‌وه‌ی شێوه‌كاران به‌ڕێگای گوێوه له نێو پادشاو خان وسه‌رده‌سته‌ی شێوه‌كاراندا به‌شێوازی ((كچه نه‌دیمه )) ناسراوه و باوبووه به‌ڵام بۆئه‌وه‌ی كه ئه‌گه‌ر شێوه‌كارێك وێنه‌یه‌ك بكێشێت بزانرێت كه كێیه ونه‌توانی ڕه‌تی بكاته‌وه، وه‌كوو نهێنییه‌ك ده‌شاردرێته‌وه. خاڵی لاوازی كێشه‌كه لایه‌نی كه‌م نرخ و به‌های وێنه‌یه له دڵی شێوه‌كاردا كه له‌دڵیدا جێگا ناگرێ‌و دووباره ده‌یكێشێته‌وه، جا گرنگ ئه‌وه‌یه كه ئه‌و لایه‌نانه بدۆزرێنه‌وه. ئه‌مه ده‌توانێ گوێ، ده‌ست، گیاكان و په‌له‌كان یان وه‌كو یاڵی ئه‌سپه‌كان ته‌نانه‌ت پێ وسمه‌كانیشیان بێت. به‌ڵام ده‌بێ وریابی كه شێوه‌كار نه‌زانێت كه ئه‌و شته بووه به ئیمزای شاراوه‌ی. بۆ نموونه سمێڵ

نابێت، چونکە کەس سەرنجیان ناداتێ، ئێستاوەرە با سەیری وێنەکانی زاوا ڕەحمەتیەکەت بکەین وبزانین کە کام وێنەو فلچەو قەڵەم هی کام وەستای گەنجە: بەم شێوەیە لاپەڕەکانی کتێبە شاراوەکەی زاوا ئەفەندی و ئەوەی وابەئاشکرایی لەژێر بەرپرسیاری مندا لەسەر جەژنی سوونەتکردنی شازادەکان درووستکرابوون خرانە پاڵیەك ومن ورەشە بە هاوێنەکەی منەوە بە هەستیارییەوە تەماشامانکرد.

1- لەلاپەڕەیەکی جەژننامەکەدا لەکاتی بەڕێوەبردنی جەژنەکەدا پێیست گورووەکان لەبەر کۆشکی پادشاوە تێپەڕدەبوون کەوا تایبەت بۆ سەیرکردنی بۆنەکان . سەرنجمان چووە سەر پینەچی‌یەکی عەباسوورو پشتوێن مۆر، کە پێستی ڕێویەکی دەم کراوەی لەباوەشدابوو. ددانەکانی ئەم ڕێوییەکە یەکەبەیەکە دیاربوون،ئەمە لەگەڵ ددانەکانی وێنەی شەیتانەکەی کتێبی زاوا، کەوامدەزانی لەسەمەرقەندەوە هێنابووی بەدەستی زەیتوونەوە کێشرابێ.

2- لەژێر پەنجەرەکەی پادشادا کەلەڕۆژانی خۆشی و ڕابواردندا لەوێوە تەماشای مەیدانی ئەسپەکەی دەکرد، دەستەیەك لەکەمئەندامە هەژارەکانی شەڕی سەرسنوور بە جلە شڕۆلەکانیانەوە دیاربوون. لەناو ئەوەنەدا یەکێکیان بەپادشا دەڵێت" ئەی پادشا! ئێمە سەربازە گیانفیداکانی تۆین کە لەشەڕی کافرەکاندا لە ڕێگای دیندا گیانبازیمان کردووە وبەدیل گیراوین. کافرەکان بۆ بەردانی هەریەکە لەئێمە یەك لە خزمەکانی ئێمەیان بە دیل وەرگرتووە، کاتێ گەڕاینەوە ئەستەنبووڵ شت ئەوەندە گران بووە کەناتوانین پارە کۆبکەینەوە و خزمە گیراوەکانمان ئازاد بکەین. بۆیە ئێمە هەموومان نیازمەندی یارمەتی تۆین، یان وەکو ئەسیرمان

بدەرێ تاوەکو بچین و براگیراوەکانمان بەربدەین. لەم کاتەشدا سەگێکی تەمبەڵ لە گۆشەیەکەوە تەماشای پادشاو گیانبازە هەژارەکان و نێردراوەکانی تاتارو ئێرانی دەکات. چنگوڵەکانی ئەم سەگە لەگەڵ وێنەی چنگوڵی سەگێك لە وێنەی بەسەرهاتەکانی پارە لە کتێبەکەی زاوادا کە گۆشەیەکی گرتووە لەیەك دەچن. دیارە ئەمانە بەدەستی لەق لەقەوە کێشراون.

3- لە نێوان ئەو فێڵبازو سیحربازانەی کەوا لە بەردەم پادشادا تەقلە لێدەدەن لەسەر تەختەدا هێلکە دەبەن بەڕێوە، یەکێکی کەچەڵی چۆخەمۆری تێدایە کەلەسەرقاڵییە سوورەکەدا چۆکی داداوە و دەفەکەی گرتووە بەدەستەوەوبە پەنجەکانی دەیژەنێت. ئەمە لەگەڵ دەستەکانی ژنەکەی ناو وێنەی (( سوورە )) لەکتێبەکەی زاوادا کەوا سینییەکەی گرتووە لەیەك دەچێ. ئەمەش کاری زەیتوونە.

4- چێشتکەرەکانی پادشا پێدادەنێنە سەر بەردە شینەکانی سەر زەوییە پەمبەییەکەو وردە وردە عارەبانەکە پاڵ دەنێن کە قازانێکی گەورەی پڕلە دۆڵمەی کاهوی پیازداری بەسەرەوەیەو ئاگری ئاگردانەکەشی کزە کراوەتەوە. ئەو بەردەشینانە لە بەردە سوورەکانی خۆڵە نیللیەکە دەچێ کەوا لە وێنەی مەرگی ناو کتێبەکەی زاوادا شتە نیوە تارماییەکە بەبێئەوەی پیدانێتە سەریان بەسەریاندا ڕێدەکات ئەمەش هەردوو وەشاوەی دەستی پەپولەیە.

5- نێردراوی ئێرانیەکان لەبەردەم پادشادا زمان شیرینی دەکات ئەو دەهێنێتە سەر زمان کە پادشای ئێرانییەکان زیاتر لە برایەتیلەگەڵ پادشایی عوسمانیدا بیر لەهیچ شتێکیتر ناکاتەوە. بەڵام لەهەمانکاتدا

هەواڵبەری تاتارەکان هەواڵی ئامادەبوونی سوپای ئێران بۆ هاتن بۆ وڵاتی عوسمانی دێنن. جەماوەرێکی تووڕە نێردراوەکە تەختی زەوی دەکەن وڕایدەکێشن، لەدوای هەڵسانی تۆزی ناو مەیدانی ئەسپەکە باڵندەکانی سەقا لەوێ هەڵفڕیون. هەر لەو کاتەدا بۆ ئارامکردنەوەی ئەو جەماوەرەی کە دەیانەوێ هێرش بکەنە سەر باڵوێزەکە ڕۆنیان بەسەردادەکەن و هەندێك پیاوی جەواڵ بەدەست کە هەمووپڕن لە ڕۆن فریای کابرا دەکەون و نەجاتی دەدەن. چۆنیەتی ڕاپەڕاندنی سەقاکان وشێوەی پێهەڵگرتنی سەربازەکەی ناو وێنەی (( سوورە )) لەیەك دەچن. کار کاری پەپوولەیە! ئەم دوایین دۆزینەوەیەو بەدواداچوونی شوێنەدەستەکان کاری من نەبوو، بەڵکو ئەوە ڕەشەیە کەلە ترسی ئەشکەنجەدران و بۆ گەیشتن بە ژن ومناڵەکانی لەماڵدا هاوێنەکەی دەستم ئەملاو ئەولاپێدەکات و چاوەکانی زەق زەق کردۆتەوە. بەپێی شێوازی کچە نەدیمە کە تەماشای تەواوی وێنەکانی کاکی زاوامان کرد وشتانێکمان بۆ خۆمان دەرخست ودانیشتین و شیکردنەوەکانی خۆمانمان هێنایە سەر زمان، دوانیوەڕکەمان تەواوبوو. زاوا ڕەحمەتییەکەی ڕەشە هیچ وێنەیەکی بەدەستی یەك شێوەکارەوە نەکێشابوو بەڵکوو لەزۆربەی وێنەکاندا قەڵەمی هەموو شێوەکارانی بەکارهێنابوو. ئەم وێنانە ئەوەی نیشاندەدا کەلەم ماڵ بۆ ئەو ماڵ براون و هاتووچۆی لەم چەشنە زۆرکراون. هەستم بە هەبوونی دەستێکی نەزان وتازەکار وەکوو دەستی پێنجەمم کرد کەوا فڵچەی هێناوە بەسەر وێنەکاندا. خەریکبوو بڵێم کە پیاوکوژە هیچ وپوچەکە زۆر لێنە هاتوو بووە کەڕەشە زانیئەو زاوابووە کە بە هەستیارییەوە بۆیاخی کردوون و بەم شێوەیەش لە ڕۆیشتن بەدوای شوێنە دەستی درۆینەدا نەجاتمان بوو. بەداخەوە لەوەش تێگەیشتم کە

زەريف ئەفەنديش جار جار فلْچەی بەم وێنانەدا هێناوە و وەکوو چۆن جوانکارییەکانی جەژننامەی دەکرد هەر بەو شێوەیەش کتێبەکەی زاواشی ڕازاندۆتەوەو دەرو ديوارو هەوری بۆ جوانترکردووە کاتێ ئەوەمان خستە لايەکەوە تێگەيشتم کەتەنيا سێ وەستای شارەزاو لێهاتوو دەستيان بەم وێنانەدا کێشاوە. ئەوانەش ئەو ڕۆڵانەی منن کەوا لەکاتی شاگردييانەوە تاوەکو ئێستا خۆم بە خێوم کردوون. ئەوانە هونەرمەندە خۆشەويستەکانی من، زەيتوون، پەپوولەو لەق لەق بوون. ئەوەی کەوا دەتوانێ بۆ دۆزينەوەی ئەو شتەی بەدوايدا دەگەڕێين يارمەتيمان بدات ئەوەيە کە بەيەکەوە لەسەر وەستايەتی و خۆو سروشتی هەريەك لەوانەو تەنانەت لەسەر ژيانی خۆشم قسەبکەين .

## (( تـــأیــبـــەتــمــەندییــەکــانــی زەیــتـــوون ))

ناوی ڕاستەقینەی وەلی جانە، زیاتر لەو نازناوەی کەمن بۆم داناوە نازناوێکی تری نیە ئەگەر هەیبێتیش من ئاگام لێی نیە. چونکە تاوەکوو ئێستا نەمبینیوە کە ئیمزاکەی خۆی لە جێگایەك بدات. لە کاتی شاگردیدا ڕۆژانی سێشەمە دەهات بەدوایی مندا. زۆر لە خۆباییە، ئەگەر خۆی بچوك بکاتەوەو ئیمزایەك لە جێگایەك بدات دەیەوێت هەر کەسێك بیبینێت وئاشکرابێت. ئیمزای خۆی ناشارێتەوە. خوداوەند لێهاتوویەکی زۆری پێبەخشیوە. جوانکاری و هێڵکاریشی لەدەست دێت و باشترین شت دروستدەکات. لە کێشانی وێنەی دارو حەیوان و ڕوومەتی مرۆڤدا لێوەشاوەترین دەستی وێنە کێشخانەکەی منە. وابزانم باوکی وەلیجان کەلە دە سالێدا ئەوی هێنابووە ئەستەنبووڵ دەست پەروەردەی شێوەکارە بەناوبانگەکانی وێنەکێشخانەی شای سەفەوی لە تەورێزدابووە کە ڕەچەڵەکی ئەو وەستایانە دەگاتەوە وەستا مەغۆلەکان. لەژێر کاریگەری چینییەکان و مەغۆلییەکاندا بووە وکاتی خۆی لە سەمەرقەندو بوخاراو هەراتدا نیشتەجێبووەو وەکو وەستا پیرەکان کە سەدوپەنجا ساڵ بەر لە ئێستا کردوویانە توانیویەتی وێنەی عاشقە گەنجەکان بەپێی نەریتی چینیەکان بکێشێتەوە. هەم لە کاتی شاگردیشدا هەم وەکو لە کاتی

وەستایەتیشیدا نەمتوانی ئەو کاریگەرییانەی لەسەر لابەم و بە قەوڵی قسە ئەو گوێزە ڕەقە بشکێنم و کرانەوەی تیدا دروستبکەم. دەمەویست کەلە نەریتی وەستا چینی و مەغۆلی وهەرانییەکاندا دەرچێ و بتوانێ لە بیریان بەرێتەوە. کاتێ ئەمەشم پێدەگووت وەکو و هەموو ئەو شێوەکارانە قسەی دەکرد کەوا وڵاتەکەو وێنەکێشخانەکەی خۆیان بەجێهێشتووە قسەی دەکرد و دەیگوت: لەزووەوە فەرامۆشمکردوون، خۆی لە خۆیدا هیچ شتێکیش فێرنەبووبووم. ئەو قاڵبانەی وا لە مێشکی شێوەکاراندا ماونەتەوە بۆ زۆر یان پڕ بایەخ بەنرخن، بەڵام ئەگەر ئەو ئەمانەی فەرامۆش بکردایە وەستایەکی گەورەی لێدەردەکەوت. ئەو فێرکراوانەی واهی وەستاکانیبوون لە قوڵایی میشکیدایەو هەریەکێکیان وەکوو تاوانێکی وازلێهێنراو دەشارێتەوە. بەڵام ئەمانە بەبێئەوەی کە خۆشی هەستپێبکات دوو سوودیان بۆ ئەو هەبوو:

1- بەم شێوەیە ئەمە هەستێکی بێگانەیی‌و تاوانباری بە شیوەکارە لێاهتووەکە دەبەخشێ، گەڕانەوەیەکی گەورەی هونەری تێدایە.

2- ئەو شتانەی کەوا فەرامۆشیان دەکات لە کاتی تەنگانەدا بەبیری دەهێنێتەوە و یەکێك لە قاڵبە کۆنەکانی هەرات لەناو بابەتێکی تازە ولەمێژوویەکی تازەدا لەناو وێنەیەکی ناباودا بەکاردەهێنێت.

لەبەر ئەوەی چاوێکی زۆر باشی هەیە دەتوانێ قاڵبە کۆنەکان فێربووەکانی لە وەستا کۆنەکانی شاناماسووبەوە لەناو وێنەیەکی تازەدا بە ڕاگرتنی هاوسەنگی جێگیر بکات. لەژێردەستی ئەو دا وێنەی هەرات و نەخشی ئەستەنیوول لەناو بەیەك ڕاهاتنێکدا تێکەڵاویەك دەبن. وەکو ئەوەی بەسەر هەموو شێوەکاراندا هێنابووم، لەناکاو بەبێخەبەر چوین

بەسەر ماڵەکەیدا. بەپێچەوانەی من و زۆر وەستای دیکەیتر، ڕەنگ وفلّچەکانیو مۆرو مێزەکەیو توێژەڵە دەریاییەکانی هەموو تێکەڵ وپێکەڵ بوون و خۆیشی لە گۆشەیەکدا کاری دەکرد و ماڵەکەشی ئاوەها شپرزەبوو. ئەمە بۆ من وەکوو مەتەڵێکە. بەڵام ئەو لەوەزعەی خۆی تەنانەت شەرمیشی نەکرد. لەمانەش زیاتر ئەو بۆ چەند ئاکچەیەکی زیاتر کاری بۆ دەرەوەنەدەکرد، لەکاتی ئەم قسانەی مندا ڕەشە گوتی کە زاوا ئەفەندی گوتوویەتی لەنێو هەرسیێ شێوەکارەکەدا زەیتون لەهەموویان زیاتر حەزی لە نەریتی ڕۆژئاواییەکان کردووەو بەگوێرەی ئەوان وێنەی کێشاوە.

دەمزانی ئەم شتە بەگوێرەی ئەو گەمژە خوالێخۆشبووە شتێکی پەسەند کراوبووە هەروەها دەمزانی کە ئەمە وردبوونەوەیەکی هەڵەشی تێدایە. نازانم لەوەی کە هەیە چەندە زیاتر و بەشێوەیەکی نهێنی لەژێر کاریگەری وەستا کۆنەکانی ئەو سەردەمەو وەستا بەهزادو نەریتی هەراتیەکاندایە کە بەڕێگای وەستا موزەفەری مامۆستای وەستا سیاوەشی مامۆستای باوکیەوە پێیگەیشتووە، بەڵام ئەمانە هەموویان وایان لێدەکردم کەمن وەها بیر بکەمەوە لەناو زەیتووندا هەمیشە شتانێکی شاراوە هەیە کەدیار نابن. لەدڵی خۆمدا گوتم زەیتوون بێدەنگترین و دەروونیترین وتاوانبارترین وخاینترین وساختەچیترین شێوەکاری منە. کاتێ باسی ئەشکەنجەکانی بوستانجیباشی دەکرێ بۆیەکەمجار ئەو دێت بەعەقڵمدا (هەم دەمەوێت بکەوێتە ژێر ئەشکەنجە هەم دەمەوێت ئەشکەنجە نەکرێت) چاوەکانی وەکوو هی جندۆکە وایە: هەموو شتێك دەبینێ وهەستی پێدەکات، تەنانەت کەمووکوڕیەکانی منیش: بەڵام وەکوو کەسێکی بێ وڵات وپەنابەر کە ڕەنگی هەموو قاڵبێك لەخۆ دەگرێ زۆر بەدەگمەن دەم دەکاتەوەو

کەمووکوڕیەکانمان دەڵێتەوە. بەگوێرەی من کەسێکی فێڵبازە بەڵام پیاو کوژ نیە ( ئەمەشم بەڕەشە گوت ) ئەو بڕوا بەهیچ شتێك ناکات تەنانەت بڕوابە پارەش ناکات، بەڵام بەترسۆنکیەوە کۆی دەکاتەوە بە پێچەوانەی ئەوەی وا خەڵکی بیری لێدەکەنەوە پیاوکوژانیش لەنێو بێبڕواکاندا دەرناکەون و زۆرتر لە نێوان ئیمانداری کان و بڕوادارانداده‌رده‌که‌ون. وێنەکێشیو نەخشەکێشان حاشا،حاشا: هەریەك دەرگای مەیدان خوێندنەوەو کێبرکێیە لەگەڵ خودادا. هەموو کەسێك ئەمە دەزانێت. لەم ڕووەشەوەو لەباری بێبڕواییەوە زەیتوون شێوەکارێکی ڕاستەقینەیە. بەڵام ئێستا وەها بیردەکەمەوە کە لێهاتوویەکەی لەهی پەپوولەو لەق لەقیش کەمترە. ٍدەمەویست زەیتوون کوڕیمن بایە. بەم گوتنەم ویستبووم کەڕەشە بە خیڵی بەزەیتوون بباتەوە. بەڵام تەنیا وەکوو سەرنجدانی منداڵێك چاوە ڕەشەکانی کردەوە وسەیری کردم .پێمگوت : ئەو کاتانە زەیتوون بە شێوازی ( ڕەشایی قەڵەم) کاری دەکرد وێنەی شەڕکەران و ڕاوچییەکان و دیمەنی باڵندەی وەکوو چینییەکان دەکێشاو وێنە کچێکی جوانی لەژێر دارێکدا کە بە دانیشتوویی عود دەژەنێ و شیعر دەنوسێتەوە دەکێشاو ئازادی عاشقە ئەفسانەییەکان وشایەکی تووڕەی شمشێر بەدەست وترسی ڕوومەتی ئەو قارەمانەی وا بە هێرشی ئەژدیهاکە دەرپەڕی وەکوو شتانێکی دەرئاسایی دەکێشا.

ڕەشە گوتی: " لەوانەیە دوایین وێنە کە ڕووخساری پادشاو شێوازیدانیشتنەکەی بەنەریتی ڕۆژئاواییەکان دەکێشرا بەدەستی ئەوەوە بکێشرابایە" دەیەویست کە ڕێگاونکەرەیەك بخاتە بەردەمم؟

وتم: ئەگەر وەها بێت بۆچی لەدوای کوشتنی زاوا وێنەیەك بدزێت کە خۆی دەیزانێت ؟ یان وەکوو بۆچی بۆ بینینی ئەو وێنەیە زاوا بکوژرێت؟" ماوەیەك ڕووبەڕووی یەك دانیشتین و بیرمان کردەوە.

ڕەشە گوتی:" لەوانەیە لەبەر کەموکوڕی ناو وێنەکە بێت یان وەکوو پەشیمانبوونەوەو ترسان لە شتێك بێت ". تۆزێکیتر بیری کردەوەو دووبارە گوتی:" ئەی نابێت لەدوایی کوشتنی زاوا بێچارەکەم بۆ ئەوەی کە زیانێك بگەینێت یان لەبەر بیرەوەرییەك، یاخود لەبەر شتێکی بێ هۆ هەڵیگرتبێ؟ زەیتون وەستایەکی گەورەیەو سرووشتیەکە ڕێزیش بۆ وێنەیەکی جوان دابنێت". بەتووڕەبوونێکەوە گوتم:" باسی ئەوەمان کرد کەزەیتوون وەستایەکی گەورەیە بەڵام هیچ یەك لە وێنەکانی زاوا جوانین"

ڕەشە بە ئازایەتییەکەوە گوتی:" بەڵام چاومان بەدوایین وێنە نەکەوتووە".

## (( تایبەتمەندیەکانی پەپوولە ))

پێی دەڵێن حەسەن چەلەبی باروتخانەیی، بەڵام بۆ من لە کاتی خۆیدا پەپوولەیە، ئەم ناوەی جوانیەکەی کاتی منداڵی و دەورانی لاوێتی ئەوم وە بیر دەهێنێتەوە ئەوەندە جوانە کەئەوانەی وا دەیبینن بڕواناکەن و دەیانەوێ دیسان بیبیننێتەوە. ئەو موعجیزەیەی کەوا هەمیشە منی بە هەڵەدا بردووە ئەوەیە کە بەقەدەر جوانییەکەی خۆی شارەزاو لێهاتووشە. بەهێزترین لایەنی ئەو وەستایەتیەکەی لەڕەنگکاریدایە. دەڵێی کە بۆ خۆشی ڕەنگکردن دەگەڕێت و بەعەشقەوە دەستی بە وێنەکێشان کردووە. بەڵام ئەوەشم بەڕەشە گوت کە کەسێکی بەهەواو بێبەزەیی ودوودڵە. هەروەها ئەوەشم پێزیادکرد کەلەکاتی وێنەکێشاندا لەدڵەوە نەخش دەکات و ترسی عادڵ بوونیشی لەدڵدایە. ئەگەر ڕەسم بۆ مێشك و بانگکردنی گیانلەبەرەکەی

دەروونمان نەبێ وبۆ دەستهێنان بەسەر هەستی شانازی کردنی پادشادا نەبێ وتەنیا بۆ ڕازاندنەوەو شایی چاوبێت ئەوا پەپوولە شێوەکارێکی ڕاستەقینەیە. وەکوو ئەوەی کە چل ساڵ لەمەوبەر لەوەستا قەزووێنییەکان دەرسی وەرگرتبێ خەتی گردی پان ورەحەت ودڵخۆش دەکێشێ و بێترسانە بەرەنگە بریقەدارەکانیوە بۆیاخیان دەکات وهەمیشە لە داڕشتنە شاراوەکەی ناو وێنەکانیدا حەڵقەیەکی شیرین هەیە. من ئەوم فێر کردووە بەڵام وەکوو وەستا قەزوێنییەکان پەروەردەم نەکردووە کەلە زووەوە تۆپیۆەن، لەوانەیە هەر لەبەر ئەمەش بێ کەوەکوو کوڕی خۆم حەزی لێدەکەم. بەڵام ئەوەی ڕاستیش بێ ئەوەیەکە هیچ حەیرانی نەماومەتەوەو لەکاتی منداڵیو لەسەرەتایی جوانیدا وەکوو شاگردەکانیتر بە قەڵەم وبەدارلێم دەدا، بەڵام لەبەر ئەمە هیچ بێ ڕێزییەکم لەبەرامبەر ئەودا نەدەکرد چوونکە زۆریشم لە لەق لەق دەدا بەڵام ڕێزم لەویش دەگرت. لێدانی وەستا توانایەتی و جندۆکەو شەیتانە هونەرییەکانی شاگردێك ناشارێتەوە بەڵکوو بەشێوەیەکی کاتی دەیانگەڕێنێتەوە دواوە. خۆ ئەگەر ئەمە لێدانێکی بەهەق بێ شەیتان وجندۆکانە ددان دەردەکەن و وێنەکێشەکە کەوا خەریکە پێدەگات هاندەدەن بۆ پێشکەوتن وباشتر کارکردن. ئەو لێدانانەی وا بەر پەپوولە کەوتوون وایان لێکردووە کە ببێ‌بە شێوەکارێکی دڵخۆش وملکەچ. سەرارەی ئەوەش دواتر لەبەرامبەر ڕەشەدا هەستم بە پێویست بوونی پەسەندانی پەپەوولە کرد. وتم نەخشی پەپوولە بەڵگەیەکە بۆ ئەو شاعیرەی کەوا لەمەسنەوی‌دا لەوەڵامی پرسیارێکدا دەڵێ" کێشانی وێنە دڵخۆشی بەس بەڕێگای هونەری خواییەوە مومکین دەبێت". کاتێ لەمە تێگەیشتم ئەو شتەم دۆزییەوە کەوا لە پەپوولەدا پەیدا نابێ. ئەوەش ئەوەیە کەئەو

شەوە تاریکەی ڕۆح کە ( جامی ) لەشیعرەکەی خۆیدا دەیهێنێتە سەر زمان کاتێکی بێ بڕواییە کە لەئەودا پەیدا نابێت. وەکوو شێوەکارێك کەلەناو بەهەشتدا وێنە بکێشێت بەبڕواو بەئیمان وبەخۆشییەوە دەست بەکێشان دەکا لە ڕاستیشدا ئەو وێنەدڵخۆشکەرە دەکێشێت. چەمبەردرانی قەڵای (( دوپیو)) لەلایەن سەربازەکانی سوپای ئێمەوە ماچکردنی پێی پادشاکەمان لەلایەن باڵوێزی مەجەرەکانەوەو ڕۆیشتنی پێغەمبەر بە ئەسپەکەیەوە بۆ حەوت قاتی ئاسمان، هەریەکەو ڕووداوێکی دڵخۆشکەرن، بەڵام لەلاپەڕەکەی ژێر دەستی پەپوولەدا هەریەکە وەکوو چەژنێکی ڕاستەقینە دەردەچن. ئەگەر لەناو وێنەیەکدا کەمن بمگووتبایە بیکێشن تاریکایی مەرگ و جیددیەتی کۆبوونەوەی دیوان زیادە لە حەدبایە ئەو کات بە پەپوولەم دەگووت کە چۆن دەتەوێ ئاوەها ڕەنگی بکە. ئەوسا ئەویش بەبای ڕەنگەکانی خۆی وێنەی ئەو خاکەی وا مردووەکانی تێدابوون و بەرگەکان و دارەکانی شەپۆل شەپۆل دەهێنا کایەوە. جارجار وەها بیرم دەکردەوە کە خوداش دەیەوێت دنیا وەکوو نەخشەکانی پەپوولە ببینێ و فەرموودەکانیشی لەسەر ئەوەیەکە دونیا ببێت بەجەژن وشایی. ئەوە دونیایە کە لەوێدا ڕەنگ وئاهەنگ هۆنراوەی باش بۆیەك دەخوێننەوە وشەیتانیش ناتوانێ سەردانی ئەوێ بکات. بەڵام پەپوولەش دەزانێت کەئەمەش کەموکوڕی تێدایە. کەسێك بەهەقەوە ئەوەی چپاندووە بە گوێیەوەکە نەخشەکانی وەکوو ڕۆژانی چەژن دڵخۆشکەرن بەڵام زۆر قووڵ نین و شازادە بچکۆلەکان و پیرە ژنە خڵەفاوەکانی حەرەسەرا کەلەکاتی گیانداندان لەم وێنانە خۆشی وەردەگرن نەك ئەو پیاوانەی ژیان کەبەناچاری لەگەڵ خراپەییدا خەریك دەبن. ئەم پەپوولە بێچارە لەبەر

ئەوەی ئاگای لەم قسانەی پشتەسەری خۆی بووە جارجار بە خێلی بە وێنەکێشە لێنەهاتووە لە خۆی نەزانترەکانیش بردۆتەوە. ئەمەش تەنیا لەبەر ئەوەبووەکە ئەوان جندۆکەو شەیتانیان نیە. کەچی ئەو شتەی وا ئەو بە شەیتان وجندۆکەی دەدانا شتێکی زیاتر لە خراپەی و بەخیلیبردنەوە نەبوو. لەکاتی نەخش کردنی ڕەسمێکدا خۆیلە دونیا دەرئاساییەکەدا نوقم دەکرد و وایدەزانی کە گەیشتۆتە دوایین پلەی خۆشی و حەزی لەدیدگای نەخشەکانی دەهات وئەمەش ڕقی منی هەڵدەستاند. شتێکیتری پێکەنیناوی لەناو ژیانی ئەودا هەبوو ئەویش ئەوەبوو کە زۆر شێوە کاری لەو لێنەهاتووتر هەبوون بەڵام لەو زیاتر خۆیانیان بۆ نەخش ونیگار تەرخان دەکردە کەچی ئەووەها نەبوو. هەربۆیە بۆ لابردنی ئەم کەموکوڕییە پەپوولە کەوتبووە دەردی خۆبەختکردن لە ڕێگای وێنەکانیدا. وەکوو ئەو شێوەکارە مێشك بچووکانەی کەوا لەسەر نینۆك ودانەی برنج وێنەی ڕووت وقووت دەکێشن ئەویش مەراقی لەو چەشنەی لەسەر کاری بچوك هەیە. جارێك ئەوم لێپرسی بوو ئەو ویستەی وا زۆربەی شێوەکاران کوێر دەکات وئەویش تووشی بووە لەبەر ئەوەیە کە لەو لێاهتوویيە شەرم دەکەن کەوا خودا پێیانی داوە. مەراقی لە شێوەی دروستکردنی درەختێك بە هەموو پەلەکانییەوە لە سەر دانەیەکی برنج شتێکی تایبەتەبە شێوەکارە لێنەهاتووەکان کە دەیانەوێ زوو ناو بانگ دەرکەن وبکەونە نێو چاوی گەورەکانیان. داخوازیوحەزی لەو چەشنە ویستی ئاوەهاو وێنەکێشان وەکوو دیتنی کەسانیتر نەوەك بە گوێرەی دیتنی خۆی خوویەکی پەپولەیەکە ناتوانێ وازی لێبێنێ و ئەمەش وای لێکردووە کەببێت بە کۆیلەی تەواوی پەسندان وگرنگی پێدانی. پەپوولەی ترسنۆك بۆ ئەوەی کە

**جێی پێی خۆی بکاتەوە دەیەوێت ببێت بەسەردەستەی وێنەکێشان. ڕەشە ئەم بابەتەی کردبووەوە:**

**وتم: "بەڵێ ئاگام لەوە هەیە کە بۆئەوەی کەلەدوای مەرگم جێگام بگرێتەوە خەریکی فرت وفێڵە".**

**رەشە گوتی: " لەم ڕووەوە دەتوانێ هاوڕێ شێوەکارەکانی خۆی بکوژێت ؟"**

**-:ناتوانێت چونکە وەستایەکی گەورەیەو لەکاتی نەخشکێشاندا دونیا فەرامۆش ناکات و خۆشی ئاگای لەمانە نییە. کە ئەمەم گووت و نەمگوت تێگەیشتم کەوا دەمەوێت لەدای مەرگم پەپولە بێت بەسەر دەستەی وێنەکێشخانەکە. بڕوام بە زەیتوون نیەو قەناعەتیشم وایە کە درەنگ بێ یان زوو لەق لەق دەبێت بە لاساییکەری نەریتی ڕۆژئاواییەکان. لەبەرئەوەی وەها بیرم دەکردەوە کە دەتوانێ پیاو بکوژێ، خەمیشم بۆخۆبە حەزدادانەکەیەتی، چونکە تایبەتمەندییەکی ئاوەها بۆ ئیدارەکردنی پادشاو وێنە کێشخانەکە لەیەك کاتدا شتێکی پێویستە.ڕۆژئاواییەکان کاردینالْ و پردوو بەلەم و مۆمدان و کلێساو گەوڕو هتد وەکوو ئەوەی کەلەچاوی خوداوەیەك بەهایان هەبێ وەکووخۆیان دەکێشنەوە کە مرۆڤیش وادەزانێت کە ئەمانە ڕاستەقینەن. لەبەرامبەرئەم نەریتەدا تەنیا هەستەوەر بوونی پەپوولەو متمانەیی ڕەنگەکانی دەتوانێ بەرەنگار ببێتەوە".**

**ڕەشە گوتی:" وەکو ئەوەی کە بەوێنەکێشانیترتان کردووە ئایا بەپێخەبەر سەردانی ئەویشتان کردووە؟" کەسێك بۆیەکەمجار تەماشای وێنەکانی پەپوولە بکات وادەزانێت خۆشەویستی وخەمخواردن لەدڵی ئەودا زۆرەو لەیەکەم ساتیشدا لەواتای عەشق تێدەگات وهەستیپێدەکات. بەڵام**

هەموو ڕەنگدۆستەکان بای ویستیان زوو زوو هەڵدەکاو دەگۆڕیٚ لەبەرهەستیارییەکەی لەبەرامبەر ڕەنگداو لەبەر ئەو هونەری کە خودا پێی دابوو لەکاتی جوانیدا حەزملێدەکرد لەبەرئەوە لەنێزیکەوە تاقیم کردۆتەوە هەموو شتێکی دەزانم سروشتییە کەلە وەزعێکی ئاوەهادا شێوەکارانیتر بە خێڵی ببنەوە وپێوەندی وەستاو شاگرد بکەوێتە ناو زەحمەتییەوەو زەرەر ببینیٚ. پەپوولە لەوەنە دەترسا کەخەڵك چی پێدەڵێن و زۆربەی کاتەکانی بە عەشق تێپەڕ دەکرد. بەتازەیی لەگەڵ کچی دووکاندارەکەی گەڕەکدا زەماوەندی کرد، هەم بۆم نەهات هەم وەکوو مەجالیشم نەبوو کەبچم سەردانی بکەم." ڕەشە گوتی:" دەلێن کەلەگەڵ لایەنگرانی مەلا ئەرزڕوومییەکەدا هەڵسوکەوت دەکات". لەبەرئەوەی کەمەلا ئەرزڕوومییەکە جەژننامەکانی ئێمە و ئەو وێنانەی کەوا چێشتکەرو فێڵبازو جەماوەری تەریقەتەکانی تری دوابەدوای یەك لەبەردەم پاشادا کێشاوە حەرام کردووە سۆفییەکانی ئەو مەلایە لەوبارەیەوە خەڵکی سەرزەنشت دەکەن، بۆیە ئەگەر گەڕانەوەیەك هەبێت بۆ کتێبەکۆنەکان و نەریتی وەستا کۆنە ئێرانیەکان ئەوا پەپوولە بەسوود دەردەکەوێت. ئەگەر سەرکەوتووانە بگەڕێنەوە بۆ وێنە دەرئاساییەکانی زەمانی تەیموور لەدوای من و ئەو لەق لەق باش وژیرەکەم ئەم ژیانە بەرێوە دەبات و ئەوانیتر لەبیر دەکرێن. بەڵام ئەمە نابێت چونکە هەموو کەس بەرەولای نەریتی ڕۆژئاواییەکانەوە دەچێت." ئایا بڕوام بەم قسە دەروون ڕەشکەرانەی خۆم دەکرد؟ ڕەشە بە بێدەنگییەوە گوتی: زاواشم وەهای دەگوت بەڵام ئەو خۆشبین بوو.

## (( تایبەتمەندییەکانی لەق لەق ))

چاوم بەئیمزایەکی کەوتووە کە نووسیویەتی شێوەکاری تاوانبار موستەفا چەلەبی. لەبەر ئەوەی گوێ ناداتە ئەوەی پێوسیتە شێوازێکی هەیە یان نا، ئەگەر هەبێت بە ئیمزاوە بێت یان نا. وەکوو وەستا کۆنەکان بیشارێتەوە یان نا وخۆشی بەوەوە خەریك ناکات کە خاکیبوون ئیمزای

دەویٚ یان نا بە پیٚکەنینەوە وەکوو ئەوەی کە سەرکەوتنیٚکی بەدەست هیٚنابیٚ ئیمزای خۆی لە ویٚنەکان دەدات. لەسەر ئەو ڕیٚگایەی کەوا من ڕیٚچکەیم دانابوو بە لیٚبووردەییەوە دەڕۆیشت، شتانیٚکی بینی وکیٚشاکە کەس نەیتوانیبوو ویٚنەی بکیٚشیٚ. هەرگیز نەیگوت  وەستاکانی زەمانی تەیموور و وەستا کۆنەکانی تەرویٚزو قەزویٚن و شیٚوەکارە ئەفسانەییەکان دانەبەزیووە ویٚنەی وەستا شووشەچییەکانیان لە کاتی فووکردنە ناو لوولە کونەکە بۆ دروستکردنی دۆلکەیەکی شین و چەرمەکانی بەردەس وەستایەکی پینەچی کە سەرنجی تەواوەتی خۆی داوەتە سەر دروستکردنی پیٚلاوو چەکمەکانی و دەرزی و قالبەکان و کیٚشانەوەی کەوانی جۆلایەك بە جوانی لە ڕۆژیٚکی جەژندا و ئەو زەختەی کە ڕۆنی دانە تلیقاوەکان دەردەخات و تەقەی تۆپە وەرگیٚڕاوەکانی خۆمان و لوولەی چەکەکان و دۆلەکان و شتی لەم چەشنەیان نەکیٚشاوە وەکوو چۆن من بینیومەو کیٚشاومە ئەویش بینوویەتی و کیٚشاویەتی لە دوایشدا بۆ دروستکردنی سەفەرنامە خۆی ئامادەکردووەو ڕۆیشتۆتە شەڕو بەویستەوە تەماشای قەلاکانی دوژمن و تۆپ و سوپا و ئەسپەزامدارەکان و چۆڕەی خویٚنەکانیان و گیاندانی بریندارەکان و لاشەی مردووەکانی کردووەو  کیٚشاو نوویەتی وبووە بەیەکەم شیٚوەکاری موسلمان کە بەسەلامەتی لەشەڕدا گەڕاوەتەوە. بەر لە شیٚوازەکەی تەماشای بابەت وبەرلە بابەتەکەشی تەماشای وردەکارییەکانی دەکەم کەلەپیٚشدا کەس سەرنجی نەداو نووتیٚو هەر لەویٚشەوە دەیناسمەوە. دەتوانم لەڕیٚکوپیٚکردنی لاپەڕەو کەلەکەکردن وجیٚگیرکردنی ویٚنەکانەوەبگرە تا ڕەنگکردنی وردەکارییەکان هەمووشتیٚکی پیٚ بسپیٚرم. لەم ڕوەشەوە لەراستیدا لە دوای من بوون بە سەرۆکی

شێوەکاران مافی ئەوە بەڵام ئەوەندە لە خۆرازیو لە خۆبایی وبەفیزە کەوا ناتوانێ هەموو کەسێك بەرێوەببات و هەموویان دەرەتێنێ. لە ڕاستیدا ئەگەر بەگوێرەی ئەو بێت دەیەوێت بە کۆششکاری خۆیەوە هەموو وێنەکانی وێنەکێشخانەکە بکێشێ. کە دەتوانێ ئەنجامیشی بدات و وەستایەکی گەورەشە. کاری خۆی دەزانێ حەز لەخۆشی دەکات. چەندە دڵخۆشە! جارێك بێخەبەر ڕۆیشتینە ماڵەکەی، لەکاتی کارکردندا چاوم پێیکەوتبوو، کتێبەکانی پادشاکەمان وئەو لاپەڕانەی کە بۆمن نەخشی کردوون و ئەو وێنانەی کە بۆ ڕۆژئاواییە گێژەکانی دەکێشا کە دەیانەویست ئێمە بچوك بخەنەوە ولاپەڕەیەك لەو سێ لاپەڕەیەی کەوا بۆ پاشایەکی دەکێشا کە ئەویش خۆی بەشتێك دەزانی وئەو وێنانەی کەوا بۆ خۆشی کێشابوونی وتەنانەت وێنەی جووتبوونێکی بێئەدەبانەی ژن وپیاوێکیش لەسەر تەختەو مێزیەکان ودۆشەکەکاندا بوون و لەناو پێدابوون وخۆشی وەکوو زەردەواڵەئیشی دەکرد وبەبەژنە درێژەکەی خۆیەوە لەم ڕەسم بۆئەو ڕەسم دەچوو، گۆرانی دەگوتەوە و مەقەسێکی دەخستەسەر گۆنای شاگردەکەی کەوا ڕەنگی تێکەڵاو دەکرد. شتێکی بۆ گاڵتە دەخستە ناو وێنەکە و نیشانی ئێمەی دەدا بەسەر سووڕماوییەکەوە قاقای لێدەدا. بەپێچەوانەی شێوەکارانیتر لەبەرئەوەی کەمن چووبووم دەستی لەکاری خۆی بەرنەدەداو بۆنەی ڕێزگرتنی بۆ دروستنەدەکردم، بەڵکوو بەکارکردن ئەو لێهاتوویەی کەخودا پێی بەخشیبوو تێکەڵاوی هونەری دەکردو کارە پەلەپەلەکانی خۆی بەردەوام دەکرد. ( لەیەك کاتدا کاری حەوت هەشت شێوەکاری تری دەکرد) ئێستاکانەش بەدزیوە وەها بیر دەکەمەوە کەئەگەر بکوژەکە یەکێك لەم سێکەسە بێت خودا بکات کەلەق لەق بێت ، بەڵام خۆم

دەگرمەوە، لەدەورانی شاگردیدا کەلەبەرەبەیانی ڕۆژانی هەینی دا چاوم پێدەکەوت بەئەندازەی دیتنی پەپوولە خۆشحاڵ نەدەبووم هەرجۆرە وردەکارییەکی سەیر بەبێ هیچ ژیرییەك (بەمەرجێك کەنەبینرابێت) ببینێت ئەوا هەر بەو ڕێژەوە دەیکێشایەوەو ئەو لایەنەشی لەوەستا ڕۆژئاواییەکان دەچوو، بەڵام لەق لەقە بەویستەکەی من بەپێچەوانەی وەستا ڕۆژئاواییەکان ڕوومەتی مرۆڤەکانی جیاوازتر لەیەك نەدەکێشا، تەنانەت ئەو فەرقەشی نەدەبینی. وابزانم لەبەر ئەوەی بە ئاشکراو بە شاراوەیی مرۆڤەکانیتری بچوك دەبینی هەر بۆیە سەرنجی نەدەدایە سەر ڕوومەتی مرۆڤەکان. زاوای خوالێخۆشبووش وێنەی مرۆڤەکانی بەئەو نەکێشاوە. ئەگەر جیددیترین وێنەش بکێشێت ئەوا دەبێت لەگۆشەیەکەوە بە هەبوونی نێوانێك، سەگێك یان وەکوو دەوڵەمەندی بۆنەیەك یاخوود نەداری لەتەچنێکی تێدا بکێشێت، ئەوەندە متمانەیی بەخۆ هەیە کەدەتوانێ گاڵتە بەڕەسمەکەو بابەتەکەیخۆی بکات .

ڕەشە گوتی:" ئەوەی کەوا زەریف ئەفەندییان کوشتووەو خستوویانەتە ناو چاڵە ئاوەکە لەبەسەرهاتەکەی یوسف وبراکانی دەچێ. گوژرانی زاواکەشم لە کوژرانی خەسرەو دەچێ کەبەدەستی کوڕەیەوە کوژرابوو کەوا دڵی چووبووە شیرین. هەرکەس دەڵێت کە لەق لەق حەز لەوێنەی شەڕو مەرگ وخوێناوی دەکات". ئەگەر وەها بیربکردرێتەوەکە ئەو وێنەیەی وا شێوەکارەکە دروستیدەکات دەچێتەوە سەر بابەتەکە، ئەوەبە مانای تێنەگەیشتن دەبێ لەمن ولەشێوەکارانیتریش. ئەو شتەی کە ئێمە دەدات بەدەستەوە ڕاسپاردەکان نین- خۆی لەخۆیدا بابەتەکان یەکن- بەڵکوو ئەوەیەکە لەکاتی نێزیکبوونەوەو کێشانەوەی دا چ جۆرە هەستەوەرییەکی

خۆمانی تێکەڵاو دەکەین. ئەو تیشکەی کەوا خۆی دەدزێتەوە ناو ماڵو دارەکان وئەسپەکان ومرۆڤەکان وئەو تووڕەییەی کە لە کەڵەکەکردنی لاپەڕەکاندا شاراوەیە، داری سەروو خەم و ئارەزووەکانی لەکاتی درێژبوونەوە بۆئاسمان و پشتبەستن و سەبر کە چاو کوێر دەکات هەموو ئیشارەتی ئێمەن. ئەمە هەموو وەکوو ئەسپانێك نین کە ڕاوەستاوبن خۆیان دووبارە بکەنەوە، وێنەکێش پێویستە لەکاتی کێشانی تووڕەیی و خێرایی ئەسپێکدا تووڕەییو خێرایی خۆی لێدەرنەخات، لە کاتێکدا کە تێدەکۆشی باشترین وێنەی ئەسپ بکێشێت، عەشقەکەی خۆی بەرامبەر خۆڵقێنەری دەوڵەمەندییەکانی دونیاو عەشقی ژیان و ڕەنگەکانی نیشاندەدات و بەس.

## (ناوی من ڕەشەیە) (42)

لەگەڵ وەستا عوسماندا هەندێك كتێبمان دانابووە بەردەستی خۆمان وسەیرمان دەكردن، هەندێكیان تەواوبووبوون هەندێكیشیان تەنیا خەتەكانیان نووسرابوون و هەندێكیتریشیان بەهەر هۆیەك بێت بەنیوەو ناتەواوی مابوونەوە. تەواوی دوانیوەڕۆكەمان بەقسەكردن لەسەر وەستاكان و شیكردنەوەی تایبەتمەندییەكانی ئەوان كتێبەكەی زاوا تێپەڕكرد. ئەم كتێب ولاپەڕانە لەئەنجامی بەسەرداچوونی ماڵی شێوەكارەكاندا بەدەستهێنرابوون. ئەمانەیان وەكوو پێوەندیان بە دوو كتێبەكەی ئێمەوەنەبوو، یان وەكوو جارێكیتر ئەوەی دەسەلماند كە شێوەكاران بۆ چەند ئاكچەیەكی زیاترو لەبەرنەداریكارو ڕاسپاردەی دەرەوەی كۆشك ئەنجامدەدەن. ئیدی واماندەزانی كە پێی پیاوە بەڕێزو كەللە ڕەقە هەڵوێست توندەكانی بۆستانچیباشی ناكەوێتە ئێرە، بەڵام یەكێك لەوانە كەمتمانەیەكی تەواوی بە خۆوە هەبوو هاتە لای وەستا عوسمان ولەبن پشتوێنەكەیەوە كاغەزێكی دەرهێنا. وامزانی نامەی باوكێكە كە دەیەوێ كوڕەكەی بكات بە شاگردو بەم شێوەیە ڕێگایەكی دۆزیوەتەوەو نامەكەی ناردۆتە لای كابرایەك كە زۆر جاران ئاغایەتی و سەر دەستەیی شێوەكارانی كردووە، هەر بۆئەوەش زۆر گوێم تێنەدا. لەكزایی ئەو تیشكەوە كەدەهاتە ناو هەستم بەوە دەكردكە خۆرەكەی بەیانی نوقم وناپەیدا بووە بۆ ئەوەی كە چاوەكانم تۆزێك پشووبدەن هەندێك لە نووسراوەكانی وەستا كۆنەكانی شیرازم لەبارەی مەرجەكانی كوێرایی داهاتنەوە خوێندەوە كە تەمەنی لاوێتییاندا نووسیبوویان. ئەو حەرەكەتانەی وا باسیان كردبوو، ئەنجامم دا، بەبێئەوەی كە هیچ شتێك ببینم تەماشای چۆڵەوانییەكی دووردەستم كرد. كاتێ چاوم بەڕەنگی شیرینی سەرسووڕماوییەكەی وەستاكەم

لەبەرامبەر کاغەزەکەدا و چۆنیەتی تاکردنەکەیم بینی دڵم کەوتە تریپەتریپەوەو لەگەڵ پەشۆکان و هەڵچووندا ئاشنابووم. دەقاودەق لەونامەیانەی دەچوو کە شەکورە بەرێگای ئەستەرەوە بۆمنی دەنارد. خەریکبوو بڵێم ئەمە چ هەڵکەوتەیەکە! کەچی لە هەمووشتێك زیاتریش وەکوو یەکەم نامەکەی شەکورە وێنەیەکی لۆچ کراویان هێنابوو! وەستاعوسمان کاغەزی وێنەکەی لای خۆی گرتەوەو ئەویتری دا بەدەستمەوە، ئەوسا ئیتر بەشەرمێکەوەتێگەیشتم کەنامەکە هی شەکورەیە:

" ڕەشە بەگی خۆم: بۆئەوەی کەبۆنی دەمی ژنە بێوەژنەکەی زەریف ئەفەندی تاقیبکەمەوە ئەستەرم ناردبوو بۆلای. لەوێدا ئەم لاپەڕە وێنەیدارەی پێنیشاندابوو، لەدواییدا خۆم ڕۆیشتم، دەمزانی بەکەڵکت دێ بۆیە بۆ وەرگرتنی ئەم لاپەڕەیە سەد جاربووم بە قوربانی. ئەم لاپەڕەیە لەسەر تەرمەکەی زەریف ئەفەندی لەناو چاڵە ئاوەکەدا دۆزراوەتەوە، قەلبیەبە سەدان سوێندو قورئان دەڵێ کە کەس داوای کێشانی وێنەی ئەسپی لە مێردەکەم نەکردووە. ئەگەر وابێ کێ ئەمانەی کێشاوە؟. پیاوەکانی بۆستانچیباشی ماڵەکەیان پشکنی. لەبەرئەوەی کاری سەر ئەم ئەسپە پەلەی تێدایە بۆ تۆی دەنێرم. منداڵەکان دەستت ماچدەکەن- شەکورەی ژنت." وەکوو ئەوەی کە بەوردبوونەوەیەکی تەواوەوە لەناو باخچەیەکدا تەماشای دووگوڵی سوور بکەم ئاوەها سەیری دوو وشەی دوایی نامەکەم کردوو دووبارە خوێندمەوە. چاوم نێزیکی ئەو لاپەڕەیەکردکە وەستا عوسمان سەرنجی دابووە سەری و تەماشای دەکرد. هەندێك ئەسپم بینی کە موورەکەبەکەیان بڵاوبووبوونەوە، وەکوو نەریتی وەستاکۆنەکان بۆ دەستە گەرمی کێشرابوون. ئەم وەستا عووسمانەی کەبەبێدەنگییەوە نامەکەی

شەکورەی خوێندبووەوە گوتی: "کێ ئەمەی کێشاوە؟" خۆشی وەڵامی دایەوەو گوتی: " دیارە  ئەو شێوەکارەی وا ئەسپی ناو کتێبەکەی زاوای کێشاوە". ئەوەندەلە مە دڵنیابوو؟ بەڵام کێیە؟ ئێمە لەوە دڵنیانەبووین کەکێ ئەسپی ناوکتێبەکەی زاوای کێشاوە. لەناو نۆ لاپەڕەدا وێنەی ئەسپەکەمان دەرهێناو بەوردی تەماشامان کردەوە. ئەوەندە جوان وسادەبووکە مرۆڤ لەتەماشاکردنی تێرنەدەبوو. کاتێ ئەڵێم لەتەماشاکردنی تێرنەبدەبوو ڕاست دەڵێم؟ لەگەڵ زاواکەمدا سەیرم کردبوو، لەودایشدا کاتی زۆرم بۆ تەماشاکردنی هەبوو، بەڵام لەسەری ڕانەوەستابووم. جوان بوو بەڵام ئەسپێکی سادەبوو. ئەوەندە لامان ئاسایی‌و سادەبوو کەنەمانتوانی بزانین کێ ئەمەی کێشاوە. ئەم ئەسپەم زۆرجار لەناو کتێبیتردا بینیبوو بۆیە مرۆڤ وەها خەیاڵی دەکرد کەس بیر لە نەخش ناکاتەوە و هەروا لە خۆیەوە دەکێشرێت. تا ئەو کاتەی کە زانیمان ئەم ئەسپە ڕازێکی شاردۆتەوە، هەر بەو چاوەوە سەیرمان دەکرد. کەچی ئێستا جوانییەك دەبینم کە وەکوو هەڵم دەلەرزێ، لەخۆمم پرسیارکردو گوتم:" خودایە ئەم شێوەکارە دەست سیحراوییە کێیە کەوا توانیویەتی لەشێوەی بینینی خودا وێنەی ئەسپێك بکێشێتەوە؟" بۆ ساتێك پیاو کوژبوونەکەیم فەرامۆشکردبوو. لەلایەکەوە وێنەی ئەسپەکە ئەوەندە لەڕاستی دەچوو کەوامدەزانی لەبەرامبەرمدایە لەلایەکیتریشەوە بەشێکی عەقڵیشم دەیزانی کەئەمە وێنەیەکەو من لەناو دووبیردا سیحراوی کراوم، هەر ئەمەش بوو بووە هۆی ئەوەی کە هەستی بێ کەموکوڕی بوون لەمندا دروست ببێ. بۆ ماوەیەك وێنە ئەو ئەسپانەمان لەگەڵ ئەوەی ناو کتێبەکەی زاوا ئەفەندیدا بەراوردکرد. ئەم ئەسپانە بۆ دەستگەرمی کێشرابوون. هەردوو لە ژێریەك دەستەوە دەرچووبوون،

ڕاوەستانی ئەسپەکان بانگهێشتی جموجۆڵی نەدەکرد، بەڵکوو هاواری مانەوەی سەردەدا، لەخۆبایی، ناسك وجوان بوون. لەبەرامبەر وێنەی کتێبەکەی زاوادا حەیران مابوومەوە. وتم:" ئەوەندە جوانە کە مرۆۋ یەکسەر دەیەوێت لاپەڕەیەك وەربگرێ‌و لەڕووی بکێشێتەوەو لەدوایشدا وێنەی هەر شتێك بکێشێ". وەستا عوسمان گوتی:" گەورەترین باشە کردن دەرهەق بەشێوەکارێك ئەوەیە کە پێی بڵێی وێنەکەت لەئێمەدا جۆش وخرۆشی دروستکردووە، بەڵام ئێمە ئێستا تەماشای هونەری شەیتان ناکەین، بابزانین کێ کێشاویەتی، زاوا ئەفەندی پێی نەگووتووی ئەم ئەسپە چ جۆرە بەسەرهاتێکی هەیە؟"

-" نەیگووتوە. بەڵام ئەمە یەکێك لەو ئەسپانەیەکە دەتوانێ لە هەموو وڵاتێکدا بژی و خاوەنەکەشی پادشای گەورەو بەهێزی ئێمەیە. ئەسپێکی جوانە، یەکێکە لە ئەسپەکانی عەلی عوسمانە. شتێکە کەوا دەوڵەمەندییەکانی پادشاکەمان دەهێنێتە پێش چاوی دۆچی وەنیز". بەڵام لەلایەکیترەوە پێویست بوو وەکوو ئەو شتەی لە کێشراوەکانی وەستا ڕۆژئاواییەکاندا هەیە ئەمەش لەوەی کە خودا دەیبینێ بەجموجۆڵترو خوێنگەرمتر بێت و ژیانکردنی لەئەستەنبووڵ وگەوڕو ئەسپەوانەکەشی دیاربێت، تاوەکووشێوەکارە ڕۆژئاواییەکان بڵێن ئەوانەی ئەستەنبووڵ دەیانەوێ وەکوو ئێمەیان لێ بێ و پادشاکەشیان بڕوابەمە بکات کە عوسمانییەکان دەیانەوێ وەکوو ئەوانیان لێ بێ. چونکە کاتێك مرۆۋ بە شێوازێکیتر ئەسپێکی کێشا ئەوا بەشێوازێکیتریش دونیا دەبینێت بەڵام ئەم ئەسپە سەرەڕای سەیربوونەکەی بەشێوەی وەستا کۆنەکان کێشرابوو. ئەو ئەسپەی کە ئەوندە قسەمان لەسەری دەکرد یەکسەر چوو بووەچاومانەوەو

سەرنجمانی ڕاکێشا. دەمی تۆزێك کراوەبوو لەبەینی دانەکانییەوە زمانی دیاربوو. چاوەکانی دەبریقانەوە لاقەکانی بەهێزو ناسك بوون. ئەوشتەی کە دەبێت بەهۆی ئەوەی وێنەیەك ببێت بەئەفسانە خودی وێنەکەیە یان وەکوو ئەو شتانەیە کە لەسەری دەیڵێن؟ وەستا عوسمان بەهێواشی هاوێنەکەی دەهێنا بەسەر وێنەکەدا لەناو دڵمەوە گوتم:" ئەم ئەسپە دەیەوێت چی‌بلێت؟ واتای هەبوونی ئەم ئەسپە چیە؟ بۆچی ئەم ئەسپە! ئەم ئەسپە چیە؟ بۆچی دمترسێنێ؟ "

وەستاعوسمان گوتی: "پادشا کتێبدۆستەکان وپاشاکان لەبەرئەوەی بۆ ڕاسپاردەکانی ئەوان ڕەنجدراوە وفرەبوونی نوری چاو شێوەکاری لەسەر ڕاسپاردە کانی ئەوان دەبێتە بەڵگەی هەبوونی هێزو دەوڵەمەندییان، وێنەکان جوان دەبینن وحەزیان لێدەکەن. هەربۆیە هونەری شێوەکاری شتێکی کەم پەیدایە، جوانی وێنەك وەکوو ئاڵتوونی بەکارهێنراو نرخی هەیە، هەرئەمەش خۆی بەڵگەی ئەم کەم پەیدابوونەیە ئەگەر کەسانیتریش تەماشای وێنەکە بکەن لەبەر بابەتەکەی دەڵێن: ئەمە لەکەسێك دەچێ یان وەکوو ئەسپی خودایە یان وەکوو خەیاڵێکە و بە جوان دەینرخێنن و بەڕاستەقینە زانینی ئەمەش بە لێهاتوویی هونەرەوە ڕوون دەکەنەوە. بۆ ئێمە مانانیش جوانی ڕەسمەکە بەفرە واتایی وناسك کارییەکانیوە دەستپێدەکات. لەبەرئەوەی کە دەست وئامارژەکانی شەیتان لەنێو ئەم وێنەیەدا شاراوەیە سروشتییەکە واتاکانی زیاتربن، یەکیتریش ئەوەیە کە وێنەکە بەباشی نەزانی. بەڵام ئەو ئەسپەی کە بەباشی دەیزانی کێ کێشاویەتی" وەکوو ئەوە نابێت کە چۆن تەماشای وێنەی ئەسپێك دەکەین سەیری بکەین ، ئەگەر وەکوو چۆن سەیری ئەسپێکی ڕاستەقینە بکەن

سەیری ئەم ئەسپەتان بکردایە، چی حاڵی دەبوون؟ تەماشای گەورەیەکەیم بکردایە دەمگووت کەئەمە کوڵە ئەسپ نیە، کاتێ سەیری ملە درێژو کەوانییەکەیم بکردایە دەمگووت کەئەمە ئەسپی غاردانە، خۆ ئەگەر سەیری پشتە ڕێکەکەشیم بکردایە ئەوا دەمتوانی بڵێم بۆ سەفەری دوورو درێژ دەبێت. لاق ناسکەکانی وا دیار دەکات کە وەکوو ئەسپێکی عەرەب توونـد ڕەوو لێهاتووە بەڵام ئەمە ئەسپی عەرەب نیە چونکە سینەی درێژو گۆشتنە. جوانی پێکانی وەکوو ئەوەی کە زانایەکی بوخارایی لە (( بەیتار نامەی فادلاندا)) لەسەر ئەسپێکی پەسەند کراو باسیکردووە ئەوە نیشاندەدات کە ئەگەر چۆمێك لەبەر ڕێگای ئەسپەکەماندا بێت بە ئاسانی لێی دەپەڕێتەوە وسڵ ناکات و ناترسێت. ئەو بەتیارنامەیە یە دەستی (( فیوزە)) بەتیاری کۆشکەکەی خۆمانەوە وەرگێردراوەتەوە. منیش هەموویم لەبەر کردووە، لەبەر ئەوەش کە هەمووی دەزانم، دەزانم کە ئەو شتەی لەسەر ئەسپێکی پەسەند کراو دا هەیە دەقاو دەق لەم ئەسپەدا هەیەو ئەسپێکی باشە. شێوەی ئەسپەکەش جوانە. پێویستە چاوەکانی لەهی ئاسك بچێ و گوێکانی وەکوو پەلی قامیش بێت و نێوانیان پان بێت. ئەسپی باش بچووك وتەوێڵ خڕەو ئەبرۆکانی وشکەو بەژن و باڵاو یاڵی درێژە، هەروەها پشتی کورتەو لمۆزو شانەکانی یچکۆلەیەو پشتی پانە، سینەی گەورەیەو کلکی پانەو ڕانەکانی گۆشتنەو لە خۆبایی‌و ناسکۆڵیەو کاتێك ڕێ دەکات وەکوو ئەوە وایە کەلەملاو ئەولا سڵاو بکات. (( بەیتار ـــــــ پزیشکی حەیوانەکان)).

بەسەرسوڕماوییەکەوە تەماشای وێنەی ئەسپەکەم کردو گوتم کە ئەمە خودی ئەسپەکەی ئێمەیە.وەستا عوسمان بە پێکەنینە لەناچارییەکەی

خۆیەوە گوتی:" زانیمان کەئەسپەکەمان کێیە، بەڵام بەداخەوە! ئەمە بۆ دۆزینەوەی شێوەکارەکە هیچ سوودێکی نیە، چونکە دەزانم ئەو شێوەکارەی تۆزێ عەقڵی هەبێت بەتەماشاکردنی ئەسپێکی ڕاستەقینەوە وێنەی ئەسپێك ناکێشێت. دیارە کە شێوەکارانم لەبەرخۆیانەوەو لەیەك هێرشدا وێنەی ئەم ئەسپە دەکێشن. بەڵگەی ئەمەش ئەوەیەکە کە زۆرینەیان لەکاتی کێشانی خەتەکانی ڕووی دەرەوەی ئەسپەکەدا لە پێشدا لەنووکی سمەکانیانەوە دەستپێدەکەن." وەکوو ئەوەی کە داوای لێبووردن بکەم گوتم:" بۆ ئەوەی کەبتوانێ پێ دانێتە سەرخۆڵ لەپێکانیوە دەست پێناکەن؟" وتی وەکوو ئەوەی کە جەمالەدینی قەزوێنی لەسەر کێشانی ئەسپەکاندا گووتوویەتی: ئەگەر لەپێکانییەوە دەست پێبکەی بە مەرجێك دەتوانی تەواوی بکەی کەهەموو ئەسپەکەت لەبەر بێ. دیارە ئەو ئەسپەی کە بەتەماشاکردنی ئەسپێکی ڕاستەقینەوە بکێشرێت بەبیرکردنەوەو بیر هێنانەوە لەسەرییەوە دەستپێدەکرێت و لەدواییدا مل وسینەی دەکێشرێت. هەندێك شێوەکاری ڕۆژئاوایی هەن کە بەدوودڵیو بەئەزموون کردنەوە وێنەی ئەسپێکی بارکێش لەناو کۆڵانەکاندا دەکێشن ودەیفرۆشن بەبەرگدروو وقەسابەکان. ئیدی ڕەسمێکی بەم شێوەیە ناتوانێ ئامارژە بەواتای دونیاو ئەو جوانیانە بکات کە خودا خوڵقاندوونی. بەڵام لەوەش دڵنیام ئەوانیش دەزانن لەوکاتەدا وێنەکان بە یارمەتی بینراوەکانیان ناکێشن بەڵکوو خۆشیان دەزانن چی بەبیربهێننەوەو هەر ئەوە دەکێشن. وێنەکێش هەمیشە لەسەر کاغەزەکەیدا تەنیایە لەبەرئەوەش بیرهێنانەوە هەمیشە پێویستە. بۆ دۆزینەوەی ئیمزای شاراوەی ئەو ئەسپە کەوا بەخێرایی دەست ولەبەر خۆوە کێشراوە زیاتر لە ڕێگای نەریتی کچە نەدیمە هیچ چارەیەکیترمان

نیەو هیچیترشمان لەدەست نایەت. تۆش باش تەماشای ئەمە بکە."

وەکوو ئەوەی کەلەسەر نەخشەیەکی کۆندا بەدوای خەزێندا بگەڕێت ئاوەها بەسەرنجەوە هاوێنەکەی بەسەر پێستی ئەسپەکدا دەهێنا. وەکوو شاگردێك کەبیەوێ شتێك بە مامۆستاکەی بداتە قەبوڵکردن وبەپەشۆکاوی وهەڵچوونی دۆزینەوەی شتێکی تازەوە گوتم:" بەڵێ دەتوانین ڕەنگ وکارەکانی سەرزینی ئەسپە لەگەڵ زینیتردا بەراورد بکەین"

وتی:" وەستاکانی من فلچە بەسەر ئەم وێنانەدا ناهێنن. ئەو شاگردەکانن کە جل وقاڵیو ڕووپۆشەکانی ناو وێنەکان ڕەنگ دەکەن لەوانەیە زەریف ئەفەندی ئەوەی کردبێت، ئەوە دەرباز بکە."

دووبارە بە هەڵچوونەوە گوتم:" گوێکانە؟ گوێی ئەسپەکانیش..."

وتی:" نا، ئەمە ئەو گوێیانەن کەوا بەپێی قاڵبەکانی تەیموور کێشراون ولەپەلی قامیش دەچن". خەریکبوو بڵێم کە هۆنینی یاڵی ئەسپەکەو شانەکردن و داهێنانی تاڵ بەتاڵی مووەکانی کە هەستم بەوە کرد لەم یارییەی وەستاو شاگردییە بێزاربووم وبێدەنگ مامەوە. خۆ ئەگەر شاگردیش بم پێویستە سنووری خۆم تێپەڕ نەکەم. وەستا عوسمان وەکوو پزیشکێك کەدومەڵێکی نەخۆشینی وەبای دۆزیبێتەوەو بەنیگاگلەییکەرەکانییەوە پیشانی ئەویتری بدات ئاوەها بانگی منی کردو گوتی:" تەماشای ئێرەبکە، دەبینی؟" ئێستا هاوێنەکەی هێنابووە سەر سەری ئەسپەکەو بەهێواشی لە ئەسپەکەی دووردەکردەوەو بەرەو ئێمەی دەهێنا. بۆئەوەی کە بیبینم سەرم نێزیکی هاوێنەکە کردووە، کونی لمۆزی ئەسپە زۆر سەیربوو. وەستا عوسمان گوتی:" چاوت پێی کەوت؟" بۆئەوەی لەبینینەکانم دڵنیاببم پێویست بوو کەزیاتر سەرم نێزیکی هاوێنەکە

بکەمەوە، ئێستا کە هاوێنەکە دوور دەبێتەوەو وەستا عوسمانیش لەو کاتەدا ئەوەی کرد گوپەکانمان هاتبووە لای یەك. کاتێ هەستم بە وشکایی وزووربوونی ڕیشەکانی وەستا عوسمانم لەسەر گوپی خۆم کرد بۆ ساتێك ترسام و بێدەنگییەك دروستبوو. دەتگوت کەلەوبەری چاوەماندووەکەمەوە شتێکی سەیر ڕوودەدات و ئێمەش دەبێ بەشایەتی ئەو ڕووداوە. زۆر دواتر توانیم بەدەنگی نزمەوە بڵێم:" ئەوە چییە لەلمۆزیدا؟" وەستا عوسمان گوتی: لمۆزەکەی زۆر سەیر کێشاوە، دەستی پێداهێناوە؟ کەموکوڕییە؟" هێشتا تەماشای چۆنیەتی کێشانی ئەم لمۆزە سەیرو بێ وێنەیەمان دەکرد. وەستا عوسمان بەدەنگێکی گاڵتە پێکەرانەوە گوتی:" ئەو شێوازەی کەوەستا چینییەکان بەلاساییکردنەوەی ڕۆژئاواییەکانەوە دوای کەوتوون ئەمەیە؟" وامزانی کە گاڵتە بەزاواکەم دەکات و گرتمەدڵمەوەو گوتم:" زاوا ئەفەندی گوتویەتی ئەگەر کەموکوڕی لەئەنجامی لێنەهاتوویی و کەمبوونی هونەری شێوەکارەوە نەکەوتبێتەوەو لەقوڵاییەکانی ڕۆحییەوە هاتبێت، ئەوە دەبێت بەشێواز". بۆ دۆزینەوەی ئەوناپیاوەی کەزاواکەمی کوشتبووهیچ ئاماژەیەك زیاتر لەلمۆزی ئەسپەکەمان بەدەستەوەنیە کە دیارنیە لەدەستی شێوەکارەکە دەرچوو یان وەکوو لە خودی ئەسپەکەوە دەرکەوتووە. لە دۆزینەوەی لمۆزی ئەسپەکانی سەر ئەو کاغەزەی وا لەسەر جەنازەکەی زەریف ئەفەندیدا دۆزرابووەوەو مورەکەبەکەی بڵاوبووەوە، زۆری و زەحمەتیمان دەکێشا چ بگات بە کونی لمۆزی ئەسپەکان. وەختێکی زۆر کەممان هەبوو بۆ دۆزینەوەی کەموکوڕی ئەم لمۆزە لەنێو وێنەکانی شێوەکانی وەستا عوسماندا کەلەماوەی ئەم چەند ساڵەی ڕابردوودا کێشاویانە. لەنێوان دووسەدوپەنجا لاپەڕەی جەژننامەدا کەباسی

تێپەڕبوونی جەماوەر بەبەردەم پادشادا وێنە ئەسپی کەمی تێدابوو. کتێبە نموونەییەکان ودەفتەری قاڵبەکان وئەو کتێبە تازە تەواو بووانەی کە لەنێوبینای وێنەکێشخانەکەدا بوون هەموویان هێناو کەسیشیان نارد بۆ ناوەوەی کۆشك بۆ وەرگرتنی مۆڵەتی هێنانی کتێبە شاراوەکانی ناو خەزێنەو حەرمسەرا کە قوفڵیان لەسەرە. بۆیەکەم جار تەماشای وێنەی ئەو ئەسپە خەمبارەمان کرد کەوا زینە دەرئاساییەکانیان داپۆشراوەو بەنەخش ڕازێندراوەتەوەو جەنازەی سوڵتان سولەیمانی قانوونییان دەکێشاو دەبرد کەلە چەمبەرەکەی زیگەتواردا کوژرابوو. ئەم بەرگەیان لە ژووری شازادەیەکی گەنجدا هێنابوو. زەیتوون، لەق لەق وپەپوولە هەمیشە ئەم شتانەیان دەکێشا. چی ئەوانەی کە چەرخەکان دەکێشن چی ئەوانەش کەوابە چاوێکی هەڵماوییەوە تەماشای تەرمی خاوەنەکانیان دەکەن و سلاویان لێدەکەن، کەوا لەژێر سوورایەکەدا داپۆشراون. هەموویان وەکو ئەوەی وەستا کۆنەکان، بەراوەستانێکی ناسك و جوانەوە کێشابوو. ( قاچێکیان بە ناسکییەوە لە پێشەوە بووو قاچێکیتریشیان بەڕاوەستاوی لەدواوەیە). هەموویان بەژن درێژو کەوانی بوون کلکەکانیان بەستراوەو شانەکراوبوون. بەلام لەهیچکامێکیاندا ئەو لمۆزەی کەوا بەدوایدا دەگەڕێین نەدۆزرایەوە. هەروەها لەنێو ئەو ئەسپانەشدا نەبووکەوا فەرماندەکان وزاناکان و مامۆستاکانیان هێنابووە سەرجەنازەکەی سوڵتان سولەیمان . بەم خەمەوە تۆزێك لەپەژارەی دەرووبەری جەنازەکەش بەرەو لای ئێمەدەهات. هەروەها چاویشمان بەوە دەکەوت کە لەسەر لاپەڕەکاندا کە شازادەکانیان دەهێنایە کایەوە لەملاولەولایاندا شتیان نووسیبوو، هەر لەبەر ئەمانەش خەممان بۆ ڕەنجی وەستاکانی وەستا عوسمان دەخوارد

کەلەپێناوی ئەماندا دابوویان. بەدەست وخەتێکی خراپەوە لە ژووری وێنەی باپیری پادشاکەماندا کەلەژێر دارێکدا نێچیری دەکرد نووسرابوو:" گەورە م! ئەی حەزرەت! بەئەندازەی سەبرو لێبوردەیی ئەو دارە حەزتان لێدەکەم و چاوڕێیتان دەکەم." بەم هەستە شکاوو خەمبارەوە ئەو کتێبە ئەفسانەییانەم گرتە دەستەوە کە بەتەنیا باسی دروستبوونیانم بیستبوو ونەمبینیبوون. تەماشای بەرگی دووهەمی هونەرنامەمان کرد کەواقەڵەمی دەستی هەرسێ وەستاکەی لێکەوتبوو. لەپشتی ئەو تۆپانەی کەوا گرمەگرمیان دەکردو لەدوای هێزی پیادەدا سەدان ئەسپی ڕەنگاو ڕەنگی لێبووکەوا سەربازە شکۆدارەکانی سواریان شمشێرەکانیان دەرهێنابوو سپەرەکانیشیان بەرزکردبووەوە. بەڵام هیچ یەك لە وانە کەموکوڕی تێدانەبوو. وەستاعوسمان گوتبووی ئەم کەموکوڕییە چییە ئیتر؟ دواتر هەر لەو کتێبدا تەماشای لاپەڕەیەکمان کرد کە وێنەی دەرگای هومایون وگۆڕەپانی گاڵتەی کێشابووکە ئێستا ئێمە تێیدابووین. وێنەیەك بوو کە نەخۆشخانەکەی تەنیشت و ژووری داواکاری و حەوشەو درەختەکانی وەها کێشابوو کەلەنێو چوارچێوەکەدا جێگایان بێتەوە بچوك و بەقەدەر گرنگی پێدانیعەقڵیشیان گەورە کێشابوو،ئەو ئەسپانەی کەوا دەرگاوان و بنووسەکان و پاسەوانەکان سواری دەبوون ئاماژەیەکی لەو چەشنەیان پێوە نەبوو. هەروەها تەماشای ئەو وێنەیەشمان کرد کەوا ( یاوز سوڵتان سەلیمی ) باوکی باپیریپادشاکەمان لەکاتی سەفەرەکەی بۆ (دولقادر) نیشاندەدات کە لە سەوزەڵانییەکی گیادار لەپاڵی دۆڵی قین کراوەکاندا ڕادەوەستێ و چادرهەڵدەدات، تانجییە ڕەشەکلك سوورەکان و بەچکە ئاسکی قون زل وکەروێشکی زۆریان گرتبوو، هەروەها لەلایەکیتریشەوە

پڵنگێگ کەوتبوو کە خوێنی سوور لەسەر جەستەیدا گوڵی دابوو. نەوەکوولە سەر لمۆزی ئەسپەکەی پادشا نەوەکوو لەسەر لم‌وزی ئەسپی بازجبییەکان کەلەودیوی تەپۆلکەکەوە بە ئامادەیی ڕاوەستابوون، شتێکی وەها دیارنەبوو. هەتاوەکوو ئێوارە بەسەدان کاری زەیتوون و پەپوولە و لەق لەقمان بینی کەلەماوەی ئەم چەند ساڵەدا کێشرابوون و وێنەی ئەسپیان تێداهەبوو: ئەسپە ڕەش وزەردە گوێ جوانەکانی موحەمەدخانی گیرای. ئەسپە پەمبەیی و قورشوونیەکانی حەیدەر پاشا کەوا لەشەوێکدا لەپشتی تەپۆلکەیەکدا بەتەنیا سەریان دیار بوو، ئەسپەکانی حەیدەر پاشا کەوا قەڵای ( خەلق الواد )لە کافیر ئیسپانیاییەکانی دەستێنێتەوەو ئەسپەسەوزەکانی ئەو ئیسپانیایانە کەوا غاردەدەن و لووت لەسەر لووت کەوتوونەتە سەر پشتیان، ئەو ئەسپە ڕەشەی کەوا خەریکبوو والە وەستا عوسمان بکات کە بڵێ ئەمەم لەپێش دا نەبینیوە کێ ئەمەی دروستکردووە، ئەسپێکی سوور کەوا لەبنی دارێکەوە گوێی قوت کردۆتەوەو گوێ لەو عودە دەگرێ کەوا کوڕێك دەیژەنێ، وێنەی شەو دێز کەوا وەکوو شیرین ناسکۆڵەو شەرمەزارەو لەکاتێکدا کە شیرین لەبەر ڕووناکی مانگە شەودا لەحەوزەکدا مەلە دەکات چاوڕێی دەکات، ئەو ئەسپە جووڵە جووڵکەرانە کەوا یاریکەرە تێر ئەندازەکان لەسەریان سوار دەبن، ئەسپی فەرتەنەوئەسپەوانێکی جوان کەنازانم لە بەرچی هۆیەك بوو وایان لە وەستا عوسمان کرد کەبڵێ:" لەکاتی لاویمدا زۆر ماندووبووم، زۆرحەزم پێدەکرد"، ئەو ئەسپە زێڕینەی کەوا لەکاتێکدا حەزرەتی ئەلیاس دەکەوێتە بەر پەلاماری بوتپەرستەکان خودا بۆی دەنێرێ‌و لەهەڵە بەر حەزرەتی ئەلیاس دەکەوێ، کاتێك کەوا سوڵتان سولەیمانی قانوونی بەسواری ئەسپە کووتە

دەشتییەکەیەوە تەماشای شازادەیەکی خەمبار دەکات کەلەتەمەنی لاویدا لەکاتی گیاندان ومەرگدایەو سێ کوڕەکەی بانگ کردووە بۆلای خۆی و هاتوون بۆ نێچیر، ئەسپە تووڕەکان، ئەسپی بەزین و غاردان، ئەسپە ماندووەکان، ئەسپە جوانەکان، ئەو ئەسپانەی کەکەس تەماشایان ناکات، ئەو ئەسپانەی کەلەم لاپەڕەیە دەرناکەونە دەرەوە، ئەو ئەسپانەی کەوا وەکوو ئەوەی بیانەوێ لەبەر تەنگاوی ئەم لاپەڕانەدەربکەون و چوار چێوەکانیان تێپەڕاندووە. لەلمۆزی هیچ یەك لەمانەدا ئەو ئاماژەیەی کەوا بەدوایدا دەگەڕاین بە دی نەکرا. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو بێزاری وخەم وترسەی کەوا دڵمانی داگرتبوو کەم نەدەبووەوە: بۆ ماوەیەك ئەسپەکەمان لەبیر چووبووەوەو تەسلیمی جوانی ڕەنگەکان بووبووین و ڕۆیشتبووین، وەستا عوسمان کاتێ تەماشای  زۆربەی ئەم وێنانەی دەکردکە بەرپرسیاری دروستکردنیان بووە، لەسەرسووڕماویی  زیاتر تووشی ترس و لەرزەی بیر هێنانەوە بووبوو. ئاماژەیەکی کرد بە گیا مۆرەکانی بەر چادرەسوورەکەی شەڕی سوڵتان سولەیمانی باپیری پادشاکەمان کردو گوتی:" ئەمە، قاسمی قاسم پاشا.... ! ئەو وەستا نەبوو.  بەڵام لەماوەی چل ساڵدا لە جێگا چۆڵەکانی وێنەکاندا  گیای پێنج پەلا تەك گوڵینی بەر ئاوی دروستدەکردو و دووساڵ بەر لەئێستا مردو ڕۆیشت. لەبەر ئەوەی هەموو کەسێك باشتر دەیتوانی ئەم  گیایە بکێشێ ئەمەم پێ کێشابوو." ماوەیەك بێدەنگ بوو، لەدواییدا وەستاکەم گوتی:" مەخابن! مەخابن!" لەم قسەیەوە بە تەواوی ڕۆحمەوە هەستمکرد کە زەمان و کاتی هەندێك شت و چاخێك بەسەر هاتووە. هەموو جێگایەك تاریکبوو، لەناکاو ژوورەکەی پڕبوو لە تیشك، جموجۆلێك دەستپێکرد دڵکەم کەواتر پەترپی لێوە دەهات لە هەموو شتێك

تێگەیشت. فەرمانڕەوای جیهان پادشاکەمان هاتبووە ناو ژوورەکەوە. خۆمم خستە بەر پێی و چمکی عەباکەیم ماچکرد، سەرم خولی دەخوارد، نەمدەتوانی تەماشای نێو چاوانی بکەم، بەڵام ئەو لە ژوورەوە لەگەڵ وەستا عوسماندا دەستی بە قسەکردبوو. لەبەر ئەوەی لەگەڵ کەسێکدا قسەی دەکرد کەوا تۆزێك بەر لەئێستا شانبەشانی پێکەوە دانیشتبووین سەیری وێنەکانمان دەکرد هەستم بەگڕگرتنی ئاگری شانازی کردن بەخۆمەوە لەدەروونمدا دەکرد. نەمدەتوانیبڕوابکەم کە پادشاکەمان لە جێگاکەی مندا دانیشتبوو وەکوو من بە هەستیارییەوە گوێی لە قسەکانی وەستا عوسمان دەگرت. خەزێنەدارو ئاغای بازچییەکانیش هاتبوون. چەند کەسیتریش کەنەمدەناسین هەم دەیانپاراست هەم بەوردی گوێیان لە قسەکانی ڕادەگرت. بۆ ماوەیەك هەموو تواناو لێبووردەییەکی خۆمم کۆکردەوەو بەلاچاوێکیشەوەبێت تێر تێر تەماشای نێو چاوانی پادشام کرد. چەندە جوان بوو! چەندە ڕێکوپێك و ڕاستبوو ! دڵم لە پەشۆکاویدا ئیدی توند لێینەدەدا. هەر بەو کاتەدا تەماشای منی کردو چاومان بەچاوی یەکدا هەڵتۆقی.

گوتی:" خوالێخۆشبوو زاواکەتیشم خۆشدەویست". بەڵێ لەگەڵ مندا قسەی دەکرد! لەبەر پەشۆکان و هەڵچوون بەشێك لەقسەکانیم لەدەست دەرچووبووە.زۆر خەفەتبار بووم، بەڵام ئەو تابلۆیانەی کە ئامادەی کردوون شتانێکی دەرئاساین و تەماشاکردنیان سەرەخۆشی ودڵدانەوەیە بۆ من. کاتی گاورە وەنیزییەکە ببینێت سەری سووڕدەمێنێ و لەهێزی عەقلی من دەترسێ ئیدی لەلمۆزی ئەسپەکەوە دەتوانن تێبگەن کە پیاوکوژەکەکام شێوەکاری چەپەلە. ئەگینا هەموو شێوەکاران دەکەین، هەرچەندە

کەستەمیشە بەڵام پێویستە".

وەستا عوسمان گوتی:" پادشای جیهان پەنا ! سوڵتانی من! ئەگەر شێوەکارانم بەبێ بیرکردنەوە وێنەی ئەسپێك بکێشن لەوانەیە بتوانیین تێبگەین کە کێیەو کێ ئەمەی کێشاوە". پادشا بەشێوەیەکی ژیرانەوە گوتی:" ڕاستە، ئەگەر ئەمە لمۆزێکی ڕاستەقینە نەبێ ولە قەڵەم سووڕدانێکدا کێشرابێ". وەستا عوسمان گوتی:"پادشای من! ئەگەر هەر ئەمشەو کێبر کێیەك ڕابگەیەندرێت و تەك تەك لە دەرگای ماڵی وێنەکێشان بدرێو داوایان لێ بکردێت کە لەناو کاغەزێکی نەنووسراودا ... .

پادشا تەماشایەکی بۆستانچیباشی کرد، کەواتای گوێت لێیبووبێ دەدا لەدواییدا گوتی:" دەزانن کە لە شیعرەکانی نیزامیدا زیاتر حەز لەکام کێبڕکێ دەکەم"؟ هەندێکمان گوتی: دەزانین. هەندێکیش گوتی کامەیە؟ یان ناو کەسانێکیش وەکوو من بێدەنگ مانەوە. پادشا جوانەکەم گوتی:" حەز لەکێبڕکێی شاعیرەکان ناکەم، هەروەها حەز لەبەشی بەسەرهاتاتی مامە چینی وڕوویەکانیش ناکەم. من زۆرتر حەز لەکێبڕکێی پزیشکەکان دەکەم کەوا تامردن ئەنجامیدەدەن". ئەمەی گوت و نەیگوت یەکسەر هەستایەسەرپێ و بۆ نوێژی ئێوارە ئێمەی بە جێهێشت. زۆر دواتر کاتێ بانگی ئێوارەیان دا لەدوای ئەوەی لەتاریکایی و دەرگای کۆشکەوە دەرکەوتم، بەدڵخۆشییەوە خەیاڵم لە شەکورە و منداڵەکان و ماڵ دەکردەوەو بە هەڕاکردن بەرەو گەڕەکەکە دەڕۆیشتم کە بەترسەوە بەسەرهاتی کێبڕکێی پزیشکەکانم کەوتەوە یاد:

یەکێك لەو دووپزیشکەی کەوا لەبەردەم پادشاکانیاندا کێبڕکێ دەکەن حەبێکی سەوزی ژەهراوی دروستدەکات کەدەتوانێ خێڵێك بکوژێت. دەیدا

بەو پزیشکەکەیتر، ئەویش دژە حەبەکەی دروستدەکات و بەعافییەتەوە دەیخوات و لەداوییی ئەوەش حەبە ژەهراوییەکەش دەخوات. وەکوو ئەوەی کە چاوەڕوان دەکرا هیچی لێنەهات. لەوەش زیاتر کاتی ئەوە هاتبوو کە ئەو بۆنی مەرگ بدات بە بەرلووتی ڕەقیبەکەیدا . وردە وردە دەجولێتەوەو تامی نۆرەی خۆی دەچێژێت، لەدواییدا لەناو باخچەکەدا پەلی گوڵێکی پەمبەیی دێنێت وردەیخاتە ناو دەمییەوەو هۆنراوەیەکی پێدا دەخوێنێتەوە کەتاوەکوو ئەو کاتە کەس نەیبیستبوو. لەدوایشدا بە خۆمتمانەییەکەوە پەلی گوڵەکە دەدات بە پزیشکە جل پەمبەییەکە بۆ ئەوەی کە بۆنی بکات. ئەم پزیشکە جل پەمبەییە پەلەکە نێزیکە لووتی دەکات ونایکات لەترسی ئەو هۆنراوەیەی کەوا بەسەر پەلە گوڵەکەدا خوێنراوەتەوە دەکەوێ‌و دەمرێ.

## (( بەمن دەڵێن زەیتون)) (43)

بەر لەنوێژی ئێوارە بوو کە کەلەدەرگایان دا، کردمەوە لەکۆشکەوە پیاوێکی بۆستانچیباشی هاتبوو لاوێکی پاك وجوان وپێکەنۆك بوو، چراکەی دەستی لەوەی زیاتر کەروومەتی ڕۆشنتربکاتەوە سێبەری دەخستەسەر ڕووخساری. تەختەی نووسین و لاپەڕەیەکی بەدەستەوەبوو، وتی: پادشاکەمان کێبرکێیەکی لەنێوان شێوەکارەندا سازکردووە، بۆ ئەوەی بزانێت کەکێ دەتوانێ لەناکاو ولەیەك جاردا جوانترین وێنەی ئەسپێك بکێشێت. دەستووریان داوەکە هەر ئێستا لەسەر چۆکم دانیشم وتەختەکە

بخەمە سەرقاچم وجوانترین وێنەی ئەسپی دونیا بکێشیم. میوانەکەم بردە ناو ماڵەوە. بەڕاکردن ڕۆیشتم وناسکترین قەڵەمی خۆمم هێنا کەلەتووکی پشیلە دروستکرابوو مووڕەکەبەکەم دانایە بەردەستی خۆم و دانیشتمە سەر زەوی بۆ ساتێك چاوەڕوان مامەوە! ئەم کارەشتێکی تێدا نەبێ کەببێ بەهۆی لەدەستچوونی سەروماڵم !؟ لەوانەیە ! بەڵام ئایا وەستا کۆنەکانی هەرات ئەفسانەکانی خۆیانیان لە نێوان مەرگ و جوانیدا نەخوڵقاندووە؟ دەروونم پڕبوو لە هەستی وێنەکێشان، بەڵام لەوەش ترسام کەوەکوو وەستا کۆنەکانی بکەم و خۆمم ڕاگرت– بەسەیرکردنی لاپەڕە سپییەکە تۆزێك چاوەڕێ مامەوە بۆئەوەی کە ڕۆحم لەترس و لەرزەکانی نەجاتی ببێ وبتوانم بیر لەو ئەسپە جوانەبکەمەوەکەوا دەیکێشم وسەرنج وهێزی خۆی بدەمە سەر. هەر لەئێستاوە وێنەی ئەو ئەسپانەی کە بینیبوومن وکێشابوومن دەهاتنەوە پێش چاوم بەڵام یەکێکیان هەبوو کەلەهەموویان جوانترو باشتربوو. ئەو ئەسپەی کەتاوەکوو ئێستاکەس نەیتوانیبوو بیکێشێ من دەمکێشا. بەبڕیارەوە هێنامەوە پێش چاوی خۆم : بۆ ساتێك هەموو شتێك بێدەنگ بوو، تەنانەت ئەوەشم فەرامۆشکردبوو کەمن لێرەدا دانیشتووم و خەریکی وێنەکێشانم. دەستم لە خۆیەوە قەڵەمەکەی خستۆتە ناو قووڵایی جامۆڵکەو خەستایی مورەکەبەکەوە. دەی! دەستە باشەکەم، ئەو ئەسپە دەرئاساییەی پێش چاوم بکە بەراستی ! وەکوو ئەوا وابووکە من و ئەسپەکە بووبێتین بەیەك ودەمانەوێ لەناوئەم دونیایەدا جێگای خۆمان بکەینەوە. بەم هەستەوە لەناکاو لەناولاپەڕە سپییە چوارچێوەکراوەکەدا بەدوای ئەو جێگایە دەگەڕام. لەخەیاڵی خۆمدا ئەسپەکەم لەوێدا بەجێکردو لەناکاو وەکوو ئەوەی کەمن بیریشم لێنەکردبێتەوە. دەستم بەبڕیارێکی

تەواوەوە دەستیپێکردو لەسمەکانیەوە پێچی خواردەوە و ڕۆیشتە ژوورەوە بۆ سەر پشتی ئەسپەکە، ئەمجارەیان لەلای ئەژنۆکانیدا خۆی بادایەوەو ڕۆیشتە سەرزکی ئەسپەکە. لەناکاو خۆشی دایگرتم! ئەی ئافەرین**!** هەر بەولەنجەولارەوە بەهیوای سەرکەوتنەوە بەرەو ژوور بڕۆ. سینگی چەندە جوان دەرکەوت ! وەکوو ئەسپەکەی پێش چاوی خۆم ئەو پەڕی وردەوردە باریك بووەوەو بووبەملی. بەبێئەوەی کەقەڵەمەکەم هەڵگرم تۆزێك بیرم کردەوەو لەژێرگوێکانییەوە دەمە بەهێزەکەیم بەکراوەیی کێشاو زمانەکیشم هێنایەدەرەوە. بەهێواشی– نەکەوێتە گومان ودوودڵییەوە گەڕامەوە بۆسەر لمۆزی ( یۆز) یەکڕاست. قەڵەمەکەم بەرەو ژووربردەو سەیرێکی هەموویم کرد، کاتێ بینیم وەکوو ئەوەی نا خەیاڵی خۆم دەرچووە ئەوەم فەرامۆشکرد کەمن کێشاومەو واهەستمدەکرد کە گوێو مل وچاڵاییەکانی پشتیم نەکێشاوە ودەستم لەخۆیەوە خەتەکانی ڕاستکردەوە. دەستم لەبەر خۆوە خەریکی کێشانی کورتانی ئەسپەکە بوو، تۆزێکی پێچوو، لەناکاو ڕاوەستاو قەڵەمەکەی خستەوە ناو جامۆلکەی مورەکەبەکە. زۆر لەوە ڕازیبووم کە پاشەڵەکەیم بەهێزو گۆشتن دروستکردبوو، لەگەڵ وێنەکەمدا تێکەڵاوبووبووم. واهەستمدەکرد کەلە تەنیشت ئەسپەکەدام، بەخۆشییەوە کلکەکەیم کێشا، ئەسپێکی خێرابوو بۆ شەڕکردن زۆرباش بوو. کلکەکەیم بەستەوەو بەرەو ژوور هەڵگەڕامەوە. کاتێ کەبەینی کلك و سمتەکانیم دەکێشا هەستم بە فێنکاییەکی خۆش لەدواوەی خۆمدا دەکرد. جوانی پاشەڵەکەیم تەواو کرد و بە حەزێکی تەواوەوە دوایین پێی چەپیم بە کۆکراوەیی کێشا، خەیاڵی پێی چەپی پێشەوەی بەهەموو ناسکۆڵییەکەوە لەمێشکمدا بەرجەستەبوو. لەو هەموو جوانییە سەرم سووڕمابوو. دەستم

هەڵبڕی و چاوەئاگر پڕژێن و خەماوییەکانیم کێشاو بەدوودڵییەوە کونی لمۆزو ڕووپۆشی کورتانەکەیم کێشا. وەکوو ئەوەی کەیاڵەکانی شانە بکەم و دەستی پێدا بهێنم قەڵەمەکەم تاڵ بەتاڵی یاڵەکەی کێشا لە غاوەکەیم بەست و لەدوایشدا بە ویستێکی زۆرەوە ناو گەڵیشیم تەواوکرد. ئێستا هەموو شتێك تەواوە من کاتێك ئەسپێکی دەرئاسایی دەکێشم خۆم دەبم بەو ئەسپە دەرئاساییە.

## ((بەمن دەڵێن پەپوولە)) (44)

وابزانم لەکاتی نوێژی شەودا بوو کەیەکێك لەبەردەرگاکەدا پێی وتم: پادشا فەرمانی دروستبوونی کێبرکێیەکی داوە . بەسەرسەرم پاشام، جاکێ دەتوانێ لەمن باشتر وێنەی ئەسپێکی جوان بکێشێ؟! سەرەڕای ئەوەش کاتێ کەزانیم ئەبێبەبێ ڕەنگ و بەشێوەی ڕەشایی قەڵەم بکێشرێ بۆ

ماوەیەك بێدەنگ مامەوە. بۆچی بۆیاخی ناکەین؟ داخۆ دەبێ لەبەر ئەوەبێ کەمن لەهەموویان باشتر وێنە ڕەنگدەکەم؟ کێ بڕیاری ئەوە دەدات کەکام وێنە لەهەموویان باشترە؟ بۆنی دەمی کوڕە ناوشان پان و لێو پەمبەییەکەی نێو دراوی کۆشکم تاقیکردەوەو زانیم کە وەستا عوسمانیش ئاگای لەم بەزمە هەیە . بێگومان وەستا عوسمان هونەرەکەی من دەبینێ و لەوەش زیاتر لەنێوان هەموو وێنەکێشاندا زیاتر منی خۆشدەوێ.

بەمجۆرە تەماشای لاپەڕە سپییەکەم کردو ئەو جۆرەی ڕاوەستان وشێوەی نیگاکردنەی وا ئەوان حەزیانلێدەکرد هێنامەوە پێش چاوی خۆم . پێویستە ئەم ئەسپە وەکوو ئەسپەکانی دواترە ساڵلەمەوبەری وەستاعوسمان پڕجموجۆڵ بێ و لەهەمانکاتدا لەسەر خۆبێو قورساییەکەی بەدەوروبەر بسەلمێنێ، هەروەها دەبێ لەجۆری ئەسپانەبێت کەوا پادشاحەزیانلێدەکات، ئەبی دوولاقی پێشەوەی بەرزبووبێتەوە تاوەکوو هەردووکیان لەسەر جوانییەکەی هاوبیر بن، داخۆ خەڵاتەکەی چەن ئاڵتوونە؟ خۆزگە دەمزانی کە " میر موسەویر " چۆن ئەم ئەسپەی دەکێشا ؟ دەبێ بەهزاد چۆنی بکێشایە ؟ لەناکاو شتێك هات بەمێشکمدا بەڵام بەرلەوەی بزانم کە چیبوو، دەستە چەتوونەکەی من قەڵەمەکەشی وەرگرتبوو و دەستی بە کێشانی پێی چەپی پێشەوەی ئەسپەکە بە بەرزکراوەیی کردبوو. قاچەکانی تۆزێکی مابوو کەلەگەڵ سینەیدا ببێبەیەك، لەدوایدا بەلێبوردەییەکەوە دووکەوانم کێشا کە ئەگەر بتانبینیبایە دەتانگوت ئەم هونەرمەندە وێنەکێش نیە بەڵکوو خۆشنووسێکی لێهاتووە. دەستم لە خۆیەوە بەرەو سەری ئەسپەکە دەڕۆیشت منیش بەسەرسووڕماوییەوە وەکو ئەوەی کەوا دەستی کەسێکی

تربێ تەماشای جەستەی خۆمم دەکرد. کەوانە دەرئاساییەکان و زکە فڕەکەی ئەم ئەسپە نائاساییەو سینگە پتەوەکەیو ملە درێژەکەی کەلەهی قاز دەچووتەواو بووبوون و وێنەکە زۆری نەمابوو. چەندە لێهاتووم !

کەبیرم لەم شتانە دەکردەوە دەستم، دەمەکراوەکەی ئەم ئەسپە سەرخۆشە بە هێزەو لمۆزەکەیو تەوێڵ ژێرەکەیو گوێکانیشی کێشابوو. سەیرکە دایە! چ جوان دەرچووە! کەوانێکیترم کێشا، تۆزێکی مابوو کە پێبکەنم لە جووتە پێ بەرزکراوەکانی پێشییەوە تاوەکوو چەماوییەکی پشت وملە بێ کەموکوڕیەکەی هاتمە خوارەوە ، دەستم زینەکەی دەکێشا، بەشانازییەوە تەماشای سینگە قەڵەوەکەیم کرد کەوا وەکوو هی من خڕۆڵە بوو: لەبەرامبەر ئەم ئەسپەدا هەرکەس سەری سووڕدەمێنێتەوە. بیرم لەو قسە خۆش و شیرینانە کردەوە کەوا پادشا لەکاتی وەرگرتنی خەڵاتەکەدا پێمدەڵێ:کاسەیەکی پڕ لە زێڕم پێدەدا، بیرم لەوە دەکردەوە دەکەوا لە ماڵدا چۆن دەیانژمێرم و پێکەنین دەیگرتم. لەو بەینەدا بەلاچاوێکەوە سەیری دەستمم دەکرد کەوا زێنەکەی تەواو کردبوو، ولەدواییدا دەستم فڵچەکەی ژەند بەناو مورەکەبەکەدا و بەپێکەنینەوە وەکوو ئەوەی کەگاڵتە بکات پاشەڵی ئەسپەکەی دروستکرد. بەخێرایی کلکەکەیم تەواوکرد، دواوەی ئەسپەکە لەتەواو بووندایە و بەخۆشییەوە وەکوو هی کوڕە جوانکیلەیەك سمتە خڕۆڵەکانیم کێشا. کاتێ من پێدەکەنیم دەستە ژێرەکەم پێکانی دواوەی کێشاو ڕاوەستا: بووبە جوانترین ئەسپێك کەوا لەسەر دووپێ ڕاوەستابێ. خۆشییەك دەروونمی گرتەوە: بیرم لەوە دەکردەوەکە چۆن ئەسپەکەم پەسەند دەکەن، منیش وەکوو وێنەکێشێکی هونەرمەندو بگرە هەر لەئێستاوە وەکوو سەرۆکی وێنەکێشان ڕادەگەیەنن و ئەوەشم بەبیردا

**دەهات کە ئەمەش دەڵێن : چەندە بەزووی و بە خۆشییەوە کێشاویەتی! تەنیا لەبەر ئەوەی کە دەبێ بەبۆنەی ئەمەوە گوێنەدەنە وێنەکەم زۆر ترسام. بەمجۆرەش بەوردی کارم لەسەریاڵو کونی لمۆزەکان و موی کلك و ڕوپۆشی زینەکەی کرد( بۆئەوەی کە دیار بێت کەلەگەڵ دروستکردنی ئەم وێنەیەدا ڕەنجی زۆرم کێشاوە) بەمجۆرەی کەئەم ئەسپە ڕاوەستاوە ئەگەر لەلایەکی دواوە سەیری بکەیت هێلکە گونەکانی دیار دەبن، بەڵام من ئەمەم بۆ ئەوە نەکێشاوە کە عەقڵی ژنان بچێتە سەری، بەشانازییەکەوە سەیرێکی ئەسپەکەم کرد: لەسەر دووپێ ڕاوەستاوەو وەکوو فەرتەنە پڕجموجۆڵە، بەهێزە: خەتە لارەکانی وەکوو ئەوەی کە بایەك هەلیکردبێو وەکوو پیتەکانی خۆشنووسێك کەوتبوونە جمووجۆڵ بەڵام لە هەمانکاتیشدا ڕاوەستابوو. بەشی ئەم وێنەکێشە دەرئاسایەیان کەوا ئەم ئەسپەی کێشاوە وەکوو (بەهزاد )و(میر موسەویر) دەدەنەوەو ئەوکات منیش وەکوو ئەوانم لێدێ. کاتێ کەوێنەی ئەسپێکی نائاسایی دەکێشم خۆم دەبەم بە وێنەکێشێکی دەرئاسایی کەوا وێنەیەکی نائاسایی دەکێشێت.**

## ((پێم دەڵێن لەق لەق )) (45)

**دوای نوێژی شەوبوو، بۆ قاوەخانە دەڕۆیشتم کەوتیان: یەکێك لەبەر**

**دەرگاکەدایە. خێرە! ڕۆیشتم، یەکێك لەکۆشکەوە هاتبوو: باسیکرد، باشە: جوانترین ئەسپی دونیا؟ ئێوە پێم بڵێن کە بۆ هەر یەکەو چەندە ئاکچەم پێدەدەن تاوەکوو پێنج شەش دانە لە جوانترین ئەسپەکانی دونیاتان بۆ بکێشم.**

**بەڵام بەوریایەوە هەڵسوکەوتم کردو وەهام نەگوت، منداڵەکەی بەردەرگام هێنایە ژوورەوە. بیرمکردەوە: جوانترین ئەسپی دونیا نیە تاوەکوو من وێنەی بکێشم. دەمتوانی ئەسپەکانی شەڕو ئەسپە قەڵەوەکانی مەغوول و ئەسپە ڕەسەنەکانی عەرەب و ئەو ئەسپە قارەمانانەی وا لەناو خوێندا خۆیان بادەدەنەوەو تەنانەت ئەو ئەسپە بێبەختانەی وا عارەبانەی پڕلە بەرد دەکێشن و دەیبەن بۆ بیناسازی بکێشم، بەڵام کێ دەڵێ ئەمانە جوانترین ئەسپی دونیان؟ خۆی لەوە تێگەیشتم کە پادشاکەمان بە گوتنی جوانترین ئەسپ ، دەیەوێت دەرئاسایترین ئەسپێك بکێشرێت کەوا لەمەوبەر بەقاڵب و یاساو ڕاوەستاندنەکانیانەوە بەهەزارن جار لەلایەن وێنەکێشانی ئێرانەوە کێشرابێ. بەڵام بۆچی؟ دیارە بۆ وەرگرتنی کاسەیەك زێڕە. ئەگەر بلێن ئەسپێکی سادە و عادی بکێشن ئەوا هەموو دەزانن کەس ناتوانێ لەگەڵ ئەسپەکانی مندا کێبرکێ بکات. کێ پادشاکەمانی هەڵخەڵەتاندووە؟ سەرەڕای ئەو ورتەو بۆڵانەی وا لەسەرمن لەلای پادشادا کراوە پادشا خۆی دەزانێ من وێنەکێشێکی بە هونەرم وحەز لەوێنەکانی من دەکات. لەناکاو دەستم وەکوو ئەوەی کە بییەوێت وازلەم هەمووئەم حیساباتە بهێنێ دەرپەڕی لە جارێکدا لە قاچەکانیەوە دەستپێکردوو وێنەی ئەسپێکی ڕاستەقینەی کێشا. ئەمانە لە کۆڵانەکان و لە شەڕەکاندا دەبینن. ماندوون بەڵام لەسەر خۆن... لەدواییدا بەهەمان تووڕەییەوە وێنەی ئەسپێکی**

سوپاهیشم کێشا، جوانتر دەرکەوت، هیچ یەك لە وێنەکێشانی وێنەکێشخانەکە ناتوانن شتانی ئاوەها جوان بکێشن . خەریك بوو لەبەر خۆمەوە یەکێکیتر بکێشم کەئەو کوڕەی لەکۆشکەوە هاتبوو وتی: " یەك دانە بەسە " لاپەڕەکەی وەردەگرت و دەڕۆیی کە گرتم. چونکە وەکوو ناوی خۆم دەمزانی کە ئەم ناپیاوانە بۆ ئەم ئەسپانە کاسەیەکی زێر نادەن. ئەگەر وەکوو خۆم بیکێشم کاسەیەکی زێڕم پێنادەن! ئەگەر ئەو کاسە زێڕەش وەرنەگرم لەمەوبەدوا ناوم لەکەدار دەبێ . بەکوڕەکەم وت:" تۆ ڕاوەستە . ڕۆیشتمە ناوەوەو دوودانە زێڕی بریقەداری ( وەنیزیم) هێناو خستمە ناو دەستەکانی کوڕەکەوە. ترسا. چاوی واق مابوو. وتم:" تۆ کوڕێکی باشی، شێرە کوڕی !". یەکێك لەدەفتەری نموونەکانم دەرهێنا. ساڵانێکە ئەمانەم لەهەموو کەس شاردۆتەوەو تا ئێستا نیشانی کەسم نەداون و هەربەمانەش بەدزیوە نموونەیەکی جوانترین وێنەکانم دروستکردووە خۆ ئەگەر دە ئاڵتوون بدەی بە ئاغا بچکۆلەکەی کۆشك، ئەو ناپیاوە باشترین دارەکان و ئەژدیها پەلەورو نێچیروان و سەربازت لەناو نهێنیترین و شاراوەترین کتێبەکانی خەزێنەدا بۆ دەردەخاو وێنەیەکیت پێدەدا، ئەم دەفتەرەی من بۆئەو کەسانە نابێت کە دەیانەوێ ئوستادەکۆنەکان و چیرۆکەکۆنەکان بهێننەوە یاد، شتێکی دەرئاساییە. لاپەڕەکانی دەفتەرەکەم بەبەرچاوی کوڕەکەوە هەڵدەدایەوەو لەدواییدا جوانترین ئەسپم هەڵبژارد. بەدەرزییەکەی دەستمەوە خەتەکانی خۆمم کون کون کردو تێپەڕبووم. لاپەڕەیەکی خاوێنم خستە ژێر قاڵبەکەوە. خەڵووزی ورکراوم پژاند بەسەریداو باش ڕاموەشاند بۆئەوەی کەهەمووی بچێتە خوارەوە. قاڵبەکەم هەڵگرت. خەڵووزە وردکراوەکە نوختە نوختە وێنەی ئەسپەجوانەکەی دیارکردبوو، حەزم

لەتەماشاكردنی دەكرد. دەستم برد بۆ قەڵەمەكەم و بەو ئیلهامەی وا لەوكاتەدا لە دەروونمەوە بۆم هاتبوو، بەشێوەیەكی جوان وزۆر ناسكانە نوختەكانم گەیاندەیەك و كاتێك كەزكی ئەسپەكەو ملە جوانەكەیو لمۆزەكەو پاشەڵەكەیم كێشا هەستم بەخۆشییەك دەكرد. وتم: "ئاوەها!" جوانترین ئەسپی دونیا . هیچ یەك لەو گەمژانەیتر ناتوانن شتی ئاوەها بكێشن. بۆ ئەوەی كە كوڕەكەش بڕوا بكات و چۆنیەتی ئیلهامی كێشانی ئەم ئەسپە بۆ پاشا و هازم نەگێڕێتەوە سێ ئاڵتوونیترم پێدا و ئامارژەشم بەوەكرد كە ئەگەر كاسەیەكی زێڕ بە خەڵات وەربگرم زۆرتری پێدەدەم. لەوەش زیاتر ئەویش خەیاڵی دووبارە بینینەوەی ژنەكەی منی دەكرد كەوا بەدەمێكی كراوەوە تەماشای دەكرد. زۆر كەس وادەزانن بەكێشانی جوانترین نەخش دەبن بە وێنە كێشێكی باش بەڵام تەنیا كێشانی باشترین وێنە بۆ ئەمە بەس نیەو دەبێ قەناعەت بە پادشاو دەوروبەرە هیچ نەزانەكەی بكەی كە تۆ وێنەكێشێكی باشی. كاتێ وێنەی ئەسپێكی نائاسایی دەكێشم من تەنیا بەدەبم بە خۆم و بەس .

## (( لەدواییدا پێم دەڵێن پیاوكوژ)) (46)

بەرلەوەی ئەسپەكە بكێشم زانیتان من كێم؟ كەئەوەم بیست داوایان لێكردووم وێنەی ئەسپێك بكێشم یەكسەر تێگەیشتم كەئەمە بۆ كێبركێ نیە بەڵكو بۆئەوەیە كە بەرێگای ئەوەوەو بزانن كەمن كێم . هەستم بەوەكردبوو كە وێنەی چەند ئەسپم لەسەر لاشەكەی زەریف ئەفەندی بەجێهێشتبوو، ئەوانەم لەسەر لاپەڕەیەكی گەورە بۆ دەستگەرمكردن كێشابوو. بەڵام من كەموكوڕییەكم نیە تاوەكوو تەماشای ئەو ئەسپانە بكەن كەوا من كێشاومەوبوجۆرە بمدۆزنەوە. بۆ دڵنیابوون دڵنیابووم بەڵام دیسان كاتێك كەوێنەی ئەسپەكەم دەكێشا ترسێك دەروونمی گرتەوە. ئایا كاتێك وێنەی ئەسپەكەی زاوا ئەفەندیم كێشابوو شتێكی وام كێشابوو كە بمدات بەدەستەوە؟ پێویست بووئێستا ئەسپێكیتر بكێشم، ئەمجارە بیرم لە شتانیتر كردەوە بەڵام خۆمم ڕاگرت و نەبووم بەخۆم. بەڵام من بۆ خۆم كێم؟ من كەسێكی وام كە بۆ ئەوەی لەگەڵ شێوازەكانی وێنەكێشخانەدا یەكبگرمەوە شتە دەرئاساییەكانی دەروونی خۆم دەشارمەوە ؟ ئایا من ئەو كەسەم كە ڕۆژێك بە سەركەوتنەوە ئەسپەكەی دەروونم بكێشمەوە؟ بۆماوەیەك بەترسەوە هەستم بەهەبوونی ئەو وێنەكێشەكرد لە دەروونی خۆمدا. وەها هەستمدەكرد كە ڕۆحێكیتر لەدەروونمەوە سەیرم دەكات، شەرمم لێكرد. لەبەر ئەوەی كە تێگەیشتم ئیدی ناتوانم لەماڵ بمێنەوە لێمداو ڕۆیشتمە ناو كۆڵانەكانەوە. ( شێخ عوسمان بابا)لە(مەناقبنامە)كەی خۆیدا نووسیویەتی : عەوداڵ بۆئەوەی كە شەیتانەكەی دەروونی خۆی دووربكاتەوەو لەدواوە بیهێڵێتەوە پێویست بوو كە لەماوەی تەمەنیدا هەمووكات ڕێبكات و

بۆماوەیەکی زۆریش لەیەك جێگادا نەمێنێتەوە، بەڵام خۆی لەدوای ئەوەی کەحەفتاوحەوت ساڵ لەم شار بۆ ئەو شار دەگەڕێ ماندوو دەبێ و تەسلیمی شەیتان دەبێت. ئەم تەمەنە ئوستادەکانی وێنەکێشی دەگەیەنێتە تاریکاییەکەی خوداو کوێراییان پێدا دەدا و بەبێئەوەی کە بیانەوێ دەیانکات بە خاوەنی شێوازێکی تایبەت بە خۆو لە هەمانکاتیشدا لەهموو شێوازەکان نەجاتیان دەدات.

لەمەیدانە چۆڵەکەی بازاڕی ئەسیرەکان و بازاڕی مریشکەکان لە ( بەیازیت)دا وەکوو ئەوەی کە بەدوای شتانێکدا بگەڕێم لە نێو بۆنی خۆشی دوکانە مەحەلەبی و شۆربا فرۆشییەکاندا دەگەڕام، لەبەر دوکانە داخراوەکانی دەلاکەکان و ئوتوکێشەکانەوەو نانەواخانەی باوەپیرەیەك کەوا پارەی دەژماردو بەسەر سووڕماوییەوە سەیری منی دەکردو لەبەر دوکانێکی ترشی فرۆشییەوە کە بۆنی میسك وماسی خوێکراوی لێوە دەهات تێپەڕبووم. تەنیا لەبەرئەوەی کە چاوم بەرەنگی شتەکانی ناو دووکانەکەیدا هەڵتۆقی ڕۆیشتمە ناو دوکانێکی وشکە فرۆشییەوە کە خەریککی کێشانی شتێك بوو، وەکوو ئەوەی کە پڕ بەدڵەوە تەماشای مرۆڤەکان بکەم لەبەر ڕووناکی چراکەوە سەیری قاوەو زەنجەفیل و کیسەکانی دارچین و قوتوە ڕەنگاورەنگاکانی بنێشت و ڕەشکەو گیاوشکەی ترم کرد ، لەدواییدا ڕۆیشتمە ئەو جێگایەی کەوا پێمیدەگوت چێشتخانەی خەفەتباران ( دەبوایە بمگوتایە چێشتخانەی بێنەوایان ) وحەفتەیەك دووجار لەوێ زکی خۆمم تێردەکرد. دەرگاکەی بۆئەوانەی وا دەزانن تانیوە شەوان کراوەیە .ناوەوە کەسانی ڕاکردوو لە پەتی سێدارەو ئەسپ دزو چەند بێچارەی تووکن و چەند داماوێکیتر کەوەکوو تلیاقکێشەکان چاویان

لەم دونیایە وەرگرتبوو ورایانکردوو بۆ بەهەشتانێکیتر و دوولەنەچن کە نەیاندەتوانی بەباشی بە گوێرەی داب و نەریتەکانی جەماعەت هەڵسوکەوت بکەن و کابۆایەکی ڕێبوار کەسەرەڕای هەموو جەنجاڵێك لە گۆشەیەکدا سەری داخستبوو، دانیشتبوون. بە ناسکییەوە سڵاوێکی چێشتکەرە حەلەبییەکەم کرد. سینەییەکەمی پڕکرد لە دۆڵمەی کەلەرمی گۆشتدار و ماستم کرد بەسەریدا و مشت بەمشت بیبەری سوورم پڕژاند بەسەریدا لەپاڵی ڕێبوارەکەدا دانیشتم . هەر شەوێك خەفەت و ئازارێکیتر دایدەگرتم. هەندێك لەشەوان خەوی پێوە دەبینم و وا دەزانم کە لە چاڵە ئاوەکە دەرکەوتووەو بەدوای مندا دەگەڕێ بەڵام خۆڵێکی زۆرمان دابووبەسەر تەرمەکەیدا؟ ناتوانێ لەقەبرەکەی هەڵسێتەوە .

ئایا کردنەوەی دەرگای قسەو باسکردن لەلایەن ئەو ڕێبوارەی وا لووتی ژەند بوو بەناو شۆرباکەیدا ئاماژەیەك نەبووکە خودا بۆمنی ناردووە؟ بەڵێ، گۆشتەکەیان بەباشی وردکردووەو دۆڵمەی کەلەرمەکەشم زۆرپێخۆش بوو. پرسیارمکرد: وتی کە: لەدوای بیست ساڵ تازە قوتابخانەی تەواوکردووەو ئێستا لەلای( ئاریفی پاشا) دامەزراوەو نووسەری دەکات. پرسیارم لێنەکرد کەبۆچی ئەم نیوە شەوە لە بارەگای پاشا یان لە مزگەوت یان وەکوو لەماڵو لەباوەشی ژنەکەیدا نەماوەتەوەو هاتووە بۆ چێشتخانەی ئەم جەردەبێژنانە. ئەو پرسیاری لێکردم کە کێم ولە کوێوە هاتووم. منیش بۆ ساتێك بیرمکردەوەو وتم:" ناوی من بەهزادە. لەهەرات و تەورێزەوە هاتووم. دڵڕفێنترین وێنەی دەرئاساییم کێشاوە. ئەوە سەدان ساڵە لە وێنەکێشخانەکانی وڵاتی موسڵماندا لە ئێران وعەرەبستاندا وەها دەڵێن: کەتەماشای دەکەی وادەزانی وەکوو وێنەکانی بەهزاد ڕاستەقینەیە، خۆی

لەخۆیدا ئەمەش ناوەڕۆکی کێشەکە نیە، وێنەکانی من ئەو شتانەی وا بەچاو دەبینرێن ناکێشێ بەڵکوو ئەوانە دەکێشێ کەبە عەقڵەوە دەبینرێن. وەکوو ئێوەش ئاگاداری وێنەش جەژنێکە کەوا بۆ چاوەکان دروستکراوە. ئەم دووشتە تێکەڵبکەن دونیای منتان بۆ ئاشکرا دەبێت. کەواتە:

ئەلف: وێنە نیشاندانی ئەو شتانەیە کە وا عەقڵ دەیانبینێ، جەژنی نیگاو چاوانە.

لام : ئەو شتانەی کەوا چاو لەدونیادا دەیبینێ بەو ئەندازەیەی کە خزمەتی عەقڵ بکات دەکەونە ناو وێنەوە.

میم : کەواتە جوانی ئەو شتەیەکەوا عەقڵ لەخۆیەوە دەیزانێو چاویش لە دونیادا دووبارە دەیدۆزێتەوە.

ئایا ئەم بەرێزەی وا بیست ساڵ لە قوتابخانەدا ماوەتەوە لەم ژیربیرییەی من تێگەیشت کەوا بەئیلهامێکی لەناکاوەوە لە قووڵاییەکانی ڕۆحمەوە دەرمخستبوو؟ نا.چونکە بۆماوەی سێساڵ لەبەردەم ئەو مامۆستایەی وا لە گەڕەکەکانی کەناری شاردا بۆ بیست ئاکچە وانە دەڵێتەوە (ئەمڕۆ بەوپارەیە تەنیا بیست نان دەکڕدرێ) دادەنیشی ولەدواییدا نازانی بەهزاد کێیە . دیارە کە ئەم مامۆستایەش کەوا بیست ساڵ ئەم کارەیکردووە نازانێ بەهزاد کێیە. باشە. باسیدەکەم. وتم: "هەموو شتێکم کێشاوە، هەموو شتێك. پێغەمبەرەکەمان لە بەرمینبەرە سەوزەکەی مزگەوتەکەداو دانیشتنەکانی لەگەڵ چوار خەلیفەکانیداو لەدواییدا لە پەرتووکێکیتردا هەستانەوەو ڕۆیشتنی نێردراوی خودا بەسواری ئەسپەکەی بەناوی ( بوراك) ەوە بۆ میعراج و شتی لەو چەشنەم کێشاوە، هەروەها ئەسکەندەرم لەکاتێکدا کێشاوە کەوا بۆ ترساندنی ئەو

گیانلەبەرە دڕندەیەی وا لەسەر ڕێگای چیندا بەفەرتەنە شەپۆلی دەریاکان هەڵدەستێنێتەوە، هەروەها وێنەی سیویەکەمین پادشام لەکاتێکدا کێشاوەکە بەگوێگرتن لە عود بە دزیوە تەماشای ژنە جوانەکانی ناو حەرە مسەرا دەکات کە بەرووتی لە حەوزەکەدا مەلەدەکەن. لەلایەکیتریشەوە وێنەی چۆنێتی شەرمەزاربوونی ئەو شاگردە زۆرانبازەم کێشاوەکە بەئوستادەکەی دەڵێ لێتدەبەمەوەو ئوستادەکەشی هەموو شتێکی پێفێرنەکردووەیەك فێڵی هێشتۆتەوە هەربەوەش ولەبەردەم پاشادا دەیدا بەعەرزدا، هەروەها وێنەی عاشق بوونی لەیلا و مەجنون لەکاتی منداڵیدا و لەوەختی چۆکدادان بۆ قورئان خوێندنەوە لە قوتابخانەیەکدا کەوا دیوارەکانی بەجوانی دروستکراون و جۆرەکانی بێشەرمانەو بێڕەوشتانەی تەماشاکردنی عاشقان بۆیەك و بەرد بە بەرد دروستکردنی کۆشکەکان وئەشکەنجەدانی تاوانباران و فڕینی هەڵۆکان و کەروێشکە گاڵتەکەرەکان وپڵنگە خاینەکان و دارەکانی سەروو چنارو ئەو قەلە باچکانەی وا هەمیشە لە تەپۆڵکەکاندا دامدەنان و وێنەی مەرگ و ئەوشاعیرانەی وا کێبرکێ دەکەن و سوفرەکانی سەرکەوتن و کەسانی وەکوو تۆم کەلە سوفرە زیاتر شتی دیتر نابینن کێشاوە" ئەم نووسەرە بە تەدبیرە ئیدی لەمن نەدەترسا، تەنانەت قسەکانی منی پێخۆش بووو پێدەکەنی. وتم: مامۆستاکەت بۆتی خوێندۆتەوە تۆ دەزانیکام بەسەرهاتی ناو بۆستانەکەی ( سەعدی)م زۆر لاخۆشە ؟ ( دارا) پاشای ڕاستەقینە ڕۆژێك لەگەڵ کۆمەڵێك کەسدا دەچێ بۆڕاو، لەمیانەی جەنجاڵی ڕاوەکەدا خۆی دەدزێتەوەو دەچێتە سەر تەپۆڵکەکان و دەست بەگەڕان دەکات . لەناکاو توشی کابرایەکی نائاشناو مەترسیدار دەبێ. پاشا توشی حەپەسان دەبێ وترس دایدەگرێوبەپەلە

بەسواری ئەسپەکەیەوە دەست دەبات بۆ کەوانەکەی، لەم کاتانەدا کابرای نەناس دەڵێ: پاشام ! ڕاوەستە، تیرەکەت مەهاوێژە، چۆن نامناسنەوە؟! مەگەر من ئەسپەوانە دروستکردارەکەتان نیم؟ بەسەدان جار ئەسپەکەتان و خۆراکی سەربازەکانتان بەمن ڕاسپاردووە؟ چەندە زۆریش منتان بینیوە؟ من سەد ئەسپی ئێوەبە شێوەو خۆو ڕەنگیان و کەفەکەی دەمیان دەناسمەوە. باشە چۆن دەبێ ئێوە سەرنجنادەنە سەر کەسێکی وەکوو من کەلەنێوان ئەو پیاوانەی وا کارەکەری ئێوەن لەهەوو زیاتر ڕووبەڕووتان دەبێتەوە؟

لەکاتی کێشانی ئەم تابلۆیدا ، دەتوانم بە جۆرێك نیگا بڕلە بەزەییەکانی ئەسپەوانەکەو ئەسپی ڕەش وسپیو...

لەکاتی لەوەڕان لە سەوزەڵانییەکی پڕ لەگوڵی ڕەنگاورەنگ کەلە بەهەشت دەچێ، بەئاسوودەیی‌و بەنەخۆشییەکانیانەوە بکێشمەوە کە گەوجترین کەسیش بتوانێ لە کورتە باسەکانی (سەعدی) شاعیرەوە پەندەکانی خۆی وەربگرێ:" جوانی ونهێنییەکانی ئەم دونیایە تەنیا لەرێگای سەرنجدانەوەیەکی پڕلە خۆشەویستی‌و بەزەییەوە دیاردەبن". ئەگەر دەتانەوێ لەو بەهەشتەدا بژین کەوا ماینەکان و ئەسپەکان تێیدا دەمێننەوە، چاوەکانتان بکەنەوەوەو تەماشای ڕەنگەکان و وردەکارییەکانیان بکەن و سەرنج بدەنە سەر گاڵتەکانو سەیری دونیابکەن. پێکەناندنی مامۆستایەکی بیست (ئاکچەیی) ئەوی دڵخۆش دەکرد بەڵام لەهەمانکاتدا لەمنیش دەترسا. دەیەویست کەوچکەکەی دانێ‌و هەڕا بکات بەڵام نەمهێشت و بەئاسانی بەرم نەداو وتم: " وەستا بەهزادی مامۆستای مامۆستایان لەو وێنەیەدا پادشاو ئەسپەوانەکەیو ئەسپەکانی زۆرجوان کێشاوەتەوە، سەد

ساڵی تەواو لاسایی وێنەی ئەو ئەسپانەیان کردۆتەوە کەوائەو کێشاویەتی کەچی هێشتا تەواویان نەکردووە ، ئەو ئەسپانەی وا لەڕووی خەیاڵو دڵەو دەیکێشان ئێستابوون بە قاڵب، من وسەدان وێنەکێشی تر دەتوانین لەبەرخۆوە بیانکێشێتەوە. تۆ چاوت بە وێنەی ئەسپ کەوتووە؟"

- ( لەکتێبکێی سیحراویدا کە زانایەك دابووی بە خوالێخۆشبوو ماموٚستاکەی خۆم ، چاوی بە ئەسپێکی باڵدار کەوتووە!)

- هەی خوا نەیکوژێ! ئەم کاسە شۆربایە بڕژێنم بەسەر ئەم سەرسامەی وا لەگەڵ وەستاکەیدا بڕوایان بە (عجایب المخلوق) کردووە، وازی لێبێنم بابخنکێ یان وەکوو باسی ئەو تەنیا ئەسپە بکات کەوا لە ژیانیدا بینیوەو کێدەزانی کەچەندە خراپیش بێت؟ ڕێگایەکی سێیەمم دۆزییەوەو لە چێشتخانەکە دەرکەوتم، لەدوایی ماوەیەکی زۆر ڕێکردن ولەدواییدا ڕۆیشتنە ناو تەکیەیەکی چۆڵکراو، هەستم بەئاسوودەیی‌و ئارامی کرد . دەورووبەرم پاك و خاوێن کردەوەو بەبێئەوەی کە شتێك بڵێم گوێم بۆ بێدەنگییەکە ڕاگرت. لەدواییدا ئاوێنەکەم لە جێگا شاراوەکەدا دەرهێناو لەبەرامبەر خۆمدا پاڵمدا بە مێزەکەوە، دوولاپەڕەم هەڵگرت و بەقەڵەمە خەڵووزەکەمەوە خەریکی کێشانەوەی ڕوومەتی خۆم بووم. ماوەیەکی زۆر بەسەبرەوە ئیشمکرد، بەڵام لەدواییدا کاتێك کەزانیم دیسان وێنەکە وەکوو ڕوخساری خۆم لەناو ئاوێنەکەدا دەرنەچووە چاوم پڕبوو لە ئاوو خەفەت دایگرتم. ئەو وێنەکێشە وەنیزیانەی وا کاکی زاوا بەتامەوە باسیان دەکات چۆن دەتوانن ئەمە بکەن؟ بۆساتێك وەها بیرمکردەوە کە ئەگەر خۆم لەجێگای یەکێك لەوانەدا دابنێم و وێنەکەم بکێشم لەوانەیە وەکوو خۆم دەربچێ. دواتر دوعای خراپم بۆ زاواش و وێنەکێشە

فەرەنسییەکان کردو ئەوەی وا کێشابووم پاکمکردەوەو دیسان تەماشای ئاوێنەکەم کردەوەو دووبارە خەریکی کێشان بووم. زۆر دواتریش خۆمم لەناو ئەم کۆلانانەو ئەم قاوەخانە پیسەدا دۆزییەوە. تەنانەت هەستیشم بەوەنەدەکرد کە چۆن هاتوومەتە ئێرە.

- کاتێ کەرۆیشتمە ناو لەبەر ئەوەی کە خۆم تێکەلاوی ئەم وێنەکێش و خۆشنووسە هیچ وپووچانە دەکەم تەوێڵم لە ئارەقەی شەرمدا تەڕبوو. هەستم بەوە دەکرد کە سەیرم دەکەن و دەڕوانن بۆیەك و ئاماژەبە من دەکەن و پێدەکەنن، ئەوەتا بە چاوی خۆم دەیبینم.

دەمویست کە هەڵسوکەوتەکانم سروشتیبن و لەجێگایەکدا دانیشتم. لەلایەکیشەوە چاوم بۆ ئەو برا خۆشەویستە وێنەکێشانە دەگێڕا وا زەمانێك پێکەوە لەلای وەستا عوسمان شاگردیمان کردبوو. دڵنیام لەوەی وا ئەمشەو هەریەکەو ڕەسمێکیشمان بەوان کێشاوەو ئەونایش کێبرکێکەیان بەجیدی وەرگرتووەو دڵیان فرتە فرتی کردووە. هێشتا وێنەکەیان بە دیواری قاوەخانەکە هەڵنەواسیبوو کابرای بالۆرە بێژیش دەستی بەگووتنەوەی بەیتەکان نەکردبوو، ئەمەش منی ناچار دەکرد کەلەگەڵ جەنجاڵی قاوەخانەکەدا یەکبگرمەوە. باشە، باراستیتان پێبڵێم: منیش وەکوو هەموو کەس گاڵتەم دەکردو بەسەرهاتی بێئەدەبانەم دەگێڕایەوەو بەجموجۆڵو زێدەڕۆیوە لەگەڵ دۆستەکانمدا ماچماچانم دەکردو قسەی بەماناو دووتوێم دەگوت و پرسی شاگردە گەنجەکانم دەکردوو وەکوو هەر کەسێکیتر پۆرتی دوژمنەکانم دەشکاندو کاتێ باسەکانیش گەرم دەبوون گاڵتەی بە دەست ومل ماچکردنیشم دەکرد. زانینی ئەوەیکەلایەك لەمێشکم زۆر بێبەزەییانە لەکاتی ئەنجامدانی ئەماندا بێدەنگ دەمایەوە زۆر ئازاری دەدام. سەراڕەی

ئەوەش توانیبووم بە یاریکردن بەوشەکان ،شتەکە(ئالەتەکە)ی خۆم وەی ئەوانەیتریش واباسم لێوە دەکردن لەگەڵ قەڵەم و قامیش وستوونەکانی قاوەخانەکەو باوك ودەسك و منارەو پەنجەی دۆشاوهەڵمژو درەختی سنەوبەرو دووجاریش وەکوو هەموو عاڵەم لێکبچوێنم و دواوەی ئەو کوڕە جوانکیلانەشم واکردبووم بەبابەتی قسە، بەپرتەقاڵ و هەنجیرو سەرین و هێلانەیکی زۆر بچکۆلانەی مێروولەکان لێکدەچوواند. ئەوەش لەکاتێکدا بووکە هەر لەو ماوەیەدا بەئیدە عاترین هاوتەمەنم بەنەزانکاری و بێمتمانەیی بەخۆوە تەنیا توانیبووی (شتەکە)(ئالەتەکە)ی بەستوونی کەشتییەك، پاشەڵیکۆبەرێك لێکبچوێنی. لەمەش زیاتر هەندێك قسەی دووتویو واتادارم گوت بە قامیشی ئەو وێنەکێشە پیرانەی وا هەڵناسنەوەو بە کوڵمە ئاڵەکەی بەردەستە تازەکارەکان و بەوانەی وا(وەکوومن) پارەکانیان لە جێگایەکدا (وتمان گۆشەیەکی بێئەدەبانە) شاردۆتەوەو لەبەرئەوەی کەلەباتی پەڕی گوڵدا ئەفیون (تلیقاقی) یان کردبووە ناو ئەو شەرابەی وا دەمخواردەوە هەندێکیشم لەسەر ئەو شەرابە گوت. هەندێکیشم بەدوایین وەستاکانی شیرازو تەوریێ گوت وباسی ئەوەشم کرد کەلەم دواییانەدا لەحەلەب قاوەو شەراب تێکەڵ دەکرێو چەند قسەیەکی ماناداریشم بە خۆشنووس وکوڕە جوانەکانی ئەویێ گوت. جاری واش هەبوو یەکێك لەو دوو ڕۆحەی وا لەدەروونمدایە سەردەکەوت و ئەویتری لەدواوە دەهێشتەوە، وامدەزانی دەتوانم ئەو لایەنە بێدەنگە بێخۆشەویستییە لەبیر بکەم. ئەو کاتانەش وەکوو هەرکەسێکیتر وەکوو ئەوەی لەگەڵ خۆمدا باسبکەم، ڕۆژانی چەژنی دەورانی منداڵیم دەهێنایەوە یادی خۆم. بەڵام لەنێو ئەم هەموو جەنجاڵو گاڵتەکردن وماچ وموووچەدا،

بێدەنگییەك کەمنی تەنیا دەکردەوە لەدەروونمدا بوو. کێ ئەم ڕۆحەی وا هەموو کاتێك سەرزەنشتی منی دەکردو لەجەماوە دووری دەخستمەوە(رۆح نەبوو، بەلًکوو جندۆکەیەك بوو) خستبووە ناو دەروونی منەوە؟ شەیتان؟ بەڵام ئەم ڕۆحە بە ئەو بێئەدەبییانەی وا شەیتان داوای دەکرد ئارام نەدەبوو بەڵکوو بە پێچەوانەوە بەگێڕانەوەی بەسەرهاتێکی پاك کە کاریگەربێت لەو بێدەنگی ڕۆحەدا. ڕووی ئاسوودەیی دەبینی. لەبەر کاریگەری شەرابەکەو لەبەر ئەوەی کەوامدەزانی ئاسوودەییم پێدەبەخشێ دوو بەسەرهاتم گێڕایەوە. شاگردە خۆشنووسێکی باڵابەرزو کەرەنگی لاشەی کاڵو پەمبەیی بوو بەچاوە سەوزەکانییەوە تەماشای نێوچاوانمی دەکردو بەوردی گوێی بۆ ڕادەگرتم.

ئەم دووبەسەر هاتەی لەسەر کوێرایی داهاتن
و شێواز کەوێنەکێش بۆ ئاهۆن بوونەوەی
رۆحی خۆی گێرابوونیەوە:
(ئەلف)

بەپێچەوانەی ئەوەی وا دەزانرێ کە کێشانی وێنە ئەسپ بەتەماشاکرددنی خودی ئەسپەکە دەرهێنراوی فەڕەنسییەکانە، ئەمە بیرۆکەی وەستای گەورە، جەمالەدینی قەزوێنی بووە. لەدوای ئەوەی کە حەسەنە درێژی (خاقانی)* بزن سپییەکان (ئاککویونلو) دەستی بەسەر قەزوێندا گرت، ئەم وەستا پیرە بەویستی خۆی لەوێنە کێشخانەی خاقانی سەرکەوتوودا ئیشی دەکردو لەوەش زیاتر گوتوویەتی دەمەوێ لەگەڵ خاقاندا بچم بۆ ئەملاوئەولا بۆ کێشانی مەیدانەکانی شەر. بەمجۆرە ئەو وەستایەی وا حەفتاودوساڵ بەبێ بینینی شەڕ وێنەی ئەسپ وسوارو

شەڕی کێشابوو بۆ جاری یەکەم دەچێ بۆ مەیدانی شەڕ بەڵام هێشتا چاوی تێکەڵاوبوونی پڕ لەدەنگەدەنگی ئەسپەکانی نەبینیبووکە بەگوللەی تۆپی دوژمنەوە هەردوو چاوی کوێر دەبێ‌و هەردوو دەستەکەشی لەمەچەکدا دەقرتێ. ئەم وەستایەش وەکوو وەستا گەورەکانیتر کوێرایی داهاتنی وەکوو خێری خودا دەزانی‌و چاوەڕوانیشی دەکرد، و بێدەست مانەوەکەشی وەکووکەموکوڕییەکی گەورە نەدەزانی‌و وەکوو ئەو کەسانە بیری دەکردەوەکە دەڵێن بیرو یادی وێنەکێش لەدەستدا نییە بەڵکوو لە مێشك و دڵدایە، وگوتوویەتی:" جوانترین و بێ عەیبترینی ئەو ئەسپانەی وا خودا گوتوویە ئێستا لە دوای کوێربوونم دەیانبینم". و بۆئەوەی کەئەم وێنە دەرئاساییانە بە وێنە دۆستان ڕابگەیەنێت شاگردە خۆشنووسێکی باڵابەرزو چاوسەوز کەرەنگی لاشەی کاڵ‌و پەمبەییە دەگرێتە لای خۆی و هەموو بینراوەکانی پێدەنووسێ‌و دەڵێ کەئەگەر دەستی هەبایە چۆن دەیکێشان. لەدوای مردنی وەستا ئەم خۆشنووسە جوانە باسی چۆنیەتی کێشانی سێسەدوو سێ ئەسپ لەسێ کتێبدا بەناوی نەخشی ئەسپەکان، تێکڕژانی ئەسپەکان وعەشقی ئەسپەکان کۆ دەکاتەوە، لەماوەی دەسەڵاتداری بزن سپییەکان(ئاککویونلو)ەکان لەوڵاتدا زۆر حەزیان لێدەکرا وخەڵکی بەدویدا دەگەڕان و نووسراوەو لاساییکردنەوەی جۆراو جۆری لێدروستبووەو هەندێك لەوێنەکێشەکانیش داویانە بە شاگردو بەردەستەکانیان بۆئەوەی کەلەبەری بکەن و وەکوو کتێبێکی کارکرد بەکاری بێنن، بەڵام لەدوای سڕینەوەی ئاسەواری دەسەڵاتی (ئاککویونلو)ەکان و هەمەگیربوونی نەخشی هەراتی لەتەواوی وڵاتی عەجەمدا لەبیر کراوە. کەمالەدین ڕەزای هەراتی لەکتێبەکەی خۆی بەناوی (ئەسپەکانی

کوێرەکە)دا ئەو سێ کتێبە بەتوندی ڕەخنە دەکات و بەژیربیرییەکی بەهەقەوە دەڵێت: ئەو ئەسپانەی جەمالەدینی قەزوێنی لەکتێبەکانیدا باسیان دەکات، هیچ کامیان نابن بە ئەسپێکی خودایی، چونکە ئەم وەستا پیرە تەنیا جارێك وبۆماوەیەکی کورت و لەدوای بینینی مەیدانی ڕاستەقینەی شەڕ لەمانە تێگەیشتووە.

لەدوای ئەوەی کە خەزێنەی حەسەنە درێژی (ئاککویونلو) لەلایەن سوڵتان فاتیح موحەمەدەوە تالآن دەکرێ، ئەم سێ کتێبە دێننە ئەستەنبووڵ. ئەو شتەی وا پێویستە سەرمان پێی سووڕبمێنێ ئەوەیکە جاروبار هەندێك لەم سێسەدوسێ بەسەرهاتە لەکتێبی جوداجودا دا بەکار دەبرێن.

(لام)

لەشیرازو لەهەراتدا کوێربوونی وەستای وێنەکێشان بەنیشانەی کارو تێکۆشانی زۆر دەزانراو لەوەش زیاتر وەکوو ڕێزلێنانێك دەبینرا کەخودا بەرامبەر هونەرو ڕەنج وزەحمەتیئەو وێنەکێشەیدا ئەنجامیداوە. هەر لەبەر ئەمەش لەوکاتەدا بەگومانەوە سەیری ئەو وێنەکێشە پیرانەیان دەکرد کەوا سەراڕی زۆر بوونی تەمانیان کوێر نەبووبوون و ئەمەش وایدەکرد کەوەستا پیرەکان بەدوای کوێرایی داهاتندا بگەڕێن. هەندێك لەمانەش لەباتی ئەوەی کە شێواز بگۆڕن وخزمەتی پادشایەکی تر بکەن. چاوی خۆیان کوێردەکەن و ڕێگای وەستا کۆنە ئەفسانەییەکان دەگرنە پێش و ماوەیەکی زۆر بەرێزەوە یادیان لێوە دەکرێت.

کاتێ (ئەبو سەعید) میران پاشای کوڕەزای تەیموور لەدوای گرتنی تاشکەنت و سەمەرقەند وێنەکێشخانەی خۆی دادەنێت بەرێز لێنان

لەلاسایی کردنەوەی کوێرایی داهاتن، پەنجەرەی دونیایەکی تازە دەکاتەوە وەستای بەتەمەن (وەلیە ڕەش)کە ئیلهامی بە ئەبوو سەعید داوە وتوویەتی:" خۆی لەخۆیدا وێنەکێشە کوێرەکان ئەسپەکانی خودا دەبینن، هونەری ڕاستەقینە ئەوەیە کە وێنەکێش بەبێئەوەی کە کوێربێت بتوانێ وەکوو کوێرێك تەماشای دونیای دەوروبەری بکات".

ئەمەشی بەوە سەلماندووە کەلە تەمەنی حەفتاو دوو ساڵی خۆیدا توانیویەتی بە بێئەوەی تەماشای لاپەڕەکەی بەردەمی بکات بەنووکی قەڵەمەکەی ئەوەی هاتووەبە مێشکیدا کێشاویەتی. میران پاشاش بۆئەوەی کەیارمەتی ئەم وەستایە بدات، بە مۆسیقا ژەنی کەڕەوە مۆسیقای بۆ لێداوەو بە بالۆرە وێژێکی لاڵیشەوە چیرۆکی بۆ گێراوەتەوە، لەدوایشدا کاتێ کەوێنەی ئەسپەکەیان لەگەڵ هیتردا بەراوردکردووە هیچ جیاوازییەکی تێدابەدی نەکراوە. لەدوای ئەوەی کە میران پاشا بە ئەم وەزعە ئاڵۆز بێئارام بووە. وەستا ئەفسانەییەکەش گوتوویەتی:" وێنەکێش ئەگەر چاوی کراوە بێت و داپۆشراویش بێت تەنیا بەو جۆرەی وا خودا دەبینی چاوی بەئەسپ دەکەوێ". بەگوێرەی ئەو کاتێ کەبابەتی قسە وێنەکێشێکی باش بێت، ئەوە فەرق ناکات کە کوێر نەبێت یان نەبێت و هیچ جیاوازییەکیان نیە. دەستەکان بەتەنیا یەك جۆرە ئەسپیان دەکێشایەوە، چونکە لەو کاتەدا ئەو شتەی وا شێوازی پێدەڵێن و داهێنراوی فەرەنسییەکانە هێشتا نەهاتبووە ئاراوە. ماوەی سەدونۆساڵ هەموو وێنەکێشەکانی دونیای ئیسلام لاسایی وێنەی ئەسپەکانی (وەلیە ڕەش)یان کردووە.بۆ خۆیشی لەدوای شکستهێنانی ئەبوسەعیدو بڵاوبوونەوەی وێنەکێشخانەکەی لەسەمەرقەندەوە دەچێت بۆ قەزوێن و دوای دووساڵ لەوێبە بەهانەی

ئەوەی کە مانای ئایەتی (کوێرەو چاوساغ دەبن بەیەك؟) لەقورئان پووچەڵ دەکاتەوە لەپێشدا هەردوو چاوی کوێردەکەن و لەدوایشدا بەدەستی سەربازەکانی نیزام پاشای گەنجەوە دەکوژرێت. خەریك بوو کەباسی سێهەم بەسەرهات بکەم و چۆنیەتی خۆ کوێرکردنی وەستا بەهزادو هۆی ئەوەی کە نەیدەویست لە هەرات دووربکەوێتەوە بکەم وبڵێم بۆچی کاتێ کە بەزۆر بردیان بۆ تەورێز وێنەی نەکێشاوهەروەها بڕوای وابوو کە شێوازی هەر وێنەکێشێك ئەو وێنەکێشخانەیەدا تێیدا ئیش دەکات و هەندێك ئەفسانەیتر کەوەستا عوسمان بۆی گێڕا بوومەوە باسبکەم کە عەقڵم چووە لای کابرای بالۆرەبێژ، نەمدەزانی کە چۆن دەزانم ئێستا باسی شەیتان دەکات؟ واهات بەدڵمدا کە بڵێم:" شەیتان یەکەم کەسبوو کەوتی من ! ئەوەی وا شێوازێکی تایبەتی هەیە شەیتانە، هەروەها ئەوەی ڕۆژئاواو ڕۆژهەڵات لەیەك جودا دەکاتەوە هەر خودی شەیتانە!" چاوەکانم گرت و وەکوو چۆن لەدڵمەوە دەهات وێنەی شەیتانم لەسەر لاپەڕە گەورەکەی بالۆرە وێژە کەکێشا. کاتێ کە دەمکێشا، بالۆرەوێژو شاگردەکەیو وێنەکێشانیترو زانخوازەکان پێدەکەنین و دەیانەویست بمورووژێنن وتووڕەم بکەن.

بەگوێرەی ئێوە ئایا من شێوازێکم هەیە، یاخود لەبەر شەرابەکە وادەکەم؟

# ((من، شەیتان )) (47)

حەز لەبیبەری سووروٚكراو لەناو ڕۆنی زەیتووندا دەكەم و بارینی باران لەكاتی بەیانیاندا بەسەر دەریای ماندووم لاخۆشەو دیاربوونی ژنێك لەبەر پەنجەرەیەكی كراوەو بێدەنگی بیركردنەوەو سەبركردنم خۆش ئەوێ. متمانەم بەخۆ هەیەو زۆرجاریش گوێنادەمە ئەو قسانەی واله سەرمن دەكرێت. بەڵام ئەمشەو هاتووم بۆئەوەی لەم قاوەخانەیەدا هەندێك لەبرا وێنەكێش و خۆشنووسەكانم سەبارەت بە هەندێ درۆودەلەسەو ورتەوبۆڵەی

پشتەسەر ئاگادار بکەمەوەو هەڕەشەیان لێبکەم. هەڵبەت دەزانم کەئێوە تەنیا لەبەر ئەوەی کەمن ئەم قسەیە دەکەم بڕوابە پێچەوانەکەی دەکەن. بەڵام ئەوەندە ژیرن کەهەموو کاتێك پێچەوانەی قسەکانی من بەڕاست نازانن و ئەوەندە هەستیاریشن کە گوێ بۆ هەر قسەیەکی من ڕادەگرن. زیاتر لەپەنجاودووجار ناوم لە قورئانی کەریمدا نووسراوە، لەبەرئەوەش ناوی من یەکێك لەوانەیە کە زیاتر بەبیر دەهێنرێنەوە. باشە، بالە کتێبەکەی خوداوە یانی لە قورئانی کەریمەوە دەستپێبکەین. ئەو شتانەی والەوێدا سەبارەت بەمن دەگووترێ هەمووی ڕاست و دروستە. کاتێ کەئەمەش دەڵێم حەز دەکەم بزانرێت کەوا من بێفیزیمکردووە. چونکە کێشەی شێوازیش لەئارادایە. ئەو سووکایەتیکردنەی وا قورئان بەرامبەر من کردوویەتی هەموو کات دڵی ئێشاندووم. ئەم ئازارە شێوەی ژیانی منە. باسی ئەمەتان بۆناکەم.

بەڵێ لەپێش چاوی ئێمەی فریشتەدا خوداوەند مرۆڤی دروستکرد. لەدواییدا داوای لێکردین کە کڕنۆشی بۆبەرین ، بەڵام من نارەزایم دەربڕی و ئەوەم وەبیرهێنایەوە کە مرۆڤ لە قوڕ دروستکراوەو وەکوو دەزانن منیش لە ئاگرەوە دروستکراوم. لەبەرامبەر مرۆڤدا کڕنوشم نەکردو خوداش منی بەلە (خۆبایی) لەقەڵەمداو وتی:" لەبەهەشت دابەزە، گەورەیی نواندن لەوێدا شایستەی تۆ نیە".

وتم:" تاوەکوو قیامەت ورۆژی زیندووبوونەوەی مردووەکان ڕێگام پێبدەباوەکوو بژیم". یارمەتی دام. منیش وتم:" لەم ماوەیەدا تێدەکۆشم بۆئەوەی ڕەگەزی ئەو ئادەمەی وا لەبەرئەوەی سوجدەم بۆنەکردو سزایاندام لە ڕێگای ڕاست بترازێنم و دووریان بکەمەوە".

ئەویش وتی:" ئەوانەی وا تۆ لەرێگاوە دەریان بێنی هەموو دەچنە دۆزەخ". خۆ ئێوەش ئاگادارن کە ئێمە لەبەرامبەر یەکدا ئەم شتانە دەکەین لەوە زیاتر شتێکم پێ نیە کەلە سەر ئەم باسانە بیڵێم. هەندێك کەس دەڵێن لەوکاتاندا لەگەڵ خودای گەورە لەسەر ئەو بابەتە ڕێککەوتبووین. بەپێی ئەم ژیربیرییە من عەبدەکانی خودا تاقیدەکەمەوەو عەقڵیان ڕادەکێشم و لەو بارەیەوە یارمەتی خودا دەدەم:باشەکان بەئەندازەی باشبوون لە ڕێگا نەدەترازان و خراپەکانیش تەسلیمی ویستەکانیان دەبوون وریگای دۆزەخیان دەدۆزییەوە و تووشی گوناح دەبوون، ئەگەر هەر کەسێك بچووبایەتە بەهەشت هیچ کەس نەدەترسا، دونیاش بەئەندازەی باشی پێویستی بەخراپەیی وبە قەدەر دروستکردایش پێویستی بە تاوان هەیە ولەبەر ئەوەی کاروباری دەوڵەت و دونیا پێویستیان بە وانە هەیە کردەوەکانی من گرنگییەکی تایبەتیان هەیە. سەرەڕای ئەوەی کە نەزمی خودایی لەسایەی من و بە یارمەتی خودی خودا دروستکراوە (نازانم بۆ چی تاقیامەت ڕێگای بە ژیانکردن ومانەوەم دابوو؟) بەلام خراپبوونی من و ڕێگاگرتن لە نەدانی هەقی من (سزا) هەموو کات ئامانجێکی شاراوەم بووە. هەندێك کەس دەڵێن :" کەسانی وەکوو مەنسووری حەلاج و ئەحمەدی غەزالی برای ئیمام غەزالی کەتاوەکوو دوایی پێداگرتنی لەسەر ئەو ژیربیرییەی من کرددوە بەیارمەتی و ئیزنی خودا بووە، کەواتە ئەو گوناحانەش وامن تووشیان بووم بە مەیلی خودا بووەو شتانێکن کە خودا خۆی ویستوونی و خراپەو چاکەش هەبووونیان نیە چونکە هەمووی لە خوداوە سەرچاوە دەگرێ وتەنانەت منیش بە شێکم لە خودا". هەندێك لەم بێ عەقڵانەیان بە هەقەوە لەگەڵ کتێبەکانیاندا کوشتووەو

سووتاندووە.چونکە خراپە وچاکە هەیە. کێشانی خەتێك لە نێوان ئەمانەدا کاری هەموومانە. من-حاشا- خودانیم وئەم شتەپڕوپووچانەشم نەکردووە بە مێشکی ئەم بێ عەقڵانەدا. ئەوان بۆ خۆیان بیریان لێکردۆتەوە. ئەمەش واملێدەکات کە بۆ دووهەم جار ناڕەزایی خۆم دەرببڕم :" زۆر کەس هەن بەبێئەوەی من بیانورووژێنم و فریویانبدەم و بیانخەمە دوودڵی و گومانەوە بۆ خۆیان ولەبەر زیادە خوازی و شەهوەت و بێئیرادەیی و ناپیاوی و گەوجبوونی خۆیان تووشی گوناح دەبن بەو ئەندازەیەی وا هەندێك لە (موتەسەویف)(سۆفی)ە خوێنەوارو نووسەرەکان من لە هەموو جۆرە تاوان وخراپەیەك دوورو پاکدەزانن و چەندە ئەمەش بیرێکی هیچ و پووچە هەر ئەوەندەش بیری ئەوانەی وا من بەسەرچاوەی هەموو جۆرە تاوانێك دەزانن هیچ پووچەو دژی هەر ئەوەندەش بیری ئەوانەی وامن بەسەرچاوەی هەموو جۆرە تاوانێك دەزانن هیچ پووچەو دژی قورئانە. من هەر سەوزە فرۆشێکی موشتەری خەڵەتێن کەبە فێڵ و تەڵەکە سێوی گەنیویان پێدەفرۆشی و هەر منالێك و ماستاو چییەك و هەر بیرەمێردێك کە خەون وخەیاڵی بێئەدەبانە دەبینێ‌و هەر کوڕێك کە بەدەستی خۆی یاری بەشتەکەی دەکات فریو نادەم. تەنانەت خوای گەورەش لەو دووانەی دواییدا خراپەیەك بچووك نادۆزێتەوە کە بیرهێنەری من بێت .ڕاستە کەمن بۆ ئەنجامدانی تاوانی گەورەو خراپ تێدەکۆشم بەڵام هەندێك لە مامۆستاکانی بەدەمی کراوە بایەشکدان و پژمەو بابەردانی هەندێك کەس بەکاری من دەزانن وشتی وا سەیرسەیرم لەسەر دەنووسن. ئەمەش خۆی بەمانای ئەوەدێت کە ئەمانە بەهیچ جۆرێك لەمن تێنەگەیشتوون. دەتوانن بڵێن کە با تێئەگەن تۆش دەتوانی بەئاسانی فریویان بدەی . ڕاستە، بەڵام منیش غرورێکم هەیە و تەنیا لەبەرئەوەش

بوو كە لەگەڵ خودای گەورەدا نێوانم دروستبوو و ناكۆكیمان پەرەی سەند. دەتوانم بەهەموو شێوەیەك ڕوخساری خۆم بگۆڕم وبەتایبەت دەتوانم خۆم وەكوو ژنی جوان دەربێنم. سەرەڕای ئەوەی كەئەمانە لەنێو دەیان هەزار كتێبدا نووسراوە،كەچی برا وێنەكێشەكانم هێشتا وێنەی من وەكوو شتێكی شاخدارو بەكلك و بچكۆلانە كە نیشانەی گۆشتی ڕوومەتی داگرتووە دەكێشن، نازانم لەبەرچی وەها دەكەن، ئایا دەتوانن ڕوونكردنەوەیەكی ئەمەم بۆ باسبكەن؟

بەمجۆرە هاتینە سەرباسەكەمان: نەخش. جەماوەرێك كەلەلایەن مەلایەكەوە كەنامەوێ ناوەكەی بڵێم، بۆئەوەی لەدواییدا نیگەرانتان نەكات ورووژێندراون، هەموو كۆڵانەكانی ئەستەنبووڵیان پڕكردۆتەوە. ئەمانە دەڵێن خوێندنەوەی بانگ بە بەزم و ئاهەنگەوە شتێكی حەرامەو كۆبوونەوەی ناو تەكیەكان و لەباوەش یەكتریدا (زیكر) كردن و لەگەڵ ژەندنی مۆسیقادا لە خۆدەرچوون شنێكی ڕەوانیە و حەرامە، هەروەها ئەوشی پێ‌زیاد دەكەن كەئەمانە هەمووی دژی فەرموودەكانی خودان. وام بیستووەكە هەندێك لەم وێنەكێشانەی بەینی خۆشمان بێ لەمەلاوجەماوەرەكەی دەترسن و دەڵێن وێنەكێشان بە پێی نەریتی فەرەنسیەكان كاری شەیتانە. بەسەدان ساڵ درۆو دەلەسەیان بەدەم منەوە هەڵواسی بەڵام هیچكامیان بەقەدەر ئەمەیان لەراستی دوورنەبوو.

بابگەڕێنەوە سەرەتای هەر شتێك.چی؟ئەوكاتەی وا میوەی حەرامم داوە بە حەوا ؟ نا. تەنانەت كاتی بەلەخۆبایی لە قەڵەمدانی من لەلایەن خوداوە ناتوانێ ببێت بەسەرەتا. لەسەرەتای هەموو شتێكەوە ئەوە دێت كە ئەو لەمن و فریشتەكانیتری ویست كە لەبەرامبەر ئادەمدا كڕنۆش بەرین و

فریشتەکانیتر بەبڕیارێکی لەجێی خۆدا کڕنۆشیان بۆبرد.

من کڕنۆش بۆ ئادەم نابەم

لەدوای ئەوەی منی لە ئاگرەوە دروستکرد، ئەوی لەمادەیەکی بێقیمەتتر یانی لە قوڕەوە دروستکرد.

کڕنۆش بەرە بۆ ئادەم!

بەڕای ئێوە ئەم گوتنەی لەجێی خۆیدایە؟ دەست بخەنە سەر ویژدانتان و بێڵێن، ئێوە برای منن؟ باشە،دەزانم، ئێوە وابیر دەکەنەوە کە هەموو شتێك لە نێوانماندا نامێنێتەوەو هەموو شتێکیش دەگاتەوە گوێی ئەو و لەوە دەترسن کەڕۆژێك حیسابتان لێبپرسێتەوە. ئەوکات پرسیاری ئەوەتان لێناکەم کەبۆچی ویژدانی پێداون، لەترساندا هەقتان پێدەدەم و پرسیارەکەم و جیاوازی ئاگرو قوڕ فەرامۆشدەکەم. بەڵام شتێك هەیە کە هیچ کات فەرامۆشی ناکەم و هەمووکات بەشانازییەوە وەبیری دەهێنمەوە:

من کڕنۆش بۆ ئادەم نابەم

کەچی ئێستاکانە وێنەکێشە فەرەنسییەکان خەریکی ئەمەن. ئەمانە وێنەی پاپاکان و بازرگانە دەوڵەمەندەکان و تەنانەت ژنان و ڕەنگی چاوەکانیان و هەستکردنی جەستەیان و خواردنەوەو وێنەی لێوەکانیان و سێبەری جوانی مەمکەکانیان و چرچ و لۆچی تەوێڵەکانیان و گوستیلەکانی دەستەکانیان و تەنانەت مووە سپییەکانی ناو گوێکانیشیان کێشاون. بگرە بەمانەشەوە نەوەستاون وەکوو ئەوەی کە مرۆڤ خوڵقێندراوێکی شایستەی کڕنۆشبردن بێت لەنێو دڵی وێنەکاندا جێگیریان دەکەن وەکوو ئەوەی ئەم وێنانە بپەرەستن بەدیوارەکانەوە هەڵیاندەواسن ئایا مرۆڤ ئەوەندە گیانلەبەرێکی گرنگە کە دەبێت بە هەموو شتێکی تەنانەت بە

سێبەرەکەشیەوەبکێشریت؟ ئایا ئەگەر ماڵەکانی گەڕەکێك وەکوو ئەوەی جاروبار مرۆڤ بەهەڵە دیبینێ بە بچووکی بکێشرێت، ئەمە بەمانای ئەوە نایەت کە لە باتی خودا مرۆڤ دەخرێتە ناو مەرکەزی دونیاوە؟ ئەو خودا گەورەی وا توانای زاڵبوونی بەسەر هەر شتێکدا هەیە خۆی ئەمانە باشدەزانێ. وادەزانم ئەوە دیار بوویێت کە بیر کردنەوە لەسەر ئەوەی وامن (منێك کە کڕنۆشم بۆ مرۆڤ ڕەتکردۆتەوەو لەبەر ئەوە لە پێش چاوی خوداکەوتووم وئازاری تەنیایم چێشتووەو نەفرەتملێکراوە) ئەم بیرەم خستۆتە مێشکیانەوە شتێکی هەڵە و پڕوپووچە. بڕواکردن بەوەی کەمن هەموو کەسێکم تڕاندووە لەوە باشترومەنڤیترەکە هەندێك لەمەولا مامۆستاکان هۆی ئەوەی کوڕان بەشتەکانیان یاریدەکەن دەگێڕنەوە بۆ من .دەمەوێ لەم بارەیەوە دوایین قسە کانی خۆمبکەم بەڵام ڕووی قسەکانم لەو کەسانەنیە کە هەموو کات شتێکیان لەبەر ویستی خۆ نیشاندان و شەهوەت و بەدەستهێنانی پارەو داخوازییە هەڵەچەوپەڵەچەکانیان لیڵو مژاوییە ! تەنیا خودا خۆی بەعەقڵە بێکۆتاییەکەیەوە دەتوانێ لێم تێبگات :

ئەوە خۆت نەبووی فریشتەکانت ناچار کرد کڕنۆشیان بۆ بەرن و فێری لە خۆبایی بونت کردن ؟ ئێستاکانەش ئەو شتانەی وا لە فریشتەکانەوە فێربوون بۆ یەکتری ئەنجامدەدەن و لەبەرامبەر یەکدا کڕنۆشدەبەن و خۆیان دەخەنە ناو دڵ و مەرکەزی دونیاوە. هەموو کەسێك تەنانەت دروستترین عەبدەکانیشت دەیانەوێکە وێنەکانیان بە شێوەی وەستا فەرەنسییەکان بکێشرێت. وەکوو ناو دەستی خۆم دەزانم کە ئەم شەیدا بوونەیان بەرامبەر بە خۆ لەدواییدا دەبێت بە هۆی لەبیر چونەوەی تۆو لەئەنجامی ئەو لەبیر کردنەشدا هەر من تاوانبار دەکرێم . چۆن دەتوانم ئەوەتان بۆ باسبکەم کە

ئەوەندە گویٚ نادەمە ئەمانە ؟ سروشتییەکە بە لەسەر پیٚ مانەوەم لەدوای ئەو هەموو بەردباران و هەڵسوکەوتە بیٚبەزییانە کە سەدان ساڵە بەرامبەرم دەکریٚو دوای ئەو هەموو جنیٚوو لەعنەتەی کە بۆم ناردراوە. ئەگەر ئەو دوژمنە هیچ وپووچە تووڕانەم کە جنیٚوم پیٚدەدەن بیریان لەوە بکردایەتەوەکە خودا خۆی ڕیٚگای پیٚداون تا قیامەت بژیم و بمیٚنمەوە کاری هەمووومان ئاسانتر دەبووە ئەو تەمەنەش کەلەخودا وەریانگرتووە شەست حەفتا ساڵیٚك دەخایٚنیٚو دەرباز دەبیٚ. ئەگەر بڵیٚم ماوەی خواردنەوەی قاوەکەتان دریٚژبکەنەوە لەبەر من پیٚچەوانەکەی ئەنجامدەدەن و تەنانەت لەوانەیە هەندیٚکیشتان خۆ سەرەو خوار بکەن و لەدوا تاتەوە قاوە بخۆنەوە.

مەکەنن. ناوەڕۆکی فیکرەکان گرنگ نین بەڵکو ڕووەکانیان گرنگە. بۆ ویٚنەکیٚشیٚکیش ئەوە گرنگ نیە کەچی کیٚشاوە بەڵکو شیٚوازەکەی بەبایەخە. بەڵام پیٚویستە هیچ یەك لەمانەش دیار نەبن . دەمەویست لەدواییدا باسی بەسەرهاتیٚکی عەشقتان بۆبکەم بەڵام درەنگ بووە . ئەم باڵۆرە ویٚژەی وا ئەمشەو منی خویٚندەوە قەوڵی ئەوەی داوە کە بەیانی نا دوو بەیانی کاتیٚ کە ویٚنەی ژنیٚکی هەڵواسی بەسەر هاتیٚکی عەشق بەدەنگە شیرینەکەی خۆی بگیٚڕیٚتەوە.

له خەودا باوكمم بینی ، هەندێك شتی پێدەگوتم كە لێی تێنەدەگەیشتم ، مەترسیداربوو، لە خەوراپەڕیم : شەوكەت و ئورهان لەدوولامەوە باوەشیان پێداكردبووم ، لەبەر گەرمایی جەستەی ئەوان ئارەقم كردبوو، تەڕببووبووم. شەوكەوت دەستی خستبووە سەرقژم . ئورهان سەرە ئارەقاوییەكەی نابووە سەر سینگم. سەرەڕای ئەوانە لە جێگاكە هەستام و لە ژوورەكە ڕۆیشتمە دەرەوە . لە هەیوانەكەوە تێپەڕیم و بە بێدەنگی دەرگای ژوورەكەی ڕەشەم كردووە . لەبەر ڕۆشنایی مۆمدانەكەی دەستمدا چاوم بەخۆی نەكەوت،بەلاّم لەناوەڕاستی ژووره تاریك و ساردەكەدا چاوم بە جێگایەكی سپی كەوت كە وەكوولاشەیەكی كفن لێپێچراودرێژكرابوو، وەكوو ئەوەوابوو كەرووناكی مۆمدانەكە نەگەیشتبێتە جێگاكەی ڕەشە .

كاتیٚ كەمۆمدانەكەم نزیكترکردووە ڕووناكیە نارنج ڕەنگەكە بەر ڕوومەت وشان وملە ڕووتەكەی ڕەشە كەوت . لێی نزیكبوومەوەوچوومەپەنایەوە، وەكوو ئورهان خۆی بادەدایەوەو وەكوو مێروولەكان ئەملاو ئەولای دەكرد و ڕوخساری لەهی كچێكی نووستوو دەچوو . لەبەر خۆمەوە وتم : (ئەمە شووی منە). ئەوەندە لێم دوربوو كە لەبەرامبەریدا هەستم بە بێگانەیی دەكردو پەشیمان بووم لەوەی وامكردوومە، ئەگەر خەنجەرێكم پێبایە یەكسەر دەمكوشت. ئەمەلەبەرئەوە نیە كەبەراستی دەمەویٚ بیكوژم، بەڵكوو تەنیا لەبەر ئەوەیە والەمنداڵیدا وەكوو چۆن هەمووتان بیردەكەنەوە، بیرم لەوە دەكردەوە كەئەگەر بیكوژم چیدەبیٚ ؟ متمانەم بەو پاكبوونە مندالاّنەیەی وا لە ڕوومەتیدا دیاربوونەبوو و بڕواشم بەوە نەدەهات كەسالاّنێكی ژیانی بەبیركردنەوە لەسەر من بردۆتە سەر . لایەكی پیٚ

ڕووتەکەم لە شانیداو لەخەو هەڵمساند. کە چاوی بەمن کەوت وەکوو ئەوەی وا دەمویستلە باتی حەیران مانەوەو پەشۆکان بۆ ساتێکیش بێت ترسا . بەرلەوەی کە باش وشیاربێتەوە پرسیارم لێکرد وتم : (لە خەودا باوکم بینی، شتێکی زۆر مەترسیداری پێدەگوتم : تۆ ئەوت کوشتووە ...)

-:" کاتیٚ باوکت کوژرا من و تۆ پێکەوە نەبوین ؟"

- :" منیش ئەمە دەزانم، بەلاَم تۆ لەوە ئاگاداربووی کە باوکم بەتەنیا لە ماڵ دەمێنێتەوە . "

-:" نەمدەزانی، تۆ خەیرییەو منداڵەکانت ناردووە، یەك خەیرییە دەیزانی و لەوانەیە ئەستەریش ئاگادار بووبێت، تۆ باشتردەزانی کە کیٚ ئاگادار بووە "

-:جاری واهەیە وا دەزانم کە دەنگێك لە دەروونمە دەردیٚ و نهێنی ئەم نەهامەتیانەم بۆ ئاشکرا دەکاو ئەوەم پێدەڵیٚ کە بۆچی هەموو شتێك بەرەوخراپی دەچیٚ بەلاَم کاتیٚ دەمم دەکەمەوە وەکوو ئەوەی ناو خەوەکە دەنگی لێوە نایەت. تۆش ئیدی ئەو ڕەشە پاك و باشەی کاتی منداڵی نیت و گۆڕاوی ".

-:"تۆش و باوکیشت ئەو ڕەشە پاك و سافەتان وەدەرنا ".

-:"ئەگەر لەبەر تۆڵە سەندنەوە لە باوکم لەگەڵ مندا زەماوەندت کرد تۆڵەکەی خۆتت وەرگرت . لەوانەیە هەرلەبەر ئەوەش بیٚ کە منداڵەکان حەزت لێناکەن".

بە خەمێکەوە وتی : "دەزانم . ئێوارە بەرلەخەوتن بەشێوەیەك کەگوێم لێبیٚ دەیانگوت : (ڕەشە! ڕەشە! دواوەمان بریندارە ". لە پێشدا لە دڵمەوە وتم: "لێت دا بایەن " ، لەدویدا بە پەشۆکاویوە وتم : "ئەگەر دەستیان

لێهەڵبڕی دەتکوژم "

وتی : "وەرە ناو ئەم جێگایە ڕەق دەبەیتەوە ".

-:"لەوانەیە هیچ کاتێك نەیەمە ناو ئەوجێگایە، لەوانەیە هەڵەمان کردبێت کەپێکەوە زەماوەندمان کرد، دەڵێن کە ئەو مارە بڕینە دروستنەبووە ، ئەمشەوبەرلەوەی بخەوم گوێم لە دەنگی پێی حەسەن بوو، لەبیرنەکەی کەکاتێك لەگەڵ مێردەخوالێخۆشبووەکەمدا دەمامەوە، ماوەیەکی درێژ گوێم لەدەنگی پێی حەسەن دەبوو . منداڵەکان حەزی لێدەکەن . بێبەزەیشە . شمشێرێکی سووری هەیە، خۆتی لێبپارێزە " کە لە نیگاکانی ڕەشەدا ماندووبوونێکی پڕ لە تووڕەییم بینی زانیم کە ناتوانم بیترسێنم .

وتم : " تۆ هەم خۆشحاڵ و بە هیوای ، هەم خەفەتبار و بە ئازاری ، من لەبەر ئەوەی وا ناڕەحەت نەبم و منداڵەکانم بپارێزم، ئاوەها کەللەڕەقی و پێداگریدەکەم تۆش تەنیا لەبەر ئەوەی کە خۆت بسەلمێنی وا دەکەی نەك لەبەر ئەوەی وا منت خۆشدەوێ " باسی ئەوەی بۆکردم کەچەندە منی خۆشدەوێ ولەکاروانسەرا چۆڵەکاندا و چیا ڕووتەکان و شەوە بەفراوییەکاندا بیری لە من کردۆتەوە . ئەگەر باسی ئەوانەی نەکردبایە، منداڵەکانم لەخەو هەڵدەستاندو دەڕۆیشتمەوە بۆماڵی مێردەکەی جارانم . لە ناکاو لەدڵمەوە وەهام گوت : "هەندێك جار وا دەزانم لەوانەیە هەرسات مێردەکەم بگەڕێتەوە، لەوە ناترسم کە نیوەشەوان لەکاتی مانەوەمان لەم ژوورەدا منداڵەکان پێمان بزانن بەڵکو لەوە دەترسام کە هێشتا باوەشمان بەیەکدا نەکردبێ و مێردەکەم لە دەرگاکە بدات " دەنگە دەنگی چەند پشیلەیەك لەدەرەوە لە پاڵ دەرگای حەوشەکەوە دەهات کەپێکەوە تامردن شەڕیان دەکرد. لەدواییدا ماوەیەکی درێژ بێدەنگی دروستبوو.

بۆساتێك وامزانی نزگەرە لێدەدەم، نە ئەوە بوو مۆمدانەکە دانێمە سەر مێزەکە نەئەوەش بوو بگەرێمەوە بۆ ژوورەکە بۆ لای منداڵەکانم لەبەر خۆمەوە وتم : تائەوکاتەی تەواودڵنیادەبم کە دەستی لەکوشتنی باوکمدا نەبووە ئەم ژوورە بەجێناهێڵم. بەرەشەم گوت : "ئێمە بچووك دەبینی" لە دوای ئەوەی لەگەڵ مندا زەماوەندت کردووە گەورە بووی . خۆی لە خۆیدا لەبەر ئەوەی وا مێردەکەم نەگەڕابووەوە بەزیت پێماندا دەهاتەوە ، ئێستاش کە باوکم مردووە دیسان بەزییت پێماندا دێتەوە "  بەوردییەوە وتی : "شەکورە خان !... ) . پێم خۆشبوو کەقسەکەی بەوە دەستیپێکردبوو . . " ... خۆدەتزانی کە ئەمانە ڕاست نین و منیش ئامادەم کە هەموو شتێکت بۆ بکەم " . وتی : "ناتوانم " و بەشەرمەوە ئاماژەیەکی بەلێفەکەو جلەکەی شەوی کرد .. هەقیبوو ، بەڵام دیسان لەبەر ئەوەی وا گوێی بۆ قسەکەم ڕانەگرتبوو تووڕەبووم .

وتم : "بەرلەوەی باوکم بکوژرێ وەکووئەوەی شیر ڕژرابێ هاتووچۆی ئەم ماڵەت دەکرد ئیستاکانەش کەبەمن دەڵێی (شەکوورە خان) وا دیارە کە خۆت بڕوات پێی نیە و دەتەوێ ئێمەش لەوە ئاگادار بکەیتەوە . "

لەرزدایگرتبووم، ئەمەش لەبەر توڕەیی نەبوو بەڵکوولەبەر ئەو سەرمایەی بوو وا ڕان و پشت وملمی وەکوو سەهۆڵ لێکردبوو .

وتی : "وەرە ناو جێگاکەم و ببە بەژنم ."

وتم : "ئەی ئەو ناپیاوەی وا باوکمی کوشتووە چۆن دەدۆزرێتەوە ؟ ئەگەر زۆر درەنگ بخایەنێت دروست نابێت کە پێکەوە لەم ماڵەدا بمێنینەوە"

-:"له سایەی تۆو ئەستەرەوە وەستا عوسمان سەرنجی داوەتە سەر ئەسپەکان"

-:"وەستا عوسمان دوژمنی گیانی بەگیانی باوکە خوالیّخوشبووەکەم بووە، ئیّستا لەسەرەوە چاوی بەوە دەکەویّ کە بۆ دۆزینەوەی بکوژەکەی پیّویّستی بەو هەیەو ئازار دەکیّشیّ " لە ناکاو هەستایە سەرپیّ و خۆی دابەسەرمدا، جووڵەم نەکرد. بەڵام بەپیّچەوانەی ئەوەی وابیرم دەکردەوە بەدەست مۆمەکەی کوژاندەوە و ڕاوەستا . هەموو جیّگایەك تاریك بوو .

بە هیّواشی وتی : "ئیدی باوکت چاوی پیّمان ناکەویّ" تەنیا ماوینەتەوە، ئیّستا پیّم بڵیّ شەکورە : کاتیّ کەلە دوای دوانزە ساڵ گەڕامەوە بۆ ئیّرە وەهات نیشاندا کە دەتوانی حەزم لیّبکەی و لە دڵتدا جیّگایەکم بۆ بکەیتەوە، لە دواییدا پیّکەوە زەماوەندمان کرد، بەڵام لەوکاتەوە تا وەکوو ئیّستا لەوەی وا حەزم لیّبکەی خۆت دەشاریتەوە ."

بە چپەوە گوتم : "لەبەرناچاری لەگەڵ تۆدا زەماوەندم کرد ."

هەستم بەوە دەکرد کە وشەکانم وەکوو ئەوەی وا (فزولی) دەیڵیّ : " هەریەکە وەکوو بزماریّك " دەچەقانە سینگی وا لەبەرامبەرمدا ڕاوەستابوو . جاریّکیتریش هەربەچپەوە گوتم : "ئەگەر تۆم خۆشبویستایە هەر لە مندالیمەوە خۆشم دەویستی "

وتی : "پیّم بڵیّ ئەی جوانی ناو تاریکایی بەدزیوە تەماشای هەموو ئەو ویّنەکیّشانەت کردووە واهاتوو چۆی ماڵی ئیّوەیان کردووە بەڕای تۆ کامەیان پیاوکوژە ؟" دڵخۆش مانەوەیەکم لا پیّ خۆشبوو . میّردم بوو .( سەرمامە ) .

نازانم ئەمەم گوتبوو، وە بیرم نایەتەوە . دەستمانکرد بە ماچکردنی یەك . هێشتا مۆمدانەکەم بەدەستەوە گرتبوو، باوەشم پێداکرد وزمانەکەیم خستەناودەمم ! فرمێسکەکانم، پرچەکانم، جلی شەو، لەرزەلەرزەکەم تەنانەت زگەکەی ئەویش جوانبون . لەو سەرمایەدا لووتە ساردەکەم دەبردە لای دەمی وگەرمم دەکردەوە، ئەوەشم پێ جوانبوو، بەڵام شەکورەی ترسنۆك خۆی ڕاگرت و لەکاتی ماچکردندا خۆی فەرامۆشنەکردو بیری لە مۆمدانەکەی دەستی و باوکەکەی وا سەیری دەکردو مێردەکەی جارانی و منداڵەکانی وا لە ناوجێگاکەدا خەوتبوون دەکردەوە .

قیڕاندم و وتم : "یەکێك لەمماڵەدایە" پاڵم نابە ڕەشەوەو ڕۆیشتمە ناو هەیوانەکەوە .

# ( ناوی من ڕەشەیە ) (49)

له تاریکایی بەیانیدا وەکوو تاوانبارێکی میوان، بەبێدەنگی و بەبێئەوەی کە کەس چاوی پێمبکەویٚ و خۆم نیشانی کەس بدەم لە ماڵەوە دەرکەوتم و ماوەیەکی درێژ لەکۆڵانە قوڕاوییەکاندا ڕێمکرد. لەحەوشەی بەیازتیدا دەستنوێژم گرت و ڕۆیشتمە ناو مزگەوتەکەوە نوێژم کرد . کاتێك لەناوەوە بە هونەرێکەوە کەچل ساڵ جارێك مرۆڤ پێی دەگات نوێژم دەکرد، لە پیرەمێردێك کە دەیەویست بخەوێتەوەو مەلای مزگەوتەکە زیاتر کەسی تری لێنەبوو . ها ! هەندێك جار هەیە کەلە نێو خەیاڵەخەواوییەکاندا و بیرەوەرییە بیٚ هیواکانماندا وا دەزانین کە خودا ئاوڕمان لێدەداتەوەو وەکو هیوای کەسێك کەوا بەدڵی خۆی داخوازنامەیەك دەداتە دەستی پادشاوە، لێی دەپاڕێینەوەو داوای هەندێك شتی لێدەکەین : منیش بۆ ئەوەی کە ماڵێکی پڕ لە خۆشەویستیتان و دڵخۆشیم پێبدات، لە خودای خۆم پاڕامەوە.

کاتێ گەیشتمە لای ماڵەکەی، وا هەستمکردکە وردە وردە وەستا عوسمان جێگای زاوا ئەفەنی لە مێشکمدا گرتۆتەوە . زۆر کەللە ڕەقتربوو ، دورتریش بوو لە من بەلاّم بڕوای بە نەخشاندنی کتێب قوڵتر و بەهێزتربوو . هەربەو نێوانەی وا لە بەینی چاو هاوێنەکەدا گرتبووی وەکوو هەڵۆیەك کەلە سەرەوە بەوردی تەماشای زەوی بکات، سەیری لاپەرەکانی دەکردو هاوێنەکەی بەسەرسێ ڕەسمە دەرئاساییەکەدا دەهێنا. وەکوو هەڵۆیەك کە ئاسکێکی بۆ نێچیرکردن دیتبێ بۆ ساتێك لەسەر لمۆزی ئەسپەکان هێواش بوویەوە، بەلاّم خۆی تێکنەدا. لە دواییدا خوێنساردییەوە وتی : نیە . بوستانچی باشی وتی : چی نیە ؟ منیش وامدەزانی کە وەستای گەورە بەباشی خۆی خەریکی کارەکە دەکات و لە یاڵەکانەوە تا وەکوو سمەکانیان هەمووی سەیردەکات و لێیاندەکۆڵێتەوە . وەستا عوسمان وتی : "وێنە کێشە مەلعونەکە هیچ شوێنە دەستێکی بەجێ نەهێشتووە، لەم وێنانەوەدیارنابێت کەکێ وێنەی ئەوئەسپەی کێشاوە"هاوێنەکەی ئەوم هەڵگرت و تەماشای لمۆزی ئەسپەکانم کرد، وەستاکەم ڕاستی دەگوت . ئەو لمۆزە سەیرەی وا لە ئەسپی کتێبەکەی زاواکەم دا هەبوو لەم سێ ئەسپەدا نەبوو . هەر لەم کاتانەدا بیرم چووە سەر ئەو ئامرازە تازەیەی وا نەمدەزانی ئەشکەنجە گەران چۆن بەکاری دەهێنن . لەبەینی دەرگاکراوەکەدا دەمویست بیانبینم، لەناکاویەکێکیان وەکوو ئەوەی کە جندۆکە دەستی لێوەشاندبێ بەرەودواوە . وەستای گەورە لەوە زیاتر لەیەکێك بچێ کە سالاّنێك بای ترس و سەرسوڕماویی لە نێوان وێنەکێشاندا هەڵکردبێ لە دەروێشێکی پیر دەچووکە لە حاڵی خۆدایە . ئەوبە پشتە چەماوەکەیەوەو بەسواری ئەسپەکەوە منیش بەتۆزێك چەماوی پشتمەوە لە تەنیشت ئەسپەکەیەوە ،

لەلای ماڵی ئەو بەرەو كۆشكێك بەرێكەوتین ، پێویست بوو كەلەوێنەی ئەو دەروێش و موریدەبە ویستە بچین وا لە وێنە هەرزانەكانی گەرەكە كۆنەكاندا هەیە . (بۆستانچی باشی، وپیاوەكانی لە ئێمە بەویستتربوون . لەبەرئەوەی وا بڕوایان بەوە هەبووكەبەیانی پادشاكەمان دەیەوێت كە ئێمە تەماشای وێنەی ئەسپەكانی هەرسێ (وەستا) بكەین و یەكسەر پیاوكوژە مەلعونە بدۆزینەوە، هەرلە خۆیانەوەو بەبێ پرسیار فەرمانی ئەشكەنجەدانیان دابوو، بەمجۆرە بردینیانە ماڵە كۆنەیەك لە جێگا شاراوەكەی ئەشكەنجەوئیعدامكردن لە باخچەی تایبەتدا و نەیانبردینە لای كانییەكەی جەللاد بۆ ئەوەی كە هەر كەس بیبینێ و پەند وەربگرێ .

كوڕێكی گەنج و نازك كەدیاربوو پیاوی (پۆستانچی باشی) نیە، بەلە خۆمتمانەییەكەوە سێ لاپەڕەی دانایە سەر مێزەكە . كاتێ كە وەستا عوسمان هاوێنەكەی دەرهێنا دڵم فرتە فرتی لێوە دەهات .

هەڕای كردو خۆی خستە پشتی دارتوویەك . هەرلەو كاتەدا حەزرەتی پاشا،(بنەمای هەموو دونیا) وەكوو ڕووناكییەككە بەیانییە لێڵەكە ڕوونبكاتەوە هاتە ناوەوە . وەستا عوسمان یەكسەر پێیگوت كەلەم وێنانەدا ناتوانێ هیچ شتێك دەربخات . سەرەڕای ئەمەش سەرنجی پاشای ڕاكێشایە سەرپێ بەرزكردنەوەو هەستانەوەی یەكێك لەم ئەسپانەونازكبونیراوەستانە جوانەكەی ئەویتر گرانایی و سەلاری سێهەم دانەیان . هەر لەو كاتەشدا ئەوەشی هێنایە سەر زمان كە كام وێنەكێش كام یەك لەم وێنانەیان كێشاوە، ئەو كورانەی وا شەوان دەچونە بەردەرگای ماڵی وێنەكێشان بۆچونەكانی وەستا عوسمانیان پشتڕاستكردەوە . وەستا عوسمان وتی : "گەورەم! سەرتان لەوە سورنەمێنێ كە وێنەكێشەكانی خۆم وەكوو كەفی

**دەستم بناسم، چونكە من لەوە سەرم سوردەمێنیٚ كە چۆن دەبیٚ لە ژێر دەستی ئەو وێنەكێشانەی واباش دەیانناسم هەڵەیەك دەربچیٚ كەمن نەیزانم، چونكە هەڵەی هیچ وەستایەك بیٚ بونیات نییە" پاشاكەمان وتی :" یانی ؟" "پاشای گەورەو (بناخەی دونیا)، بەبڕوای من ئەو كەموكوڕییە وئەوئیمزا شاراوەی والە لمۆزی ئەسپەكەدا بینیومانەشتێكی سادە نیە، بەڵكو ڕیشەكەی دەگەڕێتەوە بۆ زەمانی كۆن، بۆ وێنەی تر ڕێچكەوشێوازێتروو لەوانەیە بگەڕێتەوە بۆ ئەسپیتریش. لەوانەیە بەتەماشاكردنی ئەو سەدان كتێبە كۆنەی وا لە سندوقەكاندا و لەدۆلاٚبەكاندا دەرگاتان لەسەر داخستووە بتوانین لەوە ئاگادار بینەوە كەئەمە نەریتێكی كۆنەو بەوەش قەڵەمی یەكێك لەو سیٚ وێنەكێشە بدۆزینەوە" سوڵتان بەسەرسوڕماوییەوە وتی:یانی دەتەویٚ بچیتە خەزێنە خانەكە؟"**

**وەستاكەم وتی: "بەڵیٚ" ئەم داخوازییە بەقەدەر ئەوەی داوای چوونە ناو حەرەم بكردرێت بێشەرمانەبو . هەرلەوكاتەشدا ئەمە تێگەیشتم كە دەرگای بینای حەرەم وخەزێنە لەگۆشەیەكی جوانی بەهەشتی كۆشكەكەی پاشا (ئەندەروون)ەوەیە كە ڕۆحی پاشاكەمان بەرامبەر بەوانەزۆرهەستیارە . ئیدی بەلێبوردەییەوە تەماشای ڕوومەتە جوانەكەی پاشام دەكرد و دەمویست كەبزانم چیدەبیٚ، لە ناكاو ڕۆیشتن. داخۆ نارەحەت بۆوبێتن ؟ داخۆ دەبیٚ كەلەبەر ڕووداری وەستاكەمان منیش و هەموو وێنەكێشانیش سزا بدرێن ؟**

**كاتیٚ كە تەماشای ڕەسمی سیٚ ئەسپەكەم كردەوە تێگەیشتم كە تا وەكوو جارێكیترشەكورە نەبینمەوەو بەیەكەوە لە یەك جێگادا نەخەوین ناكوژرێم . سەرەڕای هەموو جوانییەكی ئەم وێنانە وامدەزانی كە ئەمانە**

لەدونیایەکی ترەوە دەرکەوتوون و هاتوون وەکوو چۆن لە مندالّیەوە بتبەن بۆ ناودلّی کۆشك (ئەندەروون) و لەوێدا گەورەببی فێری ئەوەببی کەچۆن خزمەتی پاشا بکەی ببی بە پیاوی ئەمەش بەمانای مردن لەورێگایەدا دێت، بوون بەوێنەکێشیش بەمانای کۆیلەبوون بەبەرامبەربەجوانیەکانی خوداومردن لەبەرئەوانە دێت، بێدەنگیەکی ترسێنەربوو، لەوبێدەنگییەدا ئەمانەم دەئاخنیە ناو مێشکم . زۆرتردواترکاتیٚ کەپیاوەکانی خەزێنەدار ئێمەیان بەرەوژوور بەرەو دەرگای ناوەراست بردئەم مەرگی بێدەنگم لەبیردا بوو .

لەو (باب السلام)ەی وا بەدەیان پاشا لەوێدا بەسێدارە کوژرابوون تێپەڕبووین ،دەتگوت دەرگاوانەکان ئێمەیان نەبینیوە . مەیدانی ئەو دیوانەی وادوێنیٚ تەماشام دەکردو وامدەزانیکە خودی بەهەشتە و بورجەکەو پەلەوەری تاوس هیچ کاریگەریان لێنەدەکردم . کە زیاتر ڕۆیشتینە ناوە تێگەیشتم دەمانبەنە ناو دلّی دونیا شاراوەکەی پاشا(ئەندەروون) . بەمجۆرە لەو دەرگایانەوە تێپەڕبوین کە تەنانەت وەزیری گەورەش نەیدەتوانی بیٚ ئیجازە لەوێوە تێپەڕ بێت . وەکوو مندالّێك کە چوبێتە ناو چیرۆکێکەوە، بۆ ئەوەی کە ڕووبەڕووی گیانلەبەرە دەرئاساییەکان نەبمەوە، چاوم لەسەر زەوی هەلّنەدەبڕی . تەنانەت تەماشای ژووری داخوازیشم نەدەکرد. بەلاّم بۆ ساتێك چاوم خزاو دیوارەکانی حەرەم و درەختی چنارێکی ئاسایی کە هیچ فەرقێکی لەگەلّ درەختەکانیتردا نەبوو، بینی و سەیری کابرایەکی بالاّ بەرزم کرد کە عەبایەکی شینی ئەتلّەسی بریقەداری لەبەر کردبوو . لە نێوان ستونە بەرزەکانەوە تێپەڕبووین . لەبەر دەرگایەکی گەورەو شکۆدارتر لەوانیتردا

ڕاوەستاین . لەبەردەرگاکەدا چەند ئاغایەکی عەبالەبەری لێبووکەیەکێکیان خۆی کلیلەکە چەماندبووەوە . خەزێنەدار تەماشای نێوچاوانمانی کردو وەهای گوت : "خۆزگە بەئێوە کەپاشا مۆڵەتی پێداون کە بتانبەمە ناو خەزێنەخانەی ئەندەروون . تەماشای ئەو کتێبانە دەکەن واکەس نەیبینیون و سەیری لاپەڕە زێڕاوییەکان و وێنە نائاساییەکان دەکەن وەکوو نێچیروانێك بەدوای شوێنە دەستدا دەگەڕێن . پادشام سێ ڕۆژمۆڵەتی داوە بە وەستا عوسمان ، لەم سێ ڕۆژە یەکێکیان بەسەرهاتووە ، پێویستە لەم دوو ڕۆژەدا وەستا بتوانێ ئەو وێنەکێشە مەلعوونە دەربخات و دیاری بکات هەروەها ئەگەر وەڵامی (نا) مان پێڕابگەیەنێت ئەوا (بۆستانچی باشی) ویستی کە ئەوەش بە بیرتان بهێنمەوە کە بەئەشکەنجە ئەم کێشەیە چارەسەر دەکات . "

لە پێشدا زەرفی کلیلە هەڵواسراوەکەی مۆرەکەیان کردەوە کە بۆ پاراستنی کۆنی کلیلەکەلە کلیلی تر جێگیر کرابوو کوێخای خەزێنەکەو دوولە ئاغاکان چاویان بەمۆرەکە کەوت و سەرێکیان لەقاند . مۆرەکەیان دڕاند، لە دواییدا کە کلیلەکەیان خستەناو کونەکە، سەرنجی هەموومان چووە سەری، پاشان لە بێدەنگییەکدا کرتەیەکی لێوەهات وکرایەوە بۆ ساتێك ڕەنگی ڕوومەتی وەستا عوسمان وەکوو هی خۆڵەمێشی لێهات . کاتێك کە دەرگا تەختەییە نەخشێنراوەکە کرایەوە وەکوو ئەوەی ڕوناکییەکی ڕەشی پاشماوەی زەمانە کۆنەکان لەم ڕوومەتەی دابێ، ئاوای لێهات .

خەزێنەدار وتی : "پاشاکەم لەخۆیەوە داوای ئەم ئاغایانەی نەکردووە بۆئەوەی بزانن ئێرە چی تێدایە و هەمووی بنوسن پارێزەری کتێبەکان

مردووه، کەسێك نەماوە کەلە جێگای ئەودا تەماشای ئەم کتێبانە بکات، هەرلەبەر ئەمەش پاشام ویستویەتی کەلەگەڵ ئێوەدا تەنیا جەزمی ئاغا بێتە ناوەوە" تەمەنی دەوروبەری حەفتاساڵ دەبوو، چاوەکانی بریقەی دەدایەوەو پیاوێکی کورتە باڵابوو، سەرپۆشە سەیرەکەی سەری کەلە خۆی سەیرتربوو، لە بادبان دەچوو . "جەزمی ئاغا ناوەوەی وەکوو ماڵی خۆی دیارکردووە، لە هەموو باشتر دەزانێ کە جێگای هەرشتێك لە کوێدایە "پیرە کورتە باڵاکە شانازی بەخۆوە نەکرد . تەماشای کوڕە تازەکارەکانی خەزێنەخانەکەی دەکردو واخەریکی بردنی مەقەڵێکی زیوی پێدراو جێگایەکی دانیشتنی دەسك سەدەفین و چرا مۆمدانەکان بوون دەکرد .

خەزێنەدار وتی بەمۆرە حەفتا ساڵەکەی سوڵتان یاوز سەلیم دەرگاکەتان لەسەر دادەخەینەوە وئێوارەلە نێوجەنجاڵی ئەم ئاغایانەدا دیسان مۆرەکە دەدڕینەوەو دەرگاکە دەکەینەوە، ئاگاداربن باوەکوو شتێك بەهەڵە نەچێتە ناوجل وسەرومل وگیرفان و پشتوێنەکانتان چونکەلەکاتی دەرکەوتنندا تەنانەت شۆرتەکانیشتان دەگەڕێیین .لە نێوان ئەوئاغایانەی‌وا چۆکیان دادابوو ڕۆیشتینە ناوەوە . وەکوو سەهۆڵ وابوو . کەدەرگاکە داخرا هەمووجێگایەك تاریکبوو، تا وەکو قوڕگم هەستم بەبۆنی تەپ و تۆزکرد . هەموو جێگایەك تێسپیێردرابوو،کەلوپەلەکان و سندوقەکان وکلاّوەئاسنینەکان و هەموو شتێك لە ناو یەکدابوون ، زۆر جەنجاڵ بوو، هەستی بینینی شەڕێکی گەورەی لە دەروونمدا وروژاندەوە .

چاوم بەو تیشکە سەیرە ڕاهات کەوا لەکونی پەنجەرەکەی سەرەوەو لەسەر ئەو پەیژەیەی وابە دیوارە بەرزەکانەوە هەڵپسێردرابوو تاقاتی هەڵواسراوەکان دەرۆیشت ، دەهات و بەر هەموو جێگەیەکی دەکەوت .

ڕەنگی ئەم ژوورە لە بەر ڕەنگی قوماشە مەخمەڵەکانی سەر دیوارو ماڵی و گلێمەکان سووربووبوو . لە نێو پەژارەیەکدا هەستم بەوەکرد کە بۆ وەدەستهێنانی ئەم دەوڵەمەندییانە چەند سەفەر کراوەو چەندین شەڕدروستکراوەو چەندین شار تالآنکراوەوچەندە خوێنرژاوە، وکۆتاییەکەیان بووە خەزێنەخانەیەك . پیرەمێردە کورتەبالآکە وەکوو ئەوەی کە بانگی هەستەکەی دەروونمیکردبێ وتی : "ترسان ؟ ئەوەی بۆ یەکەم جار بێتە ئێرە دەترسێ، شەوان بەچپە چپەوە لەگەڵ ڕۆحی ئەم کەلوپەلانەدا قسەدەکات" . شتی مەترسیدار بێدەنگی نێژراوی نێوان فرەییە بڕوا پێنەکراوەکەی ئەم کەلوپەلانەیە . جیڕە جیڕی مۆرەکەمان دەبیست وا لە دەرگاکەی پشتەسەرمانیان دەداو بەبێ ئەوەی کە جووڵە جوڵێك بکەین سەیری دەوروبەری خۆمان دەکرد . چاوم بە شمشێر و شفرە و عەباو مۆمدانەزیوەکان و ئالآی ئەتڵەسی کەوت . ژمارەیەکی زۆر قوتوی سەدەفین و سندوقی ئاسنین و گوڵدانی چینی و پشتوێن و سازوزرێ و سەرینی ئاورێشمین و ئەو بێلآنەی وا دونیانیشاندەدەن و چەکمەو پێست و شفرەی کەرگەدەن و هێلکەی نەخشکراوی وشتر ومرخ و چەك وکەوان ودەسك و دۆلآب و دۆلآبم بینی . هەموو جێگایەك پڕبوو لە قوماش و قاڵی و ئەتڵەس و ئەمانە لە قاتە بەرزەکانی بەدار نەخشێنراوەو لە ژوورە بچکۆلانەکەوە بەسەر دیوارەکاندا شۆڕکرابوونەوە وەکوو ئەوەی وابوو کە بە سەر مندا دەڕژێن . تیشکێکی سەیر کەنمونەکەیم لە هیچ جێگایەکی تردا نەبینیوە لە قووماش و قوتو وعەباکانی پادشاو زینە بەزێڕ نەخشێندراوەکان و سیمە زەردەکان و سەرینە مرواریدارەکان و شمشێرە تیغ چەماوە دەسك ئەڵماسییەکان و دەسکە یاقووتییەکان و کاتژمێرە سەیرەکان و ئەو

ئەسپانەو ئەو فیلانەی وا لە شفرەی فیلەوە دروست کرابوون چەکمەجە سەدەفییەکان و قلیانە ئاوییە سەرئەڵماسییەکان و سینیەگەورەکان وکلاوە ئاسنینە بەفیروزە ویاقوت نەخشێنراوەکان ومەسینەکان وخەنجەرەکان دەکەوت . ئەم تیشکەی وا بەشێوەیەکی دیارونادیارخۆی دەدزییەناوەوە وەکوتیشکی هەتاو لە ڕۆژێکی هاویندا کەلە گومەزی مزگەوتێکەوە دێتەناو، دانەدانەی تۆزەکانی ناو ئەم ژووره نیوە تاریکە دیار دەکات بەڵام ئەمە تیشکی هەتاو نەبوو . لە سایەی ئەم تیشکە سەیرەوە لێرەدا هەوا وەکوو شتێکی لێهاتبوو کە بە دەست هەستیپێبکرێت و هەرلەبەر ئەم تیشکەش وادیاردەبوو هەمووئەم کەلوپەلانە لەیەك شت دروستکراون، لە دوای ئەوەی وا ماوەیەك پێکەوە بەترسەوە گوێمان لە بێدەنگییەکەی ژوورەکەبوو زانیم کەئەوەی وا ڕەنگ سورە زاڵەکەی ناوژورەکەی کاڵ کردۆتەوەو یەك چینیشی داوە بەسەر هەموو کەلوپەلەکاندا تۆزی ناو ماڵەکەیە . ئەوشتەی وادەبوو بەهۆی ئەوەی کە ئەم شتانە زیاتر ترسێنەربن ، فرەبوونی ئەم کەلوپەلە سەیرو سەمەرانەی بوون وا لە یەکەم نیگاو دووهەم نیگاشدا نەتدەزانی چییە . ئەوشتەی وا وامدەزانی سندوقەلە دواییدا وامدەزانی مێزە ودواتریش دەمگوت کەئەمەئامرازێکی‌نەناسراوی فەرەنسییە . ئەو سندوقە سەدەفینەی وا لە نێوان عەباکاندا کەبە پەلە پەل فڕێدرابوونە ئەوی لە ڕاستیدا چەکمەجەیەکی سەیربووکە ( تەزاری ) ڕوس (مۆسکۆ) ناردبووی . جەزمی ئاغا بەپێی عادەت مەنقەڵەکەی لە ئوجاخەکەی لای دیوارەکەدا جێگیرکرد . وەستا عوسمان بەچپەوە وتی : "کتێبەکان لە کوێن؟ "

**کابرای کورتە بالاَ وتی : "کام کتێب ؟ ئەوانەی وا لە عەرەبستانەوە هاتوون یان قورئانەکانی کوفی، یا خود ئەوانەی وا یاوز سوڵتان سەلیم خان ( جێگای بەبەهەشت بێ ) لەتەورێزەوە هێناونی ، یان کتێبەکانی ئەو پاشایانەی وا لەبەرئیعدامکردن دەست دانراوە بە سەر ماڵەکانیاندا ، یان وەکوو ئەو بەرگانەی وا نێردراوەکانی (وەنیز) داویانە بە باپیرانی پاشاکەمان ، یاخودئەوکتێبە خاچپەرستیانەی وا لەکاتی (فاتیح سوڵتان موحەمەد) ەوە ماونەتەوە ؟ "**

**وەستا عوسمان وتی : "ئەوکتێبانەی وا سی ساڵ بەر لە ئێستا شاتاماسووب بە هەدیە ناردوویەتی بۆحەزرەتی سوڵتان سەلیم ( جێگای بە بەهەشت بێ ) "**

**کورتە بالاَ ئێمەی برد بۆ لای دۆلاَبێکی گەورەی دارین . وەستا عوسمان کاتێ کەدەرگاکانی کردەوەوچاوی بەو کتێبانە کەوت بێ سەبربوو . بەرگێکی کردەوە نووسراوەکەی خوێندەوە ، لاَپەڕەکانی هەڵدایەوە . لەگەڵ ئەوەدا منیش بە سەر سووڕماوییەوە تەماشای وێنەکانی خان کردکەوا هەریەکەیان بە وردی و سەرنجێکی تایبەتەوە و بە چاوێکی تۆزێك کێشراوەوە کێشرابوون . وەستا عوسمانوتی: "جەنگیز خان، تولوی خان، کوبیلای خان کە فەرمانڕەوای چینە "**

**بەدەنگ خوێندەوەو کتێبەکەی بەستەوەو بەرگێکیتری گرت بە دەستەوە ، وێنەیەك بە جوانییەکی باوەڕپێنەکراوەوە ڕووبە ڕوومان بووە کە وێنەی ئەوکاتەی نیشاندەدا وا فەرهاد بەهێزی عەشقەوە شیرین وئەسپەکەی دەخاتە سەر پشتی خۆی و بە ئازارەوە دەیانبات .دەستێکی خەفەتبار بەلەرزەلەرز تامەزرۆیی دڵدارانی کێشابوو، بۆ ئەوەی کە ئازاروخەمەکانی**

زیاترنیشانبدات تاشەبەردەکانی ناوچیاوپەلەکانی ئەوسێ دارە سەروەرەسەنەی کەشایەتی عەشقەکەی فەرهادبوون بە خەمێکی وەهاوە کێشابووکە خەم و فرمێسکە ڕژراوەکانی ئەو پەلاّنە یەکسەر دەربازی من و وەستا عوسمانیش بوو . ئەم وێنە خەماوییە بۆ ئەوەنەکێشرابوو کە هێزی بازووی فەرهاد نیشانبدات بەڵکوو بۆ ئەوە بوو کە ئەو دیار بکات دەردی عەشق لە هەموو دونیادا لە یەك ساتدا هەستدەکرێت. وەستا عوسمان وتی : "یەکێکە لەو لاساییانەی وا هەشتا ساڵ بەر لە ئێستا لە تەورێز لە بەهزاد کراوەتەوە " و کتێبەکەی گرتەوەو خستەوە جێگاکەی خۆی و یەکێتری کردەوە . ئەمە وێنەیەك بوو کە باسی دۆستایەتی زۆرەکیانەی مشك و پشیلە دەکات کە لە کتێبی (کلیلە و دەمنە)دا باسکراوە . پشیلەی سەرسووڕماوی بێچارە لە نێوان سمۆرەی سنەوبەر لە زەویداو باڵندەی کۆلار لە ئاسماندا ڕێگا چارەی نەجاتدانی خۆی لە ڕزگارکردنی پشیلەیەکی بێچارەی گیراو لە بەردەرگای ڕاوچیدا دەدۆزێتەوە پێکدێن، پشیلە وەکوو دۆستێك بە خۆیەویستیوە مشك دەلێسێتەوە . سمۆرەوباڵندەی کۆلاریش لەپشیلەکە دەترسن ولە ڕاوکردنی مشکەکە پەشیماندەبنەوە مشکیش بەوریاییەوە پشیلەکە لەبەر دەرگاکە ڕزگاردەکات . هێشتا من لە وریایی نێو وێنەکە تێنەگەیشتبووم کە وەستا کتێبەکەی ئاخنیوە لای کتێبەکانیترو یەکتیری جوانی کردبووەوە: ئەمە وێنەی جوانی پیاوێك بووکەدەستێکی بە جوانی وەکوو ئەوەی کە پرسیارێك بکات هەڵبڕیبوووبەدەستێکیترەوە کراسەکەی ژنێکی جوانی لە سەرئەژنۆی گرتبوو ، لای لێکردبووەوەو گوێی دەدایە قسەکانی . بەخێلیم بە نهێنیکارییەکانی نێوانیان و عەشق و دۆستایەییەکەیان بردەوەو

بەویستەوە تەماشامکردن . وەستا عوسمان ئەوەشی داناو لاپەڕەیەکیتری لەکیبێکیتر کردەوە . سوارەکانی لەشکرەکانی ئێران و توران کە دوژمنی هەتا هەتایی یەکترین ، هەموو زرێکان و کلاّوە ئاسنینەکان و ئەژنۆ بەندەکان و کەوانەکان و تیرەکان و تیردانەکانیان بەستبوو سواری ئەو ئەسپە جوانانەبووبوون کە تا وەکوو ملیان لەناو زێڕدا بەسترابوونەوەو لەسەر سەوزەلاّنییەکی پڕلە گوڵی زەرد دا بە جوانی لەبەرامبەر یەك ڕاوەستابوون و ڕمە ڕەنگاورەنگە جوانەکانیان ڕاستکردبووەو بەرلەوەی بڕێژێنە نایەك تەماشای ئەو فەرماندەیانەیانەکرد وا بەر لە هەموو کەسێك دەرکەوتبوون و پێکەوە شەڕیاندەکرد .

خەریکبوو لەبەرخۆمەوە بڵێم ئەگەر سەد ساڵ بەر لە ئێستا کێشرابێ و ئەگەر ئێستا کێشرابێ، ئەگەر وێنەی شەڕ بێ یاخود هی عەشق بێ ، ئەوەی وا وێنەکێشێکی ئیماندار دەیکێشێ و نیشانماندەدات ، هەمان عەشقی خۆی بۆ نەخشەکێشان و شەڕی خۆیە لەگەڵ نەفسی خۆیدا . خەریکبوو ئەوەش بڵێم کەئەو شتەی واکێشاویەتی ئەنجامی سەبری خۆیە کە وەستا عوسمان وتی : "ئەمەش نییە" و کتێبە قورسەکەی گرتەوە .

دیمەنێکمان بینی کە چیا بەرزەکان لە نێو هەورە چین چینەکاندا دەڕۆیشتن و هەر چەندە کە درێژتر دەبوو فراوانی و پانتایی دیمەنەکە زیاتر دەبوو . وەها بیرمکردەوە کە دەبێ وێنەکێشان تەماشاکردنی ئەم دونیایەو کێشانەوەی وەکوو دونیای دیتر بێت . وەستا عوسمان بەسەرهاتی ئەوەی باس کرد کە دەبێ چۆن ئەم وێنە چینییە لە بوخاراوە هاتبێتە هەرات و لە هەراتەوە برابێتە تەورێز و لە تەورێزیشەوە هێنرابێتە کۆشکی پاشاکەمان و ڕۆیشتبێتە ناو کتێبیترو لە دوایدا بەرگەکەی پەڕوپووت کرابێت و لەگەڵ

**ڕەسمیتردا دووبارە بەرگ کرابێتەوەو هێنرابێتە ئەستەنبووڵ . چاومان بە وێنەی جۆراو جۆری شەڕ کەیەك لە یەك مەترسیدارترو باشتر کێشرابوون کەوت . ڕۆستەم لەگەڵ شای مەزەندەراندا ، ڕۆستەم هێرش دەکاتە سەر لەشکری ئەفراسیاو، ڕۆستەم لە نێو زرێدا،گیانلەبەرە سەیرەنەناسراوەکە ...، لە جێگایەکیتردا چاومان بەلاشە لەت لەتکراوەکانی شەڕی نێوان دوولەشکری نەناسراوی ئەفسانەیی کەوت، ئەو خەنجەرانەی وا بە سوورایی خوێن سووربووبوون ، ئەو سەربازانەی وا تیشکی مەرگ لەچاویانەوە ڕەنگی دەدایەوە ، ئەوگیانلەبەرانەی وا یەکتری وەکوو پیاز دەهەنجنن ، هەموویانم بینی ، وەستا عوسمان وەکوو وەستایەکی گەورەی تا وەکوو سەرنجی منی ڕانەکێشایە سەر ئەو سەیربوونانەی وا لەهەر ڕەسمێکدا هەن، تەنانەت لەنێو خراپترین ڕەسمەکانیشدا، ئارامی نەگرت ، ئەم شتە سەیرانە دەبێت کەلەکەموکورتی وێنەکێشەکەوە بێت یاخود لەنێوان خودی ڕەنگەکان و قسەکردنەکانیانەوە دەرکەوێت . کێ دەزانێ کە بۆ چەندەمین جار وەکوو وەستایەکی شارەزا سەیری وێنەی تەماشاکردنی بەدزیی خەسرەو لە کاتێکدا کە شیرین لە بەر مانگە شەودا مەلە دەکات و وێنەی لەیلا و مەجنون کە چۆن دوای ماوەیەك دووری و یەکنەبینین ، بێهۆش دەبن و دارەکانی (سالأمان) و(ئابسالٚ) کە لە هەموو دونیا خۆیا شاردۆتەوە و ڕایانکردووە بۆ دوورگەیەکی خۆشبەختی و وێنەی گوڵەکان و پەلەوەرەکان و وێنەی خۆشی کردوئەو شتە سەیروسەمەرانەی پێنیشاندام. کام وێنەکێشی بەدنیەت ئەو باوەقووشەی لەسەر ئەو دارە دانیشاندووە وا خەسرەوشیرین لە بنیدا گوێ لەو بەسەرهاتە خۆشانە دەگرن کە خزمەتکارەکانیان دەیگێڕنەوە؟ کێ وێنەی ئەوکوڕەجوانەی لەنێوان وێنەی**

ئەوژنە جوانە میسریانەدا کێشاوە وا لەکاتی تەماشاکردنی یوسف دا نارنجی شیرین پاکدەکەن و دەستی خۆیان دەبڕن ؟ ئەو وێنەکێشەی واکوێربوونی ئەسفەندیاری بە تیرکێشاوە بیری لەوە نەکردۆتەوە کەلە دواییدا خۆشی کوێر دەبێت ؟

چاومان بەوێنەی ئەو فریشتانە کەوت کە لەکاتی بەرزبوونەوەی پێغەمبەردا دەوروبەریان گرتبوو، هەروەها وێنەی ئەو پیاوە پیرەریش درێژە شەش باڵە، لاشە مۆرەی وا لەباتی ئەستێرەی زوحەلدا کێشراوە و وێنەی ڕۆستەمی منداڵن لە کاتێکدا کە لەژێر نیگای دایك و دایەکانیدا لە بێشکەکەیدا بەئارامی نووستووە بینی.

چاومان بە مردنی بەئازاری دارا لە باوەشی ئەسکەندەرداو تەنیا مانەوەی بەهرامی گوور لەگەڵ شازادەی ڕوسدا لە ژورێکداو پەڕینەوەی سیاوەش لە سەر ئاگر بەسواری ئەسپێکی ڕەش کە ئیمزایەکی لە لمۆزەوە پێوەنی یەو تەرمە خەفەتبارەکە خەسرەو کەوت وابەدەستی کوڕەکەی خۆی کوژرابوو .

کاتیَ وەستا عوسمان بەخێرایی بەرگەکانی هەڵدەبژاردوو سەیری دەکردن ، جاروبار هەندێك وێنەکێشی دەناسییەوە و نیشانی منی دەدا و لە نێوان گوڵەکاندا و لەپەنای وێرانەیەکدا و لە گۆشەیەکی ئەو چاڵە ئاوە ڕەشەی وا جندۆکەی خۆی تێدا شاردۆتەوە ، ئیمزایەکی دەدۆزییەوە کەوا بە شەرمەزاری لەوێدا شاردرابوونەوە ، تەماشای ئیمزاکان و نووسراوەکانی دەکردو دەیگوت کەکیَ چی لە کێوە وەرگرتووە لەبەرئەوەی کەلەوانەیە لە بەرگێکدا چاوی بە هەندێك وێنە بکەوێت بۆ ماوەیەکی درێژ لاپەڕەی هەڵدەدایەوە . جاروبار بێدەنگ دەبوو زیاتر لە خشەخشە دیارو

نادیارەکەی لاپەڕەکان هیچی دیترمان نەدەبیست . جارجاریش وەستا عوسمان دەنگی ئەها ! یەکی دەردەخست و لەبەر ئەوەی کە من نەمدەزانی لە بەر چی سەری سوڕماوە بێدەنگ دەمامەوە . جارجاریش کە هەر یەکجۆر ڕێکوپێککردنی لاپەڕەو کەڵەکەکردن و جێگیرکردنی سوارو دەرختەکانی لە بەرگیتردا دەبینی، نیشانی منی دەداو وەبیری دەهێنامەوە .

وێنەیەکی حەماسەکەی نیزامی لەکاتی شارەزای کوڕی تەیموریان دووسەد ساڵ بەر ئێستا و هی کتێبێکی تر لە کاتێکیتردا بەراورد دەکردو پرسیاری ئەوەی لە من دەکرد کە چۆن دەبێ کە وێنەکێشان بەبێ ئەوەی تەماشای وێنەی یەکتری بکەن بتوانن وەکوویەك وێنە بکێشنەوەولەدواییدا خۆی وەڵامی دەدایەوەو دەیگوت:"نەخشەکێشان وەبیرهێنانە وەیە " کاتێك کە کتێبە کۆنەکانی دەکردەوەو دەیگرتەوە، لەبەرامبەر شتە نائاساییەکاندا دڵگیردەبوو( چوونکە ئیدی کەس نەیدەتوانیوەهاوێنە بکێشێتەوە )، لەبەرامبەر نەتوانکارییەکانیشدادڵخۆش دەبوو(چوونکە ئێمەی وێنەکێش برای یەکین !)، ئەوە شتەی واوێنەکێش وەبیریدەهێنایەوە وێنەی کۆنی دەرختەکان، فریشتەکان، چەترەکان، پڵنگەکان، چادرەکان، ئەژدیهاکان و شازادە خەمبارەکانی نیشاندەدا و ئاماژەی بەوە دەکردکە کاتی خۆی خودا دونیای بە جوانی بێهاوتای خۆیەوە بینیوەو ئەوەشی بۆ عەبدەکانی خۆی بەجێهێشتوە . کاری ئێمەی وێنەکێش و وێنە دۆستان وئەوانەی وا سەیری دەکەن ئەوەیەکە ئەو دیمەنە دەرئاساییەی وا خودا بینیویەتی و بۆ ئێمەی بەجێهێشتووە وەبیربهێنینەوە . گەورە وەستایانی هەر جیلێکی وێنەکێشان هەموو ژیانی خۆیانیان تەرخانکردووەو تا وەکوو داهاتنی کوێرایی چاوانیان کاریان بۆ گەیشتن و کێشانەوەی ئەو خەیاڵەی وا خودا گوتویە

بیبینن کردووە . ئەو کارەی واکردویانە لە بیر هێنانەوەی بیرەوەرییەکانی خودی مرۆڤ دەچوو . بەڵام مەخابن! تەنانەت گەورە وەستاکان و ئەوانەی وا وەکوو وێنە کێشە گەورەکان بەماندوویی و پیریوە تاکوێربونی چاوانیان ئیشیان کردووە، تەنیا ئەملا یان ئەولای ئەو وێنە دەرئاساییەیان وەبیرکەوتۆتەوە . هۆی ئەوەی وا وێنەکێشان سەرەڕای هەبوونی سەدان ساڵ جیاوازی کاتی و نەدیتنی وێنەی یەکتری توانیویانەی وێنەی دارێك، پەلەوەرێك، یاخود شازادەیەك کەلە حەمامدا خۆی دەشۆرێ و ڕاوەستانی کچێکی خەمبار لەبەر پەنجەرەیەکدا وەکوو یەك بکێشنەوە ئەمەبوو .

زۆر دواتر لە دوای ئەوەی وا تیشکە سوورەکەی ژووری خەزێنە ڕەشتربووەوە و ئەوە دیاربوو کەلە نێو دۆڵابەکەدا هیچ یەك لەو کتێبانەی وا شاتاماسووب بە هەدیە ناردوونی بۆ باوکی پاشا نەماون، وەستا عوسمان هەر ئەو ژێر بیرییەی کەوتەوە یاد : جاری وا هەیە کە باڵی پەلەوەرێك،خۆگرتنی پەلێك بە دارەوە،با خواردنەوەی کەناری پاسارەکان ، ڕاوەستاندنی هەورێك لەئاسماندا،پێکەنینی ژنێك، لەوەستایەکەوە تا شاگردێك، جیل بەجیل نیشاندەدرێن، فێردەکرێن و بەلەبەرکردنیان بەسەدان ساڵ دەشاردرێنەوە . وەستایەکی وێنەکێش لەبەر ئەوەی والە وەستاکەی خۆیەوە فێردەبێت و بڕوای وایە کە ئەمە قاڵبێکە و وەکوو چۆن بڕوای بە نەگۆڕانی قورئانی کەریم هەیە، وەها بڕوا بەنەگۆڕانی ئەو قاڵبەدەکات و وردەکارییەکانی فەرامۆشناکات . بەڵام فەرامۆشنەکردنی بەمانای ئەوە نایەت کە ئەوە بەکار دێنێت . بەڵام ئەو وێنە کێشخانەیەی واتێیدا نوری چاوانی ڕژاندووە، یان وەستا بەدخۆکەی وکەیفی پاشاکەی، جاروبار ڕێگابەو وێنەکێشە نادەن کە ئەو وردەکارییە بکێشێت و باڵی

پەلەوەرێك یان پێکەنینی ژنێك و .... دیار بکات ).منیش وتم :"یان وەکوو لمۆزی ئەسپێك." وەستا عوسمانیش بێ ئەوەی کە پێبکەنێت وتی:"یان وەکوو لمۆزی ئەسپێك" ئەو وەستا گەورەیەی ئەو شتە ناکێشێت کەوا لە قووڵاییەکانی ڕۆحیدایە، لەو ساتەدا وەکوو نەریتی وێنەکێشخانەکەو وەکوو هەرکەس نەخشدەکات ، تێدەگەی ؟ "

لەلاپەڕەیەکی کتێبی خەسرەوشیریندا کەتا وەکوو ئێستا نوسخەی جۆراوجۆریان هاتبووە بەردەست، وێنەی شیرین بە سەر تەختەوە نیشاندەدرێت کەلەسەر دیواری کۆشکەکەوە لەسەر بەردەکان ئەمە نوسرابوو (هەڵکەنرابوو) : خودای گەورەم! پادشا ڕەسەنەکەمان، خاقانە عادیلەکەمان ! هێزی کوڕی تەیموورخانی سەرکەوتوو و فەرمانڕوایەتییەکەی و وڵاتەکەی بپارێزە تاوەکوو هەم دڵخۆش بێ( لەسەربەردەکەی لای چەپ نووسرابوو) هەم وەکوو دەوڵەمەندببێ ( لەسەر بەردەکەی لای ڕاست نووسرابوو) لە دواییدا پرسیارمکردکە : " ئێمە لەکوێ ئەو وێنانە دەدۆزینەوە وا وێنە کێشەکە وەکوو چۆن لمۆزی ئەسپەکەی لە مێشکیدا هەڵکەندووە، تێیدا کێشراوییتەوە؟" وەستا عوسمان وتی : " پێویستە بەرگی ئەو شاهنامە ئەفسانەییە بدۆزینەوە وا شاتاماسووب بەهەدیە ناردوویەتی. پێویستە بگەڕێینەوە بۆ ئەو کاتە جوانە ئەفسانەییانەی وا خودا بەشداری لە وێنەکێشاندا کردووە ، تەماشای کتێبی زۆرتر دەکەین ."

ئەوەم بە بیردا هات کە ئامانجی سەرەکی وەستا عوسمان دۆزینەوەی ئەسپە لمۆز سەیرەکە نیە ، بەڵکوو ئەوەیە کە تا ئەوەندەی لە دەستی بێت تەماشای وێنەکانی ناو ئەم خەزێنەیە بکات کەوا دوور لەهەموو نیگایەك

لێره لەخەودان. بۆ دۆزینەوەی شوێنە دەستێك کە زووتر بمگەیەنێت بەو شەکورەیەی واله ماڵەوه چاوەڕێی من دەکات زۆر بەپەرۆش بووم، هەروەها نەمدەویست بڕوابەوەبکەم کەوەستای گەوره بییەوێت تا ئەوەندەی کە ڕێگا بدرێت لەم ژوورەساردەدا بمێنێتەوه بەمجۆره ئەو دۆلآبەوسندووقە تازانەمان کردەوه واپیرەکورته بالآکە نیشانیدابووین وبەردەوام بووین لەسەرتەماشاکردنی وێنەکان جاروبار لە تەماشاکردنەوەی وێنە دووبارەبووەکان بێزاردەبووین و نەماندەویست کە هاتنی خەسرەو لە ژێر پەنجەرەی ژنەکەیەوه بۆ دیتنی شیرین ببینین ، تەنانەت تەماشای لمۆزی ئەسپەکەی خەسرەوم نەدەکرد لە وەستا جودا دەبوومەوەو دەڕۆیشتم بۆ پالٚ مەنقەڵەکەو خۆمم گەرم دەکردەوه، یان وەکووله نێوان ئەو ژووره مەترسیدارانەی خەزێنەکە بەرووی یەکدا دەکرانەوەو کە بەینی ڕۆنی زریٚ و قوماش و ئاڵتوون و دەسکەوت و چەکدا بە سەر سووڕماوییەوه ڕێمدەکرد .
جاری واش هەبوو کە بەدەنگێکی وەستا عوسمان یان وەکوو جوڵەیەکی دەستییەوه وامدەزانی کە شتێکی‌دەرئاسایی یان وەکوو ئەسپێکی لمۆز سەیری دۆزیوەتەوەو خێرا بەرەو لای ئەو هەر ڕامدەکرد ، کاتیٚ کە تەماشای ئەو لاپەڕەیەم دەکردوا وەستای پیر بەدانیشتن لە سەر قالٚییەکی دەورانی(فاتیح سوڵتان موحەمەد)و بەدەستە لەرزۆکەکەی گرتبوی لەگەلٚ وێنەی چوونە بەلە فیٚلٚ و تەڵەکەکەی شەیتان بۆ ناو کەشتییەکەی نووحدا ڕووبەڕوو دەبوومەوه، سەیری وێنەی سەدان کەس لەو پاشایانەی وا لە کاتی سوڵتان سولەیمانی قانوونییەوه تا وەکوو کاتی تەیموور لە سەر تەخت دانیشتوون و پادشاو سوڵتانەکان وئاسکەکان و شێرەکان و نێچیرەکانی کەروێشکەکانمان لەکاتی خۆشیدا لەبەرامبەر بەستنەوەی

تەختەیەك لەنێوان دووئەژنۆی دواوەی وشترێكدا بۆ ئەوەی كە بتوانرێت لە دواوە خەریكی بن، وێنەی پەنجە لە دەم مانەوەی شەیتانە بێعارەكەشمان بە شەرمەوە بینی، وێنەی داستانی فڕینی بازرگانێكمان بینی كە بەدەستگرتن بە قاچەكانی پەلەوەرێكی ئەفسانەییەوە لە دەریاكانەوە تێپەڕدەبێت و تەواوی دونیا دەبینیٚ ، شایانی باسە كە ئەم چیرۆكە لە كتێبێكدا هاتووە كەلە ڕێگای بەغدادەوە هاتووەتە ئێرە . لە كتێبی دوای ئەوەدا چاومان بەوێنەی خەسرەوكەوت وا شیرین بەهەڵواسراوی دەبینیٚ وعاشقی دەبیٚ، من وشەكورە زۆر حەزلەم وێنەیە دەكەین . چاومان بەهەندێك تۆپ كەوت كە لە سەر پشتی فیلێك جێگیركرابوون ، وێنەیەكمان بینی كەكاركردنی كاتژمێری نیشاندەداو زەمانمان كەوتەوە یاد . نازانم كە چەندە ئەم بەرگ و ئەو بەرگ و ئەو وێنەو ئەم وێنەمان كردبیٚ ، وەكوو ئەوەی وابوو كە زەمانە زێڕینە نەگۆڕەكانی ناووێنەكان لەگەڵ چركەساتە نەمدارەكانی ئەم خەزێنەیەدا تێكەڵاوبووبن، دەتگوت كەئەم وێنانەی وا بەرژتنی نووری چاو لە وێنەكێشخانەی دەیان پادشا وخان وپاشادا دروستكراون، وێنەی ئەوكڵاوە ئاسنینەو شمشێرە دەسك ئەڵماسینەوخەنجەرەكان و زرێكان وئەوكوپانەی واله چینەوە هاتوون وئەو عوودەناسكانەی وا تۆزیان لێنیشتوەوئەو سەرێنە مرواریيانەی وا هاوتاكانیمان لە وێنەكاندا بینیوەو دەورووبەرمانیان پڕكردۆتەوە نیشاندەدەن .

"لە دوای ئەوەی كە بە سەدان ساڵ بە دزیوە و بەپێی نەریت هەریەك وێنەیان كێشاوەتەوە، ئێستا تێدەگەم كە وێنەی گۆڕانی دونیایەك بۆ دونیایەكی تر بە دزیوەو بەپێی نەریت كێشاوەتەوە " .

دەتوانم ئیعتراف بکەم کە تێنەگەیشتنم کەئەم قسەیەی وەستا عوسمان مانای چیدەدات بەڵام تەماشاکردنی وێنەی ئەو ئەسپانەی وا لەم دووسەد ساڵەی دواییدا لە بوخاراو هەرات و تەورێز و بەغداد و ئەستەنبوولدا کێشراون لە گەڕان بە دوای لمۆزێکی سەیردا زیاترە و شتێکی تری تێدایە . ئێمە جۆرە بۆنەیەکی خەماویمان بۆ هونەر و ئیلهامی وەستایانە دەگرت وا چەند سەد ساڵێکە لەم خاکانەدا وێنەو نەخشیان کێشاوە . هەر لەبەر ئەمەش کاتێك کە ئێوارە وەختان مۆرەکەیان شکاندو دەرگای خەزێنەکە کرایەوە و وەستاعوسمان وتی نایەوێت لێرە بچێتە دەروو ئەگەر شەو تا بەیانی لە نێو مۆمەکاندا سەیری وێنەکان بکات ، ئەوسا دەتوانیٚ مافی ئەرکەکەی پادشا بداتەوە ، یەکەم شتێك کە هات  بە مێشکمدا ئەوەبووکە منیش لەگەڵ وەستا عوسمان و پیرە کورتە باڵا کەوا بمێنمەوە، هەر بۆیە پێمگوت . کاتیٚ دەرگا کرایەوەو وەستاکەمان بڕیارەکەی بەئاغاکانی بەردەرگا ڕاگەیاند، تاوەکوو مۆڵەت لە خەزێنەدار وەربگرێت، من یەکسەر پەشیمانبوومەوە، شەکورەو ماڵەکە بەرچاومی دەگرت . کاتیٚ کەبیرم لەوە دەکردەوە کە دەبیٚ چۆن شەکورەو منداڵەکان شەو بەتەنیایی بەسەر بەرن و چۆن پەنجەرەکە دابخەن، مووی هەموو لاشەم ڕاستدەبووەووە .

لە نێوان بەینی دەرگاکەی خەزێنەکەوە وەکوو ئەوەی حەوشەی ئەندەروون لەناومژێکدا بێت دیاردەبوو، دووکوڕی جوان بۆ ئەوەی کە پاشا نەبیسی و ناڕەحەت نەبیٚ بە بێدەنگی وبەئاماژە پێکەوە قسەیان دەکرد، ئەمە ڕایدەکێشام بۆ ژیانی دەرەوە ، بەڵام لەبەر شەرم و هەستی تاوانباری بیٚ جموجۆڵ مامەوە.

## ( ئێمە ، دوو عەودالْ ) (50)

هەندێك قسەو باس سەبارەت بە هەبوونی وێنەی ئێمە لە نێو بەرگێك، یاخود لە نێو ئەولاپەڕانە لە ئارادایە وا لە چین و سەمەرقەند و هەراتەوە هاتوون و ئێستا لە گۆشەیەكی شاراوەی ئەوخەزێنەیەداین كە باوباپیرانی پادشاكەمان لە ماوەی سەدان ساڵدا بە داگیركردن و تالأنكردنی سەدان وڵات كۆیانكردۆتەوە . پێدەچیْ ئەم قسەو باسانە لە لایەن جەزمی ئاغای كورتە بالأوە گەیشتبێتە لای دەستەی وێنەكێشان، جابۆیە ئەگەر ئێمە بە شێوازی خۆمانەوە بەسەرهاتە كەی خۆمان بگێرینەوە ئەگەرخودا مەیلی بیْ ئەوكەسە هەڵبژێردراوانەی والەم قاوەخانە جوانەدا دانیشتوون دڵگیرنابن.

سەدو نۆساڵْ بەسەر مەرگماندا تێپەڕبووەو ئاگری زەندیق(بێباوەڕ) و هێلانەی شەیتان لەژێردەستماندایە، چاككردنەوەی

مومكین نیە، خۆی لە خۆیدا لەبەر ئەوەی لایەنگری ئێرانییەكان (عەجەم)بوون ئەوە چل ساڵْ دەبیْ كە دایانخستووە . بەلأم سەیركەن! ئێمە لەبەرامبەرتاندااین، بۆچی؟ چوونكە بەپێی نەریتی فەرەنسییەكان وێنەمان كێشراوە ! وەكوئەوەی والە وێنەكەدا دیار دەبێت، ڕۆژێك ئێمە (دوو عەودالْ) لە وڵاتی پادشاكەماندا لەم شار بۆ ئەو شار دەڕۆیشتن و دەگەڕاین، پێپەتی، نیوە ڕووت وكەچەڵْ، یەكی یەك یەلەك وپێستی ئاسكێكمان

لەبەردابوو، هەریەکەوکەمەڕێکیشمان بەپشتەوە بوو، یەکی یەك توێڵاَمان بەدەستەوەبووکە سەرەکەیان شکابوو، دوو قاپەکەشکۆڵینەمان پێبووکە بە زنجیرەکەی ملمانەوە بەسترابوون، یەکێکیشمان تەورێکی بۆ داربڕین پێبوو، ئەویترشمان کەوچکێکی پێبوو بۆئەو خواردنەی وا خودا دەیخستە ناو قاپەکەشکۆڵینەکەمانەوە. ئێستاش لەگەڵ دۆستەکەم ، خۆشەویست و هاوڕێکەمدا کەوتبووینە ناو باسەکەی جاران، باسمان لەسەر ئەوەبووکەکیٚ لە پێشدا بە کەوچکەکە لەناو دەفرەکەشکۆڵینەکەدا خواردن بخوات، من نا تۆ لە پێشدا بیخۆ، ئەمانەمان دەگووت و دەڕۆیشتین کە لە سەر کانیاوێك لە جێگایەکی دانیشتندا کابرایەکی گەشتیاری سەیرو سەمەرەی فەرەنسی ڕایوەستاندین ، هەریەکەو پارەیەکی زیوی وەنیزی پێداین و دەستی بە کێشانی وێنەکەمان کرد.فەرەنسییەکە کابرایەکی سەیرە : وەکووئەوەی کەلە نێو چادری پاشاکەماندا بین ئێمەی لە ناوەڕاستی لاپەڕەکەدا کێشا بوو، خەریکبوو بەنیوە ڕووتی بمانکێشێت کەشتێکم بە بیردا هات، یەکسەر بە هاوڕێکەم گوت، بۆ ئەوەی کە وەکوو لەتەچنێکی قەلەندەرووبیٚ هیچی ڕاستەقینە دەربکەوێت پێویستە ڕەشاییەکەی چاومان بەرەو دواوە بەرین و سپیایەکەشی بەرەو پێش بێنین و وەکوو کوێرێك تەماشا بکەین، وەهامان کرد، لەم بارووودۆخەدا بەپێی دەروێش بونمان تەماشای‌دونیای دەرەوەمان نەکرد بەڵکو سەیری ئەو دونیایەمان دەکرد کە لەمێشکماندایە، لەبەرئەوەی کە مێشکمان(تلیاقی)تێدابوو ئەودونیایەمان لاخۆش بوو. تومەزە دیمەنەکانی دونیای دەرەوە لەوەی هەبووخراپتریش بوون، چونکەدەنگی قیڕەقیڕی مەلایەکی ئەفەندیمان بیست، بەلاَم بەهەڵەتێنەگەن، کەوتمان مەلای ئەفەنی، هەفتەیەك بەر لە ئێستا هەر لەم قاوەخانە جوانەدا بەهەڵەلێمان

تێگەیشتبوون، ئەم مەلا ئەفەندیە، مەلا نوسرەتی ئەرزڕوومی ومەلا هوسرەتەباوك نادیارەکەش نیە ، تەنانەت ئەو مەلا سیواییەش نیە کەوا لەسەر دارەکە لەگەڵ شەیتاندا ئیشەکەیان دەکرد، چوونکە ئەوانەی وا هەموو شتێك بەخراپی شیدەکەنەوە گوتویانە : ئەگەر جارێکی تر قسە بەحەزرەتی مەلا ئەفەندی بگوترێ ئەوا زمانی بالوۆرەبێژەکە دەبڕین و قاوەخانەکەشی بەسەردا دەڕمێنین .

سەدوو بیست ساڵ بەرلەئێستا قاوەخانە نەبووە، لەوکاتانەدا ئەو مەلا ئەفەندییەی وا ئێمە باسیدەکەین لەتووڕەییدا لووتی ئاوی لێدەهات و دەیگوت : "بۆچی وێنەی ئەمانە دەکێشی ئەی فەرەنسەیی کافیر ! ئەمانە دزی دەکەن ، ئەم قەلەندەرە هیچ وپوچانە لەتەچنی دەکەن و دەگەڕێن، تلیاق دەکێشن، شەراب دەخۆنەوە، لەنیوە ڕووتیەکەشیاندا دیارە کە یەکتریش دەکەن، ئەمانە ئاگایان لە نوێژو دوعاو ماڵ و بنەماڵەو وڵات نیە و قەباحەتی دونیان، لە کاتێکدا ئەم وڵاتەی ئێمە ئەوەندە جوانی هەیە تۆ بۆچی وێنەی ئەم خراپەییەدەکێشی، بۆ ئەوەیە کە خراپەییمان بەسەردا بێت ؟" کافیرەکە وتی : "باروو دۆخی خراپی ئێوە پارەی زیاتردەکات" ئێمە (هەردوو عەوداڵ) لە بەرامبەر هێزی عەقڵی وێنەکێشەکەداسەرمان سووڕما.هەرچەندە کەمەلای ئەفەندی بە فێڵبازییەوە ویستی بیکێشێتە ناو قسەو باس و وتی :"ئەگەر پارەی زیاترت بدەنێ وێنەی شەیتانیش بە جوانی دەکێشی ؟" بەڵام وەکوو لە ڕەسمەکەی ئێمەدا دیار دەبێ ئەم کابرا وێنەکێشێکی تایبەت بوو و گوێی نەدەدایە دەنگە دەنگ و قیڕەی وشك و مێشکی لەسەر پارەبوو، هەربۆیە گوێی لێڕانەدەگرت . بەمجۆرەش وێنەی ئێمەی کێشا، وێنەکەی خستە ناو بەرگبەستەکەی سەرپشتی ئەسپەکەو

گەڕایەوە بۆ ولاّتی کافیرەکان، بەلاّم لە بەرئەوەی کە لەشکرە سەرکەوتووەکەی (عوسمانی) ئەو شارەی لای کەنارەکانی چۆمی (تون)یان داگیرکرد، لەئەنجامیتالاّنکردنەکاندا ئێمە گەڕاینەوە بۆ ژووری خەزێنەکەی ئەستەنبووڵ . لە ویشدا بە تەماشاکردن وێنەیەکمان لە بەر کێشرایەوەولە دەفتەرێکی نهێنی وە براین بۆ کتێبێکیترو لەویشەوە هاتینە ئەم قاوەخانە جوانەی وا قاوەکەی بەگیان و بەدڵ وەکوو (ئەکسیر) دەخورێتەوە .ئێستاکانە : ڕوونکردنەوەیەکی کورت سەبارەت بە وێنە، مەرگ وجێگای ئێمە لە دونیا:ئەو مەلا ئەفەندییە (قۆنیاییەی) وا تۆزێك بەرلە ئێستا باسمانکرد ئامۆژگارییەکانی خۆیلە کتێبێکی گەورەدا دەنوسێتەوە وەها دەڵێ : "قەلەندەرەکان (دەروێشی هەژار) زیادەییەکانی ئەم دونیایەن، چوونکە : چینەکانی ناو ئەم دونیایە بە : 1- ئاغاکان 2- بازرگانەکان 3- جوتیارەکان 4- پیشەسازان، بەشدەکرێن و ئەمانەش لەناوهیچ یەك لەمانەدانین و هەرلەبەرئەوەش زیادین" لە جێگایەکیتریشدا وەهای فەرمووە :"ئەمانە هەمیشە دووبە دوو پێکەوە دەگەڕێن و هەموو کاتیش باس لەسەر ئەوە دەکەن کەکێ بەکەوچکەکە خواردن بخوات، ئەمە خۆی دانانی بناغەی ئەو باسەیە کەکێ لەپێشدا ئەویتر بکات، ئەوانەی واتێناگەن پێدەکەنن " .ئامان باکەس بەهەڵە تێنەگات،بەڵام لەوانەیە لەبەرئەوەی کەمەلای ئەفەندی هاوڕێی ڕێگای ئێمەو کوڕەجوان و بەردەستە جوانکیلەکانە، ئاوەها ئاگاداری نهێمیەکانی ئێمەیە .

(بەلاّم نهێنی گرنگ)

ئەمەیە : کاتێك کە کافیر فەرەنسییەکە وێنەی ئێمەی دەکێشا، ئەوەندە جوان سەیری دەکردین کەئێمەش حەزماندەکرد ئەو وێنەمان دەکێشێ،

**بەچاوێکی ڕووتەوە تەماشای دونیای دەکردوئەوەی وادەیبینی دەیکێشا، بەمجۆرە کەسانێکی وەکوو ئێمەشی کە چاویان دەیبینا وەکوو کەسانێکی کوێر دەکێشا، بەلاّم ئێمە گوێمان نەدایە ئەمە . ئێستاش زۆر مەمنونی ئەوین . بەگوێرەی مەلا ئەفەندی ئێمە ئێستا لەدۆزەخ داین، بەگوێرەی هەندێك بێ ئیمانیش ئێمە وێنەیەکین، چەندە جوانە! ئەڵێی لە ڕاستیدا لەبەرامبەرتاندابن، لەدوای ئەوەی وا مەلا ئەفەندیمان بینی لە قۆنیا وە بۆسیواس لە سێ جێگادا ڕاوەستاوین و بەلەتەچنی هەشت گوند گەڕاین، بەلاّم لە دواییدا بەفرێکی قورس باری و ئێمەش لەسەرماندا باوەشمان کرد بەیەکداو خەوبردیینەوەو بەیانی لەسەرماندا ڕەقمان بردبووەو مردبووین، بەرلەوەی بمرم لە خەوم دا وامدەزانی کەوێنەیان کێشاوم و لەدوای ئەوەی هەزاران ساڵ ژیاوە ڕۆیشتۆتە بەهەشت .**

## (( من ، وەستا عوسمان )) (51)

له بۆخارادا باسی بەسەر هاتێك دەكەن كه له كاتی ( عبدا ... )خانەوه ماوەتەوه . ئەم خانه دوو دڵەی ئوزبەك لەوه تووڕه نەدەبوو كه چەند وێنه كێش دەستكاری وێنەیەك بكەن ، بەڵكوو لەوه حەزی نەدەكرد كه وێنەكێشان تەماشای دەستی یەك بكەن و لاسایی یەك بكەنەوه .چونكه لەكاتی ئەنجامدانی تاوانی كێشاندا دۆزینەوەی تاوانبارەكه لەنێوان ئەو وێنەكێشانەی بەبێشەرمییەوه لاسایی یەكدەكەنەوه كارێكی سەخت و دژوار و نامومكینه .لەوەش گرنگتر ئەوەیه كه كاتیّ ئەم وێنه كێشانه خۆدەدزنەوه ، دوای ماوەیەك لەباتی ئەوەی خۆیان بخەنه ناو زەحمەتی و له نیوەشەواندا بەدوای بیرەوەرییەكانی خودادا بگەڕێن ، تەماشای ئەوەی لای سەری دەكا و به تەمبەڵییەوه دووباره دەیانكێشێتەوه .

ئەم خانی ئوزبەکە بە گەرمی پێشوازی لەو دوو وەستا وێنەکێشە دەکات وا لە دەستی شەڕ و پادشاستەمکارەکانەوە لەشیراز و باشوور و ئەو ڕۆژهەلاتەکیتر و سەمەرقەندەوە ڕایانکردووە و بەدوای کەسێکدا دەگەڕێن کە پەنای بۆ بەرن . بەلام وێنەکێشانەوە لەبەریەکیان لێ قەدەغە دەکات . بەمجۆرە بۆ ماوەی سێ سال و حەوت مانگ تەنیا باسی وێنەکانی یەکتریان وەکوو باسی دینی بیستۆتەوە و گوێیان لەوە بووە کە وێنەکانیان چەندە لەیەك دەچێ و خالی جیاوازییان چیە . خانی ئوزبەك وەکوو کیسەل تەمەنێکی زۆر دەباتە سەر و دەمرێ ، لەدوای مردنی هەر دوو وێنەکێشەکە بۆ بینینی وێنەکانی یەکتری هەڕا دەکەن . لەدواییدا  کاتێك کە هەر دووکیان لەسەر دۆشەکەیەك دادەنیشن و تەماشای وێنە و کتێب و بەسەر هاتە ئەفسانەییەکانی  ( عبدا... خان ) دەکەن ، تێدەگەن کە ئەمە ئەوە نەبووە وا هەردووکیان خەیالیان کردووە ، هەر بۆیە لەق وپۆی خەیالەکانیان دەشکێ . چونکە ئەو وێنانەی وا سەیریان دەکردن وەکوو ئەو بەسەر هاتانەی وا لەخانەوە بیستبوویان ئەفسانەیی نەبوون و وەکوو هەموو ئەو وێنانەی وا لە سالانی دواییدا بینیویانە بێ تایبەتمەندی و بێنوور و لێل بوون . لە دواییدا هەر دوو وەستا بڕوایان بەوە کردووە کە هۆی لێلبوونی وێنەکان دەگەڕێتەوە بۆ وردە وردە داهاتنی کوێراییان و لەدوای ماوەیەك بەبێئەوەی کە ئاگادار بن بە تەواوەتی کوێر دەبن و بە بڕواکردن بەوەی کە خەیالەکان لە وێنەکان جوانترن دەمرن .

لە نیوە شەودا کاتێك لەم ژوورە ساردەی خەزێنەدا بەو پەنجانەی و لە لەسەرماندا وەکوو سەهۆلیان لێهاتووە لاپەڕەکانی ئەو کتێبانە هەلدەدەمەوە کەچل سالە خەیالیان پێوە دەبینم ، ئەم بەسەرهاتەم کەوتەوە یاد ، بەلام من

له قارەمانە ستەمکارەکانی ئەم بەسەرهاتە زیاتر دڵخۆشم . وێنەی ئەو کتێبانەی هەمیشە دەمەویست بەر لە مردن و بەرلە کوێرایی داهاتنم چاوم پێیان بکەوێ منیان دەهێنایە جۆش و خرۆشەوە ، تەنانەت هەندێك لەو وێنانە لەو ئەفسانانەی وابیستبووم جوانتر بوون ، هەر بۆیە کاتێ کە دەمبینین لەبەر خۆمەوە دەمگوت : " شوکر ، شوکر ، شوکر بۆ خودای خۆم. "

بۆ نموونە هەشتا ساڵ بەر لە ئێستا کاتێك کە شائیسماعیل لە چۆمەوە دەپەڕێتەوە و هەرات و تەواوی خوراسان بە زۆری شمشێرلە ئوزبەکەکان وەردەگرێتەوە و پارێزگاری هەرات دەهێڵێتەوە بۆ ( سام میرزای) برای خۆی ، براکەی بۆ ئەوەی کە ئەم دڵخۆشیەی پیرۆز بکات کتێبێك ئامادە دەکات و ئەو ئەفسانەیەی وا لە کۆشکەکەی ( ئەمیر خەسرەوی دەهلی )دا گوێبیستی بووە دووبارەی دەکاتەوە و کتێبی بەیەك گەیشتنی ئەستێرەکان ئامادە دەکاتەوە . بەگوێرەی ئەوەی وا لە ئەفسانەکانەوە بیستوومە و ئەوەی وا لە وێنەکەدا هەیە وێنەی دوو فەرماندەی جەنگین کە لە پاڵ چۆمێکدا بۆ پیرۆز بایی کردنی سەرکەوتنەکەیان بەیەك گەیشتوون ، شێوەی ڕوخساری هەر دوو فەرماندەکە لە ڕوومەتی سوڵتانی دەهلی کەیقوباد و باوکی کەوا کتێبەکە باسیدەکا و لە ڕوخساری بوغرا خانی فەرمانڕەوای بەنگال و شا ئیسماعیل و براکەی دەچوو کەوا بووە بە هۆی دروستبوونی ئەم کتێبە . کاتێ کە زانیم هەر جۆرە بەسەر هاتێك لە مێشکمدا وەبیر بهێنمەوە و تەماشای وێنەکە بکەم ، دیسان وێنەی ئەو قارەمانانەی ئەم بەسەر هاتەم لە چادری سوڵتاندا بینی ، هەر بۆیەلەبەر ئەوەی کەخودا مەجالی ئەوەی بۆ ڕەخسانووم چاوم بەم لاپەڕە نائاساییە

بكەوێت ، شوكری‌خودام كرد .هەرلەو كاتانەشدا لە وێنەیەكدا كەبەدەستی یەكێك لەگەورەترین وەستاكان یانی شێخ موحەمەدەوە كێشراوە وێنەی عەبدێكی هەژاری پاشایەك دەكێشرێت كەحەزو خۆشەویستیەكەی بەرامبەربە پاشا لەرادەی عەشقدایەو لەكاتێكدا كێشراوە كەپاشا یاری(چۆگان) دەكات و عەبدە هەژارەكەش بەهیوای ئەوەی كەتۆپەكە بەرەو لای ئەو بێت و بیدات بەدەستی پاشاوە، زۆر چاوەڕوانی دەكات، هەر بەراستیش تۆپەكە بۆلای ئەو دێت و دەیدا بەدەستی پاشاوە .بە سەدان جار باسی ئەو حەیران مانەوەو حەزو خۆشەویستیە بەهەقەم بیستووە وا كوڕە شاگردێكی جوان بەرامبەر پاشایەكی گەورە، خاقانێك،یان وەكوو وەستایەكی گەورە دەینوێنیٚ . لەم وێنەیەشدا ئەوەندە جوان ئەم حەیران مانەوەوتەسلیم بونەكێشرابووكە لە چۆنییەتی درێژكردنەوەی تۆپەكەوگرتنی بە پەنجەكانی وتەماشانەكردنی پادشا لەشەرماندابە ئاشكرایی دەردەكەوت، كاتیٚ تەماشامدەكرد وەكوو ئەوەی خۆمم هەستمدەكرد، دەمزانی ئەگەر خۆشترین شت لەدونیادا ئەوەبیٚ كەوەستایەتی شاگردی جوان و بەچەمك بكەی، بەهەمان ئەندازەش بەردەستی كردنی وەستایەكیتری گەورە تارادەی تەسلیمبون لەبەرامبەریدا شتێكی‌خۆشەوخەفەتم بۆئەوانە دەخوارد والەم مافە بێبهرەماونەتەوە .كاتیٚ لاپەڕەكانم هەڵدەدایەوەو بەخێرایی و بەوردی تەماشای وێنەی هەزاران پەلەوەر، ئەسپ، سەربازە وشترو عاشق و دارم دەكرد، ئاغا كورتەبالاٚ دڵخۆشەكەی خەزێنە ئەمەی بەهەلێك دەزانی بۆ ڕیسواكردنی دەوڵەمەندی و زۆر بێشەرمانە وەكوو پاشایەك پەسنی خۆی دەدایەوەو لەم سندوق كتێبی دەردەهێناو دەیخستە ئەویتر، ئەم كتێبە نائاساییانە لەنێوان سندوقێكی

ئاسنیندا لەنێوان کتێبەکانی ترداو لە بەینی جەنجاڵی ئەوێدا دۆزرانەوە، یەکێکیان بەپێی نەریتی شیراز، بەرەنگی هەڵووژەی گەنیورەنگکراوە ئەویتریشیان بەپێی کاریگەری چینەکان زۆر بەخەستی ڕووکەشی لێدرابوو، لاپەڕەکانی ئەم دووکتێبە ئەوەندە لەیەك دەچوون کەسەرەتا وامزانی لە ڕووی یەك گیراونەتەوە .کاتیٚ نوسراوەکانم دەخوێندەوەو بەدوای ئەوەدا دەگەڕام کەبزانم کامەیان بەرگی ئەسڵەو کامەیان لەروو گیراوەتەوە، لەدواییدا بەلەرزێکەوە تێگەیشتم کەئەمە کتێبی (نیزامییە) کەوا بەدەستی شێخ عەلی تەورێزییەوە بۆ خاقانی (کارا کویونلو) وەکان جیهانشاە و خاقانی (ئاککویونلو)ەکان حەسەنەدرێژ دروستکراوە .کاتیٚ کە یەکەم بەرگیان بۆ خاقانی(کارا کویونلو)ەکان دەکێشیٚ، پاشا بۆ ئەوەی کەیەکێکیتر بۆ کەسیتری نەکێشیٚ کوێری دەکات، لەدواییدا شێخ پەنا دەباتە لای خاقانی (ئاککویونلو)ەکان و بەچاوی کوێرەو لەوە جوانتریشی بۆ دروستدەکات، ڕەنگی وێنەکانی یەکەم بەرگ، جوانترو پڕ لە ژیانن، بەڵام وێنەکانی بەرگی دووەهەم و لەدوای کوێربوونی شێخ، ساف و بیٚ ئارایشتترن، ئەمەئەوەی وەبیر هێنامەوە کە کوێرەکان سادەیی و بێئارایشتییە بێڕەحمەکانی دونیا ئاشکرا دەکەن و دەیبینن، بەڵام زیندوبونەکانیان دەکوژن . لەبەر ئەوەی وەستایەکی گەورەم و هەموو ئەو شتانە دەبینم کە خودای گەورەو زاناش دەیانبینی، دەزانم کەرۆژێك کوێردەبم، بەڵام ئایا ئێستا ئەمەم دەویٚ؟ وەکوو تاوانبارێك کەبەر لەسزادان بییەوێت بۆ جارێکیتر چاوی بەدیمەنێك بکەوێت، منیش بەخودای گەورەم گوت: " باهەمووی ئەم وێنانە ببینم و چاوەکانم تێر بکەم ." چوونکە لە تاریکاییە شکۆدارە مەترسیدارەکەی ژووری خەزێنەدا کە پڕ بوو لەکەلو

پەل، زیاتر هەست بە هەبوونی خودا لەنێزیکەوە دەکرا.لەولاپەڕانەی وا هەڵمەدەدانەوە زۆرتر چاوم بە ئەفسانەو بەسەرهاتەکانی کوێربوون و ژیری و داناییەکیتری خودا دەکەوت . کابرایەکی گێژ لەسەر ئەو وێنەیەی واداستانی عاشقبوونەکەی شیرین بەرەسمە هەڵواسراوەکەی خەسرەوله گەڕانێکدا نیشاندەدات، گوتبووی بابەتی سەرەکی ئەم بەسەرهاتە دارچنارەکە نیە، هەربۆیە لەبەرامبەر ئەم قسەیەدا شێخ عەلیرەزای شیرازی بە کێشانی دارچناری ئەم وێنەیە بەجوانی و بەشێوەیەك کە هەموو پەلەکانی دیاربن و ڕوولە ئاسمان بکەن، ئەوەی بەشانازییەوە سەلماندبوو کەبابەتی سەرەکی لەنەخشدا، حەزکردن لە کچێکی گەنجی جوان نیە بەڵکوو بابەتی سەرەکی ویستی خودی وێنەکێشەکەیە ، هەروەها دەستی بەکێشانی هەر ئەو دارچنارە بەهەموو پەلەکانییەوە لەسەردانەیەکی برنج کردبوو . چاوم بەو داری سەر برنجەکە نەکەوت . حەوت ساڵ و سێ مانگ دوای دەستبەکاربوونی کوێردەبێ و هێشتا بەنیوە تەواوی دەهێڵێتەوە،

ئەگەر ئیمزای ژێر پێی خزمەتکارە جوانەکەی شیرین بەهەڵەمدانەبات، چاوم بەو دارچنارە کەوت وا لەسەر لاپەڕە کێشرابوو . لە لاپەڕەیەکیتردا وێنەی ئەسکەندەر کێشرابوو کەبەتیرە سێ سەرەکەی ڕۆستەم کوێر دەبێت، وێنەکێش ئەم وێنەیەی وەکوو ئەوەی ولاّتی هیندی بیبنێ بەرەنگی جۆراو جۆر بۆیاخکردبوو، ئەوەندە جوان دەرچووبوو کە کوێرایی کەدەردی بێکۆتایی وێنەکێشە تایبەتەکە بوو وەکوو سەرەتای جەژن و شاییەك بۆ بینەر دیار دەبوو . بەگەرمایی و جۆش و خرۆشی کەسێکەوە کە ساڵانێکە بییەوێت چاوی بەم وێنانەو ئەم کتێبانە بکەوێت و ئەفسانەکانی بیستبێت و بەپەشۆکاوی کەسێکەوە کەدەیزانی ماوەیەکیتر کوێر دەبێت تەماشای

وێنەکانم دەکرد، بۆ جاری یەکەم بووکە لەم ژووره ساردەی خەزێنەداو لەبەر قوماش و تیشکە سەیرەکەی ئەم مۆمە بۆرانەدا چاوم بەوە دەکەوت کە ڕەنگی تاریکاییەك بەرەو سووربوون بچێت،هەرلەبەر ئەوەش دەنگێکم دەردەخست و ڕەشەو کورتە بالاّ پیرەکە دەهاتن و لەسەر ملی منەوە تەماشای ئەو شتە دەرئاساییەیان دەکردوا من سەرم لێی سووڕماوە، منیش خۆمم بۆ ڕانەدەگیراو باسم بۆ دەکردن دەمگوت کە :"ئەم سوورە، هەرئەو سوورایيیە وا(میرزا بابا ئیمامی تەورێزی) لەگەڵ خۆیدا وەکوو ڕاز بردوویەتییە قەبر. گویٚ چمکی قاڵبییەکەوئیشارەتی سەر سووریی (قزڵباش) لەسەر کلاٚوەکەی شای سەفەوی و عەباکەی ئەو کوڕە جوانەشی بۆیاخکردووە . خودا ئەو ڕەنگە سوورە جوانەی لە دونیادا داناوە و لەدڵی بەردەکان و جەستەی حەشرەدا شاردوویەتیوە بۆ ئەوەی کە بەدوایدا بگەڕێین و بیدۆزینەوە، ئەم ڕەنگە دەرەوەی ڕژاندنی خوێن لە هیچ جێگایەکیتردا نابینرێت مەگەر لەسەر ئەو قوماشانەی وا دەستکردی مرۆڤە و لەسەر وێنەی وەستا گەورەکان نەبێت " و ئەوەشم پێزیاد دەکرد "شوکرو سوپاس بۆئەوەی وا ئێستا ئەمەمان پێنیشاندەدات " زۆردواتر خۆمم نەگرتەوەو وتم :"سەیری ئەمە بکەن"و چەند وێنەیەکم نیشاندان کەباسی ئەوین و دۆستایەتی و بەهارو خۆشییان دەکرد و شایستەی ئەوە بوون کە بخرێنە ناو هەرکتێبێکی غەزەلەوە . تەماشای درەختەکانی بەهارمانکرد کەوا پەل و پۆی کردبووەوەو سەیری درەختی سەروی باخچەیەکی وەکوو بەهەشتمان کرد کە عاشقان بەخۆشییەوە شەرابیان دەخواردەوەو لەوێدا شیعریان دەخوێندەوە، ولەم نێو بۆنی تۆزو کەڕووی ئەم ژوورەی خەزێنەدا وەکوو ئەوەمان لێهات کەبۆنی نەرمی لاشەی عاشقە

دڵخۆشەكان و گوڵەكانمان كردبێ . وتم:"سەیری جەنجاڵی لای دارە سەرەوەكەی پشتی عاشقەكان بكەن وا ئەو وێنەكێشە كێشاویەتی كەلە دڵەوە دەستی عاشقان و پێ ڕووتە جوانەكانیان و ناسكۆڵەیی ڕاوەستاندنەكانیان و دڵخۆشی ئەو پەلەوەرانەی كێشاوە كەلە دەوروبەریاندا هەڵدەفڕن ! ئەمە وێنەی (لوتفی بوخارایيە)، لەبەربەدخۆیی و بەر سروشتی خۆی هەموو وێنەیەكی بە نیوە ناتەواوی دەهێشتەوەو دەیگوت ئەم پاشا یان ئەو خان لە وێنە تێناگات و لەگەڵیاندا شەڕی دەكردو لە دوایيدا ئەم شارەو ئەو شاری دەكرد و دەچووە لای ئەم پاشاو ئەو خان و ... تا وەكوو لەكۆتاییدا دەچێتە وێنەكێشخانەی خانێكی نادیاركە بەسەرهەرێمێكی بچووكدا حوكمی دەكرد و لەوێ دەمێنێتەوە و دەڵێ لەوانەیە كەهەرێمەكەی ژێر دەسەڵاتی ئەم خانە كەم بێ بەڵام لە وێنەكێشان تێدەگات و بیست و پێنج ساڵی كۆتایی تەمەنی لەوێ تێپەڕدەكات . ئەمڕۆ بەگاڵتەوە باسی ئەوە دەكەن كە نەیزانیوە داخۆ ئەم خانە كوێر بووە یان نا؟" زۆر دواتر لەوە نیوە شەوەدا وتم: "چاوتان بەم لاپەڕە دەكەوێ ؟" ئەمجارە هەردووكیان بەمۆمدانەكەی دەستیانەوە بە هەڕاكردن هاتن . وتم : "ئەم كتێبە لە هەراتەو تاوەكوو ئێرە و لەزەمانی كوڕەزای تەیموورەو تاوەكوو ئێستا دە خاوەنی گۆڕیوە " هەرسێكمان پێكەوە ئیمزاكانی گۆشەی لاپەڕە نووسراوەكەو بەناوپێشكەشكردنەكان و ڕستەكانی مێژوو وناوی سوڵتانەكانمان بە هاوێنەكەی من گەورەكردەوەو خوێندەوە كە لەژیانی ڕاستیدا شەڕی یەكیان كردووە و یەكیان سەربڕیوە : ئەم كتێبە بەیارمەتی خودا لە ساڵی (840 ) ی كۆچیدا بەدەستی (سوڵتان وەلی) خۆشنووسی كوڕی موزەفەری هەراتی وە بۆ (عیسمەت و دونیا) (عصمت

الدنیا) ی ژنی (موحەممەدی جووکی سەرکەوتوو)ی برای دەسەڵاتداری دونیا (بایسونگور) لە هەراتدا دروستکراوە . دواتر ئەوەمان خوێندەوە کە ئەم کتێبە گەیشتۆتە دەستی(سوڵتان خەلیلی ئاککویونلویی) و دواتر کەوتۆتە دەستی (یاقووب ئاغای) کوڕی و لەویشەوە گەیشتۆتە سوڵتانەکانی ئوزبەك لە باکوروو هەریەك لەوان خۆی بە کتێبەکەوە خەریك کردووە و یەك دوو وێنەی دەرخستووەو یەك دوانیشی پێ زیادکردووە و بەویستەوە وێنەی ژنەکانی خۆیان تێدا نەخشکردووە و بە شانازییەوە ناوی خۆیان لە پێشەکییەکەیدا نووسیوە، دواترگەیشتۆتە دەستی سام میرزای برای شا ئیسماعیل کە خانی هەرات بووە، ئەویش پێشکەشکردنە بە ناوەکەی دەگۆڕێ و پێشکەشی براکەی خۆی دەکا . شائیسماعیل ئەم کتێبە لەگەڵ خۆیدا دەبات بۆ تەورێزو جوان جوان بۆهەدیە ئامادەی دەکات و پێشکەشکردنەکەی دەنوسێتەوە بەلاّم کەسوڵتان یاوز سەلیم (جێگای بە بەهەشت بێ) لەشەڕی (چالدران)دا شکستی دەدات، کۆشکی (هەشت بەهەشتی) لە تەورێز تالاّندەکرێ و ئەم کتێبە بەدەستی سەربازەکانی عوسمانیوە لەبیابان و چیاو چۆمەوە دەهێنرێتە خەزێنەکەی ئەستەنبووڵ .

ئایا ڕەشەو پیرە کورتە بالاّکە چەندە لە جۆش و خرۆشەکەی من تێدەگەن ؟ چەندە لاپەڕەی کتێبەکانم هەڵدەدایەوە لە قولاّیی دڵمەوە هەستم بە خەمێکی زۆر بەرامبەر چارەنووسی ئەو سەدان وێنەکێشە دەکرد کەوا هەریەك خەڵکی شارێکی گەورە یان بچوك بوون و سرشت و ڕەچەڵەکیان جیاوازبووەو خزمەتی پاشاو خان و ئاغایەکی غەداریان کردووە وچاوەکانی خۆیان کوێر کردووەو هونەریان نیشانداوە . کاتێك لاپەڕەکانی کتێبێکم هەڵدەدایەوە کەباسی شێوارزە سەرەتاییەکانی ئەشکەنجەی دەکرد،

بەشەرمێکەوە لێدانخواردنەکانی کاتی شاگردی و سووربوونی گوپەکانمان لەبەرزەربەکانی ناوەوەی جەدوەل و ئازارەکانی لێدانی سەرە تاشیاوەکانمان بەمۆرە مەڕمەڕنیەکانم دەهاتەوە یاد، نەمدەزانی ئەم کتێبەی وا بەپارەی گەشتیارە فەرەنسییەکان و بەدەستی چەند وێنەکێشێکی بێشەرەفەوە کێشراوەو لەباتی ئەوەی ئەوە نیشانبدات کەئەشکەنجە بۆ پێکهێنانی عەدالەتی خودا لەژێر فەرمانی قازیدا شتێکی ڕەوایە، ئەوەی نیشانداوە کەئێمە چەند غەدارو بێبەزەیین، لێرەداو لە خەزێنەی عوسمانییەکاندا چیدەکات؟ بەلاّم من لە ئەو فەلاقەو لێدان و چوارمێخەکێشان و قامچیلێدان و هەڵواسین و بزمارلێدان و خنکاندن و قوڕگبڕین و کردن بە خواردنی سەگی برسی وخستنە ناو ئاوی ساردو ڕنینی پرچ و شکاندنی پەنجەکان و گرتنەوەی پێست و لووت بڕین و دەرهێنانی چاوو ئەشکەنجە لەوجۆر شەرمم کردو هەستم بەوە کرد کە مەگەروێنەکێشێکی وەکوو ئێمە کەلە تەواوی سالاّنی شاگردیدا فەلاقەکراوەو لێدراوەو لەبەرخراپ کێشانی جەدەولێك لەلایەن وەستایەکی تووڕەوە مشتی لێدراوەو شەیتانەکەی دەروونی مردبێ و بووبێ بە جندۆکەی نەخش، لە کێشانی وێنەی ئەشکەنجەکردن دڵخۆش ببێ و وەکوو بۆیاخکردنی کۆلارەی یاری مندالاّن ڕەنگیان بکات . هەندێك کەسی دیکەش وەکوو چۆن سەیری وێنەی ناو کتێبەکان دەکرێ، تەماشای دونیای ئێمەش دەکەن و دەیانەوێ خۆیانی لێ نێزیك بکەنەوەو لێی تێبگەن، بەلاّم لەبەر ئەوەی سەبریان نیە، بڕواناکەم لە هەستی شەرمکردن و خۆشی و ئازارە قوڵەکانی من لەناو ئەم ژوورە ساردەی خەزێنەدا تێبگەن . کاتێ پەنجە پیرەکانی دەستم کەلەبەر سەرما هەستیارییەکەی خۆیان لە دەست دابوو،

لاپەڕەکانیان هەڵدەداوە، هاوێنە دەسک سەدەفینە برنجەکەم و چاوی چەپم وەکوو لەق لەقێك کە تەواوی دونیای ببینیبێ بەسەریاندا باڵیاندەداو بە بێئەوەی کە بێزاربن دیسان بەسەر سووڕماوییەوە تەماشای دیمەنەکانیان دەکردو بە دوای شتێکی تازەدا دەگەڕان.

کاتێ لە ڕووی ئەو لاپەڕانەی وا ساڵانێکە نیشانی ئێمە نەدراون و تەنیا ئەفسانەی زۆریانم بیستبوو، تێگەیشتم کە کام وێنەکێش لە کوێوە چی نێو بووە و ئەو شتەی وا ئەمڕۆ بە شێوازی تایبەت ناوی لێدەبرێ یەکەم جار لە لایەن کام وێنەکێشخانە و لە ژێر سەرپەرەشتی کام پادشادا دەرکەوتووە و کام وەستای ئەفسانەیی لە خزمەتی کێدا ئیشی کردووە و بۆ نموونە کاتێ کە دەمزانی ئەو هەورە چین چینیانەی وابە نەریتی چینی دەکێشرێ و ئێمە زاماندەزانی کە لە ڕێگای هەراتەوە هاتۆتە وڵاتی ئێران، لە قەزوێنیشدا بەکار براوە ، لەبەر خۆمەوە (وای ! ) یەکی ماندوم هەڵدەکێشا ، بەڵام لەبەر ئەوەی شەرمتان لێدەکەم باسی ئەوەتان بۆ ناکەم کە ئەو ئازارەی وا دەیکێشم لەبەر ئەو وێنەکێشانەیە وا ڕوخساریان وەکوو مانگە و لە ساڵانی شاگردیدا ئەو ڕوومەتەیان بە دەستی وەستاکانیانەوە ڕووکاوە و بە باڵانەمامییەکە و چاوە ئاسکەکانیان و جوانییەکانیانەوە بۆ کێشانی وێنەلە دڵەڕاوکێدا بوون و پەشۆکاون و لەگەڵ هەموو بچووک دیتن وسەرزەنشتێك کە بەرامبەریان کراوە بە گەرمایی و هیواوە لە وەستاکانیان و عەشقی هاوبەشی نەخش کێشانەوە نزیك بوونەتەوەولە کۆتاییدا لەبیر کراون و کوێراییان داهاتووە . لەبەر ئەوەی ساڵانێکی زۆر وێنەی شەڕ و شاییم بۆ پادشا کێشاوە ، ڕۆحم بە خەفەت و ئازارەوە ڕۆیشتە ناو دونیای ئەو هەستە جوان و ناسکانەی وا وێنەیان دەکێشرێت .

له كتێبێكیتردا چاوم به كوڕێكی لێو سووری كەمەر باریكی عەجەم( ئێرانی ) كەوت كەوا ئەویش وەكوو من كتێبێكی گرتبوو بە باوەشەوە ، لەو كاتەدا ئەوەم بیر كەوتەوە كە ئەو شتەی وا پادشا تەماكارە زێڕ و دەسەڵات دۆستەكان لەبیریان چووە ئەوەیە كە هەموو جوانییەكانی ئەم دونیایە هی خودایە . لە لاپەڕەیەكی كتێبێكیتردا چاوم بە وێنەی جوانی دوو گەنجی دەرئاسایی كەوت كە عاشقی یەكبوون ، وەستایەكی گەنجی ئەسفەهانی ئەمەی كێشابوو ، عەشقی وێنەی شاگردە گەنجەكانی خۆم وەبیر كەوتەوە و بە چاوێكی فرمێسكاوییەوە دیسان سەیرم كردەوە . كچێكی باڵا نەونەمامی لێو گێلاسی،چاو بادامی و جامۆڵكە لووت، قۆڵی كوڕێكی وەكوو خۆی پێ بچووك و لاشە ڕۆشن و ناسكۆڵە و بێبازووی هەڵماڵی بوو. لاشەی جوانی ئەم كوڕە هەستی ماچكردن و مەرگی لە دەروونی مرۆڤدا زیندوو دەكردەوە ، لە دواییدائەم جوانكیلیە بۆ ئەوەی هێزی عەشق و گرێدانەكەی خۆی بە كچەكە نیشانبدات ، بە ئاگری نێوان دەستەكانیەوە خۆی دەسووتێنی و وەكوو ئەوەی تەماشای سێ گوڵ بكات تەماشای سێ ئیشارەتی عەشق دەكات . بە شێوەیەكی سەیر دڵم خێراتر دەستی بە لێدان كرد . حەفتا ساڵ بەر لە ئێستا لە كاتی شاگردیمدا چاوم بە وێنە نیوە ڕوتەكانی كوڕە لاشە مەڕ مەڕینەكان و كچە ناسكۆڵە مەمك بچكۆڵەكان كەوتبوو كە بە شێوەی ڕەشایی قەڵەم كێشرابوون و لە تەورێزەوە هاتبوون ، وردە وردە دڵۆپەكانی عارەقی لەشم لە سەر تەوێڵم كۆ بوونەوە و ئەو كاتەم هاتەوە یاد كە چەند مانگ دوای ژن هێنان و بوون بە وەستا ، كوڕێكی جوانی فریشتە ڕوخساری چاو بادامی ، لاشە گوڵینیان بۆ شاگردی هێنایە لام و منیش هەستم بە قولایی بیروعەشقی وێنە كێشان كردبوو . بۆ ماوەیەك هەستم

بەوە کرد کە وێنەکێشان پەیوندی بە شەرم و خەفەتەوە نیە بەڵکوو گرێدانی بەو داخوازیە هەیە وا ئێستا لە دەروونم دایە ، ئەم داخوازیە لە سەرەتادا هونەری وەستای وێنە کێش بەرەو لای عەشقی خودا دەبا و عەشقی خوداش دەگۆڕێتەوە بۆ عەشقی ئەو شتانەی وا لە دونیادا دەیان بینیٚ ، ئەم هەستەم بە شێوەیەك بوو کە بە تەختەکەی باوەشمەوە دانیشتم و بیرم لە هەموو  ئەو لێدانانەی کاتی شاگردیم و بە بڕیار بوونم لە سەر کوێرای داهاتنم لە بەر وێنە کێشان وەکوو تامی سەرکەوتنێکی پڕ لە خۆشی کردەوە . وەکوو ئەوەی تەماشای شتێکی قەدەغە بکەم بۆ ماوەیەکی درێژ بە بیٚ دەنگیەوە تەماشای ئەم وێنەیەم کرد . زۆر دواتریش هێشتا هەر تەماشام دەکرد کە دڵۆپە فرمێسکێك لە چاوەکانم دابڕاو بە سەر گۆنامدا شۆڕ بووە وە و تێکلاوی ڕیشەکانم بوو . کاتیٚ کە چاوم بە یەکێك لەو مۆمدانانە کەوت وا بە هێواشی لەناو ژووری خەزێنەدا دەگڕی و بەرەولای من دێت کتێبەکەم دانا و لەخۆمەوە یەکێك لەو کتێبانەم هەڵگرتەوە کە ماوەیەك بەر لە ئێستا کورتە باڵاکە لە تەنیشتمەوە داینا بوو . ئەمەش کتێبێکی تایبەت بوو کە بۆ پاشاکان ئامادە کرابوو :

لە سەوزەڵانیەکدا چاوم بە دوو ئاسکی عەشق کەوت کە چەقەڵەکان وەکوو دوژمن سەیریان دەکردن و بەخیڵییان پیٚ دەبردنەوە . لاپەڕەکەم هەڵداوە " هەندێك ئەسپی ئاڵم بینی کەوا تەنیا وەستا هەراتیەکان دەتوانن بیانکێشن ، چەندە جوانیش بوون !" لاپەرەکەم هەڵداوە "چاوم بە وێنەی میرزایەك کەوت کەوا  بە خۆ متمانەیەکەوە دانیشتبوو ، وێنەیەکی حەفتا ساڵان بوو ، خۆی لە خۆیدا نەمدەتوانی لە ڕووی ڕوخساریەوە بزانم ئەمە کێیە چونکە لە هەموو کەسێك دەچوو . خەریك بوو بڵێم... کە هەوای

وێنەکە و ڕەنگکردنی ڕیشی کابرا بە چەند ڕەنگێك هەندێك شتی وەبیر هێنامەوە . دڵم تونتر لێیدەدا ، دەستە دەرئاسایەکی ناو وێنەکەم ناسیەوە. تەنیا وەستا گەورە بەهزاد دەیتوانی بەمجۆرە دەست بکێشێت . وەکوو ئەوە وابوو کە لە وێنەکەوە نورێك بە سەر دەم و چاومدا پژابێت. چەند جارێك لەمەوپێش وێنەکانی وەستا بەهزادم بینی بوو ، بەڵام دەبێ لەبەر ئەوەی کە لەگەڵ وەستاکانیتردا تەماشام کردوون و لەوەش دڵنیا نەبووم کە ئەمانە وێنەی وەستا بەهزاد بن ئاوەها چاوم بریقەی نەداوەتەوە .وامدەزانی کە تاریکاییە قورسەکەی ژوورە بۆنی کەڕووداره‌کەی خەزێنە ڕۆشن بووەتەوە . وێنەی ئەم دەستە جوانەم لەگەڵ ئەو قۆڵەیوا بە ئیشارەتی عەشقەوە داخکرا بوو و ماوەیەك بەرلە ئێستا بینیبووم ، لەمێشکمدا هێنایە پاڵ یەك . و سوپاسی خودام کرد بۆ ئەوەی وا بەرلە مردن ئەم وێنە جوانانەی پێنیشان داوم . چۆنم دەزانی کە لە ماوەیەکی کورتدا کوێر دەبم ؟ نازانم ! بۆ ماوەیەك هەستم بەوە کرد کە دەتوانم هەست و بۆ چوونەکانم بەو ڕەشەیەی بڵێم وا بە مۆمدانەکەی دەستیەوە لە دوامەوە تەماشای ئەو وێنەی دەکرد کەوا من سەیرم دەکرد ، بەڵام شتێکیتر لە دەمم دەرکەوت . وتم : " تەماشای جوانی ئەم دەستە بکە ، هی بەهزادە . " وەکوو ئەوەی وا حەزی لێدەکەم مەچەکی دەمار دار و پان بوو . لە کاتی جوانیدا دەستی شاگردێکم دەخستە ناو دەستی خۆمم و و بەر لەوەی پێی بڵێم کە چۆن فڵچەکەی بگرێ بە دەستەوە بە حەز و خۆشەویستیەوە تەماشای نێو ئەو چاوانەیم کرد کە دەترسان . وەها تەماشای ڕەشم کرد . لە بەر ڕۆشنایی بڵێسەی مۆمەکانی مۆمدانەکەی دەستیەوە چاوم بە گلێنەی چاوی کەوت . وتم :" ئێمەی وێنەکێش ، هەمووان برای یەکین ،بەڵام ئێستا هەموو شتێك

تەواو دەبێ "

- " چۆن ؟ "

بە ڕەشەم گوتبوو کە ، وەکوو چۆن وێنە کێشێك کە سالآنێك خزمەتی خاقانێك یان شازادەیەکی کردبێ و لەو وێنەکێشخانەکەیدا بە نەریتی وەستا کۆنەکان شتانی دەرئاسایی خو لْقاندبێ بووبێ بە هۆی ئەوەی کە ئەم وێنەکێشخانەیە شێوازێکی تایبەت بە خۆی هەبێ ، لە کاتێکدا کە پارێزەرەکەی یانی خاقانەکە لە شەڕدا شکست دەهێنێ دەزانێ کە وێنە کێشخانەکەی بە دەستی ئەو گەورە پیاوانەی وا لە دوای سەربازە پیرۆزەکانەوە بۆ تالآنکردن دێنە ناو شار ، لە ناو دەبرێ و بەرگەکان خراپ دەکرێن و لاپەڕەکان تێکەڵ وپێکەڵ دەکرێن و ئەو شتە بچووکانەی وا ئەو لە نەخشەکێشاندا بڕوایان پێدەکات و حەزیان لێدەکات ،بچووك دەبینرێن و خراپ دەکرێن ، ئەو کاتە دەلێ : " ئێستا هەموو شتێك تەواو دەبێ "، و دەیەوێ کۆێرببێ . دەبووایە ئەمانەم بەمجۆرە بۆ ڕەشە باس نەکردبایە .

گوتم : " ئەم وێنەیە وێنەی شاعیری گەورە( عەبدولآی هاتیفی ) یە . ئەم کابرایە ئەوەندە شاعیرێکی گەورەیە کە کاتێك شا ئیسمائیل دەچێتە هەرات وهەر کەس ماستاو چێتی بۆ دەکات ، ئەو ناچێت و شا ئیسماعیلیش ناچار دەبێ کە بچێ بۆ ماڵەکەی لە دەرەوی شار . لە ڕووی ئەو ڕەسمە تێناگەیین کە ئەمە وێنەی هاتیفیە بەڵکو لە نووسراوەکەی ژێر ڕەسمەوە تێدەگەین ، وانیە ؟ " ڕەشە بە چاوە جوانەکانیەوە تەماشای منی کرد و وتی : " بەڵێ "

وتم :" کاتێ کە تەماشای وێنەی ڕوخسارەکە دەکەین وادەزانین ئەمە دەتوانێ ڕوخساری هەرکەسێك بێ ، ئەگەر خوالێخۆشبوو عەبدۆلآ هاتیفی

ئێستا لێره بایه، نه‌مانده‌زانی که ئه‌مه وێنه‌ی ئه‌وه به‌ڵام له هه‌وای وێنه‌که‌دا و له‌و ده‌سته جوانه‌ی وا وه‌ستا به‌هزاد کێشاویه‌تی و له ڕه‌نگه‌کاندا و له جوانکاریه‌کاندا شتانێك هه‌ن که ده‌بن به  هۆی ئه‌وه‌ی که مرۆڤ یه‌کسه‌ر تێبگات ئه‌مه وێنه‌ی شاعیرێکه ، چونکه له وێنه‌ی ئێمه‌دا مانا له پێشه‌وه‌ی ڕوخسار دێت . ئێستاش له‌و کتێبه‌ی وا پادشاکه‌مان به زاواکه‌تانی ڕاسپارد بوو ، به لاسایی کردنه‌وه‌ی‌نه‌ریتی وێنه کێشه فه‌ره‌نسی و ئیتاڵییه‌کان ڕوخسار ده‌که‌وێته پێش ماناوه ، به نه‌ریتی فه‌ره‌نسییه‌کان ... "

ڕه‌شه به‌بێ‌ئه‌ده‌بییه‌که‌وه وتی : " زاواکه‌م ، خوالێخۆشبوو ، کوژرا . " وه‌کوو شاگردێك که‌ئاماده‌ی خوڵقاندنی شتانی نائاسایی بێت ، ده‌ستم هێنا به ده‌ستی ڕه‌شه‌دا و  نه‌وازشم کرد . بۆ ماوه‌یه‌ك به بێده‌نگی ته‌ماشای وێنه‌که‌ی به‌هزادمان کرد . له دواییدا ڕه‌شه ده‌ستی له ناو ده‌ستم ده‌رکێشا و وتی : " به‌ر له‌وه‌ی به‌باشی ته‌ماشای وێنه‌ی لمۆزی ئه‌سپه‌کانی لاپه‌ڕه‌ی پێشوو بکه‌ین ، تێپه‌ڕ بووین . "

وتم : " هیچ شتێکی تێدا نیه . " و بۆ ئه‌وه‌ی که ببینێ لاپه‌ڕه‌که‌م هه‌ڵدایه‌وه : هیچ شتێکی نائاسایی به‌سه‌ر وێنه‌ی لمۆزی ئه‌سپه‌کانه‌وه نه‌بوو . ڕه‌شه وه‌کوو منداڵێك پرسیاری کرد وتی : " ئه‌ی که‌ی ئه‌سپه لمۆز سه‌یره‌کان ده‌دۆزینه‌وه؟ "

کاتێك که له نیوه شه‌ودا من و کورته باڵاکه شاهنامه ئه‌فسانه‌ییه‌که‌ی شا تاماسووبمان له ژێر قوماشی سه‌وز و ته‌تڵه‌سی ناو سندوقێکی ئاسنیندا دۆزیوه ڕه‌شه له‌سه‌ر قاڵییه‌کی سووری خزمه‌تکارێکدا سه‌ری نابووه سه‌ر سه‌رینێکی مه‌خمه‌ڵین و خه‌وتبوو . که‌چی کاتێك ئه‌م کتێبه

ئەفسانەییەم دۆزیوە تێگەیشتبووم کە بۆ من تازە ڕۆژ دەستی پێکردووە . ئەوەنە گەورە و قورس بوو کە من و جەزمی ئاغا بە زۆر توانیمان هەڵیبگرین و دەریبهێنین .

کاتیٚ دەستمدا بە بەرگی ئەو کتێبەی وا بیست و پێنج ساڵ بەر لە ئێستا لە دوورەوە چاوم پێکەوتبوو زانیم کە پێستی بەرگەکە تەختەی تێدایە . بیست و پێنج ساڵ بەر لە ئێستا کاتێك سوڵتان سولەیمانی قانوونی کە سیٚ جار تەورێز داگیر دەکات ، دەمریٚ ، شا تاماسوب باری دەیان وشتر هەدیە و قورئانێکی کەریم و ئەم کتێبە جوانەی ناو خەزێنەکەی خۆی بە دیاری بۆ سوڵتان سەلیم دەنێریٚ . ئەو کاتەی کە سێسەد کەسە نێردراوەکەی شا تاماسووب و بارە وشتر و هێسترەکان دەگەنە ئەستەنبووڵ ، پاشاکەمان ڕۆیشتبوو بۆئەدیرنە بۆ ڕاوی زستانان ، ئەو کاتە سەرۆکی وێنەکێشان مەمیەرەش و ئێمەیانی سیٚ وەستا گەنجەکەی ڕۆیشتین بۆ تەماشا کردنی ئەم کتێبە . وەکوو ئەو ئەستەنبووڵیانەی بە هەڕا کردن دەڕۆیشتن بۆ تەماشاکردنی فیلێکی هیندوستانی یان وەکوو زەڕافەیەکی ئافریقایی ، ئێمەش بە خێرایی بەرەو کۆشك دەڕۆیشتین ، ئەو کاتانە ئەوەم لە وەستا مەمیەرەش بیستبوو کەلەبەر ئەوەی کاتێك وەستا بەهزاد لە هەراتەوە دەچێت بۆ تەورێز کوێر بووە ، دەستی لەم کتێبە نەداوە و وێنەی تێدا نەکێشاوە . تەماشا کردنی کتێبێك کە دووسەد وپەنجا ساڵ وێنەی گەورەی تێدایە بۆ کەسێکی وەکوو ئێمەی وێنە کێشی عوسمانی کە لەبەرامبەر کتێبە سادە حەوت هەشت ڕەسمییەکاندا سەرسام دەبووین وەکوو ئەوە وابوو لە کاتێکدا کە هەموو کەسێك خەوتبیٚ بەناو کۆشکدا بگەڕێین . بەبیٚ ئەوەی بڕوا بکەین و وەکوو ئەوەی کە تەماشای باخچەکانی بەهەشت بکەین

کەوا لە ئەنجامی موعجیزەیەکدا لە ماوەیەکی کورتدا لەبەر چاومان دیار بووە ، سەیری لاپەڕە دەوڵەمەندەکانی کتێبەکەمان کرد بوو . بیست و پێنجساڵی دوای ئەوەشمان بە قسە کردن لەسەر ئەو کتێبە بەسەر برد والە ناو خەزێنەدا کلیلی لەسەر دراوە .

لەدوای بیست و پێنج ساڵ وەکوو ئەوەی کە دەرگای کۆشکێك بکەمەوە ، بە بێدەنگییەوە بەرگە ئەستوورەکەی ئەم کتێبەکەم کردەوە ، بەڵام کاتێك کە خشەخشی ئەو لاپەڕانە دەهاتە بەرگوێم واهەڵمدەدانەوە ، لەوەی زیاتر کە خۆشحاڵ ببم ، تووشی خەفەت و ناڕەحەتی بووم .

1- لەبەر ئەو قسەوباسانەی وا دەیانگوت وەستا ئەستەنبووڵییەکان هەریەکە و شتێکیان لەم کتێبە دزیوە و بەکاری دێنن ، سەرەنجم نەدایە سەر وێنەکان .

2- لەبەر ئەوەی بە وردی تەماشای پێنج شەش ڕەسمی نائاساییم دەکرد ( لە دواییدا تاهموراس چەندە بە جوانی و بە ناسکی گورزەکەی لەسەری ئەو شەیتان و دێوانەداوە کە ئەلف و بێی یۆنانیو زمانە کانیتری پێ٘فێر دەکەن ! ) بەڵکوو لە گۆشەیەکیدا چاوم بە دەستێکی جوان بکەوێ٘ کە بەهزاد کێشاویەتی ، نەمدەتوانی سەرەنج بدەمە سەر شتیتر .

3- لمۆزی ئەسپەکان و هەبوونی ڕەشە و کورتە بالأکە ئاستەنگبوون لەبەردەم ئەوەی وا بەوردی تەماشای وێنەکان بکەم . ئەوەی کە لەباتی دڵدا بە چاوی عەقڵەوە تەماشای ئەو کتێبەی دەکەم وا   خودا بەرلەوەی ئەو تاریکاییە مەحمەڵێنەی کە وەکوو خێری خودا دێتە پێش چاوی هەموو وێنە  کێشێك بێتە پێش چاوی من ، مەجالی سەیر کردنی پێداوم ، خۆی شتێك بوو کە خەفەتباری دەکردم . تاوەکوو ئەو کاتەی کە ڕووناکی بەیانی

**گەیشتە ناو ئەم ژوورە ساردەی خزێنەکە هەرچی دەچوو لە قەبرستان دەچوو ، تەماشای دووسەد و پەنجا و نۆ ( دوسەو پەنجانیە ) وێنەی ناو ئەو کتێبەم کرد بوو . بە عەقڵەوە تەماشام کرد بوو: باوەکوو ئەو زانا عەرەبانەی وا هیوایەتیان عەقڵە، جیاوازیان بکەمەوە و بڵێم :**

**1- لەنێو وێنەی ئەسپە ڕەنگا و ڕەنگەکانی ئەو کاتەی ڕۆستەم لەتوراندا ئەسپ دزەکان ڕاوەدوودەنێت و ئەو ئەسپانەی وا کاتێك شای عەرەبەکان ڕێگا بە فەرەیدوون نادات،و ئەویش بە مەلەکردن لە ئاوی دیجلە دەپەڕنەوە و وێنەی ئەو ئەسپە دەشتییانەی والە کاتێکدا تور لەبەر ئەوەی کە باوکی ئیرەجی لەوڵاتە جوانەکەی ئێران داناوە و ئەویشی لە وڵاتێکی ئاسیای دوور ( لەچین ) بەجێهێشتووە ، بە ناپیاوی سەری ئیرەجی برای دەبڕێ ، بە چاوێکی خەماوییەوە سەیری سرە بڕاوەکەی ئیرەج دەکەن و لە وێنەی ئەسپەکەی سوپا قارەمانەکەی ئەسکەندەر کە هازارەکان و میسرییەکان و بەربەرییەکان و تازییەکان پشتیوانی لێدەکەن و وێنەی ئەو ئەسپە ئەفسانەییەی وا بە ئاوەکەی خۆیلووتی یەزدگرد چاك دەکاتەوە کەلەبەر ئەوەی خودا چارەیەکی ڕەش و خەماوی پێداوە دەستی بە سەرهەڵدان لە بەرامبەر خودا کردووە و لەدواییدا ئەو ئەسپە لە کەناری گۆمە شینەکەدا بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراو و بە عەداڵەتی خودا دەکوژرێ و لە نێو سەدان وێنەی شەش حەوت وێنەکێشی لێهاتوودا چاوم بە ئەسپێکی لمۆز سەیر لە وێنەی لە وێنەی لمۆزی ئەو ئەسپانە نەکەوت وا پیاو کوژە ناپیاوەکە کێشاویەتی ، بەڵام بۆ ئەوەی تەماشای کتێبەکانیتری ناو وێنە کێشخانەکە بکەم لە ڕۆژێك زیاتر مۆڵەتم ماوە .**

2– ئەوە بیست و پێنج ساڵە لەناو وێنەکێشاندا ئیدعا و قسە و باسێك هەیە : وێنە کێشێك بە مۆڵەتی تایبەتی پاشاوە هاتۆتە ناو ئەم خەزێنەیە و ئەم کتێبە دەرئاساییەی دۆزیوەتەوە و لەبەر مۆمدا وێنەیتری لە ڕووی وێنەی ئەسپ و درەخت و هەور و گوڵ و باخچە و پەلەور و شەڕ و خۆشەویستی ناو ئەم کتێبە لە نێو دەفتەری نموونەکانی خۆیدا کێشاوەتەوە و لە دواییدا کەڵکی لێوەرگرتوون... لە دواییدا ئەگەر کەسێك وێنەیەکی جوانی بکێشابایە و ئەوانیتر بەخیلییان پیٚ ببردایە ئەمەیان لەسەر دەگوت و دەیانگوت : کاری عەجەمانە ، لە تەورێزەوەیە ، و بەمانە بچووکیان دەکردەوە . ئەو کاتانە تەورێز بەشێکی وڵاتی پاشاکەمان نەبوو . کاتێك ئەم تۆمەتەیان دەخستە پاڵ من بە تووڕەییەکی ڕەواوە هەستم بە شانازی دەکرد ، بەڵام کاتێك کە لەسەر کەسێکیتر دەگوترا بڕوام دەکرد . ئەمڕۆ لەدوای بیست و پێنج ساڵ بە شێوەیەکی سەیر و بە خەفەتەوە تێگەیشتم کە لەدوای ئەو کاتەی وا ئێمە چوار کەسی تەماشای ئەم وێنانەمان کرد بوو، سەرەتا لە مێشکماندا نەخشمان کردوون و لە دواییدا بە گۆڕانکاری لە کتێبی پاشاکاندا دووبارە ئەوانەمان کێشاوەتەوە .

خەمم بۆ ئەوە نەدەخوارد کە پاشاکان ئەمجۆرە کتێبانە ناخاتە بەر دەستمان بەڵکوو لەبەر ئەوە ناڕەحەت دەبووم کە بۆ چی دونیای وێنە کێشانی ئێمە ئەوەندە بچووکە . چی وێنەکێشە کۆنەکانی هەرات بن و چی ئەوانەی تازە کاری قەزوین بن، ئەوەی ڕاستی بێت ، ئەوان لە ئێمە باشتر ( وێنەکێشە عوسمانییەکان ) وێنەیان کێشاوە .

بۆ ساتێك وەها بیرم کردەوە کە ئەگەر دووبەیانی من و وێنە کێشەکانم ئەشکەنجە بکرێین باش دەبێت و لە دواییدا بیٚبەزەییانە بە نوکی قەڵەم

تراشەکەم ڕوخساری وێنەکەی بەر دەستم ڕووکاند . ئەمە وێنەی بەسەر هاتی ئەو زانا عەجەمەیە کە تەماشای تەختەی داماکە دەکات و فێری یاری شەترەنج دەبێت و کاتێك کە فێر دەبێت لە وەستا هیندییەکەی دەباتەوە ! درۆی عەجەمی ! یەك بە یەك ڕوومەتی ئەوانەی وا یاری دەکەن و ئەوانەش وا سەیریان دەکەن و چاو و ڕوخساری پاشاکەشم ڕووکاند . لاپەڕەکانم بەرەو دواوە هەڵداوە و وێنەی ئەو پاشایانەی وا بێبەزەییانە پێکەوە شەڕ دەکەن و هی سەربازەکانی لەشکرە دیدەنییەکان لە نێو زرێکانیاندا و سەرە بڕاوەکانیانم بێبەزەییانە پاك کردەوە .

کاتیٚ کە سیٚ لاپەڕەم والێکرد ، قەڵەمتراشەکەم خستە بەینی پشتوێنەکەم . دەستەکانم دەلەرزان ، بەڵام هەستم بە خراپی نەدەکرد . ئایا ئێستا لە هەستەکانی ئەو کەسانە تێگەیشتم کە ئەم کارەیان کردووە ولەماوەی پەنجا ساڵ تەمەنی وێنە کێشیمدا لەگەڵیاندا ڕوو بە ڕوویان بوومەتەوە ؟ دەمویست لەو چاوانەی وا پاکم کرد بوونەوە خوێن بڕژێتە نێو کتێبەکە .

3- ئەمەش من دەهێنێتە ئەو کاتە دواییانەی تەمەنم وا تێیدا هەست بە ئازار و سەرە خۆشی دەکەم. وەستا بەهزاد قەڵەمی لەم کتێبە نەداوە کەوا شا تاماسووب لەماوەی دە ساڵدا بە قەڵەمی باشترین وێنەکێشەکانی وڵاتی عەجەم دروستکراوە . ئەو دەستە جوانانەی ئەو لە هیچ جێگایەکدا نەکێشرا بوون. ئەمەش ئەوەی پشتڕاست دەکردەوە کە بەهزاد لە کاتی کوێر بوونیدا لەو هەراتەی والە پێش چاو کەوتووە هاتووەتە تەورێز . بەمجۆرە بە خۆشییەوە جارێکیتر تێگەیشتم کە ئەو وەستایەی وا تەواوی تەمەنی کاری کردووە کاتێك کە گەیشتۆتە پلەی بیٚ کەمو کوڕی وێنە کێشە کۆنەکان ،

بۆئەوەی کە وێنەکەی خۆی تێکەڵاوی وێنە کێشخانەیەك و داخوازی پاشایەك نەکات خۆی کوێر دەکات.

لەو کاتەدا ڕەشە و باڵا کورتەکە بەرگێکی گەورەیان کردەوە و دایان نایە بەر دەستم .

بەبێ ئەوەی تووڕە ببم وتم : " نا ، ئەمە نیە ، ئەمە شاهنامەیەکی مەغولییە " ئەسپە ئاسنینەکانی سەربازە ئاسنینەکانی ئەسکەندەر لە نەفت پڕدەکەن و کاتێك ئاگری تێبەر دەدەن ، لمۆزەکانیان وەکوو چرایەك دەگرێت و بەو جۆرە هێرش دەکەنە سەر دوژمنەکانیان . " تەماشای وێنەی ئەم لەشکرە ئاسنینەی ناوئاگرمان کرد کەوا لە وێنەی چینییەوە دەرکەوتووە .وتم : " جەزمی ئاغا ! هەدیەکانی ئەو نێردراوانەی عەجەم کە ئەم کتێبەشیان هێنا بوو و ئێمەش لە دواییدا سەلیم نامەشمان کێشا بوو ... " . یەکسەر سەلیم نامەکەی دۆزیوە و هێنایە بەر دەستم. لەو لاپەڕەیەی وا پێشکەشکردنی هەدیەکان بە سوڵتان سەلیمی ڕەحمەتی بە جوانی ڕەنگکراوە ، لە نێو لیستی هەدیەکانیدا چاوم لە خۆیەوە شتێکی دۆزییەوە کەلەبەر ئەوەی ئەوسا بڕوام پێنەدەکرد لەبیرم چوو بوو ! ئەو دەرزییە زێڕینە دەسك سەدەف و فیروزە نەخشینەی وا وەستای و وەستایان بەهزادی هەراتی بۆ کوێر کردنی چاوی خۆی بە کاری هێناوە .

پرسیارم لە کورتە باڵاکە کرد کە سەلیم نامەکە لەکوێدا بووە . لە نێوان تاریکایی ژووری خەزێنەدا لە بەینی سندوقەکان و قوماش و کۆگای قاڵی و دۆڵابەکان و ژێر پلیکانەکانەوە ڕۆیشتین . چاوم بە سێبەرەکانی خۆمان کەوت کەوا گەورە و بچووك دەبوونەوە و دەکەوتنە سەر قەڵخان و شفرەی فیلەکان و پێستی پڵنگەکان . لە ناو ژوورێکدا لە ناو هەر ئەو ڕەنگە سوورە

سەیرەی قاڵی و قوماشەکاندا خنکا بوو لە پاڵی ئەو سندوقەی وا شاهنامەکەمان لەوێدا دۆزیبووەوە چاوم بە کتێبێکیتر و هەندێك لە هەدیەکانی شا تاماسووب و قاڵی ئاورێشمینی ئەسفەهانی و شەترەنجێکی شفرەی فیڵ کەوت و لە نێوان ئەو ڕووپۆشانەی وا بەزێڕ و زیو ڕازاندراونەتەوە و لە پاڵ بەردەکانی سەیلان و لە نێوان خەنجەرە بەرد یاقووتینەکاندا قوتویەکی قەڵەمم بینی  کە یەکسەر دیار دەبوو کە لە کاتی تەیمموورەوە ماوەتەوە .

قوتوەکەم کردەوە ، لەگەڵ بۆنی کاغەزی سووتێندرا و گوڵدا دەرزییە دەسك فیروزە و سەدەفینەکە دەرکەوت . دەرزییەکەم هەڵگرت و وەکوو سێبەر گەڕامەوە بۆ جێگاکەی خۆم . کاتیٚ تەنیا مامەوە ئەو دەرزییەم دەرهێنا وا وەستا بەهزا خۆی پیٚ کوێر کرد بوو و دامنایە سەر لاپەڕەکانی شاهنامە و تەماشام کرد . نەتەنیا ئەو دەرزییەی وا خۆی پیٚکوێر کرد بوو بەڵکوو هەر شتێك کە ئەو گرتبێتی بە دەستەوە منی دەهێنایە لەرزە .بۆچی شا تاماسووب ئەم دەرزییە ترسێنەرەی لەگەڵ هەدیەکاندا ناردووە بۆ سوڵتان سەلیم ؟ ئایا لەبەر ئەوەیە کە ئەم پاشایە لەدوای ئەوەی کە منداڵییەوە پەروەردەی نەخش کێشانی بینیوە و لە جوانیدا وێنەکانی ئەم وەستایەی بە دەست گرتووە تەماشای کردووە ، شاعیر و وێنە کێشەکان لە خۆی دوور دەکاتەوە و دەست بەنوێژ و پاڕانەوە دەکات ؟ ئایا دەبیٚ کەلەبەر ئەو هۆیەش ڕازی بووبێت ئەو کتێبە لە دەست بدات کە وێنە کێشان دە ساڵ کاریان لەسەر کردووە ؟ ئایا ئەمەی بۆ ئەوە ناردووە کە هەر کەس بزانێت چارە نووسی وێنە کێشان خۆ کوێر کردنە یان وەکوو بۆ ئەوەیە کە بە گوێرەی ئەو باسە بێت وا لە کۆنەوە هەبووە و گوتوویەتی : " کیٚ

تەماشای ئەم وێنانە بکات ، نایەوێت چاوی بە دونیا بکەوێت " ؟ بەڵام بۆ ئەو پادشایەی کە لە کاتی لاویدا حەزی لە وێنە کردووە و ئێستا وەکوو زۆر پاشایتر لەکاتی پیریدا لە ترسی گوناح وازی لێدێنێت ، ئیدی ئەم کتێبە شتێکی دەرئاسایی نیە . ئەو بەسەر هاتانەم هاتەوە یاد کەوا وێنە کێشە پیرە بێئومێدەکان دەیانگێڕایەوە : کاتێ کە لە شەکرەکەی جیهانشای فەرمانڕەوای کاراکوێنلوەکان دەچنە شیراز ، ( ابن حسام ) ی سەرۆکە ئەفسانەییەکەی وێنەکێشانی شار بە دەستی شاگردەکەی خۆی چاوی خۆی داخ دەکات و دەڵێ : "من بە شێوەیەکیتر ناتوانم بەردەوام بم . " هەروەها دەیانگوت لە کاتێکدا کە سەربازەکانی یاوز سوڵتان سەلیم لەشکری شا ئیسماعیل شکست دەدەن و کۆشکەکەی هەشت بەهشت تالان دەکەن و شتەکانی دەبەن بۆ ئەستەنبووڵ ، وەستایەکی پیری عەجەمیش دێنن ، ئەڵێن ئەم وەستا لەبەر نەخۆشی کوێر نەبووە ، بەڵکوو لەبەر ئەوەی کە نەیویستووە بە نەریتی عوسمانیەکان وێنە بکێشێت بە دەرمان خۆی کوێر کردووە . منیش نموونەی خۆ کوێر کردنی وەستا بەهزادم لە کاتی تووڕەییدا بۆ وێنەکێشانی خۆم دەهێنایەوە . ڕێگایەکی دووهەم نیە ؟ ئەگەر وەستای وێنە کێش لە کەنارێکەوە یان لە گۆشەیەکەوە نەریتە نوێکان پەسەند بکات ، ئایا ناتوانی کەمێکیش شێوازی وێنەکێشخانە و وەستا کۆنەکان بپارێزێ ؟

ڕەشاییەکم لەسەر نوکە تیژەکەی دەرزییەکەدا بەدیکرد ، بەڵام چاوەماندووەکانم دەریان دەخست کە ئەمە خوێنە یان وەکوو شتێکیترە . هاوینەکەم نێزیك کردەوە و وەکوو ئەوەی کە تەماشای وێنەی عەشقێکی خەماوی بکەم ماوەیەکیتر تەماشای دەرزییەکم کرد و خەیاڵی ئەوەم کرد کە

**داخۆ دەبیٚ بەهزاد چۆن ئەم کارەی کردبیٚ . مرۆڤ هەروا لە خۆیەوە کویٚر نابیٚ ، دەڵێن ئەو تاریکاییە مەخمەڵینە لە ماوەیەکی درێژدا دەکەوێتە پێش چاوی مرۆڤ . کاتیٚ کە ڕۆیشتبووم بۆ ژوورەکەیتر چاوم بە ئاوێنەیەك کەوتبوو ، هەستام ڕۆیشتم و تەماشام کرد . درێژاییەکەی ئەم ئەم ئاوێنە کەوا لە شفرەی فیل دروستکرا بوو بە نووسراوەیەکی وەکوو گوڵ ڕازێندرابووەوە . تەماشای چاوەکانی خۆم کرد . گلێنەی چاوەکانم کە شەست ساڵە وێنەدەکێشن و تەماشای وێنەیان دەکرد شەپۆلی تیشکی مۆمدانەکە زێڕینەکەی بە جوانی دەبینی . جارێکیتر بە ویستەوە پرسیارم لە خۆم کرد و وتم وەستا بەهزاد چۆن ئەم کارە ی کرد ؟ وەکوو ژنێك کە چاو بڕێژی چاوم لەسەر ئاوێنەکە هەڵنەدەگرت ، دەستم لە خۆیەوە دەرزییەکەی دۆزییەوە و وەکوو ئەوەی کە هێلکەی وشترمرخ دەڕازێندرێننەوە و دەڵێن لە سەرەکەیەوە ، بەبیٚ هیچ دوودڵی و گومانێك و ڕاوەستانێك وبە لێبووردەییەکەوە دەرزییەکەم کرد بە نێوە ڕاستی گلێنەی چاوی ڕاستمدا . لەبەر ئەوەی چاوم بە کردەوەکەی خۆم دەکەوت دەروونی خۆمم دەخواردەوە . دەرزییەکەم بە ئەندازەی چارەکە پەنجەیەك کرد بە چاومدا و دەرمهێنا . ئەوەی دەستم هیوای تەمەنێکی پڕ لە جوانی و بێکۆتایی بۆ تەماشاکەری ئاوێنەکە و تەمەنێکی درێژی بۆ ئاوێنەکە دەخواست . بە پێکەنینەوە ئەو چاوەکەیتریشم والێکرد . ماوەیەکی درێژ بەبێئەوەی کە بجووڵێمەوە ڕاوەستام . تەماشای دونیا و هەموو شتێکم کرد . وەکوو ئەوەی وا خەیاڵم دەکرد ڕەنگەکانی دونیا ڕەش نەبوون بەڵکوو چوونە ناو یەکەوە . بەڵام لەسەر و لەخوار هێشتا چاوم بە هەموو شتێك دەکەوت . تۆزێك دواتر ڕەنگە کاڵەکەی تیشکی خۆر لە نێوان سوورایییە**

خەستەکەی ژووری خەزێنەکەدا و ڕەنگی قوماشەکانەوە دابەزی و خەزێنەدار و پیاوەکانی هەر بەو ڕێو ڕەسمەوە مۆرەکەیان شکاند و دەرگاکەیان کردەوە . جەزمی ئاغا لامپاکان و مەنقەڵەکان و شتەکانیتری گۆڕیوە و نانی تازە و تووی وەرگرت و وتی : " هێشتا لە نێوان کتێبەکانی پادشادا بە دوای ئەسپە لمۆز سەیرەکان دەگەڕێین . چی لەوە جوانتر هەیە کە تەماشای وێنە جوانەکان بکەیت و ئەو دونیایە وەبیر بهێنیتەوە کەوا خودا بینیویەتی ؟ "

## (( ناوی من ڕەشەیە )) (52)

چاوەکانم بە سوورایییەکەی ژووری خەزێنە ڕاهاتبوو ، بەیانی کاتێك کە خەزێنەدار و ئاغاکانی بە ڕێو ڕەسمەکەی جاران مۆرەکەیان شکاند و دەرگاکەیان کردەوە ، تیشکی ڕۆژێکیتری زستان لە دەرگای حەوشەوی ئەندەروونەوە هاتە ناو، بەڵام چاوەکانم ئەوەندە بەو سوورایییە ڕاهاتبوون کە وامدەزانی ئەو تیشکە تەنیا شتێکە کە بینەرەکەی هەڵدەخەڵەتێنیٚ . وەکوو وەستا عوسمان ، لە جێگاکەی خۆمدا جۆڵەم نەکرد : وەکوو ئەوە وابوو کە ئەگەر بجووڵێم هەوا کەڕووداره تۆزاوییەکەی ژووری خەزێنە کە بە دەست

هەستی پێدەکرێ و  ئەو سەرپەتانەی وا بە دوایاندا دەگەڕێین بفڕێن و دەرچن . وەستا عوسمان وەکوو ئەوەی بە سەرسوورماوییەوە بۆ یەکەم جار تەماشای شتێکی دەرئاسایی بکات تەماشای ئەو تیشکەی دەکرد وا لە نێوان سەری ڕیزی یەکەمی ئاغاکانەوە دەهاتەوە ناو . شەو کاتێك تەماشای وێنەکانی دەکرد و لاپەڕەکانی شاهنامەکەی شا تاماسووبی هەڵدەدایەوە ، لە دوورەوە چاوم لێی بوو ، جار وبار سەرسامبوونێك لەرروومەتیدا پەیدا دەبوو . جارجاریش سێبەرەکەی لەسەر دیوارەکە دەلەرزا ، بە وردی سەری نێزیکی هاوێنەکەی دەستی دەکردەوە و لەسەر لێوەکانی نەرمابییەك پەیدا دەبوو ، وەکوو ئەوەی خۆی ئامادەی گێڕانەوەی ڕازێك بکات ولە دوایبدا بەسەر سامی تەماشای دەکردەوە و هەندێك شتی لەبەر خۆوە دەگوتەوە . لەدوای داخرانی دەرگاکە لەنێوان نائاسوودەییەکدا کەرووی لە زیاد بوون بوو ، لە نێوان ژوورەکاندا هاتووچووم دەکرد ، وەها بیرم دەکردەوە کە لەم خەزێنەیەدا زانیارییەکی زۆرمان دەست ناکەوێ و کاتەکەشمان بەشی ئەوە ناکا . لەبەر  ئەوەی هەستم بەوە کرد بوو کە وەستا عوسمان بەباشی سەرنج ناداتە سەر کارەکەی ، ئەو پەرۆشییانەیخۆمم بۆ باسکرد . وەکوو وەستایەکی ڕاستەقینە کە فێری نەوازشکردنی دەستی شاگردەکانی خۆی بووبێت ، بە شێوەیەکی زۆرخۆش دەستمی گرت . وتی : " کەسانی وەکوو ئێمە چارەیەکیان زیاتر لە پەنا بردنەبەر دەرگای خودا و بینینی شتەکان وەکوو ئەوەی وا ئەو دەبینێ نیە . لێرەدا لە نێو ئەم کەلوپەلانەداهەست بە نێزیك بوونەوەی ئەم دووانە دەکەم ، کاتێ کە نێزیکی بینینی شتەکان وەکوو بینایی خودا دەبینەوە ، ئەو کات عەداڵەتەکەی بۆ خۆی دێت ، سەیری ئەم دەرزییە بکە وا وەستا بەهزاد خۆی پێکوێر کردووە ... " .

كاتیٚ كە بەسەر هاتەبێبەزەییەكەی ئەم دەرزییەی دەگێڕایەوە بۆ ئەوەی كە باشتر ببیبینم بە هاوێنەكەوە لەژێر نووریٚكی پەمەیی دا تەماشای نووكە تیژەكەی ئەم شتە ناخۆشەم كرد .

وەستا عوسمان وتی : " وەستا كۆنەكان گۆڕینی هونەر و ڕەنگ و شێوازی خۆیانیان كە تەمەنێكیان پێبەخشیبوو ، وەكوو كێشەیەكی ویژدانی لێدەكرد و ئەوەی وا ئێستا باوە و ئەمڕۆ وەكوو پاشایەكی ڕۆژهەلاَتی و ڕۆژێتر وەكوو پاشایەكی ڕۆژئاوایی تەماشای شتەكان دەكات لەلای ئەوان وەكوو بێشەرەفی وابوو . " چاوەكانی نەتەماشای منی دەكرد نەتەماشای لاپەڕەكەی بەردەمی دەكرد . وەكوو ئەوەی وابوو كە تەماشای ئەو سپییاییەی دەكات كەوا لەدواوەیە و دەستی كەسیش پێیڕاناگات . لەلاپەڕەكەی بەردەمیدا لەشكەرەكانی ئێران و تووران ، بە هەموو هێزێكیانەوە ڕژا بوونە ناویەك ، ئەسپەكان بەریەك كەتبوون و سوارەكانیش سپەرەكان و زرێكانیان كون بوون لاشەكانیان پارچە پارچە بوو بوو، سەر و دەستیان بڕا بوو ، سێنگە دوولەتكراوەكانیان ڕژا بوونە عەرز ، و شەڕكەرە قارەمانەكان بەرچاویان سوور بوو بوو بە خۆشی و شاییەكەوە شمشێرەكانیان لەیەك ڕاكێشا بوو و یەكتریان كوشتبوو . " وەستا كۆنە گەورەكان لەبەرامبەر شێوازی بالاَدەستەكان و ناچار كردنی وێنەكێشان بۆ لاسایی كردنەوە و بۆ ئەوەی كە شەرەفی خۆیانبپارێزن ، ئەو كارەی وا لە دواییدا كوێری دەكردن قارەمانانە بە دەرزی تەواویان دەكرد و لەدوای ئەوە بەر لەوەی تاریكاییە سافەكەی خودا وەكوو خەلاَتێك بێتە پێش چاویان ، بە چەندین كاتژمێر یان وەكوو چەندین ڕوژ سەریان لەسەر ئەو وێنەیە هەڵنەدەگرت وا دایاننابووە بەردەمی خۆیان و بەبیٚ وەستان تەماشایان

دەکرد . لەبەر ئەوەی بە ساعەتان سەریان لەسەر ئەو وێنەیە هەڵنەدەبڕی جار و بار دڵۆپێك خوێن ڕژاوەتە سەر دەنیا و مانای وێنەکە و وەکوو لەیەك لەسەری ماوەتەوە ، لە دواییدا چاوی ئەم وەستا قارەمانانە بە هێواشی بەرەو نەرمایی کوێر بوون ڕۆیشتووە ! چ خۆشییەکە ! تۆ دەتزانی کەمن تاکاتی داهاتنی کوێراییم دەمەویست تەماشای چ وێنەیەك بکەم ؟ "

جارجار گلێنەی چاوەکانی گەورە دەبوو ، بچووك دەبووەوە ، وەکوو ئەوەی کە بییەوێت بیرەوەرییەکی کاتی منداڵی وەبیر بهێنێتەوە تەماشای دووردەستی دەکرد، وەکوو ئەوەی کە چاوی بڕیبێتە جێگایەکی دەرەوەی ژووری خەزێنەکە.

" وێنەی خەسرەو کە بە ئەسپەکەیەوە هاتبێتە بەر کۆشکەکەی شیرین و لەبەر عەشقەکەی بسووتیّ ! بەڵام ئەگەر بە شێوەی وەستا هەراتییەکان کێشرابیّ . "

لەوانەیە بۆ ئەوەی کە پەسنی وەستا کۆنەکان بداتەوە ئەو وێنەیەی بە هەوا شێعرێکەوە باسبکردایە.بەخۆتێوەرانێکی سەیرەوە قسەکەیم بڕی و وتم : " وەستای گەورەم ! ئەفەندم ! ئەو شتەی وا هەموو کات دەمەویّ تەماشای بکەم ڕوومەتە ناسکۆڵەکەی گیانەکەمە ، ئەوە سیّ ڕۆژە کە لەگەڵیدا زەماوەندم کردووە ، دوانزە ساڵ بەتاسەوە بیرم لێکردۆتەوە . وێنەی عاشقبوونی وێنەکەی شیرین بە ڕەسمەکەی خەسرە و هەموو کات ئەمەم وەبیر دێنێتەوە . " باری گوزارشتکردنێکی بەسەر شانەوە بوو ، نەیدەتوانی لەروویدا بیشارێتەوە ، لەوانەیە مەراقێکی هەبێت ، بەڵام ئەمە لەسەر بەسەر هاتەکەی من و لاپەڕە خوێناوییەکەی بەردەمی نەبوو . وەکوو ئەوە وابوو کە بە هێواشی تەماشای مژدەیەك بکات .

لەناكاو دەرزییەكەم هەڵگرت و لەویٚ دوور كەوتمەوە . لە سیٚهەمین ژووی خەزیٚنەكەدا لەو جیٚگایەی وا دەگاتە حەمامەكە ، گۆشەیەكی لیٚبوو كە هەدیە خراپ بووەكانی پاشا و فەرەمانڕەوا فەرەنسییەكان لەویٚدا كۆ كرا بوونەوە و سەدان سەعاتی سەیری گەورەی لیٚبوو . لەویٚدا بەباشی تەماشای ئەو دەرزییەم كرد كەوا وەستا عوسمان دەیگوت : وەستا بەهزاد خۆی پیٚ كویٚر كردووە . لەبەر ئەو تیشكی ئەو ڕۆژەی وا لە چوار چیٚوە زیٚڕینەكانی ئەم ساعاتە كۆن و تۆزاوییانە و شووشە بلور و ئەڵماسەكانەوە دەگەڕایەوە ، جار وبار نووكە ئاڵتوونیە ڕووكەش پەمبەییەكەی ئەم دەرزییە دەبریقایەوە . ئایا بەراستی وەستا بەهزادە ئەفسانەییەكە بەم شتە خۆی كویٚر كردووە ؟ وەستا عوسمان ئەو شتە مەترسیدارەی وا بەهزاد بەسەر خۆیدا هیٚنا بووی ، ئەنجامیداوە یان نا ؟ بەسەر ساعاتیٚكی گەورەوە بەرزایٚكی بچووك بە ئەندازەی پەنجەیەك دەبوو ئاویٚزانكرا بوو، لە نیگاكانیەوە وادەردەكەوت كە دەڵیٚ : ( بەڵیٚ ! ) وایە . ئەم پیاوە كڵاو لەسەرەعوسمانیەش لەسەر ئەم كاتژمیٚرە وەكوو گاڵتەی سەعاتسازە لیٚهاتووەكەیە كە ئەمەی دروستكردووە . ئەمە لەلایەن پاشای فەرەنسەوە وەكوو هەدیە ناردراوە و بۆ ئەوەیە كە سەعات هەر چەندیٚك بیٚ ئەو پیاوە ئەوەندە سەر بلەقیٚنیٚ و بەم شیٚوەیە پادشا و ژنەكانی لەحەرەمدا سەرگەرم بكات . زۆر كتیٚبی ئاساییم هیٚنایە بەردەستی خۆم : كورتە باڵاكە بە خۆشییەكی بیٚبەزەییانەوە وتی ، پاشایەك كەبە سەر خۆشی پارە و دەسەڵاتەوە عەبد بوونی خۆی لەبیر بچیٚتەوە و وەكوو پادشاكان و شاكان ، بەنیٚوی خۆی كتیٚب بنووسیٚتەوە و بە ئەستیٚرەی زیٚڕین بیڕازیٚنیٚتەوە ، هەقی سەربڕانە . لە هەندیٚك لە ئەو كتیٚبانەوا بابەتی جۆرا و جۆر لە خۆ دەگرن و

لە کتێبە ڕازێندراوەکاندا و دیوانە ڕەسمدارەکاندا چاوم بە وێنەی عاشقبوونی شیرین بە وێنەکی خەسرەو دەکەوت و ماوەیەکی درێژ ڕادەوەستام و سەیرم دەکردن وێنەکەی خەسرەو لەناو ئەو وێنەیەدا وا شیرین لە گەشتێکی خۆ بۆ گوند و لادێکانی ولاّتدا تەماشای کرد بوو ، دیار نەبوو . ئەمە لەبەر ئەوە نەبوو کە وێنە لەنو وێنەدا شتێکی بچکوولانەبیٚ و وێنەکێشان نەتوانن بەباشی بیکێشن. چونکە زۆر لە وێنە کێشەکان دەیانتوانی لەسەر دانەیەکی برنج ،نینۆك یان تەنانەت تاڵە قژێکەوە کاربکەن و بەناسکی وجوانی وێنەیان لەسەر بکێشن . بۆچی ئەوکاتە وێنەی ئەو خەسرەوەیان بەئاشکرایی نەدەکێشا ، کەوا شیرین تەماشای کرد بوو و عاشقی بوو بوو ؟ لە خۆمەوە بیرم دەکردەوە و دەمگوت دوای نیوەڕۆ لەکاتێکی گونجاودا ئەم پرسیارانە لە وەستا عوسمان دەکەم ، لەناکاو لە لاپەڕەیەکی کتێبێکی فرەبابەتی تێکەڵ و پێکەڵدا کە بە هەڵکەوت هاتبووە بەر دەستم لە نێو وێنەی شایی بووکێنییەکدا چاوم بە وێنەی ئەسپێك لەسەر قاڵییەکی ڕاخراو کەوت . ئاهەنگی لێدانەکەی دڵم شێوا .لەوێدا ، لەبەرامبەرمدا ئەسپێکی لمۆز سەیری لێبوو . لەسەر پشتی خۆی بووکێکی نازداری هەڵدەگرت و تەماشای منی دەکرد . وەکوو ئەوە وابوو کە ئەو ئەسپە سێحراوییە ڕازێکی بۆ دەدرکاندم .

وەك ئەوەی ناو خەیاڵم ، ویستم بقیڕێنم ، بەڵام دەنگم دەرنەدەهات . هەر کە کتێبەکەم گرتەوە لە نێو کەلوپەلەکان و سندوقەکانەوە بەرەو لای وەستا عوسمان هەڕام کرد . لاپەڕەکەم لەبەر دەستیدا کردەوە . تەماشای وێنەکەی کرد . کاتیٚ کە هیچ بریقەیەکم لە نێو چاوانیدا بەدینەکرد ، بەبیٚ ئارامییەکەوە پرسیارم لێکرد و وتم : " کونی لمۆزی ئەم ئەسپە وەکوو هی

ئەو ئەسپەیە کەوا بۆ کتێبەکەی زاواکەم دروستکراوە . "

هاوێنەکەی دەستی هێنایە سەر ئەسپەکە ، بەوئەندازەیەی کە لووتی لە لاپەڕەکە بدات ، هاوێنەکە و چاوی نێزیکی لاپەڕەکە کردەوە . لەبەرامبەر ئەو بێدەنگییەدا سەبرم نەما و وتم : " وەکوو ئەوەی وا دەیبینن ئەم ئەسپە بە نەریت و شێوازی ئەو ئەسپەی کە بۆ کتێبەکەی زاوا دروستکراوە نەکێشراوە ، بڵام لمۆزەکانیان  لەیەك دەچن ، وێنەکێش ویستوویەتی وەکوو چینیەکان تەماشای دونیا بکات . " تۆزێك بێدەنگ مامەوە . " بەزمێکی شایی ، ئەڵێی وێنەی چینییە، بەڵام ئەوانەی وا کێشاویانە چینی نین و کەسانێکی وەکوو ئێمەن . " ئێستا وەکوو ئەوە وابوو کە هاوێنەکەی وەستا چەسپابێ بە لاپەڕەکەوە و لووتیشی بە هاوێنەکەوە .

بۆ ئەوەی کە بتوانێ ببینێ نەتەنیا چاوەکانی ، بەڵکوو سەر و لووت و ماسووڵکەکان و پشتە پیرەکەی و شان و ملەکانیشی بەهەموو توانایەکەوە خستبووە جووڵە . بێدەنگییەکی درێژ دروستبوو . لەدواییدا بە هەسکە هەسکەوە وتی : " کونی لمۆزی ئەسپەکە بڕاوە " . سەرم پاڵدا بە سەری ئەودا و بەوجۆرە ماوەیەکی درێژ تەماشای لمۆزی ئەسپەکەمان کرد . لە ناکاو بە خەمێکەوە هەستم بەوە کرد کە تەنیا لمۆزی ئەسپەکە نەبڕاوە ، بەڵکوو چاوی وەستا عوسمانیش باش نابینێ .

-:" چاوتان پێی‌دەکەوێ ؟ "

وتی : " زۆر کەم ، تۆ باسی ئەسپەکەم بۆ بکە . " بەخەمێکەوە وتم : " بە گوێرەی من ئەم بووکەخەمبارە سواری ئەسپێکی لمۆز بڕاوی دەشتی بووە و لەگەڵ پارێزەر و هاوڕێ نائاشناکانیدا دەچێ .

روومەتە ترشەکەیان و ڕیشە ڕەشە ترسێنەرەکەیان و نیو چاو و ئەبرۆ

درێژەکەیان و سمێڵە گەورەکەیان و ئێسقانە پانەکان و عەباناسك و سادەکەیان و پێڵاوە بچووکەکانیان و تەور شمشێرەکانیان ئەوەی نیشاندەدا کە دەبێ ئەمانە خەڵکی ئەولای ئاوەکە بن ( ماورالنهر ) و تورکمانی ئاککویونلویی بن ، بە پێی ئەوەی کە ئەم بووکە جوانە شەو لەگەڵ خزمەتکارەکەیدا و لەژێر ڕووناکی چرا و مەشعەلەکاندا سەفەر دەکات ، دەبێ کە ڕێگاکەی دوور بێ و لەوانەیە پڕەنسەسێکی خەمباری چینیش بێت . "

وەستا عوسمان وتی : " یان لەوانەیە وێنەکێشەکە بۆ ئەوەی قورسایی بخاتە سەر جوانی بووکەکە ، بەرەنگی سپی بۆیاخی کردبێ و وەکوو چینیەکان چاوەکانی ڕاکێشاوکێشا بێت . "

وتم : " هەرکە دەبێت با ببێت بەڵام من بەزەییم بەم جوانە خەمباردا دێتەوە کەوا بە نیوەشەو لەگەڵ هەندێك لە پارێزەری نەناسراودا بە بووکی دەچێت بۆلای مێردێك لەوڵاتێکی نائاشنا کەوا هیچ نەیبینیوە . "

لەدواییدا یەکسەر پرسیارم کرد و گوتم : " چۆن دەتوانین لەلمۆزە بڕاوەکەی ئەو ئەسپەوە کەوا ئەو لێی سوار بووە ، بزانین کە وێنەکێشەکەی ئێمە کێیە ؟ " وەستا عوسمان وتی : " تۆ لاپەڕەکانیتری کتێبەکە هەڵدەوە و باسی ئەوەم بۆ بکە کە چی دەبینی . "

کاتێ کە بەهەڕا کردن ئەم کتێبەم بۆ وەستا عوسمان دەهێنا ، کورتە باڵاکە لەسەر دانیشتنگەکەی( سیفۆن )ەکەی دانیشتبوو ، ئێستا ئەویش لەگەڵ ئێمەدا بوو ، هەر سێکمان پێکەوە تەماشای ئەو لاپەڕانەمان دەکرد وا هەڵمدەدانەوە .

چاومان بە وێنەی کچە جوانە چینیەکان کەوت کەوا بە شێوەی کێشانی

وێنەی بووکە خەمبارەکەمان نەکێشرا بوون، لە باخچەیەکدا کۆ بووبوونەوە و عودێکی سەیریان لێدەدا . چاومان بە وێنەی ماڵی چینی و داری سەوزەڵانی و کاروانە خەمبارەکان کەوت کە لە سەفەردان و دیمەنی جوانی سەوزەڵانیمان بینی کە بەقەدەر خەیاڵێك جوان بوون . چاومان بە دارە پێچاو پێچەکانی نەریتی چینی و گوڵە کراوەکان و بولبوولە دڵخۆشەکان کەوت کەوا لەم پەل بۆ ئەوەیتر شەقەی باڵیان لێدەدا . چاومان بە وێنەی شازادەکان کەوت کەوا بەپێی نەریتی خوراسان لە چادرەکانیاندا دادەنیشن و لەسەر عەشق و شەراب قسەیان دەکرد . باخچەی دەرئاسایی و وێنەی ئەو پیاوە ماقووڵانەشمان بینی کەوا بەسەر ئەسپێکەوە شاهینێکیان بەسەر باڵەوە بوو و بۆ ڕاو دەچوون . لە دواییدا وەکوو ئەوەی کە شەیتانێك تێپەڕ بووبێ ، هەستمان بەوە کرد کە زۆربەی کات خراپییەکانی ناو وێنەشتانێکی ژیرانەن . ئایا وێنەکێشەکە شتێکی گاڵتە پێکەرانەی تێکەڵاوی وێنەی شازادەکە کردووە کەوا بە شمشێرە گەورەکەی خۆی ئەژدیهاکە دەکوژێ ؟

ئایا چێژێکی لە نەداری گوندییە فەقیرەکان وەرگرتووە کەوا لەبەرامبەر شێخدا چاوەڕێی لێبووردن و ساخبوونەوە دەکەن ؟ ئەم وێنەکێشە زیاتر لە کاتێکدا کە وێنە چاوی خوماری دوو سەگی لەکاتی چەقاندا لاخۆشبوو یان بە ڕەنگی سووری شەیتانی بۆیاخکردنی دەمە پێکەنیناوییە کراوەکەی ژنان کەیف خۆشتری دەکرد؟ دواتر چاومان بە خودی شەیتانەکانی وێنەکێشەکە کەوت : ئەم گیانلەبەرە سەیرانە لەوێنەی ئەو دێو وجندۆکانە دەچوون کەوا بە دەیان جار لەلایەن وێنە کێشەکانی هەرات و ئەوانیترە وە کێشراونەتەوە ، بەڵام هونەرە گاڵتەکەرەکەی وێنەکێشەکە وایکرد بوو کە

ئەمانە زۆر خراپتر و هێرشکەرتر لەوان دیاربن و زیاتر لە مرۆڤ بچن . بالایان بەقەدەر مرۆڤێك دەبوو ، بەلام وجوودیان بچووکتر بوو ، شاخەکانیان گرێدار بوو ، کلکیان وەکوو هی پشیلە وابوو ، کاتێ کە تەماشای ئەم شەیتانە مەترسیدارانەمان کرد پێکەنین . هەرچی لاپەڕەکانم هەڵدەدایەوە ، ئەم شەیتانە ڕووتە ، ئەبرۆ پڕپشتە ، ڕوومەت گێلە ، چاو زلە ، ددان درێژە ، نینۆك لەگەڵ یەکدا زۆرانیان دەگرت و پێکەوە شەڕ و ئاژاوەیان دەکرد ، لە دواییدا ئەسپێکی گەورەیان دزی بوو بۆ قوربانی کردن بۆ خوداکەیان و هەڵدەقونین و داریان دەبڕی و سوڵتانە جوانەکانیان بە تەختە ڕەوانەکەیەوە دەدزی و ئەژدیهایان دەگرت و خەزێنەیان دەبڕی . لەنێو ئەم بەرگەدا کە چەندین وێنە کێش قەڵەمیان لێداوە ، ئەو وێنە کێشەی وا شەیتانەکانی کێشا بوو بە ڕەشایی قەڵەم وێنەی دەروێشە قەلەندەرییەکانی بە گۆچانی دەستیان و زنجیری ملیان و سەر و ملە شێواوەکانیان و قژە هەڵکەندراوەکانیانەوزە کێشا بوو ، کاتێ ئەمەم بۆ وەستا عوسمان باسکرد داوای لێکردم کە لایەنە لەیەك چووەکانیان دووبارە بکەمەوە و بە وردی گوێی لێڕادەگرتم . لە دواییدا وتی : " بڕینەوەی لمۆزی ئەسپەکان بۆ ئەوەی باشتر هەناسە وەربگرن و غار بدەن عادەتی سەدان ساڵەی مەغوولەکانە . کاتێ کە لەشکرەکەی هۆلاکۆخان بە ئەسپەکانیان تەواوی وڵاتی عەرەب و عەجەم و چین دەگەڕێن و دەچنە بەغدا و ئەوێ تالان دەکەن و کتێبەکان دەخەنە ناو ئاوی دیجلە ، خۆشنووسی بە ناو بانگ و دواتر وێنە کێشی لێهاتوو ( ابن شاکر ) وەکوو ئەوەی هەموو کەسێك دەیکرد لە باتی بەرە و باشوور بچێت بەرەو باکوور یانی ئەو شوێنەی وا سەربازە چەپاوکەرەکانی مەغوول لەوێوە هاتبوون ڕۆیشتووە . لەو کاتانەدا لەبەر

ئەوەی دەیانگوت قورئانی کەریم وادەڵێ ، وێنەیان نەدەکێشا و وێنەکێشانیش بە جیددی وەرنەدەگیران . وەهام بیستبوو کە دەیانگوت پیری گەورە و وەستای هەموومان وەستا ( ابن شاکر ) کە گەورەترین ڕازی پیشەکەمان یانی تەماشاکردنی دونیا لە منارەوە و توانایی بینینی خەتی ئاسۆ بە ڕوونی و کێشانی هەموو شتێك ( لەهەورەوە بگرە تا حەشەرەیەك ) بە شێوازی چینییەکان لەوەوە فێر بووین و قەرزاری ئەوین ، لەکاتی ڕۆیشتن بەرە و دڵی جێگای سەربازە مەغوولەکان و لە ڕێبوارییە مێژووییەکەی خۆیدا بۆ ڕۆیشتن بۆ باکوور تەماشای کونی لمۆزی ئەسپەکانی کردووە . بەبێ ئەوەی گوێ بداتە زۆری و زەحمەتی ڕێدەکەوێ و لەساڵێکدا دەگاتەوە سەمەرقەند، بەڵام لەوێنەی ئەو ئەسپانەدا کە ئەو لەکاتی نەخش کردنی کتێبدا کێشاویەتی ، جێگایەی کە بینیبێتم و گوێم لێبووە وێنەی ئەسپی لمۆز بڕاوی تێدا نەبووە . چونکە وێنەی ئەو ئەسپانەی وا لە خەیاڵی ئەودا دەردەکەون ، وێنەی ئەو ئەسپە بەهێزە سەرکەوتووانەی مەغوولەکان نەبووە ، بەڵکوو وێنەی ئەو ئەسپە ناسکۆڵانەی عەرەب بووە وا بە خەمێکەوە بەجێیهێشتبوون . لەم ڕووەشەوە لمۆزە سەیرەکەی ئەو ئەسپەی وا بۆکتێبەکەی زاوا نەخشکراوە بۆ من بیر هێنەرەوەی ئەسپەکانی مەغوول و ئەو عادەتەیە وا مەغوولەکان لە خوراسان و سەمەرقەندا جێگیریان کردووە ، نەبوو!"

وەستا عوسمان جارجار سەیری من و جارجاریش سەیری کتێبەکەی دەکرد و قسەی دەکرد بەڵام وەکووئەوەی وابوو کە ئەو شتانە دەبینێ وا خەیاڵی دەکردن .

- " ئەوەی وا بەرێگای لەشکەری مەغوولەوە تا وڵاتی عەجەم و

تائێرەش هاتبوو تەنیا بڕینی لمۆزی  ئەسپ و وێنەی چینی نەبوو ، بەڵکوو ئەم شەیتانانەی ناو ئەم کتێبەش هاوردەی ئەوان بوو . ئەوەتان بیستووە کە ئەوانە نێردراوەکانی هێزە ڕەشاییەکانی دونیای ژێر زەوین و ژیانی ئێمەی مرۆڤ و شتە بە بایەخەکانمان دەدزن و دەمانبەن بۆ ژێر مەرگ و تاریکایی . لەم دونیایەی ژێرەوەدا ، هەموو شتێك،هەور و درەخت و کەلووپەلەکان و سەگەکان و کتێبەکانیش ڕۆحیان هەیە و قسەدەکەن . " کورتە بالآکە وتی : " بەڵێ ، خواشایەتمە کە هەندێك لەو شەوانەیوا بەباشی دەرگاکە دادەخەم بەتەنیا سەعاتەکان قاپە چینییەکان و ئەو کاسە بلوورینانەی وا هەمیشە زرنگەزرنگ دەکەن ، پێکەوە قسەناکەن ، بەڵکوو ڕۆحی هەموو ئەو تفەنگ و شمشێر وقەڵخان و کلآوە ئاسنینە خوێناوییانە ، نائاسوودە دەبن و لەو تاریکاییە کوێرەدا وەها دەست بە قسە دەکەن کە ئەم ژووری خەزێنە دەبێ بە مەیدانێکی شەڕی مەحشەر." وەستا عوسمان وتی : " دەروێشە قەلەندەرییەکان ئەم بڕوایان لە خوراسانەوە بردە وڵاتی عەجەم و لەوێشەوە هێنایانە ئەم ئەستەنبووڵەی خۆمان . کاتێ کە یاوز سوڵتان سەلیم شا ئیسماعیل شکست دەدا وکۆشکی هەشت بەهەشت تالآن دەکات ، یەکێك لە نەوەکانی تەیموور بە ناوی ( بدیع الزمان میرزا ) بەشا ئیسماعیل خەیانەت دەکا و لەگەڵ دەروێشە قەلەندەرییەکانیدا بەشداری ڕیزەکانی لای یاوز سەڵتان سەلیم دەکات . کاتێك یاوز سوڵتان سەلیم جێگای بە بەهەشت بێ لەنێو بەفر و بەو زستانە دەگەڕێتەوە بۆ ئەستەنبووڵ لە دەرەوەی دوو ژنە لاشە سپییە ، چاو بادامییە ، جوانەکانی شا ئیسماعیل کە لەشەڕی چاڵدراندا شکستی خوارد بوو ، ئەم هەموو کتێبەشی لەگەڵدا بوو کەوا شائیسماعیل لەدوای شکستدان و تالآن کردنی

مەغوولییەکان کە خاوەنی پێشووی تەورێز بوون و ئیلخانیەکان و جەلایرییەکان و کاراکویونلوەکان و ئوزبەکەکان و عەجەمەکان و توورکەمەنەکان و تەیموورییەکان ، هەموویانی لە کتێبخانەکەی کۆشکەکەی هەشت بەهەشتیدا شارد بووەوە . "

بەڵام ئیدی لە نیگاکانیدا ئەو کەموکورپییەی دۆزینەوەی هەدەف والە کوێرەکاندا هەبوو ، بەدی دەکرا : ئەو هاوێنە دەسك سەدەفینەی لەبەر بینین نەگرتبوو بەدەستەوە ، بەڵکوو لەبەر ئەوە بوو کە عادەتی پێکردبوو . تۆزێك بێدەنگماینەوە . کورتە باڵاکە وەکوو ئەوەی کە گوێی بۆ بەسەر هاتێکی خەماوی ڕابگرێ گوێی ڕادەگرت ، وەستا عوسمان بەرگێکی بۆ تاریف کرد و داوای لێکرد کە بیهێنێ . کاتێ کورتە باڵاکە ڕۆیشت بە دڵپاکی و سادەییەوە پرسیارم لەوەستاکەم کرد و وتم : " ئەگەر وابوو کێ وێنەی ئەسپەکەی ناووێنەی زاواکەمی کێشاوە ؟ "

وتی : " لمۆزی هەردوو ئەسپەکەش بڕاوەیە . بەڵام لەسەرمەقەندبێ یان وەکوو لە ( ماوەرا ئوننەهر ) بێت . ئەم ئەسپە هەر بە نەریتی چینییەکان کێشراوە . نموونەی ئەم ئەسپەجوانە زۆر بەکەمی پەیدا دەبن ! ئەوە ئەسپ نەخشکراوە ئەسپی مەغوولی نیە . "

چپاندم بە گوێیەوە و وتم : " بەڵام کونەکەی وەکوو هی ئەسپێکی ڕاستەقینەی مەغوولی بڕاوە . "

" چونکە لەو کاتەی وا مەغوولەکان پاشەکشەیان کرد و تەیموورو کوڕەکانی جێگایان گرتەوە تا دووسەد ساڵ بەر لە ئێستاش ئەگەر وەستایەکی هەراتی وێنەی ئەسپێکی بکێشایە ، یان ئەسپێکی لمۆز بڕاو یان وەکوو وێنەی ئەسپێکی لمۆز بڕاو یان وەکوو وێنەی ئەسپێك لەو

چەشنەی وەبیر دەهێنایەوە کەس نازانیٚ کە کام لاپەڕەی کام کتێبە و بۆ کام پادشا دروستکراوە " بەڵام لەوە دڵنیام کە ئەو کتێبە و ئەو ڕەسمە لە کۆشکێکدا یان وەکوو کێدەزانیٚ لەوانەیە لە حەرەمی پادشایەکدا پەسند کرابیٚ و ماوەیەك بووبیٚ بە ئەفسانە ! لەوەش دڵنیام کە هۆی زیاد بوونی ئەم ئەسپە لمۆز بڕاوەش ئەوەیە کە وێنەکێشە ئاساییەکان بە بەخێلێبردنەوە و قسە کردن لاسایی ئەوەیان کێشاوە و نموونەی زۆریان لێدروستکردووە . بەمجۆرەش ئەسپ و کونی لمۆزەکەشی بوون بە قاڵب و لە مێشکی وێنە کێشەکانی ئەو وێنە کێشخانەیەدا ماوەتەوە . لەدوای ساڵانێك کاتێك کە پادشاکانی ئەم وێنە کێشانە لەشەڕدا شکستیان هێناوە ، ئەوانیش وەکوو ژنانی حەرەم ئەفەندیتریان بۆ خۆ دۆزیوەتەوە و وڵاتەکەی خۆشیان گۆڕیوە و لەمێشکی خۆشیاندا ئەو ئەسپانەیان بردووە کەوا لمۆزیان بە ناسکی و جوانی بڕا بوو و لەوانەیە زۆر لەو وێنە کێشانەی کەوا لە گۆشەیەکی مێشکیاندا وێنەی ئەم ئەسپە لمۆز بڕاوەیان پێبوو ، لەبەر وێنە کێشخانەکان یان بە نەریتی وەستاکانی ئەویٚ ئەوەیان نەکێشابیٚ و لەبیریان چووبێتەوە . بەڵام هەندێك لەوانەش لەگەڵ ئەوەی کە خۆیان کێشاویانەتەوە گوتوویانە ئەم (ئەسپە لمۆز بڕاوە ) نەریتی وەستا کۆنەکانە و فێری شاگردە جوانەکانیشیان کردووە . بەمجۆرەش لەدوای ساڵانێکی درێژ لە پاشەکشەی مەغوولەکان لە وڵاتەکانی عەجەم و عەرەب و سەدان ساڵ دوای ئەوەی کە شارە کاولکراوەتاڵانکراوەکان دووبارە ئاوادان کراونەتەوە ، دیسان هەندێك لە وێنە کێشەکان بڕوایان بەوە هەبووە کە ئەسپی لمۆز بڕاوی بە هێزی مەغوولی قاڵبێکە و لەڕوویان کێشاونەتەوە . هەروەها لەوەش دڵنیام کە هەندێك لەوانەش ئاگایان لەسوارەکانی مەغوولی و ئەسپە

لمۆز بڕاوەکانیان نەبووە و گوتوویانە: " ئەمە قاڵبە " و وەکوو وێنەکێشخانەکەی ئێمە کێشاویانەتەوە. بە هەستێکی سەرسامبوونەوە وتم : " وەستای من !ئەفەندم ! لەراستیدا شێوازی (نەدیمە ) وەکوو ئەوەی ئێمە چاوەڕوانمان دەکرد ئەنجامی هەبوو ، هەر وێنە کێشێك ، ئیمزایەکی شاراوەشی هەیە . "

بەشانازییەکەوە گوتی : " هەر وێنەکێش نا بەڵام هەر وێنە کێشخانەیەك هەیەتی ، تەنانەت هەندێك وێنەکێشخانەش ئەوەیان نیە ، بەڵکووەکوو هەندێك لەو خێزانانەی وا سالانێکی درێژ هەر مێشکێکی دەنگێك دەردەخا و کەسیان لەوە تێناگەن کە دڵخۆشی لە پێکەوە گونجاون دیّ و پێکەوە گونجانیش دەبیّ بەخۆشی . هەندێکیان بە نەریتی چینی و هەندێك وەکوو تورکمانەکان و هەندێکیش وەکوو شیرازییەکان ومەغوولەکان وێنە دەکێشن و وەکوو ژن و مێردێکی ئاژاوەچی خەمبار پێکەوە شەڕ دەکەن و شێوازێکی هاوبەشیان نابێت." ئێستا زۆر بەباشی دیارە کە شانازی بە خۆیەوە دەکات ، ڕوومەتی ئەو پیرە پیاوە بە ئازارەی وا هەمیشە دەمبینیّ ئێستا گۆڕا بوو بۆ ڕوخساری پیاوێکی کەللەرەقی تووڕەکە دەیەوێت هەموو هێزێکی خۆی لەدەستیدا کۆ بکاتەوە . وتم : " وەستام ئێوە لەماوەی بیست ساڵدا لێرەدا لە ئەستەنبووڵدا وێنە کێشەجودا سرشت و جودا خوێنەکانی هەر چوار لای دونیاتان کۆ کردۆتەوە و کردووتانە بە شێوازی عوسمانی . " بۆچی ئەو حەیران مانەوەی وا تۆزێك بەرلە ئێستا بە هەموو دڵمەوە هەستم پێکرد ، ئێستا کاتێك لە ڕوویدا گوتمەوە بوو بە دوو ڕووییەکی ماستاوچییانە ؟ بۆ ئەوەی کە بتوانی لەدڵەوە پەسنی یەکێك بدەیتەوە کەلە دەروونەوە حەیرانی هونەر و وەستایەکەیی ، ئایا پێویستە کابرا دوور لە

دەسەڵات و پلەبێ و بێچارە بێت ؟ گوتی: " ئەم کورتە باڵایە چی لێهات ؟ " وەکوو ئەوخاوەن هێزانەی وا حەز لە ماستاوچێتی و پەسندانیان دەکەن و ئەوەیان بەبیر دەکەوێتەوە کە دەبێ حەزیان لێنەکەن ئەم قسەیەی گوتبوو : لەبەر ئەوەی دەیویست وەها دیار بکات کە دەیەوێ بابەتی قسەکە بگۆڕێ . چپاندم بە گوێیەوە و وتم : سەرەڕای ئەوەی کە وەستایەکی گەورەی نەریتی و ئەفسانەی عەجەمین ، توانیوتانە دونیایەکی نەخشکێشان بخوڵقێنن کە شایستەی هێز و جێگای عوسمانیەکان بێ . ئێوە هێزی شمشێری عوسمانی و ڕەنگە گەشنبینەکانی سەرکەوتنەکانی و مەراقی کەلوپەل و سەربەستی و ئاسوودەیی ژیانەکەیتان هێناوەتە ناو وێنەوە . وەستام ! بەشەرەفترین و پڕ شانازیترین کاتی ژیانم ئەمەیە کەوا ئێستا لەگەڵ ئێوەدا تەماشای وێنەی وەستا کۆنەکان دەکەم و ... " . بەمجۆرە لەسەر یەك بابەت ماوەیەك چپاندم بە گوێیەوە . لە ناو ژووره تاریك و سارده پەرش و بڵاوەکەی خەزێنەدا کەوەك پاشماوەی مەیدانێکی شەڕ دەچوو ، ورگمان لەیەك دەکەوت ، ئەمەش خۆی مەحرەمیەتی دەبەخشی بە قسەکانی من . لە دواییدا وەکوو ئەوەی وا لە هەندێك کوێرەکاندا هەیە و ناتوانن ئاگاداری چۆنیەتی گوزارشتەکانی ڕوومەتی خۆیان بن ، لەنێو چاوەکانی وەستا عوسمانیشدا ، نیگای خەستی کابرایەکی پیرم لە خۆشیدا بەدی دەکرا . هەندێك جار لەبەر ئەوەی بەراستی لە دڵەوە وا هەستمدەکرد هەندێك جاریش لەبەر ئەوەی وا بەزەییم بە کوێران دەهاتەوە پەسنم دەدایەوە . بە پەنجە ساردیەکانیەوە دەستمی گرت . نەوازشی باڵەکانمی کرد و دەستی هێنا بە ڕوومەتمدا .

وابزانم هێز و پیر بوونەکەی ئەو لە ڕێگای ئەو دەستانەوە هات بۆ من ،

بیرم لە شەکورە دەکردەوە وا لەماڵدا چاوەڕێی منی دەکرد . هەندێك لاپەڕەی کراوە لەبەردەمماندا هەبوون ، بە بێئەوەی کە بجووڵێنەوە ڕاوەستا بووین . پەسندانەکانی من و بەزەیی هاتن و سەرسام بوونەکانی ئەو لەبەرامبەر خۆیدا ماندووی کرد بووین ، بەڵام گوێمان نەدایە . شەرممان لەیەك دەکرد . جارێکیتر پرسیاری کرد و وتی : " کورتە باڵاکە چی لێهات ؟ " لەوە دڵنیا بووم کە کورتە باڵا ساختەچییەکە خۆی شاردۆتەوە و لە گۆشەیەکەوە بە دزیوە تەماشای ئێمە دەکات .وەکوو ئەوەی کە بەدوای ئەودا بگەڕێم سەرم بە شانی چەپ و ڕاستدا گەڕاندەوە بەڵام بە وردی چاوم بڕیبووە نێو چاوانی وەستا عوسمان . . کوێر بوو بوو، یان وەکوو دەیەویست ئەوە بسەلمێنیٚ کە خۆی وهەر کەسێکیتریش کوێرە ؟ هەندێك لە وەستا کۆنە بیٚ هونەرە لێنەهاتووەکانی شیراز بۆ ئەوەی کە ڕێزیان لێبگیردریٚ و لێنەهاتوویی و سەرنەکەوتنەکانی خۆیان بشارنەوە لاسایی کوێرەکان کردۆتەوە . وتی : " دەمەویٚ لێرەدا بمرم " وەکوو ئەوەی کە ماستاوی بۆبکێشم وتم : " وەستای گەورەم ! ئەفەندم ! لەم زەمانە خراپەدا کە بە نەخش بایەخ نادریٚ و تەنیا گرنگی بە پارەکەی دەدریٚ و لاساییکردنەوەی فەرەنسییەکان پڕ بایەخە ، لەم قسەیەی ئێوە تێدەگەم و چاوم پڕدەبیٚ لە ئاو . بەڵام پاراستنی وێنەکێشەکانتان لە دوژمنەکان ئەرکی ئێوەیە . تکایە پێم بڵێن ئەنجامی شێوازی نەدیمە بووبە چی ؟ کام وێنە کێش ئەو ئەسپەی کێشاوە ؟

" زەیتوون " . وەها گوتبووی کە هیچ سەرسام نەبووم . ماوەیەك بێدەنگ مایەوە . بە هێمنییەوە گوتی : " بەڵام لەوە دڵنیام کە زاوا کەشتو زەریف ئەفەندیش بە دەستی ئەو نەکوژراون . لەوەوە زانیم کە دەبیٚ

ئەو وێنەی ئەسپەکەی کێشابێ کە لە نێو هەموو وێنە کێشاندا زیاتر ئەو گرێدراوی وەستا کۆنەکانە و تەنیا ئەوە کە زۆربەی ئەفسانە و نەریتە کۆنەکانی هەراتی بەدڵە . من شەجەرەنامەی وەستاکان تانەوەی کە بگاتەوە سەمەرقەند دەردەخەم . دەزانم کە پرسیاری ئەوە ناکەی بۆ چی لەنێو ئەو هەموو وێنەی ئەسپەدا وا ساڵانێکە زەیتوون کێشاونوویەتی چاومان بە ئەسپێکی بەو جۆرە نەکەوتووە ؟ ئەوەم گوتبوو کە زۆر جار وردەکارییەك ، باڵی پەلەوەرێك ، یان چۆنیەت خۆ گرتنی پەلێك لە مێشکی چەندین نەسڵی وەستا و شاگرددا دەمێنێتەوە بەڵام کەللەرەقی وەستای وێنە کێشەکە و وێنەکێشخانەکە و ویستی پادشاکە ناهێڵن ئەوە دیار ببێت . کەواتە ئەو ئەسپەی وا زەیتوونی خۆشەویست ڕاستە و ڕاست لە کاتی منداڵیدا لەوەستا عەجەمەکانەوە فێری بووە ئەم ئەسپە بووە . دەرکەوتنی ئەم ئەسپە لەنێو کتێبەکەی زاوای گەمژەدا ، یارییەکی بێبەزەییانەی خودایە لەبەرامبەر من . ئایا هەموومان بە ئەندازەی بەس وەستا کۆنە هەراتییەکانمان نەکردووە بە نموونە بۆ خۆمان ؟ وەکوو ئەوەی کاتێك کە وەستا تورکەمانەکان خەیاڵی ژنی جوان دەکەن ، دەبێ بە نەریتی چینی بیکێشن ، مەگەر ئێمەش کاتی بیرمان لەوێنەی جوان دەکردەوە ئایا بە نەریتی هەراتییەکان نەماندە کێشا ؟ هەموومان حەیرانی وەستا کۆنە هەراتییەکانین . لەدوای هەموو وێنە کێشێکی گەورەوە هەراتی بەهزاد و لە دوای بەهزادیشەوە ئەسپەکانی مەغوول و چینیەکان هەن . زەیتوونێك کە ئەوەندە گرێدراوی ەستا کۆنەکانی هەراتبێ ، بۆچی زەریف ئەفەندییەکی بێچارە بکوژێت کە کوێر کوێرانە و لە خۆشی خراپتر گرێدراوی نەریتە کۆنەکان بوو بکوژێت ؟ وتم : " کێیە ؟ پەپوولە ؟ " . وتی : " بە هەموو

دڵمەوە بڕوام وایە کەلەق لەقە . لەبەر ئەوەی کە گەرم و گوڕی و چاو هەڵگڕاوەیی کار کردنی دەزانم . گویێ لەمە بگرە : بە ئەگەرێکی گەورە زەریف ئەفەندی بێچارە لەوە تێگەیشتبیێ کە ئەو کتێبەی زاواکەت وا جوانکاری بۆدەکات و دەیڕازێنێتەوە بیٚدینی و زەندیقایەتی و ڕەتکردنەوەی تێدایە و ترسابیێ و لەلایەکەوە لەبەرئەوە ئەوەندە گەوج بووبیێ کە گوێی دابێتە لاقردییەکانی مەلاگێلەئەرزڕوومیەکە و – ( وەستا جوانکارەکان لەوێنەکێشان زیاتر نێزیکی خودا دەبنەوە بەڵام بەداخەوە هەموویان بێزارکەر و گەوجن )– لەلایەکیتریشەوە ئەوەی زانیوە کە کتێبەکەی زاوا گەمژەکەی تۆ شتێکی نهێنی و شاراوەی پادشایە و هەر لەبەر ئەوانە ترس و گومانەکانی لەگەڵ یەکدا کەوتبێتە ناکۆکی : بڕوا بە پادشاکەی بکات یان بە مەلا ئەرزڕوومییەکە ؟ ئەم ڕۆڵە بێچارەیەم کەوا وەکوو ناو دەستی خۆم دەیناسم ، ئەگەر کاتێکیتر بایە و دەردێکی هەبایە کە ئێسقانەکانی بخواتەوە یەکسەر دەهات و بەمن یانی بە وەستاکەی دەگوت . بەڵام لەبەر ئەوەی کە ئەویش بە مێشکە بچووکەکەی خۆیەوە تێگەیشتووە کە ڕازاندنەوەی کتێبی زاواکەت کە لاساییکەری فەرنسییەکان بوو خەیانەتە لەبەرامبەر وێنە کێشخانەکە ، هەر لەبەر ئەوە لای من باسی نەکردبیٚو بۆ لەق لەق باسی کردبیێ کە لەبەرامبەر هونەر و عەقڵەکەیدا سەرسامبوو بوو . زۆر جار ئەوەم بینیوە کە لەق لەق لەم سەرسامبوونەی زەریف ئەفەندی کەڵکی وەرگرتووە و بەکاری هێناوە . چ قسە و باسێك لە نێوانیاندا ڕوویدابێت ڕوویداوە بەڵام لەوە دەچیێ لەق لەق ئەویتری کوشتبیێ کەوا حەیرانی فەرنسییەکان بووە . من ناتوانم بڵێم کە زۆر ناڕەحەت بووم . ساڵانێك بەر لە ئێستا زاواکەت پادشای فریو دابوو و ڕازی کرد بوو کەبە

دەستی وێنەکێشێکی وەنیزی وێنەیەکی وەکوو پادشایەکی کافرەکان بکێشرێ ، ( ناوی وێنە کێشەکە سباستیان بوو ) لە دواییدا ئەوەی وەکوو نموونەیەك خستە بەردەستی من و ناچاری کردم کە وێنەی لەڕوو بکێشمەوە . منیش لە ترسی پادشا ئەو کارە پیسە، ئابڕووبەرانەم کرد و زۆر بێشەرەفانە لاسایم کردەوە . ئەگەر نەمکردایە ، لەوانەیە کە مەرگی زاواکەت دڵنگەران ببایەم و بۆ دۆزینەوەی بکوژە ناپیاوەکەی ئەو خۆمم ڕابوەشاندایە . بەڵام دەردی من زاواکەت نیە ، بەڵکوو وێنە کێشخانەکەمە . لەبەر زاواکەت بوو کە هەموو ئەو وێنەکێشانەی وا لە منداڵەکانی خۆم خۆشترم دەوێن و بیست و پێنج ساڵ بەلەرزە لەرز پەروەردەم کردوون هەڵگەڕانەوە و خەیانەتیان کرد و ئێستا دەڵێن لەبەر ئەوەی پادشا وەهای دەوێ بە وێستەوە لاسایی فەرەنسییەکان دەکەنەوە . ئەم بێشەرەفانە هەموویان ئەشکەنجەیان هەق کردووە ! ئێمەی جەماعەتی وێنەکێش ، ئەگەر بەر لەوەی ببین بە عەبدی پادشا ، عەبدی کارەکەی خۆمان بین ئەوا جێگامان بە بەهەشت دەبێ . ئێستاش دەمەوێ بەتەنیا سەیری ئەم کتێبە بکەم . وەکوو پادشایەك کە بە بەرپرسیاری شکستەکان لە قەڵەم بدرێ و سەری لەدار بدەن و دواپین قسەکانی خۆی بکات ، ئەم قسانەی کرد بوو . لاپەڕەکانی ئەوکتێبەی کردەوە کەوا کورتە باڵاکە نابوویە بەردەمی و بە شێوەیەکی سەرزەنشتکەرانە داوای لێدەکرد کە لاپەڕەکانی بۆ بدۆزێتەوە . بەم وەزعە تاوانبارکەرانەیەوە یەکسەر ناسراوە و بووە بە سەرۆکی وێنەکێشان . دوور کەوتمەوە و سەیری سەرینە مرواری نەخشەکان و تفەنگە دەسك زێڕینە لوولە ژەنگ گرتووەکانم کرد و لەگۆشەیەکەوە لەنێو دۆڵابەکانەوە سەیری وەستا عوسمانم کرد . ئەو گومانانەی وا لەکاتی گوێ گرتن بۆ قسەکانی

وەستا عوسمان دەهات بە مێشکمدا ئێستا ئێسقانەکانم دەخۆنەوە : بیری ئەوەی کە لەوانەیە وەستا عوسمان بۆڕاگرتنی کتێبەکەی پادشاکە تەقلیدی فەرنسییەکان دەکاتەوە ، لەپێشدا زەریف ئەفەندییە بێچارەکە و لە دوایشدا زاواکەمی دابیٚ بە کوشتن زۆر لەلام ژیرانە بوو ، هەر بۆیە پەشیمان بوومەوە لەوەی کە تۆزێك بەرلە ئێستا پەسەنی وەستام دابووەوە . لەلایەکیتریشەوە ڕێزیشم هەیە لەبەرامبەر ئەم وەستا گەورەیەدا کەوا بە چاوە کوێرەکەی یان نیوە کوێرەکەی وەکوو ئەوەی سەیری پێستی دەم و چاوی بکات بەوردی سەیری کتێبەکەی بەردەمی دەکات . ئەوەم باش بەمێشکدا دەهات کە دەتوانیٚ بۆ دانانەوەی سیستمی وێنە کێشخانەکە و ڕزگار بوون لە کتێبەکەی زاواکەمان و بوونەوە بە هەڵبژێردراوی پادشا ، نەتەنیا یەکێك لە وێنە کێشان بەڵکوو تەنانەت منیش تەسلیمی ئەشکەنجەی پیاوەکانی بۆستانچیباشی بکات ، بۆ ئەوەی کەلەو عەشقە نەجاتم ببیٚ والە دوو ڕۆژدا منی بەوەوە بەستۆتەوە ، ماوەیەکی درێژ هێزی خەیاڵی خۆمم کۆ کردەوە . ماوەیەکی زۆر تێپەڕ بوو بوو و عەقڵم تێکەڵ و پێکەڵ بوو . تەنیا بۆ ئەوەی کە لە شەیتانەکانی دەروونم نەجاتم ببیٚ و سەرنجی جندۆکەکانم بڵاو بکەمەوە تەماشای لاپەڕەوێنەدارەکانی ئەو کتێبانەم دەکرد والە ناو سندوقەکان دەرمهێنا بوون . کەسانێکی زۆر لە ژن و لە پیاو بە نیشانەی سەر سووڕماوی پەنجەیان خستبووە دەمیانەوە ! لەماوەی دووسەد ساڵی ڕابردوودا ئەمکارە وەکوو نیشانەی سەر سووڕمان لە هەموو وێنەکێشخانەکانی سەمەرقەند و بەغدادا بەکار هێنراوە : کەیخەسرەوی قارەمان کە دوژمنەکانی سەرسام دەکات ، لەکاتێکدا کە بەلەمچییە ناپیاوەکە و پاروچییەکەی ڕێگەی پێنادەن سواری بەلەمەکە ببێت ، لەگەڵ

ئەسپە ڕەشەکەیدا بە یارمەتی خودا لە ئاوی جەیحوون دەپەڕێتەوە ، لەدوایشدا ئەو دوو ناپیاوەش بەنیشانەی سەر سووڕمان پەنجەکانیان دەخەنە دەمیانەوە . کاتیّ کە خەسرەو بۆ یەکەم جار چاوی بە شیرین دەکەوێت کە بە لاشە لەمنگ چووەکەی خۆیەوە لەو گۆمەدا مەلە دەکات کە بەسالاّن زیوی تێدا ڕەش بووەتەوە ، لەو جانییەی سەری سووڕ دەمێنیّ و پەنجەی دەخاتە دەمی.شتێکیتر کەوا بۆ ماوەیەکی درێژ سەیرم کرد ، ژنەکانی حەرەم بوون کەوا لە دەرگا نیوە کراوەکانی کۆشك و لەپشتی پەنجەرە دوو دەستەکانی بورجەکانەوە پەنجەیان خستبووە ناو دەمیان : کاتێك ( تەژاو ) لەبەرامبەر سوپای ئێران شکست دەخوا و تاجەکەی لە دەست دەدا و دەیەویّ لە مەیدانی شەڕ هەڕا بکات ، دەزگیرانە جوانەکەی لە پەنجەرەی کۆشکەوە بە سەر سووڕماوییەوە پەنجە دەخاتە دەمی و بە نیگا خەمبارەکانی سەیری دەکات ، وەکوو ئەوەی کە پێی بڵیّ لەنێو دوژمناندا بە جێم مەهێڵە . کاتیّ کە ( یوسف ) لەبەر تۆمەتەکەی زولەیخا دەگرن کە گوتبووی " هاتووە بۆم " زولەیخا لەبەر پەنجەرەکەوە زیاتر لە سەر سووڕمان بە نیگایەکی پڕلەویست و تامە زرۆییەوە تەماشای ( یوسف ) دەکات و پەنجەی دەخاتە نێو دەمە جوانەکەی .

کاتیّ کە دوو عاشقی خەمبار بە خۆشییەکی لە وێنەی دوای غەزەلێکەوە لە ناو باخچەیەکی وەکوو بەهەشتدا بە هێزی خۆشە ویستیو شەراب سەر خۆش دەبن ، خزمەتکارێکی بەدنییەت لە ڕووی بەخیلیوە پەنجەی دەخاتە نێو دەمە سوور کراوەکەی و سەیریان دەکات . سەرە ڕای ئەوەی کە ئەم حەرەکەتە لە نێو دەفتەری نموونەکانی زۆربەی وێنەکێشان و مێشکیاندا وەکوو قاڵبێکی لێهاتووە بەلاّم ئەو پەنجە درێژە هەرجارە و بە جوانی و

ناسكۆڵەییەکی جیاوازترەوە دەچێتە ناو دەمی ژنێکی جوان . بینینی ئەم وێنانە چەندە دڵدانەوەی داوە ؟ کاتێك خۆر ئاوا دەبوو و تاریکایی دادەهات ڕۆیشتم بۆ لای وەستا عوسمان و وەهامگوت : " وەستام ! ئەفەندم ! کاتێك دەرگا کرایەوە ، بەیارمەتی ئێوە دەمەوێ لە خەزێنە دەرکەوم " .وتی : " خەیرە ! هێشتا شەو و ڕۆژێك کاتمان ماوە ، چاوەکانت چەندە زوو لەبینینی جوانترین ڕەسمەکانی دونیا تێر بوون ! " . کاتێ ئەمەی گوت سەری لەسەر لاپەڕەکەی بەردەمی هەڵنەبڕیبوو ، بەڵام لە کاڵبوونەوەی ڕەنگی گلێنەی چاویدا دیار بوو کە وردە وردە کوێر بوو بوو . بە لێبووردەییەوە وتم : " بەڵام ڕازی لمۆزی ئەسپەکەمان دۆزیوە . "

وتی : " ها ! " .

ئیدی لەمەو بەدوا ، کار کاری پادشا و خەزێنەدارە ، لەوانەیە هەمووشمان ببورن . "

نەمدەزانی ئایا لەق لەق وەکوو پیاوکوژ دەدا بە دەستەوە یان نا ؟ لە ترساندا نەمتوانی پرسیاری ئەمە بکەم . چوونکە لەوە دەترسام کە نەهێڵی بچمە دەرەوە. لەوەش خراپتر جار و بار بڕوام بەوە دەکرد کە لەوانەیە منیش تاوانبار بکات .

وتی : " ئەو دەرزییەی وا بەهزاد خۆی پێ کوێر کردووە ون بووە . "

وتم : " لەوە دەچێ کە کورتە باڵاکە بردبێتیەوە بۆ جێگاکەی خۆی ، ئەم وێنەیە چەندە جوانە وا سەیری دەکەن ! " ڕوومەتی وەکوومنداڵێك پرشەی تێکەوت ، بزەیەکی لێدا . وتی : " ئەمە وێنەی ئەو کاتەیە وا خەسرەو و بە ئەسپەکەیەوە دێتە ژێر کۆشکەکەی شیرین و لە سووتانی عەشقەکەیدا تەماشای شیرین دەکات و چاوەڕوانی دەکات ، بە شێوەی وەستا

هەراتییەکان کێشراوە . "

ئێستاش وەکوو ئەوەی کە وێنەکە دەبینی تەماشای ڕەسمەکەی دەکرد ، بەڵام تەنانەت هاوێنەکەشی بەدەستەوە نەبوو .

" لە تاریکایی ئەم شەوەدا چاوت بە گەڵای دارەکان و گوڵانی بەهار و جوانی دیار نەبوونەکانیان وەکوو ئەستێرەکان دەکەوێ کە لە خۆیانەوە دەدرەوشێنەوە و سادەیی ئەو سەبرەی وا دیوارەکانی چینیوە و ناسکبوون لەبە کار هێنانی ئەستێرە زێرینەکە و کەڵەکە کردن و دارشتنی وێنەکە دەبینیێ ؟ ئەسپەکەی خەسرەو جوان و قۆز ، وەکوو ژنێك ناسکۆڵە و جوانە . شیرینی خۆشەویستی کە لە پەنجەرەکەی سەرەوەدایە ، ملی گەورەیە بەڵام ڕوخسارێکی مەغروور و لە خۆبایی هەیە . وەکوو ئەوە وایە کە لەبەرعەشقی وێنەکێشەکە و ئەم ڕەنگە ناسکانە و دارِشتنی وێنەکە ، عاشقان بۆ هەمیشە لەوێدا ڕادەوەستن ، چاوت پێدەکەوێ ، سەریان تۆزێك بەرەو لای یەکە ، بەڵام لاشەی هەردووکیان بەرەولای ئێمەیە . چونکە دەزانن کە ئەو شتەی واتێیدا ڕاوەستاون وێنەیەکە و لە ئێمەشەوە دیار دەبن . لەم ڕووشەوە ، دیانەوێ دەقا و دەق لەو شتانە نەچن کەوا ئێمە هەموو کات دەیانبینین . بە پێچەوانەوە ئاماژە بەوە دەکەن کە بیرەوەریەکانی خوداوە دەرکەوتوون .لەبەر ئەمەش لەوێدا یانی لە نێو ڕەسمەکەدا زەمان ڕاوەستاوە . هەرچەندە کە ئەفسانە و چیرۆکەکانی ئەم وێنانە بەپەلەپەل باسبکردرێن ، بەڵام ئەمان وەکوو کچی ناسکۆڵە و شەرمنی باش پەروەردە کراو ، دەستیان لەوەی زیاتر لەسەر شان یان وەکوو سینگە ناسکۆلچەکانیان بێت ، هیچ جم و جووڵێکی زیاتر ناکەن و هەتا هەتایە وەها دەمێننەوە . لەگەڵ ئەواندا لە نیوە شەوی نیلی دا هەموو شتێك دەیبەستێت . پەلەوەرەکەی

ئاسمان لە ناو تاریکاییدا و لە نێوان ئەستێرەکاندا وەکوو لێدانی بەپەلەی دڵی خۆشەویستەکان دەفڕێ و لە لایەکیتریشەوە لە نێو ئەو کاتە بێ هاوتایەدا وەکوو هەڵفڕین بەرە و ئاسمان هەتاهەتایە دەمێنێتەوە . ئەگەر وێنەکێشە هەراتییەکان بەر لەوەی تاریکاییە مەخمەڵینەکەی خودا بێت بەسەر چاویاندا بەبێ هیچ جمو جووڵێك سەیری وێنەی لەم چەشنە دەکەن ، لەبەر ئەوەیە کەوا دەزانن ڕۆژێك ڕۆحەکانیان لەگەڵ کاتە بێکوتاییەکەی ئەو وێنانەدا یەك دەگرێتەوە ، تەنانەت ئەگەر کوێریش بووبن . "

تا کاتی بانگی ئێوارە کاتێك کەبە بەزمەکەی جاران دەرگاکە کرایەوە ، وەستا عوسمان هێشتا هەربەو سەرەنجەوە تەماشای ئەو پەلەوەرەی دەکرد والە ئاسماندا ڕاوەستا بوو . بەڵام ئەوانەی وا هەستیان بە کاڵبوونەوەی ڕەنگی گلێنەی چاوی‌ی دەکرد دەیانزانی کە ئەمیش وەکوو هەندێك لەو کوێرانەی وابە هەڵە سەیری قاپێك دەکەن ، بە شێوەیەکی سەیر تەماشای ئەو وێنەیە دەکرد . کاتێك کە پاسەوانەکانی ژووری خەزێنە زانیان وەستا عوسمان هێشتا دەمێنێتەوە و جەزمی ئاغاش لەبەر دەرگا دەبێ ، زۆر بە باشی نەیانپشکێنیم ، هەر بۆیە هەستیان بە دەرزییەکە نەکرد لەناو شۆرتەکەمدا . کاتێك لە حەوشەی کۆشکەکە دەرکەوتم و هاتمە ناو کۆڵانەکانی ئەستەنبووڵ چوومە چۆڵاییەکەوە و دەرزییەکەم دەرهێنا و خستمە ناو بەینی پشتوێنەکەم وەکوو ئەوەی هەڕا بکەم لە نێو کۆڵانەکانەوە ڕێم دەکرد .

هەوای ساردی خەزێنەکە ئەوەندە کاری لێکرد بووم کە وامدەزانی بە زوویی لە کۆڵانەکانی شاردا بەهار هاتووە . لەبەر دەم دوکانە داخراوەکانی سەرتاشین و سەوزە فرۆشی و دار فرۆشی ، گیا فرۆشی بازاڕی خانە

کۆنەوە هێواشتر دەڕۆیشتم و لەبەر ڕۆشنایی چراکاندا بەوردی سەیری بەرمیل و ڕووپۆش وگێزەرەکانم دەکرد .

کۆڵانی زاواکەمانم ـ ( هێشتا نەمدەگوت کۆڵانی خۆم یا خود کۆڵانی شەکورە ) ـ لەدوای دوو ڕۆژ وەکوو جێگایەکی دوور و نائاشنا دەهاتە پێش چاو .بەڵام خۆشی بینینەوەی شەکورە و بەرەو پیش چوونی کاری ئاشکرا کردنی بکوژەکە و بەگوێرە ئەویش بە دەستهێنانی مەجالی خەوتن لەگەڵ شەکورەدامنی وەها لە دونیا نێزیك دەکردەوە کە کاتێك چاوم بە پەنجەرە تازە تەعمیر کراوەکە کەوت خەریکبوو وەکوو کابرایەکی بوستانچی لەوبەر دۆڵەکە وە بقیڕێنم بەڵام هەر چۆنێك بوو خۆمم ڕاگرت . چوونکە کاتێك کە شەکورەم بدیبایە دەمویست وەها دەست بە قسە بکەم . " پیاو کوژە مەلعوونەکە دۆزرایەوە " . دەرگای حەوشەکەم کردەوە . نازانم لە جیڕە جیڕە دەرگاکەوە بوو یان لەبێخەمی ئەو چولەکەیە بوو وا لە سەتڵی ئاوی بیرەکە ئاوی دەخواردەوە یان لەبەر هەستە گورگانەی کابرایەك بوو کە دوانزە ساڵ بەتەنیا ژیابێ زانیم کە کەس لەماڵەوە نیە . مرۆۋ کاتێك هەست بە تەنیایی دەکات ، هەموو دۆڵاب و قابلەمە و دەرگاکان دەکاتەوە ، منیش وەهام کرد . سندوقەکانیشم کردەوە و تەماشام کردە . لەماوەی ئەم بێدەنگییەدا تەنیا شتێك کە گوێم لێیبووبێ دەنگی لێدانی دڵی خۆم بوو . وەکوو کابرایەکی پیرکە ئاردەکەی ئەڵەك کردبێ و ئەڵەکەکەی هەڵواسی‌بێ لە ژێر سندوقێکی دوورەوە شمشێرەکەم دەرهێنا و خۆمم ئامادە کرد ، ئەوسا ئارام بوومەوە . لەو ساڵانەی وابە قەڵەمەکەم کارم بۆ خۆم پەیدا دەکرد شمشێرە دەسك شفرەینەکەم ئاسوودەیی و هاوسەنگی ( تەنانەت لە ڕۆیشتنیشدا ) بۆ پەیدا کردووم . کتێبەکان تەنیا قەڵاییەك زیادەی

ناخۆشییەکانی مرۆڤ دەکەن کە ئێمە وادەزانین دڵدانەوەیە . داکەوتمە ناو حەوشەکە . وەکوو ئەوەی کەشتییەکی غەرقبوو بەجیٚبهێڵم، لە ژێر بێدەنگی تاریکاییە داکەوتووەکەدا ماڵەکەم بەجێهێشت و دەرکەوتم . دڵم بە متمانەییەکی زیاترەوە دەیگوت ، هەڕاکە ، بڕۆ بیاندۆزەرەوە . هەڕام کرد . بەڵام کاتێك کە لە جێگا جەنجاڵەکان و ڕێکورتی حەوشەی مزگەوتەکانەوە دەرۆیشتم و جەنجاڵی سەگەکان ڕووی لە زیاد بوون دەکرد کەوا بۆ خۆشی ڕاوەدوویان دەنام ، هێواشتر دەڕۆیشتم .

## (( ناوی من ئەستەرە )) (53)

بۆ چێشتی ئێوارە شۆربای نیسکم دەکولاند کە نەسیم وتی : " یەکێك لەبەر دەرگاکەدایە . "

وتم : " بنی شۆرباکە نەیگریٚ " و کەوچکەکەمدا بە دەستە پیرەکەیەوە و دوو جار شۆرباکەم تێکدا . چونکە ئەگەر نیشانی نەدەیت بە ساعاتان

کەوچکەکە بەبێ جووڵە لە ناو شۆرباکەدا ڕادەگرێ . کاتێ لەبەر دەرگاکەدا چاوم بەرەشە کەوت بەزەییم پێیدا هاتەوە . لە ڕوومەتیدا شتێکی وەها دیار بوو کە مرۆڤ نەیدەوێرا پرسیاری لێبکات . وتم : " تۆ مەیە ژوورەوە ئێستا خۆم دەگۆڕم و دێم . " جلە پەمەییە ڕەنگ زەردەکانم کردەبەر ، ئەم جلەم لەکاتی خۆشییەکانی ڕەمەزان و لەسەر سوفرەکانی زەماوەند لەخۆ دەکرد . بوخچەی جەژنانەکەم هەڵگرت و بە نەسیمە بێچارەکەم گوت : "لەکاتی گەڕانەوەمدا شۆرباکەم دەخۆمەوە . " لە گەڕەکە هەژار نشینە جوولەکەکەمانەوە کە دوکەڵکێشەکانیشیان وەکوو قابلەمەکانیان دووکەڵی کەمی لێوە هەڵدەستا تێپەڕ بووین و نەبووین کە وتم : " مێردەکەی جارانی شەکورە لەشەڕ گەڕاوەتەوە . " تاوەکوو دەرکەوتن لە گەڕەکەکە هیچ پرسیارێکی نەکرد . ڕوومەتی وەکوو خۆڵەمێشی لەرەنگی شەوی لێهاتبوو . زۆر دواتر پرسیاری کرد و گوتی : " لەکوێن ؟ " بەمجۆرە تێگەیشتم کە شەکورە و منداڵەکانی لەماڵ نین . وتم : " لە ماڵی خۆیاندان . "

لەبەر ئەوەی ئەم قسەیە باسی ماڵی پێشووی شەکورەی دەکرد دەمزانی کە دڵی ڕەشە شەپۆلاوی دەبێت هەربۆیە بە دووهەمین وشەوە دەرگایەکی هیوام بۆ کردەوە . " لەوانەیە . " تەماشای نێو چاوانمی کرد و پرسیاری کرد و وتی : "تۆ مێردە لەشەڕ گڕاوەکەیت بینی ؟ "

" من نە مێردەکەی نە خودی شەکورەم بینیوە . "

" لەکوێوە زانیت کە ماڵی بەجێهێشتووە ؟ "

" لە ڕوومەتی تۆوە " . بە بڕیارەوە وتی : " هەموو شتێکم بۆ باس بکە"

ئەم ئەستەرە وا چاوی لەپەنجەرەیە و گوێی لەڕێیە و بەدەیان کچی بە خەیاڵی داوە بە شوو و دەتوانێ بە ئاسانی لە دەرگای هەموو ماڵێکی

خەفەتبار بدات . بۆ ئەوەی کە ببیٚ بە ئەستەر ، ئەوەندە دەردەدارە تیٚناگات کە دەبیٚ هەموو شتیٚك نەگیٚڕیٚتەوە . وتم : " حەسەنی برای میٚردەکەی جارانی شەکورە دەچیٚتە ماڵتان ـ کاتیٚك وتم ماڵتان چاوم لیٚبوو کە پیٚیخۆش بوو ـ و بە شەوکەت دەڵیٚ باوکت خەریکە دەگەڕیٚتەوە و عەسر دەگاتەوە ماڵ و ئەگەر چاوی بەئیٚوە و دایکتان نەکەویٚ تووشی خەفەت دەبیٚ ، شەوکەت ئەگەر خەبەرەکەشی گەیاندبیٚتە دایکی دیسان شەکورە بە وریایی هەڵسوکەوتی کردووە و بڕیاریٚکی لەو بارەیەوە نەداوە . بەرەو عەسر شەوکەت لە ماڵ هەڕا دەکات و پەنادەباتە لای باپیری . "

" تۆ ئەمانە لەکویٚوە فیٚر دەبی ؟ "

" شەکورە پیٚی نەگوتوویی کە حەسەن لەم دووساڵەی دواییدا بۆ گەڕاندنەوەی شەکورە فیٚڵ و تەڵەکەی جۆرا و جۆری بەکار هیٚناوە ؟ ماوەیەك حەسەن بەریٚگای مندا نامەی بۆ شەکورە دەنارد . "

" شەکورە هیچ وەڵامی دەدایەوە ؟ "

بە شانازییەکەوە وتم : " هەموو جۆرە ژنیٚکی ئەستەنبووڵ دەناسم بەڵام کەسی وەکوو شەکورە م نەبینیوە کە گریٚدراوی ماڵ و میٚرد و ناموسی خۆیبیٚ . "

" بەڵام ئیٚستا من میٚردی ئەوم . "

لەدەنگیدا ئەو بیٚمتمانەییەی پیاوان دیار بوو کە هەمیشە ئازاری دەدام، شەکورە بچووبایەتە کام لا ئەویتر دەڕووخا.

" شەوکەت لەنامەیەکدا کە حەسەن پیٚیدا بووم بۆ ئەوەی بیبەم بۆ شەکورە نووسیبووی چاوەڕوانی باوکی دەکا و هاتووە بۆ ماڵی باپیری و دایکی بە مارەبڕینیٚکی درۆینە لەگەڵ میٚردکی درۆزندا زەماوەندی کردووە

هەر بۆیەش زۆر دڵنگەرانە و ئیدی ناگەڕێتەوە بۆ ئەو ماڵە . "

" شەکورە چیکرد ؟ "

ئەو بێچارەیە ئەو شەوە لەگەڵ ئورهاندا بەتەنیا چاوەڕێی تۆیان دەکرد."

" خەیرییە ؟ "

" خەیرییە ساڵانێکە بەدوای هەلێکدا دەگەڕێ کە شەکورە لە کەوچکێك ئاودا بخنکێنێ ، لەبەر ئەوەش دەچووە باوەشی زاوا خوالێخۆشبووەکەتەوە . حەسەن کاتێك زانی کە شەکورە لەگەڵ ترسی بکوژ و تارماییدا ماوەتەوە بە ڕێگای منەوە نامەیەکی بۆ شەکورە نارد . "

" چی نوسیبوو ؟ "

" زۆر سوپاس بۆ خودا کە ئەم ئەستەرە بێچارەیە خوێندن و نووسینی نیە بەڵام کاتێك کە پیاوە ماقووڵەکانی تووڕەکان و باوکە دەمار گرژەکان ئەم پرسیارەی لێدەکەن وەها دەڵێ : من نامەکەم نەخوێندەوە بەڵام ڕوخساری کچەکەم خوێندەوە . "

" چیت خوێندەوە ؟ "

" بێچارەیی!"

ماوەیەکی درێژ هیچ قسەیەکمان نەکرد . لەسەر کلیسایەکی بچووکی ڕوومییەکاندا چاوم بە بایەقوشێك کەوت کەلەسەر بانەکەی دووکەڵی وەردەگرت و چاوەڕوانی دەکرد . منداڵە چڵمنەکانی گەڕەکم بینی کەوا تەماشای جل و بەرگەکەی من و بوخچەکەمیان دەکرد و دەکەنین . چاوم بە سەگێکی گەڕ کەوت کەوا بەخۆ خوراندنەوە و بە خۆشییەوە لەنێو دارە سەروەکانی قەبرستانەکەوە لەبەر داهاتنی شەودەهاتەخوارەوە .

دواتر قیڕاندم بەسەر ڕەشەدا و وتم : " هێواشکە ، من ناتوانم وەکوو تۆ

لەم بەرەو ژووركانەدا سەركەوم، بەم بۆخچەیەی دەستمەوە من بۆ كوێ دەبەی ؟ "

وتی " بەرلەمە تۆ من ببەیتە ماڵی ئەم حەسەنە بۆخچەكەت دەكەمەوە و دەتبەم بۆلای ئەو جوانمێرانەی وا دەستماڵی ڕەنگاو ڕەنگ و پشتوێنی ئاورێشمینی و كاسەی پارە بۆ خۆشەویستەكانیان دەكڕن . "

بەم وەزعە بێچارەیەی خۆیەوە گاڵتەكردنەكەشی شتێكی باشە بەڵام لەگاڵتەكەیشیەوە تێگەیشتم كە دەیەوێ بەراستی چیبكات .

وتم : " ئەگەر لەشكەرێك كۆدەكەیتەوە هیچ ناتبەمە ماڵی حەسەن ، زاورم لە شەڕ و ئاژاوە دەتۆقێ . "

وتی : " ئەگەر تۆ ئەستەرە ژیرەكەی جاران بی ، شەڕ و ئاژاوە دەرناكەوێ . " لە ( ئاكسەرای )وە تێپەڕ بووین و چوونە پشتەوە بۆ ئەو ڕێگایەی‌وا دەچێتە ناو بۆستانەكان . ڕەشە ڕۆیشتە ناو دوكانێكی سەرتاشییەوە ، لەگەڕەكێكدابوو كە زەمانی خۆی برەوی هەبوو . چاوم بە وەستایەك كەوت كەوا لەبەر ڕووناكی چراكەدا قژی چاك دەكرد و لەگەڵ شاگردە ڕوومەت پاكە دەست جوانەكەیدا قسەی دەكرد . زۆری پێنەچوو كە سەرتاشەكە و شاگردەكەی و دوو پیاویتریش هاتن بۆ ( ئاكسەرای) بۆلای ئێمە . شمشێر و تەوریان پێبوو . لە ( شازادەباشی )دا كوڕێكی خوێنەواریش بە خەنجەرەكەی دەستیەوە هات بۆلامان ، بەلای منەوە ئەمە هیچ پاڵەوانیەتی پێنەدەكەوت . وتم : " بەرۆژی ڕۆشن هێرش دەكەنە سەرماڵان ؟ "

رەشە بە شێوازێك كە زۆر حەزی لە گاڵتە بێت وتی : " ڕۆژ نیە شەوە "

وتم : " مەڵێ لەشكەرێك پیاوم ئامادەكردووە و لەخۆبایی مەبە و بڕوابە

خۆمەکە ، با ( یەنیچەرییەکان)  بەم چەکانەوەچاویان پێتان نەکەوێ . "

" کەس نابینی . "

"دوێنێ پیاوەکانی ئەرەزڕوومییەکە لە ( ساغر قاپی )دا لەپێشدا هێرشیان کردۆتە سەر مەیخانەیەك و لە دواییدا چوونەتە سەر تەکیەیەکی ( جەڕاحی ) و هەر کەسێکیان دارکاری کردووە ، پیاوێکی پیر بەزەربەیدارمردووە، لەوانەیە لەم تاریکایە کوێرەدا وابزانن ئێوەش لەوانن."

" چووی بۆ ماڵی زەریف ئەفەندییە بێچارەکە ، خوات لێڕازی بێت لەلای ژنەکەی چاوت بە وێنەی ئەو ئەسپانە کەوتووە وا مورەکەبەکەی بڵاو بووەتەوە و شەکورەت ئاگادار کردۆتەوە . زەریف ئەفەندی لەگەڵ پیاوەکانی ئەم ئەرزڕوومیەدا زۆرهاتووچۆی هەبوو ؟ "

وتم : " لەبەر ئەوە بوو کە وەهام بیر کردۆتەوە ئەگەر لەو ماڵەدا تۆزێك زیاتر بونیدەم تاقیبکەمەوە لەوانەیە بەکەڵکی شەکورە بێت .خۆی لەخۆیدا بۆ فرۆشتنی قوماشە تازە هاتووەکانی فلامینگ ڕۆیشتبووم بۆ ئەوێ ئەگینا ئەو بیرە بچووکە یەهودییەی من لەکوێ دەگاتە شەڕ و سیاسەتی ئێوە "

- " ئەستەر خان! تۆ زۆر ژیری . "

- " لەبەر ئەوەی کە وەهام بائەم شتەت پێبڵێم : پیاوەکانی ئەم مەلا ئەرزڕوومییە گیانی زۆرتر دەگرن و زۆرتر هار دەبن،خۆتانی لێبپارێزن . "

- کاتێ کە ڕۆیشتینە کۆڵانی پشتی ( چارشی قاپی ) لێدانی دڵم خێراتر بوو . پەلە ڕووت و نیوە تەڕەکانی دارە توو وکەستانەکان لەبەر ڕووناکییە کەمڕەنگەکەی مانگدا دەبریقایەوە . ئەو بابیەی وا جندۆکە و تارماییەکان فوویان کرد بووو هەڵیان کرد بووچمکەکانی بوخچەکەمیان ڕاوەشاند و

دارەكانیش فیتەیان لێدا و بۆنی جەنجاڵەكەمانیان گەیاندە ئەو سەگانەی گەڕەك والەكەمیندا ڕاوەستا بوون. كاتێ هەریەك لەوان دووواڕەی كرد ماڵەكەم نیشانی ڕەشەدا . ماوەیەك بە بێدەنگی تەماشای سەربان و پەنجەرە تاریكەكانیمان كرد . ڕەشە پیاوەكانی لە حەوشە و لەلا و ئەولا لەپشتی ماڵەكەدا جێگیر كرد . وتم : " ئەم بەینە لەتەنچینێكی ڕەزیلی تاتاری لێیە . كوێرە بەڵام لە موختارەكە باشتر دەزانێ كە كێ چووە و كێ هاتووە . وەكوو مەیمونە بێئەدەبەكانی پادشا هەمیشە بە دەستی بە شتەكەی یاری دەكرد ، ئەگەر بەبێئەوەی دەستی لێبدەن هەشت نۆ ئاكچەی بۆ بژمێرن هەموو شتێكتان پێدەڵێ . " لەدوورەوە سەیری ئەوەم كرد كە ڕەشە لە پێشدا پارەی دایە و لە دواییدا شمشێرەكەی خستە سەر قوڕگی . لەدواییدا نازانم كە چوون بوو شاگردی دەلاكەكە بە دەسكی تەوركەی دەستی بە لێدانی تاتارەكە كرد . وتم ئێستا تەواو دەبێ و تۆزێك سەیرم كرد بەڵام تاتارەكە دەگریا ، بەرلەوەی بیكوژێ لەبەر دەستی دەرمهێنا . شاگردی دەلاكەكە وتی : " جنێوی بە دایكمدا ". ڕەشە وتی : " دەڵێ حەسەن لەماڵ نیە ،ئایا قسەی ئەم كوێرە ڕاستە ؟ " نامەیەكی‌نوسیبوو ، پێیدام و وتی بیبە بۆ حەسەن ئەگەر لەوێ نەبووبیدەبە دەستی باوكیەوە . " كاتێ نامەكەم لێوەرگرت وتم : " ئەی نامەت بۆ شەكورە نەنووسیوە ؟ "

وتی : " ئەگەر نامەی بۆ بنووسم ئەوە دەبێ بە هۆی ورووژانی زیاتری پیاوەكانی ناو ماڵ . پێی‌بڵێ بكوژە ناپیاوەكەی باوكیم دۆزیوەتەوە . "

" ئەمە ڕاستە ؟ "

" تۆ بڵێ . "

سەرزەنشتی تاتارەكەم كرد واهێشتا دەگریا و بێدەنگم كرد و گوتم : "

ئەوەی وابۆتۆم کردووە لەبیرت نەچیٚ . " و زانیم کە هەموو ئەم درێژ کردنی کارانە بۆ ئەوەیە کەوا لەویٚ جودا نەبمەوە . بۆچی لووتم کردبوو بەناو ئەم هەموو کارەدا ؟ دوو ساڵ بەرلەئێستا لە " ئەدیرنەقاپی "هەرزەکارێك ژنێکی بۆخچەچی لەبەر ئەوەیوا ئەو کچەی کە پەیمانی پێدا بوو لەگەڵ کەسیتردا زەماوەندی کرد بووکوشتبوو،دایکی دایکم هەموو کات پێیدەگوتم تورکەکان زۆر جار بەبیٚ هۆ پیاو دەکوژن . نەسیمەکەم هاتەوە پێش چاو وائێستا لە ماڵدا شۆربای نیسکی دەخوارد . هەرچەندە کە پێم دەیەویست بەرەو دواوە بێت بەڵام کاتیٚ زانیم شەکورە لەوماڵەیە بەرە و ئەویٚ ڕۆیشتم .مەراقیش دەروونمی دەورووژاند .

بوخچەچی : " لەچینەوە قوماشی جەژنانەم بۆهاتووە . " هەستم بەوە کرد کە تیشکە نارنجییەکەی بەرپەنجەرەکەجوولاٚیەوە . دەرگا کرایەوە . باوکە ناسکەکەی حەسەن بردمیە ژوورەوە . ماڵ وەکی ماڵی دەوڵەمەندان گەرمبوو . شەکورە لەبەر ڕۆشنایی چرایەکەدا لەگەڵ منداڵەکانیدا لەسەر سوفرەیەك دانیشتبوو ، کاتێك منی بینی ڕاپەڕییە سەرپیٚ . وتم : " شەکورە !مێردەکەت هاتووە . "

وتی : " کامەیان ؟ "

وتم : " تازەکە ، بە پیاوە چەکدارەکانیەوە دەورووبەری ماڵیان حەشارداوە ، هاتوون لەگەڵ حەسەن شەڕبکەن . "

خەزووری پیر وتی : " حەسەن لەماڵ نیە . "

وتم : " چ هەڵکەوتێك ! " وەکوو نێردراوێکی لەخۆبایی کە نامەی پاشایەك بدات بە کەسێك نامەکەی ڕەشەم پێدا و گوتم : " تۆ ئەمە بگرە وبیخوێنەرەوە بزانم." کاتیٚ خەزوورە ناسکەکە نامەکەی دەخوێندەوە

شەكورە گوتی : " ئەستەر! وەرە با شۆربای نیسکت پێبدەم ، گەرم دەبێتەوە . " لەپێشدا وتم : " حەزی لێناکەم . " لەوەیوا وەکوو ئەوەی کە ئەم ماڵەی بە دڵ بێت قسەی دەکرد خۆشم نەهاتبوو . بەڵام کاتێ کە زانیم دەیەوێ بەتەنیا لەگەڵم قسە بکات کەوچکەکەم هەڵگرت و لەدواوەی ڕۆیشتم . بەچپەوە گوتی : " بەرەشە بڵێ کە هەمووی لەبەر شەوکەت وایلێهات ، دوێنێ شەو بە ترسی پیاو کوژەکەوە لەگەڵ ئورهاندا بەتەنیا چاوەڕێمان کرد . ئورهان هەموو شەو دەلەرزا . منداڵەکانم جیا بوونەتەوە ! کام دایك لە منداڵەکانی جیا دەبێتەوە ! کاتێ ڕەشە نەگەڕایەوە هەواڵی ئەوەشیان هێنا کە پیاوەکانی پادشا ئەشکەنجەیان کردووە و خۆیداوە بە دەستەوە و دەستی لە کوشتنی باوکمدا هەبووە . "

" مەگەر کاتێك کە باوکت کوژرا ڕەشە لەگەڵ تۆدا نەبوو ؟ "

" چاوە جوانەکانی کردبووە و گوتی : " ئەستەر! یارمەتیم بدە . "

" پێم بڵێ بزانم بۆچی گەڕایتەوە بۆ ئێرە تاوەکوو یارمەتیت بدەم . "

" یانی دەتەوێ بڵێی نازانی بۆچی گەڕاومەتەوە . " ویستی بگری و وتی : " ڕەشە پاڵی ناوەبە شەوکەتمەوە ، کاتێ حەسەن گوتی باوکی ڕاستەقینەی منداڵەکان گەڕاوەتەوە بڕوام پێکرد . "

بەڵام لە چاوەکانی دەمزانیکە درۆ دەکات و ئەویش دەیزانی کە زانیومە . بەچپەوە گوتی : " فریوی حەسەنم خوارد ! " و لەم قسەیەدا هەستم بەوە کرد کە دەیەوێ بزانم حەسەنی خۆشدەوێ . بەڵام شەکورە دەیزانیلەو کاتەی وا مێردی بە ڕەشە کردووە زیاتر بیری حەسەنی کردۆتەوە ؟ دەرگا کرایەوە خەیرییە بە نانێکی بۆن خۆشی گەرمەوە هاتە ناو . کاتێ منی بینی پیێناخۆش بوو ، زانیم لەدوای مەرگی زاواوە ئەم بەڵای میراتە بۆ شەکورە

ماوەتەوە کە ئەگەر فڕێیبدەی فڕێ نادرێ و ئەگەر بیفرۆشی دیسان نافرۆشێت . کاتێ شەکورە گەڕایەوە بۆلای منداڵەکانی ڕاستی کێشەکەم بۆ دەرکەوت : کێشەکە لەوەدا نیە شەکوورە بەدوای مێردێکدا بگەڕێت کە خۆشی بوێت بەڵکوو بە دوای یەکێکدا دەگەڕێ کە منداڵەکان حەزی لێبکەن . ئەگەر ڕەشە بێت یان حەسەن هیچ فەرقێك ناکات و دۆزینەوەی ئەوەش تۆزێك سەختە . شەکورە ئامادەی ئەوە بوو کە بەنییەتی باوەشەوە حەز لەهەموو مێردە باشەکان بکات بەبێ ئەوەی بیر بکەمەوە وتم : " بەدڵەوە بەدوای ئەو شتەدا دەگەڕێی کە دەتەوێ بەڵام دەبێ بە عەقڵت بڕیار بدەی . "

وتی : " هەر ئێستا لەگەڵ منداڵەکانمدا دەگەڕێمەوە بۆلای ڕەشە بەڵام مەرجم هەیە ! " ماوەیەك بێدەنگ بوو لە دواییدا وتی : " بەباشی هەڵسوکەوت لەگەڵ شەوکەت و ئورهاندا بکات ، حیسابی ئەوەم لێنەپرسێت کە بۆچی پەنام هێناوەتە ئێرە . هەروەها مەرجی هاوسەریشمان هەبوو ئەبێ بەجێیان بهێنێ ـ دەزانێ ـ دوێنێ شەو منی لەبەردەم حەسەن و پیاو کوژەکەو دز و بێخەبەرەکاندا بەتەنیا هێشتۆتەوە .

وتم : " بکوژەکەی باوکت هێشتا نەدۆزراوەتەوە ، بەڵام ئەو پێی گوتم کە پێت بڵێم دۆزراوەتەوە . "

"بچم بۆلای ؟ "

من وەڵامێکم نەدابووەوە کە خەزوورە کۆنەکە کە نامەکەی لە زووەوە تەواو کرد بوو گوتی : " بە ڕەشە چەلەبی بڵێن من ناتوانم بەرپرسیاری دانەوەی بووکەکەم بگرمە ئەستۆ لەکاتێکدا کە کوڕەکەم لێرەدا نیە . "

بە دەنگێکی ناسکەوە وەکوو ئەوەی کە ئامۆژگاری بکەم گوتم : "کام

کوڕت ؟ " لەبەر ئەوەی کە پیاوێکی بەڕێز بوو بە شەرمەوە گوتی : " حەسەن ، هەندێك شایەت هەن کە دەڵێن کوڕە گەورەکەم لە وڵاتیعەجەم دەگەڕێتەوە ." دوو کەوچکم لە شۆرباکەی شەکورە خوار دوگوتم : " حەسەن لە کوێیە؟" بە فێڵی مندالآنەی پیاوە گێلەکانەوە و بەبیٚ بادانەوەی درۆکەی گوتی : " ڕۆیشتووە بۆ کۆ کردنەوە نووسەرەکان و حەماڵەکان و پیاوەکانی لە گومرك . لە دوێنێوە لەدوای کردەوەکانی ئەرزڕوومییەکان یەنیچەرییەکان لە بازاڕدا دەگەڕێن . "بەرەو دەرگاکە ڕۆیشتم و گوتم :" ئێمە نەمانبینین ، دوایین قسەت ئەمەیە ؟ "بۆ ئەوەی خەزوور بترسێنم ئەمانەم پێگوتبوو . بەڵام شەکورە باش دەیزانی کە چیم لێپرسیوە . ئایا بەراستی مێشکی ئەوەندە تێکەڵ و پێکەڵە یان وەکوو شتێك دەشارێتەوە ، بۆ نموونە چاوەڕێی گەڕانەوەی حەسەن و پیاوەکانیان دەکرد ؟ لەراستیدا شەکورە دەیزانی کەمن حەزم لە بیٚبڕیارییەکەی کردووە. شەوکەت بە لێبوردەییەوە گوتی : "ئێمە ڕەشەمان ناوێت ، تۆش جارێکیتر مەیە بۆ ئێرە ، شیشکۆ! "

گوتم : " بەڵام ئەگەر من نەبم کیٚ ڕووپۆشی ڕیشڵدار و دەستماڵی گوڵ گوڵین دێنیٚ بۆ دایکت و کیٚ قوماشە سوورەکانی کراس دێنیٚ واتۆ حەزیان لێدەکەی ؟ " و لە دواییدا بوخچەکەم دانایە ناوە ڕاستی ژوورەکە و گوتم : " تا ئەو کاتەی دێن، بیکەنەوە و سەیری بکەن و ئەوەی وا دەتانەویٚ بیپۆشن و لە خۆتانی هەڵواسن و بیبڕن و پێوانی بکەن و بیدروون . " کاتیٚ دەرکەوتم نارەحەت بووم : تا ئەو کاتە چاوی شەکوورەم بەپڕی نەبینیبوو . بە ساردییەکەی دەرەوە ڕاهاتم و نەهاتم کە ڕەشە بە شمشێرەکەی دەستیەوە لەرێگا قوڕاوییەکەی دەرەوەدا ڕایوەستاندم .وتم: " حەسەن

لەماڵ نییە . لەوانەیە بۆ پیرۆزبایی کردنی گەڕانەوەی شەکورە چووبێ بۆ بازاڕ بۆ کڕینی شەراب . لەوانەشە کە وەکوو ئەوەی کە دەیانگوت چووبێ بۆ کۆکردنەوەی پیاوەکانی و هەر ئێستا دێتەوە . ئەوکات لەیەك دەخەن . چونکە شێتە . بگرە ئەو کاتەی کە شمشێرە سوورەکەی بگرێ بە دەستیەوە! "

" شەکورەچی‌گوت ؟ "

" خەزووری گوتی نا ، نابێ ، بووکەکەم نادەم . بەڵام تۆ لەوە مەترسە لە شەکورە بترسە ، مێشکی تێکەڵ و پێکەڵە ، دوو ڕۆژ لەدوای کوژرانی باوکی و لەگەڵ ترسی بکوژەکە و هەڕەشەکانی حەسەنداماوەتەوە وتۆش هیچ خەبەرێکت بۆ جێنەهێشتووە ، وا زانیویەتی کە ناتوانێ دوو شەو لەوێدا بمێنێتەوە هەر لەبەر ئەوەش گەڕاوەتەوە . ئەوەشیان پێ‌گوتوە کە دەستی تۆش لە کوشتنی باوکیدا هەبووە ... بەڵام مێردەکەی جارانی شەکورە نەگەڕاوەتەوە . شەوکەت بڕوای بە قسەکانی حەسەن کردووە . وا دیارە کە باوکیشی بڕوای کردبێ ... شەکورە دەیەوێ بگەڕێتەوە بۆلای تۆ بەڵام هەندێك شەرتی هەیە . " تەماشای نێو چاوانی ڕەشەم کرد و مەرجەکانم پێڕاگەیاند . یەکسەر وەکوو ئەوەی کە لەگەڵ نێردراوێکدا ( باڵوێز ) قسە بکات بە شێوەیەکی ڕەسمی مەرجەکانی پەسەند کرد . وتم : " منیش مەرجێکم هەیە " ، تەختەکانی پەنجەرەی پشتی خەزوورم نیشاندا و گوتم : " تۆزێك دواتر هێرش بکەنە سەر ئێرە و دەرگاکە . کاتێ من قیڕاندم بیبڕنەوە . ئەگەر حەسەنیش هات بەبێ هیچ ترسێك لەیەك دەدەن " هەڵبەت ئەمە قسەی نێردراوێك نەبوو کە بەدوای چارەدا بۆ خۆی بگەرێ ، بەڵام ئەم ئەستەرە خۆی دەخاتە ناوهەموو ئیشێك . کە وتم : " بوخچەچی " یەکسەر

دەرگاكەكرايەوەو يەكڕاست ، خەزوور هاتەبەرامبەرم .

وتم : " هەموو گەڕەك و قازييەكەی ئەم ناوەش ئاگادارن كە شەكورە جيا بووەتەوە و بەپێی قورئانی ـ كەريم ـ ، مێردی كردۆتەوە . ئەگەر كوڕەكەی تۆ دووبارە زيندوو ببێتەوە و لەلای حەزرەتی موساوە بگەڕێتەوە بۆ ئێرە ديسان بايەخێكی نيە ، چوونكە شەكورە جيا بووەتەوە . ژنێكی مێرددارتان ڕفاندووە و لێرەدا دەستتان داوە بەسەريدا ، ڕەشە داوای لێكردم كە پێتان بڵێم بەرلەوەی قازی سزاتان بدات خۆی و پياوەكانی سزاتان دەدات . " خەزوور بە ناسكييەوە گوتی : " كارێكی هەڵە دەكات ، خۆ ئێمە شەكورەمان نەڕفاندووە ! شوكر بێت من باپيری ئەم مندالانەم وحەسەنيش ، مامیانە . كاتێ شەكورە بێكەس مايەوە چيبكات ؟ پەنای هێنايە ئێمە . ئەگەر بييەوێت دەتوانێ هەر ئێستا لەگەڵ منداڵەكانيدا بگەڕێتەوە بەڵام لەبير نەكە كە ئێرە ئەو جێگايەيەوا ئەو منداڵانەی لەوێدا بووە و گەورەی كردوون . ماڵی خۆيەتی . " بەبێ مێشكييەوە گوتم : "شەكوورە دەتەوێ بگەڕيتەوە بۆ ماڵی باوكت ؟" لەبەر قسەی ماڵێكی خۆش كەوتە پەڵمە گريانەوە و گوتی : " باوكم نيە " . لەوانەيە من وەهام بيستبێ . منداڵەكان لە پێشدا باوەشيان كرد بە داوێنەكەيدا و لە دواييدا دايانشاند و سەريان نابە سينگيەوە . هەموويان باوەشيان كرد بە يەكدا و بوون بە تۆپێك و دەستيان كرد بە گريان. ئەم ئەستەرە گێل نييە : تێگەيشتم كە شەكورە بە گريان دڵی هەر دوولای ڕادەگرێ و لايەكيش هەڵنابژێرێ بەڵام دەمزانی كە لە دڵيشەوە دەگری . چونكە منيش دەستم كرد بە گريان .كەمێ دواتر زانيم كەخەيرييە مارەكەش دەگری . لەو كاتەدا هێرشەكەی ڕەشە و پياوەكانی لە هەقی خەزوورە ناسكەچاوسەوزەكە هات

کەوا تەنیا ئەو لەماڵدا نەدەگریا . لە تەختەی پەنجەرەکە و لە دەرگاکەدرا . دووکەس پاڵیاندا بوو بە دەرگاکەوە بە جۆرە شاخی بزنیکی نێر لێیاندەدا، هەر جا لێیان دەدا دەنگی وەکوو تۆپێك دەهات . بە جەسارەت وەرگرتن لە فرمێسکەکانی خۆمەوە بە خەزوورم گوت کە : " تۆ ڕۆژانێکت بینیوە ، پیاوێکی بەڕێز و ئەفەندیت دەرگاکە بکەوە و بڵێ شەکورە دێت باوەکوو ئەو سەگە هارانەی دەرەوە ڕاوەستن . "

" ئەگەر تۆبی ژنێکی بێچارە و بێکەس کە پەنای هێنا بێتە تۆ و بووکیشتبێ لە ماڵ دەردنێی و دەیخەیتە بەر دەستی ئەوسەگانە ؟ "

بە دەستماڵە مۆرەکەم لووتە گیراوەکەم سڕی و گوتم : " خۆی دەیەوێ بچێتەوە."

وتی : " ئەگەر وابێ دەتوانی دەرگاکە بکاتەوە و بچێ . "

لەپاڵ شەکورە و منداڵەکانیدا دانیشتم . گرمە گرمە مەترسیدارەکەی ئەوانەیوا دەرگاکەیان پاڵپێوە دەنا بەهانەیەك بوو بۆ ڕشتنی فرمێسکی زیاتر : منداڵەکان زیاتر دەگریان ، ئەمەش دەبوو بە هۆی خێراتر بوونی جمو جوڵی فرمێسکەکانی من و شەکورە بەڵام هەردووکیشمان حیسابی زەربەکانی دەرەوەمان دەکردکەوا وەکوو ئەوە وابوون کە ماڵەکە خراپ بکەن و هەر دووکمان دەمانەویست کاتێکی زیاترمان هەبێت .وتم : " شەکورە جوانەکەم! خەزوورت ڕێگات پێدەداو ڕەشەی مێردت هەموو مەرجەکانت پەسەنددەکات و لەدەرەوە بە عەشقەوە چاوەڕێت دەکات . تۆ ئیدی پێوەندیت بەم ماڵەوە نیە ، جلەکانت بکەبەر و بوخچەکەت هەڵگرە و دەستی منداڵەکان بگرە و دەرگاکە بکەوە تاوەکوو بەرەو ماڵ بچینەوە."ئەم قسانەی من فرمێسکەکانی منداڵەکانی زیاتر کرد و چاوەکانی شەکورەشی کردەوە .

گوتی : " لەحەسەن دەترسم ، تۆڵەکەی پیس و مەترسیدار دەبێت چونکە من بۆ خۆم هاتووم بۆ ئێرە . "

گوتم : " بەڵام ئەمە ژیانی هاوسەری تازەت تێکنادات ، مێردەکەت هەموو شتێکی عەفو کرد . تۆی دەوێ ، ئەوە ساڵانێکە حەسنمان ڕازی کردووە ، دیسان هەروەها ڕازی دەکەینەوە " و بزەیەکم بۆ لێدا . گوتی : " من درەگاکە ناکەمەوە ، ئەوە بە مانای ئەوە دێت کە بە دڵی خۆم گەڕاومەتەوە " گوتم : " شەکورە گیان! منیش ناتوانم بیکەمەوە ، ئەگەر وا بێ ئەوە بە مانای ئەوە دێ کە من دەستم وەر دابێتەوە کاری ئێوە و و تۆڵەکەشی زۆر خراپ لە من دەگرنەوە " وتی : " کە وابوو کەس دەرگا ناکاتەوە ، لێ گەڕێ با دەرگاکە بشکێنن و بە زۆر بمان بەن . " تێگەیشتم کە ئەمە ڕێگا چارەی هەرە گونجاوە بۆ شەکورە و منداڵەکانی و ترسام . گوتم : " بەڵام ئەو کاتە خوێن دەرێژی ، ئەگەر قازی نەکەوێتە بەینەوە خوێن دەکەوێت و شەڕی خوێنیش ساڵانێك درێژە دەکێشێت . ئەوەی وا شەرەڤ هەبێت لە بەرامبەر شکانی دەرگای ماڵەکەی و ڕۆژانی خوێندا بێدەنگ نامێنێتەوە . "

کاتێك کە لە باتی وەڵام دانەوەیەکی گونجاودا باوەشی کرد بە منداڵەکانیدا و دەستی بە گریان کرد ئەوسا دووبارە بە پەشیمانیەوە تێگەیشتم کە ئەم شەکورە چ ژنێکی فێڵباز و ساختەچییە . دەنگێك لە دەروونمەوە دەیگوت کە واز لە هەموو شتێك بێنم و بڕۆم . لە ڕاستیدا هەم لە شکاندنی دەرگاکە و هاتنە ژوورەوەیان دەترسام هەم لە نەشکاندیان . چونکە ڕەشە کە متمانەی بە من هێناوە و نایەوێ بێتە ژوورە و لەوانەیە پیاوەکانی بکێشێتەوە ، ئەمەش دەبێ بە هۆی جەسارەت پەیدا کردنی

خەزوور . کاتیٚ زیاتر باوەشم کرد بە شەکورەدا زانیم کە بە درۆوە دەگری بەڵام لەوەش خراپتر بە شێوەیەك کە لاسای ناکرێتەوە دەلەرزا . نێزیکی دەرگاکە بوومەوە و بەهەموو هێزێکمەوە قیڕاندم و گوتم :"راوەستن، بەسە ئیدی!" بۆ ساتێك جم و جوٚڵەکانی دەرەوە و گریانەکانی ناوەوەش ڕاوەستان .

وەکوو ئەوەی لەگەڵ منداڵێکدا قسە بکەم بە ئیلهامی لە ناکاو گوتم : " با ئورهان دەرگامە بکاتەوە ، ئەو دەیەوێت بگەڕێتەوە بۆ ماڵی خۆی ، کەس من لەو تووڕە نابێت " . لە دوایيدا من قسەکەم تەواو کرد و نەکردکە ئورهان لە باڵە نەرم بووکانی دایکیوە دەرکەوت وە کوو ئەوەی کە ساڵانێك لەم ماڵەدا ژیابیٚ خاکە نازەکەی لابرد و لە دوایيدا تەختەی دەگاکە و دوگمەکەی کێشاوە و دوو هەنگاو هاتە دواوە . لە بەینی دەرگاکەوە کەلە خۆیەوەکرابووە وە بایەکی سارد دەهاتە نێو ماڵەوە . بێدەنگییەکی وەها دروستبوو کە هەموومان گوێمان لە سەگێکی تەمبەڵ بوو کە لە دوورەوە تەنیا لەبەر بیٚئیشی دەیوەڕاند . ئورهان گەڕایەوە باوەشی باوکی و دایکی ماچیکرد ، شەوکەت گوتی : " بەمامە حەسەنم دەڵێم . "

کاتیٚ شەکورە چمکی کراسەکەی گرت و هەستایە سەرپیٚ و خۆی بۆ هاتنەوە ئامادە دەکرد دڵم ڕەحەت بوو ، لەپێکەنیندا ترسام . دانیشتم و دووکەوچکیتر نیسکم خوارد . ڕەشە ژێرییەکی کرد بووکە نەهاتبووە بەردەرگای ماڵەکە. کاتێك کە شەوکەت لە ژوورەکەی باوکیدا خۆی شاردبوەوە و نەدەهاتە دەرەوە ، بانگمان کرد بەڵام دیسان نەهات و ڕێگاشی بە پیاوەکانی نەدا کە بێنە ژوورەوە . شەوکەت بە مەرجێك ڕازی بوو بێتە دەرەوە کە دایکی ڕێگای پێبدا خەنجەرە سوورە دەسك

یاقووتییەکەی مامی هەڵبگریٚ . خەزوور زیاتر لەوە کە بەهەوایەکی شکست و تۆڵەوە قسە بکات ، بەترسیٚکی ڕاستە قینەوە وتی : " خۆتان لە حەسەن وشمشیٚرە سوورەکەی بپاریٚزن . " یەکە بە یەکە ماچی قژی کوڕە زاکانی کرد و ماچی کردن و هەندیٚك شتی بە چپە بە شەکورە گوت . کاتیٚ کە بۆ جاریٚکیتر بەپەلەپەل تەماشای دەر و دیوار و ئوجاخ و ماڵەکەی کرد ، ئەوەم وەبیر هاتەوە کە ئەمە ماڵی یەکەم میٚردی شەکورەیەو لیٚرەدا ڕۆژانیٚکی خۆشی بەسەر بردووە . شەکورە چاوی بەو بۆنەی مەرگ دەکەوت وا ئیٚستا لەو ماڵەوە دەهات کە جیٚگای حەوانەوەی دوو پیاوی تەنیایە ؟ لەبەر ئەوەی دڵی شکاند بووم لەکاتی گەڕانەوەدا باوەشم پیٚدا نەکرد . ئەوەی وا دوو منداڵی هەتیوو ژنیٚکی خزمەتکار و یەکی یەهوودی و بیٚوەژنیٚکی نیٚزیك دەکردەوە ساردی و تاریکاییەکەی شەو نەبوو ، بەڵکوو ئەم کۆڵانە نائاشنا و تەنگانە و ترسی حەسەن و پیاوەکانی بوون . لەژیٚر پاریٚزوانی پیاوەکانی ڕەشەدا کاروانە جەنجاڵەکەمان وەکوو ئەوەی کە خەزیٚنەی پیٚبیٚ لەلارەڕیٚ و کۆڵانەکانەوە دەڕۆیشت ، بۆ ئەوەی کە ڕووبە ڕووی پاسەوانەکان و یەنیچەرییەکان و جەردەکان نەبین و تووشی حەسەن نەبینەوە هەندیٚك جار لە تاریکاییەکی ڕەشدا کە چاو چاوی نەدەبینی بەخۆ لیٚدان لە دیوارەکان ڕیٚگامان دەدۆزییەوە . واماندەزانی کە جندۆکەکان و تارماییەکان وشەیتانە ژیٚرزەمینییەکان دەردەکەون و دەمانڕفیٚنن ، هەر بۆیە باوەشمان کرد بوو بە یەکدا. لەپشتی ئەو دیوار و پەنجەرانەی وا بەدەست هەستمان پیٚدەکردن ، لەساردی شەودا گویٚمان لە پرخەی لووتی خەوتووەکان وناڵەی حەیوانەکان دەبوو لە گەوڕەکانیاندا . دەرەوەی گەڕەکە هەژار نشینەکان کەوا میللەتی جۆرا و جۆر و بیٚخیٚر کردوویانە بە جیٚگای

خۆیان پێم ناوەتە ناو هەموو گەڕەکەکانی ئەستەنبووڵ و ئەو کۆڵانانەی وا لەم تاریکاییە بیٚبنەدا وادەزانم کە تەواو نابن لە ڕۆژدا بە بوخچەکەمەوە لێیان تێپەڕ دەبم و ئێستا دەیانناسمەوە : دیوارەکانی کۆڵان ( تەرزی باشی ) ، بۆنی گووی ناو گەوڕەکەی باخچەکەی مامۆستا نووروڵا کە نازانم لەبەر چییە وا بۆنی لە دارچین دەچیٚ . جێگای سووتانی کۆڵانە گیانبازەکان ، ڕێگای باز فرۆشەکان و کانی حاجیە کوێرەکەم ناسیەوە کەوا بەرەو مەیدانێك جۆگەی بۆکرا بوو ، و زانیم کە بەرەو ماڵی باوکە خوالێخۆشبووەکەی شەکورە ناچین بەڵکوو بەرەو جێگایەکیتردەچین . یەکسەر تیگەیشتم کە ڕەشە دەیەوێت خێزانەکەی لە شەڕی حەسەن بپارێزیٚ کە کاتێك توورە دەبیٚ نازانیٚ چیدەکا ( و لە شەڕی ئەو بکوژە شەیتانەش ) و بە دوای پەناگەیەکدا دەگەڕێت . ئەگەر ئەو جێگایەم بزانیبایە هەر ئێستا بەئێوەم دەگوت و بەیانیش بە حەسەنم دەگوت . چوونکە دڵنیا بووم شەکورە جارێکیترحەسەنی دەوێت .

بەڵام ڕەشە ژیر بە هەقیشەوە ئیدی هیچ بڕوای بە من نەدەهات . لە کۆڵانێکی تاریکی پشتی بازاڕی ئەسیرەکەدا بووین کە دەنگی قیڕە قیڕ و هاوار هات .

دەنگی لێدانی تەور و دار و شمشێر لەیەك و کاتێك لە جەستەی مرۆڤ دەکەون دەهات و هەموویانم بە ترسەوە ناسییەوە . ڕەشە شمشێرە گەورەکەی خۆیدا بە کابرایەکی متمانە پێکراو و خەنجەرەکەی دەستی شەوکەتی بە زۆر وەرگرت و خستیە گریانەوە و شەکورە و خەیرییە و منداڵەکانی لەگەڵ کابرای دەلاك و شاگردەکەی و دوو پیاودا دوور خستەوە و گوتی کە گەنجە خوێنەوارەکە تۆش بە ڕێگای کورتەوە دەگەیەنێتەوە ماڵ

و نەیهێشت کە من لەگەڵ ئەواندا بمێنمەوە . ئەمە هەڵکەتبوو یان وەکوو بەرنامەیەکی داڕێژراوی فێڵبازانە بوو بۆ ئەوەی وا جێگای خۆ شاردنەوەکە لەمن بشارنەوە ؟ ئەو کۆڵانە تەنگەی‌وا ناچار بووین لێیەوە تێپەڕ ببین دوکانێکی لێبوو کە زانیم قاوەخانەیە . چاوم بە جەماعەتێکی جەنجاڵ کەوت کە دەچوونە ناوەو دەهاتنە دەرەوە ـــلەپێشدا وامزانی تلاندەکەن ـ و قاوەخانەکەیان خراپ دەکرد . کوپەکان و قاوەکوتەکان و پەرداخەکان و سێپیاکانیان لە پێش چاوی ئێمەی زانخوازدا بە وریایی دەهێنایە دەرەوە و لە دواییدا بۆ ئەوەی پەندی لێوەربگیردرێ ورد و هانیان دەکردن . کابرایەك ویستی ئەم کارە ڕاوەستێنێ بەڵام تۆزێکیان لێدا بەلاّم ئەو توانی خۆی ڕزگار بکات . لەسەرەتا وامدەزانی کە وەکوو خۆیان دەڵێن هەموو کێشەکانیان ئەم قاوەیەیە . باسی ئەوەیان دەکرد کە زیانەکانی قاوەچییە و دەیانگوت کە ئەمە ژەهرێکی فەڕەنسییە و مێشکی مرۆڤ تێکدەدا و لە ئیمان دووری دەخاتەوە ، هەروەها باسی ئەوەیان دەکرد کە شەیتان خۆی کردووە بە ژنێکی جوان و قاوەی پێشکەشی پێغەمبەر کردووە بەلاّم پێغەمبەر گەڕاندوویەتیوە . وەکوو ئەوەی کە ئەمە خۆشییەکی بەبەرنامەی شەوانە بێت و بیرم لەوە دەکردەوە کە کاتێ گەڕامەوە بۆ ماڵ دەقیژێنم بە سەر نەسیمدا و دەڵێم : " ئەو زوقوومە زۆر مەخۆرەوە " .

لەبەر ئەوەی لەم ناوە ژووری هەرزان و بێژنی زۆری تێدا بوو لە ماوەیەکی کورتدا گروپێکی زۆری تووتکە سەگی بێ‌ئێش و هەرچی و پەرچی لەوێدا کۆ بوونەوە و ئەمەش دەبوو بە هۆی ئەوەی وا دوژمنانی قاوە بە جەسارتتربن . ئەو کاتە تێگەیشتم کە ئەمانە پیاوەکانی مەلا بەناوە بانگەکەی ئەرەزڕوومییەکەنن و جێگای شەراب خواردنەوە و قەحپەخانەکان

و قاوەخانەکان پاکدەکەنەوە و لاڕێکان لە ڕێگای حەزرەتی موحەمەد و ئەوانەی وا لەتەکیەدا موسیقا لێدەدەن و هەڵپەڕکێدەکەن سزا دەدەن . جنێویاندا بەدوژمنانی دین و هاوکارەکانی شەیتان و بوتپەرەستان و زەندیقەکان و ئەوانەیوا وێنەکێشن .

تازە تێگەیشتم کە ئەم قاوەخانەیە هەر ئەوەیە وا تێیدا جنێویان بە دین داوە و وێنەیان تێدا هەڵواسیوە و قسەیان بە مەلا ئەرزڕوومیەکە گوتووە و کاری بێئەدەبانەیان کردووە . شاگردێکی قاوەچی بە دەم و چاوێکی خوێناوییەوە لە قاوەخانەکە دەرکەوت ، وامزانی کە دەکەوێت بەڵام بە باڵی کراسەکەی خوێنی ڕوومەتی سڕی و هاتە نێو ئێمە و دەستی بە تەماشاکردنی بەسەردا چوونەکە کرد. جەماوەر ترسا بوون و تۆزێك کێشابوونەوە . هەستم بەوە کرد کە ڕەشە لەنێو جەنجاڵەکەدا چاوی بە یەکێك کەوتووە و زانیم کە ماوەیەك بێبڕیار ماوەتەوە. لەوەی وا ئەرزڕوومیەکان خۆیان کۆ دەکردەوە زانیم کە لەوانەیە یەنیچەرییەکان وەکوو جەماعەتێکی دار بەدەست خەریکن بەرەو ئێرە دێن . مەشعەلەکان کوژرانەوە . جەماوەرەکە تێکەڵاو بوو . ڕەشە باڵمی گرت و خستمیە دوای کوڕە خوێنەوارەکەوە و گوتی : " لەکۆڵانە کورتەکانەوە دەچن ، دەتباتەوە بۆ ماڵ " . کوڕە خوێنەوارەکەش دەیویست تۆزێك زووتر خۆی نەجات بدات. بەهەڕا کردن دوور کەوتینەوە . بیرم لەلای ڕەشە بوو بەڵام ئەگەر ئەستەر لەدەرەوەی جموجوڵەکان بمێنێتەوە خۆ ناتوانێ درێژەی بەسەرهاتەکەتان بۆ باسبکات .

## (( من ، ژن ))(54)

بـالۆره بێـژی ئەفەنـدی ! دەڵـێن تـۆ دەتـوانی لاسـایی هـەموو کەسـێك بکەیتەوە ، بەڵام نـاتوانی ببـی بـە ژن ! من ئیدەعای پێچەوانەی ئـەم قسـە دەکەم . بەڵێ ڕاستە، لەبەر ئەوەی شار بە شار دەگەڕێین و تـا نیوەشـەوان لـە زەماوەنـد و شـاییەکاندا و لەقاوەخانەکانـدا لاسایی هـەموو شـتێك وهـەموو کەسێك دەکەینـەوە و بەسـەرهات دەگێڕینـەوە ، زەماوەنـد کـردن و ژن هێنـان نەبووە بە نسیبمان . بەڵام ئەمە بەمانای ئەوە نایەت کە ناتوانین ڕەگـەزی ژن بناسین . بە پێچەوانەوە زۆر بەباشی ژنان دەیانناسم : تەنانەت خۆم بۆ خۆم

چاوم به چواریان کەوتووە وتەنانەت لەگەڵیاندا قسەشم کردووە ، ئەمانە " 1− دایکە خوالێخۆشبووەکەم 2− پووری خۆشەویستم 3− براژنەکەم ( کاتێك منی دەبینی لێیدەدام و دەیگوت: دەرکەوە لە ژوورەکە . بۆ یەکەم جار عاشقی ئەو بوو بووم ) 4− ئەو ژنانەی وا لەکاتی سە فەرەکانی قۆنیا لەبەر پەنجەرەیەکەوە دەمبینین . سەرەڕای ئەوەی وا هیچ لەگەڵیدا قسەم نەکردووە و بەیەکنەگەیشتووین بەڵام ساڵانێکی درێژ و ئێستاش هەستی ئەویندارییم لەبەرامبەریاندا هەیە . لەوانەیە ئێستا مرد بێتن .

لەبەر ئەوەی قسەکردن لەگەڵ ژنێکی ڕوومەت کراودا و بینینی حاڵەتە مرۆییەکانی دەبێ بە هۆی ورووژاندنی شەهوەت ویستەکان و قووڵتر بوونی ئازارە مەعنەوییەکان، دینەکەمان فەرموویەتی تەماشا کردنی ژنان بە تایبەتی ئەوانەی وا جوانن لە هەموو شتێکیتر خراپترە ! مادام کە ڕێگا ی چێژ وەرگرتنی جنسی لە ژنانمان لێوەردەگرێ ، دۆستایەتی کردن لەگەڵ کوڕە جوانەکاندا تەنیا ڕێگای چارەیە و ئەمەش دەبێت بە نەریتێکی شیرین .

لەشارەکانی فەرەنسەدا ژنەکان تەنیا ڕوخساریان دەرناخەن بەڵکوو لایەنەسەرنجڕاکێشەکانیشیان وەکوو قژەبریقەدارەکانیان و مل و دەست و گەردنە جوانەکانیشیان ڕووتدەکەن ، تەنانەت بە گوێرەی ئەو شتانەیوا باسی دەکرێ لایەك لە قاچەکانایشیان بە ڕووتی دەهێڵنەوە و دەگەڕێن . هەر لە بەر ئەمانەش پیاوەکانیان لە شەرماندا هەمیشە لە نیو ئازاردان . ئەمەش خۆی لە خۆیدا دەبێ بە هۆی فەلەج کردنی کۆمەڵگا . هۆی ئەوەی کە فەرەنسای گاور لە بەرامبەر عوسمانیەکاندا هەر ڕۆژە و شتێك و قەڵایەك لە دەست دەدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەمە .

هەر لە سەرەتای تەمەنی گەنجیمدا تێگەیشتم کە دوور مانەوە لە ژنە جوانەکان بۆ ئارامشی ڕۆحم شتێکی باشە . بەڵام لەو کاتەوە دەمەوێ لە بارەی ژنانەوە شتی زیاتر بزانم و مەراقیان دەکەم . لەوەش زیاتر لە بەر ئەوەی لەو کاتانەدا زیاتر دایکم و پورم ژنی ترم نەبینیبوو ، زانخوازیەکەم دەبێ بە شتێکی ڕازدار . پێویستەلاساییان بکەیت و قسەکانیان دوو پات بکەیتەوە و جلەکانیان لە بەر بکەی و وەکوو ئەوان خواردن بخۆی تاوەکوو لە ڕاستیدا تێبگەی کە ئافرەت چ جۆرە بوونەوەرێکە. بەمجۆرە ڕۆژێکی هەینی کە دایکم و باوکم و پوورم و کاکم ، هەموویان پێکەوە دەڕۆیشتن بۆ باخچەی کۆمەڵگای لای کەناری ( فاهڕنگ ) گوتم زۆر نەخۆشم و لەماڵ دەمێنمەوە . دایکە خوا لێخۆشبووەکوم وتی : " وەرە لەو سەوزەلانیدا چاوت بە سەگ و دار و ئەسپ دەکەوێ ، وەرە و لاساییانمان بۆ بکەرەوە با ئێمەش پێبکەنین . " نەمدەتوانی بڵێم جلەکانی تۆ دەپۆشم و دەبم بە ژن ، بۆیە گوتم ، زکم زۆر دەیشێ.

باوکم وتی : " نا ، نا ، مەکە ، وەرە پێکەوە زۆران دەگرین . " بەڵام نەڕۆیشتم.

ئێستاش یەکە یەکە باسی ئەوە بۆ ئێوەی وێنەکێش و خۆشنووسی برای خۆم دەکەم کە لە دوای ڕۆیشتنی ئەوان و لە بەر کردنی جلەکانی دایکم و پوورم هەستم بە چی کرد و ژن بوون چ واتایەکی هەیە . بەر لە هەر شتێك با ئەمە بڵێم : بە پێچەوانەی ئەوەی وا لە کتێبەکاندا نووسراوە و بە دەیان جار خۆیندوومانەتەوە و هەروەها بە پێچەوانەی ئەو شتەی وا لە مەلاکانەوە بیستوومانە ، کاتێ مرۆڤ دەبێ بە ژن ،خۆی وەکوو شەیتان هەست ناکات . بە پێچەوانەوە کاتێ کە شۆرتە بە گوڵ نەخشێندراوە

ڕێسراوەکەی دایکم لە پیێ کرد، هەستم بە بڵاوبوونەوەی خۆشییەك لە دەروونمدا کرد . وامدەزانی منیش بە قەدەر ئەو هەستەوەرم . کاتێ کە کراسە ئاوریشمینە سەوزە فستقیەکەی پوورمم بە ڕووتی کردە بەر( خۆی دڵی نەدەهات لە بەری بکات ) لە دەروونمدا هەستی حەز کردن بەرامبەر بە هەموو منداڵەکان و تەنانەت خۆشم بەرز بووەوە . دەمەویست چێشت بۆ هەمووان لێنێم و شیریش بدەم بە هەموو کەس . ئەگەر مەمکم هەبایە هەستم بە چی دەکرد ؟ ماوەیەك لە سەر ئەوە بیرم کردەوە ولە دوایدا چوومە سەر ئەو بیرەی کە بوون بەژنێکی مەمك گەورە چ جۆرە هەستێکی تێدایە ، هەر بۆیە زۆر شتم – گۆرەوی و ... – خستە بەر سینگم و کاتێ کە بەرزایە گەورەکەم بینی خۆمم وەکوو شەیتان لەخۆبایی و مەغرور هەستکرد . کاتێ زانیم ئەگەر پیاوەکان تەنانەت چاویان بە سێبەرەکەشی بکەوێ بە دوایدا هەڕا دەکەن و تەنیابۆئەوەی بیخەنە ناو دەمیان دەپاڕێنەوە ، ئەوسا هەستم بە بەهێز بوونی خۆم کرد ، بەڵام ئایا من دەمەویست بە هێز ببم ؟ میشکم تێکەڵ و پێکەڵ بوو بوو : هەم دەمویست کوڕێکی نەناسی دەوڵەمەنی ژیرو بە هێز حەزم لێبکات ، هەمیش لێی دەترسام .

کاتێ سەر چەفە نەخشینەکەی دایکم لە ژێرەوەی سندوقی جەهیزیەکەدا دەرهێنا و گۆرەویە بۆن خۆشە بەنینەکانم کردە پیێ و بازنگە زێرینە با دراوەکانی دایکم لە جێگا شاراوەکەیدا دەرهێنا و کردمە دەستم و تۆزێك لە سووراوەکەیشم لە گۆنامدا ( ئەو دوای حەمام گۆنای خۆ پیێ سوور دەکرد) و کراسە سەوزە سنەوبەرییەکەی پوریشم لە بەر کرد و ڕۆیشتمە بەر ئاوێنە چوار چێوە سەدەفینەکە و تەماشای خۆمم کرد تووشی حەپەسان بووم .

تەنیا چاو و گۆناكانم دیار بوو، بەڵام من ژنێكی جوان بوم و ئەمەش منی زۆر خۆشحاڵ دەكرد . شتەكەشم بەر لە من هەستی بەمە كردبوو و ڕەپ بوو بوو . ئەمەش بوو بە هۆی نارەحەت بوونی من . لە نێو ئەو ئاوێنەیەیدا سەیری فرمێسكێكم كرد كە لە چاوە جوانەكانم دەهاتە خوارەوە . لەو كاتەدا بەو ئازارەوە شێعرێكم بۆ هات كە هیچ كات لە بیرم نەكرد . چونكە هەر لەو كاتەدا بە ئیلهامێكی خودایەوە ئەو شێعرەم وەكوو بەزمی گۆرانی و بە هەڵپەركێ كردن بۆ لە بیربردنەوەی ئازارەكانم گوتبوو :

"ئەم دڵە بێ ئارامەم دەڵێ ئەگەر لە ڕۆژئاوا بم دەمەوێ لە ڕۆژ هەڵات بم و ئەگەریش لە ڕۆژ هەڵاتیش بم دەمەوێ لە ڕۆژ ئاوا بم.

جێگەكانی ترم دەڵێن ئەگەر پیاو بم دەمەوێ ببم بە ژن و ئەگەریش ژن دەمەوێ ببم بە پیاوێكی ئازا .

چەندە سەختە بە مرۆڤ بوون ، لەوە سەخت تریش ژیانێكی مرۆڤانە .

دەمەوێ هەم بە دوا و هەم بە بەرم ، هەم بە ڕۆژ هەڵات و هەم بە ڕۆژ ئاوا خۆشی و چێژ وەر بگرم ".

خەریكبوو بڵێم با برا ئەرزڕوومیەكانمان گوێیان لەم گۆرانییەی من نەبێ ، زۆر تووڕە دەبن . لەچی دەترسم ؟ لەوانەیە تووڕەش نەبن . تەنیا لەبەر قسە باسی ناكەم . چونكە ئەو حەزرەتی مەلا ئەفەندییە كە ( هوسرەتیش ) نییە خۆی ژنی هەیە ، بەڵام وەكوو ئێوەی وێنە كێش زۆر هەستیارەو كوڕانی جوانی لە ئێمەی ژن زیاتر خۆشدەوێ ، نازانم من درۆی دەمی خەڵك دەكەم . بەڵام من لەبەر ئەوەی بە خراپی دەزانم گوێی لێناگرم ، زۆر پیرە . ددانەكانی كەوتوون و بە قسەی ئەو كوڕە جوانانەی والێی نێزیكبوونەتەوە بۆنی دەمیشی زۆر پیسە ، داوای لێبووردنتان لێدەكەم بەڵام دەڵێن وەكوو

بۆنی قوونیەتی . باشە، تووڕە مەبن، چەنەم ڕادەگرم و دەگەڕێمەوە سەر بابەتە سەرەکییەکە :

کاتێ زانیم زۆر جوانم ئیدی نەمدەویست وەکوو خزمەتکارەکان بچمە ناو کۆلان و دەفر و جل و بەرگ بشۆرم . هەژاری و نەداری و خەفەت خواردن و گریان لەبەر ئاوێنەدا کاری ژنەپیسەکانە . پێویستە مێردێك بدۆزمەوە کە بەسەردەستەوە بمگەڕێنێ ، بەڵام ئەوە کێیە ؟ بەمجۆرەش لە کونی دیوارەکەوە بە دزیوە تەماشای ئەو کوڕە پاشا و بەگزادانەم کرد کەوا باوکم بە بەبەهانەی جۆرا و جۆر دەهێنان بۆ ماڵ . دەمەویست وەکوو ئەوەی وا هەموو وێنە کێشەکان عاشقیان دەبن ، منالکارێکی دەم بچکوولانەی لە ژن چوو بێت .بەسە ئیدی، باشتر وایە بەسەر هاتی عەشقی شەکورە جوانەکەتان بۆ باسبکەم . بەڵام ڕاوەستن قەولی شتێکیترم پێدا بوون، بەم ئێوارەی چوار شەمەیە ئەمەمەتان بۆباس دەکەم"

ئەو بەسەر هاتی عەشقەی کە شەیتان بۆ ژنی گێڕاوەتەوە .

لەراستیدا زۆر سادەیە . لەیەکێك لە گەڕەکە فەقیرەکانی ئەستەنبووڵدا ، لە ( کەمەر ئوستوو ) ڕوویداوە . یەکێك لە پیاو ماقووڵانی گەڕەك ناوی ئەحمەد چەلەبی دەبێ و بۆ ( واسیف پاشا ) نووسەری دەکات و ژن و دوومنداڵی دەبێ و سەری لەنێو کاری خۆیدا دەبێ ، ڕۆژێك لە پەنجەرەیەکی کراوەوە چاوی بە ژنە جوانکیلەیەکی بۆشناك دەکەوێ و عاشقی چاوەوقژە ڕەشەکانی و باڵا بەرزەکەی و لاشە سپییەکەی دەبێ . بەڵام ژن مێردی هەیە و حەز لە مێردە جوانەکەی دەکات و دڵێ لە چەلەبی ناچێت . بەمجۆرە چەلەبی ناتوانێ باسی عەشقەکەی بەلای هیچ کەسەوە باسبکات و لەدەردی عەشق دەڕووخێ ، ئیدی هەر ڕۆژ شەرابی ڕوومی دەکڕێ و دەیخواتەوە ،

بەڵام لە دواییدا ناتوانیٚ ڕازی عەشقەکەی لە گەڕەك بشاریٚتەوە . لەبەر ئەوەی کە خۆشیان حەزیان لە بەسەر هاتی عەشقەکان کردووە و حەزیان لە چەلەبیش کردووە دوو سیٚ گاڵتەی لەگەڵدا دەکەن و چاوی لیٚدەگرن . بەڵام کاتیٚك دەزانن ئەو بیٚچارەیە بەسەر خۆیدا زاڵ نابیٚ و هەموو شەویٚك بەسەر خۆشی لەبەر دەرگاکەیاندا وەکوو منداڵیٚك دەگری ، ئەوسا لیٚی دەترسن . شەوان لە ئازاری عەشقدا زیاتر دەگری ، بەڵام کەس ناتوانیٚ لیٚیبدا و دەریکا و کەسیش ناتوانیٚ دڵی بهیٚنیتەوە . چەلەبیش زۆر فەقیرانە دەگری و قسە بە کەس ناڵیٚ و ئازاری خۆی دەکیٚشیٚ . وردە وردە ئەو خەمە دەبیٚ بە خەمی تەواوی گەڕەك و خۆشییان لەلا نامیٚنیٚ و خەفەتیان وەکوو کانیاوەکەی مەیدانەکە هیچ ڕاناوەستیٚ و سەرچاوەکەشی زیاتر دەبیٚ . بەمجۆرە لە پیٚشدا وشەی خەماوی و لە دواییدا قسەی بیٚخیٚر و دواتریش بیری بیٚبەرهەم و بیٚپیٚز لەگەڕەکەکەدا بڵاو دەبیٚتەوە . هەندیٚك کەس باردەکەن هەندیٚك خۆشییان نامیٚنیٚ ، هەندیٚکیتریش ناتوانن لەسەر پیشەکەیان بەردەوام بن . ڕۆژیٚك کە گەڕەك چۆڵ دەبیٚ چەلەبیش دەستی ژن و منداڵەکانی دەگریٚ و لەویٚ دەچیٚ و بار دەکات و ژنە لاشە سپییەکەو و میٚردەکەی بەتەنیا دەمیٚننەوە . ئەو نەهامەتیەی وا خۆیانبوو بوون بە هۆی دروستبوونی دەبیٚت بە هۆی سارد بوونەوەی عەشقەکەیان و نیٚوانیان دروست دەبیٚت . تا دوایی تەمەنیان پیٚکەوە دەژین بەڵام هیچ کات ڕووی خۆشی نابینن .

خەریکبوو بلیٚم لەبەر ئەوەی ئەم بەسەر هاتە باسی مەترسیدار بوونی ژنان دەکات ، زۆر خۆشە ! کەچی هاتەوە بیرم . هەی ڕۆ کەنی! لەبیرم چووبوو ،خۆ من ئیٚستا ژنیٚکم بۆیە پیٚویستە شتیٚکی جیاواز بڵیٚم . باشە .

شتێکی ئاوەها :

ئای کە جوانە عەشق !

بەڵام نائاشنایانەکێن کەوا لە دەرگاکەوە هاتنە ناوەوە ؟

## (( پێم دەڵێن پەپوولە )) (55)

کـاتێ چـاوم بـە جەنجاڵەکـە کـەوت زانـیم کـە ئەرزڕوومیـەکان وێنەکێشـە

گاڵتەچییەكانی ئێمە دەكوژن . ڕەشـەش لـەنێو ئـەو جـەماوەرەدا بـوو كـە سـەیری بەسـەردا چـوونەكەیان دەكـرد . خەنجـەرێكی بـە دەسـتەوە بـوو ، هەندێك پیاوی غەریب و ئەستەر بوخچەچییە ناودارەكە و چەند ژنی دیكەی بوخچەبەدەسـتی لەگەڵـدا بـوو . ئەوانـەی وا لـە قاوەخانەكـە دەردەكـەوتن لێـدانێكی باشـیان دەخـوارد و جەماعـەتێكی غـەداریش هـاتن ،نـازانم لـەوە دەچـێ یەنیچـەرییەكان بـووبێتن ،هـەر لـەو كاتانـەدا ئەرزڕوومیـەكان مەشـعەلەكانیان كوژانـدەوە و ڕایـانكرد . كـەس لەبـەر دەرگـا تاریكەكـەی قاوەخانەكەدا نەبوو ، تەنانەت كەسیش تەماشای نەدەكرد . چوومە ناوەوە . هەموو لایەك پڕ بوو لە شتی ورد و هان كراو . پێم نا بەسەر وردەی كوپ و قـاپ و پـەرداخ و شووشـەدا و ڕێمكـرد . سـەرە ڕای ئـەو هـەموو شـتە چرایەكی هەڵواسرا و بە بزمارێكی سەر دیوارەكەوە هێشتا نەكوژا بوویەوە ، بـەڵام باسـی شـتە وردوهـان بووەكـانی زەوی و سـپیێا لـەناو چـووەكان و تەختـە پارچـەكراوەكانی نـەدەكرد بـەڵكوو لەكـەكانی سـەر سـەقفەكەی نیشاندەدا . دۆشەكەكانم نایە سەر یەك دەستم درێژ كرد و چراكەم داگرت . لەبەر ڕۆشناییەكیدا چاومبە تەرمێك كەوت كاتێ كە زانیم دەمو چاوی خوێناوییە سەیرم نەكرد و خۆمم پاڵدا بە ئەویترەوە . دووهەمینیان ناڵەی لێوە دەهات " كە چاوی بە چراكەم كەوت وەكوو منداڵێك دەنگی دەرخست . خۆم كێشـایە دواوەوە. یـەكێكیتر هـاتبووە نـاوەوە ! لەپێشـدا ترسـام ،بـەڵام دواتروا هەستم كرد كە ڕەشەیە . هەردووكمان پێكەوە چووینە لای لاشەی سێهەم . كاتێك كە چراكەم نێزیك كردەوە ئەو شتەم بینـی كـە هـەردووكمان لە گۆشەیەكی عەقڵمانەوە هەستمان پێكرد بوو ، بالۆرەبێژە ئەفەندییەكـەیان كوشتبوو . هیچ شوێنێك بەسەر ڕوومەتیەوە نەبوو، خۆی وەكوو ژن لێكـرد

بوو . بەڵام چەناکە و چاوولێوە سوور کراوەکەی تلیقا بوون و ملیشی لەبەر فشاردان شین بوو بوو . دەستەکانی لەدواوەوە درێژ کرا بوون . زانینی ئەوەی کە یەکێك لەدواوەوە دەستەکانی بالۆرەبێژەکەی بەم جلەژنانەوە گرتبیّو یەکیتریش بە مشتە کۆڵە بەر بووبێتە گیانی و لەدواییدا خنکاندبێتیان شتێکی ئاسان بوو . ئایا دەبیّ کە گوتبێتیان " زمانی ئەوە ببڕن کە قسە بە حەزرەتی مەلا ئەفەندی ئەرزروومی دەڵیّ " و دوایی ئەو کارەیان کردبیّ؟

ڕەشە گوتی : " چراکەت بێنە ئێرە " . ڕووناکی چراکەی دەستم دای لە قوڕاوی قاوە ڕژاوەکە و پارچەکانی قاوە کوتەکان و تەرازووەکە و کوپە ورد و هان کراوەکان . لەو گۆشەیەی وا هەموو شەوێك کابرای بالۆرەبێژ وێنەی هەڵدەواسی ، ڕەشە بەدوای کەلوپەلی ئیش و پشتوێن و گوپاڵە کابرادا دەگەڕا .

چراکەی لە دەستم گرت و گرتیە نێو چاوانم و گوتی بیر لە وێنەکان دەکەمەوە! بەڵی . منیش لەبەر دۆستایەتی دوانیانم کێشا بوو . تەنیا توانیمان کڵاوە عەجەمییەکەی ئەو بێچارەیە بدۆزینەوە . لە ڕێڕەوێکی تەنگەوە کە دەچووە دەرگای پشتەوە ڕۆیشتین و بەبێئەوەی کەس بمانبینیّ دەرکەوتین . دەبیّ کە لە کاتی بەسەردا هاتنەکەدا وێنەکێشەکان لێرە و هەڕایان کردبیّ ، بەڵام گوڵدانە کەوتووەکان و تەلیسە قاوە ڕژاوەکان ، ئەوەیان نیشاندەدا کەلێرەشدا شەڕ کراوە . کوشتنی بێبەزەییانەی بالۆرەبێژەکە و بەسەرداهاتنی ئەم شەوە سارد و ترسێنەرە من و ڕەشەی نزیکی یەککردەوە . وابزانم بێدەنگییەکەی نێوانیشمان لەمەوە دەهات . کۆڵانی یەکەممان تێپەڕ کرد، ڕەشە چراکەی دەستی دا بەمن بۆ ئەوەی

هەڵیبگرم . لەدوایدا خەنجەرەکەی دەرهێنا و خستیە سەر قورگم و گوتی: "دەچین بۆ ماڵی ئێوە ، دەمەوێ بیپشکێنم، بادڵم ئارام ببێتەوە".

گوتم : "خۆ پشکنییان " و بێدەنگ بوومەوە . خۆ بچووك دیتنێك لە دەروونمەوە دەرباز بوو ، بەڵام لێی تووڕە نەبووم . ئایا بڕوا کردنی بەو قسانەی وا لەبارەی منەوە دەیلێن ئەوەی دیار دەکرد کە ئەویش بەخیلیم پێدەباتەوە ؟ لە کاتی گرتنی خەنجەرەکەیدا زۆر متمانەی بەخۆی نەبوو . ماڵەکەم لە پشتیقاوە خانەکەو لەبەر ئەو کۆڵانەیە کە لەوێوە هاتووین . لەم ڕووەشەوە بۆ ئەوەی کە تووشی جەنجاڵەکان نەبین ، لە نێو گەڕەکەکانەوە بەم کۆڵان و ئەو کۆڵان ، لەراست و لە چەپەوە گەڕاینەوە و کەوانێکمان کێشا . دەنگە دەنگە لای قاوەخانەکە نەدەبڕایەوە . گوێمان لە ئەرزڕوومیەکان و یەنیچەرییەکان بووکە بە دوایانەوە بوون و دەنگی لاوەکانمان بیست . تاوەکوو نیوەی ڕێگا هاتبووین کە ڕەشە گوتی : " ئەوە دووڕۆژە لەگەڵ وەستا عوسماندا لە ژووری خەزێنەدا تەماشای وێنەی وەستا کۆنەکان دەکەم . " ماوەیەکی درێژ بێدەنگ مامەوە . زۆر دواتر بە قیڕەوە گوتم : " لەدوای تەمەنێك ، ئەگەر وێنەکێش لەگەڵ خودی بەهزادیشدا لەسەر مێزێك دانیشێت و تەماشای وێنە بکات فێری هیچ شتێك نابێت ، تەنیا جەژنێك بۆ چاوەکانی دروست دەکات وبەس . چونکە وێنە بە چاو ناکێشرێ بەڵکوو بە دەست دەکێشرێ . دەستیش لە تەمەنی وەستا عوسماندا ، تەنانەت لە تەمەنی منیشدا فێری شتێکی تازە نابێت . " لەبەر ئەوەی کە دەمویست ژنە جوانەکەم کە ئێستا لە ماڵدا چاوەڕێم دەکات ، بزانێت کە تەنیا نیم و کەسیترم لەگەڵدایە و ڕوو بە ڕووی ڕەشە نەبێتەوە دەمقیڕاند و بە دەنگی بەرز قسەم دەکرد ، نەك لەبەر ئەوەی کە لەم ڕەشە

خەنجەر بەدەستە لە خۆباییە بترسم . کاتێ لە حەوشەی ماڵەکەوە چووینە ناو وامزانی کە تیشکی چراکە لەناو ماڵەوە جووڵایەوە . بەڵام زۆر شوکر ئێستا هەموو لایەك تاریك بووە . هاتنی حەیوانێکی خەنجەر بەدەست بۆ ناو ئەو ماڵە بەهەشتینەم وا زۆربەی کات لەوێدا بە دوای دۆزینەوەی بیرەوەرییەکانی خودادا دەگەڕێم و وێنە دەکێشم و کاتێکیش کە ماندوو دەبم لەگەڵ جوانترینئافرەتی دونیادا جووت دەبم و لاقە دەکەم ، زۆر ناڕەحەتی کردم ، هەربۆیە سوێندم خوارد کە تۆڵەی ئەمە لە ڕەشە بستێنمەوە .

تەماشای لاپەڕەکانمی کرد، لاپەڕەیەکم هێشتا تەواو نەکردبوو ـ وێنەی ئەو گیراوانەی کە بۆ ڕزگار بوون چاوەڕێی باشییەکی پادشا دەکەن و لێی دەپاڕێنەوەـ وتەماشای ڕەنگەکان و مێز و چەقۆ و فڵچە و شتەکانی لای مێزە نیلییەکەمی کرد و دووبارە سەیری لاپەڕە و مۆرو قەڵەمتراشەکان و قووری قەڵەم و ژێری دۆشەکە و قاڵی و جێگاکانی کرد . دەتگوت بە دوای ماڵەکەمدا نەگەڕێ بەڵکوو بەدوای وێنەکانمدا دەگەڕێ . ئایا ناتوانم ئەوەی وا بمەوێ بیشارمەوە ؟ناتوانم لەو ژوورەیدا کە ئێستا ژنەکەم بە دزیوە تەماشای ئێمە دەکات بیشارمەوە ؟

ووتی : " دوایین وێنەی کتێبەکەی زاوام نەماوە ، بکوژەکەی دزیویەتی."

یەکسەر گوتم : " لەوانیتر جیاواز بوو . زاوای خوالێخۆش بووت داوای لێکرد بووم کەلە گۆشەیەکدا وێنەی درەختێك بکێشم . لەدواوە تا جێگایەك ... لە ناوەڕاست و لە پێشەوە وێنەی کەسێکی لێدەبوو : لەوانەیە ڕوومەتی پادشاکەمان بووایە . جێگا گەورەکەی ئامادە بوو ، بەڵام نەکێشرا بوو .

لەبەر ئەوەی ئەم وێنەیە بەپێی نەریتی فەرەنسییەکان دەکێشرا و کەلوپەلەکانی دواوە بچووك دەبوونەوە داوای لێکردم کە وێنەی درەختەکە بچووك بکێشم . هەرچی بەرەو پێش دەچوو واتدەزانی کە لەپەنجەرەیەکەوە سەیری دونیا دەکەی . کاتێك کە چاوم بە جەدوەلەکانی ئەو ڕەسمە و جوانکارییەکانی و چوار چێوەی پەنجەرەکان کەوت زانیم کە ئەم وێنەیە بە نەریتی فەرەنسییەکان دەکێشرێت.

- " چوار چێوەکان و جوانکارییەکان بە دەستی زەریف ئەفەندییەوە دروست کرابوو ؟ "

- " ئەگەر ئەمە دەپرسی ، لە پێشدا گوتبووم من نەمکوشتوە . "

- بەپەلەپەل گوتی : " مرۆڤ ئەگەر بکوژێ و نەکوژێ ، ناڵێ کوشتوومە . " و پرسیاری ئەوەی کرد کە لە کاتی بەسەردا چوونی قاوەخانەکەدا لەوێدا چیمدەکرد .

چراکەی لەولای دۆشەکەکەمەوە و لەنێو لاپەڕەکان و نەخشکراوەکانمدا وەها دانا بوو کە ڕوومەتی ڕۆشن دەکردمەوە . خۆشی لەنێو تاریکاییەکەدا وەکوو سێبەرێك هەر چوار لا دەگەڕا . ئەو شتانەی وا بە ئێوەم گوتبوو بە ئەویشم گوت"

زۆر کەم سەردانی قاوەخانەکە دەکەم و بە هەڵکەوت لەوێوە تێپەڕ دەبووم حەزم لەو ڕووداوانە نەکردووە و دوو لە وێنەکانی ئەوێش بە دەستی من دروستکراون و گوتم : " چوونکە ئەگەرنەخش هێزی خۆی لە هونەری وێنەکێش و عەشقی نەخش و خودا وەرنەگرێ و خراپییەکانی ژیان لە داخوازی بچووك کردن و سزادانەوە وەربگرێت ، لە دواییدا خودی وێنەکێش بچووك دەبێت و سزا دەدرێت . لەوەش زیاتر ئەگەر ئەو قاوەخانە

وازی لە ئەرزڕوومییەکان بهێنابایە ، لەوانەیە ئەمشەو ئەوانەی بەسەردا نەهاتبایە . "

ناپیاو گوتی : " بەڵام تۆ هەر هاتوو چووی ئەوێت دەکرد . "

- " دەڕۆیشتم ، چونکە لەوێدا خۆمم سەرگەرم دەکرد . " ئایا تێدەگەیشت کە چەندە بەراستی قسە دەکەم ؟ ئەوەشم پیٚ زیاد کرد کە " ئێمەی ئادەمیزاد لەوانەیە بە پێی بیرووییجدانی خۆمان بزانین کە شتێك ڕاستە یان هەڵەیە ، بەڵام لەهەمانکاتدا دەتوانین چێژیشی لێوەربگرین . من لەبەر ئەوەی لەو وێنە هەرزانان و لاساییکردنەوانە ولە شەیتانە بێئارەزووە ناخۆشەکە و پارە و بەسەر هاتەکانی سەگ چێژم وەرگرتووە ، شەرم لە خۆم دەکەم " .

- " کەواتە بۆچی دەچووی بۆ قاوەخانەی ئەو بیٚئیمانانە ؟ "

- بە دەنگێکی نزمەوە گوتم : " باشە ، منیش هەندێك گومانم لە دڵدایە کە جار و بار وەکوو کرم دەروونم دەخواتەوە ، ئەوانەت بۆ باسدەکەم “ لەو کاتەی وا نەتەنیا وەستا عوسمان بەڵکوو پادشاکەشمان بە ئاشکرایی زانیویەتی کە لێهاتووترین و هونەردارترین وێنەکێشی وێنەکێشخانە منم ، دەستم بە پاراستنی خۆ کرد تاوەکوو لە کەوچکێك ئاودا نەمخنکێنن ، هەر بۆیە دەچوومە ئەو جێگایانە وا ئەوان دەچوون و لەگەڵیاندا هەڵسوو کەوتم دەکرد و دەمویست لەوان بچم . تێدەگەی ؟ لەو کاتەش وا دەیانگوت من ئەرزڕوومیم ، بۆ ئەوەی کومانم لەسەر نەکەن هاتوو چۆی قاوەخانەی ئەو بیٚئیمانانەم دەکرد . "

- " وەستا عوسمان دەیگوت زۆر شتی کردووە بۆ ئەوەی داوای لێبوردن لە خۆت و هونەرەکەت بکات ."

- " لەبارەی منەوە چیتری دەگوت ؟ "

- " دەیگوت لەبەر ئەوەی بڕوات پێبکەن کەلەبەر خاتری وێنە کێشان وازت لە ژیان هێناوە لەسەر دانەی برنج و نینۆك وێنەی هەرچی و پەرچییانە دەکێشیٚ ولەبەر ئەوەی لەو هونەرەی وا خودا پێیداوی شەرم دەکەی هەموو کات دەتەویٚ لە ناو خۆشیدا بیت . "

لە دڵەوە گوتم : " وەستا عوسمان لەپلەی وەستا بەهزاددایە . ئیتر ؟ "

- ناپیاو گوتی : " بەبیٚ هیچ ترسێك و کەمو کوڕییەکانتیشی هێنایە سەر زمان . "

- " کەمو کوڕیەکانم بۆ باسبکە " .

- وتی : " لەبەر هونەرەکەت وێنە ناکێشی ، بەڵکوو لەبەر ئەوەیە کە بکەویتە چاوی خەڵکەوە . لە کاتی وێنە کێشاندا ئەوەی وا دڵخۆشت دەکات ، ئەوەیە کە خەیاڵی ئەوە بکەی کە تەماشا کەرانی وێنەکەت چەندە چیژ و تام وەردەگرن ، کەچی دەبیٚ وێنەت بۆ ویستی خۆت بکێشابایە . "

چۆنیەتی بیر کردنەوەی وەستا عوسمان لەبارەی من و باسکردنی بە شێوەیەکی بێپەروایانە بەلای کابرایەك کە ئاگای لە نەخش نیە و هەموو ژیانی بە نووسەری و نامەبەری و ماستاوچێتی تێپەڕ کردووە ، لە دڵەوە برینداری کردم . ڕەشە شتیتریشی گوت : " وەستا عوسمان ئەوەشی گوت کە وەستا گەورە کۆنەکان ئەو شێواز و نەریتەی وا لەئەنجامی کاری تەمەنێك بە دەستیان هێناوە ناگۆڕنەوە بە دەسەڵاتی شایەکیتری تازە هاتوو یان کەیف یاخود وێنەی زەمانێکیتر ، هەر بۆیە لە ئەنجامدا بە قارەمانی خۆیان کوێر دەکەن . بەڵام ئێوە لەبەر ئەوەی پادشا دەیەوێت ، وێنەکانی کتێبەکەی زاواکەمتان بە ویست وحەزی خۆتانەوە کێشاوە وزۆر

بێشەرەفانە لاسایی فەرەنسییەکانتان کردووە."

وتم : " وەستا عوسمان باسی شتێکی خراپی نەکردووە ، بائەخلاموور بکوڵێنم بۆ میوانەکەم . "

ڕۆیشتمە ژوورەکەی تەنیشتەوە . گیانەکەم بە جلی ئاوریشمینە چینیەکەی شەویوە کە لە ئەستەری بوخچەچی کڕیبوو خۆی هاوێتە باوەشم و گوتی : " ئەخلاموور بکوڵێنم بۆ میوانەکەم ! " لاساییکردمەوە و دەستی برد بۆ قامیشەکەم . لەژێر دۆڵابەکەی لای ئەو جێگایەی وا بۆ خەوتن ڕایخستبوو ، لە نێوان سەرچەفە بۆن گوڵدارەکاندا شمشێرە دەسك عەقیقینەکەم دەرهێنا ، کێشامەوە . کەنارەکانی ئەوەندە تیژن کە ئەگەر دەستماڵێکی ئاورێشمین بخەیتە سەری دەبێ بە دوولەتەوە و ئەگەر لاپەڕەی زێڕینیش ببڕی وەکوو ئەوە دەردەچێ کە جەدوەلیان کێشاوە و ڕێك دەردەچێ . شمشێرەکەم لەپشتی خۆمدا قایم کرد و گەڕامەوە بۆ ژووری وێنەکێشان . ڕەشە ئەفەندی ئەوەندە حەزی لە لیپرسینەوە من دەکرد کە هێشتا بە خەنجەرەکەی دەستیەوە لەدەور و بەری دۆشەکەکەدا دەهاتوو دەچوو .

لاپەڕەیەکی نیوە نەخشکراوەم خستە سەر دۆشەکەکە و گوتم سەیری ئەمە بکە . لەمەراقاندا چۆکی دادا و ویستی بزانێ چیە . چوومە پشتیەوە ، شمشێرەکەم هەڵکیشا و خۆم هاوێتە سەری و دام بەعەرزدا . خەنجەرەکەی کەوت . قژیم گرتو چەسپاندم بە عەرزەکەدا و لە ژێریشەوە شمشێرەکەم نایە سەر قوڕگی و بە ورگە گەورەکەم زەختم خستە سەری . دەستێکم پڕ بوو لە قژە چڵکنەکانی و دەستێکیشم شمشێرەکەی نابووە سەر لاشە ناسکەکەی . ژێرییەکی کرد و جووڵەی نەکرد چونکە یەکسەر خوێنیم

دەڕشت . قژە لوولەكانی و پشت ملەكەی كە ئەگەر جاریكیتر بایە دەمەویست لێیبدەمله گەڵ گوێ پیسەكانیدا تووڕەیان كردم . وەكوو ئەوەی نهێنییەكی پێبدەم گوتم : " لێرەدا بۆ نەكوشتنت بەزۆر خۆم ڕادەگرم " . دەنگ دەرنەخستن و گوێگرتنی وەكوو منداڵێكی ژیر ، بەلامەوە خۆش بوو . دووبارە چپاندم و گوتم : " ئەفسانەكە ی شاهنامەوە دەزانی ؟ فەرەیدوونی باوكیان هەڵەیەك دەكات و وڵاتەكەی دەكا بە سێ بەش و وڵاتەخراپەكان دەدا بە دوو كوڕە گەورەكەی و باشترینیان كە ئێرانە دەدا بە ئیرەج كە بچووكی ناویانە . توور كە دەیەوێ تۆڵەی بستێنێتەوە ئیرەجی برای دەخەڵەتێنێ و بەر لەوەی سەری ببڕێ وەكوو ئەوەی وا من ئێستا كردوومە قژی دەگرێ و خۆی دەدا بەسەریدا و ئازاری دەدا . هەست بە گرانایی من دەكەی لەسەر خۆت ؟ " وەڵامی نەدایەوە ، بەڵام لە نیگای چاوەكانیدا زانیم كە گوێی لێڕاگرتووم . جارێكیتر ئیلهامم بۆ هاتەوە و گوتم : " من تەنیا بە نەریتی وێنە كیشە عەجەمەكان وەفادار نیم بەڵكوو لەبەرامبەر نەریت و شێوازی شمشێر لەبەر ملگرتن و سەربڕینی ئەوانیشدا دروست ماومەتەوە . نموونە یەكیتری ئەم وەزعە جوانەم لەوێنەكەی مەرگی شا سیاوەشدا بینیوە . "

ڕەشە بە بێدەنگی گوێی لێڕادەگرتم و منیش باسی ئەوەم بۆ دەكرد كە چۆن سیاوەش خۆی بۆ تۆڵەسەندنەوە لەبراكانی ئامادە كردووە و چۆن ئاوری بەرداوەتە هەموو كۆشك و مۆڵكی خۆیو گەردن ئازایی لەگەڵ ژنەكەیدا كردووە سواری ئەسپەی بووە و چووە بۆ سەفەر و چۆن لەشەڕدا شكستی هێناوە و ، لە مەیدانە كەدا قژی دەگرن و ڕایدەكێشن هەروەها چۆن لەنێو دۆست و دوژمنەكانیدا شمشێر دەكەوێتە بەرملی و چۆن

باسی ئەوە دەکرێت کە ئایا بیکوژن یان نا و خۆیشی گوێی لێدەبێت .

لە دواییدا گوتم : " حەز لەو ڕەسمە دەکەی ؟ . ئەو سیاوەشەی وا کەسێکی وەکوو من لە دواوە خۆی دەهاوێتە سەری و خەنجەر دەخاتە بەر قوڕگی ، لە دواییدا لە لایەن ( گەرووی ) یەوە بەبادانی قژی و برینی قوڕگی بەخەنجەر دەکوژرێت . ئەو خوێنەی وا تۆزێکیتر لێرەدا دەڕژێتە خاکە تینوەکە ، لەپێشدا دووکەڵێك هەڵدەسێنێت و لەدواییدا گوڵێکی تازە دەڕوێنێت . " تۆزێك بێدەنگ بووم و گوێمان لە ئەرزڕۆومییەکان گرت کە لەنێو کۆڵانەکەوە ڕایان دەکرد و هاواریان دەکرد . ئەو ترس و فەلاکەتەی دەرەوە یەکسەر ئێمەی نێزیکی یەك کردەوە کە لەزەویدا لەسەر پشتی یەك بووین . قژەکەی ڕەشەم لەناو دەستی خۆمدا زیاتر بادایەوە و گوتم : " بەڵام لەنێو هەموو ئەو وێنانەدا زۆرییەکانی کێشانی وێنەی دووکەس کە لە یەك نەفرەت بکەن ، هەستدەکرێت .

دەڵێی خەیانەتەکانی پێشوو و بەخیڵیبردنەوەکان و جەنجاڵ وشەڕە کۆنەکان تێکەڵاوی ئەم کاتە شاهانەی سەربڕین بوون . گەورەترین وەستاکانی قەزوینیش ، لەکێشانی دووپیاو لەسەر یەکدا تووشی زەحمەتی دەبن . هەموو شتێك تێکەڵ و پێکەڵ دەبێ ، کە چی من و تۆ زۆر کۆ کراوەتر و جوانتریشین . "

ناڵاندی و گوتی : " شمشێرەکەت دەمبڕێ . "

- " لە بەر ئەوەی قسەت کرد زۆر سوپاست دەکەم گیانەکەم ! بەڵام ناتبڕێ چونکە ئاگام لێیە . ناتوانم هیچ شتێك بکەم کە ئەم ڕاوەستانە جوانەمان تێك بدات . وەستا کۆنە گەوەکان کە ئەو هەموو وێنەی عەشق و مەرگ و شەڕەیان کێشاوە و کاتیچ کە وێنەی دوو کەسیان وەکوو یەك کەس

كێشراوەتەوە ، تەنیا توانیویانە فرمێسك لە چاوەكانمان بێنن . بۆنی قژەكان و پشت ملت دەكەم . سەرم وەكوو ئەوەی بەشێكی جەستەت بێ چەسپاوە بە پشت ملتەوە . قاچەكانم ئەوەندە بە هێمنی خۆیان لە سەر هەردوو لای قاچەكانت درێژ كردوە كە بینەر وا دەزانێت ئەمە حەیوانێكی جوانی چوار پێیە . هەست بە هاو سەنگی گرانایەكەم لە سەر پشتی خۆت و شمشێرەكە دەكەی؟" زەختم نەخستە سەر شمشێرەكە چونكە خۆێنی لێدەهێنا . چپاندم بە گوێیەوە وتم : " ئەگەر قسە نەكەی ، قەپ لە گوێچكەكانت دەگرم . " كاتێ لە چاوەكانیەوە زانیم ئامادەیە بۆ قسە كردن ، جارێكی تر هەر ئەو پرسیارەم لێكردەوە ، " هەست بە هاو سەنگی گرانایەكەم لە سەر پشتی خۆت و شمشێرەكە دەكەی ؟ "

- " بەڵێ "

- گوتم : " جوانە ؟ ئێمە جوانین ؟ ئێمە بە قەدەر ئەو قارەمانانەی ناو وێنەی وەستا كۆنەكان جوانین وا بە ناسكیەوە یەكتری دەكوژن ؟ "

- ڕەشە گوتی : " نازانم ، چاوم بە خۆمان لە ئاوێنەدا ناكەوێ . "

كاتێ كە خەیاڵی ئەوەم كرد كە داخۆ دەبێ ژنەكەم وا لەو دیوە بە دزیوە تەماشای ئێمە دەكات ، دەبێ لەبەر ڕۆشنای چرای قاوەخانەكەوە ئێمە چۆن ببینێ ، پەشۆكام و لەوە ترسام كە بە ڕاستی قەپ لە گۆی ڕەشە بگرم .

گوتم : "جەنابی ڕەشە ئەفەندی ! تۆ كە بە زۆرە ملی و بە خەنجەرێكەوە دێیتە ناو ماڵ و مەحرەمییەتی من ئێستا هەست بە هێزی من لە سەر خۆت دەكەی؟ "

- " هەست بەوەشم دەكەم كە حەقیشت هەیە . "

- " ئێستا دەتوانی ئەوەی وا دەتەوێ پرسیاری بكەی . "

- " باسی ئەوەم بۆ بکە کەوەستا عوسمان چۆن نەوازشی دەکردی . "

- " لە کاتی شاگردیمدا ، زۆر لە ئێستا باریکتر و ناسکتر و جوانتر بووم . وەکوو چۆن ئێستا هاتوومەتە سەر تۆ دەهاتە سەرم . باڵەکانمی نەوازش دەکرد. جار و باریش لێدەدام بەڵام لە بەر ئەوەی حەیرانی هونەر و زانایی و هێزی بووم، حەزم لە مانە دەکرد و بیرم لە شتی خراپ نەدەکردەوە ، چونکە حەزم لێدەکرد . حەز کردنی وەستا عوسمان ، ڕێگای خۆشەویستی نەخش کێشان و ڕەنگەکان و لاپەڕە وقەڵەم وجوانی وێنە و هەمووشتێکی وێنە کێشرا و هەموو دونیا و خودا بوو ."

– : " زۆری لێدەدای ؟ "

- " وەکوو باوکێك لە بەر پێویستی بە عەداڵەتەوە لێیدەدام وەکوو وەستایەکیش لە بەر فێر بوون گیانی دەئیشاندم و سزای دەدام . ئێستا تێدەگەم لە بەر ئازاری نینۆەکانم کە بە ڕاستە لێیدەدان ، بە باشی و بە زوویی فێری شت بووم . لە کاتی شاگردیمدا لە بەر ئەوەی پرچەکانم نەگرێ و سەرم نەدا بە دیواردا فێری ئەوە بوو بووم کە ڕەنگەکان نەرژێنم ، ئاوی زێر بە کار نەبەم ، فڵچەکانم لە کاتی خۆیدا پاك بکەم وهەڵەی ڕاستەکێش بشارمەوە وهەموو ڕۆح و سەرەنجێکم بدەمە سەر لاپەڕەکەی بەر دەمم . لە بەر ئەوەی ئێستا دەزانم کە وەستایەتیەکەی خۆم قەرزاری ئەو لێدانانەم ، بە دڵێکی ڕەحەتەوە لە شاگردەکانم دەدەم . تەنانەت لێدانی بە ناحەقیش ئەگەر غروری منداڵەکە نەشکێنێ دیسان بۆ داهاتوو کەڵکی منداڵەکە دەخوات . "

- " بەڵام کاتێ کە بۆ خۆشی خۆت پەتەکە دەپچڕێنی و لە شاگردێکی ڕومەت جوانی شیرین نیگای فریشتە ڕەوشت دەدەی ، ئەوەت وە بیر نایێتەوە کە وەستا عوسمانیش وای بە تۆ کردوە ؟ "

- " جار و بار بە بەردی مەڕ مەڕ وەها لە گوێمی دەدا کە گوێم زرەنگەی لێوە دەهات و سەر سام دەبووم . جار جاریش وەها زلەی لێدەدام کەفرمێسکیان لە چاوم دەهێنا ، ئەمانەم بە بیر دێتەوە ، بەڵام دیسان حەز لە وستا کەم دەکەم . "

ڕەشە گوتی : " نا ، لێ تووڕە دەبوی . بە کێشانی وێنەکانی کتێبەکەی زاواکەم بە نەریتی فەرەنسی تۆڵەی ئەو تووڕەییە کۆبووەتان دەکردەوە . "

- " تۆ وێنکێشان ناناسی ، پێچەوانکەی ڕاستە . ئەو لێدانانەی وا وێنەکێش لە کاتی منداڵیدا لەدەستی وەستاکەی دەیخوات ، دەبێت بە هۆی دروستبوونی گرێدانێکی بە عەشق . "

- " سەر بڕینی زاڵمانە و خاینانەی ئیرەج و سیاوەش بەو شێوەیەی کە تۆ لە دواوە شمشێرت خستە سەر قوڕگی من، هەمووی لە بەر بەخیلی بردنەوەی برایانە . لە شاهنامەشدا هەمیشە باوك ئەو بەخیڵی بردنەوەیە ئامادە دەکات.. "

- " ڕاستە "

- بە بێ شەرمییکەوە وتی : " ئەو باوەکە بێ عەداڵەتەی وا ئێوەی بەر داوەتە یەك ئێستاش خۆی بۆ خەیانەت بە ئێوە ئامادە دەکات . "

- ناڵاندی و گوتی : " ئا ، ئا ، مەکە ، دەیبری . " تۆزێکی تر قیڕاندی و گوتی : " بەڵێ ، ڕژاندنی خوێن و سەر بڕینی من کاری ساتێکە ، بەلام بە بێ گوێ گرتن لەو شتانەی کە وا ئێستا باسی دەکەم ... بڕوا ناکەم ئێستا

وەها بکەی ، ئا ، ئا، ئاه ، بەسە ــ سالأنێکی درێژ بیریان لە سەر دەکەیتەوە، تۆزێك شمشێرەکە ببەرە دواوە . " بردمە دواوە .

- " ئەو وەستا عوسمانەی کە لە منداڵیتانەوە چاوی لە هەر هەنگاوێك و هەر پشوو دانێکتان بووە و تەماشای بون بە هونەری لێهاتووییەکانی ئێوەی کردوە (کەخودا داویە پێتان ) ئێستاکەش بۆ پاراستنی وێنەکێشخانە و شێوازەکەی کە سالأنێکی تەمەنی بۆ تەرخان کردوە پشتتان لێدەکات ."

- " ئەو ڕۆژەی وا زەریف ئەفەندیمان ناشت ، بۆ ئەوەی کە بزانی شێواز چ شتێکی پیسە ، سێ بە سەرهاتم بۆ گێرابوویەوە . "

- رەشە بە وریایەوە گوتی : " ئەوانە لە سەر شێوازی وێنە کێش بوون بەلأم هەموو دەردێکی وەستا عوسمان پاراستی شێوازی وێنەکێشخانەکەیە. "

باسی ئەوەی کرد کە چۆن پادشا گرنگی بە دۆزینەوەی بکوژە ناپیاوەکەی زەریف ئەفەندی و زاواکەی دەدا و بۆ ئەوەش تەنانەت دەرگای خەزێنەی ئەندەروونی بە ڕوویاندا کردوٚتەوە هەروەها ئەوەشی باسکرد کە چۆن وەستا عوسمانیش ئەوەی وەکوو دەرفەرتێك بۆ لە ناو بردنی کتێبەکەی زاواکەی و سزا دانی ئەو وێنەکێشانە بەکار دێنێ کە لاسایی وێنەکێشە فەرەنسییەکانیان کردوٚتەوە و خەیانەتیان لێکردووە . هەر وەها ئەوەشی گوت کەلەبەر ئەسپە لمۆز بڕاوەکە ، گومانی شێوازەکە لەسەر زەیتوونە ، بەلأم لەبەر ئەوەی وەستا عوسمان لە تاوانبار بوونی لەق لەق دڵنیایە ، ئەو تەسلیمی جەلادەکان دەکات . لەبەر ئەوەی کە لەژێر زۆری شمشێرەکەدا ڕاستی دەگوت و وەکوو منداڵێك خۆی خستبووە ناو

باسەكەی ، دەمەویست ماچیبكەم . لەوانەی وابیستم نەترسام " چونكە بە لە ناو چوونی لەق لەق و مردنی وەستا عوسمان ــ خوابیدا لە خەزێنەی خۆی ــ من دەبم بە سەرۆكی وێنە كێشان،ئای كە خۆشە!

ئەو شتەی كە منی بێئارام دەكرد ڕوودانی ئەم شتانە نەبوون بەڵكوو ئەگەری ڕوونەدانیان بوو . ئەو بۆشاییەی والە نێو قسەكانیدا هەستمپێكرد ئەوە بوو كە دەبێ وەستا عوسمان تەنیا لەق لەق لەناو نەبا و منیش وا لێبكات . بیر كردنەوەی ئەم ئەگەرە بڕوا پێنەكراوە تەنیا زاوری نەدەتۆقاندم ، بەڵكوو منی دەخستە ناو ترسی بێجێگا و ڕێگا مانەوەی هەتیوێكی بێباوك .

لەبەر ئەوەی كاتێك ئەمەم وەبیر دەهاتەوە ، لە دەروونمەوە وەهام بۆ دەهات كە شمشێرەكە بكەم بە قوڕگی ڕەشەدا ، هەر بۆیە خۆمم ڕادەگرت و جارێكیتر لەگەڵ خۆم و لە گەڵ ڕەشەشدا باسی ئەوەم نەكرد : بەبۆنەی چەند وێنەی هەرچی و پەرچی بۆ كتێبەكەی زاوا كە بەنەریتی فەرەنسییەكان دروستدەكرێت بۆچی ببین بە خایین ؟ جارێكیتر بیرم لەوە كردەوە كە دەبێ لەپشت كوشتنی زەریف ئەفەندیوە لەق لەق و زەیتوون داوێكیان بۆ من دانابێ و شمشێرەكەم لەسەر ملی ڕەشە لابرد و گوتم : " پێكەوە بچین بۆماڵی زەیتوون و هەموو كونێكی بپشكێنین ، ئەگەر دوایین وێنە لەلای ئەوبێ ، ئیدی دەزانین كە پێویستە لەكەس نەترسین ، ئەگەر لەوێ نەبێ ، ئەویش دەگرینە پاڵ خۆمان و بەسەرماڵی لەق لەقدا دەچین . " پێمگوت كە متمانەم پێبكات و خەنجەرەكەی ئەو بەشی هەردووكمان دەكات . لەبەر ئەوەی پەرداخێك ئەخلامووریشم پێنەدابوو دواوای لێبووردنم لێكرد.

کاتێ چرای قاوەخانەکەمان وەرگرت ، پێکەوە تەماشایەکی واتاداری ئەو دۆشەکەکەیەمان کرد کە ئەوم لەسەر درێژ کرد بوو . بە چراکەی دەستمەوە نزیکی بوومەوە و گوتم ئەو تۆزە بڕینەی لای ملت دەبێ بە نیشانەی دۆستایەتیمان . ملیشی تۆزێ خوێنی لێهاتبوو . لە کۆڵانەکاندا هێشتا دەنگەدەنگی ئەرزڕوومیەکان و ئەوانەی وا ڕاوە دوویان دەنێن دەهات ، بەڵام کەس کاری بە ئێمەوە نەبوو . زوو گەیشتینە ماڵی زەیتوون . لە دەرگای حەوشە و دەرگای ماڵەکەماندا و بەبێ سەبرییەوە لەپەنجەرەکەشمان دا . کەسی لێنەبوو، ئەوەندە دەنگمان دەرخستبوو کە دڵنیا بوو بووین ، کەس لەوێ نییە . ڕەشە ئەو شتەی گوت کە هەردووکمان بیرمان لێدەکردەوە " "بچینە ناوەوە ؟"

بەلاکولەکەی خەنجەرەکەی ڕەشە ئاسنی درگاکەم کردەوە ، لە دواییدا خەنجەرەکەمان تێخست و بەلار کردنەوە کلیلەکەمان شکاند . لە ناوەوە بۆنی نەم وتەپ و تۆز و تەنیایی ساڵانێکی درێژ دەهات . لەبەر ڕۆشنایی چراکەدا چاومان بە جێگایەکی پەرش و بڵاوی خەوتن کەوت کە زۆر بێمێشکانە چەند پشتوێنی لەسەر فڕێدرا بوون ، یەلەك و دوو مشکی و فەرهەنگی فارسی و تورکییەکەی (نیعمە تولاّی نەقشبەندی ) و قووماش و تاودەرزی و سینیەکی مسینی پڕلە پێستی سێومان بینی ، هەروەها چاومان بە فڵچەکانی و هەموو کەلوپەلەکانی وێنەکێشانی کەوت . خەریکبوو لە نێوان لاپەڕەکانی لەسەر مێزەکەو لاپەڕە نەخشکراوەکانەوە دەستیپێبکەم بەڵام لەبەر ئەوەی کە ڕەشە لەمن بە ویستتر بوو و ئەوەشم دەزانی کە ئەگەر وەستایەکی وێنەکێش کەلوپەلەکانی وەستایەکیتری لە خۆی خراپتر ، تێکەڵ و پێکەڵ بکات ئەوا تووشی خەیر نابێت خۆمم ڕاگرت

. ڕەشە تاوەکوو گەیشتە بنی سەبەدی جلەکان هەموو جێگایەك گەڕا بوو ، بەڵام من دەستم نەدا بوو بەهیچەوە و تەماشای خاولییە بورساییەکانی زەیتوون و شانەدارینەکەی و شیشەکانی ئاوی گوڵ و پشتەماڵەیەکی پێکەنیناوی هیندی و چاکەتە خورینەکانی و سینی قاوەکەی و جلە پیسەکانیم دەکرد . ئەم زەیتوونە بە گوێرەی ئەو پارەیەی وەریدەگرێ وبەپێی کەلوپەلە هەرزانەکانیەوە یان وەکوو زۆر تەماکارە و پارە خەرج ناکات ، یان وەکوو پارەکەی لە جێگایەکدا دەدا بە ئاودا .

لە دواییدا بە ئیلهامەوە گوتم : " بە تەواوی ماڵی پیاو کوژێکە . تەنانەت بەرماڵێکی نوێژیشی نیە . " بەڵام ئەمانە ئەوانەی مێشکی من نەبوون . گوتم : "کەلو پەلەکانی کەسێك کە نازانێت خۆشحاڵ بێت ..." بەڵام لە لایەکی تریشەوە بە خەمەوە هەستم بەوە دەکرد کە بە خەفتباری و نزیك بوونەوە لە شەیتان بە کەڵکی نەخشکێشان دێت .

رەشە گوتی : " مرۆڤ سەرە ڕای ئەوەی بزانی چۆن دڵ خۆش دەبێ ، دەتوانێ دڵ خۆش نەبێت. چەند ڕیزە وێنەیەکی لە بنی سندوقێکەوە دەرهێنابوو ، ئەوانە لە کاغەزی هیندییەوە دروستکرا بوون و پشتەکانیشان بە لاپەڕەی ترەوە ئەستور کرابوون ، داینایە بەر دەستم . چاوم بە وێنەی شەیتانێکی شیرین کەوت کە لە خۆراسانەوە لە ژێر زەوییەوە دەرکەوتبوو و هاتبووە ئێرە ، وێنەی درەختێك ، ژنێکی جوان ، سەگێك و وێنەی ئەو مەرگەشی تێدا بوو کە وا من کێشابووم : ئەمانە ئەو وێنانە بوون کە ئەو بالۆرە بێژە کوژراوەکە هەموو ئێوارەیێك لە کاتی گێرانەوەی بە سەر هاتە ڕسواکانیدا هەڵیدەواسی . لە سەر پرسیاری ڕەشە ، وێنەی مەرگەکەم پیشاندا .

وتی : " کتێبەکەی زاواکەشم ئەم وێنانەی تێدایە . "

- " بالۆرە بێژەکە و قاوەچیەکەش دەیانزانی بە دەستی ئێمەوە کێشانی ئەو وێنانەی وا هەر شەو هەڵدەواسرێن شتێکی ژیرانەیە . لاپەڕەیەکی گەورەی دەداینێ داوای دەکرد بە پەلە پەل وێنەکە بکێشن و پرسیاری گاڵتەی نێو وێنە کێشانی دەکرد و لە دوایدا خۆشی تۆزێکی پێ زیاد دەکردو دەیگوتەوە : "

- " بۆچی ئەو وێنەی وا بۆ زاوات کێشاوە ، بۆ ئەویشت کێشاوە ؟ "

- " ئەوەی وا بالۆرە بێژەکە دەیویست تەنیا وێنەیەك بوو ، بەڵام وەکوو ئەوەی کتێبەکەی زاوا خۆمم پیوە خەریك نەکرد و هەر وا بە پەلە کێشام . ئەوانی تریش هەر وا ، لەوانەیە گاڵتەشمان پێکردبێ . "

- پرسیاری کرد و گوتی : " کێ ئەو ئەسپە لمۆز بڕاوەی کێشابوو ؟ "

چراکەمان نزێك کردەوە و تەماشای ئەسپەکەمان کرد ، لەو ئەسپە دەچوو کە وا بۆ کتێبەکەی زاوا دروست کرابوو ، بەڵام بە پەلەتر و بێ ویستانە تر کێشرابوو پێ دەچێ کە یەکێك پارەی کەمی دابێ بە وێنەکێشەکە و پەلەی لێکردبێ و داوای ئەسپێکی کردبێ کە زۆر بمێنێتەوە .

وتم : " لەق لەق باش دەزانی کە کێ ئەم ئەسپەی کێشاوە ، ئەو گێلە لە خۆ باییە، لە بەر ئەوەی نەیدەتوانی بە بێ ورتە و بۆڵە لەسەروێنەکێشان بژی ، هەموو شەوێك دەچوو بۆ قاوەخانەکە.

## (( بە من دەڵێن لەق لەق)) (56)

ڕەشە و پەپولە نیوە شەو هاتن ، وێنەکانیان ڕیز کرد و داوایان لێکردم کە پێیان بڵێم کام وێنە هی کام وێنەکێشە . لە منداڵیماندا یاری " کڵاو هی کێیە " مان دەکرد،ئەمەش لەوە دەچوو : لە سەر لاپەڕەکان ، کڵاوی

مامۆستا، سەرباز و ژن و جەلاد و نووسەر دەكێشرا ، ئینجا داوادەكرا بەبێئەوەیسەیری بكەی، ئەمانە لە گەڵ ناوە نادیارە كانی لاپەڕەی دیتردا یە كبخەیت . گوتم خۆم ئەم سەگەم كێشاوە ، هەموومان بە سەر هاتەكەیمان بۆ باڵۆر وێژە كە گێڕاوەتەوە كە بە ناپیاوی كوشتوویانە . ئەوەشم ڕاگەیاند كە ئەو مەرگەی وا شەپۆلی نووری چراكە بە سەریدا دێت و دەچێ كاری ئەم پەپوولە خۆشەویستەیە كە ئێستا خەنجەرەكەی ناوەتە سەر قوڕگم . ئەوەشم بە بیر دێت كە زەیتوون بە ویستێكی زۆرەوە ئەم شەیتانانەی كێشابوو " لەوانەیە ئەو خوالێخۆشبووە خۆی بە سەر هاتەكەی گوتبێ . من دەستم بە درەختەكە كرد بوو . خۆشمان بە سەر هاتەكەیمان گێڕابووەوە . سوورەكەش هەروابوو : سوورایی تكابووە سەر لاپەڕەیەك : باڵۆر بێژە گەوجەكە دەیگوت ئەمە تابلۆی لێدەردەچێ . هەندێكی تریشمان تكاندە سەری ، لە دوایدا وێنە كێشەكان لە گۆشەی خوارەوەی لاپەڕەكەوە شتێكی سووریان كێشاو بە سەر هاتەكەشیان بۆ باسكرد . ئافەرین بۆ زەیتوون كە ئەم ئەسپە جوانەمی كێشاوە ، ئەوەشم بە بیر هاتەوە كە ژنە خەمبارە كەش هی پەپوولەیە . هەر لەو كاتەدا پەپوولە خەنجەرەكەی لابرد و منیش بە ڕەشەم گوت كە ئەم ژنە جوانە خودی پەپوولە كێشاویەتی . گوتی بەڵێ ئێستاباسی ئەوانە بكە كە لە بیرتاماوە . پارەكەی ناو بازار ، دەستی هەمووماني تێدایە ، ئەو دوو عەبداڵەش زەیتوون كێشاویەتی ( كە خۆیشی بەڕەچەڵەك عەوداڵی قەلەندەرییە ). ئایینزاكەی ئەمانە لە سەر لەتەچنی و ئەنجامدانی شتەكە لە گەڵ كوڕە جوانەكاندا بنیاتنراوە ، شێخی نەمانە ناوی ( ئەوحادودینی كرمانی ) یەو دووسەد پەنجا ساڵ بەرلە ئێستا كتێبی

ئەمەی نووسیوە و بە شێعریشەوە گوتوویەتی کە ڕوخساری خودا لە ڕوومەتە جوانەکاندا دیاردەبێ.

برا وێنە کێشەکانیشم ! لە بەر پەرش و بڵاوی ماڵەکە داوای لێبوردنتان لێدەکەم ، ئامادەییمان نەبوو ، لە ناکاو هاتن ، ناتوانم قاوەیعەمبەردارو نارنجتان پێ بدەم چوونکە ژنەکەم لەو دیوەکەی تردا خەوتووە ، خەریکبوو بڵێم کاتێك کە تەماشای سەبەد و سەندوق و بەنەخۆێن و کەمەرە ئاورێشمینە هێندیەکانتان کرد و کاتێك و لە نێو دۆڵابەکاندا و لە ژێر قاڵی و دۆشەکەکاندا ولە نێو ئەو لاپەڕانەی وا بۆ کتێبی جۆراو جۆر ئامادەم کردبوون ، ئەگەر ئەوشتەتان نەدۆزیوە کە بە دوایاندا دەگەڕین ، نەچنە ژوورە کەیتر بادەستم نەچێ بە خوێندا. بەڵام با ئەوەش بڵێم کە حەزم لەوە دەکرد جۆرێك هەڵسوکەوت بکەم و نیشانبدەم کە لەوان دەترسم : هونەری وێنە کێش تەماشای جوانیەکەی ئەم کاتە دەکا کە خۆی تێدا جیددی وەر دەگرێ و گەڕانەکەشی بە دوای ئە دونیایەیە کە زیادە لە حەد ئەو جیدییەتەی وەردەگرێ . لە سەر پرسیاری ئەوان گوتم بەڵێ، لە کاتی بە سەر داهاتنی ئەرزڕوومیەکاندا ، وەکوو هەموو شەوانی تر قاوەخانەکە جەنجاڵ بوو ، لە گەڵ مندا زەیتوون و ناسری ڕاستەکێش و جەماڵی خۆشنووس و دوو وێنەکێشی جوانی سەر و ڕەحیمە شاگردە جوانەکە کە ئێستا لە گەڵ خۆشنووسەکاندا هەڵسوکەوت دەکات و هەندێك شاعیری جوانتر و سەرخۆش و تلیاق کێش و شەش حەوت کەسێك لە دەستەی عەودالەکانی لێبوو. ئەم جەماوەرە نوکتە بازە چل کەسییە سەرمان دەنایە سەر قاوە چییەکە و خۆمانمان سەرگەرم دەکرد، کاتێك هاتن ئەو جەماوەرەی کە مەراقی بێئەدەبییەکانی قاوە چیەکەیان دەکرد و لەوێ کۆ

بوو بوونەو هەر یەکەو بە لایەکدا ڕایانکرد و کەس ئەوەی بە بیر نەدەهات کە پیاوە بالۆرەبێژە بێچارەکە بپارێزێ کە جلی ژنانەی لە بەر کردبوو . ئایا خەفەتم بەمە دەخوارد ؟ بەڵێ ! چاومبڕیبوە پەپوولە مێشك بچووکە کە لە بەخیڵیبردنەوە زیاتر بیری لە هیچ نەدەکردەوە، چاوە کێشراوەکانی لە هەوای کوڕە قەڵەوە تەمەن بە سەرا هاتووەکاندا بوو . گوتم : من ، موستەفای وێنەکێشم ناویترم لەق لەقە و لە دڵەوە هەموو ژیانێکم ناوەتە سەر کارەکەم ، دانیشتن لە گەڵ برا وێنەکێشەکاندا و قسەی خۆشکردن و گاڵتە کردن وقسەی مانادار و شیعر گوتن بۆخۆ بە پێویستی دەزانم . ئەو پەپوولەیەی کە ئێستاش چاوەکانی وەکوو هی منداڵێك جوانن ، لە کاتی شاگردیشدا هەروا بە هەست و لاشە جوانبوو .

دیسان لە سەر پرسیارە کەیان باسی ئەوەم بۆ کردن کە بالۆرە بێژە پیرە خوالێخۆشبووەکە ئەم شارە و ئەو شار و ئەم گەڕەك و ئەو گەڕەك دەگەڕا و کاری بۆ خۆی پەیدا دەکرد ، لە دووهەم ڕۆژی زمان درێژییەکانی لە قاوەخانەکەدا وێنە کێشك بە سەرخۆشی قاوەوە وەکوو نوکتەیەك وێنەی سەگێك هەڵدەواستێ ، لە بەرامبەر ئەمەشدا کاتێك بالۆرە بێژە چەنە بازە کە هەست بەمە دەکات ، جۆرێك دەکات کە بڵێی ئەو سەگەو بە سەر هاتەکان دەگێڕێتەوە ، هەروەها کاتێ جەماورە حەزی لێدەکەن ئیدی هەموو ئێوارەیەك وێنەی وێنەکێشەکان هەڵدواسیۆ بە سەرهاتەکانیان دەگێڕێتەوە.

گۆتیان ئەم وێنانەیان لە شەوی بە سەردا چوونەکەدا لە ماڵی زەیتووندا دۆزیوەتەوە و پرسیاری بۆ چوونیمنیان کرد. گوتم پێۆیستی بە بۆ چوون نییە ، خاوەنی قاوەخانەکەیش عەوداڵێکی لە تەچنی دزی ناپیاوی وەکوو

زەیتوون بوو . هەروەها ئەوەشم ڕاگەیاند کە زەریف ئەفەندییە بێچارەکە لە قسەکانی مەلا ئەرزڕوومییەکە زاوری دەتۆقی و باش سەرەنجی دەدانێ ،بۆیە سکالاّی ئەمانەی لای ئەرزڕوومیەکان کردبوو . هەر وەها ئەوەشم گوت کە بە ئەگەرێکی گەورە زەریف ئەفەندی گوتبێتی وا مەکەن و ئاگاداری کردوونەتەوە ، ئینجا لە بەر ئەوەش قاوەچییەکە و زەیتوونی هاو ڕەچەڵەکی پێکەوە بێبەزەییانە کوشتبێتیان ، پێدەچێ زەریف ئەفەندی کتێبەکەی زاواشی لای ئەوان باس کردبێ و ئەوانیش لە تۆڵەی مەرگی ئەودا زاوا ئەفەندیان کوشتبێ بۆ تۆڵەی دووهەمیش بە سەر قاوەخانەکەدا هاتبن .

ئەو پەپولە قەڵەوەی وا سەری هەموو شتێکی لادەدا وهەموو جلەکانمی تێك دەدا و کون بە کونی ماڵەکەم دەگەڕا بۆچی ئەمشەولە گەڵرەشەدا گوێ دەدەنە باسەکانی من ؟ کاتێك پەپوولە لە سندوقێکی گۆێزیدا چاوی بە چەکمە و زرێ و کەلوپەلەکانی سەفەرم کەوت ، لە ڕوومەتە منداڵانەکەیدا چاوم بە بەخیلێردنەوەکەی کەوت و بە شانازییەوە دووبارە ئەو شتەم گوتەوە کە هەر کەس باش دەیزانی : من یەکەم وێنەکێشێکی موسڵمانم کە لە گەڵ لەشکەردا ڕۆیشتبێتم بۆ سەفەر و بە وردی تەماشای تەقاندنی تۆپەکان ورووخانی قەلاّ و بورجەکانی دوژمن و ڕەنگی جلی سەربازەکافرەکان و درێژ بوونی لاشەکانیان لەپانایی و درێژایی دۆڵەکاندا کردووەو وسەیری کۆ بوونەوەی لە سەریەکی سەرەکانو ڕیزەکانی سوارە زرێپۆشەکان و هێرشکانیانم کردوە و لە زەفەرنامەکاندا کێشانووەمەتەوە. کاتێ ڕەشە داوای لێکردم ئەوەی نیشان بدەم کە چۆن زرێ دەپۆشم ، بە بێ هیچ ترس و شەرمێك عەبا کورکی کەرۆێشك دارەکەم داکەند کراسەکە و

پانتۆڵ و شۆرتەکەم دەرهێنا . پێم خۆشبوو کە لە بەر ڕۆشنای ئاگردانەکەدا تەماشام دەکەن ، شۆرتە پاکەکەی ژێری زرێکانم کردە پێ و کراسە ئەستوورەکەو چۆغە سوورەکەم کردە بەر و گۆرەوییە بەنێن و چەکمە پێسە زرەدەکانم کردە پێ . زرێکەم لە جێگاکەی خۆی دەرهێنا و بەویستەوە لە بەرم کرد،وەکوو ئەوەی فەرمان بە کوڕە بەردەستەکان بدەم پشتم کردە پەپوولە و زرێکەم پێ بەستەوە و لەدوایدا ئەژنۆ بەندەکانیشم پێ گرێدا . کاتێك کە دەست بەندەکانی کردە دەستم و دەستکێشەکانی کردە پەنجەکانم و کەمەرە پێستی وشترینەکەمی گرێدا و کڵاوە ئاسنییە سوورمەیەکەمی کردە سەرم ، بە شانازیەکەوە گوتم :" لەمە و بە دوا وێنەکانی شەڕ وەها ناکێشینەوە، ئیدی نابێ وێنەی دوو لەشکەر لە بەرامبەر یەکدا و لە یەك قاڵبدا و یەکی ڕوو بە پشت و یەکی ڕوو بەولاوە بکێشی ، لەمە و بە دوا لە وێنەکێشخانەکانی عەلی عوسماندا وەکوو ئەوەی وا من بینیومە و کێشاومە بە تێکڕژانی خوێن و لاشە و مردووو ئەسپ و زرێکانیانەوە دەکێشرێت !

پەپولە بە بەخیڵییەوە گوتی : " وێنەکێش بینراوەکانی خۆی ناکێشێ بەڵکو ئەوانەی خودا دەکێشی" .

گوتم " : بەڵێ ، بەڵام خۆی لە خۆیدا خوداش هەر بینراوەکانی ئێمە دەبینی".

پەپوولە وەکوو ئەوەی سەرزەنشتی من بکات گوتی : " ڕاستە خودا بینراوەکانی ئێمە دەبینێ ، بەڵام وەکوو ئێمە نایانبینێ . ئەو دوو لەشکەرەی وا ئێمە بە سەر سووڕمایوە بە تێکلاوی دەیانبینین ، ئەو بە ڕێك و پێکی لە بەرامبەری یەکدا دەیانبینێ " وەڵامم هەبوو دەمویست بڵێم " بروا بە خودا بکەین و تەنیا ئەوانە بکێشین وا نیشانی داوین ، نەك ئەوانەی وا

نیشانی نەداوین " بەڵام بێدەنگ بووم . بەڵام لە بەر ئەوە بێدەنگ نەبووم کە پەپوولە بە لاسایی کردنەوەی ڕۆژ ئاواییەکان تاوانبارم دەکات . بە بەهانەی تاقی کردنەوە زرێکەم ،بێبەزیانە بە کڵاوە ئاسنیەکەم لە پشتیم دەدا .

حیسابی ئەوەم دەکرد کە ئەگەر دڵی ئەم گێلە چاو جوانە و ڕەشە بە دەست بهێنم ، ئەوسا دەتوانم لەو داوە ڕزگار ببیٚ کە زەیتوون بۆی داناوم . کاتیٚ کە زانییان لێرەدا نایدۆزنەوە گوتم " لە بەر ئەوە یمالّەکەمانیان پشکنیوە لەمەو بە دوا پیاو کوژە ژیرەکە ئەو وێنەیە لە جێگایەکی دەست پیٚ نەگەیشتوودا دەشارێتەوە ( زەیتوون لە عەقلّم دا بوو ) . بەڵام چەندە سەرنجیان دەدەامیٚ ؟ ڕەشە بە درێژایی باسی کێشرانی ئەسپە لمۆز براوەکەو ئەو سیٚ ڕۆژ مۆڵەتەی کرد وا پادشا دابووی بە وەستا عوسمان .

کاتیٚ ئامارەی کرد بە ئەسپە لمۆز براوەکان ومنیش پێدا گریم کرد بە سەیر کردنی چاوەکانمەوە وتی وەستا عوسمان وەکوو سەرپەتیٚ دەڵیٚ زەیتوون ئەو ئەسپانەی کێشاوە ، بەڵام لە بەر ئەوەی لە ویست و فرەخوازییەکانی من ئاگادارە ، گومانی لە سەر منە . یەکەمجار هاتبوون ئەوە بسەلەمێنن کەمن پیاو کوژم ، بەڵام ئەگەر بە من بیٚ هۆی هاتنەکەیان بە تەواوەتی ئەمە نەبوو . لە بەر تەنیای و بێچارەیی لە دەرگاکەی منیان دابوو . کاتیٚ دەرگاکەم کردەوە ، ئەو دەستەی پەپوولە کە خەنجەرەکەی بەرەو من درێژ کردبووەوە ، دەلەرزا . هەم لەوە زاوریان دەتۆقا کەهەرچیدەکەن نازانن ئەو پیاو کوژە هیچ و پوچە کێیە ،هەروەها لە پێکەنینی دۆستێکی کۆندا لە گۆشەیەکی تاریکیدا دەترسان کە خەنجەر بخاتەوە سەر قورگیان ، لەوەش دەترسان کە وەستا عوسمان لە گەڵ پادشا و خەزێنەداردا ڕێك بکەوێت و

تەلیسمی ئەشکەنجە کەرانیان بکات ، هەروها شتێکی تریش کە لێدەترسان و ورەی دادەبەزاندن ملهوڕی ئەرزڕوومیەکان بوو .

لـە پەشـۆکاندا داوای دۆسـتایەتیان لـە مـن دەکـرد . وەسـتا عوسمـان پێچەوانەی ئەم شتانەی پێ گوتبوون . پێویست بوو ئێستا وەکوو ئەوەی وا لـە دەروونیاندایەوخۆزگـەیان بـۆ دەخواسـت ، پێچـەوانەی ئەمـەیان بـۆ بسەلەمێنم . ئەگەر بمگوتبایە وەستای گەورە بەهەڵەدا ڕۆیشتووە وخڵـەفاوە ، یەکسەر دژایەتی پەپوولەم لە بەرامبەر خۆمدا دەووروژاوند ، چونکە وەکوو ئەو وا بوو کە لە چاوە هەڵماوییە برژانگ درێژەکانی پەپوولـە جوانەکـەدا کـە بـە خەنجـەرە کـەی دەسـتی لـە زرێکـەی منـی دەدا ، هێشـتا چـاوم بـە بڵێسـە کاڵەکانیعەشـقە کـەی لـە بەرامبـەر وەسـتاکەی دەزگیرانـی یـانی وەسـتا عوسمـان بـوو . لـە سـاڵانی شـاگردیمدا نزیکایـەتی ئـەم دووانـە و هەڵسـو کەوتی وەستا و شاگرد بابەتی قسـەی وێنـە کێشـان بـوو و هەمیشـە تانـەیان لێـدەدان ، بـەڵام ئـەوان گوێیـان نـەدەدا و لـە پـێش چاوی هەمووکەسێکدا تەماشای یەکیان دەکرد و بۆنی یەکیان دەکرد و لە دواییدا وەستا عوسمان زۆر بێبەزەییانـە دەیگـوت خێراتـرین قەڵـەم و باشـترین فڵچـە هـی پەپوولەیـە. زۆر جار ئەم گومانە ڕاستە ، لە نێو وێنە کێشـە بەخێڵەکانـدا دەبـوو بـە هـۆی یـاری کـردن بـە وشـەی فڵچـە و قەڵـەم و جامولکـە دروسـتکردنی قسـەی بـە واتای بێئەدبانە بەو وشـانە . لـەم ڕووەشـەوە تـەنیا مـن نـیم کـە هەسـتم بـەوە دەکـــرد ، کـــە وەســـتا عوسمـــان دەیەوســـێت پەپولـــە بهێنێتـــە ســـەر وێنەکێشخانەکە .

ماوەیـەکی درێـژە کـە وەسـتا عوسمـان باسـی ئـاژاوە خـوازی و ناڕێکـی و کەللە ڕەقی من بۆ ئەم و ئەو دەکات ، لەوەشەوە تێگەیشتووم کە لـە ڕاسـتیدا

وەستا عوسمان  شتێكی لە مێشكدایە ، بە هەقیشەوە بیری لەوە دەكردەوە كە من لە پەپوولە و لە زەیتونیش زیاتر دەتوانم نەریتی فەراسەیەكان پیادە بكەم و دەیزانی كە دەڵێم : " وەستا كۆنەكانە نەیاندەتوانی وەها نەخش بكێشن " و پشت ناكەمە داخوازییە تازەكانی پادشاكەمان . دەتوانم لەم بارەیەوە هاوكارییەكی باش لە گەڵ ڕەشەدا بكەم " چونكە ئەم تازە زاوا خۆێنگەرمەمان تەنیا لە بەر ئەوەی دڵی شەكورە بە دەست بێنێ و ئەوە نیشان بدات كە جێگای باوكی گرتووتەوە نایەوێت ئەم كتێبە تەواو بكات ، بەڵكوو دەزانێ كە دەتوانێ لە ڕێگای ئەم كتێبەوە زووتر بكەوێتە نێو چاوانی پادشا و پێشكەوێت، بەمجۆرەش لە جێگایەكەوە كە چاوەڕوانییان نەدەكرد سەرپەتەكەم گرتە دەستی خۆم و وتم كتێبەكەی زاوا موعجیزەیەكی خۆشی بێ هاوتایە و بەم شێوەیە سەری قسەم كردەوە . ئەگەر ئەم شتە نائاساییە ،یانی ئەو كتێبەی كە بە فەرمانی پادشا و بە ویستی زاوای ئەفەندی دەست پێكراوە تەواو ببایە ، ئەسا هەموو دنیا چاوی بە هێز و دەوڵەمەندی پادشای عوسمانی دەكەوت و لە بەرامبەر هونەر و جوانكارییەكانی ئێمەشدا پەنجەیان دەخستە نێو دەمیانەوە ، هەم لە ئێمە و لە هێزمان و لە بێ بەزەییبوونەكەشمان دەترسن ، هەم لە لامان خەفەتی خۆیان هەڵدەڕێژن و دەزانن كە لە نەریتی فەرەنسیەكانەوە هەندێك شتمان وەرگرتووە و لە ڕەنگەكانمان و وردەكارییەكانمانەوە بە شێوەیەك كە تەنیا ژمارەیەكی كەم لە سوڵتانەكانیان هەستی پێدەكات دەزانن ئەو شتەی وا ئێمە كێشاومانە هەم لە جێگایەكی دونیادایە وهەم لە بەینی وەستا كۆنەكاندا لە جێگەیەكی تر ڕاوەستاوە .

پەپوولـە لـە پێشـدا وەکـوو منـداڵێك کـە بیـەوێت بزانێـت زرێکـەم ڕاستەقینەیە یان نا لێیدەدا ، لە دوایدا بۆ ئەوەی بزانێت قایمە یان نا وەکوو هاوڕێیەك لێیدەدام ، دواتریش بە دوو بەهانەی پێشەوە دەیویست زرێکەم کون بکات و وەکوو بەخیلێك ئازارم پێ بگەیەنێ ، لە ڕاستیدا دەیزانی کە من لـەو بـە هونـەرترم ، لـەوەش زیـاتر بـە ئـازارەوە دەیزانـی کـە وەسـتا عوسمـانیش ئاگـاداری ئـەم وەزعەیـە . لـە بـەر ئـەوەی پەپوولـە بـە هونـەری خوداییـەوە بـوو بـە وەسـتاحەزم دەکـرد بەخیلیم پـێ بباتـەوە ،چوونکە غـرووری پێدەبەخشـیم . مـن وەکـوو ئـەو بـە دەسـت هێنـان بـە قامیشـی وەستاکەمدا نەبووم بە وەستا ، بەڵکو بە هێزی قامیشەکەی خۆم بووم بە وەستاو واشم کردووە کە ئەویش هەست بەمە بکات .

دەنگم بـەرز کـردەوە باسـی ئـەوەم کـرد کـە بەداخـەوە هەنـدێ کـەس هـەن دەیانەوێ کتێبە موعجیزەییەکەی زاوا و پادشا خراپ بکەن و لە ناوی بەرن . وەسـتا عوسمـان بـاوکی هـەموومان و وەسـتای هـەموومان بـووە : هـەموو شـتێك لـەوەوە فێـر بـووین ! بـەڵام لـە نێـو خەزێنەکـەی پادشـادا بـە دوای شوێندا گـەڕاوە و لـە دوای ئـەوەی دۆزیویەتـەوە دیسـان بـە هۆیـەکی نادیـار شاردویەتیوە . لەوە دڵنیام کە ئێستا زەیتوون لە تەکیە چۆڵکراوەکەی نزیك ( فەنەرکاپیـدا ) خـۆی شـاردۆتەوە . ئـەم تەکیەیـە لـە بـەر بـێ ڕەوشـتی و ڕسوایەکەی دانەخراوە بەڵکو لە زەمانی باپیری پادشاکەماندا لە بەر شەڕە بێ کۆتاییەکـەی عەجـەم داخـراوە ،دواتـر ئـەوەم وە بیر هێنایـەوە کـە جاران زەیتـوون بـە " چاوە ڕوانییـەوە " پەسـنی تەکیـە داخراوەکـەی دەدا ! ئەگـەر متمانەیان بە من نەهاتبایە و وەها بیریان بکردایەتەوە کە لە دوای ئەمانەوە داوێکیان بۆ دادەنێم . خەنجەرەکە بە دەستی ئەوانەوە بوو دەیانتوانی هەر

**لەوێدا سزام بدەن . پەپوولە دوو زەربەیتری لێدام ، ئەوندە قورس بوو کە زۆربەی زریێکان بەرگەیان نەدەگرت . گەڕایەوە بەرەو لای ڕەشە کە هەقی بە من دابوو و وەکوو منداڵ قیڕەیەکی کرد بە سەریدا . لە پشتەوە لێی نزیك بوومەوە و دەستە زریێ پۆشەکەم خستە ملی و بەرەو لای خۆمم ڕاکێشا . بەو دەستەکەی ترم دەستیم بادا و خەنجەرەکەیم لێسەند . لە ڕاستیدا نە یاریمان دەکرد نە شەڕ . بە سەر هاتی بەشێکی شاهنامەم بۆی گێراوە . ئەم بەشە زۆر کەم دەزانرێت :**

**" لە ڕۆژی سێهەمی شەڕەکەیان لەگەڵ لەشکری ئێراندا ، توورانییەکان بۆ ئەوەی بزانن ئەو شەڕکەرە ڕازدارەی ئێرانی کێیەوا ڕۆژ بە ڕۆژ سەربازی زیاتریان لێدەکوژێ شەنگێلی لێهاتوویان بەر دایە مەیدان . گاتێ شەنگێل بانگی شەڕکەرە ڕازدارەکە دەکات بۆ مەیدان ئەوی تریش پەسەندی دەکات ، لەشکەرەکەی هەردوو لا زریێکانیان لە بەر خۆردا دەبریقایەوە هەناسەی خۆیان دەگرت و سەیریان دەکرد، ئەسپە زریێ پۆشەکانی ئەم دوو جەنگاوەرە وەها لەیەك کەوتن کە بزسیکەی ئاگر لە گیان و جەستەی ئەسپەکانەوە دوکەڵی هەڵدەستاند . زۆری خایاند توورانیەکە تیرێکی هاویشت بەڵام ئێرانییەکە ئەسپ و شمشێرەکەی باش بە کار هێنا و لە دوایدا توورانییەکەی گرت و خستیە خوارەوە،کاتی ڕاکردن بە زریێکەوە باوەشی پێدا کرد و بە توندی ملی گرت . توورانییەکە شکستی قەبوڵ کردو بەبێچارەییەوە پرسیاری ئەو شتەی کرد وامەراقی دەکردو گوتی:"تۆ کێی؟"**

**شەڕکەرە ڕازدارەکەش گوتی : " بۆ تۆ ناوی من مەرگە "**

ئـەوە كێـی بـوو ؟ پەپوولـە بـە خۆشـییەوە وەكـوو منـداڵێك گـوتی : " ڕۆستەمی ئەفسانەیی بوو ! "

پشت ملیم ماچ كرد و گوتم : " هەمووومان خەیانتمان بە وەستا عوسمان كـرد . ئێسـتاش بـەر لـەوەی ئـەو سـزامان بـدات ، پێویسـتە ئێمـە زەیتـوون بدۆزینەوە و ژەهرەكەی ناومـان بڕێـژین ، بۆ ئـەوەی كە بتـوانین لـە بەرامبـەر دوژمنانی شێوەكاری و لـە بەرامبـەر ئەوانـەی وا دەیانـەوێت ئێمـە تەسلیمی شكەنجە گـەران بكـەن ،پێویسـتە پتـەوتر و بە هێـز تـر ڕاوەستین . لەوانەیـە كاتێك گەیشتینە ئەو تەكیە تیكدراوە تێبگەین كە هیچ یەك لە ئێمە پیاو كوژ نین . "

پەپوولەی بێچارە دەنگی دەرنەخست . چەندە بە هونەریش بێ و چەندە پشــتی پتــەو بــێ دیســان وەكــوو ئــەو وێنەكێشــانەی كــە ســەرە ڕای بەخیلێبردنـەوە بـە دوای یەكـدا دەگـەڕێن ، لـە ڕۆیشـتنە نـاو دۆزەخ و تـەنیا مانـەوە لـە دونیادا دەترسا . لـە ڕێگـای ( فەنـەر كاپیـدا ) ڕەنگێكـی زەرد لـە دوورەوە دیـار بـوو ، بـەڵام ئـەوە مانگـە شـەو نـەبوو . دارەكـانی سـەرەوە و گومــەزەكان و دیــوارە بەردینــەكان و ماڵــە چــێوینیەكان لــە بــەر ئــەم تیشكەداجێگای خۆیـان دەدا بـە قەڵایـەكی نەناسـراوی دوژمـن و هەسـتێكی وای لە دەروونـدا دەورووژانـدەوە كە لە تەپۆڵكەكەوە سـەر كـەوتین ، لـە دواوە لە لای مزگەوتەكەی بەیازیتدا سوتانی زەویمـان بینی . لـە تاریكـای شـەودا چاومان بە عەربانەیـەك كـەوت كـە ئـەویش بـە تەلیسـە ئاردەكانییـەوە وەكـوو ئێمـە بـەرەو ئـەو پـەڕی شـار دەچـوو ، دووئاكچـەمان دایـە و سـوار بـووین ، ڕەشـە ڕەسمـەكانی هێنـا بـوو ، خـۆمم درێـژ كـرد و تەماشـای ئـەو هـەورە نزمانەم دەكرد كە ئاگرەكە ڕوونی كردەبوونەوە، هەر لەم كاتانـەدا دڵۆپێكـی

باران دای لە کڵاوە ئاسنیەکەم. بە هیوای ئەوەی لەم گەڕەکە دوور دەستەدا تەکیە چۆڵکراوەکە بدۆزینەوە لە دوای ڕێ کردنێکی زۆرهەموو سەگەکانی گەڕەکمان هەستاندە سەر پێ . هەر چەندە کە نوری چرای چەند ماڵێکی بەردینمان بینی کە لە بەر ئێمە داگیرسابوون بەڵام تەکیەکەمان نەدۆزیوە ، لە دەرگای چوارەمین ماڵمان دا و مامە کڵاو لە سەرێك دەرگاکەی بۆکردینەوە ، وەکوو جەردە سەیری دەکردین و تەکیەکەی بۆ تاریفکردین، مامە بە خۆشیەوە گوتی لە دەستی جندۆکە و عفریتە و شتی وا زۆر دەکێشن وئازارتان دەدەن .لە حەوشەی تەکیەکەدا هێمنی دار سەروە لە خۆبایەکان کە گوێیان نەدایە باران و بۆنی گەڵای گەنیو پێشوازیان لێکردین ! لە پێشدا چاوم خشان بە دیوارە تەختە بەندەکانی تەکیە و لە دواییدا لە کونە بچکۆلەکانی پەنجەرەیەکەوە تەماشای ناوەوەم کرد، سێبەری ترسێنەری کابرایەکم بینی کە نازانم لە بەر ئێمە نوێژی دەکرد یا هەر بۆ خۆی نوێژی دەکرد.

## (( بە من دەڵێن زەیتوون )) (57)

نوێژەگەم ببڕیبایە و یەکسەر دەرگاکەم بۆ بکردبایەنەوە ڕاست تر دەبوو یان وەکوو هێشتەوەیان لە بەر بارانەکە ؟ کە زانیم بە درزیوە تەماشام دەکەن بە بێئەوەی خۆم تێك بدەم هەتا دوای نوێژەکە مامەوە . کاتێ دەرگاکەم کردەوە چاوم بە وانەی خۆمان، لەق لەق و پەپوولە و ڕەشە کەوت و قیڕەیەکی خۆشی لە قوڕگمەوە دەرکەوت . بەن حەپەسانەوە باوەشم کرد بە پەپوولەداو سەرم نا بە شانییەوە ونالاندم و گوتم : " چیمان بە سەر هات ، چی ! چییان لێ دەویستین ؟ بۆچی دەمانکوژن ؟" نیشانی پەشۆکان لە ڕوومەتیاندا دیار بوو ، لە ژیانی وێنەکێشمیدا جار و بار هەندێ وێنەکێشم

دەبینی ئەم نیشانەیان پێوە دیار بوو . لە نێو تەکیەکەشدا لە یەك جودا نەدەبوونەوە .

گوتم : " لەوە دەترسن ؟ دەتوانین ب ڕۆژ خۆمان لێرە بشارینەوە " .

رەشە گوتی:"لەوە دەترسین ئەو کەسەی وادەبیٚ لێی بترسین لەناو خۆماندابیٚ"

گوتم : " منیش کە بیر لەمە دەکەمەوە دەترسم ، چونکە هەندیٚ قسە وباسم لەو بارەیەوە بیستوە " لە لایەن پیاوەکانی بوستانچی باشییەوە قسەیەکی وا بلاو بووەتەوە و گەیشتوٚتە وێنەکێشان کەگوایا ڕازی بکوژەکەی زەریف ئەفەندی و زاوا ئەفەندی نەماوە و پیاو کوژەکە یەکێکە لە ئێمەی وێنەکێش کە بۆ ئەو کتێبە نووری چاوی ڕشتووە . ڕەشە پرسیاری ئەوەی کرد کە چەند ڕەسمم بۆ کتێبەکەی زاوا کێشاوە .

– " یەکەمین شەیتان بوو ، شەیتانێکی ژێر زەویم بۆی کێشاوە ، وەستا کۆنەکانی وێنەکێشخانەکانی ئاك کۆیۆنلوەکانیش زۆر جار کێشاویانە . بالۆرە بێژەکە خۆی خستە بەر پێم : " دوو عەودالم بۆ بکێشە " پێشنیارم بە زاواکەت کردبوو کە بیانخاتە ناو کتێبەکەی چونکە ئەم ئەم دەروێشانەش جێگایەکیان لە ولاتی عوسمانیدا هەیە."

– : " هەمووی ئەمەیە ؟ " کاتیٚ وتی هەموو ئەمە بوو ، وەکوو ئەوەی دزی شاگردێکی ئاشکرا کردبێت بە فیزەوە ڕۆیشتە دەرەوەو چەند لاپەڕەیەکی گەورەی هێنا کە لە بەر بارانەکەدا تەڕ نەبووبوون ، ئەوسا وەکوو دایکە پشیلەیەك کە پەلەوەرێکی بریندار بۆ بەچکەکانی هێنابیٚ چەند لاپەڕەیەکی خستە بەر دەم ئێمەی وێنەکێش . هێشتا لە ژێر باڵیدا بوون کە ناسینمەوە . ئەو وێنانەن کە وا ئەمشەو لە کاتی بەسەر داهاتنی

قاوەخانەکەدا دەستم بە سەردا گرتبوون و دزیبووم . هیچ پرسیاری ئەوەم نەکرد کە چۆن ڕۆیشتوونەتەماڵەکەم و ئەمانەیان هێناوە . دیسانیش لە گەڵ پەپوولە و لەق لەقدا زۆر ژیرانە ئەو وێنانەمان نیشاندا کە بۆ کابرای بالۆرە بێژمان کێشابوو . ئەسپێکی وەها بەم جوانییە ! لە لاوە ملی لار بووەتەوە . بڕوا بکەن کە تەنانەت خەبەری دروست بوونی ئەسپیشم نەبووە . ڕەشە وەکوو مامۆستایەك گوتی : " تۆ ئەم ئەسپەت دروست نەکردووە ؟"

– : "نا، من دروستم نەکردووە ."

– " ئەی ئەوە ناوی کتێبەکەی زاوەکەم؟ "

– " من ئەو ئەسپەشم دروست نەکردووە ."

– : " لە شێوازەکەتەوە دیار بوو کە تۆ ئەو ئەسپەت کێشاوە ، لەوەش زیاتر وەستا عوسمانیش بەمەی زانیوە ."

– : " من هیچ شێوازێکم نیە ، ئەمە بە شانازییەوە لە بەر ئەوەی لە بەرامبەر بای هەڵکردوو ڕاوەستم نابێژم هەروەها بۆ پاکانە کردن و بێتاوان نیشان دانی خۆشم ئەمە ناڵێم ، چونکە هەبوونی شێواز بۆ من لە پیاو کوژ بوونیش خراپترە ."

– : " تۆ جیاوازییەکت لە گەڵ وەستا کۆنەکان و ئەوانی تردا هەیە. "

بزەیەکم بۆ لێدا . دەستیکرد بوو بە باس کردنی ئەو شتانەی کە وادەزانی ئێوە مانانن هەمووتان دەیزانن : بە وردییەوە گوێم بۆ ئەو ڕاگرت کە پادشاکەمان و خەزێنەدار خەریکن بۆ ڕاوەستاندنی ئەم کوشتارانە چارە دەدۆزنەوە و سێ ڕۆژ مۆڵەت دراوە بە وەستا عوسمان و نەریتی نەدیمە بە کاربراوە و کونی لمۆزی ئەسپەکان بڕاوە و ڕۆیشتوونەتە ناو خەزێنەی ئەندەروون و تەماشای کتێبەکانی وەستا کۆنەکانیان کردوە . هەندێك جار

هەیە کاتێك شتێکمان بە سەردادێ هەر لە سەرەتاوە دەزانین کە لە ماوەی هەموو ژیانماندا لە بیرمان ناچێت.

بارانێکی خەماوی دەباری . پەپوولە وەکوو ئەوەی خەم بۆ باران بخوات ، بەکزی دانیشتبووو باوەشی کردبوو بە خەنجەرەکەیدا . زرێکەی پشتی لەق لەق لە ئارد سپی تر بوو ، چرایەکی بە دەستەوە بووو بە لێبووردیەوە دەچووە ناو تاریکاییەکانی تەکیەکەوە . ئەم وەستا وێنەکێشانەی کە سێبەرەکەیان وەکوو تارمایی بە دیوارەکانی تەکیەکەدا دەگەڕان براکانی من بوون و چەندە خۆشم دەویستن ! لە بەر ئەوەی وێنەکێشم هەستم بە خۆشی دەکرد . پرسیارم لە ڕەشە کرد و گوتم : " دەزانی بە ڕۆژان دانیشتن لە گەڵ وەستا عوسمان و تەماشا کردنی وێنەی وەستا کۆنەکان چ جۆرە خۆشیەکی تێدایە ؟ ماچی کردی ؟ ڕوومەتە جوانەکەتی نەوازش کرد ؟ دەستی گرتی ؟ لە بەرامبەر هونەر و زانایەکەیدا حەیران مایتەوە ؟ "

-" وەستا عوسمان لە نێو شتە دەرئاساییەکانی وەستا کۆنەکاندا ئەوەی پێنیشان دام کە تۆ شێوازێکت هەیە . هەر وەها ئەوەی پێ فێر کردم کە وێنەکێش بە دڵی خۆی شێواز هەڵنابژێرێت ،بەڵکوو ئەمە لە ڕابردوو ولە بیرەوەریە فەرامۆش کراوەکانی‌وە دیار دەردەکەوێ، هەروەها ئەوشی دیار کرد کە ئەو شتەی لە کاتی خۆیدا ئێمەی دەخستە شەرمەوە و ئەو کەموکوڕی و لاوازییانەی وا دەمانگوت با ئێمە لە وەستا کۆنەکان جیا نەکەنەوە ،لە بەر ئەوەی ئەمڕۆ شێوازی فەرەنسیەکان لە جیهاندا بڵاو بووەتەوە بووە بە " تایبەتمەندی " " شێواز " وپەسانیاندەدرێن ،لەمە و بە دواش دونیا لە بەر ئەو گەوجانەی‌کەبە کەموکوڕیەکانی خۆیان پەسەنی خۆیان دەدەنەوە پڕ ڕەنگتر و گێلانەتر و پڕ عەیبتر دەبێ "

بـروا کـردن و شـانازی کردنـی ڕەشـە بـەو شـتانەی وا دەیگـوت خـۆی نیشـانەی ئـەوە بـوو کـە ئـەو یەکێکـە لـەو گەوجانـە . پرسـیارم کـرد : " ئایـا وەسـتا عوسمـان ڕوونکردنەوەیـەکی بـۆ لمـۆزی ڕێـك و پێکـی ئـەو سـەدان ئەسـپەیە ئـەهێناوە کـە وا لـە مـاوەی ئـەم سـاڵانەدا بـۆ کتێبـەکانی پادشـام کێشاوە "

–" ئـەویش لـە بـەر ئـەوەی لـە منداڵیتانـەوە بـەو عەشقەی پێیـداون و بـەو لێدانانەی وا لێیداون بووە بە باوك و خۆشەویستتان و ئێوەی وەکوو کوڕی خـۆی و وەکـوو گـەورەکردووە لەمـە تێناگـات . ئـەو دەیویسـت وێنـە کێشـخانەی عوسمـانی شـێوازێکی هـەبێ نـە وەك ئێـوە. ئێـوەش کـەمو کوڕیـەکانی خۆتـان و جیاوازییـەکانتان لـە ترسـی سـێبەری ئـەو لـە بـیر دەچـوەوە . دواتـریش ئـەو ئەسـپەت کێشـاوە کـە سـاڵانێکە لـە دەروونتـا خەوتووە . "

– " دایکـم لـە بـاوکم ژیرتـر بـوو ، ئێمـە تـەنیا لـە دەسـت ئـەو و وەسـتا عوسمان لێدانمان نەخواردوە ،بەڵکو لە وەستا توورە کەللە ڕەقەکانی تـریش لێدانمان خواردوە، ڕۆژێك سەر دەستەکەمان بە ڕاستی لێیدام و منیش لە ماڵدا گریام و گوتم جارێکی تـر ناگەڕێمـەوە . دایکم گوتی کوڕم لە دونیـادا دوو جۆر مرۆڤ هەن : یـەکێك ئەوانـەی وا هەمیشـە لـە ژێـر لێدانـەکانی کـاتی منداڵیـدا خـۆ دەخۆنـەوە و دەمێننـەوە ، ئەوانـە هەمیشـە بـە سـەر کـوتکراوی دەمێنێننـەوە ، چـونکە لێـدان وەکـوو ئـەوەی دەخـوازرێ شـەیتانی نـاو مـرۆڤ دەکـوژێ . بـەڵام ئـەو بەختەوەرانـەش کـە ناترسـێوبە بـێ لێـدان پـەروەردە دەکـرێن هـیچ کـات بیرەوەریـەکانی کـاتی منـداڵی فـەراموش ناکـەن – دایکـم گوتی ئەمە بە کەس مەڵێ – بەڵام کاتێك فێری ئەوە بوون کە چۆن لە گەڵ

شەیتانا هەڵسو كەوت بكەن دەتوانن فێلباز بن ، شتە نەزراوەكان بزانن ، دۆست پەیدا بكەن و دوژمنەكانیان بناسنەوە و لە كاتی خۆیدا هەست بەو گومانە بكەن كە لە دواوە بۆی دروستی دەكەن ، منیش ئەوەی پێ زیاد دەكەم دەتوانن لە هەموو كەس باشتر نەخش بكێشن . وەستا عوسمان لە بەر ئەوەی ئەگەر پەلی دارێكم بە ڕێك و پێكی نەكێشابایە زللەیەكی وای لێدەدام كە لە چاومەوە فرمێسك بهاتبایە و دارستانێك لە پێش چاومدا شین ببایە . لە دوای ئەوەی كە لە بەرامبەر نەبینینی كەمو كوڕیەكەی گۆشەی لاپەرەیەك بەر دەبووە گیانم ئاوێنەكەی دەگرت بە دەستەوە و بۆ ئەوەی لە فێر بوونەكانی چاو نەجاتم ببێ ، گوێی دەهێنایە لای گوپم و لە سەر ئاوێنەكە یەك بە یەكی چەوتیەكانی پیشان دەدام ، منیش هیچ كات ئەو عەشقە و ئەو جەستەیەم لە بیر نەچوو . شەوی ئەو ڕۆژەی وا لە پێش چاوی هەر كەسدا سەرزەنشتی دەكردم و بە ڕاستە لێیدەدام تا بەیانی دەگریام و نەدەخەوتم كە چی بەیانی لە پێش چاوی هەموو كەس بە عەشقەوە دەستی ماچ دەكردم و منیش لە دڵەوە بروام دەكرد كە ڕۆژێك دەبم بە وێنەكێشێكی گەورە . من ئەو ئەسپەم نەكێشاوە ."

–" ئێمە ـ باسی لە لەق لەقیش دەكر د ـ لە تەكیەكەدا بە دوای دواین ڕەسمی كتێبەكەی زاومدا دەگەراین . تۆ ئەو وێنەیەت بینیوە؟"

– : " ئەوە شتێك نییە كە پادشاكەمان و ئێمەی وێنەكێشی گرێدراوی وەستا كۆنەكان و موسڵمانان پەسەندی بكەین. " و بێدەنگ بووم. ئەم قسەیەم بە ویستەوە كرد . لە گەڵ لەق لەقدا تەكییەكەیان ژێر و ژوور كرد و هەموو جێگایەكی گەڕان ، یەك دوو جار بۆ ئەوەی كار ئاسانیان بۆ بكەم چووم بۆ لایان . لە یەكێك لە ژوورەكاندا كە سەراپیتەكەی دڵۆپەی دەكردلە

بەر ئەوەی نەکەونە ناو قوڕی زەوییەکە ئیشارەتێکم بۆ کردن ، هەروەها واشم کرد کە ئەگەر دەیانەوێ با بگەڕێن . کلیلە گەورەکەی ئەو ژوورەم بۆ هێنان وا سی ساڵ بەر لە ئێستا و بەر لە بڵاو بوونەوەی ڕێبوارانی تەکیە و بوونیان بە بەکتاشی ژووری بابا ( باوك ) بوو . بە ویستەوە چوونە ناو ژوورەکە، بەڵام کاتێك زانیان دیواریشی نیە و یەکراست باران دەبارێتە ناوەوە تەماشای دەوور و بەریشیان نەکردودەرکەوتن . ئەوەم پێ خۆش بوو کە پەپوولە لە گەڵ ئەواندا نەبوو ، بەڵام لە هەمانکاتدا هەستم بەوە دەکرد کە ئەگەر بەڵگەیەك بۆ تاوانبار کردنی من بدۆزنەوە ئەویش لە گەڵ ئەواندا یەکدەگرێت . ڕەشە و لەق لەق لەوە دەترسان کە وەستا عوسمان تەسلیمی ئەشکەنجەگەرمان بکات و دەیانگوت پێویستە لە بەرامبەر خەزێنەدار بە هێز بین و پشتیوانی یەك بین هەر بۆیە بە باشی لە یەك نزیك بووینەوە . لەوە تێگەیشتم کە مەبەستی ڕەشە تەنیا ئەوە نیە کە بکوژەکەی زاوا بدۆزێتەوە و بەو جۆرە خەڵاتیەکی ڕاستەقینەی هاوسەرەکەی بدات بە شەکورە جوانەکە ، بەڵکو ئەوەشی تێدایە کە وێنە کێشە عوسمانیەکان بخاتە سەر ڕێچکەی فەرەنسیەکان و بەو پارانەش کە لە لای پادشاکەمانەوە دێت کتێبەکەی زاواکەشی تەواو بکات ( ئەمە لە کوفریش پێکەنیندارتر بوو ) هەڵبەت لەوەش تێدەگەیشتم کە پەپوولە دەیەوێت لە دوای ئەم گەمە و فێڵانە ببێت بە سەرۆکی وێنەکێشان ( چونکە هەرکەس وای بۆ دەچوو کە وەستا عوسمان پەپولەی بۆێت) ، و لە ئێمەش و تەنانەت لە وەستا عوسمانیش نەجاتی بێت . مێشکم تێکەڵ پێکەڵ بوو ، گویم لە باران دەگرت و ماوەیەکی دوور و درێژ بیرم کردەوە ، لە دوایدا وەکوو کەسێك کە لە ناو جەنجاڵیەکدا خۆی دەرخستبێ و بیەوێت داخوازنامەکەی بدات بە

پادشا و سەرۆك وەزیرەكەی كەلە تەنیشتیوە تێپەڕ بن خۆمم نێزیكی ڕەشە و لەق لەق كرد و لە دەرگایەكی گەورەوە بردنمە جێگایەكی مەترسیدار كە لە پێشدا چێشتخانە بوو . پرسیاری ئەوەم لێكردن كە ئایا شتێكیان دۆزیوەتەوە یان نا ؟ دیارە كە نەیاندۆزیوەتەوە . ئەو قاپ و قاچاخ و قابلمە گەورانەی وا كاتی خۆی چێشتیان بۆ هەژارەكان پێ لێنرابوو هەروا مابوونەوە . ئەم جێگە دڵ لەرزێنە پڕ بوو لە تۆڕی جاڵجاڵۆكەو تۆز و قوڕ و پیسایی سەگ و پشیلە . كەس نەویستبوو خاوێنی بكاتەوە . وەكوو جاران بایەكی بە هێز لە هەر چوار لاوە دەهات كە نەدەزانرا سەرچاوەكەی لە كوێیەوەیە . تیشكی چراكەی كز دەكردئەویش جار جار سێبەرەكانمانی كاڵتر دەكرد و جار جاریش ڕەشتری دەكرد .

گوتم : " گەڕان بۆی ، بەڵام خەزێنە شاراوەكەمتان نەدۆزیوە . " لە نێو دار و بەردە ڕەماوەكاندا دەستم برد بۆ جێگایەك كە سی ساڵ بەر لە ئێستا ئۆجاخ بوو ، بە پێی عادەت خۆڵەمێشەكەیم بە دەست لابرد و قولپی ئاسنیەكەم گرت وبە جیڕە جیڕ دەرم هێنا ، چراكەم كردە دەمە بچووكەكانی فڕنەكەوە . هەرگیز ئەوەم لە بیر ناچێت كە لەق لەق بەر لە ڕەشە پەلاماری توورەكە مەشكینەكانیدا ، دەیویست هەر لەوێدا دەمیان بكاتەوە ، بەڵام لە بەر ئەوەی من بەرەو هەیوانەكە دەڕۆیشتم و ڕەشەش لە ماڵەوە لەو تاریكایە دەترسا بە دوامەوە هات ، لەق لەقیش بە پێ درێژەكانیەوە كەوتە دوای ئێمە ، كاتێك لە قوڕەكەدا چاویان بە گۆرویەكان و شۆرتە سوورەكەم و كراسە ئاورێشمینەكەم و گۆێزانم و كەلو پەلەكانم كەوت بۆ ساتێك دوو دڵ مانەوە . لە توورەكەكەیتردا كە ڕەشە كردییەوە پەنجا وسێ ئاڵتونی وەنیزی و ئەو لاپەرە زیڕاوكراوانەیتێدابوو كە لەم ساڵانەی دوایدا لە وێنە

کێشـخانەکە دزیبـووم ،دەفتـەری وێنەکانیشـمی‌تێدا بـوو کـە لـە هەرکـەس شـاردبوومەوە . لـە نێـو لاپەڕەکانـدا لاپـەڕەی زێـڕین وچـەند ڕەسمـی خـۆم و هەنــدێکی ئــەم لا و ئــەولاو ئەنگوســتیلە عەتیقــە یادگاریەکــەی دایکــە خۆشەویســتەکەم و مشــتی قــژ و قەڵەمــە باشــەکانم و باشـترین فلْچــەکانم دەرکەوتن .

–بە لە خۆ بایی بوونێکی گێلانەوە گوتم : " ئەگەر وەکووو ئەوەی ئێوە بیر دەکەنەوە پیاکوژ بایەم ، ئەمانـە لـە خـەزێنـە شـارەوەکەمدا دەر دەکـەوتن یـان دوایین وێنەیە دەرکەوت ؟"

– لەق لەق پرسیاری کرد و گوتی : " بۆچی ئەمانە دەرکەوتن ؟ "

–" جاری پێشوو کەپیاوەکانی بۆستانچی باشی ماڵەکەیان بشکێنم – وەکوو ماڵەکەی تۆ – دوو لەم ئاڵتونانەیان کەتەمەنێکم بۆیان تەرخان کردوە بە دزیوە خستبووە ناو گیرفانییەوە ،منیش بیرم لەوە کردەوە کە لـە بـەر ئـەم بکوژە ناپیاوەجارێکیتر دەمانپشکنن ، کە هەقیشم هەبوو، ئەگەر ئەو دوایین وێنەیە لە لای من بایە لێرەدا دەبوو. " گوتنی ئەم دواین ڕستەیەم هەڵە بوو . بـەڵام دیسـان هەسـتم بـەوە دەکـرد کـە ڕەحـەتبوون و لـەوە ناترسـن کـە لـە گۆشـەیەکی تـاریکی ئـەم تەکییەیـەدا قوڕگیـان بگـرم . ئێـوەش بڕواتـان پـێ کـردم ؟ بــەڵام ئــەمجارە نائاســودەییەك دەروونــی گرتبــووم:ئــەوەی وا بــێ ئۆقرەی دەکرم ئەوە نەبوو کە هاورێ وێنەکێشەکانم کە لـە کـاتی منداڵیمـەوە دەیانناسم ، بەوەیان زانی کـە ماوەیـەکی زۆرە بـە شـێوەیەکی چـەپەڵانە پـارە کــۆ دەکەمــەوە و زێــڕ دەشــارمەوە و چــاویان بەوێنــەی بێڕەوشــتی نــاو دەفتـەرەکانم کـەوتبێ، بـەڵکو لـە بنەڕەتـدا لـەوەی وا ئەمانـەم لـە پەشـۆکان و

ترسدا نیشان داون هەستم بە پەشیمانی دەکرد . تەنیا نهێنیەکانی کەسێك ئاوا بە ئاسانی دەردەکەوت کە لە خۆڕایی و لە خۆوە ژیانبکات .

– زۆر دواتر ڕەشە گوتی : " دیسانیش با بڕیار لە سەر ئەوە بدەین کە ئەگەر وەستاعوسمان تەسلیمی ئەشکەنجە گەرانی کردین چی بڵێین " هەستم بە بێ مێشك بوون و بێزار بوونێك دەکرد . لەق لەق و پەپوولە لە ژێر تیشکە کاڵەکەی چراکەدا تەماشای وێنەی بێڕەوشتی ناو دەفتەرەکەمیان دەکرد ، لە هەوایەکدا بوون کە گوییان نەدەدا بە هیچ شتێك، تەنانەت بە شێوەیەکی مەترسیدار خۆشحالیش بوون . لە دوای هەردووکیان ڕاوەستام و وەکوو ئەوەی کە بیرەوەریەکی کۆن وەبیربهێنمەوە ، بە بێدەنگی تەماشای وێنەی بێ ڕەوشتییەکانم کرد (خۆم کێشابووم ).

ڕەشەش هاتە لامان نازانم لە بەر چی بوو ، بەڵام ئەوەی کە هەر چوارمان پێکەوە تەماشای ئەو وێنەمان دەکرد لە دڵەوە ڕەحەتی دەکردم، لە دوای ماوەیەکی درێژ لەق لەق گوتی : " کوێر و بینەر دەبن بە یەکێك " ئایا ئاماژەی بەوە دەکرد کە هەرچەندە ئەم ڕەسمە بێڕەوشتانەن ، بەڵام چێژی بینین کەخودا پێپێداوین شتێکی بەرز و پیرۆزە ؟ بەڵام لەق لەق لەم شتانەتینەدەگەیشت وقورئانی کەریمی نەدەخوێندەوە . دەمزانی کە وەستا کۆنەکان هەمیشە ئەم ئایەتەی قۆرئانیان وەبیر دەهێنایەوە . وەستا گەورەکان ئەم قسەیان لە بەرامبەر گوتنی دوژمنانی وێنەدا بەکار دەهێنا کە دەیانگوت بەپێیدینەکەمان وێنەکێشان حەرامە و لە ڕۆژی قەیامەتدا وێنەکێشان دەنێرنە دەۆزخ. تا ئەو کاتە سیحراویە هیچ کات ئەم قسەیەی پەپوولەم نەبیستبوو کە وادەتگوت لە خۆیەوە دەرکەوتووە : " دەمویست وێنەیەك بکێشم کە جیاوازی کوێرو بینەرر ( چاوساغ ) نیشان بدات ! "

ڕەشە بە دڵپاکییەوە گوتی : " کوێر و بینەر کێیە ؟ "

پەپولە گوتی:" کوێر و بینەر نابن بە یەك ، تاریکایی و ڕۆشنایی نابن بە یەك ،سێبەرو جێگای گەرمیش نابن بەیەك و زیندووەکان‌و مردووەکانیش نابن بەیەك"

لە ساتێکدا بە بیر کردنەوە لە سەر چارەنووسی زەریف ئەفەندی و زاوا ئەفەندی و ئەو بالۆرە بێژەی وا ئەمشەو کوژرا، لەرزێك کەوتە گیانم و ڕاچڵەکام ، ئەوانیش بە قەدەر من ترسا بوون. ؟ بۆ ماوەیەك کەس لە جێگای خۆیدا نەجووڵایەوە. لەق لەق هێشتا دەفتەرەکەی منی پێبوو، بەلام سەرەڕای ئەوەی تەماشامان دەکرد دەتگوت کەس ئەو وێنەی بێڕەوشتیانە نابینێ! لەق لەقیش گوتی : "منیش دەمەویست ڕۆژی قیامەت بکێشم ، زیندوو بوو نەوەی مردووەکان و جیاکردنەوەی تاوانباران و بێتاوانان. بەلام بۆ چی ناتوانین قورئانی کەریم بکێشینەوە؟" وەکوو ئەوەی لە کاتی شاگردیماندا لە یەك ژووردا پێکەوە کارمان دەکرد و وەکوو وەستا کۆنەکان بۆ دەرکردنی ماندوویی چاوان سەرمان دەنا بە سەر مێزی کار و کاتێ هەڵماندەگرت باسی ئەوەمان دەکرد وا دەهات بە مێشکماندا و بەو جۆرە سەری باسێکیترمان لادەدایەوە. ئەو کاتانەش وەکو ئەوەی ئیستا تەماشای ئەم دەفتەرە دەکەین، باسی شتەکانی دڵی خۆمانمان دەکرد بە بێئەوەی تەماشای یەك بکەین، چوونکە بۆ پشوودان سەرمان لە پەنجەرەکەوە دەبردە دەرەوە. نازانم لە بەر پەشۆکانی بیر کەوتنەوەی بیرەوەرییەکەی دەورانی خۆشی شاگردی بوویان لە بەر ئەو پەشیمانییە بێ کە لە بەر نەخوێندنەوەی قورئانی کەریم هەستم پێکردبوویان وەکوو لە بەر ئەو جەنایەتە ترسێنەر بێت کەوا شەو لە قاوەخانەکە دا بینیم، دڵم خێراتر

لێیدەدا و لە بەر ئەوەی هیچ شتێکم بە بیردا نەدەهات، ئاوەهام گوت:" من زۆرتر دەمەویست وێنەی ئەو ئایەتە دواییانەی سوورەی بەقرە بکێشم کە بەم مانایە دێن : خودایا !لە بەر فەرامۆشکردن و کەمو کوڕییەکانمان لێپرسینەوەمان لێ مەکە، ئێمە لە بەر تاوانەکانمان ببەخشە! یارەبی ڕەحممان پێبکەی." لە ناکاو دەنگم شکاو و شەرمم لە فرمێسکەکانم کرد کە وا بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراو ڕژا بوون، وامدەزانی فرمێسکەکانم ڕاوە دەوەستن، بەڵام دەستم بەهەنیسکدان کردوکەوتمە پەڵمەگریان. هەستم بەوە دەکرد هەرچی من زیاتر دەگریم، ئەوانیش هەست بە برایەتی و خەم و داتەپێن دەکەن.

لەمە و بەدوا لە وێنەکێشخانەکەی پادشاکەماندا بە نەریتی فەرەنسیەکان نەخش دەکرا و ئەو نەریت و نەخشانەی وا هەموو تەمەنی خۆمانمان پێ بەخشیبوو فەرامۆش دەکرا و لە ڕاستیدا هەموو شتێك تەواو دەبوو ، ئەگەر لایەنگرانی مەلا ئەرزڕوومیەکە ئەیانکوشتباین ، ئەوا ئەشکەنجە گەرانی پادشا سەقەتیان دەکردین . بەڵام چۆن لە کاتی گریاندا گوێم بۆ بارینی بارانەکە ڕادەگرت بە گۆشەکە تری عەقلڤمەوە بیرم دەکردەوەو دەمزانی کە ئەو شتانەی وا من دەگرێنن ئەمانەنین . ئەوانیتر چەندە هەستیان بەوە دەکرد ؟ لە بەر ئەوە بەدڵ و نە بە دڵ گریام ، تۆزێك هەستم بە تاوانباری دەکرد ، پەپوولە باوەشی پێدا کردم ودەستی خستە سەر شانم و قژەکانمی نەوازش کرد ، گۆنامی ماچ کرد و قسەی خۆشی بۆ کردم .

لەسەرەتای شاهنامەدا و لە ئەو کاتە ئەفسانەییەدا لەبەر ئەوەی ئافراندن تازە دەستیپێکردووە هەموو شتێك ئەوندە سادە بووە کە پێویستی بە

ڕوونکردنـــەوە نـــەبووە . شـــیرت بویســـتایە گـــوانی بزنەکـــەت دەمـــژی و دەتخـــواردەوە، بتگوتایـــە ئەســـپ ســـواری دەبوویـــت و دەڕۆیشـــتی ، باســـی خراپـەت بکردایـە شـەیتان دەهـات و باسـی جوانیـەکانی کوشـتنی بـاوکتی دەکرد و قەناعەتی پێدەکردی . کوژرانی مەرداسی باوکی زوحاك لەبەر کەم هۆ بوونەکەی تابلۆیەکی جوانە ، هـەروەها ئەنجامدانی ئـەو پیـاو کوژییـە لـە شەوێکدا کە ئەستێرەکان باخچە و دارە سـەروەکانی کۆشـکێکی دەرئاسـایی ڕوونـــاکتر دەکەنـــەوە جوانییـــەکیتری پێدەبەخشـــی . دواتـــر ڕۆســـتەممان خســـتەوە یـــاد کەلـــەدوای ســـێ ڕۆژ شـــەڕ لەگـــەڵ کوڕەکـــەی کـــە فەرمانـــدەیی هێزەکـــانی دوژمـــن دەکـــات بەبێئـــەوەی کـــە بزانێـــت ســـوهرابی کـــوڕی خـــۆی دەکوژێـت ، کاتێـك کـە ڕۆسـتەم لـە بـازوو بەندەکـەی باڵی سـوهراب کـە چەن ساڵ بەرلە ئـەو کاتـە دایکی پێیـدا بـوو دەزانـێ کـوڕی خۆیـەتی ، شـتێك لـەو بابەتـەی وا دەبـوو بـە هـۆی ئـەوەی ڕۆسـتەم لـەدوای ئـەم ئاگـادار بوونـەوەیـە لـەنێو فرمێسـکی چاوەکانیدا سینگی خـۆی بکوتـێ لـە دەروونـی ئێمەشـدا دەکوڵا .

ئەو شتە چی بوو ؟ باران هێشتا بە ترپە ترپەکەی خۆیـەوە لەسـەربانی تەکیەکەی دەدا ، منیش هەندێك خوار و بـانم کرد بوو و ئاوەهـام گوتبـوو : " یـان وەکـوو وەسـتا عوسمـانی باوکمـان بـە خەیانـەت هـەمووومان دەکوژێـت یان وەکوو ئێمە ئەو دەکوژین . " لەبەر ئەوەی کە قسەم ڕاست بـوو و هەڵـەی تێدا نەبوو هەمووومان کەوتینە ناو ترسەوە و بێدەنگ ماینـەوە . لـەکاتی بـان و خوار کردنەکەمدا لە پەشـۆکانی جێگیر کردنـەوەی شتەکان وەکـوو جـاران لەبەر خۆمـەوە وەهـام دەگـوت : ئەگـەر باسـی کـوژرانی سیاوەش بـە دەسـتی ئەفراسیاب بکـەم بابـەتی قسـە دەگـۆڕێ ، بـەڵام ئـەوە خەیانـەتێك بـوو کـە مـن

لێی نەدەترسام . باسی مەرگی خەسرەو بکە باشە ، بەڵام وەکوو ئەوەی وا فردەوسی لە شاهنامەدا باسی دەکات یان وەکوو ئەوەی نیزامی لە خەسرەو شیریندا دەیگێڕێتەوە ؟ ئەو شتە خەماوییەی ناو شاهنامە ئەوەیە کە کاتێ بکوژەکە دەچێتە ناو ژوورەکەوە ، خەسرەو بە چاوە فرمێسکاویەکانیەوە دەزانێ کە هاتووەکە کێیە ! وەکوو دوایین چارەکوڕەکەی پاڵدەستی خۆی بانگ دەکا و دەڵێ با نوێژێك بکەم بچۆ ئاو و سابوون و جلی پاك و بەرماڵێکم بۆ بێنە ، کوڕەکەش ئەوەندە گێل دەبێ کە نازانێ خەسرەو داوای یارمەتی دەکات و دەچێ بەراستی ئەو شتانەی بۆ دەهێنێ . کاتێ خەسرە و شیرین لە ژوورەکەدا بەتەنیا دەمێننەوە ، پیاو کوژەکە یەکسەر دەرگاکە دادەخات و کلیلی لێدەدات . لەکۆتایی ئەم بەشەی شاهنامەدا ، فیردەوسی دەڵێ : "ئەو پیاو کوژەی وا فێڵبازان و گەمەکەرانی کۆشك دۆزیویانەتەوە ، کەسێکی بۆن پیسی ورگنی تووکن بووە ."

کاتێ بان خوارم دەکرد سەرم پڕ بوو لە وشە ، بەڵام وەکوو ئەوەی ناو خەونەکان دەنگم دەرنەدەکەوت . هەر لەو کاتەشدا وەکوو ئەوانەی ناو خەیاڵەکان کاتێ چاوم بەوان کەوت کە پێکەوە چپەچپ دەکەن زانیم کە بە شێوەیەکی دوژمنانە لەسەر من قسە دەکەن . لەناکاو هەر سێکیان پێکەوە خۆیان فڕێدایە سەرم . کاتێ خۆیان دا بەسەرمدا ، پێم لەعەرز بڕا و هەر چوارمان تەختی زەوی بووین ، لە زەویدا هەندێك پاڵنان و ڕاکێشان و چنگ لە قوڕگنان دروستبوو ، بەڵام زۆری نەکێشا . من لەسەر پشت لە ژێرەوە مامەوە . ئەوانیش کەوتنە سەر من.رەشە هەر دوو ئەژنۆی نایە سەر جێگای

یەکگرتنەوە دەست و شانم وبە هێزەوە دانیشتە سەر بەینی سینگ و ورگم و جێگای خۆی کردەوە .

لەم وەزعەدا نەمدەتوانی هیچ جووڵەیەك بکەم . هەموومان سەرسام و کاڵبوو بووینەوە . ئەمەم بیر کەوتەوە : مامە خوالێخۆشبووەکەم کوڕێکی پیس و پۆخڵی هەبوو کە دوو ساڵ لەمن گەورەتر بوو ، هیوادارم لە کاتی ڕێ بڕینی کاروانێکدا گیرابێ و سەریان پەڕاندبێ . ئەم دڵپیسە کاتێك کە هەستی بەوە دەکرد من لەو زاناتر و ژیرتر و ناسکترم ، بە هەموو بەهانەیەکەوە ئاژاوەی دەکرد و ئەگەر بەهانەشی نەبایە دەیگوت بازۆرن بگرین کاتێ زۆرانیشن دەگرت منی دەخستە ژێر و وەکوو ڕەشە دەهاتە سەر سینگم و چاوی دەبڕییە ناو چاوانمولە دواییدا تفێکی لە دەممدا کۆ دەکردەوە و دەیکرد نێو چاوانم ، کاتێك شۆڕ دەبووەوە لەبەر ئەوە نەچێتە نێو چاوانم سەرم ئەملا و ئەولا پێدەکرد و ئەویش ڕادەبوێرا .

ڕەشە گوتی:"هیچ شتێك مەشارەوە دوایین وێنەکە لە کوێ‌دایە؟ئیعتیراف بکە"

بۆ دوشت هەستم بەخەم و تووڕەییەکی خنکێنەر دەکرد : هەستم بەوە نەکرد بوو کە ئەمانە لەپێشدا ڕێککەوتوون و لە خۆڕایی ئەم قسانەم کرد ، هەروەها بیری ئەوەم نەکرد بوو کە بەخیلی تائێرەش بێت و لە پێشدا هەڕام نەکرد بوو .

ڕەشە گوتی ئەگەر دوایین وێنە دەرنەخەم و پیشانیان نەدەم قوڕگم دەبڕێ . شتێکی پێکەنینداره . ئەگەر دەمم بکەمەوە وەکوو ئەوەی لە ڕاستیدا هەڕا بکەم دەگیرێت و هیچی لێ‌دەرناکەوێ . لەلایەکیتریشەوە بیرم لەوە دەکردەوە کە چارەم نییە و شتێکم لەدەست نایەت . ئەگەر لە ناوخۆدا

یەكبگرن و من وەكوو پیاو كوژ بدەن بە دەستی خەزێنەدار ئەم ئیشە كۆتایی پێدێت . تەنیا ئومێدم ئەوە بوو كە وەستا عوسمان ئاماژە بە شتێكیتر بكات و كەسێكیتر وەكوو پیاو كوژ دەستنیشان بكات . بەڵام با سەیر بكەین و بزانین ئەو شتانەی وا ڕەشە لەبارەی وەستا عوسمانەوە دەیگوت ڕاستن یا نا ؟ ئایا ئەمانە دەیانتوانی بمكوژن و لەدواییدا تاوانەكە بخەنە ئەستۆم ؟ خەنجەرەكەیان خستە سەر قوڕگم . یەكسەر چاوم بەو چێژ و تامە كەوت كەوا ڕەشە دەیگرت و نەیدەتوانی لە منی بشارێتەوە . زللەیەكیان لێدام . خەنجەرەكەی بڕا و تیژ بوو ؟ زللەیەكی تریان لێدام . بەڵام توانیم ئەو ژێر بیرییە شیان بخەمە دەست كە : ئەگەر هیچ شتێك نەڵێم هیچ شتێك نابێت ، ئەمەش هێزێكی دابەمن. ئیدی ئەوەیان نەدەشاردەوە كە لە كاتی شاگردییەوە تاوەكوو ئێستا بەخیڵییان بەمن بردووە كە لە تەواوی ژیانی شێوەكاریمدا لە هەموو كەسێك باشتر ڕنگكاری و بۆیاخم كردووە و لە هەركەس جوانتر خەتم كێشاوە و باشترین نەخشم دروستكردووە . لەبەر ئەوەی ئەوەندە بەخیڵیان بەمن بردەوە حەزم لێدەكردن، بزەیەكم بۆ برا خۆشەویستەكانم لێدا .یەكێكیان كە نامەوێ ناوەكەیتان بۆ ئاشكرا بكەم، وەكوو ئەوەی ماچی خۆشەویستەكەی بكات كەچەند ساڵە چاوەڕێی دەكات ، بەگەرمو گوڕیەوە ماچی كردم . ئەوانی تریش لەبەر ڕۆشنایی چراكەدا دانیشتبوون ، منیش وەڵامی ئەم ماچەی برا خۆشەویستەكەمم دایەوە . مادام كەبەرەو كۆتایی هەموو شتێك دێین با بزانریت جوانترین نەخش من كێشاومە. لاپەڕەكانی من بدۆزنەو و تەماشای بكەن.

وادیاربوو وەڵامدانەوەی ماچەكەی بەماچ پێخۆش نەبووبۆیە بەتووڕەییەوە دەستی بەلێدانی من كرد . بەڵام ئەوانی تر دەستیان گرت .

کەوتبوونە ناودوو دڵیو گومانەوە . لەبەر ڕاکێشان و پاڵپێوەنانەکەی نێو خویان ڕەشە تووڕە بوو، ئەتگوت تووڕەییەکەیان لەمن نیە بەڵکوو لەو ڕاستەیە کە ژیانیان بەرەو ئەویٚ دەچێت، هەر لەم ڕووشەوە دەیانویست تۆڵەی خۆیان لەهەموو دونیا و هەرکەس بسێننەوە .ڕەشە لەبەر پشتوێنەکەیدا شتێکی دەرهێنا! دەرزییەکی درێژی نوك تیژبوو ، لەناکاو لە چاومی نزیك کردمەوە " وا هەڵسوکەوتی دەکرد کە دەیەویٚ بیکا بە چاومدا . گوتی : " نزیکی هەشتا ساڵ بەر لە ئێستا کاتیٚ هەرات گیرا ، وەستای وەستایان وەستا بەهزاد کاتیٚ زانی هەموو شتێك تەواو بووە ، لەبەر ئەوەی کەس ناچاری نەکات بە شێوەیەکیتر وێنە بکێشێت بە شەرەفەوە خۆی کوێر کرد، لەدوای ئەوەی کە بە هێواشی ئەم دەرزییەی کرد بە چاوی خۆیدا و دەریهێنا ، تاریکییە شکۆدارەکەی خودا هێدی هێدی داکەوتە پێش چاوی عەبدە خۆشەویستەکەی کە ئەم وێنەکێشە دەست موعجیزەییە بوو . ئەم دەرزییە لەگەڵ وەستا بەهزاد دا کە ئیدی کوێر و سەرخۆش بوو بوو ، هێنرایە تەورێزو دواتریش لەگەڵ شاهنامە ئەفسانەییەکەدا لەلایەن شا تاماسووبەوە پێشکەشی باوکی پادشاکەمان کرا . وەستا عوسمان لەپێشدا نەیدەزانی کە ئەمە بۆچی نێردراوە . بەڵام ئەمڕۆ چاوی بە خواستی خراپ وژیرییەکەی شاتاماسووب کەوت . وەستا عوسمانیش کاتیٚ زانی ئیدی پادشا دەیەوێت بە نەریتی فەرەنسییەکان وێنەکانی خۆی بکێشیٚ و ئێوەی شاگردیشی کە وەکوو منداڵی خۆی حەزی لێدەکردن خەیانەتتان پێکرد ، دوێنیٚ شەو لە ژووری خەزێنەدا وەکوو وەستا بەهزاد ئەم دەرزییەی کرد بە چاوی خۆیدا وخۆی کوێر کرد.ئێستاش ئەگەر من تۆی مەلعوون کە

وێنەكێشخانەكەی بەرەو لەناو چوون دەبەی( كە تەمەنێكی بۆ تەرخان كردووە) كوێر بكەم چی دەبیٚ ؟

– : " كوێرم بكەیت و كوێرم نەكەیت لەدواییدا لێرەدا جێگا بۆ خۆمان نادۆزینەوە . وەستا عوسمان لەراستیدا كوێر دەبیٚ ، یان دەمریٚ و ئێمەش بەكاریگەری فەرەنسییەكانەوە وەكوو ئەوەی خۆمان دەمانەویٚ و لە دەروونمانەوە دێت بە هەموو كەموكوڕی خۆمانەوە وێنە دەكێشین ودەبین بە خاوەنی شێواز و كەسایەتی تایبەت بە خۆمان و وردە وردە لە خۆمان دەردەچین ، بەلاّم نابین بە خۆمان ! نا ، ئەگەر وەكوو وێنە كێشە كۆنەكان وێنە بكێشین ئەو كات دەبین بە خۆمان و ئەو كات پادشا كە تەنانەت پشتی هەڵكردۆتە وەستا عوسمانیش لەباتی ئێمەدا كەسیتر پەیدا دەكات ، ئیدی كەس تەماشاشمان ناكات و تەنیا بەزەییان پێمان دێتەوە . بەسەردا چوونی قاوەخانەكەش دەبیٚ بە هۆی ورووژاندنی هەموو ئەمانە ، چونكە نیوەی ڕووداوەكە دەتلێتەوە بەسەر ئێمەی شێوەكاردا كە لەبەرامبەر مەلا ئەفەندیدا زماندرێژیمان كردووە . "

هەر چەندە باسی ئەوەم كردكە ئاژاوەی ناو خۆی ئێمە زیانمان پێدەگەیەنێت و خراپە هیچ سوودێكی نەبوو. نەیاندەویست گویٚ لەمن ڕابگرن ، پەشۆكاو بوون ، بڕوایان بەوە هەبوو كە ئەگەر تا بەیانی ڕاست یان ناڕاست یەكێك وەكوو تاوانبار دیاری بكەن، دەتوانن خۆیان ڕزگار بكەن و ئەشكەنجە ناكرێن و كاری وێنەكێشخانەكەش سالاّنێكیتر وەكوو جاران بەردەوام دەبێت .

سەرەڕای ئەوەش ئەو دووەكەیتر حەزیان لەو شتە نەكرد كە ڕەشە هەڕەشەی ئەنجامدانی دەكرد .

ئەی ئەگەر کەسیتر تاوانبار بێت و لە هیچ و خۆڕایی کوێرم بکەن و ئەمەش بگاتەوە گوێی پادشا ؟

نزیك بوونیڕەشە بە وەستا عوسمان و باسکردنە بێشەرمانەکانی لەسەر ئەو ، ئەمانی دەترساند .

خوێن بەر چاوی ڕەشەی گرتبوو ، ئەوانیش دەیانویست دووری بکەنەوە . ڕەشە لەوە ترسا کە ئێمە لە ناو خۆماندا ڕێکەوتبێتین و دەرزییەکەی لەدەست وەردەگیرێت . بکێش بکێشێك دروست بوو بۆ پاراستنی خۆم لەم بکێش بکێشە و دەرزییەکەی بەر چاوم تەنیا توانیم چەناکەم بەرز کەمەوە و سەرم ببەمە دواوە . دواتر هەموو شتێك ئەوەندە لە ناکاو دروست بوو کە تێنەگەیشتم : لە چاوی ڕاستمدا هەستم بە ئازارێکی کەم بەڵام بروسکە ئاسا کرد . دوایی هەموو شتێك وەکوو جارانی لێهات . بەڵام ترسێك لە دەروونمدا جێگای خۆی کرد بووەوە . چراکەیان دوور کردبووەوە بەڵام دیسان چاوم بەوە کەوت کە یەکێکیتر بە پێداگری و بە بڕیارەوە دەرزییەکەی کرد بە چاوەکەیترمدا . تۆزێك بەر لە ئێستا دەرزییەکەی لە دەستی ڕەشە وەرگرتبوو ، ورد بینتر و خێراتر بوو . کاتێك تێگەیشتم دەرزییەکە چووە بە چاومدا خۆمم نەجوڵاند و هەستم بە سووتانەکەی پێشوو کرد . تەزینەکەی تەوێڵم ، لەسەرمدا بڵاو بوو بووەوە وسەرم تەزی.

ئێستا تەماشای چاوەکانی من و نووکی دەرزییەکەیان دەکرد . کاتیَ زانییان چ شتێکی ترسێنەرم بەسەردا هاتووە بکێش بکێشەکەیان ڕاوەستا . گرانابیەکەی سەر باڵەکانم سووکتر بوون . وەکوو ئەوەی بلورێنم دەستم بە قیڕە قیڕ کرد . ئەمە لەبەر ئازار نەبووبەڵکوو لەبەر ترس لەو شتە ترسێنەرە بوو کە بەسەرمدا هاتبوو . نازانم چەندە قیڕە قیڕم کرد بوو ! سەرەتا وا

هەستمکردناڵە ناڵەکانی من نەتەنیا من بەڵکوو ئەوانیشی ئاسوودە کردووە . دەنگم ئێمەی نێزیکی یەك دەکردەوە.بەڵام کاتێك قیڕە و هاوارەکەم زیاتر بوو ، چاوم لێیان بوو حەپەسا بوون. هێشتا نەدەئێشا بەڵام چوونی دەرزی بە دوو چاومدا شتێك نەبوو کەبە ئاسانی فەرامۆشی بکەم. بەڵام هێشتا کوێر نەبوو بووم، زۆر شوکر هێشتا چاوم بەوە دەکەوت کە سەیریان دەکردم و سێبەرەکانیشیان لەسەر سەقفی تەکیەکەدا دەلەرزا. ئەمە هەم دڵخۆشی کردم هەم خستمیە ناو ترسێکی قووڵەوە . قیڕاندم و گوتم : " وازم لێبێنن ، بەرم دەن با زیاتر هەموو شتێك ببینم ، خۆ هیچ نابیٚ ، دەی بەرم دەن. "

ڕەشە گوتی : " یەکسەر باسیکە ، ئەو شەوە لەگەڵ زەریف ئەفەندیدا چۆن یەکتریتان بینییەوە ؟ ئەو کاتە بەرت دەدەین . "

-:" لە قاوەخانەوە بۆ ماڵ دەگەڕامەوە کە تووشی بووم ، زۆر پەرێشان و پەشۆکاو بوو ، سەرەتا بەزەییم پێدا هاتەوە . بەرمدەن دوایی باسیدەکەم ، بەر چاوم ڕەش دەبیٚ . "

ڕەشە بە پەشیمانییەوە گوتی : " یەکسەر ڕەش نابێت ، بڕوام پێبکە وەستا عوسمان بە چاوە کۆن بووەکانیەوە ئەو ئەسپە لمۆز بڕاوەی ناسییەوە . "

- " زەریف ئەفەندی بێچارە گوتی متمانەم بە تۆ هەیە و دەمەویٚ قسەت لەگەڵ بکەم . " بەڵام ئێستا بەزەییم بەودا نەدەهاتەوە بەڵکوو دڵم بۆ خۆم دەسووتا .

- رەشە گوتی:" ئەگەر بەرلەوەی خوێن چاوەکانت پڕکاتەوە باسیبکەی بەیانی دەتوانی بۆ جارێکتر تێر تێر تەماشای دونیا بکەی، سەیر کە باران ڕاوەستاوە"

- :"پێمگوت بابگەڕێینەوە و بچین بۆ قاوەخانەکە ، بەڵام یەکسەر تێگەیشتم کە خۆشی لەوێ نایە و تەنانەت لێشی دەترسێ . لەدوای دەورانی شاگردیمان و بیست و پێنج ساڵ پێکەوە بوون ئەوە جاری یەکەم بوو تێگەیشتم کە زەریف ئەفەندی لەئێمە دەترسێ و لێمان دوور کەوتۆتەوە . لەم هەشت نۆ ساڵەی دواییدا لە دوای ئەوەی ژنی هێنابوو ، لە وێنەکێشخانەکەدا دەمبینی بەڵام نەمدەزانی چی دەکات ... بەمنی گوت کە دوایین وێنەکەی بینیوە و گوناحێکی زۆری تێدا بووە . شتێك بووە کە هیچ کاممان نەماندەتوانی لەژێر باری دەرکەوین . دەیگوت لەم ڕووەشەوە لە ئاگری دۆزەخدا دەسوتین . پەشۆکاو بوو ،زۆر دەترسا. لەناو هەستی ڕووخانی ورەی کەسێکدا بوو کە بە نەزانییەوە تووشی گوناح بووبێ . "

- " ئەو گوناحە گەورە چی بوو ؟ "

- " کاتێ ئەمەم لەو پرسی وەکوو ئەوەی بڵێ مەگەر نازانی؟ بەسەر سووڕماوەییەکەوە چاوەکانی کردەوە کە هاوڕێی کاتی شاگردیمان بوون و وەکوو خودی ئێمە پیر بووبوون . گوتی لە دوایین وێنەکەی زاوا خوالێخۆشبووەکەتدا ، زۆر بێپەروایانە شێوازی ( وێنەکردن لە ڕوویەکەوە ) ( پەرەسپەکتیو ) بەکار براوە . لەم وێنەیەدا وەکوو چۆن فەرەنسەییەکان کردوویانە شتەکان بەپێی گرنگییەکانی عەقڵی خودا دروستنەکراوە بەڵکوو ئەوەی بەر چاو و دیار بوو کێشراوە . ئەمەش گوناحێکی گەورە بووە . دووهەمین گوناحیش ئەوە بوو کە پادشاکەمان کە خەڵیفەی ئیسلامە بە

گەورەیی سەگێك ڕەسمكراوە . سێهەمین تاوانیش ئەوە بوو كە هەر بەو گەورەییەش شەیتان كێشراوە و وەكوو دۆستێكی گیانی بە گیانی پادشا دیار بووە . بەڵام گوناحی هەرە گەورە ئەوە بوو كە چەمك و نەریتی فەرەنسییەكان بەكار براوە و وێنەی ڕوخساری پادشا بە گەورەیی و بە وردە كارییەكانییەوە كێشراوە .ئەمەش فیعلی ئەوانەیە كە پەرەستشی بوت دەكەن ... وەكوو وێنە كەسییەكانی ( پۆرترە ) ئەو خاچپەرەستانەیە كە لە بوتپەرەستی ڕزگاریان نابێ و لەسەر دیواری كلیسا دروستیان دەكەن و كڕنۆشیان بۆ دەبەن . زەریف ئەفەندی باش ئاگای لەو قسەیە بوو وا لە زاواكەتەوە فێری بوو بوو و بەهەقەوە بڕوای بەوە كرد بوو كە كێشانی وێنەی كەسی گوناحێكی گەورەیە و بەوەش وێنەی ئیسلامی لە ناو دەچێ . لەكاتی ڕێكردن لە كۆڵانەكاندا دەیگوت لە قاوەخانەكە قسە بە حەزرەتی مەلای ئەفەندیمان دەڵێن . جار و بار ڕادەوەستا و وەكوو ئەوەی داوای یارمەتی لەمن بكات پرسیاری دەكرد و دەیگوت :ئەمانە هەمووی ڕاستن ، چارەیەكی نییە ، لە دۆزەخدا دەسووتێین یان نا ؟ .

لەنێو قەیرانی پەشیمانبوونەوەدا خۆی دەكوتا ، بەڵام لە ناكاو هەستم بەوە كرد كە هیچ بڕوای پێناكەم . ساختەچییەك بوو كە بە فێڵەوە لە سینگی خۆی دەدا و دەیكوتا . "

- " چۆن لەمە تێگەیشتی ؟ "

- " هەموومان لە منداڵیمانەوە زەریف ئەفەندی دەناسین . زۆر ڕێك و پێك و بێدەنگ بوو بەڵام كەسێكی بێتام و بێڕەنگیش بوو . وەكوو جوانكارییەكانیخۆی بوو ." وام ئەزانی كە ئەوەی لەبەرامبەردایە لەو گەوجتر و مسافرتر و بڕوادارتر و بێ توێترە .

- ڕەشە گوتی :" لە گەڵ ئەرزڕوومیەکاندا هەڵسوکەوتی کردووە "

– :" هیچ موسڵمانێك لەبەر ئەنجامدانی تاوانێك بە نەزانینەوە ئەوەندە سەرزەنشتی خۆی ناکات . موسڵمانێکی باش دەزانێت کە خودا ژیربیرە و عەداڵەتی هەیە و مەبەستی عەبدەکەشی دەخاتە نێو حیسابەوە . تەنیا نەزانە مێشك بچووکەکان بەوە بڕوادەکەن کە مرۆڤ بەخواردنی گۆشتی بەراز بەنەزانینەوە دەچێتە دۆزەخ . موسڵمانێکی ڕاستەقینە ئەوەش دەزانێت کە ترسی دۆزەخ بۆ خودی ئەو نیە ، بەڵکوو سوودی بۆ ترساندنی کەسانی تر هەیە . زەریف ئەفەندیش دەیەویست بەمەوە من بترسێنێت . لەو کاتەدا ئەمەش تێگەیشتم کە زاواکەت وەها فێری کردبوو کەدەتوانیٚ ئەمەش ئەنجام بدات .

–برا وێنەکێشەکانم ! بەراستی پێم بڵێن ئێستا خوێن چاوەکانم دەگریٚ ؟ ڕەنگی گلێنەی چاوم نامێنیٚ ؟ " چراکانیان هێنایە بەر دەم و چاوم و وەکوو پزشکێك بە وردی و بەبەزەییەوە تەماشای چاویان کردم ، دەتگوت هیچ شتێك نەبووە .

ئەو شتەی وا بۆ دواجار لە دونیادا دەمبینی ، ئەم ئینسانانە بوون کە چاویان بڕیوەتە نێو چاوانم ؟ لە بەر ئەوەی کە دەمزانی تا کۆتایی ژیانم ئەم کاتانەم لە یاد ناچیٚ و پەشیمانیش بوونم دیسان ئومێدیکم هەبوو ، دەستم کرد بە باس کردن : "زاواکەت زەریف ئەفەندی لەوە ئاگادار کردبووەوە کەشتێکی قەدەغە کراوی کێشاوە . سەری وێنەکەی دادەپۆشی و گۆشەیەکی بۆ دەهێشتینەوە کە وێنەی تێدا بکێشین ، بە شاردنەوەی هەمووی ... هەوایەکی ڕازدارانەی دەدا بە وێنەکە و بۆنی گوناحی بڵاو دەکردەوە . یەکەم جار ئەوە بوو کە گومان و ترسی گوناحی لە دەروونی

ئێمــەدا هــەڵکرد ، ئــەو ئەرزڕوومیانــەی کــە لــە ژیــانی خۆیانــدا کتــێبی نەخشــداریان نــەبینیووە کــەی ئاگایــان لــەم شــتانە هــەبوو؟ وێنەکێشــێکی ویجدان پاك لە چی دەترسێ ؟ " ڕەشەش خۆی بە زانا دەزانی! گوتی : " ئیدی زۆر شت هەیە کە وێنەکێشێکی ویجدان پاك لێیان بترسێ . "

–" بەڵێ کەس قسەیەکی لە بەرامبەر نەخشکردندا نیە ، بەڵام کێشانی وێنـەی کەسـی بـە پیـێ دینەکـەمان حەرامـە . وێنـەی وەسـتا عەجەمـەکان و تەنانـەت هـی وەسـتا هەراتیـە گـەورەکانیش ، لـە دوایـدا وەکـوو ڕازێنـەری کەنارەکان دەبینرین و لـە بـەر ئـەوەی جوانی خـۆت و شـتە دەرئاساییەکانی خۆشنووسـەکان دەردەخـەنـە پێشـەوە کەسێك دەستیان لێنـادات . خـۆی لـە خۆیـدا چـەن کـەس نـەخش کراوەکانمـان دەبینـێ؟ بـەڵام کاتێـك لـە نـەریتی فەرەنسییەکان کەڵکمان وەرگرت ، ئەوسا کردەوەکانمان چ نـەخش بێت یان وەکـوو وردە نـەخش لـە خـۆی دەردەچێت ڕاسـتە و ڕاسـت دەبـێ بـە وێنـەی تایبــەت . ئەمــەش ئــەو شــتەیە کــە قورئــانی کــەریم قەدەغــەی کــردووە و پێغەمبەریشــمان هــیچ حــەزی لێنــەکردووە . پادشــاکەمانیش و زاواکەشــم ئەمەی باش دەزانی . هەر لەبەر ئەوەش زاواکەم کوژرا . "

– : " زاواکەت لەبەر ترسی خۆی کوژرا ، ئەویش وەکوو تۆ دەستی بەو ئیدەعایـە کـرد بـوو کـە نەخشـکراوەکانی هـیچ دژایەتییـەکیان لەگـەڵ دیـن و کتێبدا (قورئان ) نیە ... ئەمەش شتێکی دژی دین بوو کە ئەرزڕوومییـەکان بۆ دۆزینەوەی کۆن بە کۆن بەدوایدا دەگەڕان . زەریـف ئەفەنـدی و زاواکـەت زۆر پێکەوە دەگونجان . "

– : " تۆش هەر دووکیانت کوشت وانیـە ؟ " لـە ساتێکدا وامزانـی کـەلێم دەدات و لەهەمانکاتیشـدا یەکسـەر تێگەیشـتم کـە مێـردە تازەکـەی شـەکورە

جوانەکە هیچ گلەییەکی لە کوژرانی زاواکەی نییە . لێی نەدەدام ، بەڵام ئەگەر لێشی بدابەیەم ئیتر گوێم نەدەدا . بە کەللە ڕەقی و پێداگریەوە گوتم : " لە ڕاستیدا ئەوەی وا پادشاکەمان دەیەویست ئەوە بوو کە کتێبێك لە ژێر کاریگەری وێنەکێشە فەرەنسیەکاندا ئامادە بکرێت ، زاواکەشت دەیەویست کتێبێك ئامادە بکات کە بۆنی گوناحی لێوە بێت و شەڕ بە هەموو لایەك بفرۆشێت .ئەمەش تەنیا لە بەر خاتری ئەوەبوو کە خۆی پیێ فش بکاتەوە ، وەکوو کۆیلە لە بەرامبەر وێنەکانی وەستا فەرەنسیەکاندا کە گەشتیارەکانیش بینیویانە سەر سام بوو بوو ، هەمووومان بڕوامان بەو شتە پڕ و پوچانە کردبوو ـــ لەوانەیە باسی وێنە کراوە یەکلایەکان و وێنە کەسیەکانی بۆ تۆش کردبیێ ـــ کە بە ڕۆژان باسی دەکرد ، بە گویرەی من ئەو کتێبەی وا ئامادەمان کردوە ، هیچ لایەنێکی دژی دین و زیاندەری تێدا نیە ... ئەویش لە بەر ئەوەی ئەمەی دەزانی وەهای پیشان دا کە کتێبێکی مەترسیدار ئامادە دەکات ، ئەمەشی زۆر پیێ خۆش بوو ... .

ئامادە کردنی کتێبێکی مەترسیدار بە پییێ ڕەزامەندی تایبەتی پادشا ، بۆ زاواکەت بە قەدەر سەر سووڕ مان لە بەرامبەر وێنەکانی وەستا ڕۆژ ئاواییەکان گرنگ بوو، کێشانی وێنەیەك بۆ هەڵواسین گوناکارییە ، بەڵیێ ! بەڵام من لەو کتێبەدا کە ئامادەمان کردووە هەستم بە شتێکی دژی دین و زندیقایەتی و ڕەتکەرەوە نەکردو و تەنانەت کەم و کوڕییەکی بچکوولانەی قەدەغە کراویشم نەبینی . ئێوە هەستتان پێکردووە ؟ " چاوەکانم کەمێك هێزی خۆیان لەدەست دابوو بەڵام زۆر شوکر چاوم بەوە دەکەوت کە پرسیارەکەم ئەوانی خستۆتە ناوگومانەوە . بە خۆشییەوە گوتم : " بڕیارێك نادەن وانییە ؟ ئەگەر بەدزیشەوە بیر لەوە بکەنەوە کە لەو وێنانەدا

بە شێوەیەكی دیار و نادیار بیرۆكەی گوناح دانراوە و سێبەری بێدینی تێدایە، قەبووڵی ناكەن و هەرگیز ناوێرن باسی بكەن و نایلێن. چونكە ئەمە دەبێ بەهۆی ماڤ دان بەو ئەرزڕوومیانەی وا ئێوە تاوانبار دەكەن . لەلایەكیتریشەوە پاكانەی بۆ ناكەن و ناڵێن وەك شیر پاك و سپییە ، چونكە ئەمە لە خۆبایی كردن بە دروستكردنی شتێكی شاراوە و ڕازدار و قەدەغەكرا و دوورتان دەخاتەوە و بەمانای واز هێنانە لەخۆ گەورە كردنتان . ئەزانن من چۆن تێگەیشتم كە چۆن خۆمم گەورە كردووە و نازم فرۆشتووە ؟ بە هێنانی زەریف ئەفەندییە بێچارەكە بۆ ئەم تەكیەیە ! ئەوم بەدەم قسەكردن و ڕێكردنەوە لەو نیوەشەوەدا هێنا بوو بۆ ئێرە . لەراستیدا زانینی ئەو بەوەی كەمن پاشماوەی قەڵەندەرییە زەندیقەكانم و لەوەش خراپتر حەزی لێدەكەم و بە دوایدا دەچم، شتێك بوو كە من دەمەویست و حەزم لێدەكرد . وامدەزانی كاتێك كە بزانێ من دوایین ڕێبواری ڕێگای تەریقەتێكم كە یاری كردن بە كوڕانی بەبنەماوەردەگرت و بەنگكێشان و خوێڕیگەری لاپیرۆز بوو و ئێستا پەرش و بڵاو كراوە زیاتر ڕێزم لێدەگرێ و لێم دەترسێ و لەوانەیە لە ترساندا دەمیشی نەكاتەوە . بەڵام پێچەوانەی ئەمە ڕوویدا. ئەم هاوڕێ مێشك بچووكەمان وەكوو چۆن حەزی لەئێوە نەكرد بوو ، یەكسەر بڕیاری دروستبوون و لەجێدا بوونی ئەو تۆمەتی بێدینیانەیدا كە لە زاواكەتەوە فێریان بوو بوو ، بەمجۆرە ئەو هاوڕێ خۆشەویستەی كاتی شاگردیمانكە لەسەرەتادا دەیگوت : یارمەتیم بدە و قەناعەتم پێبكە كە ناچینە دۆزەخ بۆ ئەوەی كە ئەمشەو بە ئاسوودەیی بخەوم ، ئەمجارە وەكوو هەڕەشە كردن گوتی : كۆتایی ئەم كارە باش نابێت و دەستی بە قسەی لەم چەشنە كرد .

دەیگوت کە قسە و باس لەسەر ئەم دوایین وێنەیە و لەسەر لادانی لە فەرمووەکانی پادشا و نابەخشوودە بوونی ئەم شتە لەلایەن پادشاوە دەگاتەوە گوێی مەلا ئەفەندی . ئیدی قەناعەتپێکردنی لەسەر ئەوەی کە هەموو شتێك گوڵ و گوڵستانە و شتێکی خراپ لە ئارادا نیە ، ، بێ ئیمکان بوو بوو . تێگەیشتم کە قسە پڕ و پووچە کانی زاوا و دژایەتی کردنی دین و ئەوەی کە شەیتان بە جوانی و شیرینی نیشاندەدرێ و گومانەکانی خۆی گەورەتر دەکاتەوە و دەیانگەیەنێتەوە گوێی دۆستە مێشك بچووکەکانی . خۆتان دەزانن کە هەموو سەنعەتکاران و خاوەن پێشەکان چۆن لەبەر ئەوەی خۆمان گەیشتووینەتە ئەو جێگایەی کە پادشا سەرنجمان بداتێ ، بەخیلێمان پێدەبەنەوە . ئەگەر وابایە ئێستا هەموویان بە خۆشی و بەویستەوە دەیانگوت وێنەکێشان بێدینیدەکەن . لەوەش زیاتر لەبەر هاوکاری زەریف ئەفەندی و زاوا ئەم تۆمەتە پشتڕاست دەکرایەوە . لەبەر ئەوەی تۆمەت دەڵێم چوونکە بڕوام بەو شتانە نەبوو کە زەریف ئەفەندی دەربارەی دوایین وێنەکە دەیگوت . هەر لەو کاتەوە من نەمدەهێشت هیچ تۆزێك بنیشێتە سەر زاوا خوالێخۆشبووەکەت .

تەنانەت ئاوڕادانەوەی پادشا لە زاواکەت لەباتی وەستا عوسماندا ڕاستتر دەبینم و ئەگەر بەو ئەندازەیەش نەبێت کە ئەو دەیگوت بەڵام منیش بڕوام بە قسەکانی دەربارەی شێوەکارە فەرەنسییەکان و وێنەکانیان هەبوو . لەدڵەوە بڕوام بەوە هەبوو کە ئێمە دەتوانین بەبێ دانوستاندن لەگەڵ شەیتاندا لەملا و لەولاوە وەکوو وێنەکێشە فەرەنسییەکان ، لەگەڕانەکانی خۆماندا شتانی جوان وەربگرین و ئەمەش تووشی هیچ دەردە سەرییەکمان ناکات . ژیان ئاسانبوو ، زاواکەشت لەدوای وەستا عوسمان لەم ژیانە

تازەیەدا باوكێكی نویْ بوو بۆ من " . ڕەشە گوتی : " واز لەویْ بێنە جاریْ ، لەپێشدا باسی چۆنیەتی كوشتنی زەریف ئەفەندی بكە . "

- : " ئەو كارە ؟"زانیم كە وشەی كوشتنم بەكار نەهێناوە . " ئەو كارەم لەبەر ڕزگار كردنی خۆمان نەكرد ، بەڵكو لە بەر سەلامەتی هەموو وێنەكێشخانەكە كردم. زەریف ئەفەندی لەوە تێگەیشتبوو كە چەكێكی هەڕەشە كردنی كەووتوە دەست . لە خودای گەورە پاڕامەوە ئەوەشم پیشان بدات كە ئەم ناپیاوە چەندە هیچ و پوچە، خودا دۆعاكانی منی قبوولْ كرد و هەرچی و پەرچیەتی ئەو هیچ و پوچەی پێنشاندام . وتم : بەرتیلت دەدەمیْ و پارەم پیْ پێشنیار كرد . ئەم ئاڵتونانە هاتەوە یادم و بەو ئیلهامە كە خودا پێیدابووم درۆیەكم بۆ هەڵواسی . گوتم زێڕەكان لێرەنین بەڵكو لە جێگایەكی تردا شاردومەتەوە . هاتینە دەرەوە لە كۆلانە چۆڵەكانەوە و لەو گەڕەكە دوورانەوە بە بێئەوەی كە بزانین بۆ كویْ دەچین ڕێمان دەكرد، هیچ نەمدەزانی كە چی بكەم و زۆریش دەترسام لە كاتی ڕێكردنەكەماندا كاتێك دوو جار بە كۆلانێكدا دەڕۆیشتن ، زەریف ئەفەندی برامان كە هەموو ژیانی بە لەش گەورە كردن و دووبارە بونەوە تێپەڕ كردووە كەوتە گومانەوە . بەلام خوداش جێگایەكی چۆڵی سووتان و چاڵە ئاوێكی قووڵی بۆ دەرخستبووین . "

- زانیم كە ناتوانم لەمەوە بەدوای باس بكەم و لە دویدا بە لێبوردەییەوە وتم : "ئەگەر ئێوەش لە جێگای مندا بایەن ، بیرتان لە سەلامەتی برا وێنەكێشەكانی ترتان دەكردوە و هەر ئەوشتەتان دەكرد . "

كاتیْ كە بیستم مافیان پێدام ،لە دڵەوە گریانم بۆ هات . خەریك بوو بڵێم لە بەر بیرەحمی خۆم دەگریم كەئەوە نەبوو،ویستم بڵێم گوێم لە دووبارە

بوونەوەی دەنگی لێدانی جەستەی لە بنی چاڵە ئاوەکە یە کە ئەویش نەبوو ، خەریك بوو بڵێم لە بەر بیرهێنانەوەی ژیانە خۆشەکەی بەر لە پیاو کوشتەکەم بوو ، کە ئەویش نەبوو .

کابرایەکی هەژاری کوێر لە کاتی منداڵی بە گەڕەکەکەماندا تێپەڕ دەبوو ئەوە هاتبووە پێش چاوم ! تاسێکی پیسی مەسینەی ئاو خواردنەوەی لە نێو جلە پیسەکانیدا دەردەهێنا و لەلای کانی گەڕەکدا لە دورەوە تەماشامانی دەرکردو دەیگوت : ڕوڵە ! کێتان جامی مامە نابیناکە پڕ ئاو دەکات ؟ کاتێ کەس نەدەچوو وەهای دەگوت : " سەواوە ڕۆڵە ، سەواو ! " ڕەنگی گلێنەکانی چاوی کاڵ ببوونەوە و نەمابوون و لە گەڵ پیسایەکەدا بوو بوو بەیەك . بە پەشۆکانی لێك چوونم لە گەڵ ئەو مامە نابینایەدا بە پلە و بە بێئەوەی تامی لێوەر بگرم باسی ئەوەم بۆ کردن کە چۆن زاوا ئەفەندیشم کووشتوە .زۆر درۆ و زۆر ڕاستیشم نەگوت، کاتێ لە هەستیان بە خەستاییەکەی هەردوویان کرد زانیان کە بە مەبەستی کوشتن نەڕۆیشتم بۆ ماڵی زاوا و منیش هەستم بەمە کرد. کاتێ کە گوتم بە نیەتەوە ئەوم نەکووشتوە ،زانیان کە من پاکانەی خۆم دەکەم و کەسێکیش ئەگەر نیەتی خراپ نەبێ ناچێتە دۆزەخ .

وەکوو ئەوەی بیرم کردبێتەوە وتم : " لە دوای ئەوەی زەریف ئەفەندیە بێچارەکەم دا بە دەستی فریشتەکانی خوداوە ، لە دوا کاتەکاندا قسەکانی ئەو ڕەحمەتیە بوو بوون بە خۆرە و کەوتبوونە گیانم . دەست بە خۆین دا چوونم لە بەر ئەو وێنەیە وێنەکەی لە پێش چاوم گەورە کردبوو . بۆ ئەوەی کە ئەم وێنەیە پیشانبدات چووبووم بۆ ماڵی ئەو زاویەت کە ئیدی ناتوانێ کەس لە ئێمە بانگ بکات بۆ ماڵی خۆی . وێنەکەی پیشان نەدام و وەکو

ئەوەی کە هیچ شتێك نەبێت و هەموو شت گوڵ و گوڵستان بێت لە گەڵ مندا هەڵسوکەوتی کرد . وێنەیەك نەبو کەمن لە پێناویدا زەلامم کووشتبێ و هیچ شتێکی تریش نەبوو ! تەنیا لە بەر ئەوەی کە بەوئەندازەیە بچووکم نەکاتەوە و کەم بایەخم نەزانێت پێمگوت کە من زەریف ئەفەندیم کوشتوە . گرنگی پێدام ، بەڵام دیسان بچووکی کردمەوە . باوك نابێ کوڕەکەی بچووك بکاتەوە . وەستای گەورە ، وەستا عوسمان زۆر لێمان تووڕە دەبوو ، لێیدەداین ، بەڵام هیچ کات بچووکی نەدەکردینەوە . براکانم !بەراستی هەڵەمان کرد کە خەیانەتمان پێکرد . "

لە کاتی گیانداندا بزەیەکم بۆ براکانم لێدا کە وەکوو ئەوەی گوێم بۆ ڕابگرن چاویان بڕیبوە چاوەکانم . وەکوو ئەوەی برایەکی مردوو هەستیپێدەکات ، منیش چاوم بەوان دەکەوت کە هەرچی دەچوو لێڵتر دەبوون .

– " لە بەر دوو شت زاواکەتم کوشت : یەك لە بەر ئەوەی وەستای عوسمانی گەورەی ناچار کردبوو کە وەکوو مەیمون لاسایی سپاستیانی ڕۆژئاوای بکات . دووش لە بەر ئەوەی کە لاوازی خۆمم پێنیشان دابوو و گوتبووم شێوازێکم هەیە یان نا ؟ "

- " چی گوت ؟ "

- " هەبووە بەڵام ئەمە بۆ ئەو حەرەکەتێك نەبوو ، بەڵکو پەسندانێك بوو ، ئەوەم بە بیر دێ کە بە شەرمەوە وەهام بیر کردوەتەوە کە ئایا ئەم پەسەندانە بۆ منیشە ؟ هەم شێوازم بە جۆرێکی بێ شەرەف و ناڕەسەنایەتی لە قەڵەم دەدا و هەم لە ناوەوە وەکوو خورە دەیخواردمەوە . دەمەوێ شێوازێکم هەبێ، بەڵام شەیتان کەوتووەتە ژێر پێستم ، مەراقیش دەکەم . "

- ڕەشە بە خۆ گەورە زانینەوە وتـی : " هـەر کـەس بـە نهێنیـەوە دەیـەوێ شـێوازێکی تایبـەتی هـەبیت. تەنانـەت وەکـوو چـۆن پادشـاکەمان دەیـەوێت هەرکـەس دەیـەوێت وێنەیـەکی کەسیشـی ( پـۆرترە ) هـەبێت ." -: " ئەمـە نەخۆشییەکی بێ دەرمانـە ؟ هەرچـەندە کـە زیـاتر بـڵاو بێتـەوە هـیچ یـەك لـە ئێمە لە بەرامبەر نەریتی وەستا ڕۆژ ئاواییەکاندا ڕاناوەستێ . "

بەڵام کەس گوێی لە من ڕانەدەگرت " ڕەشە ، بەسەر هاتی ئەو بەگەنائومێدە تورکمانەی دەگێڕایەوە کە لەبەر ئەوەی زوو عەشقەکەی بە کچی پادشا ڕاگەیاندووە ، دوانزە ساڵ بە ناچاری بۆچین دوور دەخرێتەوە . لەبەر ئەوەی وێنەیەکی خۆشەویستەکەی بەلاوە نەبووە ، لە نێو کچە جوانە چینییەکاندا ، وێنەی ڕوخساری خۆشەویستەکەی فەرامۆش دەکات کەوا دوانزە ساڵ خەیاڵی پێوە بینیبوو ، ئازاری عەشق دەکوڕدرێتەوە بە ناڕەحەتیەکی قووڵ کە خودا خۆی دەینێرێت . بەڵام هەمووومان دەمانزانی کە ئەمە بەسەر هاتەکەی خۆی بوو کە دەیگێڕایەوە .

گوتم : " لەسایەی سەری زاواکەتەوە هەمووومان فێری ئەم پۆرترە ( وێنەی کەسی )یە بووین . ئەگەر خودا بییەوێت ، ڕۆژێك فێری ئەوە دەبین کە بێترس ژیانی خۆمان وەکوو خۆی بگێڕینەوە . "

ڕەشە گوتی : " هەموو بەسەر هاتێك هیِ‌هەر کەسێکە تەنیا هی مرۆڤ نییە . " شیعرەکەی هاتیفی هەراتیم تەواو کرد و گوتم : " هەموو نەخشێك نەخشی خودایە " .

" بەڵام هەر چەندە زیاتر نەریتی ڕۆژ ئاواییەکان بڵاو بێتەوە ، خەڵکیش گێڕانەوەی داستانی کەسانیترە وەك هی خۆیان بە ماریفەت دەزانن " .

- " شەیتانیش ئەم شتەی دەوێ . "

- به هەموو هێزێکمەوە قیڕاندم و گوتم : " بەسە ئیدی ، بەرم دەن . بابۆ دواپین جار سەیری دونیا بکەم . "

که زانیم زاوریان تۆقاوه زیاتر بڕوام به خۆم کرد . له پێشدا ڕەشه خۆی کۆ کردەوە وگوتی " دواین وێنەکە دەردەخەی ؟ " وەها تەماشای ڕەشەم کرد کە تێگەیشت دەری دەخەم ،بەری دام . دڵم خێراتر لێیدەدا . ئەمە ناسنامەی منە کە ویستوومە بیشارمەوە وئێوە لە زووەوە پێتان زانیوە ، بەڵام دیسانیش لە بەرامبەر ئەوەی کە من وەکوو وەستا کۆنە هەراتیەکان هەڵس و کەوت بکەم ، سەرتان سووڕ نەمینیٚ " ئەمانە لە بەر ئەوەی کە نەزانرێت کێن خۆیان نەدەشاردەوە ، بەڵکو لە بەر ئەوە وایان دەکرد کە لە بەرامبەر وەستاکان و یاساکاندا ڕێزیان هەبووە . بە چراکەی دەستمەوە ڕێگام بۆ سێبەرە کەمڕەنگەکەم کردەوە و بە پەشۆکانەوە ژوورە تاریکەکانی تەکییەکە گەڕام . ئایا دەکەوتنی پەردەی تاریکییەکە لە بەر چاومدا دەستی پێکردبوو ، یان وەکوو ژوورەکان و هەیوانەکان زۆر تاریک بوون ؟ بەر لەوەی کوێر ببم ، چەند کات و ڕۆژ و حەفتەم هەیە ؟ من و سێبەرم ڕاوەستاین و لە نێو تارمایەکانی موتبەخەکەدا و لە گۆشەیەکی پاکی دۆڵابە تۆزینەکەدا لاپەڕەکانم وەرگرت و بە پەلە گەڕاینەوە . ڕەشە بۆ تەدبیر ، بە دوامدا هاتبوو ، بەڵام خەنجەری هەڵنەگرتبوو . ئایا دەمویست بەر لەوەی کوێر ببم ، خەنجەرەکە هەڵبکرم و چاوی کوێربکەم ؟ بە شانازییەوە گوتم : " زۆر خۆشنوودم لەوەی کە بەر لە کوێربوون جارێکی تر ئەمەم بینی ، دەمەویٚ کە ئێوەش بیبینن ، سەیری ئەمە بکەن" بەم جۆرەش لە بەر تیشکی چراکەدا ئەو وێنەیەم پێنیشان دان کە وا لەدوای کوشتنی زاوا لە ماڵەکەی هەڵمگرتبوو. بەترسەوە تەماشای ڕەسمەکەیان دەکرد ، کە

گەڕامەوە و لە گەڵ ئەواندا تەماشای وێنەکەمکرد ، تۆزێك دەلەرزام .

نازانم لە بەر ئەوە بوو کە دەرزیەکە چووبوو بە چاومدا یان لە بەر ئەوە بوو کە وێنەکە ڕاکێشراوبوو ؟ جەستەم گەرم ببوو . زاوا بە شێوەیەکی تازە کارانەش بێ بەڵام بە پیێ شێوازی تازەی کەڵەکە کردن و داڕشتن وێنەکانی سەگ و ئەسپ و درەخت و شەیتان و ژن کە ئێمە کێشابوومان بە گەورەیی و بچووکی خۆیانەوە زۆر جوان جێگیر کردبوو ، بە شێوەیەك کە کاتێك جوانکاریەکانی زەریف ئەفەندیشی پێ زیاد بوو بوو وەها دیار بوو کە تەماشای وێنەیێك ناکەی بەڵکو تەماشای هەموو دونیا دەکەی . لە ناوەندی ئەو عالەمەدا لە جێگایەکدا کە دەبوو ڕەسمی پادشاکەمانی لێبێ . وێنەی خۆمی لێبوو ، بە شانازیەوە تەماشایەکم کرد. لە بەر ئەوەی سەرەڕای هەموو خەیك بوون و بە تەماشا کردنی ئاوینەوە و لە ڕوو کێشانەوە و پاك کردنەوە نەمتوانیبوو بە باشی وەکوو خۆم دەریبێنم ، تۆزێك بێزار بووم . لە بەر ئەوەی کە وێنەکەم لە ناوەندی دونیادا کێشراوە تووشی حەپەسان نەدەبووم بەڵام لە بەر هۆیەکی شەیتانی کە ناتوانم باسی بکەم ڕوخسارم لەوەی کەهەیە زیاتر تێکەڵ پێکەڵتر و ڕازداتر دەرکەوتبوو ، هەر لە بەر ئەوەش تووشی پەشۆکانێك ببوم کە بۆم زەوت نەدەکرا . دەمەویست برا وێنەکێشەکانم هەست بەم پەشۆکانە بکەن و لەگەڵمدا هاو بەش بن . هەم وەکوو پادشایەك لە ناوەندی هەموو شتێکدا بووم ، لە لایەکی تریشەوە من خۆم بۆ خۆم بووم . ئەمەش هەم شانازی پێدەدام و هەم شەرمەزاری . لە بەر ئەوەی کە هاوسەنگی نێوان ئەم دوو هەستە ئاسوودەی دەکردم ، دەمتوانی لەو وەزعە تازەیەی خۆم چێژێکی تازە وەربگرم . بەڵام بۆ ئەوەی کە ئەم چێژ وەرگرتنەم بە تەواوەتی بێ ویست بوو کە بە پیێ هونەری ڕۆژ

ئاواییەکان چرچ و لۆچەکانی ڕوومەت و جلەکانم وسمێڵ و زیپەکەو دمەڵ و ڕیشەکانم و شێوەی دروونی جلەکانم هەمووی بیٚ کەموکوڕی بکێشرێنەوە . لە ڕوخساری دۆستە کۆنەکانمدا جۆرێکی ترس و سەر سام بوون و هەستە واز لێنەهێنراوەکەی بەخیلٚیم بینی  کە وەکوو خورە هەموومان دەخواتەوە. لەگەڵ ئەو تووڕەییەیبێز هاتنەیان بەرامبەر بە کەسێکی وەکوو  من کە لە نێو تاواندا خنکاوە ، تووشی هەستی خۆزگە خواستنێکیش دەبوون بۆ ئەوەی وەکوو من بن .

گوتم : " لێرەدا کاتێك شەوان لە بەر ڕۆشنای چرادا تەماشای ئەم وێنەیەم دەکرد بۆ یەکەم جار هەستم بەوە  دەکرد کە خودا منی بە جیٚ هێشتوە و تەنیا شەیتان دەتوانیٚ لە بەرامبەر مندا دۆستایەتی بنوێنێت  . ئەگەربە ڕاستی لە ناوندی دونیادا بایەم ـ کاتێك تەماشای وێنەکە دەکەم زۆرتر ئەمەم دەۆیٚ ـ سەرەڕای هەبوونی هەموو ئەو شتانەی وا حەزیان لێدەکەم ، تەنانەت هەبوونی ژنێکی وەکوو شەکورە و دۆستە عەودالٚەکانیشم و ڕەنگە سووره جوانە زالٚەکەش دیسان هەستم بە تەنیایی دەکرد . لەوەی کە کەساییەتێکم هەبێت و تایبەتمەندی خۆمم هەبێت و کەسی تر کڕنۆشم بۆ بەرن ناترسم بە پێچەوانەوە  تەنانەت شتی واشم دەویٚ  . لەق لەق   وەکوو کەسێگ کە تازە لە نوێژی هەینی گەڕابێتەوە گوتی: "کەواتە پەشیمان نیت ؟ "

- " نەك لە بەر ئەوەی دوو کەسم کوشتوە ، بەڵکو لە بەر ئەوەی ڕەسمێکی وەهام دروستکراوە خۆم وکوو شەیتان هەست دەکەم . وەها بیر دەکەمەوە کە ئەو دووانەم لە بەر کێشانی ئەم وێنەیە کووشتوە . بەلاٚم تەنیای وەزعەکەشم دەمترسێنیٚ . لاسایی کردنەوەی شێوەکارە

فەرەنسییەکان بەبێ فێربوونی هونەرەکەیان دەبێت بە هۆی کوێلە کردنی وێنەکێشەکە . دەمەوێ لەم وەزعە نەجاتم بێ . لە ڕاستیدا خۆی ئێوەش تێگەیشتوون کە لە بەر وەك خۆ مانەوەی وێنەکێشخانەکە هەر دووکیانم کوشت ، هەڵبەت خوداش ئاگای لێیەوە و لەمە تێگەیشتووە."

- پەپولە گیان وتی : " بەڵام ئەمە تووشی دەردیسەریمان دەکات . "

- ڕەشەی گەوج هێشتا تەماشای وێنەکەی دەکرد ، لە هەلێکدا مەچەکیم گرت. بە هەموو هێزێکمەوە نینۆکەکانم کرد بە ناو گۆشتەکەیداو دەستیم با دا . نەمتوانی خەنجەرەکەی لە دەست بگرم ، کەوتە زەوی . لە زەوی وەرم گرت وتم : " سەرەڕای هەموو شتێك ئیدی ناتوانن بە ئەشکەنجەدانی من لە ئازارەکانی خۆتان ڕزگارتان ببێ " . نوکە تیژەکەی خەنجەرەکەم وەکوو ئەوەی بمەوێ بیکەم بە چاویدا نزیکی چاوی کردەوە .

–" دەرزیەکەم پێبدە " بە دەستەکەی تری دەری هێناو پێیدام ، خستمە بەینی پشتوێنەکەمەوە ، نیگاکانم بڕیە نێو ئەو چاوانەی وا وەکوو بەرخ سەیریان دەکردم . وتم : " زۆر بەزەییم بەو شەکورە جوانەدا دێتەوە کە لە دوایدا هیچ چارەیەکی زیاتر لە مێرد کردن بە تۆ نەمایەوە . ئەگەر لە بەر خاتری ڕزگار کردنی ئێوە لە بەلاّ زەریف ئەفەندیم نەکوشتبایە ، مێردی بە من دەکرد و خۆشبەخت دەبووم . لە هەموو کەسێك باشتر من لە بەسەر هاتەکانی وەستا فەرەنسەییەکان تێگەشتوم کەوا باوکی دەیگێڕایەوە. لە بەر ئەوەش باش گوێ بدەنە ئەم دواین قسانەیوا دەیان کەم : لێرەدا جێگا بۆ ژیانی بە شەرەفانەی ئێمەی وەستای شێوەکاری نەماوەتەوە لەمە تێگەشتووم . ئەگەر وەکوو داخوازی پادشا و زاوا خوالێخۆشبووەکەت لاسایی وەستا ڕۆژئاواییەکان بکەینەوە ئەگەر کەسانی وەکوو زەریف

ئەفەنـدی و ئەرزڕوومیـەکان نـەمان گـرن ، ترسـە بـە حەقەکـەی دەروونمـان دەمـان گـریْ و نـاتوانین هـەتا دوایـی بـەردەوام بـین . ئەگـەر بـە گـۆێرەی شـەیتانیش بکـەین و تاکۆتـایی بچین و پشت لـە ڕابـردوی خۆمـان بکـەین و بمانـەویْ کەسـایەتیەك بـە پێـی شـێوازی فەرەنسییەکان پەیـدا بکـەین ئـەوا وەکوو چۆن هونـەر و زانـایی مـن بەشـی ئـەوەی نـەکرد کـە ڕەسمەکـەی خـۆم باش بکێشم ، ناتوانین لەمەدا سەر بکەوین . لە سەرتای بوونی ئەو وێنەیەدا وا کێشاومە و لـە مـن نەچووە تێدەگـەم  هونـەری ڕۆژ ئاواییـەکان شـتێکە کـە دەبیْ بـە سـەدان سـالْ فێـری بـبین ــ ( خـۆی لـە خۆیـدا هـەمووومان ئەمـەمان دەازنـی بـەلاّم گرنگـی مـان پێنـەدەدا ) ــ . ئەگـەر کتێبەکـەی زاوا ئەفەنـدی تەواو ببایە و بماننارديە بۆ وەستا وەنیزییـەکان پێمـان پێدەکـەنین و باسـی ئەمەش دەربازی لای دۆچی (پادشا) وەنیز دەبوو و دەیانگوت لـە عوسمـانی بوونی خۆیان دەردەچن و ئیدی لێمـان نەدەترسـان . چـەندە بـاش دەبـوو کـە لـەرێگای وەسـتا کۆنەکانـەوە بچووبایەین ! بـەلاّم حـەزرەتی پاشـاکەشمان و ڕەشە ئەفەندی خەفەتباریش کە لە بەر ئـەوەی پـۆرترە ( وێنـەیـەکی کەسـی ) یەکی شەکورەی بە لاوە نیە و کەسی تریش ئەمەیان نـاویْ . کـە واتـە لێـرەدا دانیشن و بە سەدان سالْ لاسایی وێنەکێشـە ڕۆژئاواییـەکان بکەنـەوە ! و بە گەورەیی و ناسکۆڵەییەوە ئیمزاکـەتان بخەنـە پالْ لاسایی کردنـەوەکانتان . وەسـتا کۆنـە هەراتییـەکان لـە کاتێکـدا کـە وەکـوو ئـەوەی خـودا دەیبـینیْ خەریکی وێنەکێشان دەبوون لە بەر شاردنەوەی کەسایەتی خۆیـان ئیمزایـان لێنــەدەدان . ئێــوەش لــە بــەر ئــەوەی  کــە ئــەوە بشــارنەوە کــە هــیچ کەسایەتییەکتان نیە ئیمزا دەخەنە پالْ وێنەکان . بەلاّم یەك ڕێگا چارە هەیە ، لەوانەیـە لـە دەرگـای ئێوەشـیان دابـیْ و ئێـوە لـە منـی بشـارنەوە ، ئەکبـەر

خــانی پادشــای هێنــد ، زێــڕ و خۆشەویســتی بــڵاو دەكاتــەوە وهــەموو وێنەكێشە هونەرمەندەكانی هەر چوار لای دونیای ئیسلام لە دەور و بەری خۆیدا كۆ دەكاتەوە . دیار بوو، ئیتر لەمە و بەدوا لە ئەستەنبووڵدا هیچ ناكەین ، بەڵكو لە وێنەكێشخانەكەی ئاگرادا ئەو كتێبە ئامادە دەكەین كە وا بۆ هەزارەمین ساڵی ئیسلام كۆ دەكرێتەوە" لەق لەق پرسیاری كرد و گوتی:"بۆ ئەوەی كە بتوانین وەكوو تۆ فیس بكەین پێویستە لە پێشدا پیاو بكوژین یان نا؟"

- بە بێ ئەوەی گرنگی پێبدەم گوتم : " لێهاتوو بوین و هونەرمەند بوون بەسە . " لە دوورەوە كەڵە شێریكی لە خۆ بایی دوو جار قووڵاندبووی . توورەكەو زێڕەكانم كۆ كردەوە و دەفتەری نمونەكان و وێنەكانم لە بەر گەبەندەكەدا جێكردەوە . ئەوەم بە مێشكادا دەرباز دەبوو كە هەموویان بەو خەنجەرە بكوژم وا خستبوومە سەر قوڕگی ڕەشە ، بەڵام هێشتا هاوڕێكانی كاتی شاگردی و تەنانەت ئەو لەق لەقەشم خۆش دەویست كە دەرزی كردبوو بە چاومدا . پەپوولەی خۆشەویست هەستابووە سەر پێ ، قیڕەیەكم كرد بە سەریدا و دامنیشاند . كاتی ئەمە متمانەی بە سەلامەت دەركەوتنی لە تەكیەكە پێدام پەلەم كرد ، لە دەرگاكەوە دەرەدەكەوتم و بە بێ ئارامییەوە ئەو قسەشان و شەوكەت دارەم هێنایە سەر زمان : "دەركەوتنی من لە ئەستەنبووڵ لە دەركەوتنی ( ابن شاكر ) لە بەغدادەوە بۆ وڵاتی داگیر كەرە مەغولییەكان دەچێ . "

- لەق لەقی بەخیلْ گوتی : " كە واتە پێویستە لە باتی ڕۆژ هەڵات بەرەو ڕۆژ ئاوا بچیت . "

- بـه عـەرەبی وه وەكـوو زاوای خوالێخشـبوو وتم : " ڕۆژهـەڵات و ڕۆژ ئاواش هی خودایه ."

– ڕەشـه گـوتی: "بـەڵام ڕۆژ هـەڵات لـه ڕۆژ هەڵاتـەوه و ڕۆژ ئـاواش لـه ڕۆژ ئاوایه."

- پەپوولـه گوتی : " پێویسـته وێنـەكێش لـه خـۆ بایی نـەبێ و لـه باتی ئەوەی ئازاری خۆی به ڕۆژ ئاوا و ڕۆژ هـەڵات دەربكـات تـەنیا وەكوو ئەوەی له دڵییەوه دێت وێنه بكێشێت . "

- به پەوپولەی خۆشەویستم گوت ئـەم قسـەیەت ئەونـده ڕاسـته كه لـه دڵـەوه دەمـەوێ ماچـت بكـەم . " یـەك دوو هـەنگاو بـەرەو ئـەو ڕۆیشـتم و نەڕۆیشتم كه ڕەشـه به فێڵبازییـەوه خـۆی هاوێشـته سـەرم . به دەستێكەوه توورەكـەی ئـاڵتوون و جلـەكانم گرتبـوو لـه ژێـر بالیشـمدا بـەرگ بەنـدەكان وێنـەكانم پـێ بـوو . كـاتێ ئەوانـەم دەپاراسـت خـۆشمم لـه بـیر نەدەچـوو . دەسته خەنجەر به دەستەكەم كەوته دەستی ئـەو ، بـەڵام لـه بێشانسـیدا پیـێ له مێزەكه هەڵكەوتوو و هاو سەنگیەكەی له دەست دەدا ، هەر بۆیـه لـه باتی گرتنی باڵم به باڵمدا شۆڕ بووەوه . لـه لایەكـەوه بـه هـەموو توانایـەكم شـەقم تـێ هەڵـدەدا و پەنجـەكانیم دەگەسـت ، لـه لایـەكی تریشـەوه بـۆ ئـەوەی لـێم ببێتـەوه ڕامدەوەشاند . لـه پەلـه قاژەی ڕزگـار كردنـی گیانـدا لوراندی . ئـەم جـاره زەخـتم خسـته سـەر هـەر ئـەو دەسـتەوه و ئـازارم پێگـەیانـد و بـەو دووەكـەی تریشـم گـوت : " لـه جێگـای خۆتانـدا دانیشـن ! " دانیشـتن . خەنجەرەكەشم وەكوو ئەوەی له ئەفسانەكاندا كەیكاوس كردوویـەتی خسـته كونی لوتی ڕەشه ، كاتێ خوێنی لێهات چاوه دەست بـەداوێن بووەكانیشـی فرمێسكیان هەڵرشت . وتم : " ئێستا بڵێ بزانم كوێر دەبم یان نا ؟ "

- گوتی : " بە گوێرەی ئەفسانە خوێن پڕی هەندێك چاو دەبێ و پڕی هەندێکیتریش نابێت . ئەگەرخودا لە نەخشەکەت ڕازی بێت بۆ ئەوەی بتخاتە پاڵ خۆی ، ئەو تاریکاییە دەرئاساییە دەخاتە پێش چاوت ، ئەو کاتەش چاوت بەم دونیا هیچ و پۆچە ناکەوێت بەڵکوو ئەو دیمەنە نائاساییانە دەبینی کەوا ئەو دەیانبینێ . نا، ئەگەر لە نەخشەکانت ڕازی نەبێت ، دەهێڵێت کە وەکوو ئێستا بتوانی ببینی " .

– : " من وێنەی ئەساسی لە وڵاتی هێنددا دەکێشم ، هێشتا ئەو ڕەسمەم نەکێشاوە کە خودا لەسەر ئەو دادگاییم بکات ."

- : " وەها خەیاڵ نەکەی کە دەتوانی لە شێوازی ڕۆژئاواییەکان هەڕا بکەی . دەزانی کە ئەکبەر خان هەموو وێنەکێشانی بۆ دانانی ئیمزا هان داوە ؟ پاپا پورتوغالییەکان لە زووەوە وێنەی ڕۆژ ئاوایی و شێوازەکانیان بردوّتە ئەوێ . ئەوان ئیدی لە هەموو جێگایەکن" – : " کەسێك بیەوێت پاك و سالم بمێنێتەوە هەمیشە جێگایەکی بۆ هەڕا کردن و کارێکی بۆ کردن هەیە . "

- لەق لەق گوتی : " بەڵێ ، کوێر بوون و هەڕا کردن بۆ ئەو وڵاتانەی کە هەبوونیان نیە . "

- ڕەشە گوتی : " بۆچی دەتەوێ ساف بمێنیتەوە ؟ وەکوو ئێمە بمێنەرەوە و لێرەدا تێکەڵاو ببە . "

- : " هەموو ژیانتان تەرخانی ئەوە دەکەن کە شێوازێکی کەسیتان هەبێت و لاسایی ڕۆژ ئاواییەکان دەکەنەوە . بەڵام لەبەر ئەوەی لاسایی دەکەنەوە هیچ کات نابن بە خاوەنی . "

– ڕەشە زۆر بێشەرەفانە گوتی : " هیچ چارەیەکیتر نییە. " دڵخۆشییەکەی ئەو نەخشکێشان نەبوو ، بەڵکوو شەکورە جوانکیلەکە بوو . خەنجەرەکەم لە لووتە خوێناوینەکەی ڕەشە دەرهێنا و وەکو جەلادێك خۆی بۆ سەر بڕاندن ئامادە بکات لەسەر سەری بەرزم کردەوە و شتە ئاشکراکەم گوت: "ئێستا ئەگەر بمەوێ دەتوانم لەسەرت بدەم . بەڵام دەتوانم لەبەر خۆشبەختی شەکورە و منداڵەکانی بتبەخشم . باش هەڵسووکەوتی لەگەڵدا بکە ، نەزانکاری نەکەی . قەوڵم پێبدە " .

– : " قەوڵ دەدەم "

– : " لەبەر خاتری شەکورە دەتبەخشم . " بەڵام دەستم بەپێچەوانەی قسەکەی دەمم هەڵسوکەوتی کرد و بەهەموو هێزێکەوە زەربەیەکم لێدا . لەدواکاتدا لەبەر ئەوەی ئەو خۆی جووڵاند بوو منیش ئاڕاستەی خەنجەرەکەم گۆڕیبوو بەر ملی نەکەوت و شانی بریندار کرد .منیش بە ترسەوە تەماشای ئەو شتەم کرد کەوا دەستم لە خۆیەوە کرد بووی . کاتێ خەنجەرە نوقم بووەکەم لە خوێندا کێشایەوە سوورایییەکی ساف هەموو لایەکی گرتەوە . ترسام و شەرمم کرد . بەڵام دەمزانی کەلەماوەیەکی کورتدا لەوانەیە کە لە دەریاکانی عەرەبدا کاتێك کوێر دەبم شێوەکارێکی هاوڕێم لەلام نابێت تاوەکوو تۆڵەی لێبستێنمەوە . لەق لەق لەوە ترسا کە نۆرەی ئەویش بگات هەر بۆیە بەرە و ژوورە تاریکەکان هەڕای کرد . بە چراکەی دەستمەوە خۆم و سێبەرم بەدوای کەوتین ، بەڵام ترسام و گەڕامەوە ، دوایین کاریشم ماچکردن و خواحافیزی کردن بوو و لەگەڵ پەپوولەدا . لەبەر ئەوەی بۆنی خوێن کەوتبووە نێوانمانەوە نەمتوانی وەکوو ئەوەی لە دڵمەوە دەمەوێ ماچیبکەم .چاوی بەوە کەوت کە فرمێسك دەرێژم . لە

بێدەنگییە مەرگاوییەکەی تەکیەکەدا کە جار و بار ناڵە ناڵی ڕەشە دەیشکاند دەرکەوتم . لەباخچە قوڕاوییەکە و گەڕەکە تاریکەکەوە بە هەڕا کردن دوور کەوتمەوە . ئەو کەشتییەی وا من دەبات بۆ لای ئەکبەر خان بەیانی دوای بانگ ڕێدەکەوێ ، لەوکاتەدا بەلەمێك لەبەندەری ( کادرگا)وە بۆ دواجار دەچوو بۆ لای کەشتییەکە . کاتێ هەڕام دەکرد ، فرمێسك لەچاوم دەهات . وەکوو دزێك لە (ئاکسەرای ) وە بەبێدەنگی تێپەڕ دەبووم کە یەکەم تیشکەکانی سپیدەدەمم بینی . بەڵام لەتەنیشت کانی یەکەم گەڕەکێك کە لە نێوان کۆڵان و ڕێگە تەنگەکانەوە کەوتە پێشم ( کە ئەو ماڵە بەردینەی لێبوو وا بیست و پێنج ساڵ بەرلە ئێستا کاتێ بۆ یەکەم جار هاتبوومە ئەستەنبووڵ شەو لەوێ مابوومەوە :

ئەو خزمە دوورەمان بە پیاوەتی و باشی خۆیەوە شەو بردمی بۆ ماڵی خۆیان و جێگای بۆ ڕاخستم،ئەوکاتە یانزە ساڵم بوو ، لەخەودا میزم کرد بوو بە دۆشەکەکەدا هەر بۆیە بە هەستی تاوانبارییەوە ویستبووم لەو نیوە شەوەدا خۆمم بخەمە نێو چاڵە ئاوەکەی حەوشەکەوە کە ئێستا لەبەینی دەرگاکەوە دەیبینم .)

هەتا گەیشتمە( بەیازیت ) چاوم بە دوکانی سەعاتچی کەوت کە چەند جار سەعاتە شکاوەکەم بۆ چاك کردنەوە بۆ ئەوێ نارد بوو ، دوکانی شوشە و جام و پەرداخی شەربەت فرۆشی و هیترم بینی، هەموویان سڵاویان لێدەکردم و ڕێزیشیان لێدەگرتم . لەلای قاوەخانە هەرۆژاوەکە کەسی لێنەبوو ، بێدەنگ بوو، لەوانەیە ئەو ماڵەش وەهابێ کە لە دڵەوە داوای خۆشبەختی شەکورە جوانەکە و مێردە تازەکەیم بۆ کرد بوون ( کە ئێستا لەکاتی مەرگدایە ) .

لەدوای ئەوەی دەستم چوو بوو بە خوێنێکدا ، کاتێك لە کۆڵانەکاندا ڕێم دەکرد. هەموو سەگەکانی ئەستەنبووڵ و دەرختەکانی تاریکی و پەنجەرە کوێرە داخراوەکان و دوکەڵهەکێشە ڕەشەکان و تارماییەکان و زوولە خەو هەڵسەرە نائومێدەکان کە بۆ نوێژی بەیانی هەڕایان دەکرد ، هەمووی وەکوو دوژمن تەماشایان دەکردم ، بەلام کاتێك دانم بە جەنایەتەکانمدا دانا و بڕیاری بەجێهێشتنی شارەکەم وەرگرت هەموویان ئیدی وەکوو دۆست تەماشایان دەکردم. لەدوای بەجێهێشتنی مزگەوتی بەیازیت لە تەپۆڵکەیەکەوە سەیری خەلیجم کرد " ئاسۆ ڕوون دەبووەوە ، بەڵام ئاو هێشتا تاریك بوو . دوو بەلەمی ماسیگیری و کەشتییە باربەرە بادبان زەردەکان و کەشتییەکی شەڕی فەرامۆشکراو لەسەر شەپۆلە نادیارەکاندا بە هێواشی دەلەقانەوە و پێیان دەگوتم مەڕۆ ،مەڕۆ ! فرمێسکەکان لەبەر ئەو دەرزییە دەڕژان کەوا کرا بوو بە چاومدا ؟ بە خۆمم گوت : خەیاڵ لەسەر ئەو ژیانە نائاساییە بکە کەوا بەشتە دەرئاساییەکانی هونەرەکەتەوە لە هیندوستان دەیکەی ! لەڕێ دەرکەوتم بەهەڕا کردن دوو باخچەی قوڕاویم تێپەڕ کرد و خۆم گەیاندە ماڵە بەردینێکی کۆن لە ناو سەوزە لانییەکدا . ئەمە ئەو ماڵەی بوو وا هەموو ڕۆژانی سێ شەمە لە دەورانی شاگردیمدا ، جانتا و بەرگبەستەکان و قوتوی قەڵەمەکە و تەختەی نووسینەکەی وەستا عوسمانم هەڵدەگرت و دوو هەنگاو لە دوای خۆیەوە بەرەو وێنە کێشخانە بەڕێدەکەوتم . لێرەدا هیچ شتێك نەگۆڕا بوو ، بەڵام دار چنارەکانی باخچەکە وەها گەورە بوو بوون کە دەوڵەمەندی و دەسەڵات و شان و شەوکەتی کاتی سوڵتان سولەیمانی بەبیر دەهێنایەوە . لەبەر ئەوەی نزیکی ڕێگای بەندەر بوو ، بە گوێی شەیتانم کرد و هەوا بینینەوەی بینای وێنەکێشخانەکە دای

لەسەرم . بەمجۆرەش لەو ڕێگایەی وا لەکاتی شاگردیمەوە لەپشتی وەستا عوسماندا پیایدا دەچووم ولە کۆلانی کەواندارەکان کەلە بەهاراندا بۆنێکی بێهۆشکەرانەی ئەخلامووری لێوە دەهات و لەبەر ئەو نانەواخانەی وا وەستاکەم بۆرەکی قیمەداری لێوەردەگرت و لەولاپاڵەوە کە لەتەچنەکان وەکوو داری کەستانە و دارەبەی ڕیزیان بەستبوو و لەبەر دوکانە داخراوەکانی بازاڕی تازە و لەتەنیشت ئەو بوستانەچۆڵەی وا هاوینان پەتبازەکان لەوێدا نمایشیان ئەنجامدەدا و لەبەر ئەو دەلاکەی وا هەموو بەیانیەك وەستاکەم سلاوی لێدەکردو لەپاڵ ژووره بۆن پیسەکانی کوڕە هەرزەکارەکان و کەمەرە ( پشتوێن ) بۆنی کەڕوو دارە بیزانسیەکان و کۆشکەکەی ئیبراهیم پاشا و ستوونە مارداره‌کە( کە بەسەدان جار وێنەیم کێشاوە) و لە پاڵ ئەو دار چنارەی وا هەموو جارێك جوداتر دەمانکێشا یەوە و لەژێر دار توو و داری کەستانەکانەوە تێپەڕ بووم (کە هەموو بەیانیەك چۆلەکەکان بەسەریانەوە پێکەوە چریکە چریکیان دەکرد.) دەرگای وێنەکێشخانەکە داخرا بوو .

بەردەرگاکە و هەیوانەکەی سەرەوەش کەسی لێنەبوو .

تەنیا ساتێك بە پەشۆکاوییەوە تەماشای ئەو پەنجەرە بچووکەم کرد بوو کەوا لەکاتی شاگردیماندا کاتێك بێتاقەت دەبووین، لەوێوە تەماشای درەختەکانمان دەکرد، کە یەکێك ڕایوەستاندم . دەنگێکی زیقن و بێزارکەری هەبوو . دەیگوت کە خەنجەرە خوێناوینە دەسك سوورەکە هی ئەوەو شەوکەتی برازاگی و دایکی پێکەوە لە ماڵی ئەو دزیویانەوە و ئەمەش سەلمێنەری ئەوەیە کەمن یەکێك لە پیاوەکانی ڕەشەم کە شەو چوو بووینە سەر ماڵەکەی و شەکورەمان ڕفاندووە . ئەم پیاوە دەنگ زیقنە زانیویەتی کە

ڕەشە و دۆستە وێنە كێشەكانی دێن بۆ وێنەكێشخانەكە . خەنجەرێكی دەسك درێژی پێبوو كە لە سوورایيدا دەبرقايەوە ، نازانم لەبەر چی بوو بەڵام دەيويست حيسابێكی زۆرم لێوەربگرێ ، بەڵام ئەوەندەش بەسەر هاتی هەبوو كە باسی بكات . لەوانەيە بمگوتبايە كە هەڵەيەك ڕوويداوە ، بەڵام چاوم بەو تووڕەييە بڕوا پێنەكراوە كەوت لە ڕوومەتيدا . هەروەها لە ڕوخساريدا چاوم بەوەكەوت كە دەيەوێ بە نەفرەتەوە هێرش بكاتە سەرم . دەمەويست كە بتوانم بڵێم " ئامان ڕاوەستە . " بەڵام ئەو هێرشەكەشی كرد بوو . منيش بەبێئەوەی خەنجەرەكەم ڕاست بكەمەوە توانيم ئەو دەسەكەی ترم هەڵبڕم و توورەكەكەم فڕێبدەمە ئاسمان، شمشێرە سوورەكە بەبێئەوەی ڕاوەستێ لە پێشدا دەستمی بڕی و لەدوايدا هەموو گيانمی بريندار كرد و دواتريش كەللەی سەری پەڕاندم . لەوەی كە جەستەم بە سەرساميیەوە دوو هەنگاوی نەناو بەجێی هێشتم و خوێنم فيشقەكەی لێوە دەهات و بە گەوجييەوە خەنجەرەكەم دەلەقاند تێگەيشتم كە سەری پەڕاندووم .

پێ بێچارەكانم وەكوو چۆن ئەسپێك بەر لە مردن پەلە قاژە دەكات ، لە خۆڕايی ڕێيان دەكرد . لەوجێگای قوراييەی‌كە سەرم كەوتبوو چاوم بە بكوژەكەم نەدەكەوت . هەروەها توورەكەی زێڕووێنەكانيشم نەدەبينی . ئەوان لە لای پشت ملمەوە لە ڕووی دەريا و بەندەرەوە مابوون كە ئيدی هيچ كات پێيان نەدەگەيشتم . سەرم ئيدی نەيدەتوانی جارێكی تر بگەڕێتەوە و تەماشای ئەوانە و دونيا تر بكات . ئەوانەم گرت و بيرم لە داخوازيەكی مێشكم كرد . ئەو شتەی وا بەر لەوەی سەرم بپەڕێ بيرم لێكردبووەوە ئەمە بوو : (كەشتيەكە دەچێ . فەرمانێكی زوو ڕۆيشتن لە عەقڵمدا يەكی گرتبوو " ئەويش لە گەڵ قسەكانی دايكمدا كە لە كاتی منداڵيمدا دەيگوت " پەلە

بکە " ، خۆی تەواو کردبوو . دایکە! ملم دێشیٚ و هیچ شتێکیش ناجوڵێت.)

که واته ئەو شتەی وا پێی دەڵێن مەرگ ئەمە بووه . بەڵام دەمزانی کە هێشتا نەمردووم . گلێنە کون بووەکانی چاوم جوڵەیان نەدەکرد بەڵام چاوەکانم به جوانی دەیان بینی . ئەو شتەی وا له ڕێکی زەویدا بینیبوم هەموو بیری داگرتبووم . ڕێگا له لاپاڵەکەوه به هێواشی سەر دەکەوت .

دیواری وێنەکێشخانەکە ، سەربانەکە و ئاسمانیش ئاوەها دەڕۆیشتن . وامزانی که ئەم کاتەی وا تەماشام دەکرد درێژ بووه و زانیم که بینینی ئێستا جۆرێکی وەبیر هێنانەوەیه . ئەو کاته ئەو شته هات به عەقڵمدا که له دوای چەند ساعەت تەماشا کردنی وێنەیەکی جوان دەهات به مێشکمدا " ئەگەر زۆر تەماشای وێنەێك بکەی بیرت دەچێته نێو کاتی وێنەکەوه . ئێستا هەموو کاتێك بووه بەو کاته. وامدەزانی کەس نامبینیٚ و له کاتێکدا بیرەکانم کاڵ دەبنەوه ، سەرم سالآنێکی درێژ تەماشای ئەم لاپاڵه خەمباره و دیواره بەردینانەوه و دار توو و کەستانەکان دەکات که هیچ کات پێیان ناگات ، له ناکاو ئەو چاوەڕوانییه بیٚ کۆتاییه ئەوەنده ئازاری پێدەگەیاندم که بیٚ تاقەتی کردم و ویستم لەو کاته دەرکەوم .

## (( من ، شەکورەم )) (58)

له ماڵی خزمه دوورەکەی ڕەشەدا که بۆ خۆ شاردنەوه ناردبووینی بۆ ئەوی شەوم به بێخەوی تێپەڕکرد . له نێو ئەو ژوورەی وا له گەڵ خەیرییه و منداڵەکاندا لەوێدا خۆمان درێژ کردبوو ، دەنگی پرخەی لوت ودەنگی

تڕرانەدەوەستا ، بەڵام جار و بار خەوم لێدەکەوت ، لە لایەکی تریشەوە مەخلوقاتی جۆرا و جۆر کە دەست و قاچیان بڕابوو و تێکەڵاوی یەکتر بوو بوون لە خەوە نائاسودەکەمدا نەیاندەهێشت ئارام بگرم و هوشیاریانم دەکردمەوە . بەرەو بەیانی هەستام و شەوکەت و ئۆرهانم باش داپۆشی ، باوەشم پێدا کردن و قژەکانیانم ماچ کرد و وەکوو چۆن لە کاتە جوانەکانی خەوە ئاسودەکانی ماڵەکەی باوکمدا دەمکرد لە خودا پاڕامەوە بۆ ئەوەی کە خەوێکی خۆشم پیێ بدات ، بەڵام خەوم لێنەکەوت . لە دوای نوێژی بەیانی لە پەنجەرە بچووکەکەی ژوورەکەوە چاوم بەو شتە کەوت کە وا هەمیشە لە خەونە خۆشەکانمدا دەیبینم " کابرایەکی وەکوو تارمایی کە لە شەڕدا و لە بەر ئەو برینانەی وا هەڵی گرتووە لە حاڵ چووە و بە هەندێك هەنگاوی ناسراو و بە گۆپاڵەکەی دەستیەوە و بە تامەزرۆیەوە نزیکی من دەبووەوە . لە خەونەکاندا کاتیێ دەمەویست باوەش بەم پیاوەدا بکەم بە فرمێسکەکانی چاومەوە لە خەو ڕادەپەریم . کاتیێ کە زانیم ئەو پیاوە خۆێناویەی ناوکۆڵانەکە ڕەشەیە ، ئەو قیڕەی وا لە خەونەکاندا لە قوڕگم دەرنەدەکەوت ، دەرکەوت و هەڕام کرد و دەرگاکەم کردەوە . ڕوومەتی لە بەر لێدانت ئاوساو بوو و ڕەش داگەڕابوو . لوتە لەت لەت کراوەکەی پڕ ببوو لە خۆێن . لە شانییەوە تاوەکوو ملی برینێکی قوڵی لێبوو . کراسەکەی و هەموو جێگایەکی بە خۆێن سوور بوو . وەکوو مێردەکەی ناو خەیاڵەکانم، لە بەر ئەوەی توانیبووی بگەرێتەوە بۆ ماڵ بزەیەکی بۆ لێدام .

گوتم : " وەرە ناوەوە . "

– : " منداڵەکان بانگ بکە ، دەگەڕێینەوە بۆ ماڵی خۆمان "

–:" حاڵی گەرانەوە بۆ ماڵت نیە . "

– : " ئیدی لەوە مەترسە وەلی جانە ئەفەندی عەجەم بووە . "

– : " زەیتوون ... ئەو بێچارەیەت کوشت ؟ "

– : " لە ڕێگای کادرگاوە بە کەشتی هەڕای کرد بۆ هیندوستان . "

لە بەر ئەوەی کە زانی کارەکەی ناتەواو ئەنجام داوە بۆ ساتێك چاوی لێدزیمەوە ،گوتم : " دەتوانی بەرەو ماڵ ڕێ بکەی ؟ با ئەسپێکت بۆ دەرخەم . " هەستمکرد کە دەمرێ و بەزەییم پێدا هاتەوە . ئەوەش تەنیا لە بەر مەرگەکەی نەبوو بەڵکو لە بەر ئەوەش بوو کە هیچ ڕوویەکی خۆشی نەبینیبوو .

لە خەماوی بوون و بە بڕیار بوونی چاوەکانییەوە تێگەیشتم کە دەیەوێت لە ماڵە بێگانەیەدا بە بێئەوەی کەس چاوی پێبێبکەوێ لە ناو بچێ و بمرێ . بە زۆری سواری ئەسپێکمان کرد . لە کاتی گەڕانەوە بەرەو ماڵ منداڵەکان لە پێشدا نەیان دەوێرا تەماشای ڕەشە بکەن . بەڵام دیسان ڕەشە توانی بە سەر ئەسپەکەوە باسی ئەوەیان بۆ بکات کە چۆن بکوژەکەی با پیریانی دۆزیووتەوە لە گەڵیدا لە یەکیان داوە . دەمبینی کە توزێك دڵیان بەوە گەرم دەبێ ، هەر بۆیە بۆ ئەوەی ڕەشە نەمرێ لە خودا پاڕامەوە . کە گەیشتینە بەر ماڵ ئۆرهان بە خۆشیەوە قیڕاندی : " گەیشتینەوە ماڵ ! " لەو کاتەدا ئەوەم بە دڵدا هات کە عیزرائیل بەزەیی پێماندا دێتەوە و خوداش تۆزێکی تر کاتمان پێدەدات ، سەرەڕای ئەوەش لە بەر ئەوەی بە ئەزمونەوە دەمزانی کە دیار نیە خودا لە کوێ و لەبەر چی گیانی کێ دەکێشێ زۆر هیوادار نەبووم . بە زۆری ڕەشەمان لە ئەسپەکە دابەزاند و پێکەوە بردمانە سەر و لە ژوورە بە شین ڕاخراوەکەی باوکمدا هەڵمانژاند . خەیرییە ئاوی کوڵاند و هێنای . لە گەڵ خەیرییەدا کراسە بە گۆشت چەسپاوەکەی و پشتوێنەکەی

و جلەکانی ترمان بە مەقەست بڕی و دەر هێنا . کاتیٚ پەنجەرەکەمان لادا ، تیشکە نەرمەکەی خۆرە لەرزۆکەکەی زستان ژوورەکەی گرت و لە جامەکان و قابلەمەکان و قوتوەکانی سرێش وردە شووشەکان و قەڵەتراشەکانەوە گەڕایەوە و جەستەی ڕەنگی مەرگ گرتووەکەی ڕەشە و برینە هەڵووژە ڕەنگەکانی ڕۆشنتر کردەوە . قوماشە چارشێوە سابوون لێدراوەکانم بە ئاوی گەرم تەڕ کرد و وەکوو چۆن قاڵییەکی پڕ بایەخ پاك بکەمەوە و وەکوو چۆن بە حەز و بە بەزەییەوە تەماشای منداڵەکانم بکەم ، جەستەی ڕەشەم پاك کردەوە . بەبێئەوەی زەخت بخەمە سەر جێگا شین بووەکانی و ڕوومەتی و برینەکەی لووتی بکولێنمەوە وەکوو پزشکێك برینە ترسێنەرەکەی شانی ڕەشەم خاوێن کردەوە . وەکوو چۆن لەکاتی بچووکاییاندا منداڵەکانم پاك دەکردەوە ، ئاوەها ڕەشەشم پاك دەکردەوە. لەلایەکیتریشەوە قسەی پڕ و پوچم پێدەگوت . لەسەر سینگ و دەستەکانیشی جێگای برین هەبوو . پەنجەکانی دەستی چەپی بە گەز کردن شین بوو بوونەوە . هەر چەندە پەڕۆکانی دەستم بەسەر جەستەیدا دەگەڕان زیاتر خوێناوی دەبوون . دەستم دا لە سینگی دا و هەستم بە نەرماییەکەی ورگی کرد و ماوەیەکی درێژ سەیری شتەکەیم کرد "

دەنگی منداڵەکان لە خوارەوە لە حەوشەکەوە دەهات . نازانم بۆچی هەندێك لە شاعیران بەمە قامیش و قەڵەم دەڵێن ؟ کاتیٚ کە دەنگە دەنگی ئەستەرم بیست (لەکاتی هێنانی هەواڵی تازەدا وەها دەنگی دەردەخست )، ڕۆیشتمە خوارەوە . زۆر پەشۆکاو بوو ، باوەشی پێدا کردم و ماچیکردم و باسی بۆ کردم : کەللەی سەری زەیتوون و توورەکە و وێنەکانیان دۆزیوەتەوە کە تاوانەکانی پێشووی دەسەلمێنیٚ . ویستوویەتی هەڕا بکات

بۆ هیندوستان ، بەڵام گوتوویەتی با بۆ دوایین جارسەردانێکی وێنەکێشخانەکە بکەم . ئاگایانی ڕووداوەکە دەلێن : حەسەن لەوێدا چاوی بە زەیتوون دەکەویٚ و بە شمشێرە سوورەکەی کەللەی سەری پەڕاندووە . کاتیٚ ئەو باسی دەکرد من بیرم لەوە دەکردەوە کە ئێستا باوکە بێچارەکەم لەکوێدایە . زانینی ئەوەی کە پیاو کوژەکە کێیە منی لە ترسێکی گەورە ڕزگار کرد . هەستم بەوەش کرد کە تۆڵە سەندنەوە هەستێکی ئاسوودەیی و عەداڵەتی خۆش دەدا بە مرۆۋ . مەراقی چۆنیەتی ئەم هەستم لەو جێگایە کرد وا باوکمی لێیە و وامزانی کە هەموو عالەم وەکوو کۆشکێکە کە دەرگا بیٚژمارەکانی بە ڕووی یەکتریدا بکرێنەوە . تەنیا بە خەیالٚ کردنەوە و بەبیر هێنانەوە دەمتوانی لەیەکێکەوە بچینە ئەویتر ، بەڵام زۆرمان لەبەر تەمبەڵی ئەمە ناکەین و هەر لەیەك ژووردا دەمێنینەوە .

ئەستەرگوتی : " مەگری گیانەکەم ! سەیر کە هەموو شتێك بە باشی کۆتایی پێهات ؟ " چوار ئاڵتوونم پێدا . دووبارە بە ویستەوە و بە تەماوە خستیە ناو دەمی و نەزانانە گازی لێگرتن . بە بزەلێدانەوە گوتی : " قاڵبی ئەم وەنیزیە کافرانە هەموو جێگایەکی گرتوٚتەوە . " ئەو هات و نەهات بە خەیرییەم گوتبوو کە منداڵەکان بباتە سەرەوە .

چوومە ژوورەوە و دەرگاکەم داخست بە ویستێکی زۆرەوە باوەشم کرد بە جەستەی ڕەشەدا و ئەو شتەم کرد کە لە شەوی کوژرانی باوکمدا لە ماڵی یەهوودییە هەڵواسراوەکەدا داوای ئەنجامدانی لێکرد بووم ، ئەمەم زیاتر لە ویست و حەز لەبەر مەراق ئەنجام دا . ناتوانم بەتەواوەتی بڵێم هۆی ئەو لەیەك چوواندنە چییە کەوا شاعیرە عەجەمەکان سەدان ساڵە بە شتی پیاوان قەڵەم دەڵێن و بەوەی ئێمەش جامۆڵکە دەڵێن . ( لەبەر بچووك بوونی دەمە

؟ بێدەنگییە ڕازدارەکەی جامۆڵکەیە ؟ ڕەسام بوونی خوداییە ؟ ) بەڵام بە ژیربیری کەسێکی وەکوو من کە خۆی دەپارێزێ ناتوانرێت لە عەشق تێگەیشتنێکی ڕاست و دروستی ببێت ، بەڵکوو بە ناژیرییەوە ئەمە ڕوونتر دەبێتەوە .

کەوا بوو نهێنییەکەتان بۆ دەدرکێنم " لەوێدا ، لە ژوورەکەدا کە بوونی مەرگی لێوە دەهات شتەکەی ڕەشە لەدەممدا نەیدەورووژاندم بەڵکوو ئەوەی وا لەکاتی هەستکردن بە ترپە ترپی هەموو دونیا لە دەممدا دەیورووژاندم و دەیپەشۆکاندم دەنگی جیکە جیکی منداڵەکانم بوو کە لە حەوشەکەدا بە خۆشییەوە قسەیان بەیەك دەگوت و ئاژاوەیان دەکرد . ئەو کاتەی وا دەمم پڕ بوو چاوم بە نێو چاوانی ڕەشەش کەوت کەبە شێوەیەکی زۆر جیاواز سەیری دەکردم .وتیجارێکیتر شێوەی ڕوخسار و دەمی منی لەبیر ناچێتەوە .

لاشەی وەکوو کاغەزی گەنیوی هەندێك کتێبە کۆنەی باوکم بۆنی لێوە دەهات . هەموو تۆز و بۆنی قوماشەکانی ناو ژووری خەزێنەکە چوو بوونە ناو قژی ڕەشەوە. کەلە خۆم دەرچووم و دەستم لەبرینەکان و جێگا هەڵئاوەساوەکانی لاشەیدەدا وەکوو منداڵێك دەینالاند و هەرچی دەچوو لە مردن دوور دەکەوتەوە و ئەو کاتەش تێدەگەیشتم کە زیاتر دڵم لێی دەچێ . جووت بوون و لاقە کردنەکەمان وەکوو بەلەمێکی بادباندار خێراتر بوو وەکوو ئەو بادباندارە بەڕێزە بە لێبووردەییەوە بەرەو دەریا نادیارەکان ڕۆیشت . لەوەی کە ڕەشە لە کاتی گیاندانیشدا بەسەر چۆنیەتی چێژ وەرگرتنیدا زاڵ دەبوو ، تێگەیشتم کە ڕەشە لەگەڵ ژنانی بێڕەوشتدا پێشتر ئەمجۆرە سەفەرانەی کردووە . نەمدەزانی دەستی خۆم ماچ دەکەم یان هی

ئەو ، پەنجەکانی خۆم بوون لە نێو دەممدا یان ... ، دونیام ژێرا و ژوور بوو بوو و ئەویش بە ئازاری برینەکان و چێژ وەرگرتنەکەیەوە سەر خۆش بوو بوو و بە یەك چاو سەیر دونیای دەکرد کە بەرە و کوێ دەچێ و وەکوو ئەوەی کە تەماشای وێنەیەکی جوان بکات لەنێو هەر دوو دەستیدا سەیری ڕوومەتی منی دەکرد، بەڵام لەهەمان کاتدا دەیتوانی ڕوخسارم لەگەڵ ڕوخساری قەحپەیەکی وڵاتێکی ڕۆژ هەڵاتیدا لەیەك بچوێنێ . لەدوایین کاتی چێژ وەرگرتندا وەکوو ئەو قارەمانانەی کە لە تێکڕژانی لەشکەری ئێران و توورانددا دەکوژرێن و دەبن بە دوو لەتەوە ، قیڕەیەکی کرد ! ترسام ، دەنگی قیڕەکەی ئەوەندە بەرز بوو کە تەواوی گەڕەك گوێی لێبوو . ڕەشەش وەکوو وێنەکێشێکی ڕاستە قینە کە لەکاتێکدا دەستی بەسەر شتەکەیەوە و خوداش ئیلهامی جووڵە کردنی پێدەدات ، چۆنیەتی داڕشتن و کەڵەکە کردنی ناو لاپەڕەکە تێکەڵاو ناکات ، لەکاتی چێژە وەرگرتنیدا بە گۆشەیەکی عەقڵیەوە تەماشای جێگەکەمانی دەکرد و خۆی تێك نەدەدا . دواتربە هەناسە وڕکەوە گوتی : " تۆ بڵێی ، مەڵهەمم لە برینەکانی باوکت دابێ ".

ئەم قسەیە ، بەتەنیا ڕەنگی عەشقەکەمانی دیاری نەدەکرد کە لەتەنگانە ڕێی نێوان مەرگ و ژیان ، قەدەخە و بەهەشت و بێچاریی و شەرمدا جێگای گرتبوو " بەڵکوو بەهانەشی بۆ دروستکرد . بیست و شەش ساڵ دوایی ئەوەش لەکاتی نیوەڕواندا هەر لەو ژوورەدا کەوا پەنجەرەکەی ڕوو بە چاڵە ئاوەکە بوو کە شەوکەت و ئورهان لەساڵە سەرەتاییەکاندا لەوێدا ئاژاوە و جێکە جیکیان دەکرد ، لەبەر ئەو تیشکەی وا لە پەنجەرەکەوە دەهاتە ناو ، لەگەڵ یەکدا جووت بووین و پێکەوە لاقەمان کرد و دیسان بەمەمان دەگوت

"مەڵهەم لێدانی برین ."

بەمجۆرەش وەڵامی داخوازییەکانی باوکێکی خەفەتبارو بەخێلم دەدایەوە و کوڕە بەخێڵەکانیشم ڕازی دەکرد کە دەیانەویست شەوان لەگەڵ مندا بخەون . هەموو ژنێکی ژیر دەزانێ کە باوەش کردن بە کوڕەکان و خەوتن لەگەڵیاندا لە باوەش کردن بە مێردێکی ڕووکاو بەدەستی زەمانەوەخۆشترە . ئێمە ، من و منداڵەکانم خۆشبەخت بووین بەڵام ڕەشە نەبوو . هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ مانەوەی برینەکەی شان و ملی و ئەو شتەی وا چاوەکانی پێیدەگوتم " سەقەت مانەوەی. "

ئەم سەقەتبوونە شتێك نەبوو کە لەبەرامبەر ژیانیدا ئاستەنگ بێ ، تەنیا شێوەی‌خراپ کرد بوو . تەنانەت ئەوەشم بیستبوو کە هەندێك ژن والە دوورەوە مێردەکەمیان بینیبوو گوتبوویان پیاوێکی قۆزە . بەڵام شانی ڕاستی ڕەشە هەموو کات داکەوتبوو و ملیشی بە شێوەیەکی سەیر لار بوو بوو . جار و باریش قسەی جۆرا و جۆرم لەبارەی ئەوەی کە ژنانی وەکوو من هەمیشە دەبن بە قسمەتی پیاوانی لەخۆ کەمتر و بوونی نائومێدی ڕەشە بە هۆی دڵخۆشی و هیواداری ئێمە دەیبیستەوە . وەکوو چۆن هەموو قسەو باسێك لایەنێکی ڕاستییان هەیە ، ئەمەش ڕاستییەکی دەهێنایە سەر زمان . ئەستەر منی بە شایستەی ئەوە دەزانی بەسەر بەرزییەوە بە سواری ئەسپێکەوە لەگەڵ گوێلەکانمدا هەموو ئەستەنبووڵ بگەڕێم ، بەڵام کاتێك ئەمە نەبوو هەستم بە هەژاری و نەداری خۆم دەکرد و جار و باریش حەسرەتی مێردێکی سەر بەرز و شێرئاسام دەکێشا . هۆکەی هەرچی دەبێ بابێ، ڕەشە هەموو کات خەفەتبار مایەوە . زۆر کات چاوم پێدەکەوت کەلە خۆشترین کاتەکانی جووت بوونیشماندا دیسان خەفەتێکی هەبوو کە

پێوەندی بە سەقەت بوونەکەیەوە نەبوو ، ئەوسا بڕوام دەکرد کەلە گۆشەیەکی شاراوەی ڕۆحیدا جندۆکەیەکی خەفەت هەیە . بۆ ئاهۆن کردنەوەی ئەو جندۆکەیە جار و بار شەرابی دەخواردەوە ، تەماشای وێنەکانی ناو کتێبەکەی دەکرد و سەرنجی لە نەخش و نیگار دەدایەوە و لەگەڵ وێنەکێشاندا هەڵسوکەوتی دەکرد و بە دوای کوڕە جوانەکان دەکەوت . ئەو کاتانەی وا لەگەڵ وێنە کێشە شاعیرەکاندا کاتی ڕادەبوارد و قسەی دوو مانا و گاڵتەی جاڕی دەکرد و بەدوای کوڕە ججوانەکان دەکەوت ، ئەو کاتانەی لەبیر دەچوو کەتوانیبووی خزمەتی سولەیمان پاشای لار بکات و کتێبداری بۆ بکات . ویست و داخوازی ڕەشە بە مەرگی پادشا و هاتنە سەر تەختی سوڵتان موحەمەد کە گوێی نەدەدایە ئەم شتانە ، لەشتێکی بە شان و شەوکەتەوە گۆڕایەوە بۆ ڕازێکی تەنیا لەپشتی دەرگا داخراوەکاندا . جارو باریش کتێبێکی باوکمی دەردەخست و تەماشای وێنەیەکی کاتی کوڕەکانی تەیمووری دەکرد کە بە دەستی وەستا هەراتییەکانەوە کێشرا بوو . بەڵێ تەماشای وێنەی عاشقبوونی شیرین بە خەسرەوی دەکرد ، بەڵام وەکوو نمایشێکی خۆش کە ئێستاش لە کۆشکدا نیشان دەدرا  تەماشای نەدەکرد بەڵکوو وەکوو وروورژاندنەوەی بیرەوەرییەکی خۆش هەستی تاوانباری پێدەبەخشی و بەخەمەوە سەیری دەکرد .

لە سێهەمین ساڵی هاتنە سەر تەختی پادشاکەماندا ، پادشای ئینگلتەرە سەعاتێکی هەواکێشداری موسیقا ژەنی سەیری بەهەدیە بۆ نارد بوو چەند حەفتە لە لا پاڵەکەی خەلیجدا خەریکی دامەزراندنی ئەم سەعاتە گەورە و قوماش و وێنە و پەیکەرە نێردراوەکان بوون . وەکوو ئەوەی کە دروستکراوی خودابن ، خۆیان بادەدا و بەلەنجەوە ڕێیان دەکرد و

سەعاتەكەشیان زەنگی لێدەدا و كاتەكانی بە ئەستەمبووڵیەكان دەگوتەوە . خەڵكی ژێر و جەماوەری سەرسەری ئەستەنبووڵ لەبەرامبەر ئەم سەعاتە و هێزی گاورەكاندا سەرسامبووبوون . ڕەشە و ئەستەر دەیانگوت پادشا و دەمار گیرە دیندارەكان لەبەرامبەر ئەمەدا زۆر ناڕەحەت و نائاسوودە بوون . لەكاتێكدا كە ئەم قسە و باسانە زۆر بوو بوون ، ڕۆژێك بیستمان كە سوڵتان ئەحمەد كە دوای ئەو پادشایە بوو بوو بە پادشا ، شەو بەئیلهامێكی خوداییەوە دێتە ناو باخچەكە و دەچێ سەعات و پەیكەرەكان دەهەڕۆژێنێ و دەیانكێشێ . ئەوانەی وا ئەم هەواڵەیان هێنا بوو دەیانگوت ، پادشاكەمان لە خەونی خۆیدا چاوی بە حەزرەتی پێغەمبەر كەوتووە و پێغەمبەر پێی گوتووە ئەگەر ڕێگا بەو كەسانە بدەی وا لەبەرامبەر ئەو گەلەدا حەیران ببنەوە كە پەیكەر دروستدەكەن و لەگەڵ خودا كێبەركێ دەكەن ئەوا لە خەتی خودا دەترازێن ، ئەویش هەر لە خەودا گورزەكەی هەڵدەگرێ و دەچێت بۆ شكاندنی ساعەت و پەیكەرەكان . پادشاكەشمان داوای كە مێژوونووسە وەفادارەكەی كرد بوو كە ڕووداوەكە وەها بنووسێتەوە . ئەم پادشایە بە كاسە زێڕی دا بە خۆشنووسەكان بۆ نووساندنی ئەم كتێبە ـ زوبدة التواريخ ـ بەلاّم بە دەستی وێنەكێشانەوە نەیڕازاندەوە .

بەمجۆرەش بوو كە گوڵە سوورەكەی نەخش و نیگاركێشان كە بە ئیلهام وەرگرتن لە وڵاتی عەجەمەكانەوە لە ئەستەنبووڵدا گەشەی كرد بوو ، دامركا و سیسایەوە . بەڵام ناكۆكی نێوان وەستا ڕۆژ ئاواییەكان و وەستا هەراتییەكان كە دەبوو بە هۆی ئاژاوە و دروستبوونی پرسیاری زۆر لە نێوان وێنەكێشاندا كۆتایی پێنەهات . زۆربەی وێنە كێشان وازیان

لەوێنەکێشان هێنا و بە گوێرەی ڕۆژ ئاواییەکان و ڕۆژ هەڵاتییەکانیشیان نەکرد . وێنەکێشەکان تووڕە نەبوون و سەریان هەڵنەدا و وەکوو پیرێك کە وردە وردە بە نەخۆشییەکەی خۆی ڕاهاتبێت ، بە پشت بەستن بە خودا و بەخەمەوە بەم وەزعەی خۆیان ڕاهاتن .

ئیدی وەکوو جاران مەراق و خەیاڵی ئەو وەستا کۆنە هەراتی و شیرازییانە کە بەسەر سووڕماوییەوە بە دوایاندا دەڕۆیشتن و وەستا ڕۆژ ئاواییەکان نەدەکرد کە لە نێوان بەخێلێبردنەوە و نەفرەتدا دەیانویست وەکوو ئەوان بن .

وەکوو ئەوەی کە دەرگای ماڵەکان لە تاریکایی شارەکەدا دابخرێت ، ئاوەهاش وێنە کێشان لە بێکەسیدا بەتەنیا هێشترانەوە . مەخابن! کتێبەکەی باوکم تەواو نەکرا . وێنەکان لەو جێگایەی واحەسەن خستبوونی دۆزرانەوە و برانە ناو خەزێنەوە ، لێرەشدا هەندێك وێنەی ئاساییان دۆزیوە و بە دەستی کتێبدارێکی فێڵباز و زیرەکەوە خرانە ناو بەرگبەستەوە و لە کتێبی فرەبابەتی جۆرا و جۆر دا بەکار بران . حەسەن لە ئەستەنبووڵ هەڕای کرد و ئیدی خەبەرێکی لێوەرنەگیرا . شەوکەت و ئورهانیش هیچ کات ئەوەیان لەبیر نەچوو کە بکوژی بکوژەکەی باپیریان ڕەشە نەبووە ، بەڵکوو ئەو مامەیانە بووە کە کوشتوویەتی . لە دوای وەستا عوسمان کە دوو ساڵی پشتی کوێر بوونی مرد ، لەق لەق بوو بە سەرۆکی وێنەکێشان . لەق لەقیش کە حەیرانی باوکە گیانەکەم بوو ، پاشماوەی ژیانی خۆی تەرخانی نەخش کردنی قاڵی و قوماش و چادر کرد . لاوەکانی وێنە کێشخانەکەش هەر ئەو ڕێگایەیان گرتە بەر . کەسیش وەها هەڵسووکەوتی نەکرد کە واز هێنان لە وێنەکێشان خەیانەتبێ . لەوانەیە لەبەر ئەوە بووبێ

**كە كەس چاوی بە وێنەی ڕوخساری خۆی نەكەوتبێ .**

**من لە تەواوی تەمەنی خۆمدا هەمیشە بە شاراوەیی ویستوومە كە دوو ڕەسم بكێشرێت ، كە باسم بۆ كەس نەكردووە .**

**1- دەمویست وێنەی خۆم بكێشرێت . بەڵام چەندە هەوڵیشیان بدایە نەیاندەتوانی وێنەی من بكێشن ، چونكە شێوەكارانی پادشا ، وێنەی ژنێك بە جوان نازانن ئەگەر وەكوو وێنەی چینییەكان چاو و لێوی نەكێشرابێت . وەكوو وەستا هەراتییەكان شێوەی منیان وەكوو كچێكی چینی دەكێشا ، لەوانەیە ئاشناكان بیانزانیبایە كە ئەمە ڕوومەتە شاراوەی نێو ڕوخساری جوانە چینییەكە هی‌منە . بەڵام ئەوانەی دوای ئێمە ئەگەر بەوەش بزانن كە چاوم ڕاكێشراو نەبوو ، هەرگیز نازانن كە ڕوومەتم لەچی چووە . لەم ساڵانەی پیریمدا كە بە دڵدانەوەی كوڕەكانم تێپەڕیاندەكەم ، وێنەیەكی كاتی جوانیم هەبایە ، زۆر دڵخۆش و خۆشبەخت دەبووم !**

**2- ئەو شتەی وا نازمە زەردی شاعیر مەراقی كرد بوو " یانی دەمەویست وێنەی خۆشبەختی بكێشرێت . باش دەزانم كە ئەمەیان چۆن دروستدەكرد . دەمویست وێنەی دایكێك بكێشرێت كە دوو منداڵی هەبێت " دەمویست كە بچووكەكەیان بە خۆشییەوە لە باوەشی دایكیدا سەری مەمكە گەورەكەی بمژێ و گەورەكەش تۆزێك بەخیڵی بباتەوە و نیگای چاوانی لەگەڵ هی دایكیدا یەكبگرێتەوە . لەلایەكیتریشەوە دەمویست دایكی ناو ڕەسمەكە منبایەم و پەلەوەری ئاسمانی وێنەكەش هەم لەكاتی فڕیندا هەم بەراوەستای و بە خۆشییەكی بێكۆتاییەوە بكێشرایە و زەمانەكەیان ڕابوەستاندایەوبە پێی نەریتی وەستا هەراتییەكان بكێشرایە . دەزانم ! ئاسان نییە .**

ئورهانە بەعەقڵەکەی کوڕم دەیەوێت بیرێك لەناو هەموو شتێکدا جێگیر بکات ، ساڵانێك پێیدەگوتم وێنەکێشە هەراتییەکان ناتوانن تۆ وەکوو خۆت بکێشنەوە ، هەروەها ئەوەشی بەبیر دەهێنامەوە کە ئەو وێنەکێشە ڕۆژ ئاواییانەش کەبەبێ ڕاوەستان وێنەی دایکی منداڵ لە باوەش دەکێشن ، هیچ کات ناتوانن زەمان ڕاوەستێنن . هەر لەبەر ئەوەش هەرگیز وێنەی خۆشبەختی من ناکێشرێت . لەوانەیە هەق بەلای ئەوەوە بێ . چونکە لەراستیدا مرۆڤەکان بەدوای پێکەنینی ناو وێنەیخۆشبەختیدا ناگەڕێن بەڵکوو لە ژیاندا بە دوای خۆشیدا دەگەڕێن . وێنەکێشان ئەمە دەزانن و ئەو شتەش کەوا نەیانتوانیوە بیانکێشن هەر ئەمەیە . لەم ڕووەشەوە خۆشی بینین دەخەنە جێگای دڵخۆشییەکانی ناو ژیان .

ئەم بەسەر هاتە وێنە نەکێشراوەم لەبەر ئەوە باسکرد بۆ ئورهانی کوڕم چوونکە لەوانەیە بینووسێتەوە . بەبێترس نامەکانی حەسەن و ڕەشە و وێنەی ئەسپە مورەکەب بڵاو بووەکەی سەر تەرمەکەی زەریف ئەفەندیم پێدا . ئورهان هەموو کات تووڕە و دەمار گرژ و بەد خۆ و نائومێدە و دەتوانێ لەبەرامبەلا ئەوانەی حەزیان لێناکەن بە ئاسانی ناهەقی بکات . لەم ڕووەشەوە ئەگەر ڕەشە لەوەی هەیە زیاتر سەرسام و ژیانمان لەوەی هەیە سەختترنیشانبدات و شەوکەت بە خراپی ومنیش لەوەی کە هەم جوانتر و بێڕەوشتتر نیشانبدات بڕوای پێمەکەن . چونکە تەنیا لەبەر ئەوەی بڕوا بەچیرۆکەکەی بکەین ، هەموو جۆرە درۆ و دەلەسەیێك هەڵدەواسێ .

" ڕۆمانە ئەزمونی و پڕ لە زانستەکانی بوون بە هۆی ناودار بوون و ئاوازە پەیدا کردنێکی نێو نەتەوەیی بۆ ئۆرهان پامۆك . "

(نیویۆرك تایمز)

(كاك جەودەت و كوڕەكانی)

ڕۆمان ، لە دەوور و بەری بنەماڵەیەكی ئەستەمبۆڵیدا دیمەنی سەد ساڵی دوایی توركیا نیشاندەدات ... ئەم ڕۆمانە لە ڕۆژانی كۆتایی ە سەڵاتی عەبدولحەمیدا لە ماڵێكدا لە وەفا دەكرێتەوە و دواتر بە هێواشی وەكو زنجیرە ساتێكی زیندوو بە شێوەیەكی وەستایانە مێژو زیندوو دەكاتەوە و لە دەوور و بەری ئاپارتمانێكدا لە نیشانتاش كۆتایی پێدێت .

" سەركەوتنێكی گەورە ... بە بێ هیچ دوو دڵێیكەوە خمستە ڕیزی ئەو بیست ڕۆمانەی توركیا كە پەسەندیان دەكەم "

(فەتحی ناجی)

بە گوێرەی ئاماری كتێبەكان یەكێكە لەو 75 كتێبەی وا مۆری خۆیان لە ئەدەبیاتی كۆماری توركیا داوە ،بۆیە:

– هەدیەی ڕۆمانی ئۆرهان كەماڵ

– خەلاتی ڕۆمانی چاپ و پەخشی میلیەتی وەرگرتووە .

(ماڵی بێدەنگ)

" ئەم كتێبە جوانە خەماوییە ، باسی حەفتەیەك ژیان سێ برا لە ماڵی دایكیان لە شارۆچكەیەكی گۆی ئاوی نزیكی ئەستەنبووڵ . ... سەركەوتنێكی سەر سووڕ هێنەر ... "

( تایمز لیتەراری سوپلەمەنت ، لەندەن . )

باپیریان كابرایەكی دوورخراوی سیاسیە ، ئەو ماڵەی وا دروستی كردووە ئێستا لەگەڵ سێ جیلدا پردێكی پێوەندی دروستدەكات ، جموجوڵی پڕ لە توند وتیژی لاوەكانی تێدایە .

– خەلاتی كەشفی ئاورووپای وەرگرتووە.

(قەڵای سپی )

لەسەد ساڵ 17.دا دزە تورکەکان کابرایەکی وەنیزی دەگرن و دەیهێننە ئەستەنبووڵ . ئەم کوێلەیەکە بڕوای وایە ئاگای لە ئەستێرەناسی و فیزیك و وێنەکێشان هەیە ، لەلایەن تورکێکی لەو چەشنەوە دەکڕدرێت . لەیەك چوونێکی سەیریان تێدایە . خاوەنی کوێلەکە دەیەوێت لە کوێلەکەیەوە فێری زانستی وەنیز و و ڕۆژئاوا ببێت . بەسەر هاتەکانیان لە نەخۆشی هەمەگیری وەبا و کۆڵانەکانی ئەستەنبووڵ و باخچە خەیالییەکە و حەیوانەکانی سوڵتانە منداڵەکەوە دەیانباتەوە سەرپرسیاری " من بۆچی منم ؟"

" بەسەرهاتێکی پۆست مۆدیرنەکە خەڵك تووشی حەیران مانەوە دەکات و بەوەستایەکی باشەوە ڕۆڵەکان پڕدەکات لە پارادۆکس ."

(پوبلیشەرس ویکلی نیۆیۆرك .)

" وەستایەتی پامووك لەوەدایە کە توانیویەتی ئەو هەموو بیرە لە ڕۆمانێکی ئاوەها کورتدا جێگیر بکات "

(گاردییەن ، لەندەن .)

(کتێبی ڕەش )

" باشترین بەرهەمی پامووك "

(تایمز لیتەراری سوپلەمەنت .لەندەن .)

گالیپ لە ڕۆژێکی بەفراوی زستانیدا لە ئەستەنبووڵ دەست بە گەڕان بە دوای عەشقی کاتی منداڵی ، هاوڕێی ، کچی مامی ، ژنە خۆشەویستە ون بووەکەی دەکات .

لەم بەینەشدا هاوڕێ ڕۆژنامە نووسەکەی کە لە گۆشەی ڕۆژنامەکاندا

دەنووسیٚ ،ئیشارەتی بۆ دەنێریٚ و هاوڕێیەتی دەکات . خوێنەر لەلایەکەوە لێکۆڵینەوەکان و ئەو کەسانە تاقیب دەکات کە لەو ئەستەنبووڵەیدا هەر دوکەڵهەڵکێش و هەر مرۆڤێکی بوون بە ئاماژەی دونیایەکی ڕازدار ، لەلایەکیتریشەوە ڕووبەڕووی نوسراوەکانی جەلالی ڕۆژنامە نووس دەبێت کە ئەم بەسەرهاتە سەیرو سەمەرانە تەواو دەکات . ئەمە هەوڵدانێکە کە بەسەر هاتی جەللادە کۆنەکان و فەلاقەی ناو ئاوی ( بوغاز ) و پیاو کوژە ڕازدارەکانی پادشا لە مێژووی کولتووریماندا ڕاز لە ڕوومەتماندا و عەشقەکانی شەوە بەفراوییەکان و کەسایەتییە سەیر و پێکەنیناوییەکانی ئەستەنبووڵ لە کۆشە دوور و تاریکەکانیوە و وردە کارییە فەرامۆشکراوەکانی ژیانی مێژووی نێزیکمان ، بە بەرچاودا بخشێنیٚ .

" داستانێکی مۆدیرن و دەوڵەمەند و خوڵقێنەری نەتەوەییە "

(د ، سوندەی تایمز . لەندەن .)

(ژیانی تازە)

ئەم ڕۆمانە سەیرە کە بەقسەی " ڕۆژێك کتێبێکم خوێندەوە و ژیانم گوڕا " دەست پێدەکات ، بەکێشە پولیسییەکەیەوە وەکوو ڕوداوە و بە چیرۆکی عەشقەکەشییەوە لە ئەفسانە دەچیٚ و تا ڕۆژی ئەمڕۆ یەکێکە لە ڕۆمانە تورکیانەی کە زۆرترین خوێنەری هەبووە . لەلایەکەوە باسی ژیان و ساتە بیٚهاوتاکان و مەرگ و نووسین و نهێنییەکان هەڵکەوت دەکات و جار و باریش دەکرێتەوە بە ڕووی ئەو فریشتانەی وا لە ڕۆمانی منداڵەکاندا دەردەکەون و بە باسکردنی شێعرەکان دەبێت بە ڕۆمانێکی بیٚهاوتا و بە شێوەیەکی تایبەتی دەمانباتە ناو دڵی خەفەت و توند و تیژی .

" ژیانی تازە ، یان کۆتایی بەرهەمەکانی ( والتر بەنژامینە ) یان وەکوو

**سەرەتای بەرهەمێکی تازەیەتی ، ڕوو داوی تازە و تایبەتن ، قسەکانی وەبیر دێنێتەوە ، ژیانی تازە ڕووداوێکی تازەیە . "**

**( د ، گادییەن . لەندەن )**

**" پامۆك یەکێکە لە نووسەرە سەیرەکانی بەرچاومانە "**

**(د ، تایمز لیتەراری سوپلەمەنت ، لەندەن)**

**(رووی شاراوە \ سیناریۆ )**

**فیلمی ڕووی شاراوە نووسینی ( ئورهان پامۆك ) و دەرهێنراوەی ( عومەر کاور ) بوو بە فیلمێکی نائاسایی و لەبیر نەکراوەی سینەمای تورکی.**

**لە فیستیواڵی فیلمی ئانتالیادا خەڵاتی باشترین فیلم و باشترین سیناریۆی وەرگرتووە .**

**(ناوی‌من سوورەیە)**

**بە بۆچوونی خودی ئورهان پاموك ، ڕەنگا و ڕەنگ ترین و خۆشبینترین ڕۆمانی، " ناوی من سوورەیە "یە ، کە لە نۆ ڕۆژی بەفراوی ئەستەنبووڵدا دەرباز دەبێت . لە کاتێکدا شەکورەی جوان کە دوو کوڕەکەی هەمیشە پێکەوە شەڕ دەکەن، لەباتی مێردەکەیدا کە چوار ساڵە لە شەڕ نەگەڕاوەتەوە بە دوای مێردێکی تازە و خۆشەویستێکیتردا دەگەڕێت ، لە جێگا شاراوەکەی خۆیەوە دەست بە تەماشا کردنی شێوەکارانی کۆشك دەکات کە لەو کاتانەدا باوکی یەکەیەکە بانگی دەکردن و دەیهێنان بۆ ماڵەوە . ئەم وەستا شێوەکارانەی وادێن بۆ ماڵ ، لەژێر بەرپرسیاری باوکیدا کتێبێکی نهێنی بۆ پادشای عوسمانی دروستدەکەن کە وێنەی مەترسیداری تێدایە و کاریگەری نەریتی ڕۆژئاواییەکانی پێوەیە . کاتێك یەکێکیان دەکوژرێ**

كوڕی پوورەكەی شەكورە كە ناوی ڕەشەیە دێتە ناو باسەكەوە. جەماوەرێك لەدەوروبەری مەلایەكدا لە ئەستەنبووڵ كۆ دەبنەوە و هێرش دەكەنە سەر تەكیەكان . لەكاتێكدا كە ترس و گرانی زاڵ و بەردەوام و بالا دەستە ، شێوەكاران و و خۆشنووسەكان لە قاوەخانەیەكدا كۆ دەبنەوە و گوێ لە بەسەر هاتانە دەگرن كەوا بالۆرەوێژێكی زماندرێژ دەیانڵێتەوە و بەوانە ڕادەبوێرن .

ئەم كتێبە لەسەر هونەر و عەشق و ژیانی هاوسەری و كەلوپەلەكان و لەتەچنیكردن بۆیان و مردووەكان و قسەكردنی هەركەسێك بە زمانی خۆیەتی ، لەهەمانكاتیشدا جوانییە لەبیر كراوەكانی هونەری شێوەكاری زەمانی كۆن بەبیر دێنێتەوە .

---

" ڕۆمان نووسی لاوی تورك ( ئورهان پامۆك ) چۆنیەتی نووسینی ڕۆمان نیشانی ئاوروپاییەكان دەدات "

(FRANFURTER ، ALLGEMINE ، ALMANYA)

" پێویستە هەركەس ئورهان پامۆك بخوێنێتەوە "

(THE NEW STATESMAN ، INGI LTERE )